حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی رۆشنبیری
بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە
زنجیرە (١٦٩)

# کوردستان
# یان کڵۆڵیی نەتەوەیەك

## دوای ئەو هەمووزانیارییانە لێبوردنی چی ؟

نووسینی
جوناثان سی - راندال

وەرگێڕانی لەئینگلیزییەوە
د. خەسرەو شالی

داڕشتنەوەی کوردییەکەی و پێشەکی
ساڵح محەممەد ئەمین

سلێمانی ٢٠٠٢

# کوردستان یان کڵۆڵیی نەتەوەیەك


- بابەت: سیاسی
- نووسینی: جۆناثان سی – راندال
- وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: د. خەسرەو شالی
- داڕشتنەوەی کوردییەکەی و پێشەکی: سالح محەمەد ئەمین
- نەخشەسازی و بەرگ: سۆران عەبدوللا
- سەرپەرشتیاری چاپ: عەتا مەحمود
- چاپ: چاپخانەی بەرهەم
- تیراژ: (٧٠٠) دانە
- ژمارە سپاردنی (١٠٦)ی وەزارەتی رۆشنبیری ساڵی ٢٠٠٢ی پێدراوە

# جۆناتان سی. ڕاندال

زیاتر لەچارەکە سەدەیەک وەک پەیامنێرێکی جەنگ ناوی دەرکردبوو، کەزانی کورد گەورەترین ڕەگەزی مرۆڤایەتی سەرلێشێواوی سەرتاپای دونیان و لەهەموو هەواڵ و ڕووداوە سەرەکییەکانی: ئێران، ئیسرائیل، تورکیا، لوبنان و عێراقدا ئاوڕیاندێت، ویستی لەشێوەی گەشتێکی بەکاوخۆی سەدەی نۆزدەیەم، سێ مانگێک لەناویاندا و سێ مانگیش لێیانەوە دووربێت و لەبارەیانەوە بنووسێت .. ئەمە هەر بیرۆکەیەک بوو، لەسەرەتانێکدا بۆی هات. بەڵام ئەوکارە پێویستی بەزانیاری زیاتر دەکرد .. چەندین شەڕو پێکدادان و بەگازی ژەهراوی شاڵاوبردنە سەریان و، دواتریش بەکۆمەڵ سەرەونگومکردنیان کاریانتێکردو ئەم بەرهەمەی کەلەبەر دەستدایە، بەشێوەی ڕاپۆرتێک لەسەر کوردستان دەرکەوت، کەمێژوویی لەدەستی سەرسوڕهێنەرو کارەساتی دیپلۆماتیانەو ڕامیاریانەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست.. بەسەرهاتێکی سەیرو سەمەرەی پەیامنێرێکی جەنگی ساڵانی نەوەدە..

لەمێژووی کوردا، زلهێزەکانی دونیا هەمیشە بەڵێنی یارمەتیدانیان پێداون، هەموو جارێکیش بۆ گەیشتن بەسەربەخۆیی ناپاکییان لەگەڵدا کراوەو خۆشیان لەو پەڕەوە دەستی بالایان هەبووە. ((ڕاندال))کەلەبارەی ئازایەتی و وریایی و شەڕی ناوخۆی کوردەوە دەدوێت و باس لەبایەخ و دۆستایەتیدانیان دەکات، لەناونیشانی کتێبەکە دووریمان دەخاتەوە. جا چونکە بەشێوازی جۆراو جۆر خۆی گەیاندۆتە سەرکردەو دیپلۆمات و وەزیرو ئەندامانی دەزگا هەواڵگرەکان ((موخابەرات))و پێشمەرگەو پەیامنێرانی ڕۆژنامە، بۆیە بۆتە تەنیا نووسەرێک کەلەم کێشەیە بدوێت و ڕاستییەکانی ئاشکرا بکات.

# لەبارەی کتێبەکەوە

ئەم لاپەڕانەی پەیامنێرێکی کارامەی جەنگەوە، کەلەهەموو کەسێکی دی زیاتر شارەزایی لەکێشەی کورددا هەیە، ڕاستی سەبارەت بەکوردستان دەخوێنێتەوە ((ڕاندل))کورد وریشیار دەکاتەوە. نووسینەکانی هەریەم لەئەنجامی هەست و دەستێکی ڕاستەو دیاریکراوی ئەو کارانەوە دێن کەلەبارەیانەوە دەدوێت..

کریستۆفەر هیچنس: واشنتۆن پۆست بوک ورڵد

گومانی تێدا نییە کەکێشەی کورد لەئایندەیەکی نزیکدا جارێکی تر دەتەقێتەوە، ئەم کتێبە هێجگار تایبەتییە لەئێستاوە لەوە وریامان دەکاتەوە، بۆیە ناکرێ پشتگوێی بخەین.

دریشارد سی هولبروک

ڕێکخەری ڕێککەوتنی دایتۆنی بۆسنیا

# سەبارەت بەنووسەر

"جوناتان سی ڕاندل" ڕاگەیەنەرێکی سەرەکی هەواڵە دەرەکییەکانی "واشنتۆن پۆست" بەسالأنی شەستەوە لە"کۆنگۆ"وە لەبارەی گرنگترین ململانێکانی ئەم چەند ساڵەی دوایی دواوە. نووسەری کتێبی سەرتاسەری "کریستیان وارلۆردس" و "سەرەنوێییەکانی ئیسرائیل" و "شەڕی لوبنان"ە، ئەگەر لەبەرەی جەنگدا نەبووبێت ئەوا لەپاریس نیشتەجێبووە..

# کورتە پێشەکییەکی "ڕێکخراوی ویلز بۆ یارمەتیدانی کورد KAW

بەرهەمی "دوای ئەم هەموو زانیارییە لێبوردنی چی؟"ی "جوناثان ڕاندال" جیاوازی لەگەڵ هەموو ئەو بەرهەمانەی تردا هەیە کەلەبارەی کوردەوە خوێندومانەتەوە. زانیارییەکی بێلایەنانەیەو، لێکۆڵینەوەکانیشی، چ ئەوانەی خۆیی و چ ئەوانەی لەسەرچاوە باوەڕپێکراوەکانەوە وەریگرتوون زۆر نایابن. خوێنەر بۆ خۆی دەتوانێت بڕیار لەسەر چۆنێتی ڕووداوەکان بدات. ئەم چاپکراوە کارێکی وا دەکات کەئەو کەسانەی لەهەراڵە ڕاستییەکانەوە دووربوون بۆچوونەکانیان لاڕوون بێتەوە.

نووسەر، بەدڵێکی فراوانەوە ڕێگای داین کەلەگۆڕینی بابەتەکەیدا بۆ زمانی کوردی ئازادبین، بۆیە ڕێزی زۆرمان بۆ ئەو هەڵوێستە جوامێرانەیەی هەیە، لەمێنانەدی ئەم بەرهەمەیدا، "KAW"بە قەرزاریی هەوڵەکانی "جوناثان" دەمێنێتەوە.

سوپاسی زۆرمان بۆ بەڕێزان "د.خەسرەو شالی" و "سالح محەممەد ئەمین" هەیە، کە بەبێ هیچ مەرجێك بەرهەمەکەیان کردە کوردی، ئەو بەرهەمەی کەبەبێ یارمەتیدانی پرۆفیسۆر "کەندال نەزان"ی ئەنستیتوی کورد لەپاریسدا، کە هانیداین و بەشداری لەهەڵسوڕانی خەرجەکەیدا کردین، نەدەهاتەدی.

"کەی ئەی دەبلیو KAW" بە هیوایە وەرگێڕانی ئەم بەرهەمە بۆ کوردی، کەپێویستە بێکەسەرچاوەیەك بۆ ئەو لاوانەی لەبڕیاری سیاسی داهاتوی گەلەکەیاندا بەشداری دەکەن، جێی بەزامەندی گەلی کورد بێت. باوەڕمان وایە چارەسەری هەموو ئەو کۆسپانەی دێنە سەر ڕێی ئاوەزووە پرشنگدارەکەی ڕێککەوتن. بکات. بەهیوای داهاتوێکی بەبەرهەمترو لێبوردنتیرین.

د.شیروان موفتی
سەرۆکی KAW

مورگان فرانسس
سکرتێری KAW

# پێشەکی

کە داڕشتنەوەی وەرگێڕانەکەی ئەم کتێبە نایابەی "ڕانداڵ"م تەواو کرد، وەک کابرای خاوەن سکاڵا، بەدیار نووسینەکەوە بۆ حاڵی خۆمان دەگریام، چونکە دوای ئەو زۆرو ستەمەی لەسەرەتای مێژووەوە بەدەستەوە کڵۆڵەکەمان کراوە، ئەو هەموو نووچدان و گلاندنەی، ڕانداڵ وتەنی کە "هەموو خەتاکان لەکورد خۆیەوە نییە"، هێشتا کێشەکەمان نەک هەر چارەسەر نەکراوە بەڵکو بەرنامەیەکی ڕوون و ئاشکرای واش بۆ چارەسەرکردنی لەئارادانییە، جا بەرنامەکە چ لەلای زلهێزەکانی دونیاوە بێت یان لای کۆمەڵەو ڕێکخراوو پارتە سیاسییەکانی کورد خۆیەوە بێت، بەڵام کوردو ڕێکخراوە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییەکانی سوورن لەبەردەوامی هەوڵەکانیاندا بۆ بەرەوپێشەوەبردنی کێشەکەیان و ڕزگاربوون لەگرێی ژێر دەستەیی، کە کەم کورد هەیە لەهەموو بەشەکانی کوردستان و هەرکوێیەکی تری ئەم دونیایەدا بژی و هەستی پێنەکردبێت. کۆسپی گەورەش لەڕێی ئەو کڵۆڵییەماندا، وەک خۆمان دەرکمان پێکردووە، لێکۆڵەرەوە بیانییەکانیش گەیاندۆتە بڕوایەک کەبەشتێکی "بۆماوە-مووروث"ی دابنێن لەخوێن و پێکهاتەی کرۆمۆسۆمەکانی کورد خۆیدا، دووبەرەکییە، ئەگەرچی ئەوانیش باوەڕیان بەوە هێناوە کەهۆکارێکی زۆری هەیە، بەتایبەتی کە کوردستان بووبێتە دووگەیەک و بەدەوڵەتانێک گەمارۆ درابێت کەڕژێمەکانیان بەخوێنی سەری گەلەکەی تینوون و، گەر لەناو یەکتریدا لەهەموو شتێکدا ناکۆک بوون ئەوا لەلێدانی کورددا هێند کۆکن موو بەنێوانیاندا ناچێت و، هەموو توانای خۆشیان بۆ نەهێشتن بەگەیشتنە ئاواتی ئەو نەتەوە کڵۆڵە بەگەڕخستووە دەخەن تا پیسترین داوی بۆ بنێنەوە. لەوەش نەگبەتیتر بەرەوبووەی خاکەکەی خۆمان دەدرێت بەتۆپ و فڕۆکەو ناهەموارترین چەکی کۆکوژی دی و تیاماندا تاقیدەکرێتەوە، هەر ئەو بەرەوبووەشەکە دەمکوتی زلهێزانی دونیای پێدەکرێت و لەپێناو پاراستنی بەرژەوەندی خۆیاندا لەئاست هەموو تاوانەکاندا دەبنە کەڕەی شەریعەت و دیزە بەدەرخۆنەی دەکەن.

ڕانداڵ کاتێک پرۆژەی نووسینی ئەم کتێبەی بەبیردا هات، لەزۆر لاوە مەترسی کارەکەیان بەگوێیدا داو ویستیان پەشیمانی بکەنەوە، بەڵام شەیدایی ڕۆژنامەنووسێکی کارامەی وەک ئەو

بۆ کارێکی وا بەئاسانی ملی پێنادرێت، بۆیە لەدڵی خۆیدا بەو پەندە کوردییەی کرد کەدەڵێت: "گۆم تا لووڵ بێت مەلەی خۆشە" و خۆی هاویشتەناو گێژاوەکەوەو بەدەیان کوێرەڕێو مینجاڕدا ملی نا، چۆنێتی هەڵگرتنەوەی زۆر لەو مینانەشی لەدووتوێی ئەم بەرهەمە بەنرخەدا بۆ باسکردووین.

نووسەرێك گەر بیەوێت شتێك سەبارەت بە، ڕووداوێك، بەسەرهاتێك یان کارەساتێك بنووسێتەوە کەلە، کەسانێکی بیستبێت، لەدووتوێی کتێبێکدا خوێندبێتییەوە یان سەر بەلایەنێکی ململانێکە بێت، زۆر لەو کەسە جیاوازترە کەخۆی تیایدا ژیابێت و، مەرگەساتی ڕۆژگارەکانی بەچاوی خۆی دیبێت و تۆڤاندبێتیان و مرۆڤێتیەکەڵی لێدەرچێت هیچ شتێکی دی بە بەسەرهاتەکەیەوەی نەبەستبێتەوەو لەناخیشەوە کاریان تێکردبێت. ڕاندال بۆ خۆشبەختی کورد لەڕۆژگارێکدا دەستی بە جێبەجێکردنی پڕۆژەکەی کردووە کەلەکێشەی کورددا بە وەرچەرخانێك دادەنرێت. دوای کورەکوژانی کیمیابارانکردنی گوندو شارۆچکە کوردییەکان و ئەنفالکردنی خەڵکەکەی، وەك پەیامنێری ڕۆژنامەیەك چۆتە سنووری تورکیاو، بەچاوی شارەزایەکی کارامە، ئەو جۆرە بەسەرهاتە جەرگبڕانەی لەدیدی هەزاران مرۆڤی تۆقیوی وادا دیوە کەبەڕێکەوت لەدۆزەخی ناهەموارترین و بێ بایەخترین و سامناکترین چەکی کۆکوژی قەدەغەکراودا دەربازبوون. جەنگی ئێران عێراق و لایەنگرێتی وڵاتانی خۆرئاوا بۆ عێراق، دەمی ئەو ڕاگەیاندنە ئازادانەی کەبۆ چەند ڕۆژێك میدیای دونیا لەڕێی ئێرانەوە دیمەنی ژەهراویکردنی کەش و هەوای دەمەو بەهاری شاری هەڵەبجەو خنکاندنەکەیان ڕاگەیاند، داخست و کراسی گومانی ئاودامانیشی بەبەری ستەمکارییەکەی ڕژێمی عێراقدا کرد، ئەویش لەکاتێکدا هەڵەبجەیی و گەرمیانی و قەرەداغی و بالیسانی و بادینانی و خەڵکی سەرجەم ئەو ناوچانەی بەحاڵی هەڵەبجەیان بردبوون، لەشارە کوردییەکاندا وەك تلیاك و ماڵی ئاچاخبن کون بەکون بەدوایاندا دەگەڕان تا ئەمانیش بگرن و بەدەردی ئەنفالکراوەکانیان بەرن، زلهێزەکان لەپێناو بەرژەوەندی خۆیاندا دەنگی هەموو میدیای دونیایان کپکردەوە.

ڕاندال یەکێك بووە لەو پەیامنێرانەی کەبۆ ڕاگەیاندنی هەواڵی ڕاپەڕینەکەی کوردستانی عێراقی ١٩٩١، بەزووترین کات خۆی گەیاندۆتە ناوچە ڕزگارکراوەکان و بەدوای ڕاستی ڕووداوەکاندا چووەو ئاوانەکانی ڕژێم و گەلێك شتی گرنگی یەکلاکردۆتەوە. کاردانەوەی قینی پەنگەوە خواردووی کوردی لەوبەشەی، بەرامبەر ڕژێمە دڕندە نامرۆڤانەکەی عێراق بینیوەو، بەشداری ڕەوە مێژوویییەکەشی کردووەو، بەجۆرێکیش لەبارەیەوە نوسیوویەتی کەدەستی خوێنەر دەگرێت و هەنگاو بەهەنگاوی ڕێگاکەی ڕەوی پیادا کردووە، بەشێوەیەك وا بۆی

باسدەکات کەمەر لەخۆی بوەشێنێتەوە. ڕاندال کۆ لەباسکردنی هەڵەو خراپەکاری و تاوانی هیچ کەس و لایەن و ڕژێم و دەوڵەتێك ناکات کە دووروونزیك دەستیان لەبەسەرهاتەکانی کورددا هەبووبێت و زۆر بەڕوونی و بەبێ پێچوپەنا، ڕەخنە لەهەڵوێست و ڕەفتاری سەرجەمیان دەگرێت و تاوانباریشیان دیاریدەکات.

پێدەچێ ڕاندال ڕێنمایکەرانی (مەبەست لەو نووسەرو کوردناسانەیە کەپێشتر تالیکردنەوەیان لەکێشە ئاڵۆزەکەی کورددا هەبووە) کاریان تێکردبێت، بەتایبەتی ئەوانەی وا بیر لەکورد دەکەنەوە، کەمێشك وەستاوبێت و هەمیشە خەڵکی دی بیریان بۆ کردبێتەوە، چونکە کورد گەرتووشی گرفتێك ببێت - کەبەردەوام هەیەتی- ئەوا ناتوانێت چارەسەرێکی بۆ ببینێتەوە. ئەوەتا سەرگوزشتەیەك دەگێڕێتەوە تیایدا خۆی لەبری کورد بیر لەچارەسەرکردنی گرفتێك دەکاتەوە کەخۆی وتەنی "بۆ یەکەمینجارە لەبری تێکدان و شێواندن، چارەسەریکات" ئەویش: کاتێك لەسلێمەکی باریکی چیایەکداو لەڕۆژێکدا کەبەفر ڕێگای گرتووە دووپاس ڕووبەڕووی یەکتری دێن، دەفەرەکانیش لەبری دابەزن و بکەونە خاوێنکردنەوەی ڕێگا تەسکەکە، دەکەونە شاتەشات بەسەر یەکتریدا و، پیاوانیان خۆیان بە کلاشینکۆفەکانیانەوە بادەدەن، ڕاندالیش بەو تەمەنەیەوە- کەئەوسا سەرو پەنجا ساڵ بووە- قۆڵی لێهەڵدەکات و بەخاکەنازێکی ناو جێبەکەی خۆیان دەکەوێتە ڕێگا پاککردنەوەو، کەلێدەبێتەوە ئەمجا بەسەریاندا دەلیرژێنێت و بەزمانی ئینگلیزی (کەخۆی دڵنیایە کەسیان لێی تێ ناگەن)داوایان لێدەکات سەرکەون و بڕۆن ڕێگەکە چۆڵبکەن چونکە ئەم پەلەیەتی. لەشوێنێکی تریشدا، لەکاتی هێرشەکەی پارتیدا بۆ سلێمانی کەئەو برادەرێکی دەیانەوێت بەرەو قەڵاچوالان بۆلای مام جەلال بچن، هێزەکانی پارتی بەجۆرێك پەرش و بڵاو دەبن، برادەرەکەی ڕاندال دەڵێت گەر یەکێتیەکان لێزانن و ڕیزێك هاوەن بێرەوە بنێن ئەوا زۆر لەمانە دەکوژن. وەك بڵێی بەنیجا پێشنیارەکەی بۆ کردبن، ئیتر هەر ئەوەندە دەزانن لەبەرزاییەکەوە یەك ڕیز هاوەن دەنرێت بەمانەوەو بەپەلەپەڕۆزێ ڕاندال و برادەرەکەی دەرباز دەبن. ئەمەشیان وا دەگەیەنێت کەکورد گەر بەنیجاش بێت دەبێ ڕێ نیشاندەرێکی هەر هەبێت لەگینا خۆیان دەرك بەهیچ ناکەن. ئێمە لەپاریس، لەبارەگای ئەنستوتی کورد ئەو پرسیارەمان بەرەوڕووکردەوە، لەوەلامدا پێیراگەیاندین کەمەبەستی وای نەبووە. ڕاندال لەیەك دوو شوێنی تردا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە: خۆی و برادەرەکانی سەریان لەو کوردانە سوڕماوە کەلەعێراق و تورکیادا دەژین و، وەك عەرەب زمانی عەرەبی و وەك تورکیش زمانی تورکی دەزانن و کەچی سوورن لەسەر کوردیتی خۆیان. منیش لێرەدا سەرم لەو لەبرادەرەکانی سوڕدەمێنێ کەداوا لەکوردێك دەکەن هەر لەبەرئەوەی زمانی نەتەوە

سەربەستەکەی ئەو وڵاتەی تیایدا دەژی دەزانێت، ئیتر هەموو ئەو جیاوازیی و بەسووک
سەیرکردنانە لەبیر بکات کەلەلایەن ڕژێمەوە لەسەر کوردێتییەکەی پێدەکرێت و تەنانەت لەڕێزی
مرۆڤیشی دانانێن، سەر سوڕمانەکەی ئەوان لە جێی خۆیدا دەبوو گەر ئەو ناڕەوایەتییە لەسەر
کورد نەمایەو ئەوانیش وەک هەرکەسێکی تری نەتەوە سەردەستەکان هەستیان بەهاوڵاتێتی
خۆیان بکردایە کورد لەو وڵاتانەی کەبەسەریاندا دابەش کراوە، هەر لەسەر کوردێتییەکەی نەک
شتێکی دی ئەوەی پێدەکرێ کەڕاندال بینوێنێ و تیایدا ژیاوەو لەکتێبەکەیدا باسی دەکات
چۆنچۆنی تەنانەت لەبەرهەمی خاکەکەشیان بێبەش دەکرێن، با گوێ لەڕاندال خۆی بگرین و
بزانین چۆن لەوبارەیەوە دەدوێت: "لەپاڵ ئەو کوردە پەککەوتووانەشدا بووم کەهەروا چەند
میلێک لەبەشێک لەدەوڵەمەندترین کانە نەوتی ئەم دونیایەوە دووربوون و کەچی لەتاو سەرماو
سۆڵە ناچار وردە لقیان خڕکردبۆتەوە تا ئاگری تێبەردەن و خۆیانی لەبەردا گەرم بکەنەوە..."
بەو جۆرە خێروبێری کوردستان بۆتە بەڵایەک و لەگەردنی کورد ئاڵاوە. هێزە چەکدارەکانی
دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستان بەڕەفتاری ئەم ساڵانەی دوای جەنگی جیهانی یەکەمیان
کەتەمەنی هەندێکیشیان سەلماندوویانە داگیرکەر نەبێت هیچی دی نین، چۆنێتی هەڵس و کەوتی
هێزەکانی ئاسایشی تورک لەگەڵ کوردی تورکیادا کە ڕاندال بینیوونی، هەر ئەو هەڵس و
کەوتانەیە کەهێزە نازیی و فاشیەکان لەناو وڵاتە داگیرکراوەکاندا کردویانە، خۆلە عێراقیشدا
ئەوە هەر لەدروستبوونی دەوڵەتەکەوە بیگرە تا ئەمڕۆی دەربەدەرکردنی کوردی ناوچەکانی
کوردستانی ژێر دەستەڵاتی حکومەتی بەغدا، بەتایبەتی ناوچە نەوتینیەکانی وەک کەرکوک و
خانەقین، کەبەئاشکرا و بەبەرچاوی هەموو دونیاوە پاکتاوێکی ناژادیکردنی ڕوون و ئاشکرایەو
پێشێلکردنی بنەما سەرەکییەکانی جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤەو کەچی دونیا لەئاستیدا
بێدەنگ و سەنگە. ئیسماعیل بێشکچی لەبەرهەمە نایابەکەیدا (کوردستان کۆلۆنیلێکی نێو
دەوڵەتییە) کە دکتۆر نوری تاڵەبانی لەڕۆژنامەی- الحیاة-ی ژمارە ١٢٢٦٦دا باسیکردووە،
بەمجۆرە لەو مەسەلەیە دەدوێت: "... کاتێک کوردەکان لەخاکی خۆیان دەردەکرێن و گوندەکانیان
کۆمەڵانی تورک و عەرەب و فارسیان تیادا نیشتەجێدەکرێن و، دەزگا کشتوکاڵیەکانی سەربە
دەوڵەت خاکە بەپیتەکەیان بەکاردەهێنن، یان سەربازگەیان تیادا دادەمەزرێنن، ئەوا بێگومان
ئەوە ڕێبازێکی ڕامیارانەی نەخشە بۆ کێشراوە ...." ئیتر چۆن ئەو شتە سەیر نابێت کەکوردێک
خۆی لەبیر بکات و نەزانێت چۆن و بەکام چاو سەیر دەکرێت. کڵۆڵی کورد، کەزۆربەی هەرەزۆری
موسوڵمانە، لەوەدایە بەسەر وڵاتێکدا دابەشکراوە کەهیچ شتێک بەشێوەیەکی ژیرانە چارەسەر
ناکەن و دەوروو پشتەکانیشیان، کەزۆربەیان وڵاتانی عەرەب و موسوڵمانن بەهیچ جۆرێک گوێ بەو

سەرکوتکردنانەی کورد نادەن و دەماریان بۆی نابزوێت، تەنانەت بەکیمیابارانکردنەکەی هەڵەبجەشەوە، لەمەشیاندا دەکرێت بۆ چەند دێڕێکی تری ئیسماعیل بیشکچی هەمان سەرچاوەی پێشوو بگەڕێینەوە. بیشکچی سەبارەت بەکۆنگرەی سەرۆکی دەوڵەتە ئیسلامیەکانی ۱۹۸۸/۳/۲۰، واتە تەنیا چوار رۆژ دوای بۆردومانکردنەکەی هەڵەبجە، کە لەکوێت بەسترا، دەڵێت: "... کۆنگرەکەی سەرانی دەوڵەتە ئیسلامیەکان لەبارەی هەمووشتێکەوە دوان .... بەمەسەلەی بوونی تورکیشەوە لەبولگاریادا و چەوساندنەوەیان بەهۆی ڕەگەزیانەوە، کەچی یەک قسەیان لەبارەی ئەو بەکۆمەڵکوژییەی کوردەوە نەکرد، کەزیاتر لەپێنج هەزار منداڵ و ژن و پیری کوردی تیادا کوژراو، ۱۰ هەزار کەسێکیشی بەجۆرێک بریندارکرد کەمەترسی مردنیان لێدەکرا".
ئەوە حاڵی کوردە لەهەموو پارچەکانی کوردستاندا. جا لەبەرئەوەی رژێمی ئەو وڵاتانەی کوردستانیان بەسەردا دابەشکراوە لەئاست کورددا باشیان نییە، بەڵکو خراپ و خراپتریان هەیە، کوردی هەر پارچەیەکی کوردستان بدوێنی خۆی بە چەوساوەتر لەوانی دی دادەنێ، بۆیە حیزب و کۆمەڵانی هەربەشێک بیر لەڕزگاربوونی خۆیان دەکەنەوەو هەر ڕێگایەکیشیان پەلاوە پەسەندبێت دەیگرن، بەپشتبەستن بەدەوڵەتانی دراوسێی دژ بە کوردیشەوە، کەلەدێر زەمانەوە هەموو پشتگیریکردنێکی ئەو دراوسێیانە باجی خۆی هەبووە، باجێک کەلەسەر کەڵکی کورد مێژگار گران وەستاوەو دەوەستێت، خۆخستنە ناو ململانێی ئەو دەوڵەتە بەرژەوەندیانەی ناوچەکەو زلهێزانی دونیاش دەرچوون لێیان ئاسان نیەو ئەوەتا کورد ئەمڕۆش ئەو باجە بەخوێنی ڕۆڵەکانی دەدات و، کەدواترینیان پاڵ پێوەنانەکەی ئۆچالانبوو لەسوریا. هەر ئەوەشە ئەو کلۆڵیە -دووبەرەکییە- ی تیادا پەیداکردووین. نەبوونی قەوارەو دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆ کورد کەنەلەسەر هەموو کوردستان و نەلەپارچەیەکی کوردستاندا هەبووە، خۆ ئەگەر لەشێوەی جۆربەجۆری وەک میرنشینەکان و کۆماری کوردستان لەمەهابادو...دا بشبووبێ، ئەوا بەجۆرێکی وانەبوون کەخاوەنی خۆیان بن بۆیە ئەک هەر مێژووەکەمان دوژمن نووسیویەتیەوەو شوێن بڕوا نیە بەڵکو هیچ شتێکی راستیشیان لەبارەوە نەوتووین، خۆ ئەگەر وتبێتیشیان ئەوا شتێکیان درکاندوە کەلەخزمەتی بەرژەوەندییەکانی خۆیاندا بووبێت، لەلایەکی تریشەوە ئەگەر سەیری هەر پارچەیەکی کوردستان بکرێت ئەوا ئەو بەشەی وڵاتەکە لەهەموو بەشەکانی دی دواکەوتووترو وێرانترە، ئەویش نەک بەهۆی شەڕو شۆڕەوە وەک خۆیان باسی لێوەدەکەن، بەڵکو ئەوە پلانێکی داڕێژراوی هەموو ئەو دەوڵەتانەن کەخۆیان وتەنی (میواندارێتی کوردیان کردوە).
خۆ ئەوە سیاسەتێکی نوێ نیە بەڵکو لەزەمانی ئیمپراتۆریەتەکانیشدا هەر ئەو بۆچوونەیان بەرامبەر بەکورد هەبووە، لەم کتێبەدا هاتووە کە: کورد هێندە بە گێچەڵ ناهێنێ ئیمپراتۆرەکان و

سوپا پێیانەوە خەریکبن. باشتر وایە بەزۆریێت یان بەرێککەوتن لەشوێنی خۆیان بهێڵرێنەوەو گرفتەکانیان نەمێنرێتە ئەفتاییەکان". کاتی دروستبوونی دەوڵەتی عێراقیش وەک لە- لمحات الاجتماعیة في تاریخ العراق الحدیث-ی دکتۆر عەلی وەردیدا هاتووە، هەمان بۆچوونیان سەبارەت بە کوردو شیعە هەبووە.

سەرەتای ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١و دواتریش، ئەو کوردانەی کەبەهۆی بارە نائاساییەکەی عێراق بەگشتی و کوردستان بەتایبەتی هەڵاتبوون، بەئامەزرۆوە بۆ سەردانی کوردستانی دوور لە دەستەڵاتی بەعس دەگەڕانەوە. عومەر سندی یەکێک بووە لەوانەی لەگەڵ ڕاندال و چەند کەسێکی دیدابووە، شادییەکەی سندی بە جۆرێک ڕاندالی بزواندووە کەلەگەڵ گەلێ شتی سەمەرەی تردا بەراووردی دەکات و، لەمیانی لە هەموویان بەلاوە سەیرتربووە. پێموایە چونکە کوردو ئازادی تائێستا دەست لەملانی یەکترنەبوون، بۆیە دەکرێت شادبوونەکەی عومەر سندی و شەیداییەکەی کوردستانی، ڕێک بەشادی و شەیدایی مەجنون بۆ لەیلاو مەم بۆ زین، یان کەسێک بەراورد بکرێت کەدوای دابڕانێکی زۆر پێی وایە بەخۆشەویستەکەی دەگات، بەڵام شادبوونی ئازادیێک بەوڵاتە سەربەستەکەی خۆی وانائەکەوێتەوە.

ڕاندال پێی وایە کە ئەو دەیان هەزار شیعەیەی لەشەڕی ئێران عێراقدا خۆیان بۆ سەدام حسێن بەکوشتداوە، بەڵگەی ئەوەیە کەشیعەی عێراق پشتگیری ئێران ناکەن، من شتێکم سەبارەت بەپشتگیری کردن و نەکردنی شیعەی عێراق بۆ ئێران نییە، بەڵام دڵنیام لەوەی ڕێژەیەکی زۆریان نەک هەر بۆ سەدام حسێن خۆ بەکوشت نادەن، بەڵکو لەئەنجامی زۆرو ستەمەکەی لەگەڵیاندا کراوە، وەک دەرکردنی ئەو ژمارەی زۆرەی کەناوی "تەبەعییە" ناویدیوی ئێران کران، بەکوردە فەیلییە شیعە مەزهەبەکانیشەوە، ئەویش دوای زەوتکردنی هەموو شتێکیان، ئەمە جگە لەگرتنی گەنجەکانیان بەناوی شیعەگەرێتییەوەو سەرەو نگومکردنی هەندێکیان، داخێکی وایان لەدڵدابوو کەبەدوای دەرفەتێکدا دەگەڕان بۆ تۆڵە سەندنەوە، ڕاپەڕینەکەی ١٩٩١ی باشووری عێراق، بەتایبەتی شارە شیعەکانی وەک نەجەف و کەربەلاو بەسرەو دیوانیەو عمارەو ... هتد چاکترین بەڵگەن. لەلایەکی تریشەوە، عێراقییەکان بەچاوی خۆیان لەتەلەفزیۆنی حکومەتەوە بەئامادەبوونی سەدام خۆی بەسەرهاتی ئەو پیرە باوکەیان لەخودی باوکەکە خۆی بیست کەدەستی چووبوە خوێنی کوڕەکەی و کوشتبووی، ئەویش نەک لەبەر نیشتمانپەروەرێتی کابرا وەک لەتەلەفزیۆنەکەدا لەبەردەم سەدام حسێندا، بەڕەنگێکی هەڵبزرکاوەوە، لەکاتی خەڵاتکردن و دەستخۆشکەرییەکەیدا ڕاییەگەیاند، نەخێر بەڵکو لەترسی ئاکامی هەڵاتنی کوڕەکەی بوو کەباوکە چاکی دەزانی هەموو کەسوکارەکەی بەناحەق ئەرزدا دەبەنەخوارەوە. ئەو زۆرو

ستەمەی ڕژێم بەرامبەریەکی وابوو، هەرکەسێك لەسایەیدا بژیایە دەبوا بیزانیایە کەهەرخۆی لە ڕەفتارەکانی بەرپرسیار نیە بەڵکوو لەهەموو شتێك بکردایەتەوە نەوەك. ڕژێم خراپی بۆ لێکبدایەتەوە. مەلا گۆرون کابرایەکی کوێربوو لەگەڵ پیرەژنەکەیدا لە لەخانوویەکی گڵی پچووکی گەڕەکی مەڵکەندی سلێمانیدا دەژیان، کوڕەکەیان بەتاوانێك گرت و گوللەبارانیانکرد، بۆ ڕۆژی دوایش مەلا گۆرون و پیرەژنیان کوشت و خانووەکەشیان بەسەر شتەکانیاندا ڕووخاند، لەدوای ڕاپەڕین بەڵگەنامەیەکی دەستگا بەدناوەکەی ئەمنی سلێمانی بەردەستکەوت، تیایدا بەڕێوەبەری ئەو دەستگایە سەبارەت بەجێبەجێکردنی بڕیاری کوشتنی کەس و کاری ئەوکەسانەی لەسەر تاوانێك گوللەباران دەکران، پرسیار لەعلی حەسەن مەجیدی بەرپرس و بگرە بکوژی ناوچەی باکووری عێراق دەکات، دەرهەق بەو باوکە کوێرەو دایکە پیرە، ئەویش وا وەڵامی دەداتەوە کەئەوە باشترین هەلە بۆ چاوترساندنی خەڵکەکەو ئێوە نابێت کۆ لەهیچ شتێك بکەنەوەو چیتان داوالێکراوەپێویستە وەك خۆی جێبەجێی بکەن. ڕەوەکەی دوای ڕاپەڕین و گەڕانەوەی هێزە سەربازییەکانی عێراق لەخۆوە نەبوو، جەماوەری کوردستان ئەو نموونانەو گەلێك کێشەی جەرگبڕی دی، وەك سەرەونگومکردنی هەشت هەزار نێرینەی بەرزانی و لەنفالکردنی نزیکەی ١٨٢ هەزار ژن و منداڵ و پیری کوردیان لەیادبوو، کەهێشتا هێندەیان بەسەردا نەچووبوو، هۆیەکی سەرەکی ڕەوەکەی ساڵی ١٩٩١ بوون.

ڕاندال لەم بەرهەمەیدا، وەك ئەمریکاییەك دان بەوەدا دەنێت کە "زۆر کەم نەبێت هەستی بەبوونی ڕەخنەیەك لەئەمریکا نەکردووە، کەوەك ڕەخنەی ئەو ڕۆژەی کورد -مەبەستی ڕۆژی ڕەوەکەیە- لەجێی خۆیدا بووبێت". ئەمریکا ئەگەر جاران پاشقولگرتنەکانی خۆی لەڕێی پسپۆڕانی پاشقولگرتنی وەك کیسنجەرەوە شاردبێتەوە، ئەمجارەیان نەك هەرئەوەی بۆنەچووەسەر، بەڵکو سەرۆکە "بوش" خۆشی دانی بەو هەڵە گەورەیەدا نا کەئەوەی بەسەر گەلی عێراقدا بەگشتی و گەلی کورد بەتایبەتی هێنا.

لەم بەرهەمەو لەزۆر نووسینی تریشدا بەشێك لە کوشتاری ئەرمەنیەکان بەسەر کورددا دەهێننەوە، کەڕۆژێك چییە کورد خاوەنی دەسەڵات نەبووە تا تاوانی کاری دەسەڵاتدارێتی بەسەردا بسەپێنرێت، ڕاندال لەم نووسینەیدا ئاماژە بۆ شتێك دەکات کە وەك خۆی بۆی چووە بەلای خۆرئاواییەکانەوە شاراوەیە، ئەویش مردنی ئەو چەند سەد هەزار کوردەی لەو بەسەرهاتەدا، چ بەکوشتن و چ بەبرسێتی سەریان نابۆوە. سەبارەت بەشاڵاوەکەی تورکیای ئەتاتورکی سەر شاری دەرسیم و هەموو سەرکوتکەرەکانی تر، لەم نووسینەی ڕاندڵدا ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە، "هەرچەندە زەحمەتە ڕووداوەکانی ئەوکاتە بزانرێت، چونکە ئەرشیفەکانی

کۆماری تورکیا بەمۆرکراوی مابوونەوەو دەشمێنەوە..." گرفتی گەورەی کورد باوەڕنەکردنی وڵاتانی دونیایە بە بەسەرهاتەکانی، چونکە لەبەڵگەنامەی ڕەسمییەوە نەهاتووە کەشوێنەوارەی ئەوانە، خۆ ئەگەر ڕژێمەکەی ئەتاتورکیش وەک ڕژێمی عێراقی دوای ڕاپەڕینی بەسەر بهاتبایە ئەوا ئەویش ئەوا ئەویش وەک چۆن بەڵگەنامە سامناکەکانی بەعسییانی عێراق ئاشکرابوون و، چەندین تەن بەڵگەنامەی دەگمەن و سەرسووڕهێنی بەردەستکەوتن و خرانە بەردەم ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ، بەتایبەتی ڕێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ -هیومان رایتس ووچ- کەبارەگاکەی لەئەمەریکایەو ئەویش بێجگە لەکتێبێکی قەوارە گەورەکە بەناوی کورد قڕان -جینوساید-ەوە لێیەکرد، وەک لەناوەڕاستی مانگی ئابی ٢٠٠٠یشدا لەبەرنامەی -لەئەمەریکاوە- ی تەلەفزیۆنی mbcەوە بڵاوکرایەوە، بەپرسی فایلی عێراقی ڕێکخراوەکە خاتوو -هانیا موفتی- ڕایگەیاند تا ئێستا هەوڵیان لەگەڵ چەندین دەوڵەتدا داوە کەداوای دادگاییکردنی سەرانی ڕژێمی عێراق بکەن، ئەمانیش فایلی ئامادەیان لەو ڕووەوە خستوونەتە بەردەست، بەڵام تا ئەو ڕۆژە هیچ دەوڵەتێك ئامادەنەبووە ئەو داوایە پێشکەش بە نەتەوە یەکگرتووەکان بکات. جابڵێی گەر پەردە لەڕووی زیندە بەچاڵکردنی دەرسیم و تاوانەکانی هەڵبماڵرایە، ئەویش لەڕۆژێکدا کەئەهەموولایەك خەریکی خۆبردنە پێشەوەبوون لەکۆمارەکەی ئەتاتورك، کەس هیچی بە بەڵگەنامەکان بکردایەو ئەویشیان بەمەردی هەڵبجەی خنکاو نەبردایە؟!.

که کێشەی بۆسنیٚ کلپەی سەندو موسوڵمانەکانی گەمارۆدران، ئەمەریکا داوای لە تورکیا کرد، لەڕووی ئیسلامیتییەکەیەوە یارمەتیان بدات و مەشقی سەربازی بەلاوەکانی بکات. ڕاندال لەم ڕووەوە چاکی بۆچووە کەدەڵێت: "... بەڵام کەس هەر هیچ نەبێت باسی ئەوەی نەکرد کەتورکیایەك بەسڕینەوەی پێناسەی کەمایەتیەکی کوردییەوە تێوەگلاوە چۆن داوای یارمەتی موسوڵمانە گەمارۆدراوەکانی بۆسنیی لێدەکرێت؟" بەلای ئەوانەوە گرفتەکەی کورد-هەروەك ڕاندالیش بۆی چووە- لەوەدایە کەموسوڵمانەو وڵاتەکەشی بەسەر چوار دەوڵەتی موسوڵماندا بەشکراوە، بۆیە ململانیٚ نەتەوەییەکەی لەگەڵ سیٚ نەتەوەی موسوڵمانی تردایە، خۆ ئەوانیش نابیٚ بۆ کورد ئەوسیٚ نەتەوەیەی دی لەخۆیان بکەن کە نەوتێکی بێشومار لەو وڵاتانی دونیادا هەیەو سێیەمیشیان- تورکیا- خاوەنی ناوچەیەکی ستراتیژی وایە کەئەدەلمەزراندنیەوە خۆڕاناییەکان کردویانەتە سەنگەری پێشەوە لەڕووبەڕووبوونەوەکەی یەکێتی شۆرەوی جارانیاندا، بنکەیەکی سەربازی بۆ هەر کێشەیەك کەلەناوچە نەوتییەکەدا بەرپابێ. لەلایەکی تریشەوە دەسەڵاتدارانی نەتەوە سەردەستەکان چەندین بڕوبیانوو بۆ لێدانی کوردی موسوڵمان دێننەوە، وەك لەم کتێبەدا هاتووە تورك پەندێکی هەیە دەڵێت: "کورد بەڵەدەر کافرێك

موسوڵمانە". لەعێراقیشداو لە ٨ی حوزەیرانی ١٩٦٣دا، زەعیم سدیقی ئامیر لیوای سەربازگەی سلێمانی ئەو دەمەنگانێکە کەسەربازەکانی بۆ قەدەغەکردنی هاتووچۆی ڕۆژی دواتر ئامادەکردبوو، پێیڕاگەیاندبوون، کە کورد ئاگرپەرستەو فەڕی بە سەر موسوڵمانەتیەوە نیەو، دەوای لێکردبوون کەبەهیچ جۆرێک دەستیان لێ نەپارێزن و بەچاکی پێڕەوی فرمانەکانی بکەن.

ڕاندال لەشوێنێکی تردا لەمەوڵی ڕێکخراوە جیهانییەکانی مافی مرۆڤدا دەنووسێت "... ئەم ڕێکخراوانە لەساڵی ١٩٩٦دا هەوڵێکی بێهوودەیان دا کەوەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بەجێبەجێکردنی بەندی ٥٠٢ی یاسای یارمەتیدانی دەرەوەیان قایلبکەن، کەتەنیا لەبارێکی تایبەتی ئاسایدا نەبوایە نەدەبوا چەک بەو وڵاتانە بدرێت کەمافی مرۆڤ پێشێلدەکەن..." بەداخەوە دەوڵەتان، ئەو مافانە بەبەرژەوەندی خۆیانەوە دەبەستنەوە، هەرچییەک لەگەڵ نیازی خۆیاندا بلوێت بەپێشێلکردنی دانانێن، جا با بەهەزاران مرۆڤیشی تیادا لەناوبچێت، کامەشیان وابنێت ئەوا دەمەژڵی پێشێلکردنی ئەو مافانەیان بۆ دەکوتن. گوناهی ئەوەش لەئەستۆی ڕێکخراوەکاندا نییە، چونکە ئەوان تەنیا ئاشکراکردنی پێشێلکردنەکەو پێداگرتن بۆ پەسواکردنی پێشێلکەرانیان لەسەرە، بۆیە دەوڵەتێک کەبەڕاستی بەرگری لەمافی مرۆڤ بکات، پێویستە هەموو توانای خۆی بۆ بەدەنگەوەچوونی ئەو ڕێکخراوە سەربەخۆیانە بخەگەڕێنات. ئێستا چەندین ڕێکخراوی جیهانی هەن کەئاڕاستەیەکی باش سەربەخۆیی خۆیانیان سەلماندووەو ڕاپۆرتەکانیان لە دونیادا بایەخی خۆی هەیە. یەکێک لەبەندە سەرەکییەکانی جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤ –یەکسانییە– "خەڵکی هەموو بەسەربەستی لەدایک دەبن و لەمافو سەربەرزیدا یەکسانن و، هەموو بیروهۆش و ویژدانیان پێبەخشراوە. بۆیە دەبێ بەگیانێکی برایانە ڕەفتار لەگەڵ یەکتردا بکەن". -بەندی یەکەم. جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤ- کەواتە هەموو ئەو دەوڵەتانەی مۆری جاڕنامەکەیان کردووەو خۆیان پێوەست بەپاراستنی ئەو مافانە کردووە کە لەجاڕنامە جیهانییەکەدا هاتووە، گەر لەڕووی ڕەوشتیشەوە بێت، بەرامبەر بێدەنگییان لەئاست ئەو پێشێلکردنە زۆرانەی لەگەلانی چەوساوەو ژێر چەپۆک دەکرێن، کەنەتەوەی کورد سەرتۆپیانە، بەرپرسیار نابن؟

ئەو هەموو قات و قڕییەی بەدرێژایی مێژوو لەکورد کراوە، کەس بەڕاستی لەسەری هەڵی نەداوەتێ و، بێجگە لەدەوڵەتانی ناوچە، کەئەوانیش لەپێناو بەرژەوەندی خۆیاندا بۆ دوورخستنەوەی کێشەکە لەخۆیان "ئاگرەسووره لەخۆم دووره" و گەمژەکردنی دراوسێکانیان پێوەی، کەهەمیشە لەگەڵ یەکتریدا ناتەبا بوون، زۆربەزۆر دەستیان خستۆتە کاروباری کوردەوە، ئەگینا ڕاندال وتەنی "بۆیەکەمجار لەم سەدەیەی مێژووی کورددا، هێزەکانی دەرەوە لەبری کورد

دەست لەکاروباری کوردستان وەردەن)) ئەم دەستێوەردانە وابۆ ١٠ ساڵ زیاتر دەچێت لەئارادایەو، کورد سەرەتا، واتە لە ڕاپەڕین و دوای ڕەوەکەو گەڕانەوەو کشانەوەی دەزگاکانی ڕژێم، لەبەشێکی زۆری کوردستاندا بەرەی کوردستانی دەسەڵاتی گرتەدەست و بۆشاییەکەی پڕکردەوە، کورد بەهۆی ئەو چەکە زۆرەی سوپا بەزیوەکەی عێراق لەناوچەکەدا بەجێی هێشت، بەزۆری چەکداربوون و پارتە سیاسییەکانیش کەوتنە خۆسازدان و دروستکردنی میلیشیا، ئەگەرچی باری ئابووری و کوردستان لەو ڕۆژگارەدا ڕۆچووبوو. بەڵام کورد ئەوەندە دڵی ئەو بارەی دوور لەڕژێم تەباییەکەی نێوان حیزبە کوردییەکان خۆشبوو بەرگەی زۆر لەوە ناهەموارتریشیان دەگرت. خۆ کەمپاری هەڵبژاردنی پەرلەمان درا هێند بەپەرۆشەوەخۆیان بۆ ئەو ڕۆژە ئامادە دەکرد کەلەگەڵ ئەو کەمو کورتیانەی تیاشیا ڕوویدا بووە ڕۆژێکی مێژوویی کوردی باشوور. بەوپێیە ڕاندال وتەنی کورد دەوڵەتێکی ژێر بەژێری هەبوو؛ دەسەڵات کەوتەدەست هەردوو لایەنەکەی کەزۆرترین دەنگیان لەهەڵبژاردنەکەدا بەدەستهێنا و تاڕادەیەکیش ژمارەی دەنگەکان لەیەکترییەوە نزیکبوون و، بەهۆی ئەو ڕێژەی سەدی (٥٧)ی وەک مەرجێک بۆچوونە پەرلەمان دانرابوو نوێنەری هیچ حیزبێکی دی نەچوو، پەرلەمانەکەوەو ئەوانیش دوای بگرەو بەردەیەکی زۆر بە پەنجا بەپەنجا پەرلەمانەکەو حکومەتیان بەڕێوەبردو پێنج نوێنەری لیستی ئاشووریش بۆ پەرلەمانەکە دەرچوون. شارو شارۆچکە کوردییەکان، بەبوونی ئەو هەموو چەکەشەوە تا پاش هەڵبژاردنەکەی ساڵی ١٩٩٢ تاڕادەیەک بەئارامی مانەوە، بەڵام ئاکۆکییەکان وورده وورده سەریان هەڵدا؛ سەرەتا چەند سووکە پێکدادانێکی نێوان میلیشیای حیزبەکان سەریان هەڵدا، کەهەمیشە یەکێک لەدوو پارتە سەرەکییەکە لایەنێکی شەڕەکە بووە. پاشان لەیەکەم ڕۆژی ئایاری ١٩٩٤ەوە شەڕی نێوان هەردوو لایەنەکەی خاوەن پەرلەمان و حکومەت دەستیپێکرد، بەوەش کۆنە برینی جەستەی کورد دیسانەوە دەمیکردەوەو ئاواتە مەزنەکانیشی شەڵتانی خوێنکراو؛ بیانووی لەبارێش بۆ دەستێوەردانە ناهەموارە هەمیشەییەکانی دەوڵەتانی ناوچە ڕەخسا، ئیتر لەو ڕۆژەوە هەریەک لەو دوولایەنە تادەهات لەیەکدی دوورو لەدەوڵەتانی ناوچە نزیکتر دەکەوتنەوەو، ئەوانیش ڕاستەوخۆو بەئاشکرایانەتر کەوتوونەتە پیلان ئانەوەو گیانی ئەو کوردە نەیارانەی کەپەنایان بۆ ئەو بەشەی کوردستان هێنابوو. هەموو خەڵکی کوردستان بەگشتی و پارت و ڕێکخراوە سەربەخۆکان و زاناو ڕۆشنبیرو نووسەرو دڵسۆزانی کوردی ناوەو دەرەوەش بەتایبەتی، هەوڵی زۆریان بۆ ڕاگرتنی ئەو کلۆڵییەدا کەلەدێر زەمانەوە یەخەی کوردی گرتووەو لێی بۆتە شەڵی شەڕو بەهیچ جۆرێک یەخەی بەرنادا، بەڵام سوودێکی ئەوتۆی نەبوو، مێژووی برایانی بابان لەقاڵبێکی ترو بەناوێکی

ترەوەو مۆدێرنانەتر دووبارەبووەو گۆڕیان بۆ زیندەبەچاڵکردنی ئەم هەڵمەش خۆشکرد، بەڵام بارودۆخی ناوچەکەو دیمەنی پەلەقاژەو هاواری مەرگەساتی ڕەوە مێژووییەکەو چەند هۆیەکی دی کەلەم بەرهەمەدا باسکراون، ڕێی هێنانەدی گۆڕەوشارکردنەکەیان گرت. شەڕوشۆڕی نێوان ئەو دوولایەنە سەرەکییە بەرادەیەک ناهەمواربوو کە مەسعود بەرزانی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان، لەشوباتی ١٩٩٦دا لەچاوپێکەوتنێکی ڕاندالدا، کەخۆی لەم کتێبەدا باسیکردووە، وتوویەتی: ((شەڕوپێشێلکردنەکانی مافی مرۆڤمان زیانێکی وایان بەکێشەی کورد گەیاند کەلەباسکردن نایەن، من لەبینینی دۆستە بیانییەکانماندا ئەوەندە شەرمەزارم لەپێشوازیکردنەکەی ئۆزدا دوودڵ بووم)). ((مانیا موفتی)) ش کەئەوکات لەڕێکخراوی لێبووردنی گشتی نێو دەوڵەتی -ئەمنستی ئەنتەرنەشیناڵ- بەرپرسی فایلی عێراق بوو، لە ٢١ی تەمووزی ١٩٩٤دا لەدوا سەردانی کوردستانیدا، لەبارەگای "لیژنەی سلێمانی - ڕێکخراوی مافی مرۆڤ لەکوردستان" لەو بارەیەوە وتی: "من پێموایە کارەکە زۆر پەرە لەخراپبوونەو ئەوەی لێرەکراوە بەبیەمدا ئەنجامدات ڕوویدا، هەر لەدیلکوشتنەوە بیگرە تا هەڵکوتانە سەر ماڵ‌و دەستگیرکردنی ئەندامانی یەکتر دەستبەسەرداگرتن‌و تاڵانکردنی بارەگای یەکتری‌و ... زۆرکەس هەیە بەراورد لەنێوان ئێستاو ڕژێمدا دەکەن‌و دەڵێن: ئێمە حاڵمان لەوانەی ژێر دەسەڵاتی ڕژێم باشترە، ئەوە ئیە سەرپەستانە ڕای خۆمان دەربەبڕین- بەڵام ئەگەر حاڵ بەمجۆرەی ئێستا پیادەبکرێت، ئەوا من ئەپەرلەمان‌و ئەحکومەت بەدەستکەوت نازانم بۆیە بەرامبەر دوارۆژی کورد زۆر ڕەشبینم. من کە کورد نیم‌و ئەتەوەیەکی ترم ڕێزی کوردم زۆر لایەو لاشبووە، بەڵام سەرکردەکان بەرامبەر بەخۆیان گەلەکەشیان ئەوەی بەبێیدا ئەنجامدات کردیان... من لەگەڵ هەردوو سەرکردەکەدا دانیشتووم، کاک مەسعود نکوڵی لەوە دەکات کەهیچ دیلێکیان کوشتبێت، مام جەلالیش دەڵێت هەردوولامان کردوومانە .. پێموواتن ئەی کەواتە گەر بەکردەوە مافی مرۆڤ ناپارێزن پێویست ناکات ئەوەندە باسی بکەن، چونکە ئێوە سەری زمان‌و بنی زمانتان هەر باسی پاراستنی مافی مرۆڤەو کەچی بەکردەوەش والنییە ... ئێمە پێمانوایە ئەو پێشێلکردنانەی لەم دواییانەداکراون دەبێت بڵاوبکرێنەوە، ئەگەرچی هەندێک بڵاوکردنەوەکە کار لەکێشەی کورد دەکات بەڵام هەردەبێت بکرێت چونکە سەرکردەکان هیچ بەڵێنێکی خۆیان نابەنەسەر، چەندین بەڵێنیان دا کە هەوڵی نەهێشتنی ئەو پێشێلکردنانە بدەن کەچی بێسوودبوو، بۆیە پێویستە ئێمە ئەوانە بڵاوبکەینەوە تا لەڕێی دۆستەکانیانەوە کاریان تێبکەین‌و ئەو شێوازەیان بگۆڕن". ڕێکخراوی ئاوبرلو لەشوباتی ١٩٩٥دا ڕاپۆرتێکی ١٧٨ لاپەڕەی دەکردو لەئەیلولی هەمان ساڵیشدا کرا بەعەرەبی‌و لەکتێبێکی ١٧٨ لاپەڕەییدا بەناوی ((نقض العهود واهدار حقوق الانسان في كردستان

– العراق)دەرکەوت، تیایدا زۆربەی پێشبینیکردنەکانی ئەو ماوەیەی تیابڵاوکرابۆوە. دەسەڵاتدارانی هەردوولای خاوەن پەرلەمان و حکومەت، هەروەها خۆشیان دانیان پێدا ناوە بەهۆی شەڕەکەیانەوە، کە وەک لەم بەرهەمەشدا هاتووە کورد ناوی- شەڕی خۆکوژی- لێنا، گەلێک کاری ناڕەوایان بەرامبەر بەکێشەی نەتەوەکەیان کرد، بۆ یەکلاکردنەوەی ناکۆکییەکەی نێوانیان پەنایان بۆ لەشکرکێشی دەوڵەتانی ناوچە دەبرد، کەلەهەموویان ناهەموارتر پەنابردنە بەر رژێمی بەعسی بەغدا بوو. سەرئەنجام شەڕەکە بەدروست بوونی دوو پەرلەمان و دووحکومەت و دووبەڕێوەبەرایەتی لەو بەشەی کوردستاندا شکایەوەو کارلێکارییەکی زۆریشی بەسەر ناوچەکانی شەڕدا هێنا. ناکۆکییەکەی نێوانیشیان تا ئەمڕۆشی لەسەرێت، بۆتە هۆی ئەوەی کەهیچ کامێکیان لەبەشەکەی ژێر دەسەڵاتی خۆیدا ناتوانێت بنەمای کۆمەڵگایەکی شارستانی دابمەزرێنێت و پێڕەوی یاسای تیادا بکرێت و کارێکی واشبکرێت کەمیلیشیاو چەکدار کەمبکرێتەوەو، پارت و رێکخراوە سیاسییەکانیش، بەهەردوو لایەنە سەرەکییەکەشەوە بەرەو بەتێکۆشانی سیاسیانە بچن و بەرێگای دانوستان و راگۆڕینەوە کێشەی نێوانیان چارەسەر بکەن و، لەماوەی دیاریکراوی یاساییانەدا هەڵبژاردن سازبکرێت و سندوقی دەنگدان ببێتە سەنگی مەحەک، ڕووی گەشی شارستانێتی ئەو نەتەوەیەش بکرێتە نموونەو نیشانی دونیا بدرێت کە کوردیش شایستەی هەموو ئەو مافانەن کەبەنەتەوەکانی دونیا ڕەوا بینراون.

لەحوزەیرانی ٢٠٠٠دا بۆ چوارچێوەی چاپکردنی ئەم وەرگێڕانە، لەپاریس سەردانی دووسەرهانکردو، لەبارەگای ئەنستوتی کورد سەبارەت بەناوەڕۆکی کتێبەکەو زیادکردنی بەشێکی نوێ بۆ ئەم چاپە کوردییە دواین. پاندال بەشە نوێیەکەی بەبۆنەی سەدەی نوێوە ئامادەکردبوو، ئێمەش ناوی " سەدەی بیست و یەکەم و کێشە ئاڵۆزەکەی کورد"مان لێنا. لەم بەشەدا پاندال بەپێی ئەو گۆڕانکارییە گرنگانەی بەسەر باری ئەو دەوڵەتانەی کوردستانیان بەسەردا دابەشکراوە دەچێتەوە، ڕفاندنە ناهەموارەکەی ئۆجەلان لەلایەن هەواڵگرانی تورکیاو ئەمەریکاو چەندین دەستی تر، جێگانەبوونەوەو وەرنەگرتنی بەپەنابەرێکی سیاسی لەهیچ وڵاتێکی ئەورووپادای پێشاتری و گوشاری ئێستایان لەسەر تورکیا تا دان بەبوونی کورددا بنێت و بەستنەوەی وەرگرتنی لەیەکێتی ئەورووپا بەو مەرجەوە، هەڵوێستی حیزب و سیاسەتمەدارانی تورک لەئاست ئەو کارەداو هەڵبژاردنی سەرۆک کۆماری نوێی تورکیا. سەرکەوتنی ڕەوتی چاکسازان، بەسەرۆکایەتی خاتەمی لەئێرانداو دوارۆژی کورد لەو وڵاتەدا. مردنی حافز ئەسەدی سەرۆکی سووریاو کاری لەبارەی کێشەی کوردی لەسووریا، بەتایبەتی دوای بەسەرهاتەکەی ئۆجەلان. لەکوردستانی باشووریشدا خۆبەستنەوەی هەردوو حیزبی ناکۆک

بەرێکەوتننامەکەی واشنتۆنەوە نوێ نەبوونەوەی شەڕی نێوانیان، ئەگەرچی هێشتا هەنگاوی کردەی وا بۆ جێبەجێکردنی خاڵە سەرەکییەکانیش نەنراوە. ڕۆڵی ئەمەریکاو وڵاتانی ئەورووپاش لەکێشەی کورددا. سەری دێر خوێنەری ئازیز، سەرەتای ساڵی ١٩٩٩، کاتێک برای بەڕێزم "دکتۆر خەسرەو شاڵی" پێزۆکەی وەرگێڕانی ئەم بەرهەمەی لا درکاندم، بەڵێنمدایە لەو ڕووەوە هەر یارمەتییەکم پێبدرێت دریغی نەکەم، ئیتر لەشوێناتی ئەو ساڵەوە شاندایە بەرو.

دکتۆر بۆخۆی دەڵێت کە- وەرگێڕانەکەی بەبێ "تەسەڕوف" کردووە -منیش لەداڕشتنەوەکەیدا هەوڵمداوە هەر وەک ئەو بکەم، کاتێک هەمووشیم بەکۆمپیوتەر تایپکرد، بەم پێشەکییەشەوە، دامەوە تا پیایدا بچێتەوەو ڕای خۆیم سەبارەت بە داڕشتنەوەکە پێبڵێت، بێجگە لەچەند هەڵەیەکی چاپ و هەندێ ڕستە ئیتر بەهەمووی ڕازیبوو، لەگەڵ ناوەڕۆکی ئەم پێشەکییەشدا هاوڕابوو.

بەهیوام بەم کارەمان توانیبێتمان یەکێک لەو بەرهەمانەی پێویستبوو لەکتێبخانەی کوردیدا هەبێت خزمەتێکی پچووکمانکردبێت، خوێنەری بەڕێزیش لەو هەڵە چاپانەی بەسەرماندا ڕەتبووە دڵنیام کاتی خوێندنەوە بەئاسانی هەستی پێدەکات، بمانبەخشێت.

صالح محەمەد ئەمین

ئەیلولی ٢٠٠٠ – هۆڵەندا

# پێشکەشە بە

جنیفیفاو جولی‌و فەریدکیونی‌و ئەو برادەرانەی دی کە گیانیان لەدەست داوە لەناوماندا نەماون‌و زۆربەیان کوردن، بە "کۆرت سەخورک" کەلەساڵانی ١٩٩١ – ١٩٩٢ دا ڕووداوەکانی کوردستانی عێراقی بۆ ڕۆیتەر دەرئاردو، لە ئایاری ٢٠٠٠دا کوژرا. (١)

جوناتان سی ڕاندال

دوای زانینێکی وا چۆن ئێوەردنێک! بیربکەرەوە، مێژوو گەلێک ڕاڕەوی جوانکاری تێدایەو بە چرپەو خواستەکانیشی دەمانخەڵەتێنێت‌و، هەر بە چۆڵەوانیمان دەگەیەنێت. بیربکەرەوە نە ترس‌و نەئازایەتی نامانپارێزن ...

ئاوانە نارەواو نائاساییەکانمان دەکەینە باوکی پاڵەوانێتیمان. ئاوانە پڕ لە شەرمەزارییەکان خۆهەڵکێشانی بەسەرمانا سەپاندووین .. ئەمانە فرمێسکی درەختێکن بەرەکەی سۆزێکی پڕ ستەمە ..

تی. ئیس. ئیلیۆت

پەندی پێشینان

(١) نوسەر لە ١٧ی حوزەیرانی ٢٠٠٠ دا ناوی ((کۆرت سەخورک))ی زیاد کرد.

(١)

# ئاگاداری کەس و کارت کردووە

**جار هەیە ساتەکان بەخورپەن، وەك یەکەم هەنگاوی گەشتی ناو بیابانێك بەزو هاتبێتنە سەر ڕێی کەسانێك کەلەکۆنەتەکیەکی شارستانی پێشکەوتوودا چاویان بەدونیا هەڵهێنابێت..**

**گیرترود بیل. بیابان و بینراو ١٩٠٧**

نیوەڕۆیەکی بێگەردی مانگی ئابی ساڵی ١٩٨٦ لەکەناری خولڕووی "مارکاس فاینیارد"ی تا ڕادەیەك چۆڵدا، کەلەگەڵ هاوسەرە بەگومانەکەم پەیتا پەیتا پێکە شەرابی بێ ڕەنگمان بۆ یەکتر پڕ دەکردەوە، بیرۆکەی نووسینی کتێبێکم سەبارەت بەکوردو کوردستان بۆهات، تا ئێستا ئەو قسەیەم لەگوێدا دەزرینگێتەوە کەپێم وت: بیرۆکەی تیشکخستنە سەر ئەوڕینێکی بێکراوی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستم لەمێشکدایە، گەشتێکی لەسەرخۆی سەدەی نۆزدەیەم ئاسا بۆ وڵاتێکی نەبوو، سێ مانگێك بەناویدا بگەڕێم و سێ مانگێکیش لێوەی دوور ... ئەوە هەر بیرۆکەی سەیرانێك بوو .. ڕاستییەکەی دەبوایە زانیاریباشترم لەو ڕووەوە هەبوایە، چونکە بەداخەوە زۆر کەمم لەبارەی کوردەوە دەزانی، زانیاری واش لەناو خۆرئاواییەکاندا کەمن. دیارە یەکەم ئاشکردنەوەم لەگەڵ کورددا زۆر دڵخۆشکەر نەبوو، چونکە کاتی پەیامنێرێتی "واشنتۆن پۆست"م لەبیروت، چەند ڕووداوێکی توندوتیژی ڕاستەوخۆ ئارەزووی ئەو کارەیان بزواندم .. سەرەتای دەستپێکردنی شەڕی ناوخۆی لوبنان، واتە ساڵی ١٩٧٥، چەکدارانی کورد کەمپشینۆیەکی کاتی بەرگی "ماو"[*] یانەیان لەبەرکردبوو، بەزۆر نووسینگەکەمیان پێ چۆڵکردم. مەبەستی ئازاردانی منیان نەبوو، تەنیا لەبیرنەوەبوو کە من لەو دەوروبەرەدا کەوتبوومە ناو شەڕێکەوە. هەرچیم هەبوو لەدەستمدا، لەوەوە ئیتر وام لێهات هەتا هەتایە

---

[*] مەبەست ماوتسی تۆنگە (١٨٩٣ - ١٩٧٦) سەرۆکی پارتی کۆمۆنیستی چینە لەدژی ڕژێم سەرکردایەتی شۆڕشی کەدەکەیکرد لەساڵی ١٩٤٩دا، سەرکەوتنی تەواوی بەدەستهێنا. (وەرگێڕ)

حەزیەبوونی هیچ شتێك بۆ خۆم نەكەم. هەر چەند مانگێكیش دوای ئەوە بەچاوی خۆم كوردو فەلەستینی و شیعە لوبنانیەكانم بینی كە میلیشیا دیانە ماڕۆنییەكان، بەزەبری چەك لەو خانووە پەڕپووتانەی كۆنە گەڕەكێكی وێرانەی بەیروت دەریانكردن، ئەویش هەر بۆئەوەی كەس لەدەوروبەری بارەگاكانیاندا نەمێنێ.. دواتریش لەو ئێوارەیەی ساڵی ١٩٨٢ دا كەئیسرائیل لوبنانی داگیركرد، بڕە كوردێك كەپێشەچوون پاسەوانی چەند نەناسراوێكبن، ماڵی برادەرێكمیان بە "ئار.پی.جی" كاولكرد، كەلەلای خۆی جێگەی بۆ دابینكردبووم و، منیش سەبارەت بەكێشەی ئاڵۆزەكەی لوبنان خەریكی نووسینی كتێبێك بووم.. تا قووڵتر قسە لەناسینی كورد بكەین، دەكرێ بۆ پوختەی چەند وتەیەكی ئاسایی بگەڕێینەوە: سەدەیەك بەرلەئێستا ئەورووپاییەكان كوردستانیان وەك خۆرئاوا دەرگەی ئەمریكا، بەچەپەكەو ترسناك دادەنا ((راستیەكەی "كارل مەی" كەنووسەرێكی بەیەلاوو بەناوبانگی ئەڵمانیاو داهێنەری چیرۆكی سەرەڕۆیی بوو، سەبارەت بە گاوانەكان "كاوبۆی"و هندییەكان، وەك ئەو بە -دڕترین كوردستان- ناویان دێنێ و، لەسەر زاری "كەمتۆنی ترۆلۆپ" ی پاڵەوانێكی رۆمانی "دەتوانی لێی ببووریت؟"دا كەساڵی ١٨٦٤ دەرچووە، باسی كوردستان بەشوێنێكی زۆر دوورو چەپەك دەكات).. یەكێك لەچواردە خاڵەكەی سەرۆك "وودرو ویلسون"ی سەردەمی یەكەم شەڕی جیهانیش، قسە لە پەیمانێكی دەومۆزگۆی دەكات كەدەوڵەتێكی سەربەخۆ لەجەستە داتەپیوەكەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بۆ كورد دابڕێژێت، بەڵام لەئەنجام، توركیای نوێی مستەفا كەمال ئەتاتورك ڕەتیكردەوە. پێشتر هەر ئەوان كوردیان لەدژی یۆنانییەكان بەكارهێناو، كەچی دوایی سەرجەم ئاواتە نەتەوەییەكانیان لەگۆڕنان. ئینگلیزەكان كەلەلایەن كۆمەڵەی نەتەوەكانەوە ئەركی ئاوسنووری وڵاتی عوسمانییان بەرەوپێشكراوبوو، لەپێناو بەدیهێنانی ئەو دەوڵەتەی كە "عێراق" یان پێدەوت، لەسەر بەرەنگاربوونەوەی ئاواتە نەتەوەییەكانی كورد سووربوونو بڕیاری دەستبەسەراگرتنی هەموو ناوچە نەوتییەكانیشیان دابوو كەكورد بەهی خۆی دادەنا، بەزۆرو بەخوێنڕشتن بەدەوڵەتی عێراقیانەوە، كەتازە لەژێر دەستەڵاتێكی كەمایەتی "سونی" عەرەبدا دامەزرێنرابوو لكاند.

ئەوكاتە هەموو دەوڵەتەكانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست ملكەچی بۆچوونەكانی خۆرئاوا بوون كەدەبێت بۆ لەناوبردنی شۆڕشە یەك لەدوای یەكەكانی كورد، دەوڵەتی نەتەوەیی ناوەندی مۆدێرنیان هەبێت و، هەركاتیش پێویستیكردبو مەترسی لەیەك نزیكبوونەوەی سەركردە كوردەكان لەئارادابوو، ئەوا لەسنوورە دروستكراوەكانی نێوان خۆیاندا ئیشی بۆ بكەن.. جا لەبەرئەوەی كورد چوارەمین كۆمەڵەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بوو هەروەشە، كەڕەنگە هەر

ئەوانیش خەلات نەکرابن و، کەسیش نکوڵی ئەوەی پێناکرێت، کەکورد گەورەترین ڕەگەزی مرۆڤایەتییە دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی نەبێت .. دەسەڵاتدارانی ناوچەکەش هەمیشە ترسیان لێیان هەبووە، بۆیە هیچ سەرژمێرێکی باوەڕپێکراویان نەکردووە، دەیان ساڵە ژمارەیان هەر دەخەمڵێنرێ و لەباشترین باریشدا بە ٢٥ ملیۆن دادەنرێن و، ڕێگەش بەدەرەوە نادەن کەلەوە بپرسنەوە. لەبنەڕەتدا خەڵکی دەری ناوچەکە، دەبوا لەئاست ئەو هەموو سامانە زۆرەی بەفیڕۆ بۆ نەتەوەیە فەلەستینییەکان خەرجکراوە، ئەویش لەکاتێکدا کە کورد لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا، بەڕاستی دەستکورتەر لەنەوتی خۆی بێبەشکراوە، لەیەکێک لەو وڵاتانەی تیایدا دەژی بەتاوڕوەیەکی کەم ژیان بەسەر دەبات و، لەیەکێکی دیاندا ڕێی بەکارهێنانی جل و بەرگی نەتەوەیی نادەن و، لەسێیەمیشیاندا، تەنانەت بەکارهێنانی زمانی خۆشیان لێ قەدەغە کراوە، بگرە کەم و زۆر لەهەموو شوێنێکدا بەشی هەرەزۆری ماڵ مەدەنی و مرۆڤایەتییان لێزەوتکراوە، سەرەڕای، کورد، سەرۆکی دەوڵەت هەرکەسێک بووبێت بەردەوام بەرگری لەماڵ خۆی کردووەیەکەم بۆردوومانی فڕۆکە لەجیهانی سێیەمدا لەوانکرا، ئەمە سەرەڕای بەکاری ژەهراوی لێدانیان و ڕیشەکێشکردنی ژیانی کۆمەلایەتی ناو گوندەکانی عێراقیان، لەناو تورکیاشدا گوندەکانیان بەکۆمەڵ کاولکردوون و خەڵکەکانیشیان بەلێشاو بۆشارەکانی خۆرئاوای ئەو وڵاتە ڕاگوێزراون، لەئێرانیشدا سەرۆکەکانیان خافڵگیر کردوون و لەناویانبردوون. لەکانوونی دووەمی ١٩١٩ دا هێزی ئاسمانی شاهانەی "R.A.F" بۆردوومانی کوردی کردووە، کەوەک زانراوە ئەوە یەکەمجار بووە شۆڕش بە بۆردوومانکردن سەرکوت بکرێت، پێنەچێ لەمێژشی پیاوەیی سەربازیانە هەرزانتر کەوتبێتەوە بۆیە هەر لەو ساڵەدا، لەکۆتایی جەنگی بەریتانیای ئەفغانستاندا، هەمان هێزی شاهانەی بەریتانیا "R.A.F" کەبنکەکەی لەهندستان بووە، شارەکانی ئەفغانستانیان بۆردوومانکردو میر "ئەمانوڵا" یان ناچارکرد داوای ئاشتی بکات. "ونستون چرچل" وەک وەزیری "وڵاتانی بندەست - مستعمرات" لەساڵی ١٩٢١ دا بەرەیمی "R.A.F"ی لەجێبەجێکردنی پاسابی و ڕێسایی ئەو بەشانەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستی ژێر ئامۆژگاری بەریتانیا بەرپرسیارکرد. "ئارتەرهاریس" کەئەفسەرێکی هێزی "R.A.F" بوو لەعێراقدا، چونکە لەجەنگی جیهانی دووەمدا دڵڕەقبووەو بەخەستیش بۆردوومانی شوێنە مەدەنی و سەربازییەکانی ئەڵمانیای کردووە، ناوی "هاریس بۆردومان"[٢] ی بەسەردا بڕا.

ئەو کوردانەی لەشارەکانی بەغداو شام و ئەستەنبوڵ یان تاراندا دەژین، هەرچەندە ژیان بەگشتی لەم شارە جیهانیانەدا بەرەبەرە خەریکە ڕەونەقە تایبەتیەکەی خۆی نامێنێ، کەچی

---

[٢] وەک لەئێستادا هەمیشتاکانەدا ناوی "کیمیاوی" بەسەر "عەلی حەسەن مەجید"دا دابڕا. (وەرگێڕ)

ئەوان هەریەکەیان باخچەیەکی کوردانەی لەدڵیدا پێکەوەناوەو یەکبینەش خەریکی پەروەردە کردنێتی. وەچەیەک لەمەوبەر رۆژنامەنووسێکی فەرەنسایی بۆ نووسیم، سەری لەوە سووڕمابوو، کەلەشەڕی کوردستانی عێراقدا وەرگێڕێکی گەنجی پەروەردەی بەغدای ناسیوە، کوردی زۆر کەم زانیوەو کەچی لەسەر کوردێتی خۆی سوور بووە، هەرچەندە واشی پێوەدیار نەبووە، بەڵام بەشێوەیەک جەختی لەهەست بەکوردێتییەکەی خۆی ڕادەگەیاند کەچارنییەو دەشبێ وابێت. منیش بۆخۆم سەرم لەبەهێزیی و پتەوی بنەما نەتەوەییەکەی لاوێکی کوردی تورکیا سووڕمابوو، کەلەقسەکردن و نووسین و خوێندنەوەی تورکیدا هەرچی گرفت بێ نەیبوو کوردیشی بەئاستەم دەزانی و کەچی لەپێناو کوردستاندا ئامادەبوو خۆی بەختبکات. کورد وایە جا بالەتوسکالیاشدا بژی..

دەڵێن مێژوو سەرکەوتووەکان نووسیویانەتەوە، ئەمەش وا دەگەیەنێت کەدوژمنانی کورد مێژووەکەیانی نووسیبێتەوە. بەڵام لەچاکەی چیاو بەرینی دەشتاییەکانیانەوەیە کە کورد هێندە لەناوەندی هێزە سەرەکییەکانی "قوستانتینیەپۆل – ئەستەنبوڵ" و تارانەوە دووربێت چارچارە هەست بەئشادی و ئازادی بکات و زۆر بایەخیش بەهێزی ئاغاکان نەداتو پێشی وابێت کە گرنگییەکەیان پوو لەنەمانە...

پێش شەڕی یەکەمی جیهانی و لەرۆژانی کەوتنە لێژی گلۆڵەی ئیمپراتۆریەتە لەرزۆکەکەی عوسمانیدا کەزۆربەی کوردی تیادا دەژیا، هەستی نوێی نەتەوایەتی کوردو عەرەب بزواو هەرچەندە پەرۆشی کورد بۆ سەربەخۆیی لەناخیدا چەسپیبوو بەڵام لەگەڵ بنەما ڕامیارییەکانی هاوپەیمانانیدا نەدەگونجا، ئەمان لەسەر مەرجی مانەوەی کورد بەپەرتکراوی سووربوون. کێشەی کورد لەم سەدەیەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا، گەر ترس و زۆر لێکردن و داپڵۆسینە بێوێنەکەشیان بەلاوە بنێین هاوتای نییە، شتەکە وا کەوتەوە ئازارو دەستێوەردانی هێزە دەرەکییەکان، کەهەر لەدراوسێ ڕاستەوخۆکانیانەوە بیگرە تا دەگاتە ئیسرائیل و بەریتانیاو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زیادیکردو بەشدارییان لەوەدا هەبوو، کەچی کوردستان بەو هەموو سەرچاوە ئاوە زۆرەیەوەو، لەخۆرهەڵاتێکی تینووی ووشکانیدا، بەو هەموو سەرچاوە ئاوە زۆرەیەوەو، لەخۆرهەڵاتێکی تینووی ووشکانیدا، بەو هەموو سامانە نەوتەی تیایدایە، هەر بەپەرۆزی، یان وەک هەندێ کورد دەڵێن: هەر بەنەگبەت ماوەتەوە..

تۆماری کورد سەرتاپا شۆڕشی ئەپسارەو سزای بێ وێنەی سەدەی ڕابردوو بووە. جێی داخە کەکورد جۆشی ڕێکخستن و سەرکردایەتی کاریگەری نەبووە. لەسەردەمی کۆیتەو جۆرە چەکی نوێی دژبە شەڕی پارتیزانیدا ئەوان هەر پەندە نایابەکەی خۆیان هەبوو کەدەڵێت: "کورد

لەچیاکانی بەولاوە دۆستی تری نییە"و زۆربەی هەرمزۆری توانا زێرینییەکەی خۆشیان لەدەستدا، چونکە چیاکانیان ئەگەر لەرۆژگارێکدا ناوبانگی کوردستانیان گەیاندبێتە ئەوتکەو لەئاستی وڵاتێکی وادا دلیان نابێت کەشانازی بە خۆیەوە کردبێت ئەوا ئیتر چیدی پارێزگاریان پێنەدەکرا..

بۆ من گەیشتنە کوردستان کەئەوسا پێم وابوو یان دەبێت لەعێراقەوە بێت یان لەئێرانەوە کارێکی سەخت و دژواربوو. پێشتر گەیشتنە کوردستان گەلێ جار گەشتێکی زۆرخایەنی ئوتۆمبێل یان ئەوپەڕەکەی چەند رۆژێکی سواری وڵاخ بوو، بەڵام کاتێک کەمن دەرچووم وڵات نزیکەی شەش ساڵ بوو لەگەڵ یەکتردا شەڕیان دەکرد چارەی بیانییان نەدەویست، بۆیە تورکیا بووە تاکە رێگا، لەوێشەوە ئەگەرچی بەرەسمی رێگا نەبوو، بەڵام بەهۆی راپەڕینی کوردەکانی ناو خۆیەوە کەلەساڵی "١٩٨٤"ەوە بەرپابیوو ئەنقەرەشی ناچاری ناردنی هێزی سەربازی بۆ سنوورە شاخاوییەکانی نێوان خۆیان و عێراق کردبوو، ئەو سنوورانەش بەرەسمی دابخات و پەڕینەوەشیان زەحمەت و پڕ مەترسی بێت. خۆ لە سووریاشەوە زۆری دەویست، چونکە تا خۆت لەپاسەوانانی عێراق و ئەو تەلە دڕکاوییانە دەرباز دەکرد، کەپێش گەیشتنە شوێنی پەڕینەوەکە بۆ بەئاگامێنانەوەی خۆیان دایاننابوون و کەبەئاگاشدەهاتنەوە دەبووە تەقە، دەبوا شەو بەو کەلەکانەی لەکولە مەڕی فووتراو یان چوورپی پڕ لەهەوا دروستکرابوون بە ڕووباری دیجلەدا بپەڕیتایەتەوە ئەمجا دەگەیشتیتە مەبەست. ئەوکاتانە "٥٢" ساڵان بووم، ٢٠ ساڵێکیشبوو پەیامنێری جەنگ بووم بۆیە وام بەخۆدا ڕانەدەپەرمو کەخۆم بخەمە کارێکی واناڵۆزەوە.
سەبارەت بە ئێران، کاتی ڕووخانی شاو سەرەتای کۆماری ئیسلامی چەند جارێک بۆم ڕێکەوت و چووم، بۆیە لەگۆڕێ یان لیستی ڕەشی "ئایەتوڵا ڕووحوڵا خومەینی" نرابووم. خۆ ئەگەر ڤیزەیەکی سێ ڕۆژانەشیان بۆ پەیدا بکردمایە ئەوا بەپێی ئەو ڕۆژگارەی تاران و بەهۆی جەنگی عێراقیانەوە، ڕێ بەهیچ پەیامنێرێکی بیانی نەدەدرا بەرەو کوردستانی ئێران بڕوات. جا چونکە بیرۆکەی نووسینی کتێبەکەم لا چەسپی بوو، بەر لەجێنەهێشتنی "مارتان ڤاین پارە" و بەرەو بنکەی پاریس بوونەوەم، جووتە پۆستاڵێکی ئیتالیانەو چەند پێویستییەکی خێوەت هەڵدانم کڕی ... جاری وا هەیە ئەوەی پەیامنێرێک بیری لێناکاتەوە بێتەرێی، بەخت دەیهێنێت و زۆریشی سوود لێدەبینێت، منیش هەر زوو شتێکی لەوبابەتەم هات بەپیرەوە، یان واسەدەزانی کەهاتبێت، دوای گەڕانەوەی مانگی ئەیلولم بۆ پاریس، دەبینینی "عەبدولڕەحمان قاسملۆ"، کەبەرپرسی سەرکردەیەکی هەڵکەوتووی دیموکراتخوازی کوردی ئێران بوو، شادبووم، بەسەردانێکی چاوەڕواننەکراو هاتبووە ئەورووپا، پێشتر لە سەرەتای شۆڕشی ئێراندا، کەئەوسا

"ئەو" ساڵێک بوو، یەکترمان دەناسی، لەکاتی دۆستایەتییەکەمان دەستپێکردبوو، لە کوردستانی ئێرانیشدا پەرەی سەند، لەوێ، لەکاتی قەدەغەکردنی خواردنەوە لەکۆماری ئیسلامی ئایەتوڵادا، کەوڕیسکی بۆ خۆی و میوانەکانی دادەنا شانازی پێوە دەکرد .. ڕێککەوتین لەکاوەخانەیەکی چەپەکی "لیفت بانک" چاومان بەیەکتر بکەوێت، کەگەیشتمە شوێنەکە، نوێنەرێکی پارتیی خۆی دوای لێبووردنی لێکردەوە بەرەو ئوتومبیلێکی "پیجۆ"ی کۆنی بردم، دوای ئەوەی خولێک بەو ناوەدا سووڕاندمییەوە ئەمجا بردمییە "کلوزیری دیس لیلاس" کە قاسملۆ بۆ خۆی لەوێ چاوەڕوانی دەکردم، ئەوسا ئەو بیرکردنەوەیەیم بەلاوە سەیربوو، بەڵام زۆر پێش ئەو ڕۆژەی ساڵی ۱۹۸۹ی ڤیەننا، کەئەوان ساویلکانە وازیان لەوجۆرە خۆپاراستنە هێنابوو، بەتەنێنی هەردووکیان بەدەست سیخوڕی ئێران خافڵگیر کران، من لە بیرکردنەوەکەی خۆم پاشگەزبوومەوە.

چونکە قاسملۆش، وەک زۆر نموونەی تری نەگونجاوی کێشەی کورد دۆستایەتی حکومەتی عێراقی دەکرد، بۆ وەرگرتنی ڤیزە پێشنیارێکی وای بۆ کردم، کەئەو حکومەتی عێراق قایل بکات من لە لیستە گەورە ڕەشەکەی "سەدام حسێن" دەریهێنێت، تا "لیزەپاس"ێکی وام بدەنێ، پێی بچمە بەغداو بەڵام تیایدا نەمێنمەوە، لەوێشەوە بۆ سنووری ئێران، کارێکی واش بکا بەرەوڕووی تاقمە کوردێکی عێراقیم بکەنەوە کە "جەلال تاڵەبانی" سەرکردەیانەو، نێوانی لەگەڵ قاسملۆدا نەک بەقەدا باشە، ئەوانیش لەڕێگەی خۆیانەوە بەرەوڕووی کۆمەڵێکی کوردی عێراقی دیم بکەنەوە، کەسەر بە مەسعود بەرزانی پارتی دیموکراتی کوردستانەو، قاسملۆ کەمێک لەمیان مەترسی هەبوو، چونکە لەجەنگی ئێران عێراقدا لایەنگری ئەو لایان بوورەو شەڕی لەگەڵ کوردی ئێراندا کردبووەو خوێن کەوتبووە نێوانیانەوە، بەڵام پەیوەندی بەرزانی تاڵەبانی تۆزێک باشتر بوو..

لەبەرئەو هۆیانەو بێگومانی شوێن پێهەڵگرتن لەلایەن عێراقییەکانەوە، کەئەگەر بزیان دەربکەوێت من لەو ڕێو شوێنەی قاسملۆ بۆیداناوم لاەداوە ئەوا لەکوردستان بەزەحمەت دەربازم دەبێت. قاسملۆ چاکی بۆ ڕوونکردبوومەوە کەدەبێت باش لەوە ئاگاداربم کەهەواڵگرانی عێراقی و ئێرانی بۆ هەر کوێ بچم هەنگاو بەهەنگاو بەدوومەوەن، خۆئەگەر ئەوسا بمانزانیبایە ئەم ڕوونکردنەوەیە چەند ڕاستە، کەبەڕاستی عێراق سیخوڕی وای هەیە ڕاپۆرتی تایبەتی وا سەبارەت بەهەموو ئەو شوێنانەی بیانییەکان بۆیانەچن و لێی دەمێننەوە دەدەن، پارەیەکی زۆریش بۆ سەریان تەرخانە، ئەوا ڕەنگە لەئیشەکەم دوودڵ بوومایە.

بەهەرحاڵ ڕۆژی دواتر چوومەوە بۆ "ئۆفیس"ەکەی قاسملۆ لەپاریس، چەند فۆڕمێکی بەڕێکوپێکی و بەوێنەی خۆم و برادەرێکی وێنەگریشەوە پڕ کردەوە. ئاگاداری ئەوەش کرام کە داواکارییەکەم بۆ دەزگای هەواڵگرانی عێراق دەنێردرێت و، هەر ئەوانیش بڕیاردەری ئەوە دەبن کەمنیش شایانی ئەو سەرکێشییەبم. دوای چەند ڕۆژێک، شەو بەشەمەندەفەر چوومە بەرلین، لەکۆنە ئوتێلێکی شاری "کرویزبێرگ" نزیک ئەو دیوارەی شارەکەی بەشکردبوو، ئەو کاتە هێشتا دیوارەکە مابوو، ئامادەی کۆنفرانسێکی ئوتابیانی کوردی کۆمەڵەکەی بەرزانی بووم، کەسیاسەتمەدارێکی لیبیایی نەبێت لەبەرلینی خۆرهەڵاتەوە هاتبوو، تاکە کەس لەناویاندا کورد نەبووبێت من بووم. لەو چەند دەرزەنە کەسەی ئامادەی بەشداربوونی کۆنفرانسەکە ببوون کەمیان خوار چل ساڵان بوون، هەندێکیان قەڵەو سەر ماش و برنج یان هەرپەک بوو تووکە بەسەریانەوە نەدەما. لەوێ دوو ڕۆژ گوێم لەو خەڵکە چالاکانەی سەربە بەرزانی گرت، باسی ئەوەیان دەکرد کە: بۆچی ئەوت و ئاوو جیۆپۆلۆتیکە کوردیان لەپشتگیری ناوچەکەو خۆرئاوا بێهیوا کردووە؟ تەنانەت بۆ بەدیهێنانی مافە مرۆڤایەتیەکانیشیان چ جای ئۆتۆنۆمی و سەربەخۆیی، هەر یەکێتی شۆرەوی یاریدەی کورد دەدات، ئەویش بەحاڵ ترۆسکایی تیادایە. بۆ بەرزکردنەوەی وورەی خۆیان باسی خێرا زۆربوونی کوردیان دەکرد، "فەلەستینییەکانیش هەرچەند نیشتەکانیان خراپ بکەوتایەتەوە، هەمان قسەیان دەکرد".

باسی بیرۆکەی کتێبەکەمم لای هەموو ئەوانە کرد کەگوێیان لێدەگرتم، بەو هیوایەی ئەم گەڕە کەمم گومانی چەسپاوی ئەم شۆڕشگێڕە بەساڵاچووانەی، کەبەرلەبەر خۆرئاوا، بەتایبەتی ئەمەریکا هەیانە لەقبکات. کوردی هەمیشە بەرەوشت، بەڵێنیان دامێ ئەگەر خۆم بگەیەنمە کوردستان ئەوا ئەوان یارمەتیم بدەن.

کە گەڕامەوە بۆ پاریس، لەئەنستیتوتی کورد کەوتمە خوێندنەوەی ئەو شتانەی لە بارەی کوردەوە هەبوو، چەند هەفتەیەک چاوەڕوانیمکرد، کەچی لەئۆفیسەکەی پاریسی قاسملۆوە هیچم بەر گوێ نەکەوت، ناچار خۆم پرسیارمکرد، ئەوانیش پێیانڕاگەیاندم کەهیچ داوایەکی وایان نەگەیشتۆتێ، ئەگەرچی سەریان لەنەزانینی شوێنی داواکەم سووڕمابوو، بەڵام خۆیان بەتەلەفۆنکردنێکیشەوە ماندوو نەدەکرد. خۆشباوەڕییەکەی خۆمم بەدڵ نەبوو. بۆچوونی بەڕێوەبەرێتیی کوردم بەمجۆرە ناسی، جا لەبیرکردنەوەی قسەکردن لەوبارەوە بێسوود بوو، داوایەکی ترم دانێ. پاش بەسەربردنی مانگێکی دی، لەسەرەتای تشرینی دووەمدا چرای کەسکم پێ هەڵکرا، بەڵام چەند برادەرێکی کورد لەگەشتەکەم ساردیانکردمەوە..

هەندێ جلو زستانی کورد دوا دەکەوێت، جاری واش هەیە مێجگار سەختە، من بە هیچ جۆرێك نەمدەویست تا بەهاری ئاینده لەو شاخانەدا گیربخۆم. دڵیشم بەدووبارە وەرگرتنەوەی "ڤیزە پاس" ە عێراقییەکە خۆشبوو، پاشان دەرکەوت واڵییە.

پێش کریسمس ویستم لەواشنتۆن "ولیەم ئیگلتۆن"، کەلەبەشی تایبەتی حکومەتدا شارەزایەکی پێشەنگی کاروباری کوردە، ببینم، زۆربەی کورد سەبارەت بەنووسینی مێژووی کۆماری مەهاباد، کەئەزموونێکی سەرنەکەوتووی هەوڵو تەقەلای دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردییە لەنێوانی کۆتایی دووەم جەنگی جیهانیدا، خۆیان بە قەرزداریاری ئەو دەزانن. "ئیگلتۆن" چونکە براندەرێتییەکی کۆنم لەگەڵیدا هەبوو بەباشی گوێی بۆ شلکردم، بەڵام گومان لەناقابیلبوونییەکەی نەدەکرا، بۆیە تاکە قسەی: کەسوکارتت ئاگادارکردووە؟" بوو. ئامۆژگارییەکەیم بەخۆشحاڵییەوە لێوەرگرت، بەتایبەتی کە دەمزانی بەو نزیکانە شتێکی وام پێناکرێت بەگەیەنێتە کوردستان.

وەك دەرکەوت چاوەڕوانکردنەکەم باشتر بوو. ژیانی پەیامنێرە بیانییەکان شتی وا سەیریان تیادایە کەبەمیی کەسدا نایەت، یەکێك لەوشتانە وای کرد کەمن هەواڵی بەسەرهاتی ساڵی ١٩٩١ی کورد، کەووڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تیایدا سەرکردایەتی سوپایەکی هاوپەیمانانی کردو دوای حەوت مانگ لە داگیرکردنی کوێت، عێراقییەکانیان لێدەرپەڕاند، بەدونیادا بڵاوبکەمەوە. ئەوەش لەگەڵبوونی دوماو نزایەکی زۆری منی دەکرد، بەهەموو شیرینیو تاڵی ئەو وڵاتەیەوە. دەریشکەوت کە کوردستان هەر خۆگرو بەشەوڵە، جا ئیتر با جارجارەش ولنەکەوتبێتەوە.

من چەند ساڵێك، بێئەوەی ڤیزەو پاسپۆرت، یان ئەووڵاتێکی وا کێویدا چەکدارم پێویست بووبێت، هاتوچۆی کوردستانو چیاکانی زاگرۆسم کردووەو، بە سنوورەکانیدا گوزەرمکردووە، هەر چەند رۆژێك پێش پەڕینەوەیەکیانم سێ پەیامنێری ئینگلیزی لەپێناو پارەو پووڵەکانیاندا لەوتارەدا کوژرابوون. شان بەشانی کوردە پەنابەرە شەکەتەکان بەماندوێتی، ماوەی زۆر بەکەنار شەقامە خێراو سەرەکییەکاندا رۆیشتووەو بەچاوی خۆم بینیومە، باپیرو داپیر ئەوە ووردەکانی خۆیانیان لەم بەرو ئەوبەری ئەم شەقامەدا ناشتووەو لەترسی مین مەگەر سەرەڕۆیانکردبێت تالەدووی گۆڕێکی باشتر، کەمێك لەشەقامەکە دوورکەوتبنەوە. بەکۆڕیتەر بەنێوان لووتکە سەختە بەفرینییە "١٢٩٤٠"پێ هەڵچووەکانی ئاسماندا، کە کێوەکانیان سنووری تورکیاو عێراقیان پێکدەهێنا فڕیوم، بێئەوەی ئەرکێکی ئەوتۆ ببینم بەشێکی وڵاتێکی راستەقینەی دابڕاوی دواساڵانی سەدەی بیستەمم پێواوە، بەدەشتە فراوانو بەرزتر لەڕووی دەریاو نشێوو

گاشەبەردی قووتەڵ و بەفراوی بێگەردی خۆردا، ڕوانیومە، دواتریش بەدووی ڕووباری دیجلەی بەپێچ و دەورەو بەدەشتی بەرینی لەبن نەهاتوو، تا دیاریەکری پایتەختی ناڕەسمی کوردستانی تورکیا ڕۆیشتووم.. لەکوردستانی عێراقدا هەڵۆو چێرگەو داڵم بینیوە کەلەو قرچەی گەرمایەدا بەسەر داریەڕووە پچووکەکانەوە، یان بەسەر کێوو گردی ڕووتەندا فڕیون و بۆشاڵاوبردنە سەر نێچیرەکانیان چاوەڕوانی کاتی لەبارتریان کردووە.

هەرکاتێك بەشەقامە سەرەکییەکاندا هاتووچۆم کردبێت، گەلێك لەکوردەکان لەبەرخۆم زۆریان لێکردووم کەبەڕۆژ چاوساغێك بەکرێبگرم. لەناو تەپووتۆزدا تووشی کۆکە هاتووم و، هاوین لەپلەی "١٢٠"ی فەهرەنهایتیدا هەڵترچاوم، لەپاڵ ئەو کوردە پەککەوتووانەشدا بووم، کەلەدووری هەروا چەند میلێك لەبەشێك لەدەوڵەمەنترین کانە نەوتی ئەم دونیایەوە، لەناو سەرماو سۆڵە ناچار وورەدڵیان خۆکردۆتەوە تا ئاگری تێبەربدەن و خۆیانی لەبەردا گەرم بکەنەوە.... "چا"و ویسکیشم لەگەڵ سەرەك عەشیرەتە کوردەکانی ناو عێراق و ئێراندا خواردۆتەوە، لەتورکیاشدا گوێم لەچالاکییەکانی ماڵ مرۆڤی کورد گرتووە، کەبەردەوام ترسی کوشتنیان هەبووە، لەهەموو هەوارو شوێنێکدا لەگەڵ کوردا لەسیاسەت دواوم. لەعێراقدا بۆ ناو جوتیارانی واچووم کە بەچەند کەرەسەیەکی سەیری بەسەرچووی سەدە کۆنەکان و، لەشوێنی دیکاویدا دروێنەیان کردووە، لەگەڵ جووتیارانی خاوەن تراکتۆریشدا لەنرخی گەنم دواوم، خەڵەتی زۆریشم لەگەڵ چینە ناوەندییەکانی شاردا خواردووە، کەلێکەوەمانەکەیان بەڕادەیەکی وابووە، هەر لەپێناو ژیاندا، زەوی، خشڵ، ئۆتۆمۆبیل، ڕادیۆ، تەلەفزیۆن، چرپا، دەرگاو پەنجەرەو خانوویان بفرۆشن.

کەگوێم بۆ بەسەرهاتی شێوەی نەمێشتنی ژیانی کۆمەڵایەتی کورد گرتووە گریاوم، بەسەرهاتی وا کەمتر لەو "وڵاتە" بەئەنقەستانەی هۆکاری ئەو وێرانکارییە لەبن نەهاتووەی، هەزاران گوندی بچووکی کورد کە ڕۆژگارێك گەوهەری کوردستان بوون، دڵتەزێنتر بوون، بەیانیان زووش لەخەوی ناو ئوتێلە هەرزان بەهاکانی شارە کوردییەکانی کوردستانی تورکیادا، لەدەنگی یەکبینەی تەقە بەئاگاهاتووم، کەهەرچەند سەد مەترێك لێمەوە دووربووە، لەو نزیکانەشدا هێزی ئاسایشی تورکم بینیوە، جۆرە زەبرو زەنگێکی وایان نواندووە، هەر پێك وەك سەربازی داگیرکەر بن و لەکەس بەرپرس نەبن. تا گوێ بۆ قسەی لاوە برسییە کوردەکانی تورکیا بگرم، کەبەهەزارانیان لەپێناو بەدیهێنانی وڵاتێکی سەربەخۆدا ئامادەی مەرگ بوون، قسەی وایان بۆ دەکردم کەبێ بەزەییانە کاریان لەمێشك دەکرد، ماندوویی ڕۆیشتنی ناو بەفری زستانی قاچاخە ڕێگای قەدپاڵی چیاکان بووم. لەوەش گەیشتم کەبۆچی کوردەکانی عێراق و ئێران. دوای چەندین

خەونی پەرش و بڵاو دەیان ساڵ کاولکاری، بەئۆتۆنۆمی یان فیدراڵییەکی دیاریکراوی سنووری خۆیان قایلدەبن.

لەگەڵ کورددا، لەئوتێلی خۆرئاواییانەی نایاب و لەبن خێوەت و کەپری زۆر سادەی بەلاق و پۆپی گەڵاڕ دروستکراو ماومەتەوە، لەسەفەری دوورودرێژی ناو ئۆتۆمۆبێلی شەق و شڕدا مشتومڕم لەگەڵدا کردوون. لەهەموویاندا گەر دەمەتەقێکەش توندوتیژبووبێت، بەڵام لەڕێزو سەفاوەت و دۆستایەتی بەولاوە ڕەفتارێکی نەرم لەگەڵدا نەکراوە، ڕەنگە بەهۆی ئەمنیشەوە بووبێت. من هەندێ جار سەرم لەوتێکەڵبوونە سەیرەی "بەئارامی" و "حەز بەخوێن ڕشتن"ەی لەناو کورددا هەیە سووڕدەمێنێت، بەتایبەتی کەئەو ڕووداوەی زستانی ساڵی ١٩٩٢ی ناو بەفرێکی ئەستوورم بەبیردێتەوە، دوو پاسی پڕ لەکورد ڕووبەڕووی یەکتر دەهاتن، لەشوێنێکی زۆر تەسکدا کەبەفر ماڵانی ناوچەکە ماڵیبوویان بەیەکگەیشتن، منیش لەلاندرۆڤەرێکدا بووم، هیچ پاسێکیان ڕێگەی بەوی دیان نەدەدا، بواری تێپەڕینی یەکێکیشان نەبوو، لەپڕێکا هەموو نەفەرەکان دابەزین و لەناو بەفرەکەدا بەجۆرێکیوا دەستەو یەخەی یەکدی بوونەوە، کە شەڕە بێسەروبەرە کۆنەکانی بەبیردێنامەوە، تەنیا بەدەست لەیەکتریان دەدا، لەوە نەدەچوو ئەو شەڕە کۆتایی هەبێت، پیاوانیان وەک هەموو کوردێکی ڕێز لەخۆگر کڵاشینکۆفیان لەخۆدابوو، منیش تا مەترسی خوێن ڕشتنێکی زۆر نەیەلم، خاکەنازێکم لەئوتومبێلەکە دەرهێناو کەوتمە ماڵینی ڕۆخی شەقامەکەو ڕێگەی ئەوەندەم چاککرد کەجێگەی ڕۆیشتنی ئۆتۆمبێلەکەی خۆم و پاسێکیشی تیادا بێتەوەو بەئینگلیزی هاوارم لێکردن کەمن پەلەمە، یەک ووشە چییە لێمتێنەگەیشتن، بێگومان من بەلای ئەوانەوە لەشێت دەچووم، ڕاستییەکەشی کەمێم لەوە دەکردەوە هەموو بەحەپەساوییەوەو تا ڕادەیەکیش بەشەرمەزارییەوە، لەپڕێکدا شەڕەکەیان ڕاگرت و چوونەوە ناو پاسەکانیان، منیش ڕێگای ڕۆیشتنیانم بۆ دیاریدەکردن، پاسێکیانم بەرەو ئەولایە نارد کەخاوێنم کردبۆوەو ئەوی دیکەشیان بەڕێگای خۆیدا ڕۆیشت.

شاگەشکەبووم، چونکە بۆ تەنیا جارێکیش بێت بیانییەک لەبری گرفتێکی کورد بشێوێنێ بۆی چارکردن، جا با ئەو گرفتە زۆر بچووکیش بووبێت، کەئەوە بۆچوونێکی سەبارەت بەبوونی کرۆمۆسۆمێکی شەڕخوازانەی "بۆماوەی" ناو کورد دەردەخست، ئەویش وەک هیندییەکان کەخۆشیان بەقسەی ئەستەق دێت دەڵێن بەهۆی دابەشبوون و پەرتبوونەوە زیاد دەکات..*

## پەراوێزەکانی بەشی یەکەم

ئاگاداری کەسوکارتانکردووە؟

((لەشێوانیشدا سەرۆکەکانیان خافڵگیر کردوون و لەناویان بردوون))

بڕوانە: سیامەند عوسمان

Contribution historique a l etude du-
Parti Demokrati Kurdistan –i- Iraq 1946 – 1970.

نامەی دکتۆرای بڵاونەکراوە و:

David Frokin, A Peace to End all Peace: The Fall of Ottoman Empire and the creation of the Moderen Middle East New-York 1989 P.422.

## (٢)

# دوای زانیارییەکی وا چۆن لێببووردنێک؟

بەپێی جۆری سزادانی کۆنی ناوچەکە، عوسمانییەکان لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا، تێکڕای عەشیرەتی هەمەوەندی کوردستانی عێراقی ئەمڕۆیان، لەسەر مل ئەدان و تالەبارێتی لەڕادەبەدەرو جەردەیی بەئاشکرای سەر ڕێگەو بانەکان، بۆ لیبیا کۆچپێکردن، کەچی لەماوەی حەوت ساڵدا بەهەموو خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا ڕێگەیان گرتەبەرو گەیشتنەوە جێگەی خۆیان و هەروەک ئەبایان دیبێت و ئەباران چوونەوە سەر پیشە ناڕەوا شەڕانگێزییە کۆنەکەی خۆیان. زۆربەی کورد شتێکیان لەم هەمەوەندێتییە تێدایە، بەتایبەتی کەبەرەنگاری کارەساتێک ببنەوە هێزە بیانییەکان بەسەری هێنابن، کە بۆ نەگبەتی، لەچاوی بیانییەکانەوە ئەوە جۆرە برینێکی لەتماعە ئەبەستووەو ئەباری ئەوانە بۆکورد ماوەتەوە. کورد لەسەر وتنەوەی شیعرێکی کۆنی خۆیان سوورن کەدەڵێت: بەشی کورد هەزاران حەسرەت و هەزاران فرمێسک و هەزاران شۆڕش و هەزاران ئاواتی تێدایە.

لەیەکەم چاوپیاخشاندنی چەند بەرەنگاربوونەوەو پاڵەوانێتییەکی کورددا، باش بەرچاو ئەکەون، بەڵام کەبەقووڵی لێیان ورد ئەبینەوە، زۆرجار شێوە هەڵەیەکی وایان تێدایە کەلەهەمان بەسەرهاتی شۆڕشەکانی کورددا بەئاشکرا دووبارە بوونەتەوە، کەلەدەستپێکردنیانەوە لەناوچوونیان بۆ نووسراوە. نەتەوەییە کوردەکان بەسەرسووڕمانەوە ئەیسەلمێنن کەلەهیچ بەشێکی وڵاتەکەیاندا، لەیەکگرتنیاندا لەگەڵ کوردی بەشەکانی تریاندا هەرگیز سەرکەوتنیان بەدەست نەهێناوە، لەڕووی ڕامیاریشەوە گەلێکی یەکگرتوو نەبوون، ئەم یەکنەگرتن و پەرتبوونەشیان زیانی زۆر قورسی پێگەیاندوون، هەمیشە بەلای ناپاکێتی ناوخۆیانیدا بردوون، ئەگەرچی بەردەوام بەرەنگاری دەستەڵاتدارانی دڵڕەق و ستەمکارو پەرچەکی واشبوونەتەوە کەبەتازەترین چەک لێیانی داوە، کەچی وادیارە زۆرکەم سوودیان لەهەڵەکانی ڕابردوویان

وەرگرتووەو لێیانەوە فێربوون، ئەوەی بۆیان ماوەتەوە خەم و خەفەتی لەڕادەبەدەری ژیانی ئەو خەڵکەیە کەلەئەنجامی شۆڕشدا بەسەریان دێت، بەتایبەتی لەعێراق و تورکیادا کەژیانی کۆمەڵایەتی دەشتەکیانەیان لەبن هەڵتەکێنراوە. کورد وەك باری کۆنی گەلانی دواکەوتوو، لەڕووی ڕامیارییەوە تاڕادەیەك ساویلکەن، کاریگەرێتی سەرکوتکردنیان لەقەوارەیەکی یاساییدا پێوە دیارە. کورد بەتاقیکردنەوەی جۆراوجۆری سەرکردەکانیاندا ڕۆیشتوون، کەنەیانتوانیوە هەستی نەتەوەییان لەپێناو سەربەخۆیی یان تەنانەت ئۆتۆنۆمییەکی چەسپاو بەردەوامدا بگۆڕن، ئەویش لە سەدەیەکدا کەدوورگەی وا لاقی ئەندامێتی نەتەوە یەکگرتووەکان لێدەدات کەمێجگار پچووکە .. نەتەوەییە کوردەکان یارمەتی دەوڵەتانی بیانی دژبە دراوسێکانیان و تەنانەت کورد خۆشیان دەدەن و بوونەتە گورزی دەستیان.

ئاغاو حوکمدارانی بیانی لەمێژوودا ستراتیژی دەمکوتکردنی کوردیان بەکارهێناوە هەرکەسێکیش بۆنی لێهاتوێتی سەرکردەیەکی باشی لێهاتبێت ئەوا لەبنجەوە هەڵیانکێشاوەو لەناویانبردووە. ڕۆشنبیرانیشیان دیاریکردوون و، بەندکردوون و کۆچپێکردن و دوورخستنەوەیان بۆ لەناوبردنیان بەکارهێناوە، بەوەش کوردیان لەپێگەیاندنی سەرکردەی ڕامیاریو بەئەزموونکردووە. لەم سەدەیەدا چەند حاڵەتێکی کەمی نەبێت، ساویلکەو مێشك داخراوو سستن و، وەك ئەوانەی دەورووبەریان نین، کەبەتەنیا هەر خۆیان نابینن و بۆ دوورتر دەڕوانن و خاوەن بڕیاری دواڕۆژیش دەبینن، کورد هەندێ جار چاو لەوانەش دەکات کەلەخۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا پەتای زۆردارێتیان تووشدێت. جاروبار سەرکردە کوردەکان کۆنەپەرستن وەك لەعێراقدا بەرچاو دەکەون، جاری واش هەیە کەسی وایان لێهەڵدەکەوێت کەڕەگیان بۆ چینەکانی خوارەوە دەگەڕێتەوە وەك ئەوانەی تورکیای ئەم سەردەمە.

لەم دواییانەدا کورد لەیەك کاتدا شۆڕشیان لەعێراق و ئێران و تورکیادا بەرپاکرد، بێئەوەی هیچ هاوئاهەنگییەکیان لە نێواندا هەبێت، بەڵام هەر ئەوەندەی کوردی یەکێك لەو وڵاتانە، بۆ بەڕێوەبردنی شۆڕشەکەیان، وورپایی لەهەڵەکانی ڕابردوو، کە کارەساتی گەورەی بەسەردا هێنابوون ڕادەگەیاند، ئیتر کوردی دوو وڵاتەکەی دراوسێیان، بەدەمهۆڵکوتانی دوا ئابەجێ شۆڕشگێڕانەکانیان دەمکوتیاندەکردن و هەردوو قاچیشیان دەبڕییەوە. تەنانەت ئەو سەرکردانەی کارامەیی و کامڵێتی لە ڕۆژگارەوە فێربوون، لەپێناوی بەرژەوەندی و خواستی خۆیاندا، یان بۆ یەکلاکردنەوەی ناکۆکیە کۆنەکەی نێوانیان، وورپایی و خۆگرییەکانیان بەبادا دەدا.

دوای حەفتا ساڵ، لە ١٩٩١دا بۆیەکەمین جار کورد وەك نوێنەری راستەقینەی بەرژەوەندییەکانیان بەهەڵبژاردن چوونە پەرلەمانی تورکیاوە، بەڵام کەژێرنتییەکی ڕامیاری وایان نەبێت خۆیان لە حکومەتێکی دەستکەلای سوپای تورکیا بپارێزن نەیانگرێت، سەرسامی پێناوێت. ئەم ناشارەزاییەیان بۆتە هۆی پشتگوێخستن و درێژە پێدانی کێشە گرنگەکەی کوردستانی تورکیا کەخۆیان مەبەستیان چارەسەرکردنی بوو.

سەرەڕای نەبوونی دەوڵەتێکی کوردو تۆماری پڕ پەژارەی شۆڕشە یەك لەدوای یەکە سەرنەکەوتووەکانیان، زۆربەی کورد کەهێشتا لەڕووی جوگرافیاوە لەپانتاییەکی بەرینی پێکەوە لکاو، بەدرێژایی پێنج دەوڵەت دەژین، بەیەکێك لەکۆمەڵگا ڕەسەنەکانی مرۆڤایەتی ناسراون، کەئەوە ڕاستییەکی گەورەیەو، ناسینەکەشیان پێویستی بەپەرە پێدانە، بەڵام کورد چاك خۆی دەناسێت.

هەرچەندە کۆمەڵگای کوردەواری فرە شێوە زمان و ڕەگەزو ئاینە، بەڵام خاوەنی مێژوویەکی دووروودرێژە، لەهەمووشی گرنگتر هەر لەسەرەتاوە تەنیا یەك ئاواتیان هەبووە، ئەمە چاك تێگەیشتنی کوردە کە؛ نەعەرەبو، نەتورکو، نەفارسن، باشیش دەزانن کوردستان کوێیەو قسە چەوت و چەوێڵە لووسەکانی حکومڕانانیان کەبەمەبەستی کوێرکردنەوەی ئاوەکەی بلاویدەکەنەوە لەخۆناگرن.

تورکیای سەردەم، بەئامانجی نەهێشتنی پێناسەی سیاسی و کولتووری کورد، جۆرە سیاسەتێکی لەوبابەتەی بەکارهێناوە، لەمارتی ١٩٢٤دا، واتە زیاد لەحەفتا ساڵ بەر لەتێپەڕبوونی تاکە ساڵێك بەسەر دامەزراندنی کۆماری تورکیای مستەفا کەمال ئەتاتورکدا، زمان و کلتوور تەنانەت ناوی کوردی شوێنەکان قەدەغەکران، بنەمای تواندنەوەی کوردیش بەلای حوکمڕانەکانەوە ببوە بڕوا، بەڕادەیەك کەدەبوایە سەرجەم کوردی کوردستانی دەرەوەی تورکیاش، کەلای ئەوان هەرناوە، ئایدۆلۆژێتی ناوەندی رژێم پەسەند بکەن و بەڕاستی دەست لەکوردیتی، یان نەتەوەی کوردی خۆیان هەڵبگرن، کەئامانجەکەی بە "تورککردن"یانە. عێراق و ئێران، هەرچەندە ویستوویانە ژمارەی کورد زۆر بەکەم دابنێن، بەڵام هەرگیز نکوڵیان لەبوونی نەکردووە. تەنانەت عێراق لەگەرچی تاوانی زۆر گەورەی بەرامبەر کردوون و ئۆتۆنۆمیشی داونەتێ، کەچی ڕێی بەکارهێنانی وشەی کوردستان لەپاڵ پێدراوەکەیاندا، نادات و "ناوچەی ئۆتۆنۆمی"ی پێدەڵێت، تورکیان لەسەر ناونانی کورد بە "تورکی شاخاوی"ی خۆرهەڵات و باشووری خۆرهەڵاتی تورکیا نەك "کوردستان" سووره، ئەم پێداگرتنە ناڕەوایەیان بۆ ماوەیەکی زۆر هەر بەوهیوایەبووە، کەلەبیربچنەوە، بۆیە هەرچەندە کوردستان لەسەدەی سیانزەمینەوە ناسراوە،

کەچی ئەمڕۆ لە ئێراندا کراوەتە ناوی شارێک کەپارچەیەکی هێجگار پچووکی وڵاتی کوردە، لەعێراقیشدا هەر لەناونیشانی ڕەسمیانەی ناوچەی دابڕاوی ئۆتۆنۆمیدا بەدیار دەکەوێت. بیرۆکراتییەکانی ناوچەکەی لێدەرچێت، بەلای هەموانەوە ڕووبەری کوردستان نزیکەی "٢٠٠,٠٠٠" دووسەد هەزار میلێکی چوارگۆشەیەو خۆی لەڕووبەری هەموو فەرەنسا، یان هەردوو ویلایەتی کالیفۆرنیاو پنسلڤانیا پێکەوە دەدات، کەش و هەوای جۆراوجۆرە، لەمامناوەندیتی دامێنی گردۆلکەو دەشتاییەکانی میزۆپۆتامیاوە بیگرە تا دەگاتە سەختی چیاکانی باکووری خۆرهەڵاتی تورکیا، کە ساڵ هەیە پێنج دانە مانگی بەفرە. بەپێچەوانەی بەشێکی زۆری خۆرهەڵاتی ناوەڕاستی تینووی بێناوەوە، زۆربەی کوردستان تەڕوپاراوەو ڕۆژگارێک بووە جەنگەڵ و دارستانێکی چڕبووە، بەڵام ئێستا دارودرەختەکەیی لێداماڵراوەو بۆتە نموونەیەکی وێرانکاری شەیتانکارانەی ئاڵۆزی سروشت، چ لەکاتی جەنگدا بووبێت یان ئاشتی، جا بەناپاڵم ووشککرابێت یان بە کیمیاباران یان بەلەوەڕی بێ حساب لەناوبرابێت. لەناو لووتکەی چیا بەفرینەکانی تورکیادا کوردەکان خۆیان بە خاوەنی دوو شوێن دەزانن، کە پێیەچێت جێگەی گیرسانەوەی کەشتییەکەی نووح بووبن، ئەوانیش، چیای "جودی"کە لەڕووبەڕووی سنووری نێوان هەر سێ وڵاتی تورکیاو سووریاو عێراقدایە، کێوی ((ئارارات))ی نزیک سنووری تورکیاو ئەرمینیاو ئێران کە "١٦٩٤٦"پێ بە ئاسماندا هەڵچووە.

لەهەموو نەخشە ئاساییەکاندا بەدیاردەکەوێت، کە زۆربەی کورد لە ناوچەیەکی سێگۆشەیی چێڵوچەوتی لنگەڵوچی وادا دەژین، کە لاکانی لەباکووری خۆرئاوای ئێرانەوە، واتە لەسنوورەکانی نێوان تورکیاو ئازەربایجانەوە ڕووەو باشوور شان بەشانی زنجیرە چیاکانی زاگرۆس تا ڕێکی بەغدا دەبنەوە دەڕۆن، واتە لەگەڵ بەغدادا لەسەر یەک پانە هێڵدان. لەعێراقیشدا لەتووڵی کەرانەیەکدان کە بەدرێژایی سنووری ئێران و تورکیاو بەرەو سووچی باکووری خۆرهەڵاتی سووریاو بەشێکی زۆری باشووری خۆرهەڵاتی تورکیادا، بەرەبەرە شانەکانی لەباکووری خۆرئاوایەوە بەدرێژایی سنوورەکانی ئێران و ئەرمینیا، ڕووەو خۆرئاوای ڕووباری فورات پچووکدەبنەوە. کۆمەڵگەی گەورەی تری کورد لەگەڵیانە شوێنی دی وەک خۆرهەڵاتی ئێران هەن، لەخوراسانەوە بەدرێژایی سنوور لەگەڵ تورکمانستان و لەبلوچستانەوە نزیکی پاکستان و لەباشوورەوە لەپانتایی ئەناتۆلیای تورکیاو هەردوو خۆرئاواو باکووری خۆرهەڵاتی دەنتەرە، لەسووریاشدا لەباکووری حەلەب و باشووری چیای "عەفرین" کەلەسنووری تورکیاوە نزیکەو ماوەی چەند میلێکیش لەدەریای سپییەوە دوورە هەن.

لەڕۆژووی ئەم گیرفانەشەوە کۆمەڵەی گچکە گچکەی دی کورد لەشوێنە جیاجیاو لێکدابڕاوەکانی تری کەوانەیەکی باکووری خۆرهەڵاتی تورکیادا بڵاوبوونەتەوە، چەند کۆمەڵە کوردێکی پچووکتریش لەئەرمینیاو جۆرجیاو بەتایبەتی ئازەربایجان و چەند ناوچەیەکی دی یەکێتی شورەوی کۆندا هەن، کەمەترسییە ئابەجێکەی ستالین لەوەی ناپاکییکەن پەرواوزەی کردن. دیسان لەبەشێکی تری ناو خاکی ئێراندا لەنزیک دەریای قەزویندا هەن. شارە گەورەکانی خۆرئاوای تورکیای وەک، ئەنقەرە، ئەدەنە، ئەنتالیا، ئەستەنبوول و ئەزمیر پڕن لەکورد، کەمێژەکانی تورکیا لەم دواییانەدا زۆرەیانی بۆ ڕاگوێزکردبوون و تیایاندا نیشتەجێبوون، ئەوەش لە دوای بەرپابوونی ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٨٤، کەبووە هۆی وێرانکردنی زۆر شوێن و چۆڵکردنی زۆربەی گوندەکانیان و تێکچوونی باری ئاسایشی تورکیا لەو ناوچانەدا. لەدیمەشقی پایتەختی سووریاشدا چەند سەدەیە کەکورد ناوچەیەکی تایبەتی هەیە، کەبەسەر ناوەندی شارەکەدا دەڕوانێت، تاران و تەبرێزو ئەو شوێنانەی ناوەندی نەوتن لەباشووری ئێراندا بەشێکی زۆری کەمایەتیەکانی کوردیان تێدایە هەروەها لەبەغداو هەر بەو جۆرەش لەئەڵمانیاو سویدو چەند وڵاتێکی دی ئەورووپای خۆرئاوادا هەن.

ئەم جۆرە گردی و پەرتەی کورد پێویستبوو ببوایەتە هۆی سەرژمێریکردنێکی ووردیان، کەچی هیچ ئامارێکی متمانەپێکراویان نییە. کوردە نەتەوەییەکان بۆ زیادبوونی ژمارەیان بیانووی خۆیانیان هەیە، بۆیە بەساڵداچووانیان پێیان وایە خاکەکەیان، وەک لەو نەخشەیەدا بەدیار دەکەوێت کەبۆ کۆبوونەوەی سانفرانسیسکۆی نەتەوە یەکگرتووەکانی ساڵی ١٩٤٥ تا سوودی لێوەربگیرێت ئامادەیانکردبوو، لەدەریای سپی ناوەڕاستەوە تا دووڕگەی فارس پارچەیەکی لێکدانەبڕاوە. کورد چونکە دەوڵەتێکی خۆیان نەبووە، بۆیە خاوەنی دەستگایەکی ئاماری خۆیان نەبوون، دەوڵەتانی تریش لە رابردوودا لەژمارەی کوردو کەمایەتییە نەتەوەییەکانی دی بەگومان بوون، بۆیە بەرە بەرە وایان بەچاکزانی کەئەمجۆرە کارانە رابگرن یان هەر بەنهێنی بیهێڵنەوە، بەوە زیادبوونی ژمارەی کوردیان حەشاردا. بەڵام هەمیشە ئەدراو چەرساوەی وادەردەبن کە جاروبار دژی ئاغاکانیان راستبنەوە، لەو راستیەش کەکێشەی دیموگرافیانەی کورد تا ڕادەیەک هەر لەپەرەسەندندایە، بەڵگەیەکی ڕەوای هێنابووە ئاراوە کەلەبەشە دەستکەوتی نەوت و سەرمایەی تایبەتی بۆ پەرەپێدانی کاری ئابووریان بێبەش بکرێن. بەبێبەشکردنەوەیەکی وورد، دەوڵەتەکان دەتوانن بەردەوام زۆرینای تواندنەوەی کورد بەرەسمی بژمێرن. لەعێراقدا سەدام حسێن هەموو جارێک سەرژمێرکردنی نوێی ڕەتکردۆتەوە، ئەویش ئابەشە نەوتەکەی کورد، کەخۆیان بەخاوەنی زۆربەی هەرەزۆری نەوتی وڵاتەکە دەزانن،

زەوتیکات. نکوڵی لێکردنی پێناسەی کوردیش لەتورکیا، جۆرێکە لەخەیاڵپڵاوی و درۆ لەگەڵ خۆکردن بەرامبەر بەڵگەی زیادکردن و پەرەسەندنی خێرای کورد بە بەراورد لەگەڵ نەتەوەکانی تری ناو تورکیادا. چەند ئامارێکی ڕەسمی ساڵی ١٩٨٩ وای نیشاندەدەن کەتێکڕای خێرایی زیادکردنی منداڵبوون لەناو کوردستانی تورکیادا خۆی لە لەسەدا ٢,٧٥ ئەدات، لەکاتێکدا لەبەشەکانی تری تورکیادا تەنیا لەسەدا (١,٤٩)ە، ئەوانەشیان کەتەمەنیان لەپەنجا ساڵ کەمترن سەدی پەنجایان لەکوردستان دان بەرامبەر سەدی ٣٥ی شوێنەکانی دی تورکیا.

پسپۆڕان و شارەزایانی خۆرئاوا، سەبارەت بەژمارەی کورد بەبێ سەرژمێرکردنیان گەیشتوونەتە باوەڕێك کە ٢٥ ملیۆن کورد، بگرە زیاتریش هەبن، یەك بۆچوونیشیان سەبارەت بەوەی کە کورد ئێستا، دوای عەرەب و فارس و تورك چوارەم کۆمەڵی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستن هەیە، خۆ ئەگەر کاری دیموگرافیانەی کوردی تورکیا لەسەر ئەم بارەی ئێستایان بەردەوامبێت، ئەوا وا خەمڵێنراوە کە کورد لەپەنجا ساڵی ئایندەدا، لەناوچەکەو بگرە لەتورکیاشدا ژمارەیان لەتورك زیاتر دەکات، ئەو پەرەسەندنەشیان دەرمان و وێرانکاری سەدەیەکیان بۆ پڕدەکاتەوە. بەشی زۆری هەموو کورد لەتورکیادا دەژین، ئەویش لەوەتەی ناوەندی دیموگرافیان بەرەو خۆرئاوا بزوێنراوە. کۆچپێکردنی کورد بۆ دەرەوەی کوردستان، کەبۆ یەکەمجار بیزەنتییەکان بەوتاوەوە دەریانکردن، لە چەند شارێکی خۆرئاوای تورکیادا بۆتە هۆی پەرەسەندنی قەوارەی کۆمەڵییان. ئەگەر وابێت وەك باوەڕ دەکرێت و بەڵام سەلمێنراونییەو کورد لەسەدا ٢٠ی هەموو تورکیابن کەلە ٦٠ ملیۆن زیاترە، ئەوا ئێستا خۆ لە ١٢ ملیۆن دەدەن، پێنەچێت نیوەی ئەو ژمارەیەش کورد لەئێراندا هەبن کەنزیکەی سەدی ١٠ی دانیشتوانی ئێران دەبن، "٢و٤" ملیۆن کوردی عێراقیش دەیانگەیەنێتە سەدی "٢٣"ی خەڵکەکەی کەدەگاتە ١٨ ملیۆن، وەك لەمێژە زانراوە ڕێژەی کورد لەعێراقدا لەهەموو وڵاتەکانی تری ناوچەکە بەرزترە. ئەم ڕێژە بەرزییەی ژمارەی کورد لەپاڵ چیای سەختی ناوچەکەدا و دەستێوەردانی بیانیان لەکاروباری ئەوناوەو توندوتیژی نێوان موسوڵمانانی سنی و شیعە، کەشیعەکان لەم وڵاتە دروستکراوەدا زۆرترن، وەڵامی ئەو پرسیارەن کە: بۆچی شۆڕشی کورد لەم وڵاتەدا زۆرترەو بەردەوامیشە؟. لەسوریاش ژمارەی کورد لەملیۆن زیاترەو دەکاتە سەدا ٩ی دانیشتوانی کەخۆی لە ١٣ ملیۆن دەدات. کوردی ئازەربایجان و ئەرمینیاش ٣٠٠ هەزارێك دەبن، ٧٠٠ هەزار کوردیش بە وڵاتانی ئەوروپادا بڵاوبوونەتەوە، هەر بەتەنیا لەئەڵمانیادا ٤٠٠ هەزار کەسێك دەبن.

ڕاستییەکەی کورد بەهەموو حسابێك خۆیان لەسەدی ١٥ی سەرجەم دانیشتوانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دەدەن. بۆیە دەبێت لەهەموودایەکی دووردا حسابێکی ووردی تایبەتی دیموگرافیانەیان

بۆ بکرێت. ژمارەی کورد تەنیا لەناوەڕاستی سەدەی هەژدەیەمدا خۆی لەژمارە تەلیسماوییەکەی ساڵانی بەر لەبەسەرگەردان کردنیان داوە، کەلەئەنجامی جەنگە یەك لەدوای یەکەکان و ڕەشەتاو دۆزینەوەی ڕێگای دەریایی کەبە دەوری "راس الرجاء الصالح"دایە، کەساڵی ١٤٩٧ "ڤاسکۆ دیگاما" دۆزییەوەو ئەورووپای بەخۆرهەڵاتی دوورەوە گەیاندو بووەهۆی کۆتاییپێهاتنی ڕێگە ئاوریشمییە زەمینییەکەی بەکوردستاندا ڕەتدەبوو، ئەو کارەساتانەو گەلێك ئەهامەتی دی کاریگەرێتیان لەگۆڕینی ئەو ناوچە کشتوکاڵییە پڕ لەسامانەدا بەرادەیەکی وا هەبوو، کردییە بۆگەناوێکی پەنگەوەخواردووی ئابووری و ڕامیاریانە. بە نەمانی بازرگانێتی بەو ڕێگا زەمینییەدا، پێویستی بەو ڕێگاوبانانەی خەڵکی بیزکرات یان دەوڵەتەکان ئەرکی سەرپەرشتی و چاککردنەوەیانیان لەئەستۆ گرتبوو نەما، ئاکامەکەشی بەرپابوونی شەڕو شۆڕی زۆری ولبوو کەکۆمەڵگەی جێگیرو خەریکبووی کشتوکاڵی کوردستان هەرەس پێبێنێت و بیکاتە کۆمەڵگەیەکی ڕەوەند.. خۆ ئەگەر ئێستاش کورد بەسەرخۆکەوتبنەوە ئەوا دەمێنێ لێکۆڵینەوەو پرسیاریان لەبارە بکرێت، چونکە ساڵانی سەدەی نۆزدە هێندە دواکەوتووبوون کەپەیوەندیکردنیان بەئیمپراتۆریەتی ڕوسیاوە بەکارێکی پڕ هیواو گەیشتن بە کۆمەڵگایەکی ژیاری و پێشکەوتوو دادەنا، بێگوێدانە دواکەوتوێتی ڕوسیا ئەگەر بەئەورووپای خۆرئاوا بەراوردبکرایە، چونکە ئەو ئیمپراتۆریەتە ئەوەندە پەرەی نەسەندبوو.

تا دوای شەڕی جیهانی یەکەم کەکۆتایی بەئیمپراتۆریەتی عوسمانی هێنا، کوردستان وەك ناوچەیەکی شاخاوی دابڕاوی بێ سەروبەر هەریەرەو دواوە دەچوو، ئەوساش کورد نەك هەر مەلی گەیشتن بەسەربەخۆبوونی خۆیانیان لەکیسدا، بگرە بەبەشداربوونیان لەقەڵاچۆکردنی زیاتر لەملیۆنێك ئەرمەنی، لەساڵی ١٩١٥ دا ڕووزەردییان بۆ مایەوە، هەرچەند بەقسەی سەرچاوە کوردییەکان، خۆیان لە ٤٠٠ هەزار کەس زیاتریان هەر لەتورکیادا لێکوژراوە، کەئەمە ڕاستییەکە خۆرئاواییەکان بەتەواوەتی پشتگوێیانخستووە، لەخۆرهەڵاتی تورکیاش نزیکەی ٧٠٠ هەزار کەسیان بەنیازی خۆدەرباز کردن لەمەترسی کەوتنە ناوباری ناهەمواری شەڕی سەربازانی ڕوسەوە لێیەڕەوازە بووەو، زیاتر لەنیوەیان مردووزو زۆری تریشیان بەهۆی شەڕەکەوە، لە ئێراندا کەبەبێ لایەن دادەنرا، یان لەچەند ولایەتێکی دی عوسمانیدا، کەدواتر عێراقی ئەمڕۆیان لێپێکهێنا، بەبرسێتی سەریان نایەوە. کەلەساڵی ١٩١٨دا ئاشتی بۆ ناوچەکە گێڕرایەوە، کوردستان وڵاتێکی ژێرخان داتەپیوبوو، ژیانی کۆمەڵایەتی تیایدا ئاڵۆزو ڕۆشنبیرانی پەرش و بڵاو کرابوونەوەو سەرەك عەشیرەت و شێخەکانیش دەستیان بەسەر پاشماوەکەیدا گرتبوو.

دەوڵەتە تازەکان کەمەپێوەری لە ڕووبەری خۆیاندا، لە ئێران و عێراق و بەتایبەتیش لە تورکیادا، لەسەر بنەمایەکی پتەوی وا دامەزرێنرابوون، ڕێک بەپێی شێوازی ئیمپراتۆرییەتەکانی پێشوودا دابخەن. کەناوچەییەکیان دەخستە ژێر دەسەڵاتی ڕەگەزە جۆراو جۆرەکانەوە، بۆخۆشیان زیاتر شێوە ڕەسایەکی تەسکی نەتەوەییان گرتەبەر. کورد لەتاو قەدەغەکردنی تەقالیدات زمان و جلەو بەرگی نەتەوەیی و کولتووری تایبەت بەخۆی، بەپێی ڕەفتاری حکومەتەکاندا وەستایەوە، هەڵوێستێکی بێ هاوتای والئی لە بەرەنگاربوونیاندا، وەک چۆن هەن نواند، کەوا بگەیەنێت ئەگەر هەزاران فرسەق زیاتریش لەوانە چەسپاوەکەی ناو شاخەکانیشیان دووربخرێنەوە، واز لەو تایبەتمەندێتییەی خۆیان ناهێنن.

سەرەڕای پەرەوازەبوونیان و ڕاگواستنیان بۆ بلوچستان و تورکمانستان لە خۆرهەڵاتەوەو کەرەکە وێرانەکانی ئەستەنبوڵ و ئەشارەکانی وڵاتانی سوید و ئەڵمانیا لە خۆرئاواوە، زەرەرمەندێتیان لەئەنجامی چەندین سەدە ڕاگواستنیان بۆ شوێنی دوورو هەندێ جاریش بۆ ناوچەی وا کەباری ئابووریان تەواو خراپ بێت، بەڵام کورد هەرگیز لەبوونی خۆیان بەگومان نەبوون. دەوڵەتانی ناوچەکەش بەپێی ئایدۆلۆژیەتی هەمەچەشنەیان، وەک یەکێتی شورەوی سەردەمی ستالین و عێراقی سەدام حسێن و تورکیای ئەمڕۆو پارتی بەعسی سووریای شەستەکان و ئێرانی سالانی "١٩٢٥ – ١٩٤١"، یەکبینە کاریان بۆ ڕیشەکێشکردنیان کردووەو بەژمارەی کەم کەم بۆ چەندین گوندی بچووک و چەپەک، بەهیوای دوورخستنەوەیان لەکێو دۆڵ و دەشتەکانیان پەرشوبڵاویان کردوونەتەوە، تا هەستی نەتەوەیی کوردانەیان نەهێڵن، بەڵام بەدبەختانی ئەو ئاواتەیان لەڕاستییەوە دووربووە..

کورد وەک دانیشتوانی تری ناوچەکە، کەناڵی ئایدۆلۆژیای زۆر گرنگی وایان نەبووە، جا ئەو کەناڵانە ڕاستی بووبن یان درۆ، تا بۆ مەزنی و گەشکردنەوەی ڕابەرایەتی ئەمڕۆو دوایڕۆژیان، یەکبینە بۆیان بگەڕانایەتەوەو پیایاندا بچووبنایەوە، کورد بەپێچەوانەی نەتەوەکانی دی ناوچەکە هیچ کلتورێکی ژیاری وایان نەبووە تا ڕەگیان لەسەرچاوە کۆنەکانەوە ڕوون ئاشکرابێت، وەک چۆن جوولەکە لە "تەورات"دا، دیان و ئاسووری لە"ئینجیل" دا، ئەرمەنییەکان لەئەرشیفی دەوڵەمەندی کەنیسەکانیاندا هەیانە، کورد بەپێچەوانەی موسوڵمانانی دەوروبەریشیانەوە، خاوەنی شتێکی وەک "قورئان"ی عەرەب نەبوو، وەک فارس و تورکیش ژیارێکی گرنگ و کەڵەکەبووی خۆ بەڕێوەبردنێکی پێشکەوتووی وای نەبووە؟، تا هەستی مێژوویی خۆیی بخاتە پاڵ، بۆیە لە مێژوویاندا زۆر سەرکەوتوو نەبوون، کورد پێویستە بەشێوەیەکی گونجاو بەمانا و ئەپساوە، ئەو چەند ڕەهە دەگمەنەی زاڵەکان بەسەریاندا بازیانداوە جیابکەنەوە.

ڕۆشنبیرانی کورد چینە لەو بەشە ئادیارەی ژیاردا دەکەن، کەئەگەر خەڵکانی دی بەدەوریشیا سوڕابنەتەوە، سەرچاویان نەکەوتووە تاپێناسەی کوردی پێ تەواو بکەن. داڕشتنی مێژووی کورد لەسەرەتاوە کارێکی مێجگار ستەمە، ئەمە بۆچوونی باسکارێکی کوردە کەزۆر بەنیگەرانییەوە دەڵێت: هەندێ جار کار دەگاتە پشکنین و دەرئەنجام و ڕێکخستن لەناو، یان بەناو سەرچاوەی هەمەجۆری وادا کەشتێ کوردو نە سەبارەت بەئەوانیش نووسراون.

ئەگەر باسی ڕابوردووی کورد لەسەرچاوەیەکی کورد خۆشییەوە بێت ئەوا هەر جۆرە ئادیارییەکی تیادا هەست پێدەکرێت. خەڵکی زۆربەی ئەفسانەی ڕابردووی خۆیانیان هەیە کەلەبنەچەیان بدوێت، کوردیش لایەنی کەم دوو ئەفسانەی لەو بابەتەی هەیە، یەکێکیان بۆ ئەو چەند ژن و پیاوەیان دەباتەوە کە کەلەدەست پادشایەکی فارسی خۆسەپێنەری سەرتەختی شایانە، کەزۆردارێکی کەتەی وابووە مەگەر هەر لەچیرۆکدا ناوی بێت، دەربازیان بووە، "زوحاک" کەناوی پادشایەکە، دەبوایە رۆژانە مێشکی لاوانیان دەرخواردی ئەو ئەژدیهایانە بدایە کەلەسەر شانی پەیدا ببوون، بەڵام چەند وەزیرێکی ژیرو دڵسۆز ویستویانە توخمەکەیان لەنەمان رزگار بکەن، بۆیە بڕیار دەدەن مێشکەکان بەمێشکی گوێرەکە بگۆڕنەوە، بەوەش چەند کوڕو کیژێک دەرباز دەکەن و بۆناو چیاکانیان دەنێرن، ئەمانە لەوێ وەچەی کوردیان خستۆتەوە. ئەفسانەکەی دیشیان باس لەشا سلێمان دەکات، کەدونیایەکی نائاسایی پڕ لەجنۆکەی بەڕێوە بردووە، شا فرمانی بەجنۆکەکانی داوە بفڕن بۆ ئەورووپا تا ٥٠٠ کیژی شۆخ و جوان بۆ بارەگاکەی بهێنن، بەڵام کەگەڕاونەتەوە زانیویانە شا مردووە، کچەکانیان بۆ خۆیان گلداوەتەوەو، وەچەی کوردیان خستۆتەوە.

کوردە لەبۆچوونی جۆراوجۆری هەندێک لەوانەی بەکوردستاندا گوزەریانکردووە، یان تیایدا ماونەتەوەو جێگیربوون و بەشداریان لەدروستبوونی ئەم "حەوزی جینات"ەدا کردووەو، بەڵگەی هەستپێکراوی واشیان هەیە کەتەنیا بە کوردستاندا ڕەتنەبوون و زۆر لەخەڵکی دی زیاتر تیایدا ماونەتەوە، نیگەران نابن. ڕاستییەکەشی کوردێکی کورتەباڵای ڕەشتاڵە، لەخەڵکی ئەورووپای باشوور، یان خۆرهەڵاتییەکانی، یان عەرەب، یان فارس جوێنناکرێتەوە، بەڵام بەشە کوردێکی دیاری وایان هەیە، چەند کەمیش بن، بەزۆری باڵابەرزو قژزەردو چاوشین یان خۆڵەمێشین و، لەقەڵەمڕەوێکدا دەژین، کەلەگۆماوی "وورمێ"ی خۆرئاوای ئێرانەوە بۆ باکووری عێراق و تا سنووری سووریا درێژ دەبێتەوە، کەبێگومان دەچنەوە سەر عەشیرەتە داگیرکەرەکانی باکووری چەند سەدەیەک لەمەوبەر. واش "ولیام لین ویسترمان" نیو سەدە پێش ئێستا وتوویەتی: کورد لە ٢٤٠٠ ساڵ پێش زایینەوە هەر شوان و ڕەوەند بوون. واشی دەردەخات کەکوردەکان دەتوانن

زیاتر لەو خەڵکانەی ئەمڕۆ لەئەورووپادا دەژین، لای تۆخم و ڕەگەزپاکی خۆیان و شێوەی کلتووری ئەپساوەیان بۆ ماوەیەکی دوورتر لێبدەن.

چەند پسپۆڕێکی شارەزا سوورن لەسەرئەوەی کە کوردە چیاییەکان لەسەردەمێکی زووی دوانزە هەزار ساڵی پێش زایینەوە، بەهۆی مەڕو بزن و بەراز بەخێوکردنەوە پێشوەخت کشتوکاڵیان کردووە، دانەوێڵەی باوی وەک: گەنم، جۆ، کەتان، نیسکیان چاندووە، پێنەچێت لەهەزارەی حەوتەمی پێش زایینەوە، نزیک دیاربەکر لەکوردستانی تورکیادا بۆ یەکەمینجار "مس" دەرهێنرابێت، بەرلەسەدەی چوارەمی پێش زاییشیش هەر لەوێوە شتومەکی پێویست لەبرۆنز دروستکرابێت، کەچی سەرەڕای ئەو بەشدارییە گرنگانەیان، ناوەندی ژیاری بەرەو دەشتاییەکانی باشووری میزۆپۆتامیا، کە بەپێچەوانەی ناوچە شاخاوییەکانەوەیە، شۆڕبۆتەوە، کەبەهۆی ئەختی زەوییەکەیی و پانتاییە زۆرەکەیەوە ژیان تیایاندا ئاسانترەو هیچ ئەرکێکی وای ناوێ و، بەردەوامی بەژیان و مانەوەو ڕێکخستنی دەوڵەت، واتە باج دانان و دامەزراندنی لەشکری گەورەو ڕێکخستنی خۆبەڕێوەبردن و نووسین دەدات.

داگیرکەرانێکی زۆر کوردستانیان تەیکردو، بارکردنی کۆچەرە هیندو ئەورووپییەکانی ساڵانی ١٢٠٠ – ٩٠٠ی پێش زایین بووەهۆی کاولکردن و لەکارخستنی کوردستان و ناوچەیەکی بەرینی باکووری خۆرئاوای ئاسیا؛ "کیسرای مەزن" ساڵی ٦١٢ی پێش زایین "نەینەوا"ی داگیرکردو کۆتایی بەئیمپراتۆریەتی ئاشووری و زەوتکردنە ١٥٠٠ ساڵیەکەی ناوچە شاخاوییەکان هێنا کەمیزۆپۆتامیاییەکان داگیریانکردبوو. لەوکاتەوە کورد بەئازایەتی و چاپوکی لەئەرکە سەربازییەکاندا ناوبانگیان دەرکردووە، بەتایبەتی لەشەڕی پارتیزانیدا، کەماوەیەکی دووردرێژ، سوپای خۆیانی لێدەرچێت لەهەموو سوپایەکی تردا جێدەستیان دیاربووە، لەوانە فەوجێکی تایبەتیان لەناو سوپای سووردا هەبووە، لەدووەم جەنگی جیهانیدا شاری "منسک"یان لەنازییەکان سەندۆتەوە.

"زەینەفۆن" لە "ئەناباسس"ەکەیدا بەئەمر باس لەجەنگاوەرە بەساماکانی کوردو مەلحەمەکانی ئەو سەردەمەیان دەکات، یان بە کاردۆخی ناویان دەبات، کەچۆنچۆنی مەلحەمەکانیان دەیان هەزار بەکرێگیراوی ئیغریقیان پاشەکشە پێکردووە، کەساڵی ٤٠١ی پێش زایین بەرەو دەریای ڕەش بیوونەوە، گوایە ئەم ئیغریقیانە شەڕێکی خۆشیان بەخواردنێکی زۆرەوە بەسەر بردووە، کەڕاستیەکەشی تا وڵاتی کاردۆخیان بڕیوە، یەکبینە لەشەڕدابوون و لەزیەتێکی واڵنیان بەدەست کاردۆخییەکانەوە خواردبوو بە هەموو ئەو ناخۆشی و ئەشکەنجانە بووە کەشای ئێران و "کیاڤیرتیس" ژەنەڕاڵی دابوونی.

دوای ئەمیش بەماوەیەکی کەم مێژوونووسێکی تری ئیفریق "میو دورس" چووبووە سەرباوەڕی ئەو چەند کەسەی وەک خۆی بوون و بەدرێژایی تەمەنیان لەو باوەڕەدا بوون، کەکورد هێند بەگێچەڵە ناهێنێ ئیمپراتۆریەتەکان و سوپا پێیانەوە خەریکبن، دەشیووت: باشتر وایە بەزۆربێت یان بەڕێککەوتن کوردەکان لەشوێنی خۆیان بهێڵرێنەوەو گرفتەکانیان نەهێنرێتە تەختاییەکان. بەڵام "ویستەرمان" دەڵێت: ئەمەش وا بەئاسانی ناکرێت، چونکە کورد زۆری حەز بەتەڵەیە کەلەشتێکی بکات بەئاسانم بجوولێتەوە، جا ئەگەر ئەو شتە مرۆڤ بێت ئەوا دەیا چاکتر، لەکاتی زەینەفوونەوە لەمڕووەوە هیچ گۆڕانێک نەبووە، هەرئەمیش دەڵێت: کورد هەمیشە دژی باجدان و سەربازیکردن بۆ دەستەڵاتدارانی بووە.

چۆنێتی کورد زیاتر بە سەرکەوتنیانەوە بەندبووە، چونکە خۆیان لەزەبرو زەنگ دەپاراست، وەک لەسەردەمی زۆر زووی شا ئاشوورییەکان شالمانزری سێیەم لەسەدەی نۆزدەدا، سەرجۆنی دووەمیش، لەسەدەی هەشتی پێش زایندا و کەبەمەبەستی مل پێدانیان هەڵمەتیان بۆ سەرهەموو کوردستان بردووەو، ئەگەر کارەکەشیان بەباشی بۆ بچوولیەتەسەر، ئەوا بەدرێژایی کەنارەکانی دەریای سپیدا و تا کەنارەکانی دورگەی فارس دەمانەوە.

کورد هەندێ جار ڕۆژگاری نێوان سەدەی دەیەم تا سەدەی دوانزەیەمی زاینی بەسەدەی کوردە ئیسلامییەکان ناودەبات، چونکە حوکمدارێتی رامیاری، یان پارێزگاری ئەو ناوچانەی لەناوەندی ئاسیاوە دەستی پێدەکات و بەرەو "هلالول خەسیب"تا یەمەن و لیبیا درێژ دەبووەوە، بەدەست سەربازانی کوردەوە بووە، ئابێ چالاکی سەربازی وبوونیان، لەئەنجامی بزوتنەوەی بەردەوامیان بۆ یارمەتیدان و پاراستنی ناوجەرگەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لەداگیرکەران لەبیر بکرێن، کەبەناوبانگترینیان خاوەن حاجەکان بوون، لەم ڕۆڵەیان هیچی لەڕۆڵی چەندین سەدەی سەکۆتلەندییەکانی ناو سوپای بەریتانیا کەمتر نییە. کورد: ئەندازەی بیناسازی و، ئەستێرەناسی و، مێژوو، ماتماتیکەو، فەلسەفەو، مۆسیقایان گەشەپێداوە. سەلاحەدینی ئەیوبی، کەلەشاری "تکریت"ی سەر ڕووباری دیجلەی "شوێن لەدایکبوونی سەدام حسێن"هاتۆتە دونیاوە، یەکێکە لەهەرە ناودارەکانی کورد لەو دەمەدا خێزانە ئۆرۆستکراتییەکەی سەلاحەدین لەخزمەتی ئەو بنەماڵە ناکوردانەدا بوون کەدەسەڵاتیان بەدەستەوەبووە، جا سەلاحەدین لەو ڕۆژگارانەدا خۆی بەکورد دەنابێت یان هەر هیچ نەبێت خۆی بەکورد زانیبێت ئەوەیان لەلایەن مێژوو نووسانەوە جێگەی پرسیارە، چونکە ئەوان لەو باوەڕەدان کەسەلاحەدین تەنانەت پێشی نەخستۆتە کوردستانەوە، بەهەرحاڵ خزمەتکردن لەدەرەوەی کوردستان، بۆ ئەو چینە وەک بەکرێگیراو، هەندێ جار لەناو کورددا پەسەند بووە، ئەگەرچی چەند مێژوو نووسێک لەو

باوەڕەدان، کە سەلاحەدین وەک سەربازێکی پارێزگاریکەری ئیسلام، کەمتر بیری لەکوردێتی خۆی کردبێتەوە، پێشتر سەلاحەدین و باوکی و مامی لە سوریادا، هەر لەبنەڕەتدا خزمەتی پاشاو بەگی تورکیانکردووەو زۆربەی سەربازەکانیشیان تورک بوون، بنەماڵەی حوکمڕانانی ئەیوبی "ناوەکە لەناوی باوکی سەلاحەدینەوە هاتووە" سننی مەزەب، لەمیسر کۆتاییان بەحوکمداریتی دووسەدەی فاتمییە شیعەکان هێناو، خەلیفەیەکی سنی مەزەبیان لەبەغدا دانا. سەلاحەدین لەساڵی ١١٨٧دا لەشەڕی "حەتین" خاچدارەکانی شکاندوساڵێکیش دواتر "ئۆرشەلیم"ی لێسەندنەوەو "ریشارد شێردل"ی بەزاند. سەلاحەدین بەمیری سوارچاکان و چاوپۆشیکەرو باش هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ دوژمنەدیان و جووە بەزیوەکاندا ناسراوبوو، بۆیە لەساڵی ١١٧٤ی زاینییەوە تا ١١٩٣ی زاینی حوکمیکردو پەرەشی بەحوکمداریتی ئەیوبی دا، کەمەرچۆنێک بووبێت تا کۆتایی سەدەی پانزەیەم بەردەوام بووە. لەهەمانکاتیشدا بنەماڵەی تری کورد لەقەوقاس و ناوەڕاست و باشووری کوردستاندا حوکمیانکردووە.

تورکە کۆچەرییەکان، لەسەرەتای سەدەی نۆزدەیەمەوە بەرەو ئاسیای خۆرئاوا بوونەوە، مەنگۆلییە داگیرکەرەکانیش کشتوکاڵی ناوچەکەیان بەشێوەیەک تێکدا، کە کوردستان سەدەیەکیش دوای ئەو کارەساتە، تەنیا نەیەکی پێش ئەو وێرانکارییەی بەرهەم دەهێنا، ساڵی ١٣٩٣ کوڕی تەیمووری لەنگ، شارەکانی دیاربەکرو ماردین و گەلێ ناوچەی ئاوەدانی تری کورد، کەئێستا لەژێر دەستەڵاتی تورکیادان تاڵانکرد، تەیمووری لەنگ خۆشی ساڵی ١٤٠١، پاش بەرپابوونی شۆڕشێکی کورد، شارەکانی، هەولێرو موسڵ و جزیرەی تاڵانکرد.

سەدەیەک دواتر شەڕی نێوان ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ئێران، بەتایبەتی دوای شەڕی چاڵدێرانی ساڵی ١٥١٤ ی زاینی، کەعوسمانییەکان لەنزیک گۆماوی "ڤان"ی خۆرهەڵاتی ئێستای تورکیا بەسەر سەفەوییەکاندا زاڵبوون و، کوردستانیان کردە کەلاوە.

شەڕ کاولکاری زۆری بەخۆیەوە هێنا، بەردەوامبوونیشی بۆ یەک سەدە زیاتر کوردستانی وێران و کاولکرد. عوسمانییەکان زۆر دڵڕەقانە ئێرانییەکانیان زیاتر بەرەو خۆرهەڵات دەبرد، تادوای نزیکەی ٢ ساڵێک لەسەر دیاریکردنی سنوورێک ڕێککەوتن، هەردوو ئیمپراتۆریەتەکە نەک هەر کوردستانیان کردە گۆڕەپانی جەنگی نێوانیان، بەڵکو تەکنیکی خاکی سووتاویان تیادا بەڕێوە دەبرد،هەریەکە ئەوی تر لەتوانا مرۆڤانەکەی کوردستان بێ بەشبکات، کۆچیان بەکورد کرد.

ڕاگوێزانی زۆرەملە سزادانێکی توندی سەدەکانی ناوەڕاستی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستە. سوڵتان سەلیمی یەکەم، پاش سەرکەوتنی لەشەڕی چاڵدێراندا، سەرجەم عەشیرەتە کوردەکانی

بۆناوەندی باشووری ئەنادۆڵ، بەتایبەتی بۆ ناوچەکانی باشووری ئەنقەرە ڕاگوێست، کەتا ئێستاش زۆر لەوەچەکانیان هەر لەو ناوەدا دەژین، تەنانەت بۆ شوێنی زۆر دووریتری وەک بولگاریاشی ناردن، بەڵام لەم ڕووەوە هەوڵەکانی بۆ ئەنجام نەچوو سەر، چونکە سەفەوییەکان بەسەدان هەزار کوردو ئەرمەن و ئازەری و تورکمانیشیان بەزۆر بەرەو ئیمپراتۆریەتەکەی خۆیان بەکێشکرد. لەساڵی ١٥٢٤ – ١٥٣٥ دا سەفەوییەکان، لەبەرئەم شاڵاوی سەربازە سەرکەوتووەکانی عوسمانیدا، شارو گوندی کوردانیان بەدوای یەکدا وێرانکردو ئاگریشیان لەدەغڵ و دانیان بەردا، کانی و کارێزو بیرەکانیان کوێر کردنەوە، هەموو کارێکی پێکخستەوەشیان بەسەر یەکدا تێک و پێکدا، لەکۆتایی هەمان سەدەدا شا عەباسی یەکەم زیاتر پەلەی لەئیشەکەدا کردو، کوردە هەڵکەنراوەکانی جارێکی دی و بەزۆری بەرەو خۆرهەڵات نارد، سەرەتا بەسەر سنووردا بۆ ئازەربایجان و ئەمجا بۆ خوراسان بەرامبەر بە تورکمانستان، لە دووری هەزار میلێکەوە دایبنان، کە تا ئێستاش هەر لەوێن لەباکووری خانووەکانی پێشتری خۆیانەوە ماون. سەفەوییەکان بەمجۆرە جارێکی دی عەشیرەتە کەڵلەڕەقەکانی کوردیان، وەک پاسدار لەسەر سنوورێکی ئاڵۆزاوی خۆرئاوای خۆیانەوە جێگیرکرد. ئەمە کارێکی سەرسووڕهێنەر بوو. چەند عەشیرەتێکی تری کورد لەوەزیاتریش دوورخرانەوەو بۆ چیاکانی هندو کوشی ئەفغانستان، کەئێستا بەشێکە لەبلوچستان.

کاریگەری ژیانی کۆچەریانە بەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی و جێگیریاندا، بووە هۆی گۆڕینی شێوە زمان لەکوردستاندا، زمانی کوردی سەر بەلقی ئاری زمانە هیندۆ ئەورووپییەکانەو لەزمانی فارسییەوە نزیکە، وەک شارەزایانی زمان دەڵێن: لەنزیکی زمانی دانیمارکی بۆ زمانی ئەڵمانی دەچێت. کورد لەکۆنەوە بەزمانێک دەدوا کەزمانی "پەهلەوانی" پێوتراوەو زۆر لەکوردییە ڕەسەنەکەی ناوچەرگەی شاخەکانی زاگرۆزەوە نزیکە، کە ئێستا بەشێکی سەرەکی سنووری نێوان عێراق و ئێرانە. دوای ئەم هەموو سەدەیەی کە بەرەو خۆرهەڵاتی باشوور تورکیا گوێزرانەوە، بڵاوبوونەوەی ئەم شێوە زمانە هۆی کۆچپێکردنیان بوو، بەڵام لەدوای سەدەی شازدەوە لەگەڵ تێکچوونی باری ژیانی کۆمەڵایەتی و جێگیربوونیان بەدرێژایی سنووری عوسمانی و فارسی، شێوە زمانی پەهلەوانی زیاتر کەلاکەوت و، کرمانجی، کەشێوە زمانی پێنااڵفتنی کۆچەرانی سەر بەناوچە شاخاوییەکانی هەکارییە، لەخۆرئاوای گۆمی وورمێ، جێگای گرتەوە، کرمانجی و پەهلەوانیش هەریەکەیان دوو دیالێکتێکی سەرەکی خۆیان هەیە، پەهلەوانی کەئێستا هەر لەم پەڕو ئەوپەڕی کوردستاندا قسەی پێدەکرێت، یەکەم شێوەی "گۆران"ە کەلە باکووری کوردستانی ئێراندا بەسەرەکی بڵاوە نزیکەی ملیۆن و نیوێک کوردپێی

دەدوێت، دووەمیان "زازا" یە کە لەتورکیادا چوار ملیۆن و نیو کوردو تورک، بەزۆری لەناوچەکانی دەوروبەری تونجیلی و بنگۆل و سیڤرێن چەند شوێنێکی گچکەتری دەوری مەلاتیاو ئەدیامان و مارلش پێی دەدوێن. کوردو تورکە عەلەوییەکانیش کەبارەی ئیسلامیانەو چەند تێڕوانینێکی بەر لەئیسلامیان هەیە، لەگەڵ هەندێ کوردی سنی مەزهەبدا بە "گۆران"ی دەزانن، کە وەک مێژوو نیشانی دەدات "گۆران" شێوە زمانی نووسین و ئەرکەسانەشە کە لەسەرتاپای کوردستاندا خۆیان پێ زانایە.

کرمانجی، کەئەمەشیان دووشێوەیە، یەکەمیان شێوەی باشوورە کە "سۆرانی" پێدەوترێت، زۆربەی کوردی عێراق و ئێران پێی دەدوێت، دووەمیشیان شێوەی باکوور "بادینانی" کە کوردی باکووری عێراق و ئێران و تورکیا قسەی پێدەکەن، بۆچوونێکیش هەیە کەدەڵێت، سێ بەشی هەموو کورد ئەمڕۆ بە کرمانجی دەدوێن، ئەو کوردانەی بەکرمانجی دەئاخافتن لەگەڵ ئەوانەیاندا کەبەپەهلەوانی دەدوێن، جیاوازی نێوانیان وەک جیاوازی نێوان زمانی فەرەنسایی و ئیتالیاییە، بەلایەنی کەمەوە هەر بەشەیان لەنیوەی شێوەکەی تریان دەگەن.

لەئەدەبی نووسراوی پێش سەدەی شانزەیەمیشدا، کەهەر پاشماوەیەکی کەمی ماوەتەوە خۆی لەبەردەمی شەقی زەمانەدا ڕاگرتبێت، کرمانجی لەکۆتایی سەدەی شانزەو حەڤدەدا هەر ئەوەندە خۆی پێگەیاندوە کەلەنووسینی سێ مەلحەمەی پرشنگداردا بەکاربهێنرێت، "شەرەفنامە"ی ئەمیر شەرەفەددینی بەتلیسی، کە بەیەکەم مێژووی سەراپای کورد دادەنرێن داخی بەلای یەکنەگرتن دەردەبڕێت، کەمحەممەدی پێغەمبەری ئیسلام بەسەر کورددا هێناوە، تا لەڕووی سەربازیانەوە ئەوەندە چالاک نەبن کە "سەرتاسەری زەوی بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە، بەشی سەرەکی "مەم و زین"ی "ئەحمەدی خانی"ش، کەچیرۆکێکی دڕێژی کوردەو لە "ڕۆمیۆ جولیێت" ی شکسپیر دەچێت، تەرخانە بۆ یەک نەبوونی کورد، زیاتر پشووی بەهیوایی تێدا دەچێنێت، دواتریش "دمدم" لەشێوەی قەڵای "مەساد"دا، بەرەنگاربوونەوەی "خانی لەپ زێڕین"ی میری "برادۆست" ڕێکدەخات، کەئێستا بەشێکیان لەخۆرهەڵاتی باکووری عێراقدا دەژین، لەم سەدەیەدا سۆرانی بۆتە جەمسەری پەرەوەی کلتووری کورد، ئەویش لەئەنجامی بەکارنەهێنانی شێوە زمانەکانی دی کوردی. لەپێشدا دەسەڵات داریتی بەریتانیاو دواتریش دەسەڵاتداریتی زۆرینەی عەرەب، بە هەموو کەمە کورتییەکانی عێراقەوە، ئەگەرچی پێشیان خۆش نەبووبێت، بۆرە سەربەستییەکی کلتووریان بەکورد داوە، لێپرسراوانی بەغدا دوای بێکدانەوەیەکی وورد، بەرپرسیاریتی ئەو کارەیان لەئەستۆ گرتووە، لە ڕۆژنامەو گۆڤارو کتێب و ڕادیۆو تەلەفزیۆندا، ڕێگەی بەکارهێنانی زمانی کوردیان داوە خوێندنیش لەقۆناغی

سەرەتاییەوە تا زانکۆ بەکوردی بووە، لەئەنجامی ئەوەدا سەدی ٨٠ی کتێبی کوردی بەسۆرانی نووسراونەتەوە کەهیچ وڵاتێکی دی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بەوجۆرە خۆی لەوکارە نەدەدا، تا لەساڵی ١٩٩١دا سەرۆک "تورگت ئۆزال" گۆڕانکارییەکی لەیاسای تورکیادا کرد، هەر بۆ نموونە نزیکەی ٧٠ ساڵی ڕەبەق تەنیا ئەو کوردانەی لەئەورووپادا دەژیان بەزمانی کوردی نووسراویان دەردەکردو بەقاچاخ بۆ تورکیایان دەناردەوە.

خۆرئاوا پێویستە لەم ڕووەوە وەڵامی گەلێک پرسیار بداتەوە، لەتەمموزی ١٩٢٣دا ئەتاتورک لەبەرخاتری خۆرئاوا، تا هاوپەیمانەکان دەست لەئەستەمبوڵی داگیرکراو هەڵبگرن، لەپەیمانی لۆزاندا لەبەندی ٣٨یدا بەڵێنی دا کە: "هیچ کۆسپێک لەڕێی ئازادی خەڵکی تورکیادا دانەنێت و، بەهەر زمانێک خۆیان بیانەوێت، لەژیانی تایبەتی، بازرگانی، ئایینی، چاپ و چاپەمەنی، کۆبوونەوەی ئاشکرایاندا، بتوانن بەکاری بهێنن" بەڵام هێزە خۆرئاواییەکان کەمانەوەی شەڕبوون، بەتایبەتی بەریتانیاییەکان، ئیتزیان لەخەرجی پارەی زۆرترو پشتگیری دیپلۆماتیانەی ئەتاتورک دەبزووە، کەساڵی پێشوو بەسەر یۆنانییەکانی ژێر دەستەڵاتی بەریتانیادا زاڵبیبوو، لەئەنجامیش ناچارکرا کەلەدژایەتی یەکێتی شوورەوی پشتگیری لەئەتاتورک بکات. بۆیە بەریتانیاییەکان سووربوون لەسەر دۆزینەوەی ڕێگاچارەیەکی سنووری نێوان تورکیاو عێراقی بن دەستی خۆیان، تا داواکردنەکەی ئەوتی موسڵیان مسۆگەر بکەن، لەبەرئەوە ئەتاتورک بێگومان بوو لەوەی خۆرئاواییەکان بەهیچ جۆرێک لە ڕوویدا ناوەستنەوە، هەربۆیەش لەئۆکتۆبەری هەمان ساڵدا کۆماری تورکیای ڕاگەیاندو دوای چەند مانگێکیش دەستەڵاتی خەلافەتی لابردو قوتابخانەو ڕێکخراوو چاپکراوی کوردی و هەموو قوتابخانەو پەیمانگا ئایینییەکان و هەموو دەستێکی یەکگرتووی ئایینیشی قەدەغەکرد، بەمجۆرە مافە کولتوورییەکانی کوردی کۆتکرد. سوریا تا لەژێر ڕکێفی فەرەنسادا بوو پشتگیری چاپی کوردی تیادا دەکرا، بەڵام دوای سەربەخۆیی ساڵی ١٩٤٦ یان لەوێش چاپەمەنی کوردی قەدەغەکرا. دەستەڵاتدارانی ئێرانیش لەسەردەمی ڕەزاشاوەو لەماوەی نێوان هەردوو جەنگی جیهانیداو دواتریش تا هاتنی سەرکردە ئایینییەکانی کۆماری ئیسلامی، دوو ماوەی کورتی لێدەرچێ: کۆماری مەهابادی ساڵی ١٩٤٦و، یەکەم چوارساڵی دوای شۆڕشی ئایەتوڵڵا ڕوحوڵڵا خومەینی ساڵی ١٩٧٩، ئەگینا زمانی کوردی لەخوێندن و چاپکردندا قەدەغە بووە. تا هەرەسهێنانی یەکێتی شوورەوی زمانی کوردی لەقوتابخانەو چاپەمەنی ناو کۆمەڵە زۆرەکانی کورد، لە ئەرمینیاو ئازەربایجان بەکار دەهێنران، بەڵام لە کۆمەڵە بچووکەکانی دی کورددا، کە ستالین کاتی جەنگی جیهانی دووەم بەئاسیای ناوەڕاستدا تۆزێکردبوون کەمتر بوو. جا ئەگەر ئەم شێوە زمانانەش بۆ هێنانەدی زمانێکی

یەکگرتووی ستانداردی کورد بەس نەبووبێ، ئەوا "ئەلف و بێ"ی هەمەجۆریش کوردی پەرتەوازەتر کردبوو، "گۆران"ی ئێران پیتی ئێرانی بەکاردەهێنن و، سۆرانی بە "ئەلف و بێ"یەکی وەرگیراوی عەرەبی و فارسی، لە ئێران و عێراق و بادینانی عێراقیشدا دەنووسن، بەڵام کوردی تورکیا لەدەرەوە بەشێوەیەکی دەستکاریکراوی پیتە لاتینییەکان دەخوێنن، کەمیر کامەران بەدرخان لەکاتی دەستپێشخستنی فەرەنساییەکاندا لەسوریا دایناوە، ئەو کتێب و رۆژنامانەی لەدەرەوە دەردەچن و بەقاچاخ بۆ تورکیایان دەنێرنەوە بەهەمان "ئەلف و بێ" دەنووسرێن. کورد لەیەکێتی شۆرەویدا "سیریلی"یان بەکارهێناوە. ئەم فاکتەرانەو چەپەکی و دابڕان و سروشتی وڵاتە شاخاوییەکەیان، وورەی بەکوردە نەتەوەییەکان بۆ گەیشتنە یەک زمان و یەک "ئەلف و بێ"ی وا، کەهەموو کورد لێی تێبگەن و بیبێتەهۆی یەکبوونیان نەهێشتووە، کەدەبینن عەرەب لەزووەوە یەک زمانی کلاسیکی، وەک زمانێکی یەکگرتوو بەکاردەهێنن، گرژ دەبن، ئەگەرچی عەرەبەکانیش جار هەیە زمانی قسەکردنی نێوانیان لەوڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر زۆر روون نییە، بەڵام یەکگرتنی زمانەکەیان پلەو پایەی زمانی قورئان دەگەیەنێت.

ئەتاتورک بەنیازی بەرەوباش بردنی زمانەکەیان، لەساڵانی بیست و سییەکاندا دەستی لەو کارە وەردا و "ئەلف و بێ"ی زمانی تورکی کردە لاتینی، گەلێک وشەی عەرەبی و فارسی لێ وەدەرنا. لەئێراندا ئەدەبیاتی کلاسیکی فارسی تا ئێستاش خزمەتێکی گەورەی مەبەستی یەکبوونیان دەکات.

کورد تەنانەت لەکێشە ئایینییەکانیشدا بەش بەشن، تێکڕای سەدی ٧٥ی هەموو کورد بەناو موسوڵمانی سنی مەزهەبن و بەکرمانجی دەدوێن، کەمایەتییەکی قەوارە دیاری شیعەی ١-٥و١ ملیۆنیش لەرێبەری باکووری کوردستانی ئێراندا، لەهەمەدان و کرماشان و لووتێکی خۆرهەڵاتی خۆراساندا هەن، چیاو دۆڵی سەختی کوردستان، وەکو "جبل لبنان" شوێنی پەنای کەمایەتییە خاوەن باوەڕە ئایینییەکان بووە؛ شارەزاکانیان لەچەپەکی و چاکی چیاکان گەیشتوون، چونکە دوورەدەستی دەسەڵاتدارە چەوسێنەرەوەکانی ئایینە سەردەستەکانەو، دەتوانن تیایدا ئەرکی تایبەت بە باوەڕەکەی خۆیان مەیسەر بهێنن، بەڵام ژێر ئاسمانی خۆرهەڵات کەم شت بەشاراوەیی بهێڵێتەوە، چەند تیرەیەکی ئایینی وەک عەلەوی و دروزییەکان شتی وایانکردووە کەبە عەرەبی "تقیە"ی پێدەوترێت و بەلای بەشە سەرەکییەکانی ئایینی ئیسلامەوە، واتە سنی و تەنانەت شیعەش، مەترسی "داهێنان - بدعە" یان لێکراوە، خۆ ڕاهێنان لەگەڵ گۆڕانە کوتوپڕە ڕامیارییەکاندا. کەزۆر کەرەت حەزیان پێنەکراوە، بۆ پارێزگاریکردن لەخۆ، خەڵکیان فێری ڕەنگ یان ئایین گۆڕین، یان هەر بەهەڵسوکەوت وای نیشاندەن، کردووە. کورد لەسەدەکانی پێشوودا

ژمارەیەکی زۆریان بوونەتە دیان و بێگومان موسڵمانیش (لەساڵی ١٩٤٨دا، دوای دروستبوونی دەوڵەتی ئیسرائیل بە) ملومیەکی زۆرکەم، زۆربەی کوردە جوولەکانی کوردستان، کەمەزۆری لەئیسرائیلدا بوون، ڕوویان لەو دەوڵەتەکرد، لەناوەڕاستی نەوەدەکانیشدا چەند سەد کەسێکی تریشیان لێهۆیشتن، دیانەکان زیاتر ڕووەو خۆرئاوا کۆچیانکرد).

دوای ئیسلام گەورەترین کەمایەتی ئایینی کەلەناو کورددا هەیە، کۆمەڵێکی تا ڕادەیەک تووندو دەمارگرژ، کە دەچنەوە سەر ئایینێکی مەزنی کۆن لەمێژوودا، ئێکرا بە "فریشتەپەرست" ناسراون کەئایینێکی گەورەبوونییەو زۆر پێش ئیسلام هەبووە، تا ئێستاش سێ بەشی زۆر لەیەکتر جیاوازیان بەناوی جیا جیاوە لەکوردستاندا ماون، ئەو سێ بەشەش بریتین لە "عەلەوی، حەقە، یەزیدی" ئەگەرچی هەر لە کەمبوونەوەدان، بەڵام چەند شارەزایەکی پسپۆڕ دەستنیشانیانکردووە، بەچارەک یان سێ یەک هەموو کوردیان دەخەمڵێنن، ئەمەش وەک هەموو خەمڵاندنەکانی تری کورد دەبێ زیادەڕۆییەکی تیادابێت، ئەو سێ تیرەیە لەسەر باوەڕێکی سەرەکی کۆکن، کەهەندێ جار لەکتێبە پیرۆزەکانیاندا بەدیار دەکەوێت و هەندێ جاریش بەوتن ڕادەیەکگەیەنرێت و، لای ئەوانەی کەباوەڕیان پێی نییە نەدرکێنراوەو بەنهێنی هێڵراوەتەوە، ئەویش ئەوەیە کە حەوت ڕووناکی خوایانەی یەک لەدوای یەک، گەردوون لەحەوت کاری ڕەشی ئەگریسانەی ماتریالیانەی بەهێز دەپارێزن.

کەزۆرجار ژیانەوە بۆ هێلکەیەک یان گەوهەرێکی چەسپیوی ناو گیانی گەردوونی دەبەنەوە، بۆ نموونە بەپێی "مصحف" کە کتێبێکی پیرۆزی یەزیدییەکانە، (یەزدان سەرەتا بەنرخترین گەوهەری سپی دروستکردووە، ئەمجا مەلیکێکی بەناوی "ئەنقار"ەوە دروستکردووەو گەوهەرەکەی ناوەتە سەرپشتی و تا چل هەزار ساڵ ماوەتەوە) ئەم تیرەیە لەو باوەڕەدان، کە گیان شێوەی جۆراو جۆری هەیەو هەر جارەش شێوەی خواوەندێکی سەرەکی و ئاسایی وەردەگرێت، لەو باوەڕەشدان کەباشەو خراپە وەک یەکن و گرنگی هەردووکیشیان بۆ ژیانەوەو بەردەوامی گەردوونە ماتریالەکەیە.

هەموو ئەوانەی سەر بەم تیرە جیا جیا یەک لەدوای یەکانەن، بەدەستی کاربەدەستە سنی و هەندێ جار شیعەو جاروبارێش برادەرە کوردەکانیانەوە چەوسێنراونەتەوە، چەوسێنەرەکان کەسانی سەر بەم تیرانەیان بەشتی درۆو دەلەسەو پڕوپووچی وەک "عەربەدە"و لەتاریکیداو بەدزییەوە ژن گۆڕینەوەش تاوانبار کردووە، ئەم تیرانە ئامادەی بەشداریکردنی مەزهەبی ئایینی دەستڕۆیشتووەکانی وەک جوولەکەو دیانە ناسراوەکان و موسوڵمان و زەردەشتی و چەندین کەسایەتی دیاری بەر لەئیسلام بوون کەلەڕێی "شاسانزم"ەوە داگیرکەرانی باکووری ئاسیا

هێنابوویان، ئەمجۆرە گونجاندنەی نێوان ئەو هەموو باوەڕە لەخۆوە نەهاتبوو، بەڵکو ڕاستییەکەی لەکاتی کێبەرکێی ئاینەکاندا، بۆ فریودان و کێشتنە پلەوپایە بەکارهێنراون. بۆ نموونە، عەلەوییەکان لەسەدەی پازدەیەمەوە بۆ سەدەی حەڤدەیەم بەڕادەیەکی وا دەست ڕۆیشتووبوون، کە گوایە کاریگەرێتیان بەسەر شیعە موسوڵمانەکانی ئێران و تەنانەت یەزیدییەکانیشدا کە ئێستا پچووکترین تیرە ئایینین، بەڵام لەکاتی سەلاحەدیندا بەڕادەیەکی وا پەرەیانسەندووە، کەگەیشتبوونە ئەو چیایانەی بەسەر ئەنتاکیاو دەریای سپیدا دەیانڕوانی.
لەسەدەی سیازدەو چواردەشدا دەسەڵاتیان ئەوەندە هەبووە، کەلە هەموو پانتاییەکانی خۆرهەڵات و دەریای سپیەوە تا ناوەندی تورکیاو کەرکوک لە عێراقداو گۆمی وورمێی ئێراندا هەبوون و، دیان و موسوڵمانانیان بەلای خۆیاندا وەرگێڕاوە. لە کۆتایی سەدەی پازدەیەمدا، وەك لەشەرەفنامەدا هاتووە، لە ٣٠ عەشیرەتە یەکگرتووەکەی کورد حەوتی ڕێکیان یەزیدی بوون.
عوسمانییەکان وەك سەرکردایەتییەکی دونیایی و گیانی سنی، بەبیانووی خۆپاراستن لە "بدعە – داهێنان"، هەرکەسێك سەر بەم تیرانە بوایە دەیانچەوساندەوە، سوڵتان سەلیمی ستەمکار، یەکەمجار پاش شەڕی چالدێران، کەناوچە فارسییەکانی خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵی داگیرکردو خستییە سەر وڵاتەکەی، عەلەوییەکانی لەپەلوپۆخست و ٤٠ هەزار کەسی لێکوشتن، چونکە گومانی وای لێدەکردن کەسۆزیان بەلای فارسەکاندا هەبێت، بۆیە لەوانی دابڕین ... چوارسەد ساڵ دوای ئەوەش لەساڵانی ١٩٣٧ – ١٩٣٨دا حکومەتی عیلمانی ئەتاتورك هەمان شاڵاوی گەورەی، بەناوی پارێزگاریکردن لەخۆ، کردە سەریان تا ڕادەیەك کەومەچەکانی داهاتویان دەمارگیرتر لێبکات. ئەوەندەی کوردی عەلەوی هەن ئەوەندەو بگرە زیاتریش تورکی عەلەوی هەن، کەبەزۆری لەدەوروبەری تونچلی و مەلاتیای ئەنادۆڵ گردبوونەتەوە، چەند شارەزاو پسپۆڕێك پێیان وایە سەدی ٢٠ی هەموو نەتەوەی کورد دەبن.
یەزیدییەکان کەزۆر چەوساوەن بەناڕەوا "شەیتان پەرست" یان پێدەوترێت، دیسان ئەمانیش بەتێکەڵکردنی باوەڕی زەردەشتی و فارسی و بەبۆچوونی دووفاقانە ڕێگەی خۆگونجاندنیان لەگەڵ، جوولەکەو، دیان و، موسوڵماندا گرتۆتەبەر. لە چەند شوێنێکی پەرتپەرت و پەرش و بڵاو... بەشێوەیەکی سەرەکی لە باشووری تورکیای نزیك سنووری سوریاو عێراق و، لەباکووری سوریاشدا لەجزیرەو ناوچەکانی عەفرین و دەوروبەری چیاکانی شەنگارو ڕۆژئاوای موسڵ لەباکووری خۆرئاوای عێراقیشدا دەژین. عوسمانییەکان لەسەدەی حەڤدەیەمەوە بەردەوام تا کۆتایی سەدەی بیستەم، بۆ وەرگێڕان لەباوەڕەکەیان نزیکەی بیست کوشتاری گەورەیان لێکردوون و، لەئەنجامدا زۆربەیانی ڕووەو باکوور بۆ قەوقاسی و ڕووسیا دەربەراند. لەم

سەدەیەدا گەلێکیان بۆ ئەوروپا بەتایبەتی بۆ ئەڵمانیا کۆچیانکردووە، ئەوشتانەی کەتایبەکەیان لێیانی حەرامکردووە، پۆشاکی شین رەنگ و پیتی "ش"ە ئەویش "لەوترسەوە کەنەکا گیانی شەیتان ئامادەبێت"، نابێ کاهوش بخۆن. لە عێراقدا شەست هەزار کەس کەمترن، لەسەردەمی سەدام حسێندا ئازاری زۆر نامەمولر دراون. "ئەهل الحق" کە حەلەشیان پێدەڵێن، یان ووردتر بڵێین "گیانی" یان پێدەوترێت، بە زۆری لەناوچەیەکی سەر هەردوو سنووری عێراق و ئێراندا، واتە لەباشووری کوردستاندان.

ئەم تایبەتمەندیتییانە بەتێکڕایی پێکهاتەی کۆمەڵگا چیاییە کەلاخراوەکانن، کەلەوبارەی کورددا بەچاکی پێکەوە گونجاون ئەگەرچی ئەوانە لەلایەکەوە هەستی نەتەوەیی کوردیان بەهێز دەکرد، بەڵام لەلایەکی ترەوە ڕێخۆشکەری حکومەتە کانبوو کەدەست لەکاروباری وەرپەن و بیخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە. ڕۆژ هات و ڕۆژ ڕۆیشت و ئارەزووی ململانێکردن و دوژمنایەتییە نابەرپرسیارانەکەی کورد وەک خۆی مایەوەو کێشەکەیانی لاوازکردو، ڕێگەشی بۆ چەندین حکومەت خۆشکردو بەڵگەی چاکیشی بۆ بەرەنگاربوونەوەیان دانی. کێشەی کورد هەرگیز شێوەیەکی خۆرهەڵاتیانەی "هاتفیلدس و ماك کویس" [4] نییە کەنموونەی ئەپەلاشییەکان بوو.

ململانێی نێوان عەشیرەتە کوردەکان هێند کاریگەر بووە، کەبڕیاری سەرۆکی عەشیرەتێکیان بۆ بەشداری لەڕاپەڕینێکدا وای لەوی دی کردووە دووره پەرێز بوەستێت و، ئامادەی وەرگرتنی چەك و پارەی مەجری بێت و شان بەشانی هێزەکانیشی بجەنگێت، بەڕادەیەکی واشە کەلەناو عەشیرەتێکیشدا لێکدابڕان ڕوودەدات و شەڕ لەگەڵ یەکتردا بکەن. لەم سەدەیەدا مەلا ستەفای بەرزانی زۆر نزیکبوو هەستی کوردە نەتەوەییەکان، بە کوردەکانی ئەودیو سنووری عێراقیشەوە یەکبخات، بەڵام چەند کەسانێکی وای لەناو عەشیرەتەکاندا تووشهاتووە کەلەپاڵ میریدا بن و ژمارەشیان لە پشتگیرییەکانی خۆی کەمتر نەبووبێت، بۆیە ناچاری شەڕ لەگەڵکردنیان بووە.

ناپاکێتی بابەتێکی کۆن و بەردەوامی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستە، لە مەلحەمە کۆنەکەی گەلگامێشی بابلییەکانی چوار هەزار ساڵ لەمەوبەردا "ئینکیدۆ"ی بێتاوانی چیاکانی زاگرۆز، دەکەوێتە داوی کارەکەرێکی سووکی پەرستگای خواوەندی خۆشەویستییەوە، قایلی دەکات

---

[4] ئەمەدەی پێشوودا لەسنووری نێوان ڕلایەتی فرجینیای خۆرئاوا و کەنتاکیدا، ململانێیەکی خراپ لەنێوان هاتفیلدس و ماك کویسدا بەرپابوو، کەلەماوەی شەڕی ناوخۆی وڵاتە یەکگرتووەکانی شەستەکاندا هێجگار پەرەی سەندو لە دوا دە ساڵی هەشتاکانیشدا بەشێوەیەك بێلەزەتبوو کەهەمیشە بەسەر زاری خەڵکەوە بێت (وەرگێڕ)

هەموو دارستانە سیدەرەکانی (*) ئەو دەشتانە بپۆشێتەوە، کەلەویش ناپاکییەک هەبوو بۆ بەکۆنە ماوێنەکانی، واتە ئەو ئاژەڵانەی لەچیاکاندا دەژیان، کردی. سەرگوزشتەیەکی تری ناپاکیتی لەم بابەتە، لەکۆتایی ژیانی فەرهاد، کەبەردتاشێکی کوردەو حەز لەشیرینی ژنی شا خوسرەوی دووەمی پاشای فارسی حەوت سەدە پێش زایین دەکات، دەمرێت، ژنە فەرهاد فێڵدەکات ئەو کێوە تیایدا دەژی بڕووخێنێت، بەڵام دوایی وەک ئەرێتێکی دەشت نیشینەکان ناپاکی لەگەڵدا دەکات و، فەرهادیش لەو داخەدا خۆی لەسەر ئەو چیایەی کەدەبوا بیڕووخاندایە بەردەداتەوە. مێژووی کوردیش پڕیەتی لەناپاکیتی بەرامبەر بەخۆیان، تەنانەت جۆرە دەستبۆیشتنی هەندێکیان لەجەنگدا بۆتەهۆی خۆڕێکخستنی سەرەک عەشیرەتە نەخوێندەوارەکان بۆ بە ڕۆشنبیرانی ناو شارو، هەروەهاشیان لەرەنگە ساوێلکەییان تیایە کەبەجێبەجێکردنی چەند پلانێکی کاتی و کورتخایەن ئامادەن بەدەنگی دەهۆڵی هەمی هەڵپەڕن. لەم سەدەیەدا سەرۆکی عەشیرەتە جیاجیاکان، کەلەپێناو حەزو ئارەزووی خۆیاندا دەکەونە ماڵبڕینی خەڵکی، تا لەناوچە بەرتەسکەکەی خۆیاندا ناوبانگ دەربکەن و بایەخیان پێبدرێت و، واشبکەوێتەوە کەهەر ئەوان توانای لەشکر ڕێکخستن و سەرکردایەتیکردنیان هەیە، بە ڕووی پوختە خوێندەوارەکەی ناو شاریشدا بووەستنەوە، کەهاوبیرایەتی هەست و هۆشی نەتەوایەتی دەکەن، بەڵام بازووی بەرگەگرتنیان نییە. ئەم بەربەرەکانییە توندوتیژانە، ڕۆژانی زۆری شەڕی نێوان جەنگاوەرانی چیاو جووتیارە کوردە ژیارییە دەشتەکییەکانیان وەبیر دەهێنایەوە. وەک ئەم سەدە پڕ لەکارەساتەگران و سەختانەی کورد دەریدەخەن، بەربەرەکانی کردنی کوردو حکومەتەکان، بەتایبەتی بەربەرەکانی کورد لەگەڵ خۆیدا هەر لەوپەڕە سەختدا بووە، کەلاخستنیان و گوێ پێنەدانیان و دەست تێوەردانی سەی لەکاروبارێاندا و جۆرە دەمکوتکردنێکی واش، کەپێشبینیکردنیشیان زۆر ئەستەمە، بەدبەختی و خۆشباوەڕیو ناپاکیتی گەورەو گران، هەموو لە حسابەکەدان، لەسەرو هەموو ئەمانەشەوە، کۆچکردنی خەڵکەکەی لەبەر باری ئابووریان و بووژخستنەوەی سیاسیانەو دواکەوتوییان، پەیوەندییە کۆنەکانیانی لاوازکردووە. ئەگەرچی کورد بەهۆی جێگیربوونیان لەشارەکاندا و خوێندن و پەروەردەوە، تەمەگەریتی لەناویاندا کەم بۆتەوە، بەڵام لەساڵانی هەشتاو نەوەدەکاندا حکومەتەکانی عێراق و تورکیا سەرزارەکیانەش بێت، بۆ بووژاندنەوەو دروستکردنەوەی، تۆڕێکی کۆنی پڕ لەساختەو پووچەڵیان، کەبەناوی پەیوەندی بوونیان بەهۆزەوەی و زارەوە خستەگەڕ، تا میلیشیای کورد بۆ بەپێشمەرگە چەکدار بکەن.

---

(*) "سیدەر" ناوی درەختێکە لەچیاکانی لوبناندا زۆرە، وێنەکەشی لەناوەڕاستی ئاڵای وڵاتەکەدا هەیە.

موعجیزەکەی ساڵی ١٩٩١ عەشیرەتەکانی سورچی و برادۆست، کەلەکۆنەوە لەڕیزی حکومەتی عێراقدا بوون، ولێکرد هەموو هێزەکانی خۆیانیان خستەوە پاڵ بڕا نەتەوەییەکانیان، ئاشکرایە کەئەوە شتێکی بەدەرە ڕێساکە یەکالا دەکاتەوە، چونکە لەڕابردوودا لەناو بەشێك لەگۆڕەپانی ئاکادیمیاییەکاندا، وابوو بوو کەباسی بەرزانییەکان و پارتی دیموکراتی کوردستان بەلادێنی و شەڕانی و دەرەبەگ بکەن و لێیان بێهیوابن، جەلال تاڵەبانی و یەکێتی نیشتمانیش بەشاری و مۆدێرن و ئاشتیخواز لەقەڵەم بدەن. بەڵام سەدام حسێن، ژیانی کۆنی کۆمەلایەتی کوردی بەجۆرێکی وابرد کە بەڕادەیەکی زۆر کاریگەرێتی ئەم جیاوازیانە پووچەڵبکاتەوە، گەورەترین دوو کۆمەڵی کوردی عێراق لەکاتی جەنگی کەنداوی ١٩٩١دا و بەهاری دواتری، سوودیان لەناوچە پارێزراوەکەی باکووری عێراقی هاوپەیمانان وەرگرت و هەڵبژاردنێکی ناوچەییانکرد، خۆئەگەر هەڵبژاردنەکە کەمو کورتییەکەی تەکنیکیشی تیابووبێت، بەڵام بەڕاستی ئازادانە بووە، دوای ئەنجامی دەنگدانەکە دەرکەوت PDKو PUK زۆر لەیەکەوە نزیك بوون، بۆیە ڕێککەوتن دەسەڵات لەنێوانیان خۆیاندا بەشبکەن. لەتەموزی ١٩٩٢دا پەرلەمانێکی هەرێمایەتی و بەڕێوەبەرایەتییەکیان لەناوچە ئۆتۆنۆمییەکەی پێشتردا دامەزراند، کەبەڕاستی لە" دەوڵەتێکی ژێر بەژێر" دەچوو، بەڵام واش کوردەکان وریایانە، تا سەبارەت بەدامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ ڕەخنەی وڵاتانی دەرەوە لەخۆیان دووربخەنەوە، ئاڵای عێراقیان بەشەکاوەیی هێشتەوەو جلوبەرگی پۆلیسیشیان وەك خۆی بەکارهێنا.

بەڵام سەرەتای ١٩٩٤ عەشیرەتەکان پێشمەرگایەتی هیچ کام لە PUKو PDK یان نەدەکرد، چونکە دوژمنایەتی نێوانیان دەستی پێکردەوەو لەئەنجامێکی ئاوڵکارانەشی هەبوو، کەسیش پێی سەیر نەبوو، چونکە گرنگترین سێ چەوتەمێڵ؛ جوگرافیا، زمانی ئاخافتن، باری کۆمەلایەتی، لەئارادابوون. یەکێتی دەستی بەسەر شارەکانی هەولێرو سلێمانی ناوچەی خۆرهەلاتی ڕووباری زێی گەورەدا گرت کەبەسۆرانی دەدوان، لەکاتێکدا پارتی بەدرێژایی سنووری تورکیای لەژێر دەستدابوو کەبەکرمانجی قسەیان دەکرد، کەبەزۆری ناوچە دەشتییەکانی باکوور خۆرئاوای ڕووباری زێی گەورە بوون، سیاسەتی هاوپەیمانانیش، بەهۆی گەمارۆی نەتەوە یەکگرتووەکانی سەر عێراق و دابڕانی "سەدام حسێن" لەشۆڕشگێڕانی کوردو، ترسی خۆرئاواییەکان لەپارەتیدانی ئابووریان و، نەبوونی دەستکەوتێکی وا کە کاریەدەستانی ناوچە کوردییەکە کاری خۆیانی پێهەڵبسووڕێنن و مووچەی فەرمانبەرانی پێدابینبکەن، لەتوندوتیژییەکەدا ڕۆڵی هەبوو. هیچ هێزێکی دەرەکی تریش بەرژەوەندی لەپارەتیدانی کورددا نەبوو، ئەگەرچی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بڕیاری لابردنی سەدام حسێنی دا و. پارەی بۆ

کۆنگرەی نیشتمانی عێراق دابینکرد کەلەناوچە کوردییەکەدا جێگیربوو. کورد دەیزانی لەخۆی بەولاوە نابێ گازاندە لەکەسی دی بکات، خەڵکی ئاسایی بەبێزەوە ناویان لە شەڕەکە نابوو "شەڕی خۆ کوژە". بێز کردنەوەکەشیان تا دەهات زیادی دەکرد.

سەرەتای ١٩٩٥ "سی. ئای. ئەی" پێشەکی هانی کۆنگرەی نیشتمانی عێراقی دا، کەهەردوو حیزبە ناکۆکە کوردییەکەی عێراق، بەنیازی ڕاپەڕینێکی ڕێکخراو لەناو سەربازەکانی کەرکوک و موسڵی سەدام حسێندا، بزووتنەوەیەکی سەربازیانە دژ بە سوپای عێراق ڕێکبخەن، کەچی کە چەند هەواڵێکی ئێران زانران، بەوەی گوایە واشنتۆن بەنیازە چاو لەچوونە پێشەوەیەکی ڕێکخراوی سەربازیانەی ئێران بۆ سەر ناوچە زەلکاوییەکانی باشووری عێراق بپۆشێ، لەدوا ساتەکاندا و کاتێک هێرشی کۆنگرەی نیشتمانی عێراق بەرەوپێش دەڕۆیشت و دوو فەوجی عێراقی هەڵتەکاندبوو، ووڵاتە یەکگرتووەکان لەبڕیارەکەی خۆی پاشگەز بۆوە، جگە لەوەش بەهۆی بەشدار نەبوونی حیزبەکەی بەرزانییەوە ڕووخاندنی سەدام حسێن نەهاتەدی. ڕاستییەکەی ئەو سەرنەکەوتنە نیشانەی هەنگاوێکی شوومی کردنەوەی دلە چێنراوەکەی نەتەوەی کوردی عێراق بوو. ساڵی دواتر، بەرزانی لە دژی تاڵەبانی داوای یارمەتی لەسەدام حسێن کرد، کەبووە هۆی نەگبەتییەکی گەورە بۆ دۆستەکانی سیاسەتی ئەمریکاو ڕامانێکی زۆری دۆستەکانی کورد لەهەندەران.

## پەراوێزەکانی بەشی دووەم

## دوای زانیارییەکی وا چۆن لێبووردنێک؟

"هەزاران حەسرەت و..." بڕوانە:

Rene Mauries, Le Kurdistan ou la mort, Paris, 1967 P.1

"زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان" بڕوانە:

David Me Dowall, A Moder History of the Kurds, London 1996 P. 441.

- ئەم خەملاندنانە تێکڕایەکی نزیکەی سەرژمێری چەند حکومەتێکەو کوردە نەتەوەییەکان خۆیان دەتوانن، بۆیە پێویستە زۆر بەووریاییەوە ئیشیان پێبکرێن. هەروەها بەراورد، لەساڵی ١٩٢٥دا کاربەدەستانی کۆمەڵەی نەتەوەکان ژمارەی کوردیان بە ٣ ملیۆن خەملاندبوو، کەنیوەیان لەتورکیادابو ٧٠٠٠٠٠ لەئێرانو ٥٠٠٠٠٠ لە عێراقو ٣٠٠٠٠٠لەسوریادا. لەئەنجامێکی زیادکردنی ژمارەی دانیشتوان، کە کردبوویە پاشکۆیەکی ئەنجامەکە لای ٩ ملیۆنی لێرەدا لەناو خەملاندنە کەمەکاندا
- William Lynn Westerman, in Foreign- Affairs- July. 1949) هەر بە ٢,٤١٩,٠٠٠ کوردی داناوە ٧٠٠٠٠٠ هەزار

کەس لەهەریەک لەئێرانو تورکیاداو ٤١٩,٠٠٠ لە عێراقداو ١٢٥,٠٠٠ لەیەکێتی شۆرەویو ١٠٠٠٠٠ لەسوریادا (کۆی ئەم ژمارانە دەکاتە ٢,٤١٩,٠٠٠ —وەرگێڕ) کوردی داناوە،

Martin van Bruinessen کەسەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوە، لەساڵی ١٩٧٠دا کوردە بەشکراوەکانی بە ٧,٥ ملیۆنی لەتورکیاو ٤-٤,٥ ملیۆن لەئێرانو ٢-٢,٢٥ ملیۆن لەعێراقداو ٥٠٠ هەزار کەس لەسوریاداو ٦٠-١٠٠ هەزار لەیەکێتی شۆرەویدا خەملاند.

ش David Mc Dowal, The Kurds ANation Denied London 1992, P.12

کۆی دانیشتوانی کوردی بە ٢٢,٦٥ ملیۆن دەخەملێنێت:

١٠,٨ ملیۆن لەتورکیادا کەسەدی ١٩ی ٥٧ ملیۆنی هەموو دانیشتوانەکەیەتی ٤,١ ملیۆن لەعێراقدا کە سەدی ٢٣ی ١٨ ملیۆن دانیشتوانەکەیەتی ٥,٥ ملیۆن لەئێراندا کە سەدی

١٠ی ٥٥ ملیۆن دانیشتوانەکەیەتی و وا لەسوریادا ٨٪ دوانزە ملیۆن دانیشتوانەکەیەتی (٠,٥)و ملیۆن لەیەکێتی شۆرەوی پێشوو و ٧٠٠٠٠٠ لەشوێنانی دی بەنزری لەئەورووپای خۆرئاوادا.

**"ناوچەیەکی شاخاوی دابڕاوی پێشەرویەر" بڕوانە:

Mehrdad R.Izady, The Kurds: Aconcise Handbook, Washington and London 1992, P.41.

- "نزیکەی ٤٠٠ هەزار کوژراو" هەمان سەرچاوەی پێشوو.
- "٧٠٠٠٠٠ نیوەیان مردوون" بڕوانە:

The Kurdish Case Against Turkey, Princeton 1929P. 33-34.

لەنووسینی سورەیا بەدرخان کە ئارشاک سافراستەین لە:

Kurds and Kurdistan, London1948 P.76

ئاماژەی بۆ کردووە، بەڵام چەند سەرچاوەیەکی دی ژمارەی کوردی کوژراوی شەڕ بە ٧٠٠٠٠٠ خەمڵاندووە، بڕوانە گەندال نەزان لە "گەلێکی بێ وڵات"دا

Gerard Chaliand, A People without country

- "کوردستان وڵاتێکی ژێرخان داتەپیو بوو " بڕوانە: The Kurds, Izady, P.59.
- "دارشتنی مێژووی کورد" هەمان سەرچاوە: P.59
- "کوردەکان دەتوانن زیاتر لەو خەڵکانەی ئەمڕۆ لەئەورووپادا دەژین لای توخم و ڕەگەزایەتی لێبدەن" بڕوانە: Westerman, in foreign Affairs (july,1946)پ
- ئەگەرچی هەر لەکەمبوونەوەدان،بەڵام چەند شارەزایەکی پسپۆر..." Foregn Afatstjuk 1946 بەشی ٤ لاپەڕە ٣١ بڕوانە: The kurds, Izady P.P. 145-158

* دوژمنایەتی واتە Feuding بڕوانە: Middle Est Report (Juli- Auguost, 1989) by Martin van Bruinessen.

## (٣)

# هەڵخەڵەتاو

سەرلەبەیانی جەژنی "ئیستەر"ی ١٩٩١، کاروانە بچوکە ڕۆژنامەگەرییەکەمان گەیشتبووە سەرەتای پێچەتیژەکانی ڕێگا پڕ لەکۆسپەکەی ڕووەو هاوینە هەواری سەلاحەدینی ناو چیاکانی عێراق، کەبنکەی سەرکردایەتی کوردەو لەوێ بەدوا بەشوێنێکی سەلامەت دادەنرێت، لەپێشیشمانەوە تا چاو بڕکات، بەسەدان ئۆتۆمۆبێل، لەتایبەت و پاس و لۆری و تەکسی و تەنانەت تراکتۆری بەعەرەبانەشەوە، بەدرێژایی هەموو دۆڵەکانی خوارمانەوە، لەگەڵ کەلێکی دی کەبەرمولای ئێمە دەماتن، لەتیس مابوون و بەستنی ڕێگاکە پەنگی پێ خواردبوونەوە. گرفتی سەرەکیشمان هەر ئەو ڕێگا بەستنە نەبوو، بەڵکو ئەو کۆپتەرە سەربازیانەی سوپای عێراقیش بوون کەبەچاو دیاربوو لەودیو سەلاحەدینەوە خەریکن و بەگەرمەشیاندا دەزانرا، خۆیان ئاسایی مووشەک و گوللەبارانی ئەو ئۆتۆمۆبیلە جۆراو جۆرانەدەکەن کەیەک دوو سەعاتێک لەمەڵاتنەکەی هەولێریانـدا دواکەوتوون و گیریان خواردووە. داخۆ کەی نۆرەی ئێمەش دێت و لەسەر تەپۆڵکەکانەوە تفەنگی کۆپتەرەکان بەدیار دەکەون؟.. بەمجۆرەو دوای پێنج ساڵ هەوڵی بەردەوامی گەیشتنە کوردستانم بەمەبەستی دانانی کتێبەکەم، کەوتبوومە ئەم شوێنەوەو دەمویست لەگەڵ ئەو برادەرانەی لەتەکمدا هاتبوون دەربازبین. بەهیچ شێوەیەک بیرم لەهیچ شتێکی نابەجێ و ناڕێزێتی ئەم کارە ساویلکەییەم نەکردبۆوە کەبەتەنیا خۆم تیایدا خاوەن بڕیاربووم. کە خۆم بیردەکەوتەوە چۆن چوار ساڵ پێشتر لەزستانی "فۆرگیس"دا پێڵاوی ئیتالیانەی تایبەت بە ڕۆیشتنی سەر بەستەڵەکیم تاقی دەکردەوە، چۆن چۆنیش لەواشنتۆن دەستەی نووسەرانم بەباسکردنی کورد، وا جاڕسکردبوو چاویان پەڕیبووە پشتی سەریان، چۆنیش لەکاتێکی وادا دەوروخولی سەرکردە کوردەکانم دەدا، تا یارمەتیم بدەن بگەمە کوردستان کە ئەوان دەبوا بەکاری باشترەوە خەریکبوونایە، هەر ئەوکاتەش زانیم، کەچۆن لەو

کاتی سەرقاڵیتییەمدا، ساوێلکانە باری سەختی کوردستانم پشتگوێ خستووە، جا ئەگەر تۆش وەکو کورد ئەوەندە بەدبەختی کە لەو وڵاتەکەی خۆت هەڵێی لەوا پێت سەیرنەبێت کەشۆڕش و جەنگ و راپەڕین و هەرەسی ئیمپراتۆریەتەکان، هەمووی بەهەواڵی خۆش بەسەرتا بشەکێنەوە، وەک چۆن پۆڵەندییەکان لەکۆتایی سەدەی هەژدەوە تا بەلادا کەوتنی یەکەم جەنگی جیهانی وڵاتەکەیان لەلایەن سێ ئیمپراتۆریەتەوە داگیرکرابوو، بەڕوونی پەیدا، ئەگەرچی پۆڵەندییەکان چەند راپەڕینێکی یەک بەدوای یەکیان بەرپاکرد، بەڵام دراوسێ دڕو چاو برسییەکانیان وڵاتەکەیانیان هەر بەتەواوەتی لەسەر نەخشە سڕییەوە. کوردیش، کەمیچ کاتێک بەدەوڵەتی خۆی شاد نەبووەو، چەندە توانیبێتیان خۆیان بە ئۆتۆنۆمییەکی پاشکۆیەتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و فارسییەوە بەستۆتەوە، جاروبارێش بەرلەوەی هێزێکی سەختی مل پێدانیان لەپایتەختەوە بۆ رێکخرابێت و چۆکیان پێدرابێتەوە، چەند بەشێکی وڵاتەکەیان بەسەرکردایەتی میرێک یەکیگرتووە، بەڵام بیری نەتەوایەتی نوێ و بەهیوایی دامەزراندنی دەوڵەت، لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە، لەسەر داروپەردووی داڕماوی ئەو ئیمپراتۆریەتانەوە سەری هەڵدایەوە، یەکەم جەنگی جیهانی بەڵێنی سەربەخۆیی بۆ کورد لەئیمپراتۆریەتی عوسمانی لێنەکەوتەوەو بەهیچی نەگەیاندن، بگرە زیاتر دەمکوتکران و لەبوارێکی تەسک نران، حکومەتە ناوەندییەکانیش بەهۆی زیادبوونی دەسەڵاتیانەوە، مەودای بیرکردنەوەیان تادەهات تەنگتردەبوو و ستەمیان بەرامبەریان زیادیدەکردو بۆ نەتەوەکەی خۆیان دەمارگیرتر دەبوون.

کوردستان وڵاتێکی دابەشکراوە، سەرەڕای بوونی سامانی نەوت و ئاو بەڵام لەڕووی ئابوورییەوە دواکەوتووە، بەسەر دوو جۆرە ئیسلامدا دابەشبووە، پێنج سنووری سێ زمان و سێ "ئەلفوبێ"، کەچی واش هەربەهۆی کوردەوە ماوەتەوە. ئەگەرچی کورد بەکەللەڕەقی خۆیان ماون، چونکە هەمیشە هەر دۆڕاو بوون، بەڵام واش بەهۆی خوێن گەرمی و ڕووخۆشی و ئازایەتی و ڕۆح سووکی و دڵڕەقی چاوەڕوان نەکراو بەڵام کورتخایەنیانەوە هەر خۆشەویست بوون. ناوی کورد لەچەند نووسینێکی سەربازییە بیانییەکانی وەک زەینەفۆن لەسەدەی چوارەمی پێش زایینداو "هیلموت ڤون مولتکە"ی لە ١٨٣٠دا، کە دواتر بۆتە فیلد مارشاڵ لەبرووسیا، هاتووە. مۆلتکە هێشتا گەنج بووە، بۆی دەرکەوتبوو کە هەردوو نەتەوەکەی کوردو عەرەب حەز بەجەردەیی دەکەن، زیاتر عەرەب وەک دزو کوردیش بەزۆری وەک جەنگاوەر.

بەڵام دەگونجێت سەربازێکی گەنجی برووسی بەهەڵە لەشتەکان گەیشتبێت. سەدەو نیوێک دوای ئەوە کۆمەڵە رۆژنامەنووسەکەی ئێمە، بەچاوی خۆیان سەرزادانی کوردیان بەدەست عەرەبەوە بینی. کە سوپا تێکشکاوەکەی سەدام حسێن، هێشتا کوشت و بڕی لەتواناندا مابوو

کوردی. کۆمەڵەکەی ئێمە نزیکەی دەرزەنە ڕۆژنامەنووسێک دەبووین و شارەزایی ئەوەمان، بەتایبەتی لەجۆری تاوانی سوپایەکی بەزیودا هەبوو، چونکە بەچاوی خۆمان بینیبوومان. وەچەیەك پێشتر لەگەڵ وێنەگر "دۆن ماك کوولن" و "مارتن وولاکوت"ی ڕۆژنامەی "گاردیان" کەئەمجارەش لەگەڵماندا بوون، "جولی فلنت"ی ئوبزێرڤەرو "مارك گرانتز"ی لیبراتیون و "چارلس گلاس" و تیمەکەی "ئەی. بی. سی" کە هەموویان لە وردە شەڕە بەردەوامەکانی ساڵانی حەفتاو هەشتاکانی لوبناندا سەلامەت دەرچووبوون. "گواینی روبرتس" کەبیست ساڵ لەوەبەر لەمزێتردا دەستی بە بڵاوکردنەوەی هەواڵی کورد کردبوو، تا ئێستاش خەریکی دەرهێنانی فیلمێکی تەلەفیزۆنیانەی وایە کە بێلایەنانەو پڕ بەڵگە بێت. نوێنەری وەچە گەنجترەکانی، وەك "جیرالدین بروکس"ی "وولستریت جورنال وەیلا مارتی"ی "سود ئوست"ی شاری "بوردولکس" و "سکوت پیتەرسون"ە "دیلی تیلگراف" لە ئاودا هەبوو.

کەدەنگی تەقەی کۆپتەرەکانم دەبیست، ترسێکم لێنیشتبوو، بۆیە کۆڵەوارە شوەکەم باسە دڵتەزێنەکەی "ئەندریە مارلوکس"ی بەگوێمدا دەدایەوە، کەساڵی ۱۹٤۰ چاوەڕوانی ئەوساتە بووە ئەڵمانییەکان گوللەبارانی دەبابە فەرەنساییەکەی بکەن کە کەوتبووە ناو جۆگەیەکەوە .. لە نزیکمانەوە پیاوێك دەستی بەسەری منداڵێکدا دەهێنا کەموشەکێکی کۆپتەرە جەنگییەکان خراپ سووتاندبووی. چوار پێشمەرگە "سل لەمەرگ ئەکەرەوە" وەك پارتیزانەکان بەخۆیان دەڵێن، ئەخشەیەکی لەپاش بەجێماوی سوپای عێراق بەلوولکراوی لەبن باڵی یەکێکیاندابوو بەڕلکردن بەبەردەممماندا تێپەڕین، پێدەچوو هەڵاتنەکەیان کوتوپڕ بووبێت، چاوەڕوانی ئەوەش ئەدەکرا کەزیاد لە یەك ملیۆن کورد لەدویانەوە بێت. جارێکی تریش وولاتە یەکگرتووەکان پشتی لەکورد کردو، شۆڕشێکی تری کوردیش پوو لەئەمان بوو. ڕۆژی ۲۹ی ئازار لەشاری سلێمانی گوێم لەهەواڵە جیهانییەکانی سەعات پێنجی دەمەوبەیانی بی.بی.سی دەگرت، کە پەخشکەرەوەکە لەزمانی دەزگای حکومەتی ئەمەریکاوە هەواڵی گرتنەوەکەی دوێنێ ئێوارەی کەرکوکی گەورەترین ناوەندی نەوتی باکووری وڵاتەکەی یەکلا دەکردەوە. بۆ یەکەم جار هەستم بەڕوودانی کارەساتێککرد کەبەکەس ئەگێڕدرێتەوە. هەرچەندیش دەمهێناو دەمبرد گومانم لە لەبەئاگایی ئەمریکاو گرتنی وێنەی ناوچەکە بەفڕۆکەکانی ئەکرد، کەبۆ بەدوادا چوون و خۆئامادەکردنی سوپای عێراق، ڕۆژی پێنج شەممە بە چاوی خۆمان بینیمانن بەسەر کەرکوکدا هاتوچۆیان‌ئەبوو. هیچ ئاماژەیەکیش لەبانگەوازەکەی ۱۵ی شوباتی سەرۆك "جۆرج بۆش"دا نەبوو، تا سلەبوونەوەی ئەمەریکا بەڕادەیەکی وا بگەیەنێ کەبەتەواوەتی دەستبەرداریان بووە، تیایدا داوای لەسوپاو گەلی عێراق دەکرد هەموو کارەکە بگرنە دەست، لەکاتێکیشدا کەمێشتا

ئیزگەکەی رادیۆی "CIA" کە لەعەرەبی سعودییەوە دژی بەغدا دەدوا، بانگەوازی بۆ عێراقییەکان بڵاودەکردەوە کە سەدام حسێن لابەرن، تا ٣ی ئازار، واتە ٣ رۆژ دوای ئاگربەست و بەتەواوی کۆتایی هاتنی شەڕی گەردەلوولی بیابانی هاوپەیمانان هەربەردەوامبوو. چۆن چۆنی ئەو ورشانەی کەبۆش زۆر بەوردی هەڵیبژاردبوون و، قسەکانی ئەو ئیزگەیەی کارە ئاڕەواکانی دادەپۆشی لەبیردەچنەوە. ساڵی ١٩٥٦ سەربازێکی تایبەتبووم لەئەوروپا، کاتێک واشنتۆن بەرپرسی بەکارهێنانی ئیزگەی رادیۆی "ئەورووپای ئازاد"ی CIA بوو، هەرچەمکیانە هانی شۆڕشگێڕیتی هەنگارییەکانی دەدا، کەچی دوایش کەتانکەکانی شۆرەوی ئیزگەکەیان لەبنوبیخدا هەڵتەکاند دەستەپاچە مانەوە، ئەوە واتەیەکی وابوو کەئەمریکاییەکانی هاوتەمەنی من لەبیریان بچێتەوە، بەڵام ئەمجارەیان هاندانە بێسەرو بەرەکەیان لەئیزگەیەکی ناو قووڵایی جەنگی ساردەوە نەبوو، بەڵکو لەسەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە بوو، کەبەپێی شارەزاکانی خۆی تاکە زلهێزی ئەم دونیایەیە.

ئەوەی زیاتر کێشەکەی ئاڵۆزاندبوو دەستگرتنی کورد بوو بەسەر ناوچە ئازادکراوەکاندا، کەلەخۆیاندا پڕ مەترسی بوون، ئەگەرچی هەر یەك هەفتە بەسەر گەیشتنەکەماندا تێپەڕیبوو، بەڵام هەمەجۆر راستیمان بینیبوو، تەنانەت لەو ١٠ رۆژەشدا کە کوردەکان دوای ٧٠ ساڵ تێکۆشان بۆ یەکەم جار دەستیان بەسەر شاری کەرکوکدا گرت و، هێشتا بەتەواوی هەر ٩ هێڵە بەرگرییەکەی بنکەی ستراتیژی "خالد ابن ولید"ی زەمینی و ئاسمانیان نەگرتبوو، چوار شەممە شەوەکەی، "گلاس" و تیمەکەی و "ماك کولن" لەکەرکوکەوە بۆ هەولێر گەڕابوونەوەو بەچاوی خۆیان لە نزیك ڕێگاکەوە شەڕیان بینیبوو، رۆژی دواتریش تانکی عێراق شاری ئاڵتونکۆپری، کەلەناوەندی سەر ڕێگای کەرکوك هەولێردایەو دەکەوێتە سەر زێی بچووك گرتووە. کەرکوکیش بەئۆتۆمۆبیل و بە ڕێگا ناپاکەکەیدا هەر سەعاتە ڕێیەك لەسلێمانییەوە دوورە، بێگومان سوپای عێراقیش، ئەوەندە بەبەرەوە مابوو کەهەر کاتێك بیەوێت بەرگریکردنی کورد تێکبشکێنێت. هێشتا مانگێکی تەواو بەسەر کۆتاییپێهێنانی حەوت مانگ داگیرکردنەکەی کوێتی سەدام حسێندا تێنەپەڕیبوو، کەلە ٢٨ی شوبات و، لەئەنجامی شەڕێکی ١٠٠ سەعاتەی زەمینی هێزە هاوپەیمانەکاندا، بەسەرکردایەتی ئەمریکا هێنرایە دی، سوپا زەلیلکراوەکەی جارێکی دی بۆ تێکشکاندنی راپەڕینەکەی کوردستانی عێراق بەخۆیدا هاتەوە، چونکە چەند رۆژێك پێشتر شیعەکانی باشووری کۆنترۆڵکردبوو.

لە ئوتێل "ئاشتی" سلێمانی، بەهۆی دیزانترییە ناهەموارەکەی چەند ساڵێك پێشترەوە، بەناچاری لەناو جێگادا مابوومەوە، بەوردی بیرم لەو قەیرانە دەکردەوە کە کوردو ئێمەشی

تێکەوتبووین، دەرفەتی بەدوالکەوتنی براەدرەکانم نەبوو کەلەناو شاردا خەریکی کۆکردنەوەی هەواڵ بوون، تا لەمەترسی ئەوبارەی کەخۆم زۆر بە چاکی دەرکم پێدەکرد ووشیاریانبکەمەوە، هەر سێ ڕۆژ پێشتر لەهەواڵی ئەو سێ ڕۆژنامەنووس و وێنەگرەی کەلەسووریاوە لەگەڵماندا هاتبوون و لێکدابڕابووین هەراڵیانمان بوو [6] دوای پاڕانەوەو تکایەکی زۆر لێیان، کەچی هەر لەسەرمانەوەی خۆیان لەکەرکوکدا سوور بوون، کە "وولا کۆت" هاتەوە ئۆتێل لەگرتنی کەرکوک ئاگاداریکرد، وتی: "چاک ئاواتی چوونمان لەگەڵ چەکدارە کوردەکان بۆ بەغدا هاتەدی!" براەدرانمان ووریاکردەوەو بەپەلە بەئۆتۆمۆبیل ڕووەو سەلاحەدین، کەهەر سێ سەعاتێک بەئۆتۆمۆبیل بۆلای باکوورەوە دوورە، کەوتینەڕێ؟. ئێوارە دونیا خەریکبوو تاریکدادەهات، لە دەرەوەی سلێمانی بۆ قسەکردن لاماندا، پەنابەرە تۆقیوە ماندووەکان، کە لەکەرکوکەوە نزیکەی ٧٠ میلێکیان بەپێ بڕیبوو، دەیانوت: کۆپتەرە جەنگییەکان لەناو کەرکوکدا بەفۆسفۆڕ لێیداون و دواتریش بەمووشەک و گوولە تەقەی لێکردوون و، لەسەر ڕێگا سەرەکییە کۆنترۆڵکراوەکەش، چی دیناری عێراقی لەگیرفانیاندا بووە لێیان سەندوون. ئەوان بێ ماڵ و حاڵ مابوونەوەو پارەیان پێویستبوو، ئێمەش بۆ گیانی خۆ دەرباز کردن و گێڕانەوەی بەسەرهاتی کەسانێک کە ناپاکیان بەرامبەر کرابوو، دەبوا بەزووترین کات لەعێراق دەرچووینایە.

راپەڕینی کورد لەدەستپێکردنییەوە گومانێکی زۆر لەسەرکەوتنی دەکرا، بەڵام چۆنێتی هەرەسهێنانەکەی وا بەخێرایی چاوەڕوان نەدەکرا. دەمانزانی چوونمان بۆناو باکووری عێراق لەهەموو ڕوویەکەوە پڕە مەترسییە، ڕەشبینییەکەمان لەوهەواڵە زۆرە گوماناویانەوە بوو کەلامان گردەبوونەوەو بەتەواوی دڵگرمییان کردبووین و زیاتر لەهاتەدانی خەونێکی نیمچە بەئاگایانەیدەکرد. ئامادەبوانی تیمەکانمان ووریاکردەوە، چونکە زۆربەمان هێندە ئەرکی هەواڵنێرێتی جەنگمانکردبوو بۆیە کاری زۆری وەک؛ بەدبەختێتی، درۆ، بەتەمای چەوتکاری، دواکەوتن و ئازێرێتی، کەش و هەوای خراپ، نەخۆشی کتوپڕ، پێ لەسەر بیرۆکراتییەت داگرتن، کشانەوەی کتوپڕ، جیوەئاسا جێگۆڕکێکردنی کاربەدەستە ڕەسمییەکان، لێکدانەوەو شیکردنەوەی نابەجێی کارە سەربازییەکان، ئامۆژگاری ناپەسندانەو هەندێ جاریش بۆ دڵگرمێکردنمان، ڕێنیشاندەرانی کەمتەرخەم، لەدەبوونی بڕوا، شۆفێری تەمەڵ، کەرەسەی ناتەواو بەتایبەتی ئۆتۆمۆبیلی بێکەڵکی وا کەموتمانە بەدەستۆپە نەفرەتییەکەی نەکرێت، کەم بەنزینی، تایەی بێفەڕ ویسکی خراپ، لێکدابۆوە.

---

[6] "جاندگروس" تازە لەزانکۆی "هارڤەرد" دەرچووبوو ئەمەش یەکەمجاریبوو لەکارێکی وادا بەشداربێکات، کاتی گرتنی کەرکوک، بەدەستی سوپای عێراق کوژرا، دوو برادەرەکەشی گیران و پاشان ئازادکران.

ئێمە تا ڕادەیەک لەو دوو ئامێری تەلەفۆنە بێزار ببووین کەلەڕێی سەتەلایتەوە بەکاردەهێنران و بەپێی ئەو پڕوپاگەندە زۆرەی بۆیانکرابوو، ئەگەر هاوپەیمانەکانیش گشت هۆیەکی پەیوەندیکردنی عێراق ئیتەو پێیە بدەن هەرکاری خۆیان دەکەن و پێوەندیکردنمان بەدونیای دەرەوە مسۆگەر دەبێت، کەچی هەر لەسەرەتاوە بەهیچ شێوەیەک ئیشیان نەکردو نەکرد. ئەوەی تەواو ئێمەی پەشۆکاندبوو، بەردەوامی ئەو هەواڵانەبوون کەلەبەردەمماندا کەڵەکە دەبوون و هەرمان پێیان نەبوو. بەرگریکردنەکەی شیعەی خوارووی عێراق تا دەهات زیاتر هەرەسیدەهێنا، گردبوونەوەی هێزی سوپای عێراق لەخوارووی کەرکوکدا، ناپاکیتی هەندێ لە هێزە ئانیزامییەکانی کورد و کشانەوەیان، ئەگەرچی بەشداری ڕاپەڕینیشیانکردبوو بەڵام چووبوونە پاڵ بەغدا، بەرەوپێشەوە چوونی "موجاهیدینی خەلق" کە ئۆپۆزسیۆنی ئێرانین و دژ بە دەسەڵاتی ئیسلامی ئێرانن و کوێرانە فرمانی بەغدا بەجێدێنن و بەچەکی قورسەوە،بەرامبەر دەست بەسەرا گرتنی بنکەو پارە کاریان مەیسەر دەهێنا. سەردانێکی وێستگە نوێیەکەی شەمەندەفەری کەرکوکی بەرەی پێشەوەی شەڕ، ئەو هێڵە سوورە ستاندەرەی دەگەیاند؛ شەقامی کپ و خامۆشی پێ منداڵ و بگرە هاتوچۆکەرانیش، دەگمەنی ئۆتۆمۆبیل و بەدزییەوە هاموشۆکردنیان، خامۆشییەک کەناوە ناوە تەقەی دوژمنکارانەی تفەنگی دوورکوژی ئار. بی. جی. شەقیدەکرد.

بەدرێژایی هەفتە گەر پچڕ پچڕیش بووبێت ئێمە هەرباسی دەربازبوونی بەپەلەی خۆمانمان لەعێراقدا کردبوو، ئەویش کەڕاپەڕینەکەی کورد شکستهێنانی پێوەدیار بوایە، بەڵام هەر قسەبوون و بەبێ ئەنجام مانەوە. عێراق، تەنانەت لەکاتی زۆر باشیشدا، ناوبانگی توندوتیژێتی لەگەڵ ئەو بیانیانەی بێڤیزە دەگیران دەرکردبوو، کەبێگومان ئێمەش هیچمان ڤیزەمان نەبوو. گەڕانەوەمان بۆ سووریاو بەو ڕێگایەی پیایدا هاتبووین ئەگەری زۆری تیادابوو. لەهاتوچۆی هەولێر – کەرکوکیشماندا، بۆماوەی سێ ڕۆژ لەناو لیتاودا گیرمانخوارد، تاچاربووین بەنشێویدا، بەناو دۆڵ و ئاوو قاچاخە ڕێی قیتاو ئەکرلوی ئەو دەشت و کێوە سەوزە ئاودارانەدا بڕۆین کەزۆر دەڵێی "میکۆنگ" ی ڤیتنام دەچوون، کورد تەنانەت کەهەموو ناوچەکەشیان بەدەستەوەبوو ڕێگا سەرەکییەکانیان هەر وەک ئێستا بەناتەواوی بۆ کۆنترۆڵکرابوو، بۆیە کەبەرەو باکوور دواتریش ڕووەو خۆرئاوا، ڕێگەی سنووری تورکیا بوونەوە، ڕێگاکە ڕێی بەرزانی پێدەوتراو ئەمیش هەر لەئاسان نەدەچوو، ئاگادارییانکردین کەئۆتۆمۆبیلی دەبڵ ئەکسل نەبێت لەو ڕێگایە دەرناچێت، ئێمەش ئوتومۆبیلی وامان نەبوو. بەدرێژایی ٢٠٦ میل سنووری بەتورکیاوە، تاکە شوێنی پەڕینەوەی ڕەسمیان پردی دۆڵی سەر ڕووباری خاپور بوو، کە لەگۆشەی باکووری

خۆرئاوایەوە نزیك بەشاری زاخۆ، بەناو ناوچەیەکی شاخاوی و مێرگزارکراوی ناهەمواریشدا دەڕۆیشت، نزیك ئەو شوێن پەڕینەوەیەی زووتر لەسووریاوە، بەکەڵەکی چووبی تایە، بەدیجلەی بەبارانتاو هەستاودا، نزیکی فیشخاپوور، لەسەردای هاوەنی سەربازە عێراقییەکاندا لێی پەڕینەوە، چونکە سەرەتای ئازار عێراقییەکان لەکشانەوەیاندا پردەکەیان تەقاندبۆوە. تورکەکانیش تەقەیان لەو کەسانە دەکرد کە هەوڵی پەڕینەوەیان لەعێراقەوە بۆناو تورکیا بدایە. پێدەچوو ئێران باشترین شوێن بێت، چونکە نزیکترین سنووربوو، بەڕێی ڤیتاریشدا هەروا دووسەعاتێك دوورە، لەوێشەوە فڕۆکەخانەیەکی لێبوو، کە ڕۆژانە دوو سەفەری تارانی لێوە دەکرد و هەروا سەعات و نیوێکیش دوور نەبوو، بەڵام هیچ کامێکمان ڤیزەی ئێرانمان نەبوو، ئێرانیش سام و مەترسییەکی وای دژ بە خۆرئاوایی و بەتایبەت ئەمریکاییەکان هەبوو، کەئەگەر چەند پاسدارێکی شۆڕشی دڵگەرمێی سنوورەکە لەگێڕانەوە خراپتریان بەسەرنەهێنایایە ئەوا گێڕانەوەکەمان مسۆگەر بوو.

ئێمە لەگێژاوێکی وادا بووین، هەستمدەکرد کەدەبوا سەرزەنشتێکی زۆری من بکرایە. بەرلە ١٦ی کانوونی دووەم تەقاندنی یەکەمین گوللەی ڕزگارکردنی کوێت، من هەر بەدوای کوردەکانەوە بووم، بەتایبەتی مەسعودبەرزانی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستانی کۆنترین پارتی نەتەوایەتی کوردستانی عێراق و، یەکێکیشە لەدوو سەرۆکەکەی "بەرەی کوردستانی" کەهەشت حیزبەکەی کوردستانی عێراقی تێدا کۆبۆوە، دواجار لەپێناو یەکگرتنی ڕیزی نەتەوەییەکانی کورددا بەسەر کۆنە ململانێکەیاندا زاڵبوون. من هێند بەختەوەربووم، سەرەتای شوبات ڤیزە ئێرانییەکەی پێشتر بەڕێکەوت و خۆشبەخت وەرمگرتبوو نوێمکردبۆوە، بەڵام وەك لەبیرم بێت، هەر بۆ ئەوەندەبوو کەلەتارانەوە پێی بگەمە ناو چیاکانی نزیك ورمێی نێوان عێراق و ئێران کەبینەکەی مەسعود بەرزانی لێبوو.

ئەگەر بەفڕۆکە بچوومایە تا ڕادەیەك کارەکەمی ئاسانەکرد، بەڵام کۆمەڵەکەی بەرزانی نەیانتوانی بلیتی فڕۆکەم بۆ دابینبکەن، بۆیە لەکاتی دیاریکراوی نێوانمان تاقێك دواکەوتین، دووشۆفێری هەرزەکاری کورد و وەرگێڕە بەڕێزەکەی بەرزانی "سیامەند بەنا" بەئۆتۆمۆبیلێکی پەیکان کە کۆکردنەوەو پێکەوەنانی پارچەکانی ئیشی ئێرانییەکان خۆیانبوو، دەرکەوتن. بەهەرحاڵ تا ئەوکاتەش دەمتوانی پاشگەز ببمەوە نەچم، بەڵام خوا ئاگادارە ئەو کاتە بەڕاستی وا لەسەرخۆم نەبووم کە ئەرزگاری زووی ناو ئێران و ئەتەنگەبەری و ماردەتی ئەو ئۆتۆمۆبیلانەی کەتەنیا بۆ هاموشۆی ناو شار دەستدەدەن بەبیربێتەوە، کەچی کەلەسەر بەفری ڕێگایەکی گردۆڵکاویدا خزا، ئەمجا زانیم خۆم خستۆتە ناو چییەوە!! ١٦ سەعاتی ڕەبەق

ڕێکردن، ٣ سەعات نووسین، ٣ سەعاتی تریش چاوپێکەوتن لەگەڵ بەرزانیداو ١٦ سەعاتیش بۆ تاران گەڕانەوە. لێدانەوەی یەکبینەی کاسێتێکی گۆرانییە کوردییەکانی شیڤانپەروەر، بەردەوام ووشیاریدەکردینەوە، بۆیە سوپاسی هەڵدەگرت، بەتایبەتی لەرینەوەی ئەو ئاوازە بەسۆزەی بەسەر هەزاران کوردی مەدەنی شاری هەڵەبجەدا هەڵیدەدا، کە سەدام حسێن لەئازاری ١٩٨٨ دا بە گازی ژەهراوی لەو شارەدا لەناوی بردبوون، ئەوە یەکەم جار بوو لەمێژوودا حکومەتێک بەوڕادەیەو بەکۆمەڵ دژ بەمەدەنی خۆی گازی ژەهراوی بڕێژێت، (عێراق ساڵێک پێشتر بەچەند کارێکی سەربازیانەی بەرودوای گچکەتر دەستی بەگاز پیاداکردنی کوردە مەدەنییەکان کردبوو، هەرچەندە کۆمەڵگەی نێو دەوڵەتی ئاگاداربوون، بەڵام پشت گوێیان خستن. مشتو مڕە زۆرەکەمان کەهەندێ جار تووڕەیی و گرژیشی تێدەکەوت، بە "ناو" لێکۆڵینەوەیەکی لەبنەهاتوومان دەکرد، جا با بۆچوونی جیاوازیشمان لەبارەی کێشەی نەتەوەی کوردیشەوە هەبووبێت، بەڵام وادەستییپێکردو دەرچوو کە باسێکی زۆر بەنرخە. زۆر ڕاگرتنمان بەهۆی ئەو هەموو پازگایەی دانرابوون وایکرد ئەو ڕێگا دوورو درێژە بەبێ گرژیو بێ پەستبوون بڕین. برادەرە کوردەکانیش، کەدەیانبینی هەواڵگرە ئێرانییەکان بەدەست گومانکردنە "پاڵۆزە" یانەکەیان لەپاسپۆرتە ئەمریکاییەکەی منو، "بەرگە" تایبەتیەکەی پاسدارانی بالادەستی شۆڕشەوە پەشۆکاوو داماون، زۆر کەیفخۆشدەبوون.

چاوپێکەوتنەکەی بەرزانیم لەژێرزەمینێکی ناوچەیەکی شاخاوی بن بەفردا کرد، کە سەبارەت بە کاری تایبەتی و، زۆربەشی بۆ هێورکردنەوەی مەترسییەکانی تورکبوو لەوەی گوایە ئێستا کورد لەبری داوا کۆنەکانیان کەتەنیا ئۆتۆنۆمی ناو عێراقێکی دیموکرات بوو، سەربەخۆییان دەوێت. بەرزانی وتی، کورد لەوە گەیشتووە کەئەگەر زۆربەی دونیا بۆ پاراستنی سنووری کۆنت جەنگابن، ئەوا هەر ئەو هۆیان وادەکەن کە هیچ کەسێك بەدامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ قایلنەبێت، جا ئەو دەوڵەتە لەعێراق یان لەئێران یان لەتورکیا دابڕێت. ئەوە پەیامێکی وابوو کەبەرزانیو سەرکردە کوردییەکانی دی یەکبینە، بۆ هەوڵە سەرنەکەوتووەکانیانو دڵنیاکردنەوەی لێپرسراوە دڵگرمێکانی ئێرانو سوریاو تورکیاو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کە بەردەوام دەهۆڵی پاراستنی یەکپارچەیی خاکی عێراقیان دەکوتا، دەیان وتو دەیانوتەوە. بەڵام وەك بەرزانی دەرکی پێکرد، دەبوا ئەوە بەشێوازی ڕامیاریانە بهێنرایتەدی نەك بەخەباتی چەکدارانە، وتیشی ڕەنگە بەهۆی باری ڕامیاریانەوە دواکەوتوو، هەندێ جاریش بەهۆی توندوتیژی نالەبارەوە کەئێستا لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا پێڕەودەکرێت، سەدەیەك یان زیاتریشی بوێت.

سالانێك بوو بەرزانیم نەبینیبوو، قاچە پچووك و بالوكە وردەكانی دەموچاویم لەبیر چووبوونەوە، بەلام ئەو تاوان و بەسەرهاتە ناهەموارانەی خەڵكەكە بەدەست هەستەرلووانی وولاتە یەككگرتووەكانی ئەمریكا بەتایبەتی و كۆمەڵی نێودەوڵەتی و هێزە ناوچەییەكان بەگشتی چەشتبوویان و بەرزانیش لێیان بەئاگابوو، لەبیر نەدەچوونەوە. وێنەیەكی گەورەی خوالێخۆشبوو ژەنەراڵ مەلا مستەفا بەرزانی باوكی، وەك نموونەیەكی بەرجەستەبووی نیوسەدەی نەتەوایەتی نوێی كورد، لەدیوارەكەوە تیژ بۆ خوارەوە دەیڕوانی، بەرزانی گەورە كەبەئادگارە هەڵۆ ئاساییەكەیدا، كاری لەبەبیرهێنانەوەی ڕۆڵی وولاتە یەككگرتووەكانی ئەمریكای لەمەسعوددا دەكرد، بەتایبەتی گەر بەناو بوترێت "هینری كیسەنجەر"، كەوتبوی گوایە واشنتۆن گرەنتی تاسەر یارمەتیدانی ئێرانی بەكورد داوە، درۆ بوو لەگەڵێدالكردن و، كەمحەمەد ڕەزا پەهلەوی شای ئێران لەساڵی ١٩٧٥ دا بەعێراقی گۆڕینەوە، دەستە پاچەیانە هیچی نەكرد.

بەڕێوەبەرێتییەكەی "ڕیگن"یش هیچی لەو باشترنەبوو، وەك مەسعود بەرزانی وتی: كەلەئۆگستۆسی ١٩٨٨دا عێراق گازی ژەهراوی لەدژی كورد بەكارهێناو، كۆنگرێسی ئەمریكاش بەزۆریەی دەنگ بڕیاری دانانی گەمارۆی ئابووری لەسەر عێراق دا، لەو بەڕێوەبەرایەتییە دژ بەو بڕیارە وەستاو پشتگیری عێراقیكرد، هەرئەویش بوو، لەكاتێكدا ڕژێمی بەغدا نزیكەی چوارهەزار گوندی لەگەڵ زەویدا تەختكردو، بەسەدان هەزار كەسی ئەو گوندانەو كوردی تریشی بۆ شارۆچكە دروستكراوەكان، ڕاپێچكرد، كەناوی شاری سەركەوتنیان لێنابوون، ئەوە سەرەڕای تۆقینی هەموو كورد لە هێرشی گازە ژەهراوی ڕژێم، كەچی ئەو یارمەتی ڕێی قەرزپێدان و تەكنەلۆژیای چەكی بۆ بەغدا خۆشدەكرد. بەرزانی بەئاشكرا وتی: كاتی جەنگی كوێت هیچ نیازێكی نییە كە بەرەیەكی دووەمی جەنگ لەدژی سەدام حسێن بكاتەوە.

بەهەرحاڵ لە ٢ی ئۆگستۆسی ١٩٩٠ەوە كە عێراق كوێتی گرت، بەڕێوەبەرێتی سەرەك بۆش بەهیچ جۆرێك نەك هەر نیازی هاریكاریكردنی كوردی نەبوو، بەڵكو تەنانەت، نە وەك كورد بەجیاو نەوەك بەشێكیش لەئۆپۆزسیۆنی گشتی عێراقی دژ بە سەدام حسێن پرسێك چییە پێینەكردوون. جەلال تاڵەبانی سەركردەكەی تری بەرەی كوردستانی و سەركردەی (سكرتێری گشتی – وەرگێڕ) یەكێتی نیشتمانی كوردستانی، دوای گرتنی كوێت، لەوباوەڕەوە كە سەدام حسێن بۆ دوایجار وەفاتنامەی خۆی بەدەستی خۆی مۆركردبێت و ئیتر هێزە جیهانییەكانیش پێشوازی لەكورد دەكەن، بەهەڵەداوان ڕۆیشت بۆ واشنتۆن، كەچی بەڕێوەبەرێتی ئەمریكا ساردیان كردەوە. جا كەواتە كورد ئیتر بۆچی خۆی لەوە زیاتر بخاتە تەنگو چەڵەمەوە؟ بەرزانی كەهەر ئەو زستانەو دوو هەفتە پێشتر خۆم گوێم لێی بوو، هەمان بۆچوونی تاڵەبانی دووبارە

کردەوە، کە وتی، سەدام لاوازە بەڵام ئێمە لاوازترین. کورد مەردانە وەستان، سوێندیان خوارد کەجارێکیدی هەتا عێراق بەرەنگاری دوژمنە بیانییەکانی بوەستێتەوە، کە ڕاستییەکەی ئەمجارەیان هەموو کۆمەڵگەی نێو دەوڵەتی دەگرتەوە، لەدژی سەدام حسێن نەجوڵێنەوە. ئەوە لەجێی خۆیدابوو، چونکە سەرکردەکانی بەرەی کوردستانی بۆیان ئاشکرابیوو کەئیتر چیدی نەدەمێنێ و نەدەشتوانن لەوەزیاتر، بەبێ بەڵێننامەیەکی خۆرئاوا، داوای خۆخستنە مەترسی لەکوردی عێراق بکەن. سەرکردایەتی کورد، لەمەڵە گەورەکانی ڕابووردوویانەوە، کە کوردستانی پێ کاولکرا لەبەتوانایی قایلکردنی جەماوەرەکەیان کەوتبوونە گومانەوە. لەوکاتەدا پاشماوەی شوێنباوەڕییەکەشیان لەمەترسیدابوو ڕۆژگاری پێوەندییە نهێنییەکان لەگەڵ هەوڵگرەکاندا بەسەرچووبوو، پێوەندی ڕاستەوخۆی ڕامیاریانەشیان بەهێزە دەرەکییەکانەوە شوێنپێروا نەبوون، بەڵکو هیوایەکی پڕ مەترسی بوون، ئەوەش ڕاستییەکە هێجگار زۆریان لەسەر کەوتبوو. دەساڵێك دوای نوشستەکەی مەلا مستەفا، مەسعودی کوڕی و تاڵەبانی بەتەواوەتی ڕوویان لە مەلاکانی کۆماری ئیسلامی ئێران کردبوو، ئەوانیش لەساڵانی ١٩٨٠-١٩٨٨دا بەهۆی شەڕی عێراقیانەوە کاری نابەجێیان پێکردبوون، کەعێراقیش لەسەر ئەو کارانەیان سزایەکی لەڕادە بەدەریدان.

سەرەتای ساڵی ١٩٨٧ لەهەڵبجەو ساڵی ١٩٨٨ یش، دوای بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی لەدژی مەدەنی و پارتیزانە کوردەکان بێ جیاوازی، ڕاونان و کاولکارێتی درێژایی شەش مانگی تریشی بەناوی "ئەنفال"ەوە چووەپاڵ، کە ئەوە شێوازێکی سەدام حسێنی وابوو هەرگیز ئەنجامەکەی لەبیر ناچێتەوە، ناوی تێکدەرو ناپاکیشی لێ نابوون. داخۆ گەر بوش بانگەوازی بۆ ڕاپەڕین نەکردبا کورد چەنێکیان بەدەنگ دووپاتکردنەوەی شەڕکردنی سەدام حسێنەوە بچونایەتەوە؟. هەروەك کرد- پێویستی بە هەژاندن بوونێت تا شتەکانی وەبیر کەوێتەوە، لە پایزی ١٩٩١ دا "عیزەت ئیبراهیم دووری" جێگری سەدام حسێن، بۆ [illegible]دارکردنەوەی کورد چووبووە سلێمانی و، وتبوی: "ئەگەر ئێوە هەڵەبجەتان بیرچۆتەوە ئەوا [illegible]خۆشە بەبیرتانی بهێنمەوەو پێتان بڵێم ئێمە ئامادەی دووبارە کردنەوەیین".

لەناو چیاکاندا چاوپێکەوتنەکەی مەسعودم کۆتاییهات، هەستام بڕۆم بەڵام خواردنی نیوەڕۆ خرایە بەردەممان و داوام لێکرا بمێنمەوە، ئیتر شێوە وتو وێژەکە گۆڕراو، بەدەم پارووی برنج و مریشك گلاندنەوە، بەرزانی لەگفتوگۆکەیدا بەووردی سنووری بۆ قسەکانی دادەناو، وای ڕوونەکردەوە کە بێلایەنییەکەی بەو ڕادەیە نییە نەگۆڕێت، بەئاشکرا دەریخست، ئەگەر ئەمەریت لەکاتی قەیرانەکەی کوێتدا لەپشتەوە لەعێراق بدات، ئەوە هەر تەکتیکەو. مەترسییە

سەرەکییەکەشی لەتۆڵە بەزەبرەکەیان بوو، ئەمە جگە لەوەی واشی لەعیراق دەکرد جبەخانەو سوپاکەی ڕووەو کوێت بنێرێت. مەسعود ئەوەشی دەرئەخست کەمەرچەندێکی بۆ بلوێت، لەو زانیاریانەی هەواڵگرانی خۆی دەستیاندەکەوێت، کەبەزۆری لەکوردستانەوەن و سەبارەت بە زیانی تۆپ و کاروباری تەکنیکین و، سەرچاوەی هەندێکیشیان کوردەکانی ناو سوپاکەی عێراقن، کە لەسەنگەرەکانی پێشەوەی بەرەی جەنگی کوێتدا، کراونەتە خۆراکی جەنگەکەو لەبەردەم تۆپەکانیان ناون، بێئەوەی داوای لێبکرێت بۆ هاوپەیمانانی تێدەپەڕێنێت.

بەدرێژایی چاوپێکەوتنەکە تۆپەڵە کاغەزێکی پچوکی قەدکراوی سەر قاڵییەکە سەرنجی ڕاکێشابووم، بۆیە کەپرسیم، ئەوانە چین؟ مەسعود بۆی باسکردم کەلە کاربەدەستانی پارتی بەعسی سۆسیالیستی خاوەن دەسەڵات و سەربازانی پلەدارو "جاش"ەکان، واتە "بەچکەی کەر" کەپارتیزانەکان بۆ گاڵتەپێکردن بەو کوردە هاوڕەگەزانەی خۆیانیانەوت کە لەڕیزی یەکە ئانیزامییەکانی سوپادا بەکرێگیرابوون، هاتووەو بەخەتی خۆیان نووسیویانن. وایاندەگەیاند کەهیچ نەبێت جاشەکان، لەترسی ئەوەی ئەوەك سەدام حسێن بکەوێت و ئەوانیش ڕووبەڕووی ڕکی پێشمەرگە ببنەوە، هەوڵی خۆدەرباز کردنیانە. کاغەزەکان هەمووی بەڵێنی وابوو کەلەخزمەتی پێشمەرگەدابن و لەکاتی پێویستدا هارێکارێتی تەواویان بکەن، قسەکانی مەسعود ولیانەگەیاند کەئەم لایەنگیریەیان ئەگەر شوێنپێوای تەواویش نەبن بەڵام ئاساییە، چونکە کوردەکان حسابی خۆیانکردووەو پلانیشیان بۆ کاتی ڕوخاندنی سەدام دلناوە، جا ئیتر کەوتنەکەی بەهەر شێوەیەك بێت. ڕاستییەکەی ئەو کاغەزو تێبینیانە ئەنجامی جێبەجێ کردنی کاری ووردو نهێنی چەند مانگێکیان بوو. لەو ڕۆژەوە کە عێراق کوێتی گرتبوو، چەند ئەندامێکی کارامەی کورد، کەبەتایبەتی بۆ گەیاندنی ڕاسپاردە دڵنەواییکەرەکانی کاربەدەستان ڕاهێنرابوون و بەشارە کوردییەکاندا بڵاوکرابوونەوە. کاری پڕمەترسی و سەرسەختانەی ئەو ئەندامە کارامانە بوو کە بوڕامکردنی بەرنەوامی جاشەکان؛ لەو پایزو زستانەی بوونەمۆی دلنانی شانۆیەکی شەڕی هەڵگێڕانەوەی ئەو کوردانەی سەر بەمیری بوون، وەك دەریشکەوت بەبێ هیچ ئەزیەتێکی ئەوتۆ دەستیان بەسەر بنکەو قەڵای سەربازی و شارو شارۆچکەکاندا گرت، کە جێگەی سەرسوڕمانی تەنانەت بەرزانی خۆی و ئەو سەربازانەش بوو کەپلانەکەیان داڕشتبوو، چونکە ئەوی ڕاستیبێت سەرکەوتنەکە دەگمەن و بێ سەرئێشە بوو، چەند کارێکی نهێنیش ڕۆڵی تیادا هەبوو، کە هێشتا لەئاست ئەو هەموو ئاگربارانە زۆرو کوتوپڕەی لەڕاپەڕینەکەدا دەستپێکرد ڕوون نییە. شتێکی تریش کەبێگومان ڕۆڵی بینی "ئاشتبوونەوەی نەتەوەیی" بوو، کەهەنگاوێکی زیرەکانەی ئاڵەبانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوو، بەجۆرێك کاری لە

جاشەکانکرد شوێنی سەرسوڕمانبوو، ئەوەش زیاتر وایەگەیاند ئەگەرچی تاوانبارێتییەکەیان لەسەر لانابرێت بەڵام بەڵێنی سەر سەلامەتیاندرابێتێ. هەردوای ئەوەی لەپێنجی ئازاردا لەشارۆچکەی ڕانیەی خۆرهەڵاتی نزیك سنووری ئێرانەوە ڕاپەڕینەکە دەستیپێکرد، ئیتر هەروا دە ڕۆژێك زیاتری بردو کەمترین شەڕو پێکدادانی قوربانی، دەستبەسەر ئەوەندەی کوردستاندا گیرا کەزۆر زیاتر بوو لەوەی هەر کاتێکی تری ئەم سەردەمە بەدەستیانەوە بووبێت. جاشەکان هەریۆخۆیان دەستیان دایە چەك و ڕانیەیانگرت دوا بەدوای ئەوە جاش لەسەرتاپای کوردستاندا هەمان ڕێگەیانگرت، بەڵام هەرچۆنێك بێت پێشمەرگە ووریایانە پلانی ڕاپەڕینەکەیان بۆ ١٠ – ١٥ی ئازار کێشابوو چاکیش حسابی کەش و هەوای نالەباری وەرزەکەیانکردبوو.

چەند شتێکی دیارو تایبەتی لێدەرچێت، تەنانەت لەو شارانەشدا کەشەڕیان تیاداکرا شتەکە زۆر لەوە ئاسانتر بوو کەبیریان لێکردبۆوە. سلێمانی، کە پایتەختی ڕۆشنبیریی کوردستانی عێراقە هەر بۆخۆی ڕاپەڕی، ئەگەرچی پێشمەرگەو خەڵکەکە دوو ڕۆژیان ویست بۆ ڕامالینی چەکدارانی "موجاهیدینی خەلق"، کەمیلەزەت شەڕیان بۆ عێراق دەکرد، پاشان جەماوەرەکە لەشەڕێکی ئەنقەستدا نزیکەی ٤٠٠ کەسێکیان لە ئەندامانی حیزبی بەعس و کاربەدەستانی هەواڵگران و پۆلیسی ئاسایش کوشت [٧]، کەلەبارەگای بەدناوە سەرەکییەکەی ئەمندا گیرابوون. دوای کۆتاییهاتنی هەمووشت، بەسەدان پۆلیسی ئاسایش و ئەندامانی حزبی بەعس کەنەیانتوانی بوو دەربازبن، لەلایەن کوردە داخ لەدڵەکانەوە گەمارۆ دران و گیران. یەکلاییە کەسلێمانی تەنیا شارنەبوو کورد تیایدا، بەم جۆرەو وابەزۆری تۆڵەی خۆیان لەئازاردەرانی پێشوویان بسەندنەوەو لەناویانبەرن، بەڵکو لەشارەکانی هەولێرو دهۆکیشدا، دوای ئازاد کردنیان شتی وا کرا.

سەردانێکی بنکەی ئاسایشی سلێمانی ڕوونیدەکاتەوە، کە کوردەکان بۆچی کارە دڵەوەرییەکانیان بەخۆیان سپاردبوو. دەروازەی چوونە ژوورەوە سامناکەکەی لەدوورەوە دیاربوو، بەدیکۆری هونەریانەی ئاسنینی وا ڕازێنرابۆوە کەتا هەتایە، لەشێوەی پەیکەرێکی

[٧] یەکێك کە خۆی لەسلێمانی بوورەو بەچاوی خۆی دیوێتی، لەنامەیەکییدا وائەیاندووە کەلە (٨)ی ئازاری ١٩٩١دا لاشەی قوربانییەکانیان لەتۆڵەی هەڵمبجەبەر شوێنەکانی دی لەت و پەتکرد، هەرچەندە هاواری ئەو ترسنۆکانە دەگەیشتە کەشکەلانی فەلەك، بەڵام کەس بەزەیی بەم پیاوە خوێنڕێژو بێزرخانەدا نەدەهاتەوە. هێرشەکەی سەربارەگای بنکەی ئاسایش، بە کوژرانی ٧٠٠ کەسێك لەئەندامانی حیزب‌و ئاسایش کۆتاییهات، ئەوانەشیان کەلەدوای شەڕ هێشتا گیانیان تیادا مابوو، دادگاییکران و هەر لەوێدا، بەدەستی کەسانێکی چەقۆو مشاری ئاسن بەدەست سزای مەرگدران.

شەیتانانەی پاڵ زیندانێکی بێپەنجەرەی بەئاسن قایمکراودا، کەقوڵاپی ئاسن و کێبڵی،لێدان و خوێنی ووشکەوەبوو بەدیوارەکانییەوەو، ئاسەواری کەرەسەیەکی زۆری ئازارو ئەشکەنجەدانی دیدا، لەتەك خانوویەکدا بمێنێتەوە کە وەك باسی لێوە دەکرا بۆ خراپکردنی کچانی کورد تەرخانکرابوو. دەرگای بێسەرو بەری واشی تیادابوو کە بە جێگەی نهێنی وایاندەگەیاندین، وەك ئەو کەسانەی دواجار بەندیخانەکەیان ئازاد کرد ڕایانگەیاند، ژنی ڕووت و منداڵی خنکاوو چەند گیاوێکی وایان تیادا دیبۆوە کەبەئاستەم نووزەیان تیادا مابوو، هەندێکیان ١٠ ساڵ زیاتر بوو گیرابوون و بەبێ دادگاییکردن لەوێیان ئاخنیبوون.

دواتر بەرزانی ئەوەی بەبیرهاتەوە کەچۆن کاتێك باسی چۆنێتی گرتنی هەولێریاندەکرد، یەکێکیان هەڵیدایە وتی: جا خۆ هەولێرمانگرتووە.! ئاکامی سەرکەوتنە کتوپڕەکان، کەپێشتر لەکارە سەربازییەکانی کورددا ڕوویان نەدابوو، ئاواهات، ڕاستییەکەی پێشمەرگە هەرلەکەرکوکدا ناچاری شەڕکردن هاتبوو، ئەو شارە نەوتینەی کەزۆر لەمێژە ناکۆکی لەسەرە، لە ٢٠ی ئازاردا بەشەڕو بەخوێنی ٢٠٠٠ کەس گیرا، ئاوایە شەڕی هەستانەوەو سەیریش نییە تەنانەت کەسێکی وەك مەسعودی هەمیشە هێمن و لەسەرخۆ، لە لوتکەی سەرکەوتنەکەدا هێندە شادو دڵخۆشبێت، دڵگەرمانە لەبەردەم جەماوەرێکی دڵخۆشی کۆیسنجەقدا بڵێت: "یەك هەناسەی ئەم ڕۆژە هەموو سامانی دونیا دەهێنێت"، دوای ئەوەش بەچەند ڕۆژێك، کەهێشتا خۆشی و دڵگەرمییە کەبەری نەدابوو، بەمنیەی وت:" ئێستا ئاکامی ٧٠ ساڵی خەباتمان لەمشتایەو ئەوەش مەزنترین شەرەفمەندێتییە بۆ من و بەدرێژایی ژیانم چاوەڕوانی ئەمڕۆژەمکردووە".

ئانی نێوەڕۆکەی شویاتی ئاوچیا دەرگایەکی لەڕوومداکردەوە کەلەمێژبوو ئاواتم پێدەخواست، داوام لەمەسعود کرد، داخۆ کەشەڕی زەمینی دەستپێکرد یارمەتی گەڕاندنەوەم بەدات تا پەیام لەبارەی کوردەوە بنێرم؟ دەشمزانی کوردی عێراق، بەتایبەتی پارتی دیموکراتی کە بەرزانی سەرکردایەتی دەکرد بۆ یارمەتیدان و پاراستنی پەیامنێران ناوبانگی خۆیان هەیەو، تەنانەت گەر ژیانی پیاوی خۆشیان لەسەر دانابێت دەیکەن، بەڵام واش، داواکەی من لەناوەڕاستی زستاندا کارێکی ئاسان نەبوو، زۆر خۆشحاڵبووم بە "بەڵێ"کەی، هەرچەندە لێشم نەپرسی بۆچی؟ بەڵام دڵنیابووم کەئەمەی لەبری سوپاسی هاتنە پڕ لەگێچەڵەکەی ئێستامبووە. کورد هەر ڕەخنەیەکی لێبگیرێت، من بەهۆی شارەزاییەکەم لێیانەوە، دەمزانی هەڵسوکەوتێکی تایبەتیان لە دۆستایەتیکردندا هەیەو لە ئاستی ئەو کەسانەدا نەرمن کە لەگەڵیاندان، یان لەپێناویاندا خۆیان تووشی سەرئێشەو گێرەکێچەڵ دەکەن.

بەمجۆرە کەلە ٢٤ی شوباتدا شەڕی زەمینی دەستیپێکرد، من بەفڕۆکە بەسەر هەموو تورکیادا، ڕووەو خۆرهەڵات بۆ ڤان چووم، لەوێ یەکێک لەپیاوەکانی بەرزانیم بینی، پێدەچێ ئەویش وەک پۆلیسی تورکیا لەهەموو شوێنێک خەڵکی خۆی هەبێت، ئەوشەوە لەئوتێلێکی هەرزان بەهدا مایەوەو سەرلەبەیانی ڕۆژی دواتر بەفر بەباوە دەباری، بەپاس بەرەو باشوور ڕۆیشتین، پۆلیس وەک ئەرکی هەمیشەیی خۆی سەیری پاسپۆرتەکەی منو ناسنامەی ئەوانی تری دەکرد، ئێمە لەناوچەیەکی گرنگی نزیک سنوورەکانی نێوان ئێران و عێراقدا بووین، کەپارتیزانە جیاخوازە گەورەکانی تورکیا، پارتی کرێکارانی کوردستان، کەزیاتر بە (PKK) ناسراوە لەو ناوچانەدا بنکەی مەشقکردن و سەنگەرەکانی دواوەیانی لێبوو. من تاکە بیانی ناو پاسەکە بووم، بۆیە ترسی پرسیار لێکردنم لێنیشتبوو، پێموابوو لەوانەیە هێشتا کاتی نەهاتبێت و بیانەوێ تەواو نزیکببمەوە ئەمجا پرسیارم لێبکەن، خۆ ئەگەر خراپترم پێنەکەن ئەوا هەر هیچ نەبێت بۆ ئەنقەرەم دەگێڕنەوە. تاکە هیوام ئەوەبوو هەمیشە هەنگاوێک لەپێش پۆلیسی تورکەوە بم، چونکە گومانیان لەو پەیامنێرانە هەبوو کەدەچوونە ناو کوردستانی تورکیاوە. کاتەکەشی چلەی زستان بوو، منیش لەخۆ بەگەشتیار یان خاوەنکار دانان زیاتر هیچ بیانوویەکی ترم بۆ خۆ دەربازکردن نەبوو. پاش سێ سەعات لە "یوکسیکوڤا" کەشارۆچکەیەکی غەمناکەو بە مەڵبەندی قاچاخچییان بەناوبانگە، چەند پیاوێکی تری بەرزانی بردیانمە ئوتێلێکی گچکەوەو خواردنیان دامێ و لەژوورێکیان کردمەو دەرگایان لێ داخستم، وتیان: پشووی خۆت بدە چونکە هەر کە تاریکداهات ئێرە جێدەهێڵین و بەرەو چیاکانی عێراق دەڕۆین، من خۆم باوەڕم وابوو کەبەدوامەوەبن، بۆیە هەموو دواکەوتنێک دەیپەشۆکاندم. دوای نیوەڕۆ پیاوەکانی بەرزانی گەڕانەوەو هەواڵی ناخۆشی بەفر بارینێکی زۆری دوێنێ شەویان پێبوو، وتیان لەچیاکانی زاگرۆس نزیکەی حەوت پێ بەفری تێکردووە، بۆیە جارێ ناکرێ بڕۆین، منیش چونکە هەستم بەسەرنێشەی پۆلیس دەکرد چاوەڕێی پاسی دواترم نەکردو یەکسەر تەکسییەکم گرت و بۆی دەرچووم، دەرکەوت کارێکی باشمکردووە، چونکە لەگەڕانەوەمدا بۆ "ڤان" نزیکەی هەر نیو سەعات جارێک ئۆتۆمۆبیلەکەیان ڕادەگرت و سەبارەت بەوەی کەمن پەیامنێرەکەی "تایمس"بم لێیان دەپرسیم، منیش واخۆم لێگێلدەکردن کەئەونەبم، ئیتر ئەوانیش ڕێی ڕۆیشتنیان دەدام.
دوایی بەرزانی بەڵێنی حەق بۆکردنەوەی دامێ، ئەویش بەوەی لەگەڵ چەند هاوڕێیەکمدا کە بۆخۆم دیاریانبکەم بچینەوەو، بەڵێنەکەشی بەباشی بردەسەر، ئێمە یەکەم پەیامنێر بووین کەلە سووریاوە بچینە ناو کوردستانەوە، ئەو بەڵێنەکەی خۆی بردەسەر، بەڵام دوای ئەوەی ڕاپەڕینەکە بەرەو هەرەسبردن بۆوەو گەیشتبووە ئەوەی گومان لە دەوروپشتیشمان بکەین. پێش هەواڵەکەی

"بی بی سی" كە لەسلێمانی گوێم لێی بوو، چوونی سلێمانی بەلای هەر یەكێكمانەوە لەهەموو كارەكانی پێشترمان گرنگتربوو، چونكە تێكەڵەیەكبوو لەمەترسیو هەست بەخۆشیو ئازادی. پێموابوو من هۆگری هەموو ئەو شتانە ببووم كەلەخۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا ڕوودەدەن. وەچەیەك پێشتر ژنە سعودیەم لەناو فڕۆكەدا بینیوە كەبەرەو خۆرئاوا چوون، بەپەچەو كراسی ڕەشی ئاودامانی بەریانەوە چوونەتە ئاودەستی فڕۆكەكەو لەوسەرەوە بەتەنوورەیەكی زۆر كورتو بلوزێكی تەنكی وڵوە هاتوونەتە دەرەوە كەهەموو لەشیانی لێوە دیاربێت. بەڵام ئەوە بەراورد ناكرێت لەگەڵ ڕادەی شادی كاتی سەردانەوەی "عومەر سندی"، كە هەرزەكارێكی شەرمن بوو لەنزیك واشنتۆن لەچێشتخانەیەكدا كاریدەكرد، كاتێك كراسە خاكیو بۆینباخە ئاوریشمەكەیو چاكەتە شینەكەی دادەكەندو شەرواڵێكی فشی لەبەر كردو مشكییەكی ڕەشو سپی بەسەریەوە پێچاو پشتێنێكی لەكەمەر بەست، كەهەمووی لەكارەساتەكەی ۱۹۷۵ دا لەماڵەوە بەجێیهێشتبوو، كەبەگەنجێتی لەكوردستانەوە هەڵدێ. دڵخۆشییەكەی سندی بەجۆرێكی وا كاری تێكردبووین، لەپەڕینەوەكەی سووریامانەوە بۆ عێراق، ترسی هاوەنی عێراقو ئەو دوبانەشمان لەبیرچووبۆوە كە لەكێشی خۆیانیان زیاتر لەسەر باركرا بوو، بەناو شەپۆلی توندو خوڕو زەبەلاحی ئاوی بەهاری دیجلەشدا، لەبری سەوڵی ئاسایی، دوو دارنیشانی هاتووچۆی سەر شەقامەكانمان بەكاردەهێنا.

دەبێت چی لەو بەكوردستان شادبوونەوەییان تەلیسماوی تر بێت. یەكەم بەیانیمان لەژاخۆ لەماڵی ئاغایەك یان سەرۆك عەشیرەتێك بووین، لەدەنگی دەهۆڵو گۆرانی ئاهەنگی ساڵی نوێی كوردی "نەورۆز"، كە بەرەولای ئێمە دەهات، بەئاگاهاتین، ئەوە تقوسێكی كۆنی بەر لەهاتنی ئیسلامەو بۆ گەڕاندنەوەی بەهارو بەهیوایی دەگێڕا، كەزیاتر تێكەڵ بەكاری فریشتەی سروشتی كوردوسووربوونی سەر مانەوەیانكراوە، خانە خوێكەمانو كورد بەیەكجۆر دەریاندەبڕی، ئەو پیاوێكی كەتە بوو، بێهیوەنانو زلكردن ۱۲۱ گوندی هەیەو كوڕێكی لەناو سوپای عێراق دامەزراندووەو یەكێكیشیانی جاشەو سێیەمیشیانی پێشمەرگەیە. هەمووشیان لەو ژوورە گەورە پڕ فەرشكراوەدا بوون كە لەماڵی كوردە دەستڕۆیشتووەكاندا، بۆ نانخواردنو دەمەتەقێی كاری ڕامیارانەو میواندارێتیو شەومانەوەی كەسانێكی وەك ئێستای ئێمە، تەرخانن.

بوونی كوڕەكانی لەوێدا باشبوو، پارێدەی تێكەیشتنی هۆی بوونی ئەو سەدان كوردە چەكدارانەی دایە، كەزۆریەیان جاش بوونو لەڕاپەڕینەكەدا بەشداربوونو بەهۆیانەوە سەركەوتن بەئاسانی بەدەست هاتووە. یان كلاشینكۆفیان لەخۆدابوو، یان هەر هیچ نەبێت بەدەمانچەوە بەووری دەسوڕانەوە، چونكە ئەگەر وانەبوایە سەركەوتنەكە هێندە ئاسان نەدەبوو، لەهۆی ئەو

پێشوازییە گەرمەی خۆشمان گەیشتین کە لەدیوی دەرەوەی "قوتابخانەی دواناوەندی زاخۆ"ی کرابووە بنکەی پێشمەرگە کردبوانین، جا ئەگەر ئەوە لەسەنگ بدەیت، کارێکە چارەنووس و دوایێژی "انتفاضة"، کە ووشەیەکی عەرەبییەو، واتا کوردییەکەی "ڕاپەڕین"ە و بەڵام کورد بەکاری نەدەهێنا، چونکە ووشە عەرەبییەکەیان بەلاوە گرنگتربوو. ڕاپەڕین بەیەک کەرەت عەرەبی بە سیاسەتە سەرەکییەکەی "فرق تسد"ی سەدان ساڵەی ئیمپریالیزم هێنا. کورد و مێژوونووسان دەمێکە بەڵای کوردیان بەدووبەرەکییەکی زۆر قووڵ و، دارەزووە وێرانکارییەکەی خۆ بردنە پێشەوە لە دوژمنە بیانییەکان دیاریکردبوو. ئەگەر کورد هەموو بۆ شیعرە مەلحەمییەکەی "مەم و زین"ی ئەحمەدی خانی سەدەی حەڤدەیەمین بگەڕێنەوە، کەلە بەشێکدا ئەفرەت لەبەڵای ئەو دووبەرەکییە دەکات و دەڵێت:

((ئەم کوردەی بەنووکی خەنجەر سەربەرزێتی بەدەستهێناوە،

چۆن دەبێت لەئیمپراتۆریەتی دونیا بێبەشبکرێت و ژێردەستەی خەڵکی تر بێت؟

کورد بوونەتە شوورەی تورک و فارس و عەرەب،

"بەڵام" هەرچەند عەرەب و تورک جوڵابێتنەوە، کورد لەخوێنی خۆیدا گەوزێنراوە.

هەموو کات پەرت و ناکۆکن و، کەسیشیان مل بۆ ئەوی تریان نادات.

خۆ ئەگەر یەک بن، ئەوا تورک و عەرەب و فارسیش دەبێت نۆکەریمان بکەن.

هەر لەکۆنەوە ڕاپەڕینە نەتەوەییەکانی کورد بەدەستی حکومەتانی دراوسێ سەرکووتکراون و، بەهۆی سەرکەوتنی ئەوانیشەوە، ڕادو کینە کەوتۆتە نێوان عەشیرەتەکانیانەوەو دژایەتی یەکتریانکردووە، بۆیە ئەو حکومەتانە دەبێت هەر سەدوونی پارەو چەکی لایەنگرە ڕامیارییەکانیان بن. ئەم بەرەبەرەکانیانە لە کوردستانی عێراقدا هێند بەهێزن لەناو تاچن و بەردەوامیشن، بۆیە لەناو خێزانە دەستەڵاتدارەکانیشدا ژن و ژنخوازێتی دەکەنە بناغەی پێکهاتنەوەیان، بۆ نموونە، دایکە زۆر بەرێزەکەی مەسعود بارزانی خۆی زێبارییە، کەئەو عەشیرەتە هەڵنیکیان نەبێت، ئەوانی دی بەردەوام لەسەر دوژمنایەتیکردنی بەرزانییەکان و سووربوون و، هەروەک چۆن لەپێشدا پشتگیری بنەماڵەی شایانەی عێراق و بەریتانییەکان و کۆمەڵەی نەتەوەیی و، پێشتریش عوسمانییان کردبوو، هەر بەو جۆرەش پشتگیری سەدام حسێنیان کرد.

بەرزانی و ئەندامەکانی دی بەرەی کوردستانی عێراق دەیانزانی لەمزلرباری جاشەکان و دەبێت لەسەر ئەو تووڵە ڕاستە ڕێیە بهێڵرێنەوە. هەر لەو ڕۆژەوە کە هێرشی عێراق بۆ گرتنەوەی کەرکوک دەستپێکرد، بەرزانی لەباشترین ئوتێلی ناو هاوینەهەواری شەقڵاوەی شاخاویدا،

ڕۆژێکی تەواوی بۆ سیمینارێکی تایبەتی، بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی ڕووشیاری نزیکەی ١٠٠ سەرۆک عەشیرەتێک تەرخانکرد، پێشوازی لەسورچی و برادۆستی و هەرکی و عەشیرەتە چەکدارەکانی تری سەر بە بەغدا کرد، کە لەوێدا وەستابوون و، چاویان لەتاوانەکانی ڕابردوویان پۆشی و، ڕێزی دوا هەڵوێستیان گیراو داوایشیان لێکرا هاریکاریان لەبەرگریکردنی کەرکوکدا هەبێت و لەمەودواش لەبری جاش "شۆڕشگێڕە چەکدارەکانیان" پێبوترێت، عومەر سورچی کە لەبەر قیشەکدان سەنگی بەدەرەوە نەبوو، لەوێدا بەڵێنی پێشکەشکردنی هەر شەش هەزار تفەنگەکەی داو، وتی: "من، هەموو پیاوەکانم و لەپێشیشیانەوە کوڕەکەم دەنێرم". ئێمە لێناپرسین، ئەو هەر لەم دواییانەدا پیاوەکانی لایەنگیرێتی تەواوی سەدام حسێن بوون و بۆ بەدووگەڕان و لەناوبردنی پێشمەرگە چاو و گوێی سوپای عێراق بوون، چۆن هێجگار بەو جۆرە گۆڕدرا؟ لە وەڵامدا تا ڕوونیبکاتەوە خۆی خستە گێژاوێکی واوە کەبەشەڕی ساردەوە بەند بوو، پێدەچوو ئەو هێشتا دەرکی بەوە نەکردبێت، کەئەگەر یەکێتی شۆڕەوی بەو جۆرەی، وا بەتەواوەتی شەڕی ساردی نەدۆڕاندایەو بەوڕادەیە پەکی نەکەوتایە کەپێویستێتی خۆرئاوای تاچاریبکات دەست لەعێراقی کۆنە هاوپەیمانی خۆی بەربدات، ئەوا گەلە کۆمەکییەکەی "کوێت"ی ڕزگارکرد سەری نەدەگرت.

وەڵامەکەی ڕاینیشاندەدا، کوردە دەشتەکییەکان (بەجاش و پێشمەرگەیانەوە)زۆربەی کاتیان لەناوچیاکاندا بەسەردەبەن و، بەهۆی پەشۆکاویانەوە تاڕادەیەک لەبەدواداچوونی گۆڕانکارییەکانی دەرەوە بێبەشن. پێدەچوو عومەر سوورچی هەستی بەوە کردبێت کەمن باوەڕم پێنەکردووە، بۆیە کەوتە لێکدانەوەی خاڵێکی دی، وتی:" ئێمە دەزانین کێ لەگەڵ کورددایە، خۆرئاوامان لەگەڵدایە نەک خۆرهەڵات، بۆیە جارێکی دی هەمان هەڵە دووپات ناکەینەوە"، کەهەستیکرد ڕوونکردنەوەکەی هێشتا ڕوون نییە، لەگەڵ پیاوێکی بەشان و شەوکەتداو بەدەم هەنگاوی گەورە گەورەوە، دەنگیشی کەمێک بەرزتر کردەوە تا گوێمان لەقسەکانی بێت: وتی" ئێمە پێویستیمان بەیارمەتی وڵاتە یەکگرتووەکانە"، کەهەرچەند دەقیقەیەکیش بوو، مەسعود داوای لەبەرهەڵستکارە عێراقییەکان کردەوە تا بەرەو کوردستان بگەڕێنەوە، واشنتۆنی بەڵێنەدانی کۆبتەرەکانی عێراق تاوانبار کردبوو.

بەدرێژایی ئەو بەهارەی کورد، ئەم جۆرە قسانەو بۆچوونی ناکۆک بەوانەش بەبیروهۆشی سەرکردەو خەڵکە ئاساییەکەی تریشدا دەهات. لەبەختی خۆمان، شاعیرێکی دهۆکی بەنێوی ماچکردنی سەرۆک بۆشی دەدا "لەبێخی قژەوە"، کەرەنگە دەربڕینێکی هەستبزوێن بێت و لەوەرگێڕاندا بەشێکی بزربێت. نووسەرێکی تێگەیشتوو لەسلێمانی ڕوونیکردەوە کە،

بەرژەوەندی هاوبەشی نێوان ئەمەریکاو کورد ڕێک وەک "شاییەکی بەهەشت" وایە چونکە ئێمە ئەوتمان هەیەو دیموکراتییەتمان پێویستە، ئێوەش لەئەمەریکا دیموکراتییەتتان هەیەو ئەوتتان پێویستە. لەشەقامەکانی سلێمانیدا عەشاماتێکی زۆر لەو وێنە بێشوومارەی پاڵەوانە نەتەوەییەکانی کورد کۆببوونەوە کەلەشوێنی شوورەبەند دانرابوون، وێنەی ژەنەراڵ بەرزانی باوکی مەسعودیش شوێنێکی دیاری بۆ تەرخان کرابوو، ئەوشتانە لەمێژ بوو قەدەغە بوون. لەڕۆژێکدا شەش کەڕەت فیلمێکی زۆر سادەی گازبارانکردنەکەی هەڵەبجە، کەئارەزوومەندێک بە کامێرایەکی ڤیدیۆ گرتبووی، لەهۆڵی سینەمایەکی هەولێردا پیشاندەدرا، کەچی واش هێشتا هەر بەر نەدەکەوت. لەسەدەی وێنەدا کەئێستا خۆمانی تیادا دەژین، بەڵگەی ستەمکاری و شەیتانێتی کاربەدەستان، بیستنی شتێکەو بینینیشی بەچاوی خۆت شتێکی ترە، چونکە هەر بینینەکەی ئەوە دەسەلمێنێت کە بەوتن نەدەوترێت و نە پێشبینیشدەکرێت. بەڵام درێژەپێدانی دووبارەکردنەوەی فیلمەکە تینەکەی ناهێڵێت.

لەو رۆژانەدا راستکردنەوەی کارە نابەجێکانی ڕابردوو، لەپێناو "مان" دا، دژ بەو شتانەی بۆنی ناهەموارترین کارەساتیان لەمێژووە دوورودرێژە پڕ نۆشوستییەکەی کورددا لێدەهات، پشتگوێخرابوون، ڕاستییەکەی لەو سێ هەفتەیەی رابردوودا بەجۆرێک لە ئازادی وورپابوونەوە، بێڕوویەکەی پێشتریان لەپێشوازیکردنی پەیامنێرە بیانییەکانداو هەڵای "حاجی بۆش" لێدانیان بۆ سەرۆکی لەڕادەبەدەر خۆشەویست نەما، چونکە دوای لابردنی سەدام حسێنی لێکردن و دواییش هیچ یارمەتییەکی بۆ سەرکەوتنی ڕاپەڕینەکەیان نەدا، بۆیە ئەو "حاجیە"تیەش هەر تا ئەوەندە بەمەککە موشەڕەف بوو. دواتر کوردەکان وایانلێهات کەزۆر بەتووڕەییەوە، بیانییە بێلەڕەکان، ئەوانەی جارێکی تریش لەناو بەرداشی تۆڵەی بەغدادا دەستبەرداریانبوونەوە، تاوانبار بکەن. لەڕێکدا حەزیانبکردبایە یان نا، قسە نابەرپرسەکانی ۱۵ی شوباتی "بوش"، کە چۆنچۆنی بۆ شۆڕش هانیدەدان، ووشە بەووشە وەک خۆی بەبیر دێنایەوە. تیمەکەی "ئەی.بی.سی" کەدوای ئەوەی میری کەرکوکی گرتەوە، ئەوان خۆیان لێنزیک دەخستەوە، وایاندەگێڕایەوە کە ڕەفتاری پێشتری پێشمەرگەو ڕووی خۆشی جارانیان نەماوەو، ئێستا لەئاستیاندا گرژن، کەبێگومان لەوەدا ناهەقیان نەبوو.

تەنانەت ئەگەر کوردەکان خۆشیان هیچیان پێنەوتینایە، پێویستمان بە بلیمەتی "کلاور ویتز" نەدەکرد تا تێبگەیشتینایە کەپێشمەرگە ڕووبەڕووی دوژمنێکی بێوورەو بوورخاوی عێزێکی جەنگاوەری زەبەلاح ببوونەوەو هیچ جۆرە چەکێکی دژە تانک و زرێپۆش و فڕۆکەشیان نەبووەو، گوللەو پێویستی ئەوچەند تانک و زرێپۆشەشیان نەبووە کەدەستیان بەسەریاندا

گرتبوو، کەسیش نەیدەزانی عێراقییەکان لەکشانەوەیاندا ئەو شتانەیان لەکوێندا حەشار داوە، چونکە یەکێك لەخەسڵەتە باشەکانی کورد ئەوەبوو. کە هیچیان لێمان نەدەشاردەوە. تۆپچییە عێراقییەکان دەرزی تەقاندنی تۆپەکانیان دەرهێنابوو، بۆیە لەبەرنگاربوونەوەی تانکەو زرێپۆشەکانیاندا ناچاربوون هەر "ئار.بی.جی"یە بەجێماوە کۆنەکان بەکاربهێنن، لەچەند "سام حەوتێك"ی بێهەرشانیش بەولاوە هیچ شتێکی تری وەك "ستنگەر"ە ئەمریکاییەکانیان نەبوو، کەئەمریکا بۆ بەگژداچوونەوەی فڕۆکەو کۆپتەری یەکێتی شۆرەوی بەئەفگانییەکانی دابوو. ئەو هێزە زەمینییەی هەشیان بوو هیچ شارەزاییەکی ئەوتۆیان لەبەکارهێنانی ئەو چەکە قورسانەدا نەبوو کەلەعێراقییەکانیان گرتبوو، ئەوەش دەرئەنجامێکی سیاسەتە هەرە کۆنەکەی بەغدایە کەهەمیشە کوردی دوور لەتەکنەلۆژیا سەربازییەکانەوە ڕادەگرت. سەرکردەیەکی سەربازی کورد، ناڕاستەوخۆ پێیڕاگەیاندین، کە مەشقپێکردنی پارتیزانەکان بەو چەکانەی دەستگیریان بووە، مەگەر بەو سەربازە عێراقیانەی هاتوونەتە پاڵ کورد بکرێت. بەڵام هیچ بایەخێکی ئەوتۆیان بەوە نەداو نەیانکردە یەکێك لەپێشکارەکانی خۆیان. جگە لەوەش کورد شارەزاییەکی ئەوتۆیان لەئەرکە سەرکردایەتی و دەسەڵاتدارێتییەکاندا نەبوو، بۆخۆشیان دانیان بەوەدا دەنا کەپێشمەرگەکانیان تەنیا لەشەڕی ناو چیا شارەزان و هیچ مەشقێکی شەڕی ناوشارو سەر شەقامەکانیان نییە، بۆیە نەیاندەتوانی لەوەچاکتر دەست بەسەر ئەوشارانەی ناوچە تەختاییەکاندا بگرن کە بەبێ هەوڵێکی ئەوتۆو بەئاسانی گرتبوویانن. بەڵام هۆی سەرەکی تێکشکاندنی پێشمەرگە شتی تربوو، لەسەرکەوتنەکانی سەرەتایانەوە، قەوارەی دوژمنیان بەکەمتر لەخۆی دادەنا. بەشە ئاساییەکانی سوپای عێراق تێك و پێك دەرلبوون، ڕاستییەکەی چەند یەکەیەکی هەڵبژاردەی گاردی کۆماریش هەر لەڕۆژانی یەکەمی ڕاپەڕینەکەوە پەرتەوازە ببوون، کورد ڕایدەگەیاند کە پەنجا هەزار کەسێکیان بەدیل گرتووە، زۆربەشیان سەرباز بوون و بەچەکی سەرەوخوارکراوەوە بەرەولای پێشمەرگە هاتبوون، لەناو ئەوانەدا هەرچەند ئەفسەرو پلەدارێکیان وەك دیل گلدابۆوە، ئیتر وەك پیشەی هەمیشەیی خۆیان لەبری ئەوەی خواردنێکی کەمیان بۆ دابینبکەن و گلیانبدەنەوە، زۆربەی هەرەزۆریان بەردابوون، خۆ کەخۆشییەکەی سەرتایان ئەماو لەخەڵکانێکی مەدەنی ناوشاری کەرکوکیان بیست، کەبەرەو باکوور دەهاتن و، چوار ڕۆژ بەر لەگرتنەوەی کەرکوك، لەبرادەرە سەربازییە شارەزاکانیانەوە چۆنێتی خۆئامادەکردنی عێراقییەکانیان بیستبوو، ئەمجا قسەی مەدەنییە دەست ڕۆیشتووەکانیان بۆ دەرکەوتبوو، کە لەوباوەڕەدابوون نزیکەی بیست هەزار سەربازێکی عێراقی، کەهەندێکیان گاردی

کۆماری بوون، بۆ بەدەنگەوە چوونی ئەو چوارە هەزارەی کەمێشتا بەرگریان لەچەند بەشێکی بنکەی "خالید ابن ولید" کردووە بەڕێوەبوون.

هەر ئەو شەوە لەبنکە کوردییەکانی سەلاحەدیندا "نەوشیراون مستەفا ئەمین"ی جێگری سەرۆکی سەربازی کورد هیچ حسابێکی بۆ ئەو بۆچوونانەی مەدەنییەکان دانەناو، بەرەشبینییەکی زۆری داناو، سووربوو لەسەر ئەوەی، کە ئەگەر کەرکوکیشیان لەدەستبچێت ئەوا پێشمەرگە، عێراقییەکان لەناو گردەکانی باکووری شارەکەداو لەڕێگای ڕێگاکەی هەولێردا ڕادەگرن، کەتیایدا جێگیرن، "دواتریش هەر ئەو خۆی لە لەندەن پێی وتم: بەئاسانی پێشبینیم نەدەکرد کە سەدام حسێن توانای ناردنی فەیلەقێکی هەبێت"، ئەمەریکاییەکان وتیان هێزی چەکداری عێراقیان هەر بەهاڕین هاڕیوە. کوردیش لەڕێی دەستگاکانی دەرەوەیانەوە، چەندیان پێکرابێت چێکی هەموو شتێکی؛ ئێرانی، سوریایی، سعودی، بەریتانیایی و ئەمەریکاییەکانیان کردووە، نەوشیروان هەموویانی بەسەرکردبۆوە، پێیان وتبوو: هاوپەیمانەکان ٤٢ تیپی سەربازیان تێکوپێکداوە، کەگاردی کۆماری و هێزی ئاسمانیشیان لەناوداوە، تۆڕی زانیاری پێشمەرگەش لەناو هێزەکانی سوپای عێراقدا زۆریان بە هەرەسهێنانی سوپاوە دەدا، ڕاستیەکەشی سەدام حسێن هیچکام لەهێزە سەرەکییە گومان لێنەکراوەکانی خۆی، وەك پۆلیسە هەمەجۆرەکانی ئاسایش و هەواڵگران و بەشی زۆری گاردی کۆماری نەناردبووە ناو کوێتەوە، سێ ڕۆژ بەر لەگرتنەوەی شارەی کەرکوك، کاربەدەستە سوپاییەکانی ئەمەریکا ئەوەیان سەلماند کەژمارەی تانك و زرێپۆشە دەربازبووەکان زۆر لەوەزیاتربوون کەلەسەرەتای شەڕەکەدا بڵاوکرابوونەوە. ژەنەراڵ "نیع نورمان چوارزکۆف"ی سەرکردەی سەربازی ئەمەریکای ناو هێزەکانی هاوپەیمانان، دووڕۆژ دواتر وتی: ئەگەر شەڕەکە ٢٤ سەعاتی دی لەسەربوایە ئەوا دەمانتوانی زیانی زۆر گەورەیان لێبدەین. خۆ ئەگەر تێکوپێکدانی هێزە چەکدارەکەی عێراقیش مەبەستی ڕاستەقینەی "پنتاگۆن" بووبێت یان نا، ئەوا ئەوەش قسە هەڵدەگرێت. بەڕێوەبەرایەتی ئەمەریکاش لەپشتگوێخستنی ڕووداوەکانی کوردستانی مانگی ئازاردا هەرچییەك بووبێت، ڕاستی قسەی ئەو کەسانەی دەسەلماند کەپێیان وابوو واشنتۆن سیاسەتە کۆنەکەی پێش ئۆگستۆسی ساڵی ٩٠ی سەبارەت بە عێراق، کەدەبێت سەدام حسێن چاوگی ئارامراگری ناوچەکە بێت، بگرێتەوە.

ڕێك وەك چۆن مسعود بەرزانی بۆی چووبوو، کەسەدام حسێن لاواز بووەو بەڵام کورد لەو لاوازترە، تەنانەت هەر کە ڕاپەڕینە چەکدارەکەی شیعەی باشووری عێراق بەرپابوو، یەکسەر ئاگر بەستە یەك لایەنیەکەی ٢٨ی شوباتی بەدوادا هات و ئەویش بەچاکەی سەدام حسێن و

ـەڕاپەی خۆیان شکایەوە. لەئاست خۆدەرباز کردن لەهێزەکانی بەعس، کەلەمانە دەستبەسەرە عێراقییە شیعەکانی جەنگی نێوان عێراق و ئێران بوونو، لەو ماوە زۆرەی بەگیراوی لای ئێرانییەکان مابوونەوە، ببوونە ئیسلامی ئوسوڵی و بەشێکی زۆریان لەسنوورەوە بەرەو عێراق دزەیانکردبوو، مەترسییەکی واشی خستەناو سوپاوە کە بۆ تێکشاندنی ڕاپەڕینەکەی، زیاتر ـەفزوە لەبەسرەو شارەکانی تری باشووردا بەرپابوو، پشتگیری "سەدام حسێن" بکەن. ـەریشکەوت هەر بینینی هێزی داگیرکەری بەعس، ڕاوەشاندنی پۆستەری خومەینی کارێکی رایکرد، کە بەتایبەتی ئەفسەرانی عێراق و وا لێیکرد سەربازەکانی ژێر دەستەڵاتی خۆیان، کەزۆربەیان شیعەبوونو پێشتر هەڵگەڕابوونەوە پاشان لە گێرەشێوێنییەکەی باشووردا بەشداریانکردبوو، هێوریکەنەوە. بێ گوێلێبوونەوەی زۆر، دیارە کەهەموو شیعەی عێراق بۆ موسوڵمانە ئێرانییە هاو مەزهەبەکانیان دڵگەرم نینو پشتگیریان ناکەن، کە ئەوەشیان بەشێوەیەکی سەرەکی لەساڵی ١٩٨٠دا سەلماند، کاتێک بە دەیان هەزاریان لەجەنگی دژ بە ئێراندا خۆیان بۆ سەدام حسێن بەکوشت دەدا، دواتریش زۆر لە عێراقییەکان، ئەگەرچی سەربەکەمایەتی عەرەبی سنەی دەستەڵاتداریش نەبوونو حەزیشیان پێنەدەکردن، کەچی هەر پشتگیری ڕژێمیانکرد، چونکە زۆر لەڕاپەڕینو ئەو گێرەشێوێنییە چاوەڕوانکراوەی بەدوایدا ـهات دەترسان. بۆیە لەناوەڕاستی مانگی ئازارەوە ئیتر سەدام حسێن بێباکانە ڕووبەڕووی کورد بۆوە، پاشماوەی هێزە چەکدارییەکەی عێراق، بەشی زۆربەی کوردستانیان، لەماوەیەکی کەمتر لەوەی کورد تیایدا ئازادیکرد، گرتەوە.

کورد تێکشکاندنو ڕەوەکەی بەسەر بڕیارەکەی ئەمەریکادا دەهێنا، کەتیایدا بەووردی هەساباین بۆ بەرنەدانەوەی کۆپتەرە جەنگییەکان کردبوو. (پێنج ساڵ دوای ئەوە جۆرج بوش لەچاوپێکەوتنێکی تەلەفزیۆنیدا، کەدانی ڕەخنە لەخۆگرتنی لێنا، بەڵام ڕەخنەیەکی نرمنگومخت، رایگەیاند کە ئەگەرا هاوپەیمانان سەدام حسێنیان لاوازتر بکردایەو، بەتایبەتی وڵاتە یەکگرتووەکانیش دەبوا بەو جۆرە ڕێی فڕینی کۆپتەرە جەنگییەکانی عێراقیان نەدایە).ئەگەرچی سەرەتا گازاندەکەی کورد لەڕووی سەربازییەوە بەجۆرە بیرکردنەوەیەکی ساکارانە دادەنرا، بەڵام دوایی ئیشێکی ڕامیاریانەی شوێنەوارەی لێدەرچوو، ژەنەراڵ چوارزکۆف بۆخۆی وتی عێراقییەکان سەرەتای گفتوگۆکەی دوای ئاگربەست، بەو دڵۆیەی کە کۆپتەرە بێچەکەکانیان تەنیا بۆ پێوەندیکردنی نێوان خۆیان ڕێی هەستانیان بدرێت "خەڵەتێندرا". کوردیش دەپرسی: لەی بۆڵەوەی سەرکردایەتی سوپای هاوپەیمانان هەڵخەڵەتێنرایە، بۆچی ئەو کۆپتەرە جەنگییانەی بەبێجیاوازی لەمەدەنیو پێشمەرگەیان دەدا،

بەرنەدەدایەوە؟ داخۆ ئەگەر ئەم هەڵە بێمەبەستیەیان، "ئەویش ئەگەر وابێت" نەکردایەو لەکاتی خۆیداو بەزوویی عێراقیان لێ بەئاگا بکردایەتەوە چی دەبوو؟ ئێمەی پەیامنێری لەجیهان دابڕاو، هەرئەوەندەمان پێدەکرا کەئیشەکانی واشنتۆن و پایتەختە سەرەکییەکانی تری هاوپەیمانان بخەملێنین و، پەیامەکانیشمان بەدەستی بەکەسێکدا بناردایەتە ئێران، بەو هیوایەی لەوێشەوە بەجێگای خۆیان بگەیشتنایە.

ئێمە ئەو شتەی بەلامانەوە پێدەچوو ئاشکرابێت، ئەوەبوو کەئەگەر ژەنەڕاڵ چولرزکۆف یان هەرکەسێکی دی لەواشنتۆن، بایەخی بەکورد بدایە، دەبوا بیزانیبایە کە کۆپتەر بەنالەبارترین چەکی کوشتن ناسراوەو، توانای لێدانی کوشندەی مەدەنی و شارپێچوڵکردن و پەشۆکاندنی خەڵکی هەیە. کورد پێیوایە، کۆپتەر وەك چەکێکی بێ هاوتای دژ بەشەڕی پاتیزانی، شوێنێکی تایبەتی لەنرکە شەیتانییەکاندا هەیە. لەکاتی جەنگی عێراق ئێران و دواتریشدا کۆپتەر لەپاڵ فڕۆکە باڵچەسپاوە مووشەك هاویژەکاندا، گازیان بەسەر کورددا ڕشتووە. بەکورتی "بفڕیت بەمریت" واتە قەدەغەکردنی فڕۆکەی باڵچەسپیو لەلایەن ئەمەریکاوە، بیرەوەرییە تاڵ و ناهەموارەکانی لەبیر کورد نەبردەوە. چولرزکۆف ژەنەڕاڵانی دی هاوپەیمانان یەکبینە ترسی ئەوەیان هەبوو کەعێراقییەکان، دژ بە هێزەکانی هاوپەیمانان چەکی کیمیاوی بەکاربهێنن، کەبێگومان بەرگی تایبەت بەخۆپاراستن و ڕووپۆشی گازیشیان هەبوو، کەچی لەئاستی کورددا توشی بەڵا سەمەرەکەی لەبیرچوونەوە هاتبوون. بەلای نەخشە کێشە مەدەنی و سەربازییەکانەوە، دەبوا دیمەنە ناشیرین و دزێوەکەی بەگاز کوژراوانی هەڵەبجەو بەڵگەی زیاتر لە ٦٥ هەزار کوردی هەڵاتووی هێرشە کیمیاوییەکانی ساڵی ١٩٨٨، کە بۆ خۆدەربازکردن ڕوویان لە تورکیا کردبوو، لەبەرچاو نەهێڵرایە. هەر لەو ڕۆژانەشدا کۆمەڵگەی نێو دەوڵەتی هەموو ئەو هەواڵانەی کپکرد کە بۆ ڕاگرتنی کوشتاری کورد، یان بەرپرسیارێتی سەدام حسێن دەدران، (کەچی کاتی پروپاگەندەی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی ئەمەریکای ساڵی ١٩٨٨، جورج بۆشیان لەبەدڵڕاوەشاندنی وێنەکانی هەڵەبجە نەخست). بێگومان ئەم دەستەپاچەییەی خۆرئاواش پێش ئۆگستۆسی ١٩٩٠، کە بوش دەیویست بە (لەمدا هێڵ) بۆ ئەوتەکەی کوێت رابکێشێت و بڕیاریش بدات کەشتێك بەرامبەر سەدام حسێن بکات، کە ئێمە لەناو کوردستانەوە ئاگادار بووین. تەنانەت ئەگەر هەستیشمان بەمەترسی کۆپتەر نەکردایە ئەوا کورد لەو ڕۆژەوەی پێمان نابووە کوردستانەوە یەکبینەمەترسییەکەی خۆیان دەوت و دەوتەوە. ئێمە لەناو دهۆکدا بەچاوی خۆمان کوردمان دەبینی بە "ئار،بی،جی" و چەکی دی تەقەیان لەکۆپتەر دەکرد، وتیشیان هەر چەند سەعاتێك بەر لەگەیشتنمان کۆپتەرێکیان خستووە. لە کەرکوکیشدا بەچاوی خۆمان چوار

کۆپتەرمان بینی شاڵاویان بۆ هێزە کوردییەکان دەبرد. پێش ئەوەی عێراق دژە هێرشەکەی بکات، نەوشیروان و سەرکردە سەربازییەکانی دی کورد، پێیان وتین کە کۆپتەر خەڵکی مەدەنی دەشڵەژێنێت، بەڵام خۆگری پێشمەرگە لەجێگاکانی خۆیاندا، تا دوا هەناسەش چۆڵنەکردنیان دووپات دەکردەوە، ئەویش بەرلەوەی بەدوای ڕەوە زۆر بەپەلەو خێراکەی ئەم چەرخە بکەون، کورد وایان دەردەخست کە ئیتر دونیایان بۆ تەختبووە، یان هەر هیچ نەبێت وایان نیشاندەدا. لە چەند سەعاتی بەر لەهەرەسەکەشدا، هێشتا کوردستان بەجۆرێکی وا سەیر بەرچاو دەکەوت کە باوەڕ بەو ساویلکەییە لەڕادەبەردەرەیان نەکرێت، یان ئەو کوردانەی چاومان پێیان دەکەوت، پێیان وابوو کە دەبێت ئازایانە خۆیان لەلای ئەو خۆرئاواییانە دەربخەن کەچەندین ساڵە بۆ یەکەمجار سەربەستن لەگەڵیاندا بن. ئەوەیە ئەهامەتی لەئازادی دابڕان و ژینی ژێر دەستەڵاتێکی پۆلیسیانە کە وات لێبکات هەمیشە وریاو بەئاگابی. کە گەیشتینە زاخۆ کورد بەهەموو بەش و چینەکانییەوە پەشۆکاوانە، هەڵس و کەوتی کەسانێکیان لەگەڵدا دەکردین کەلەئاسمان هاتبنەوە، یان گۆرانیبێژی بەناوبانگ و ناسراوبین، یان پاڵەوانانی دیاری وەرزشیانە بین. "خۆتان سەرپشك بن بۆ هەرکوێیەك دەتانەوێت بچن و پرسیاریش لەکێ دەکەن بیکەن"، بە خۆشحاڵییەوە ناوی "پرۆسترۆیکای ئیمەی کورد"یان لێنابوو.

ئیمە ٢٨ی ئازارو واتە یەك ڕۆژ بەر لە "هەینی مەزن" گەیشتینە سلێمانی، نیوە دەرزەنێکمان میوانی ئەو ئەندازیار و بازرگانانە بووین، کەلەوڵاتی خۆرئاوا خوێندنیان تەواوکردبوو، زۆر گوێشیان بەمەترسیەکانی هەرەسهێنانی ڕاپەڕینەکە نەدەدا، ئاهەنگێکی وایان سازکردبوو کەژن و کچیان بەنایابترین جلوبەرگو جوانترین خشڵەوە تیایدا ئامادەبن، چی قووتووە بیرەی شارەکەش هەبوو کۆیانکردبۆوە. ویستمان وریایانە لەهاتنی ئەو هێزە گەورەو سامناکەی عێراق بدوێین کەلەکەرکوك زانیمان ڕووەو باکوور دەبێتەوە، لەوەشمان دەپرسی کەداخۆ کورد بەهاتنەخوارەوەیان لەوچیایانەی کەتاڕادەیەکی باش دەیپارستن و گرتنی شارە گەورەکانی وەك دهۆك و هەولێرو کەرکوك سلێمانی ئاو تەختاییەکە کارێکی بەجێیان کردبێت؟

لەکاتێکدا خانەخوێکانمان چاکیان دەزانی کەسەدام حسێن شۆڕشی شیعەکانی باشووری سەرکوتکردووەو لەناویبردووە، کەچی بە زەنگێکی ئاگادارکردنەوەیان دانەدەنا، لەبری ئەوەی خۆ بەهێرشەکەوە خەریکبکەن، زیاتر خۆیان بەڕێکخستنەوەی ئاوو کارەباو باری ئابووری شارەکەوە خەریکدەکرد، میوانێك لەسەر خواردنەکە هەر بۆ جەختکردن، وتی: "ئەگەر کەرکوك شکست بهێنێت ئەوا کوشت و کوشتارێکی زۆر سامناك ڕوودەدات"، بەڵام ڕوودانی شتی لەو جۆرەی بەدوور دادەنا و بەشتێکی نامارانەی لەقەڵەم دەدا. نەخێر ئەم کوردانەی چینی ناوەنجی

بەرلەوەیەکی وا کارامەو بەڕوا بەخۆبوون، کەهیچ هەوڵێکی وایان بۆ شاردنەوەی ڕۆڵە دیارو ئاشکراکەی ناو کۆمەڵیان نەدەدا، جا بۆچی بیشارنەوە؟ خۆ ئەوان پێش هەموو شتێك براوەن و جارێکیدی وڵاتیان ناکەوێتەوە بن چنگی عێراقی دڵ پڕ لەقین. یەکبینەش ئەوەیان لێ دووبارە کردینەوە کەدەبێت بەچاوی خۆمان ڕیزە تانکی زنجیر پچڕاوو زرێپۆشە سەربازییە هەڵوەشاوەکان و لۆری لیدو بنکەی بەعس و ئەمنە سووتاوەکانمان ببینیبێت!!

ڕاستییەکەی وایەو لەوەش زیاتر، زۆرنەبوو لەو ڕێگایەی پیایدا هاتبووین، هەر چەند لەرسەقیلدو قەڵایەکی بەردینی زەبەلاحی بەدووکەڵ ڕەشداگەڕاوی چۆڵ و هۆڵمان، لەوانە دەبینی کەسەدام حسێن لەپاڵ ڕێگا سەرەکییەکاندا دروستیکردبوون، نزیکەی هەر نیو میل جارێکیش ڕەبایەی چیمەنتۆی کچکەترمان بەرچاو دەکەوت. ئەگەرچی ئەم قەڵایانە شێوەی ئاسا دروستکرابوون، بەڵام داگیرکردنە کۆلۆنیالزمەکانی بەبیر دەمهێنامەوە، کەمەر لە جەزائیرەوە بیگرە تا ڤێتنام خۆم دیبوومن. بەڵام ئەوەی تەنیا بە کوردستانەوەتایبەتبوو بێت، کاولکاری و وڵاتەختکردن و داڕووخانە زۆرەی شوێنانێك بوو کەلە ڕۆژگارێکدا گوندو ئاوەدانی بوون، کەچی ئێستا تا چاو بڕیکات تۆپەڵە ئاسەواری بێکۆتایین، ئەو ڕەزو بێستانانەش کەلەسالی "١٩٧٥"ەوە ڕۆژانە سەدام حسێن، بۆ نەهێشتنی ژیان لەو ناوچانەدا هەڵیدەپاچین. کوردیش بۆ دوورخستنەوەی گیانە شەڕخولزانەکەی کەپێشتر بەناڕەواترین شێوە ڕەفتاری لەگەڵدا کردبوون، شێوازێکی زۆر تایبەتیانگرتبوو هەرچی وێنە دیوارییەکانی سەدام حسێن هەبوون لەم پەڕ تائەوپەڕی کوردستان، هەر لەسەرەوە تا خوارەوە بەچوار چێوەی کۆنکرێتییەکانیشیانەوە بەکلاشینکۆڤ بەئاسماندا بردبوون و بەگوللە هەرچی ئەدگاری سەدام حسێن هەبوو. کە بەتەپلەیەك و بەرهەڵبینەیەکی سپی چێشتلێنانەوە وەك چێشتکەرێك، یان بەجلك و بەرگی سەربازییەوە وەك سوپا لاسارێك ڕازێنرابۆوە، یان وەك بازرگانێك لێو بەخەندەو لەقاتێکی سپی تایبەت بەئۆمارچییەکان و شەپقەیەکی پووشی پەنەماییانە لەسەردا، لەهەموو شێوەو بەرگی جۆراو جۆردا کە حەشارگەی فێڵ و درۆو ساختەکانی بن، بەتایبەتی وێنەیەکیان کەلەهەر هەموویان زیاتر سووکایەتیپێکردنی پێوەدیار بوو، کە بەجل و بەرگی تەواوی کوردانەوە، شەروالێکی فش و پشتێن و جەمەدانییەکی چوارگۆشەیی، دەیانسڕییەوە. لەهەمووشی ناخۆشتر، خانەخوێکانی دواشەوی سلێمانیمان هەر هەموو لەوباوەڕەدا بوون کەئیتر لەمەولا ڕێز لەماف مرۆڤ دەگیرێت و ڕەفتاری دیموکراسیانەش لەسەرو هەموو شتێکەوە دەبێت، زۆریش بەوکارەی سەرکردەکانیان سەربڵند بوون کەلەبەر باری ئاسایش ڕێگەیان بەزۆربەی بەکرێگیراوەکانی بەغدا دا بوو، بێگرفت لەناویاندا بسووڕێنەوەو بیریشیان لەجۆری سزادانەکەی خۆیان

ئەنەکردەوە کاتێك کە سەدام حسێن بگەڕێتەوە. کورد هەر وەك چۆن ئەو بەعەزاران سەربازە عێراقیان یان بەردا کە لایان دەم تفەنگەکەربوون. هەر واش بڕیاریاندا کەهەر کەسێك بەئاشکرا دژایەتیان نەکات ئەوا لەگەڵیانە، ئەم کە وریایەنییەیاز گەر لەگەڵ هەموو ئەو کارە ترسناکانەی بەیان سالبوو بەغدا سزای کوردی پێدەدا بەراورد بکرایە شتێکی سەیرو سامناكو، لەخەون ئەچوو، بەڵام ئەم جۆرە لێکدانەوە ساکارانە، لەکەوتنی کەرکودا بوونە هاندەرێك بۆ کۆڕەوەکە کەعێراقییەکان کەرکوکیان گرتەوە یەکسەر خانە خۆی دڵگەرمەکانو ئەوانەی تریشیان، بۆچوونە نابەجێکانی ئەو چەند هەفتە ئازادییەی خۆیانیان بەڵاوە ئاشکرابوو، بە شێوەیەکی ترسناکی واش بەئاگایهێنانەوە کەسی لێ نەبووێرێت، ئەو ترس و نەبوونی هاریکارییەکی نێوانیانی لەناخدا بەهێزکردن کە لەساڵانی دەستەڵاتدارێتی بەعس و ئاکامە کاولکارییەکانی کۆمەڵگەی کوردەوارییەوە هاتبوو.

سەرکردە بەناوبانگەکانی پێشمەرگە لەبایەخی پێوەندییە خێزانییەکانیان کەمدەکردەوە، ڕەنگە ئەوەش لەبەرئەوە بوو بێت کەخێزانی خۆیان و خێزانی ئەندامە کاراکانیان لەدەرەوەی عێراق بووبن. بۆیە کەڕەوەکە دەستیپێکرد هیچ کوردێك، جا پێشمەرگەبێت یان جاش یان مەدەنی، ماڵ و منداڵی خۆی لەبەر گوریزی تۆڵەی سەدام حسێندا جێ نەدەهێشت. چینە ناونجییەکانیش سەرسام مابوونەوەو درەنگانێك هەستیانکرد کەبەرپرسانی بەعس لەهەموو هەڵسوکەوتێکیان بەئاگان. بۆ ئەگبەتی ڕێز لەبەکرێنگیراوەکانی بەعسیش نرابوو. جاشەکانیش لەپێناو سەر سەلامەتی خۆیاندا کەوتبوونە پەلەقاژە چونکە بەهەزارانیان وازیان لەسەدام حسێن هێنابوو بەخۆیان و هێزەکانیانەوە چووبوونە ڕیزی نەتەوەییە ڕاپەڕیوەکان، چەکداران و خێزانی عەشیرەتە هەڵاتووەکانیش. دیمەنی سزادانەکەی خۆیانیان وەك لەڕژێم هەڵگەڕاوەیەك لەبەرچاوبوو، کەپێدەچوو چارەنووسیان وابێت. هیچ کوردێکیش پێویستی بەوە نەبوو کە ووشە هەرە ئازارەکەی سەدام حسێن "ناپاك"ی بەبیر بێننەوە، کەئەو ووشەیەی نەك هەر بەپێشمەرگە نەتەوەییەکان دەوت بەڵکو یەك کوردی لێ نەدەبوارد.

لەسەرکردە باڵادەستەکانی پێشمەرگەشدا، کە پلەیەکی باڵای سەربازێتیشیان نەبوبێت، بەڵام دەبوا لەخەڵکی دی ڕێکوپێکتربوونایە، ئەوانیش ڕووخان و بێووڕەییان پێوەدیاربوو هاوەڵێتیکردنی خێزانەکانیان کردە بیانوو بۆ جێهێشتنی ئەرکە دیاریکراوەکانی خۆیان و خۆدەربازکردن رووەو تورکیاو ئێران بوونەوە. چەند سەرکردەیەکی پێشمەرگە کە لەرۆژانێکدا ڕێبەرایەتی هەزاران کەسیان دەکرد، دواتر بە ڕەخنەوە دانیان بەوەدا نا کەهە چەند پاسەوانێکی خۆیانیان بەدەورەوە مابوو. دیانە کەمایەتییەکانیش، ئەگەرچی پێوەندیان بەرژێمەوە زۆر خراپ

نەبوو، کەچی ئەوکاتە هەڵاتن، پێدەچوو لەسەرێکەوە لەو ترسە کوێرانەیەوە بووبێت کەئەوەک سەدام حسێن بەهاریکارێکی ڕەمەکی ڕاپەڕینەکەیان دابنێت، لەسەرێکی تریشەوە بۆئەوە بووبێت کە هاریکاریکردنی کورد بکەن ئەوەکو گەر لەشاردا بمێننەوە کورد بەپیاوی بەغدا تاوانباریان بکات.

ترسی کۆپتەرو گازی ژەهراوی، بەجۆرێك لای کورد بەرجەستەببوو کەڕەوینەوەی زەحمەت بێت، ئەگەرچی سەدام حسێن ئەمجارەیان ئەپێویستی بە بەکارهێنانی بوو نەلە ترسی تۆڵەی پڕ لەکینی هاوپەیمانانیش ئەیوێرا شتی وا بکات، بەڵام کورد شێوازێکی وایان بۆ زانینی ئەو ڕاستییە نەبوو. ڕێك وەك چەند هەفتەیەك دواتر "نزار حەمدون"ی باڵوێزی پێشووی عێراق لەواشنتۆن، لەچاوپێکەوتنێکی بەغدادەدا پێی وتم، هێزە چەکدارەکانی عێراق باش دەیانزانی چییەکەن. شڵەژاندنی مەدەنییەکان تەکتیکێکی بەمەبەست بوو تا یارمەتی سەدام حسێن بدات بەزووترین کاتو بەهەرزانترین نرخ، گەر تەنیا خاکەکەی باکوور بگرێتەوەو هیچ کەسیشی تیادا نەمابێت هەرباشە. کەهاوپەیمانان فڕۆکەی باڵ چەسپیویان لەفڕین قەدەغەکرد، عێراقییەکان پشتیان بەکۆپتەرەکانیان بەست، کەبۆ شڵەژاندنی کورد یەکاو یەکە. کورد کەرکوکیان لەدەستداو بەرایی پەنابەرانی شارەکەش گەیشتنە ناو هەولێرو سلێمانیو زاخۆ، ئەمجا ڕەوێکی وا دەستپێکرد کەهیچ کەسێك نەلە واشنتۆنو نەلە لەندەنو نە لەپاریسو تا ڕادەیەکیش دامودەزگاکەی چوارزگۆڤیش کەبۆچوونیان لەوان کەمتربوو، بەبیریاندا نەهات. هێندە بەڵگەش لەسەر ڕۆڵی بەڕێوەبەرایەتییەکەی بۆش گردببوونەوە، کە نەیدەویست مێشکی خۆی بەدەستخستنەناو ئاڵۆزی کۆمەڵگەی عێراقی پێشو کاتی گرتنی کوێتو دواتریش خەریك بکاتو، هەموو جۆرە پەیوەندییەکی بەجێو گونجاویش لەگەڵ بەرهەڵستکارە عێراقییەکانی، شیعە یان سنی یان کورد، ڕەتبکاتەوە. لەمێژووی دووبەرەکیانەی نێوان مرۆڤدا، زۆر کەم بووە ئەو هەموو هێزە زۆرەی هاوپەیمانان، پڕچەكو ئامادەبێو ئەو هەموو پێویستیانەشی بۆ تەرخانکرابێت، کەچی سروشتی کۆمەڵایەتیو مێژووی خوێناوی دوژمنەکە وا بەئەنقەست پشتگوێخرابێت. لەسەرەك بۆش خۆیەوە بیگرە تا خوارەوە کەسێك لەبەڕێوە بەرایەتییەکەیدا نەبوو، کەڕاستی گرنگترین ئامانجی دوای ئازادکردنی کوێت بدرکێنێت، کەئەویش ڕاگەیاندنی سەرکەوتنو بەپاپۆڕ بەرەومالبوونەوەی سەربازەکانبوو. ئەوکاتەی بوش کتوپڕ شەڕەکەی ڕاگرت، ژەنەڕاڵ "کۆلن ئیل پاوڵ"ی سەرۆکی دەزگای ئەرکانی هاوبەش، ڕوونو ئاشکرا سووربوونی خۆی لەوەدا ڕاگەیاند کەنەهێڵێت هێزەکانی ئەمەریکا بەهیچ جۆرو ڕێگایەك بکەوێتەناو گێژاوی گرفتەکانی عێراقەوە، ئەوەشی کەلەبەغداو جێگاکانی تری عێراقدا ڕوویاندا

یان نەدا، وەك خۆی بەپێچراوەیی هێڵرایەوە، ئەگەرچی بەڕێوەبەرایەتی ئەمەریکا ئامادەی بەباشزانینی پایەگایەکی سنی مەزەبی بەدەستەڵات دەکرد، ئەویش هەر کاتێك سەدام حسێن بەبێ خۆتێهەڵقورتاندنی ئەمریکا لابرایەو، ژنەراڵێکی بەتوانا جێگەی بگرتایەتەوە. لەساتی یەکەمی ئاگر بەستەکەوە، مانەوەی هێزەکانی ئەمریکا لەدوورگەی فارسدا گرفتێکی رامیارانەی ناوخۆیی لەناو ئەمەریکادا بەرپاکرد، تەنانەت لەوکاتەشدا کە لەئەنجامی ئازادکردنی کوێتدا لەوپەڕی برەودابوون، بوش هەستیکرد، لەگەڵ خراپبوونی باری ئابووریاندا دەرفەتی دووبارە هەڵبژاردنەوەی ساڵی ١٩٩٢ی بەسیاسەتی دەرەوەوە بەندەبێت، ئەگینا وەك سەرۆکێکی کارامە لەسیاسەتی دەرەوەدا کۆتایی پێدێت، بۆیە شەڕ راگرتنەکە، کەمەترسییەکی هێجگار زۆری تیادابوو زۆر بەدڵی پاوڵ بوو، پاوڵ یەکبینە لەسەر ئەوە سوور بوو، کەبەهەر نرخێکبێت لەکاروباری عێراقی دوای جەنگ دووربێت، چونکە ترسی دووبارە زەلیلبوونەوەی سوپای ئەمەریکای ڤێتنامی ساڵانی شەست و حەفتاکان و ١٠ ساڵ دواتری بێروتی هەبوو.

بەڕێوەبەرایەتی ئەمەریکا، کەئەم هەموو ڕاستییە سەربازی و رامیاریانانەی لێبووە کۆڵی شێر، بەجۆرێکی لێهاتبوو کە ئەگەر کۆڕەوەکەی کوردستانی عێراق ناوزڕاندنی سەرکەوتنە بەناوبانگەکەی کوێتیشی لەدوابێت ئەوا هەر گوێی پێنەدات، بەوەش بەڕێوەبەرایەتییەکەی خۆی و ئەوی دوای خۆشی خستە تەڵەوە، چونکە لەئەنجامدا تووشی بوو بەتووشی ئەو عێراقەی کە دەیویست خۆی لێ دوور بگرێت، خۆئەگەر پێش دەستپێکردنی هێرشەکە، چەند لێکۆڵینەوەیەکی زەمینەخۆشکەری بۆ بکردایە ئەوا بەڕێوەبەرێتییەکەش تووشی ئەو بارە سەیرە نەدەهات، دەبوو ئەو بۆچوونە نەشیاوەی "خۆ لەسیاسەتی عێراقی دوای جەنگ بە دوورگرتن"ەی بکەوتایەتە ڕوو.

لەکانونی دووەمی ١٩٩١ دا، چەند رۆژێك بەر لەدەستپێکردنی جەنگی کوێت، دیاردەی روون و ئاشکرا هەبوون، هەر بۆ نموونە بەسەدان هەزار کوردی تورکیا ماڵ و حاڵی خۆیانیان لەباشووری خۆرهەڵاتی تورکیاوە بەجێهێشت و، هەر لەبەیانی زووەوە تا نیوە شەوێکی درەنگ و ویستگەی پاسەکانی دیاریەکرد، کە ئەگەر ئۆتۆمۆبێل بەخێراش بڕوات ئەمجا بەچوار سەعات دەگەیشتە نزیکترین خاڵی خاکی عێراق، بەخێرانە پەشۆکاوەکان سیخناخ بوو، کۆمپانیای پاسەکان بەردەوام پاسی زۆرتریان دەخستە گەڕ کەچی واش دەرەقەتی هامووشۆکەرانی ئەنقەرەو ئەدەنەو ئەزمیرو ئەستەنبووڵ و شارەکانی تری تورکیا، کە کوردێکی زۆریان تیادا جێگیربووە، نەدەهاتن، شەو درەنگ پیاوی رامدەبینی هەڵپەی ڕەوانەکردنی ژن و منداڵەکانی بوو بەرەو هەرشوێنێك، هەر بەو مەرجەی لەناوچە کوردنیشینەکان نەبوایە، کەڕەنگە گومان

لەمەرجەکەشیدا بووبێت. تەنانەت بەسادەیی و ساویلکەیی ناوچەکەش بگرێت ئەم پەشۆکاوی و جموجووڵییە لەجۆرە شێتییەکی دەکرد. لەهەمان کاتیشدا حکومەتی تورکیا بە دەیان هەزار سەربازی بەتانك و زرێپۆشەوە ڕووەو عێراق بزواندبوو، کەبەناسایی بەرامبەر سنوورەکانی ڕووسیا جێگیر ببوون، چونکە ئەنقەرەو بەغدا ڕاینگەیاندبوو کە هیچکامیان نایانەوێت بەرەیەکی دی لەوناوەدا بکەنەوە، بەڵام هیچکامێك لەوانە شوێنباوەڕی کوردی تورکیا نەبوون، بەتایبەتی کوردە نزیکەکانی سنوور، کە هەژارترین کەسیان لەو شارە سنوریانەدا مابوونەوە، چونکە هەر کوردێك لەهەر کوێیەك بژیایە ڕووداوەکانی ساڵی ١٩٨٨ لەبیرنەدەچۆوە. لەم کاتەدا وشەی "هەڵەبجە" زۆر لە تەنیا ناوی شارێکی کوردستانی عێراقی نزیك بەسنووری ئێران زیاتربوو، بەڵکو ببووە هێمایەکی تەواوی ئەو جینۆسایدەی ڕووی لەکورد کردبوو، چونکە هەڵەبجە ئەو جێگایە بوو کە ڕژێمی عێراق بەگازی ژیانکوژ شاڵاوی بۆسەر کوردە مەدەنیەکان کردبوو.

ڕاستییەکەی لەوچەند ڕۆژەی پێش دەستپێکردنی جەنگی کوێتدا، وەك ئەوانە دەیانوت کە لەدەرمانخانەکانی باشووری خۆرهەڵاتی تورکیادا کاریاندەکرد، کوردەکانی تورکیا هێندە ترسابوون، داوایەکی هێجگار زۆری "ئەترۆپین"یاندەکرد، کەمەتریالێکی "ئەنتی دوت"ە، واتە دژ بەژەهرەو بەتایبەتی بۆ حاڵەتە پیسخۆرییەکانی "لیتاڵ" بەکار دەهێنرێت، کەئەمیش مەتریالێکی بکوژەو "سارین"ی پێدەوترێت، لەو ناوەشدا هیچ شتێکی وای لێنەبووە جێگەی ڕووپۆش بگرێتەوە، بۆیە کوردەکانی ناو تورکیا تورنەڵی پلاستیکیان بەکارهێناوە. ڕاستییەکەشی بەرلەوەی هاوپەیمانان یەکەم بۆمبیان بهاوێژن، یەکەم قوربانی شەڕی کوێت دایکێکی کوردی کوردستانی تورکیاو منداڵەکانی بوون، کەلەئەنجامی بەکارهێنانێکی هێجگار زۆری ئەو پلاستیکانەدا خنکا بوون، سیاسەتمەدارەکانی خۆرئاوا لەئەنقەرە ئەوەیان دەخستە پاڵ نابەرپرسیارێتی و شۆرەتی خراپی ڕۆژنامەگەرێتی تورك، کە بەهیچ جۆرێك ئەندازەی ترسی کوردیان لەچەکی کیمیاوی، نەك هەر لەعێراقدا بەڵکو لە تورکیاشدا نەخەمڵاندبوو.

هیچ شتێك لەوە ترسناکتر نییە، کە گەلێك بگاتە ئەو باوەڕەی ناپاکی لەگەڵدا کراوە، چونکە هەر شتێکی خراپ و شووم کە بەبەردەمیاندا گوزەری کردبێت و گوێیان پێنەدابێت یان گاڵتەیان پێی هاتبێت، یان کەنیشیان باش بوایە گەر پێشی تووڕەبوونایە خۆیان وانیشان نەدەدا پێیانەوە دیاربێت، بەڵام کەکار وەرگەڕاو گلۆڵە کەرتە لێژی ئەوسا ئەمیش بەدیوی تۆڵەدا دەکەوێتەوە. منو "وولاکوت" شەوی مەینی مەزن گەڕاینەوە بۆ سەلاحەدین، تیمەکەی "ئەی.بی.سی." بۆیانگێڕاینەوە، لەدووڕۆژی ڕابردوودا، کەویستویانە لای خۆرئاواوە لەکەرکوك نزیکببنەوە، پێشمەرگەی تووڕەو دەم بەهەڕەشە خراپی پێکردبوون. دوای چل و هەشت سەعاتی

ناو عێراقمان تەواو کرژی کردبووین و زۆر بەهێواشیش لێمانەدەپێشت، چونکە خۆمان بۆ نیوچە هەڵاتنێک لەدەست کوردە تووڕەکان و سەربازە تۆڵە سێنەکانی عێراق ئامادە دەکرد. چەند برادەرێکمان لەناو هەولێردا بۆ دەرباز نەدەکرا گەر بەرپرسێکی پێشمەرگە ئۆتۆمۆبیلێک و چەند پاسەوانێکی لەسەلاحەدینەوە بۆ هەولێر فریا نەخستنایە، کە تادەهات ئاڵۆزتر دەبوو بەئۆتۆمۆبیلی خێراش هەر نیو سەعاتێکمان لێوە دووربوو.

ئەو تەکسییەش کەبۆ هەموو هەفتەکە بەکرێمانگرتبوو، لای خۆی چووبوو ئەوبرادەرانە لەهەولێرەوە بێنێتەوە، کەچی سووک و باریک خۆی لێوونکردبووین. ڕۆژی شەممە تیمەکەی "ئەی.بی.سی" هەموو تواناو زۆربەی کاتەکەیانیان بۆ ئۆتۆمۆبیل و شۆفێر پەیداکردن بەسەر برد، بەو هیوایەی سەرلەبەیانی زووی ڕۆژی جەژنی ئیستر خۆ دەرباز بکەین، ئەگەرچی چەند پەیامنێرێک زووتر تێپەڕیبوون، لەدوا ساتدا شۆفێرەکانی "ئەی.بی.سی" ویستیان بکشێنەوەو دەیانوت ئۆتۆمۆبیلەکانیان بۆ دەربازکردنی خێزانەکانیان پێویستە، بەڵام زەبری مەسعود بەرزانی خۆی بیرەکەی پێکگۆڕین و هەر ئەویش بەشەبەترینی پێویستی سەفەرەکەمانی لە بەنزینخانەی خۆیان بۆ دابینکردین و نامەیەکی دەستنووسی ئیمزاکراوی ڕێلێنەگرتنیشی داینێ و، خۆشی بەتەنیا لەکاتێکدا تکای لەکوردەکان دەکرد کە "لەکوردستاندا بمێننەوەو نەبنە پەنابەر تا وەک ئەرمەنییەکانیان لێ بەسەر نەیەت" چونکە مەسعود ڕای وابوو کەئەرمەنییەکان گەلێکن لەخاکی خۆیان دەرکراین، خواحافیزییەکی تایبەتیشی لێکردین.

دوای جێهێشتنی مەسعود بەرزانی و بەپێی ئەو ڕێ لەتیسمانەی تێیکەوتبووین، دیاربوو کەس بە بەگوێی نەکردبوو. هێشتا ماندووی دیزەنترییەکەمبووم، لەئۆتۆمۆبیلەکە هاتمە دەرەوەو پشتم بەدیوارێکی نزمەوەناو لێیدانیشتم، چونکە پێم وابوو ئەمەیانم بۆ خۆ پاراستن لەو کۆپتەرە جەنگیانەی لابرێت کەلەودیوی چیاکەوە ناوچەکەیان پاکدەکردەوە، لەدانیشتنی ناو ئوتۆمۆبیلەکە چاکتربێت، تاترسیش لەبیر خۆم بەرمەوە کەوتمە هەڵدانەوەی ئەو پەڕانەی تێبینییەکانمم تیادا نووسیبوون، لیستە ووشەیەکی کوردی و چەند دەربڕینێکیانم بەرچاو کەوت کەبەر لەهاتنە کوردستانم لەئەجەندەیەکەوە کۆپیمکردبوون، بەڵام تا ئێستا کاتی بیر لێکردنەوەیانم نەبووە، لەپاڵ ژمارە سەرەکییەکان و چەند ووشەیەکی بەرامبەر بەنان و ئاوو هەرچوارلاو شتی لەو بابەتانە، ووشەی "دۆست"م بەرچاو کەوت کەبۆ برادەرە،دەربڕینی "دۆستی مەی" کەبۆ "تۆ برادەرمانی"ە، لەچوارگۆشەکیشدا بەپیتی گەورە "تەکە نەکەم بۆ تەقە مەکە" نوسیبوو، ووشەی بەرامبەر بە "یارمەتی"ش بەپێی ئەو نەخشەیەی کێشابووم "هاریکاری" دەگەیاند. چاک لەسەرنجەکانم ووردبوومەوە بەخۆمموت: نابێ ئەمانە ڕاستبن، بەڵام

پێدەچوو واشبێ، بۆ نموونە "هاریکاری" زۆرلە "هاراکیری" وە نزیکە کەجۆرە خۆکوشتنێکی یابانیانەیەو بۆ خۆپاککردنەوە لەبێئابڕوێتی خەنجەرێك بەووڕگیانا دەکەن. لەکاتی نووسینەوەیدا ئەو شتە سەیرەم نەدیبوو، کەچی ئێستا تۆزێك بەوە پێکەنیم و هەستیشمکرد کەمێك باشتربووم. من لەبارێکی وادا نەبووم کە ئاگام لە کات بێت، نێودەرزمنە پێشمەرگەیەك وەك رێکخەرانی سوپا بەدیار کەوتن و کەوتنە فەرمان بەسەرا دەرکردنی ئەو شۆفێرانەی لەو خەڵکە یاخیببوون، ئیتر زۆر بەئاسانی ئەوەندەی پێنەچوو، بەپەلە بەشەقامی هاملتۆندا بەڕێکەوتینەوە، کەشەقامێکی سەرەکی سەربازیانەیەو بەریتانیاییەکان لەساڵی ۱۹۲۰-۱۹۳۰ دا کە لەهەولێرەوە تا سنووری ئێران بەرەو خۆرهەڵات بیوونەوە رایانکێشابوو تا بەئاسانی سەرکوتی عەشیرەتەکان بکەن. "نازانم ئەگەر ئەمە باشترین هەل کوردبێت، بەڵام چاکدەزانم کە ئەمە دوا هەلمان نییە، بەتایبەتی چەند مانگێك پێش ئێستا کێ پێشبینی ئەم بارەی ئەمڕۆی دەکرد؟" ئەوە قسەی بەرزانییە کەلەرایات و لەمانگی شوباتدا پێیوتم، زۆرم بیر لەکورتبینی ئەم قسەیەی بەرزانی کردەوە، چونکە پیاچوونەوەیەکی مێژووی کورد ئەم تێکەوتنەی ئێستایانی دەربەخست بۆیە دەبوا زۆر بەچاکی ڕوودانەکەی بزانرایە. بەهەرحاڵ میل بەمیلی ڕێگاکە، تا دەهات لانکە تەختەکانی منداڵان، کەبەسەر چەمچەی ئۆتۆمۆبیلەکانەوە بەسترابوونەوە، زیاتر سەرنجیان ڕادەکێشام، دواتریش پێش لۆرییەکی تەنکەر کەوتین، کەدروشمێکی دەستخەتی بەرەنگاربوونەوەی بەپشت بۆدییە بەقوڕساغدراوەکەیدا بەئینگلیزی لێهەڵکۆڵرابوو "کەس نەڵێت کورد مردووە"، ئەگەرچی حونجەی ئینگلیزییەکەی هەڵەبوو بەڵام پەیامێکی بەئاگاهێنانەوەی رابوو کەزۆر لەجێگای خۆیدا بێت.

سەعاتێکی نەبرد گەیشتینە دیانا، نامەبەپەلە نووسراوەکەی مەسعودیش ئیشی خۆی لەگەڵ عەبدولموهەیمنی خزمی کەلەوێ بەرپرسی بنکەی K.D.P بوو، کرد. هێشتا بڕیاری ڕووەو تورکیا یان ئێران بوونەوەمان نەدابوو، ئێران بەلای خۆرهەڵاتداو بەئۆتۆمۆبیل، هەر سەعاتە رێیەك دەبێت، دەشبوا بڕواپێکراوێکی "ئەی.بی.سی" لەوێ ئامادە بوایەو لەسەر سنوورەکە چاوەڕوانی بکردینایە، بەڵام نەدەبوو نەکاربەدەستە ئێرانییەکان جێی متمانەمان نەبوون، بۆیە عەبدولموهەیمن، بڕیارەکەی بۆ داین: "ئێمە هیچ بوارێکمان نییە" عەبدولموهەیمن وای وت، چونکە تازە ئێرانییەکان سنووریان داخستبوو. ئەو شۆفێرانەش کەبەکرێمانگرتبوون، بۆ دەربازکردنی خێزانیان لۆتۆمۆبیلەکانیان بەرەو سەلاحەدین ئاژووت، عەبدولموهەیمن پیکابێکی داینێ و ئێمەش کەلوپەلەکانمان لێبارکردو خۆشمان لەگەڵیدا بەرەو باکوور بۆ "کانی ڕەشت" ڕۆیشتین، کەلەسەر نەخشە لەدیوی ئاوەوەی سنووری تورکیا تەنیا خاڵێکی ڕەشە، هەر کە

گەیشتینە ناو باخێکی سەرتاپاکەسك، لاماندا تا شەوی تیادا بکەینەوە، چونکە خەریکبوو دونیا تەولو تاریك دەبوو، پیکابەکە گەڕایەوە، ڕووناکی هێشتا نەوەندەی بەبەرەوە مابوو کەبتوانین لەگەڵ قاچاخچییەکی وولاخدارى ناوچەکەدا ڕێکبکەوین و نانێکبخۆین هەگبەکانیشمان بۆ نووستن رابخەین و تا بەیانی زووی ڕۆژی داهاتوو لێی بخەوین.

جیرالدین بروکسی "دی وۆل ستریت جورنال" لەپڕێکا بەدەنگی بەرز رایگەیاند، کە گوایە دەترسێت و لەو باوەڕەشدایە هەموومان لەخەودا بکوژرێین، ئێمە زۆر لەوە ماندووترببووین کە گوێ بەو قسەیە بدەین و بەراستی دابنێین، بەتایبەتی کە لەئافرەتێکی لاوازو لەهەمووشمان نازاترەوە دەربچێت، نازایەتییەکەیی بەوەسەلماند کە شەوێك لەناو کەرکوکدا، هەربۆئەوە مایەوە کاردانەوەی خێزانێکی کورد لەکاتی تۆپباران کردنێکی خەستی عێراقدا ببینێت. بەڵام هەموو تا رادەیەك بەختەوەرو سەلامەتبووین و. واشنەکەوتەوە کەبیرمان لێدەکردەوە. ڕێگا سەختە شاخاوییەکەی‌تورکیا یەکێك بوو لەو ڕێگا دەگمەنە مینڕێژنە کراوانەی نێوان هەردوو ولات. ئەگەرچی باران نەدەباری بەڵام لە بەرزایی چیاکاندا و بەهۆی شەونمی زۆرەوە هەموو خەریکبوو دەیبەستین.

مانگ چواردە شەو بوو،چەند جارێك بۆ سەیرکردنی ئەو پەنابەرانە، کەجۆگە ئاسا، بەڕێگا سەختە شاخاوییە بڵندەکەی بەدەربەندێکی هەشت هەزار پێ بەرزی دەگەیاندن و بەو دیویا تورکیا بوو ڕێچکەیان بەستبوو، لەخەو هەڵدەستام.

لەبەرەبەیانیشدا ڕەوە بەرازە کێوییەکم بینی بەسەر لوتکەیەکی چیاکەوە سەیری خەڵکەکەیان دەکردو واقیان وڕمابوو، "بی.بی.سی"ش گرتنەوەی هەواڵێرو دەنگ و زاخۆ لەلایەن ڕژێمی عێراقەوە یەکلا دەکردەوە، ئەوەش چاکی بڕیاری ڕێگا هەڵبژاردنەکەمان و دژوەستانەوەی هەموو ئەوهەواڵانەی سەلماند کەبۆ پەشیمانکردنەوەمان دەدران. وولاخدارەکان لەکاتی دیاریکراودا نەگەیشتن، کەوتینە خۆپێچانەوەو پێشمان وابوو کەدەبێت جانتاو چی شتی قورسی تریشمان هەیە بەجێیبهێڵین. بەرەوخوار بۆسەر جۆگە ئاوێك چووم، خۆم شت و ریشم تاشی، هەرچەندە لاوازببووم ١٠ پاوەنێکیشم کەمکردبوو، بەڵام لەو هەفتەیەدا ئەوە یەکەمجاربوو هەست بەنەخۆشی نەکەم.

دواجار دووکوڕی گەنج بەسێ وولاخی بەرزەو گوندرێژێکەوە گەیشتن و بەڕێکەوتین، جیراڵد هەگبەی نووستنەکەمی بۆ هەڵگرتبووم، لەسەرخۆ بەبارێکە ڕێیەکی سەڵتەزەلامدا بەرەو ژوور هەڵکشاین، ئەوناوە پڕ لەپێڵاوی شارییانەو جانتاو شتی قورسدەستی دی بوو کە کەمەڵاتووەکان تووڕیاندابوون، ناوەناوەش بۆ پشوودان دەوەستاین تا بەخۆشییەوە سەیری

خاکی بەگوڵی بەهارە پۆشراو ئەو لوتکە نزمکانە بکەین کە بەفر گرتبوونی و لێیان ووردبینەوە. گوێش لەرەخنەی ڕووبەڕووی پڕ گومانی ئێمە جۆرێ پۆش و حیوەرجەم کارەکانی بگرین و پرسیاری "بۆچی سەدامی لەناو نەبرد؟"یان دەکردو دەشیانوت بۆش دۆستی سەدامە، ئەمانە پوختەی ئەو کوردانە بوون کە هەروو هەستیان بەتێکشکاندنەکە کردبوو هەڵاتبوون، فەرمانبەرانی مەدەنی خانەنشینی قات سێ پارچەپۆش لەبەر، بازرگان، ئەندازیار، دایکانی منداڵ لەئامێزی چینە ناوەنجییەکان.

بەدرێژایی ماوەی پیشەکەم ئەمە یەکەم کەرەتم نەبووە وەک ئەمریکاییەک هەست بەبێزاری بکەم، بەڵام زۆر کەم هەستم بەبوونی ڕەخنەیەک کردووە کە وەک ئەمیان لەجێگای خۆیدا بووبێت. پاش پێنج سەعات بەنیشانەیەکی کۆنکرێتی گەیشتین کەسنوورەکەی دیاری کردبوو، چل و پێنج دەقیقە دواتر لەبنکەیەکی بچووکی پێشمەرەی تورکیا، لە "یەسیلوڤا" لەبن پەیکەری "مستەفا کەمال ئەتاتورک"ی دامەزرێنەری تورکیای نوێ و چەوسێنەری کورد، کەلەهەموو شوێنێکدا قیتبۆتەوە، خۆمان گەرمکردەوە...

مولازمێکی گەنجی چاک ئینگلیزی زان، کەبەڕادەیەک سەری لەناوی ئەو هەمە جۆر ڕۆژنامەو تەلەفزیۆنە ئەمەریکایی و بەریتانیایی و فەرەنساییانەی ئێمە کارگێڕیانبووین سووڕمابوو. بەڕادیۆ بارەگاکانی سەرو خۆی ئاگادارکرد، پاشان کۆپتەرێکی "هیوی" کە کاتی شەڕی ڤێتنام بەکاردەهێنران نیشتەوە، هەردوو سەرکردەی سوپاو چەندرەمەی ناوچەکەی تیادابوون.

عەمیدی سوپاکە بەساردییەکەوە چاوی بەو تیمە قوڕاوییەکەی ئێمەدا گێڕاو باسی ئەوشتانەی کرد کە لەتوانایدایە بیانکات: دەتوانم وەک کەسانێک کە بەقاچاغ هاتبێتنە ناو تورکیاوە تەقەتان لێبکەم، یان تاوەیوی سنوورتان بکەمەوە. ئەمجا بەئەسپایی وتی: دەتوانم ڕێی هاتنەژوورەوەشتان بدەم. پاشان بەپێکەنینێکەوە کە وورگە زلەکەی لەگەڵیدا دەلەرییەوە، ڕێیداین و کۆپتەرێکی دی و پزیشکێکەو دوو وەرگێڕی ئافرەت و بە سەدان پارووە نانیشی بۆ داواکردین. نان و یارمەتییە تەندروستییەکان بۆ ئەو چەند سەد پەنابەرانە بوون کەلە ٣٦ سەعاتی ڕابردوودا گەیشتبوونە بنکەکەو، لەو دەشتەشدا تا ماوەیەک بەڕووتی و ماوەیەکیش لەبەر باراندا بێ پەناو خۆراک مابوونەوە، بوونی ئێمە شەرم بەخۆکردنی لەسەربازە هەمیشە بەگومان و جارجارەش دڵڕەقەکاندا پەیداکرد، تا بەشێوەیەکی وا ڕەفتاریان لەگەڵدا بکەن، کەهەر هیچ نەبێت تۆزێک لەڕەفتاری ئاسایی مرۆڤانەوە نزیکبێت. تورکەکان دەرکیان بەوە نەکردبوو کە ئەوانەی گەیشتوون پێشەنگی نزیکەی دوو ملیۆن کوردی تری هەڵاتووی تۆڵە ترسناکەکەی سەدام حسێنن.

## پەراوێزەکانی بەشی سێیەم

## ٣- هەڵخەڵەتاو

* ئەندریە مالروکس – Malraux Les Noyers de l ale burg paris- 1945 38

* "ئەگەر ئێوە هەڵە بچەتان بیرچۆتەوە..."

The Washington Post, January 25,1991

- "نزیکەی ٤٠٠ کەسیان لەئەندامانی حیزبی بەعس..."، لەچاوپێکەوتنێکی ووشیار زنبارێدا لەسەلاحەدین، لە ٢٠ شوباتی ١٩٩٢دا: لەوە زیاتر لەکتێبەکەی کەنعان مەکییەدا هەیە: Crulty and Scieleuce: War, Tyranny, Uprising and the Arab world- New York, 1993.
- پەراوێز "ئەوەی لەهەڵەبجەو شوێنەکانی تردا کرا" بڕوانە: لاپەڕە٨٩ی سەرچاوەکەی پێشووی کەنعان مەکییە.
- "بەخوێنی ٢٠٠٠ کەس گیرا" لەچاوپێکەوتنێکی ٢٣ ئەیلولی ١٩٩١ی نەوشیروان مستەفا ئەمیندا لە لەندەن.
- "یەکەم هەناسەی ئەم رۆژە" "خەونێکی ناپاکی بەرامبەر کراو" فیلمێکی بە بەڵگەی کەناڵی ٤ی تەلەڤیزیۆنی بەریتانییە کەلەنیسانی ١٩٩١دا نیشاندرا. کەنعان مەکییەش لە لاپەڕە ٨٩ی ئەو کتێبەیدا کەپێشتر ناوی هاتووە پەنجەی بۆ راکێشاوە.
- "ئێستا ئاکامی ٧٠ ساڵ خەباتمان..." کۆنگرەیەکی رۆژنامەنووسی کەلە شاری هەولێر لە ٢٤ی مارتی ١٩٩١ بەسترا بڕوانە: The Washington Post, March 27, 1991.
- "بەناسانی پێشبینیم نەدەکرد" لەچاوپێکەوتنێکی ٢٣ی ئەیلولی ١٩٩١ی نەوشیروان مستەفا ئەمین. لەندەن.
- "ژمارەی تانك و زرێپۆشەکان" The New York Times, March 25, 1991
- "دەستوانی زیانی زۆر گەورەیان.." The New York Times, March 27,1991

- "ئەوا ئەوش قسە هەڵدەگرێت.." لەژمارە ٨ی کانونی یەکەمی ١٩٩١ ی رۆژنامەی "The Independt on Sunday" دا هاتووە کە "جون بۆلوش" بۆخۆی لە٥ی ئۆکستۆسی ١٩٩١دا گوێی لێبووە کەژمەنەراڵ "کولن پاوڵ"ی سەرۆکی دەزگای ئەرکانی هاوبەشی هێزی چەکدارانی هاوپەیمانان بەیەکێك لە هاوڕێ ژمەنەراڵەکانی خۆی وتووە "من هەر بیر لەچۆنێتی کۆتایی گەمەکە دەکەمەوە، کەچۆن لەئەنجامدا هەڵوێستمان بەرامبەر بە عێراق چۆن بێت؟ ناتوانین بەبێ هیچ بەجێیان بهێڵین. هیچمان نییە کە هاوسەنگی ئێرانی پێرابگرین.بۆیە من وای دەبینم کە سوپایەکی ١٠٠هەزار سەربازیو هەزار تانکێکیان بۆ بهێڵینەوە".
- "٥ ساڵ دوای ئەوە ..." لەچاوپێکەوتنێکی دەزگای گشتی نیزگەی PBC لەگەڵ "دیڤید فروست"دا وەك لە Los Angles Time دا بلاوکراوەتەوەو لە International Harold Tribune لە١٦ی کانونی دووەمی ١٩٩٦دا دووبارەکراوەتەوە، کەبوش دەڵێت دەبوا هەوڵی لابردنی سەدام خۆی بدرایەو، دەشڵێت "بەچاکی حسابم بۆ نەکردبوو -چونکە- پێموابوو کەمەر نامێنێت" دان بەوەدا دەنێت.
- "بەسەدان هەزار کوردی تورکیا" کۆلۆنێل "فرانسوا بو چوالتر"ی مولحەقی سەربازی فەرەنسا لەتورکیادا، لەچاوپێکەوتنێکی ١١ی تشرینی دووەمی ١٩٩١ی نووسەردا ژمارەی هەڵاتوانی بە ٤٠٠ تا ٧٠٠ هەزار خەمڵاند.

(٤)

# مردنو چوونە بەهەشت

# ئێمە هەمووشتێك لەبارەی كوردەوە دەزانین

### ... ئێمە وا راهاتبووین كەهەموو هاوینێك سووكە شەڕێكیان لەگەڵدا بكەین

فریا ستارك

گەشتیارو نووسەری خزمەتگوزاری مەدەنی لە "گەشتێك بۆ دیجلە"دا

"جگە لەچیاكان دۆستی ترمان نییە" ئەمە پەندێكی كۆنی كوردە، كەچی لەنیسانی ١٩٩١دا شاخەكان بەهەزارانی لێ لەناوبردن. كوردیش بۆیان دەركەوت كەلەكاتی پێویستداو لەشوێنی دەستەڵاتی، واشنتۆنو لەندەنو پاریسو شوێنانی تریشەوە دڵسۆزیان هەیە؛ سەرۆكی توركیاو، هاوسەرەكەی سەرۆكی فەرەنساو یەكێك لە وەزیرە لەپێشەكانیو، باڵادەستێكی ئەنجومەنی پیران لە واشنتۆنو، ئەندامێكی ئەنجومەنی لۆردەكانی ئیرلەنداو، دیپلۆماتێكی پێشكەوتووی خاوەن جێو رێی گرنگ لە، ئەمەریكاو بەریتانیاو فەرەنساو شوێنانی دی، نووسەرانی خاوەن سنووری تایبەتی رۆژنامەكان، كەلەبری كوردی عێراق، هەریەكەو بە جۆرێك رۆڵی گرنگی خۆیان بینی. كورد لەو رزگاركردنەیاندا بەتایبەتی زۆر قەرزاری تەلەفزیۆنن، ئەو ئامێرە بێهەستەی زۆر بە زوویی رای گشتیی خەڵكی فەرەنساو بەریتانیای بەلای كێشەكەیاندا، كەپێشتر زۆر نەناسرابوو هەژاندو، زۆریان بۆ هەردوو حكومەتی لەندەنو پاریس هێنا كەلە ئاستیدا دەستبەكاربن. نیشەكەی تەلەفزیۆن لای دیپلۆماتە ئەورووپییەكان كارێكی كوتوپڕی چاوەڕواننەكراوی وای لەسەر زەوی هێنایە كایەوە، وەك برادەرێكی ئەمەریكایی بەسەر سامییەوە تێبینی كردبوو، كەوای لەئەورووپاییەكان كرد، گەر بۆ تاكە جارێكیش بێت بۆ خەڵكی رەفتار بكەن. یەكێك لەیاریدەدەرە حەپەساوەكانی "فرانسۆ میتران" بەشارەزاییەكەی خۆی

لەمێژوودا، لەوە ڕامابوو چۆن خەڵکی پشتگیری کێشەیەکی وایانکرد کە هێشتا "بۆچی هەڵیەگرت؟ ئەو دڵگەرمییە بۆ کورد کە نەجوولەکەو نە دیانن و لەیەکەم جەنگی جیهانیشدا کوشتاری دیانە ئەرمەنییەکانیان پێکرابوو، بۆچی؟ هەرچەندە حکومەتەکانی بەریتانیاو فەڕەنسا ئیشەکەیان توند گرتبوو دوای کۆششیان بۆ دەکردن و، ئەگەرچی دیموکراتییە بەرهەڵستکارەکانی واشنتۆنیش ڕۆژانە ڕەخنەکانیان زیادیدەکرد، بەڵام بەڕێوەبەرایەتییەکەی بوش لەئاست هەمان دیمەنی تەلەفزیۆنەکانی ئەمەریکادا دوو هەفتە زیاتر پێی لەخۆی بڕیبوو.

بەختی کورد لەوەدابوو هەر ڕێك وەك بۆ تەلەفزیۆن دروستکرابن و، دەشیان زانی چۆنچۆنی بۆی بدوێن، خۆشیان ئەوەیان بەلاوە سەیربوو، بەڵام شایانیانبوو چونکە زیرەکانە جۆرێتی خۆیانیان سەلماندو لەکاتێکیشدا هەستی ئەورووپاییەکانیان بەرامبەر بە قەیرانەکەیان بزواند کە ئەوان بەبۆنەی سەرکەوتنیان و دەرپەڕاندنی عێراقی کوێتیانەوە خەریکی پیرۆزبایکردن بوون لەیەکتری. سیاسەتمەداران و دەزگا سیاسییەکانی دەرەوەی خۆرئاوا، کاتێك ئازارو ئەشکەنجەکەی کورد تیشکیان خستەسەر ئەو مێژووە خەفەکراوەی سیاسەتی حەفتا ساڵەیان بەوەی کە ئەورووپا بەدوروچاو سەیری کێشەکەیانی کردبوو، تەریق و شەرمەزاربوون زۆریەی بەریتانیاییەکان لەئاست کورددا هەستیان بەگرێیەك دەکرد کە دیپلۆماتێکی بەریتانیایی ناوی "گرێی تاوانی مێژوویی" لێنابوو، گرێکە زۆر قوڵبوو، دەگەڕایەوە بۆ جێبەجێکردنی پەیمانە نەتەوەییەکانی دوای جەنگی جیهانی یەکەم و دواتریش، بۆ ئۆتۆنۆمی ناو عێراقێکی ژێر دەستەڵات و ڕکێفی بەریتانییەکان، چونکە ئەوان زیاتر بایەخیان بەپاسەوانێتی نەوتی کەرکوك دەدا، کە بۆخۆیان و بێت، وەك لەوەی پاسەوانی هەست و هیوای کوردە نەتەوەییەکان بکەن لەفەرەنساش وەچەیەکی حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی چەپ و ڕاست لەپێناو سوودی خۆیان و گەیشتنیان بەو تاکە سەرە پەڕە سەرەکییەی کە فەڕەنسای بەنەوتی خۆرهەڵات دەگەیاند، هەر خەریکی خۆبردنە پێشەوەو مامەڵەیی سەدام حسێنی خاوەن دووەم گەنجینە نەوتی دونیا بوون. ئێستا خەڵکی ئەو وڵاتە دانایی و ڕەوشتی ئەو سیاسەتەیان بەرپرسدەکرد کەشیوعییەکانی لێدەرچێت، سەرجەم سیاسەتمەدارانیان ببوونە سووکە زوڕنایەکی پڕوپاگەندەی بەغداو بوونەهۆی ئەو لیستە پێنج بلیۆن دۆلارە ئەدراوەیەی کە زۆریەی پارەی چەك بوو "بەشێکیشی دژ بەکورد بەکارهێنرابوون".

لەسەرو هەموو ئەوانەشەوە، جیهانێك کەهەمیشە گۆڕانکاری لەدیمەنی ڕووداوەکانیدا هەبێت، بەڵام دوای ئەو دەیان ساڵەی کە پەنابەرانی ئەفریکایی و عەرەب و ئاسیایی تەلەفزیۆنیان گرتبوو کورد جۆرێکی نوێ و ئاموبوون. بینەرانی تەلەفزیۆنی هەموو دونیا کە بەبینینی

کارەسات و ئەشکەنجەی ناوچە گەرمەکان راهاتبوون، ئێستاکە کورد لەچیا سەهۆڵبەندەکاندا دەبینن لەسەرماندا هەڵدەلەرزن و بەناو بەفرو قوڕو لیتەدا بۆدارو چیلکەو چەواڵی چاوگی ئاگر، بەناو میندا ململانێیان لەگەڵ مەرگدا دەکردو لەپێناو ئەو یارمەتییانەی کە لەسەر لۆرییەکانەوە بۆیان هەڵدەدرا بەگژ یەکتریدا دەچوون و، سەربازە مەرییەکانیش - کەلەم بارەدا سەربازانی تورکیا- هەندێ جار بۆ بەدەستهێنانی شتێك لەو یارمەتیانە تا لە برساندا نەمرن، کەئەوەش شتێکی زۆر ئاساییە، لێیاندەدان. وەك زۆربەی دانیشتوانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، پیاوانیان جامەدانەیان بەسەریانەوە بەستبوو، بەڵام پشتێنی پان و شەرواڵی دەلپ و بەرگی رەنگاورەنگی دڵکەرەوەو دەرەلنگی ژنانیان کارێکی زۆر سەیرو تایبەتیان لەبینەرە ماندووەکانی تەلەفزیۆن دەکرد. ئەو هۆیانەی وای لە"ئالان پیزی"ی هەواڵنێری "CBS" کرد کە بیست و یەك دلنەرۆژ بەڕادیۆ هەواڵی کوردی ناو چیاکان رابگەیەنێت؛ مندالانی جوان، پیاوانی سامناك و بەخۆنان، ژنانی ڕوونەپۆشراو و جوان، کەئەوە بەگشتی خەڵکی دونیای دەرەوەی ویڕ کردبوو. کورد هەندێکیان کەژاڵ و چاوشینن، لەچینی ناوەنجیش ئەوەندە هەڵاتبوون کە بتوانن کێشەکەیان بەڕوونی و جوانی بەزمانی ئینگلیزی و بەجۆرێکی وا رابگەیەنن، وەك "پیزی" دەیبینی، بهێنێت لەتەلەفزیۆندا بڵاوبکرێنەوەو بەئاسانیش ئەوە بگەیەنێت کە "کورد بوونەتە قوربانی سیاسەتی ئەمەریکا، چونکە داوای ڕاپەڕینی لێکردبوون؛ بۆ سەلماندنی قسەکەشیان بەیاننامەی مۆرنەکراوی عەرەبیان پێبوو کە فڕۆکە ئەمەریکاییەکان بەسەر سەربازە عێراقییەکاندا بەریاندابۆوەو تیایدا داوای هەڵاتنیان لێکردبوون" (٨) هەزار ساڵ رابورد، کەچی وەك بەڕاستی گەل نەبن، خەڵکانێکی نموونەیین و کەچی وڵاتی سەربەخۆی خۆیانیان نییە، کورد لە پڕێکار بۆماوەی پانزە دەقیقە ئاریاندەرکردو کەس ئەما لێیان بەئاگا نەبێت. وەك "ئەندی وا رۆڵ" یش

(٨) "ئەریك رۆلیە"ی باڵوێزی فەرەنسا گێڕایەوە، کە سەرەتای نیسان "بێرنار کۆشنەر"ی وەزیری باڵادەستی کارە مرۆڤایەتییەکانی فەرەنسای بردەسەر سنوور تا قسە بۆ نزیکەی چوارسەد کوردێکی ئاوارە بکات و بەگەڕانەوەیان بۆناو عێراق قایلیان بکات. ئەوانیش دوای ئەو کەوتنە قسەو، باسی ئەو بەیاننامانەیانکرد کە وەك بەڵگەیەکی ئاوانبارکردنی هاوپەیمانان نیشانیاندا، بەدەنگە پڕ لە سۆزەکەیان وەك "رۆلیە" بەڕێتی، وا بووە "سوپاس بۆ ووشە جوانەکان، بەڵام ئێوە چەکتان بە سەدام دا، داوای هەڵاتن و راپەڕینتان لەسەربازەکان کرد لەدژی سەدام، کەچی لەو دوو دوا هەفتەیەی کوشت و کوشتارەکەدا پشتتان تێکردین و پەنجەتان بەرز نەکردەوە، تەنانەت کۆمەڵەی SPCA بەزەیی بەئاژەڵهاتنەوەدا باشتر رەفتار لەگەڵ سەگی خوێنڕیدا دەکات وەك لەوەی ئێوە لەگەڵ ئێمەدا کردتان، بۆیە ئێمە بڕواتان پێناکەین داوا دەکەین مافی پەنابەرێتی سیاسیمان لەفەرەنسا بدەنێ کە کۆشنەر وتی: قسەکەتان لەبنەڕەتدا، راستەو ئێمە یارمەتی سەدامەمان داوە "رۆلیە پێی وتبوو: ئەو قسانە مەکە چونکە تۆ ناتوانی پەنجا هەزار پەنابەر لای خۆت وەربگریت

ڕایگەیاند، لەم سەردەمەی تەلەفزیۆندا دۆستە بیانییەکانیان بەهەموو لایەکدا بڵاوبوونەوەو هەوڵی زۆریشیاندا کە ئەو پانزە دەقیقەیە درێژتر بکەنەوە، هەر هیچ نەبێت تەوسپێکردنەکەی باڵوێزە داناکەی!! دونیای سێی بەغدا بەدرۆبخەنەوە، گەوای بۆ دەچوو گوایە کورد هەر بەقەدەر ماوەی یارییە هیلاهۆپەکەی لارێتی خۆی بەدڵی خۆرئاوا دەبێت.

دانیال میترانی هاوسەری سەرۆکی فەرەنسا، کەبەدڵ و بەگەرمی پارێزگاری لەکوردو کەمایەتییە چەوساوەکانی دی دەکرد، هیچ پێویستییەکی بەوە نەبوو کە سەرنجی مێردەکەی بۆ کارەساتەکەیان ڕابکێشێت. ئەو ساڵی ١٩٨٢ یارمەتی "کەندال نەزان"ی دابوو، کە فیزیاوییەکی باڵادەستی کوردەو لەتورکیا دوورخراوەتەوە، تا ئەنستیوتی کورد دابمەزرێنێت. دانیال میتران لەدوا ڕۆژەکانی مانگی مارتدا، کەدژە هێرشی عێراق ڕێکدەخرا، شارەزایان و پسپۆڕانی لەناوەوەو دەرەوەی حکومەتدا بۆ ئامادەکردنی پلانێکی کتوپڕانە ووریاکردەوە. لەگەڵ بەتێپەڕبوونی یەکەم هەفتە زۆر ناخۆشەکەی مانگی نیسانی ڕەوکەراندا، توانی مێردەکەی بەوە قایلبکات کە لەتەلەفزیۆنەوە سەیری ئەو پانتاییە بەرینەی چیاکان بکات کە کوردە چەوساوەکانی تیادا کۆبوونەتەوە. خاتو دانیال میتران لەسەردەمی لاوێتیا و لەوناوچانەی فەرەنسادا کەنازییەکان دەستیان بەسەردا گرتبوو، چالاکی بەرەنگار بوونەوەی هەبوو، بۆیە لە ڕێی شارەزایی خۆیەوە، سەدەنی و سەربازییەکانی "ئەلیزیە"ی لەبێسوودی بەردڵنەوەی یارمەتی بەپەرەشووت ئاگادارکردبۆوە. کارەساتەکەی کورد بەجۆرێکی وا کاری لەسەرۆک فرانسۆ میتران کردبوو، کە فەرەنسا بەپەلە داوا لەسکرتێری نەتەوە یەکگرتووەکان بکات کارێک ئەنجام بدات، ئاگاداریشی کردەوە کەئەگەر ئەو هیچ نەکات ئەوا پاریس لەلای خۆیەوە شتێک دەکات. پشتگیریکردنێکی زۆر بەسەر باڵوێزخانەو کۆنسولیەتەکانی فەرەنسادا بەجۆرێکی وا داباری کەووڵاتە یەکگرتووەکان و بەڕێوەبەرێتییەکەی بوشیان لەکەدار کردبوو، کەچی واش هەر لەسەر هیچ نەکردن سووربوو.

پێوەندی و قووڵ و دوورو درێژی دانیال میتران بە کوردەوە، نموونەیەکی نەریتە کۆنەکەی فەرەنسای کاتی شانشین نەبوو، کە لەڕێی کێشەیەکی لاوەکی و نەناسراوەوە هەوڵی ڕاکێشانی تەواوی کەسە نزیکەکانی تەختی بێت. یەکێک لەو شتانەی هەستی دانیال میترانیان بەلای کورددا بزواندبوو "برنارد دۆرین"ی دیپلۆمات بوو کەلە پڕێکا دەستی لەکار کێشایەوەو، بێنەوەی شتێکی وا لەبارەی کوردەوە بزانێت بۆیان کەوتەکار. لەساڵی ١٩٦٤ دا "گەوای د. نۆرسای- وەزارەتی دەرەوە-"ی بەتووڕەیی جێهێشت، ئەویش دوای دەمەقاڵێیەک لەگەڵ "ئەریک دی کاربۆنێل"ی بەڕێوەبەری گشتی لێپرسراویدا، چونکە فرمانی ئیمزاکردنی یاداشتێکی

شێوەکاری بەریتانیای پێکردبوو، کە تیایدا فەرمنسای لەفرۆشتنی فرۆکەی(هاوکەر هەنتەری) بەریتانیایی بەعێراق ئاگادارکردبوو، دۆرین بڕیاریدابوو کە زیاتر خۆی بۆ خەڵکێکی تر شارەزابکات، کە بەبۆچوونی خۆی پیشە دیپلۆماتییەکەیی بەقوربانکردبوون، بۆ ئەوەش زمانی کوردی خوێندو لەساڵی ١٩٦٨ دا پێی لەسەر بینینی ڕووداوەکانی کوردستانی عێراق داگرت، ئەوساکە دۆرین لەدەزگایەکی وەزیری "توێژینەوە زانستییەکان"دا کاری دەکرد، ئەویش بەئاسانی مۆڵەتی تایبەتی دایەو بەڵێنیشی پێدا "ئەگەر نەکوژرێت" بیگێڕێتەوە سەرکارەکەی، ڕاستییەکەشی لەو شەش مانگەی لەگەڵ مەلا مستەفای بەرزانیدا بوو، کەدیسانەوە لەپێناوی ئۆتۆنۆمیدا لەگەڵ سوپای عێراقدا کەوتبۆوە شەڕکردن، زۆر دوور نەبوو گیانی لەدەستبدات. لەساڵی ١٩٧١ دا، دۆرین لە وەزارەتی دەرەوەدا وەك باڵوێز لە؛ هایتی، ئەفریکای خوارو، بەرازیل، تایوان، دواییش، لەبەریتانیا دانرایەوە، لە لەندەن لەو ڕۆژگارە ئاسکانەی نیسانی ١٩٩١دا هاریکاری بەریتانیای دەکرد، تا لەگەڵ فەرەنسادا کارێك بۆ سەرفرازکردنی کورد بکەن و وڵاتە یەککگرتووەکان وا لێبکەن کە یەك تۆزقاڵ لەبەرپرسیارێتی خۆیان بنوێنن، کەئەو جۆرە هاریکردنە لەڕۆژگاری ئاشتیدا دەگمەنە.

ئەوی ڕاستبێت "پیتەر گالبرێت"ی ئەمەریکایی ئەندامی باڵادەستی لیژنەی پێوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجومەنی پیرانی ئەمەریکا، کەلەکاتی هەرەسی ڕاپەڕینەکەی کورددا لەگەڵ جەلال تاڵەبانی لەشاری دهۆك بوو، یەکەم دۆستی بیانی کوردە کە جێدەستی دیاربێت. گالبرێت، بەدڵ بەرگری لەکورد دەکرد، لەو سەفەرە ڕەسمییەی ساڵی ١٩٧٨ییەوە کە بۆ باکووری عێراق کردی و، ئەو ڕاپۆرتە ڕەسمییەی لەبارەی ڕیشەکێشکردنی ژیانی گوندو دێهاتەکانەوە خستبویە بەردەم ئەنجومەنی پیرانی ئەمەریکا، ببووە سیخێکی هەمیشەیی و لەقەبرغەی سەدام حسێن و بەڕێوەبەرایەتییەکەی "ریگن" و "بوش"یش هەڵچەقیبوو. ڕۆژی یەکشەممەی نیستر یەکێك بوو لەو دوا کەسانەی، بەرلەوەی سوپای عێراق ڕێگای دەربازبوون دابخات، لەڕووباری دیجلەوە بەژێر ئاگرباراندا هاوەندا بۆ سوریا پەڕییەوە. گالبرێت بە گەیشتنە دیمەشقی یەکسەر تەلەفۆنی بۆ باڵوێزخانەی ئەمەریکا کرد لەئەنقەرەو، لەلێشاوە بەکۆمەڵەکەی پەنابەران کە بەرەو سنوور دەهاتن و، ڕۆژنامە نووسانی ئەمەریکایی و بیانیشیان تیادایە ئاگاداریکرد، ئەم بەئاگاهێنانەوەیە باڵوێزخانەی لەڕووی کارەساتەکەدا ووریاکردەوەو بووەهۆی دەستپێشخەریان.

کاسێتە ڤیدیۆکانی گالبرێت، کە دیمەنی ڕەوەکەی لەسەر گرتبوون، لەناو ئەو یەکەم فیلمانەدا بوون کە تەلەفزیۆنی ئەمەریکایی نیشانی دەدان و هەموو دونیایان لەمەزنی ڕەوەکە بەئاگاهێنا. گالبرێت بە گەیشتنەوە واشنتۆنی ئیتر یەکبینە لەتەلەفزیۆندا سەبارەت بەکورد دەدوا، هەوڵی

چاکیشی بۆ ڕێکخستنی ئەو هەڵمەتە سەربەستانەی بۆ کارکردنە سەر دەستەکۆتراوەکەی بەڕێوەبەرێتی بوش دەدوان، تا ڕێی چاوپێکەوتنی نوێنەرانی کورد لەوەزارەتە دەستبەستراوەکەی دەرەوەی نەگرێت، ئەوانەشی کە ڕکی تەواویان لەڕەفتاری بەڕێوەبەرایەتییەکەی ئەمەریکا بەرامبەر بەکورد هەستابوو، دووانیان خاوەن خەڵاتی "پۆلیتزەر"و، دووانی تریشیان نووسەرانی ستوونی ڕۆژنامەکان. "جیم هۆگلاند"ی واشنتۆن پۆستو "ولیام سافیری.ی.دی" نیویۆرک تایمس بوون کە هەردووک ماوەیەکی زۆر بەرگریان لەکورد کردبوو.

لەسێی مانگی نیساندا سەرۆک میتران "بێرنارد کوشنەر"ی وەزیری کاروباری مرۆڤایەتی کەوەزیرێکی کارامەی بالادەستی فەرەنسایە، ناردە ئەنقەرە تا لەگەڵ تورکەکاندا بنەمایەکی یاسایی بۆ داڕشتنی بڕیارێکی ئەنجومەنی ئاسایشی سەربەنەتەوە یەکگرتووەکان، لەسەر پارێزگاریکردنی کورد لەناو عێراقدا دەربکات. لەحەفتاکاندا کوشنەر ئەندامێکی دەستەی دامەزرێنەری کۆمەڵەی یارمەتییە پزیشکییە ناحکومەتییەکان بوو، کەبەناوی پزیشکانی بێسنوورەوە دامەزرێنرا، دواتریش لقێکی پچووکتریان بەناوی پزیشکانی جیهانییەوە، بۆ کۆمەککردنی پزیشکانەی کاتی ڕووداوە کوتوپڕەکانی دونیای سێ، دامەزراند.

کۆشنەر سیاسەتمەدارێکی دەگمەنی خاوەن شارەزاییەکی چاکی کێشەی کوردبوو، ئەوەندەش بەتواناوبوو کەکارەکە بەئاسانی ڕاپەڕێنێت، بۆیە بەڕاستی ببووە شوێنبارەری بینەرانی تەلەفیزیۆن. پزیشکانی جیهان بۆ چەند ساڵێك لەیارمەتیدانی کوردەکانی سەر سنووری ئێران عێراقدا بەردەوامبوون. کۆشنەر بەڕادەیەك ئیتی لەپێشێلکەرانی مافی مرۆڤی دونیابوو، کەزۆر لەمێژبوو داوای لەکۆمەڵگەی نێودەوڵەتی دەکرد لەپێناو بنەماو کێشەکەی "مافی دەستێوەردان"دا، تەنانەت دەست لەکاروباری ئەو دەوڵەتانەش بخرێت کە لەمێژەوە سەربەخۆیەتیان بەلاوە پیرۆزبووە. ئەو لای وابوو کە کارەساتەکەی کورد دەرفەتێکە بۆ جێبەجێکردنی تیورە خۆشەویستەکەی.

مرۆڤ بە شارەزایەتی پێشتری ڕایدەزانی تورکیا ئەو دەست تێوەردانە بەڕێساشکاندن دادەنێت و یەکسەر دەیداتە دواوە، چونکە تورکە نەتەوەییە لەهەمووشت بەگومانەکان، ڕسواییخۆیانیان بەهۆی خۆتێهەڵقورتاندنی هێزە بیانییەکانەوە، ئەلەبیرچوبووەو ئەلێشی خۆشیبوون، بەتایبەتی لەو ڕۆژگارانەدا کە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی گلۆڵەی لەلێژیدا بوو، "مبشر"ینە خۆرئاواییەکان، لەبری دیانە کەمایەتییەکەی ناو تورکیا کەیاندەکرد، خۆ هەوڵ و تەقەلای بەریتانیاو فەرەنساو یۆنانیش بۆ پەرتکردنی وڵاتی ئەنادۆڵ لەولاوە بوەستێ. کەوا

هەستیانئەکرد دڵنیان لەتەو پەت دەکەن بیێ لەوەش ئەو دەوڵەتە نوێیەی ناوەند سەرەڕۆیانە بەڕێوەی دەبرد و کەمال ئەتاتورک بۆ لەنوێ دامەزراندنەوەی لەبەشە کاولکراوەکەی ئیمپراتۆریەتەکەدا مابۆوەوە، نکوڵیشی لەجیایی و بوونی کورد دەکرد، کە گەورەترین کەمایەتی ناو وڵاتێکن و، بەلەسەدا بیستی دانیشتوانی تورکیا مەزەنەدەکران. لەمێژینیە حکومەتی تورکیا هەستی بەوەکردووە کە حکومەتەکانی دەرەوە، لەسەر جۆری رەفتارکردنی لەگەڵ ئەو هەزاران کوردە عێراقیانەی مانگی ئابی ١٩٨٨، کە سوپای عێراق لەخوارووی سنووری وڵاتەکەیانەوە گازبارانی کردن، دەمی رەخنەیان لێکردوونەتەوە، چونکە ئەمان گەر لەڕووی مرۆڤایەتیشەوە بوایە دەبوا رێی هاتنەناوەوەیان بدانایە، کەچی نەیانکردو سنووریان بە ڕوودا داخستن.

لەلایەکی تریشەوە فەرەنسایییەکان هەستیان بەوەکردبوو کەسەرۆک "تۆرگت ئۆزال"، دواشت کە لەکردنیبێت، جێکردنەوەی نیو ملیۆن کوردی عێراقە لەتورکیادا، چونکە دەرئەنجامەکەی، وەك نێردراوانێکی خۆرئاوایی وتیان "لە خۆکوشتنێکی سیاسیانەی حکومەتی تورکیا دەچێت". ئۆزال لەسەفەرێکی کۆتایی پشووی هەفتە شوومەکەی ئیستەردا، کەلەئەمەریکاوە بۆ ئەنقەرە گەڕایەوە، یەکسەر داوای کۆبوونەوەیەکی ئەنجومەنی ئاسایشیی نەتەوەییکرد، کە بەتواناترین دەزگای وڵاتەو سەربازییاکان دەستی باڵایان تیایدا هەیە. لێشاوی پەنابەران تادەهات گرفتی باشووری وڵاتی ئاڵۆزتر دەکرد، چونکە سەدو بیست هەزار سەباز و پۆلیس، بەهۆی شەڕێکی ناوخۆوە، کەلەساڵی ١٩٨٤ەوە دژ بە جیاخوازە کوردەکانی ناو تورکیا هەڵگیرساوەو تا بێتیش زیاتر کڵپە دەسێنێت، پەنگیانخواردبۆوە. لەم کاتەدا ئەنقەرە تووشی بەزمێکی خراپ هاتبوو، سەربازەکان بەئاشکرا رێی ئاوارەکانیان نەدەدا تا بگەنە شوێنێکی وا کەبۆ حەواندنەوەیان باشتربێت، بگرە جاروبار بەزەبری تفەنگ ڕووەو لووتکە ڕووتەن و بەفرگرتووەکان دەیگێڕانەوە.

دیپلۆماتێکی فەرەنسایی لەپاریس، رێکەوتنەکەی کۆشنەری بە "رستەی تەلیسمی" ناودێنا، چونکە تورکیا بۆ یەکلاکردنەوەی گرفتە بێچارەکەی خەونی پێوە دەبینی. تورکیا لەئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکاندا نەبوو، بۆیە بۆ پشتگیری پرۆژەکەی پێویستی بەیارمەتی ئەندامێکی هەمیشەیی ئەنجوومەنەکە هەبوو، فەرەنساش کە هەرلەوکاتەدا خەریکی پرۆژەیەك بوو، ئەوەی زۆر پێخۆشبوو رێکەوتنەکەیان لەگەڵ لائحەی تایبەت بە "بەهەڕەشەکردن لەئاشتی و ئاسایشی جیهان"دا دەگونجاو، ڕەوایی بەتورکیاشدەدا کەڕێ بەکوردی عێراق نەدا بچنە ناو خاکی وڵاتەکەیانەوەو، لایەنگری ناردنی هێزیش بکات کەبچنە ناوخاکی عێراقەوە، تا گێڕانەوەی کورد بۆ ناوماڵ و حاڵی خۆیان بەسەر سەدام حسێندا، بیەرێت یان نا، بسەپێنرێت. کاربەدەستانی نەتەوەیەکگرتووەکان بەتووڕەییەوە ناوی "دوورخستنەوەیان" یان لەمە نابوو. کە

ووشەیەکی تەکنیکیانەی رەتکردنەوەی پەنابەرێتییە، راستییەکەشی تورکیا، دوای دووەم جەنگی جیهانی کەبەڵگەنامە نێودەوڵەتییەکەی لەسەر وەرگرتنی پەنابەری سیاسی مۆرکرد، قایلنەبوونی خۆیی لەوەرگرتنی پەنابەرانی دراوسێی خۆرهەڵات و باشووری، کەبەناو ئاوێبردن راگەیاند، لەگەرچی ئەمە لەدوای شۆڕشە ئیسلامییەکەی شوباتی ۱۹۷۹ ی ئێران، کە کۆتایی بەرژێمی شاهەنشایانەی پەهلەوییەکان هێنا، رێی دڵنەدانی نزیکەی یەك ملیۆن ئێرانی نەگرت و، لە ۱۹۸۸یشدا بواریان بەکوردی عێراق دا کەلە کەمپەکانی باشووری خۆرهەڵاتی تورکیادا، لەبارێکی زۆر ناهەموواردا بمێننەوە، تا ساڵی ۱۹۹۱ بیست و هەشت هەزار کەسیان لەوێ مابوون، دواتر زۆربەی هەرە زۆریان بۆ عێراق گەڕانەوە.

لەمڕووەوە چوونەکەی کۆشنەر رێزو سوپاسی هەڵدەگرت، چونکە بووەهۆی پێشکەشکردنی پرۆژەیەکی شۆڕشگێڕانەی دووقۆڵی فەرەنسا و تورکیا، کەبەلای زۆر لەدیپلۆماتە کارامەکانەوە گرنگ و جێی سەرسوڕمانبوو، ئەوان پێیانوابوو "سین" یان "شوورەوی" مافی ڤیتۆی لەدژ بەکاردەهێنێت، کەچی لەئەنجامدا ئەنجومەنی ئاسایش، لەپێنجی نیساندا پەسەندیکرد. لەماوەی هەفتا ساڵدا بۆ یەکەمین جارە کورد لەبەڵگەنامەیەکی جیهانیدا کەبڕیاری ٦٨٨ی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکانە، بەناو ناویان بێت، ئەویش لەڕووی یاساییەوە کەبەکارێکی زۆر گرنگ دادەنرێ و تورکیاش ناچاربوو پێی قایلبێت راستییەکەشی نەتورکیاو نەبەڕێوەبەرایەتییەکەی بوش، لەوەزیاتر شتێکی دیان پێنەدەکرا بەڕێوەبەرایەتییەکەی بوش حەپەسابوو پێشیخۆشنەبوو بەپرۆژەیەك قایلبێت کەناچاری بکات سەربازەکانی بۆ باکووری عێراق بنێرێت، چونکە لەگەڵ ئەو بەڵێنەیدا نەدەگونجا، کەدەبوا بەزووترین کات لە کەنداوی فارسەوە بۆ شوێنی خۆیانیان بگێڕێتەوە.

بەڵام جۆرج بۆش بۆ یارمەتیدانی "ئۆزاڵ"ی بێچارە زۆر بەپەرۆشبوو، چونکە لەیەکەم رۆژی کوێت گرتنەکەی عێراقەوە، ئۆزاڵ بەگەرمی ئامادەیی بۆ داخستنی بۆرییەنەوتەکانی عێراق نیشاندا، کەبەخاکی تورکیادا دەڕۆیشتن و بووەیەکێك لە هاوپەیمانە سەرەکییەکانی دامەزرێنەرانی ئەو یەکگرتنەی دژ بە سەدام حسێن کرا. جگە لەوەش، دوای هەرەسهێنانی راپەڕینەکانی شیعەو کوردو قەڵاچۆکردنیان لەلایەن عێراقییەکانەوە، کە یەکبینە لەتەلەڤیزیۆنەوە پەخشدەکران، شانازیکردنەکەی بوشی بە سیستمی نوێی جیهانەوە لەقکرد. وەك یەکێك لەپشتگیریکەرانی "مافی دەستێوەردان" سەرنجی بڕیاری ٦٨٨یبە: "بڕیاری ناردنی یارمەتییە مرۆڤایەتییەکان بۆ کوردو هاوڵاتییە عێراقییەکانی دی، با حکومەتی بەغدا لەدژیشی بووبێ، ئەوە ناگەیەنێت کەئەنجومەنی ئاسایش هیچ گرەنتییەکی یەکلاکەرەوەی وای بەدەستهێنابێت،

که لەمەولا هەر حکومەتێك خراپەکاری یان تەنانەت هاولاتیانی خۆی قەلاچۆ بکات. بتوانن بەو ئاسانیەو بەرێگەیەکی یاساییانە یارمەتییە مرۆڤایەتییەکان رەتبکەنەوە" دابوو.

کوردی عێراق دۆستێکی بەدەستی تریان لەئەنقەرەدا هەبوو، "ئیریك رۆلیە"ی بالوێزی فەرەنسا، بەرلەوەی دیپلۆماتکاری لەئامێزی بگرێت، دەیان سال لەرۆژنامەی لۆمۆندی دەست و دەنگ رۆیشتوودا، شارەزاو پسپۆری کاروباری خۆرهەلاتی ناوەراستبوو، رۆلیە بەدەرز دادانی ((مورتون، ئای، ئەبرامۆڤیتن))ی بالوێزی ئەمریکاوە خەریکبوو سیاسەتە هەرە ئاسکەکەی خۆرهەلاتی ناوەراست، بەتایبەتی "سروشتی کۆمەلگەی عێراق"ی بۆ روونەکردەوە، ناکۆکی و ئالۆزی زۆری بۆچوونەکانی بەرپوەبەرایەتییەکەی بوشی بۆ یەکلاکردەوە.

پێشتر "ئەبرا مۆفیتز" هیچ ئیشی لەخۆرهەلاتی ناوەراستدا نەکردبوو، بەلام لەحەفتاکاندا کەلەتایلاند بالوێز بووە، لەمەلوێستی ئازایانەو سیاسەتی ژیرانەو بەرپوەبەرێتییە بێهاوتاکەیداو، لەبەئاکامگەیاندنی لێشاوی ئەو ئاوارانەی بە "خەلکی پاپۆر" ناسراوبوون و لەڤێتنامەوە بەرەو تایلاندا هاتبوون، جێدەستی دیاربووە. کرژبوونی حکومەتی تورکیا بەو سەردانانەی دیپلۆماتە بیانییەکان بۆ شوێنە گرنگەکان دەیانکرد، بەتایبەتی سنوورییەکانیان ئاسایی بوو، بەلام پەرۆشی دۆزینەوەی رێگەی هەلاتنی ئەو چەند رۆژنامەنووسە ئەمەریکاییەی لەعێراقدا بوون، کردە بیانوو بۆ بەگەرخستنی ژمارەیەکی زۆرلە فەرمانبەرانی بالوێزخانەکەی، تا هەوالی نوێی لەبارەی ئەو سەدان هەزار پەنابەرە کوردە بەسەربەکترشاوانەی سنووری تورکیای دەستگیربێت.

بێ ووچان و ماندووبوون، پەیتاپەیتا بروسکەی بۆخەبەر کردنەوەی بەشە رەسمییە خەوتووەکەی واشنتۆن دەنارد. تەلەفۆنێکی بێشوماریشی بۆ دۆست و هاورێ دەستڕۆیشتووەکانی ناو دەرەوەی حکومەت دەکرد، تەنانەت نامەشی بۆ کۆشکی سپی دەناردو لەسەری دەنووسی "بۆ گرنگی پێدانی بوش"، چونکە شارەزابوونی زۆری لەکێشەی "خەلکی پاپۆر"دا، بروایەکی تەواوی بە "ئەگەر بتەوێت سەربکەویت ئەوا دەبێت لەووریاکردنەوەی خەلکیدا جێگە بەخۆت ئەگریت و هەمیشە لەجوولەدابی" پەیدا کردبوو. ئەبرا مۆفیتز وتی: "لەهەلو مەرجێکی وادا من پێمولیە کەدەبێت بیر لە رووداوی زۆر خراپ بکرێتەوە"، "برینت سکۆ کرۆفت"ی راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی سەرۆك، لەچالاکییەکانی تایبەت بەپەنابەرانی بالوێزی رۆژانی "خەلکی پاپۆر" ئاگاداربوو، بۆیە هەستیکرد ئەو ووریا کردنەوانە قەومانی کارەساتێکی گەورەی بۆ تورکیا یان بۆ وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هێجگار نزیکخستۆتەوە. بەپێی روونکردنەوەی یەکێك لەدیپلۆماتە ئەمەریکاییەکان، کەلەبروسکە ناردن و

وەرگرتنی ئەبرا مۆفتیز ئاگاداربوو، ئەبرا مۆفتیز لەئەنقەرەوە یەکبینە دەنگی لێهەڵدەستاو، لۆزالیش بە تەلەفۆن لەگەڵ بۆشدا پێی لەسەر کارێکی گونجاو دادەگرت.

باڵوێز پشتگیری ئەوەی دەکرد کەخۆراک و پێویستی لەچیاکاندا بەپەرەشوت بەربدرێنەوە، لەحەوتی نیسانەوە هێزی ئاسمانی ئەمەریکا دەستی پێکرد، زۆری ئەبرد کە تورکیا بڕیاری دا فڕۆکە لەبنکەی ئەنجەرلیکی ئەدەنەوە هەستێ و، هێزی ئاسمانی ئەمەریکاش لەوێ هەرچی فڕۆکەیەکی بارهەڵگری هەبوو لەباری ئامادەباشدا دایناان، ئەمجا بەریتانیاو فەرەنساش فڕۆکەکانیان بۆ هەمان مەبەست خستەگەڕ، بەڵام واش سەربازە ڕەسمییە باڵادەستەکانی واشنتۆن، بەکارێکی سەرکەوتوویان نەدەزانی و، کاریگەرێتییەکەیان وەك "دان بۆ کوتر ڕۆکردن" دادەنا؛ لەوێش خراپتر هەندێك لەو یارمەتیانەی بەپەرەشوت بەردەدرانەوە خراپ دەهاتنە خوارەوەو بەرسەری خەڵکی دەکەوتن و لێشی دەکوشتن، چەند کوردێکیش کەبەدوای پەرەشوتەکاندا ڕایاندەکرد "مین" لەبن پێیاندا دەتەقییەوە. بەڵام هەرچۆنێك بێت پێدەچوو یارمەتی بەردانەوەکە لەبەرنەدانەوەی باشتربێت، چونکە فیلمی دەگیراو، هیچ نەبێت وایدەگەیاند کە هاوپەیمانان بەڕاستی خەریکن، بۆشیش دەیویست بەشێوەیەك بەرچاو بکەوێت کەلەدوای کارە بێسوودەکانی یەکەمجاری، نیشێکی وادەکات کێشەکەی پێبنبڕبکات.

پاداشتی "ئەبرا موفیتز"ی باڵوێز، قایلکردنی "جێمس ئەی بەیکەر"ی وەزیری دەرەوەبوو تا سەردانی خێوەتگایەکی گەورەی ئاوارەکان لە "چوکورکا"ی ناو چیاکانی نزیك سنوور بکات: لەحەوتی نیساندا ئەوێك کەلەجیهاندا، بە خۆپارێزو بایەخدەر بەهەندام و جل و بەرگ ناوی دەرکردبوو، هەجووتێك جزمەی کاوبۆیانەوە، کە کەڕاگەیاندنە جۆراو جۆرەکان زیاتر خەیاڵیان لەوەی دابوو؛ لەکۆپتەرەکەی دابەزی، تا بەچاوی خۆی کارەساتی ئەم بەدەیان هەزار کەسە نەگبەتە لێقەوماوانە ببینێت و، کەمتر لەچارەکێکیش مایەوە. خۆ ئەگەر سیاسەتمەدارێکی دڵڕەقی وەك بەیکەر، کەهەر لەسەرەتاوە لەڕووداوەکان بەگومانبوو، لەگەڵ بەجێهێشتنی "چکورکا" کارەساتەکە بەجۆرێکی وا کاری تێبکات، پەرۆشی ئەو کەسانەی بێت کە بەچاوی خۆی بینیبوونی، دەکرێت بە "باشترین ١٢ دەقیقە لەمێژووی کاری پەنابەرێتیدا" دابنرێت کەئەوپەڕی قایلێتی بەباڵوێز بەخشی.

بەیکەر ئەوسا هەستیکرد چارەسەرکردنی ئەو قەیرانەی لەمێژووی جیهانی نوێدا، بۆ یەکەمجار کوردی گەیاندە ناو ئەجەندەی دونیاوە، پێویستی بەنێشێکە لەوئاستەدا، هەرکە گەیشتەوە دیاریەکرو بەفڕۆکە تایبەتییەکەی بەرەو ئیسرائیل بۆوە، دەست بەجێ تەلەفۆنی بۆ بۆش و "ریچار چینی" وەزیری بەرگری و "خافیر پیریز دی کوێلار"ی سکرتێری گشتی نەتەوە

یەکگرتووەکان کرد. ئەوسا سەرۆك بوش ناچار ولزی لە رەتکردنەوەی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ کوردو کەللەڕەقیتییەکەی خۆی هێنا، چونکە هەرخۆشی هۆیەکی ئەو کارەساتە گرانەبوو کەبەسەر کورد هاتووە، بەیکەریش یەکێك لەجێ باوەڕەکانی بوو.

هاوپەیمانانی بوش ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر لێی پەستدەبوون، ئەشدەکرا لەوەزیاتر چاوەڕوانییەکەن، "جۆنمێجەر"ی سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا، لەمەشتی نیسان و لە لۆکسیمبورگ پشتگیری سەرجەم ئەندامانی کۆمەڵەی ئەورووپای بۆ ئەو پرۆژە نایابە بەدەستهێنا، کەسوپای هاوپەیمانان لەتەختاییەکانی باکووری عێراقەوە، ناوچەی ئارام بپارێزن، تا هانی پەنابەرەکانبدەن چیاکانیان بەجێبهێڵن. ڕای گشتی لەبەسەرهاتەکەی کورد زۆر بێزارو نارازی بوو، "مارگرێت تاتچەر"ی سەرەك وەزیرانی پێشووی بەریتانیا هەرەشەیدەکرد و مێجەریش دەیویست ئازادی خۆی لەنیشە باشەکانیا بۆ کورد بسەلمێنێت، ئەوەش کارێکی سیاسیانەی هێجگار گرنگبوو، چونکە لەوکاتەدا چوارمانگ بەسەر گەیشتنە خانووی ژمارە "١٠"ی "داونینگ ستریت"یدا تێپەڕیبوو، بۆیە دەبوا چاك هەڵسووڕاندنی ئەونیشەی بەباشی نیشانبدایە.

تەنانەت فەرەنساییەکان، کەلەو ساڵانەی دواییدا لەگەڵ ئینگلیزەکاندا زیاتر ناکۆك بوون وەك لەوەی هاوپەیمانین، ئەم لەسەرسووربوونەیانیان بەدڵبوو، لەڕێی کەناڵە دیپلۆماتییەکانیانەوە، تا ئیشەکەی بەریتانیا بەچاك ئەبڕن، ولزیان لەخۆ بەخاوەنی بیرۆکەی ناوچەی ئارام هێناو جەختیان لەو ئامادەییە نائاساییەی مێجەر کرد، تا بێنەوەی گوێ بەڕای واشنتۆن بدات بڕیارێکی گرنگ ئەرکات و ئیشە ناپەسندەکەی حکومەتی فەرەنسای دوای جەنگ، کە چەند مانگێك بۆ پێناسەکردنی کورد پاشکۆیەتی ڕێبازی ئەمەریکای دەکردو، ئەوەش سیاسەتمەدارە ئەتەوەییە فەرەنساییەکانی ڕیزی پێشەوەی تووڕە کردبوو دەبوا پارەتیدانەکەشیان بەشێوەیەك بوایە، وێنەی فەرەنسای وەك دابینکەری سەرەکی چەکی خۆرئاوا بۆ سەدام حسێن بسڕیایەتەوە، یان هیچ ئەبێت ڕێکی بکردایەتەوە.

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو پەرۆشییەی بەریتانیاو فەرەنساو وڵاتە ئەورووپییەکانی دی بۆ یاریدەدانی کوردو بایەخپێدانیان، کەچی پەشۆکابوون، چونکە خۆیان بەتەنیا نەیاندەتوانی هیچ شتێك لەسەر زەوی بکەن، لەمێژبوو لەوەش گەیشتبوون کە ناوچەیەکی چەپەکی پڕ گرفتی پەنابەران، بەکارێکی سەربازیانە نەبێت چارەناکرێت و،ئیشی واش هەربە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا باش بەڕێوە دەچێت، خۆ بەبێ ئەمەریکاش هیچیان بۆ بڕیاری ٦٨٨و بیرۆکەی ناوچەی ئارام پێناکرێ، بۆیە وەك یەکەم هەنگاو بۆ قایلکردنی پەنابەران کەبۆسەرماڵ و حاڵی

خۆیان بگەڕێنەوە، دەبوا حکومەتەکانی بەریتانیاو فەرەنسا ئەمریکا قایلبکەن، تا بەبیانووی پارێزگاریکردنی فڕۆکە بارھەڵگرە زەبەلاحەکانی "هێرکیولیس C-130) یانەوە، کە هاتوچۆیان ئاسان نییەو بۆ بەردانەوەی یارمەتی بەکاردەهێنرێن، لەسەرووی پانەهێڵی ٣٦ەوە فڕین لە لەعێراقییەکان قەدەغەبکات.

بەردانەوەی یارمەتی لەو فڕۆکانەوە بۆ پەنابەرەکان شتێکی ئەوتۆ نەبوو، کوردی تورکیا لەناوچەکەدا، رۆژانە یارمەتی زۆر لەوان و لەمانگی سووری تورکیاش، کە دەزگایەکی یامەتیدەری جیهانییە، زیاترو کاریگەرتریان دەگەیاندنێ. بەڵام واش "C-130" یەکان بۆ بەجیهانیکردنی کێشەکە شتێکی پێویستبوو، چونکە فڕۆکەو کۆپتەری جەنگیان بۆ هاوڵیکردنیان هێنایە بنکەی ئەنجەرلیکو، فڕۆکەی A-10 یشیان بۆ پشتگیریان هێناو، تا بەردەوام ئاڵەو گرمەیان پەیامێکی دیارو ڕوون بێت بەسەر سەربازە عێراقییەکانەوەو، هەرکاتێك سەربازەکانی هاوپەیمانان بێنە ناو باکووری عێراقەوە ئەوان پاشەکشە بکەن و، کوردە ئاوارەکانیش بە بەجێهێشتنی چیاکان و گەڕاندنەوە قایلبکەن، مانگ لەدوای مانگ و ساڵ لەدوای ساڵ فڕینی فڕۆکەکانی هاوپەیمانان بەسەر کورددا دڵنیاییەکی دەدانێ و بە ئاگاکردنەوەیەکی عێراقییەکانیش بوو تا چیتر بەرەو سنوورەکانی عێراق ئێران ڕەو بە کەس نەکەن.

ئەمڕینانەی (کە تورکیا نابەدڵ ڕێیدەدان)، دەبوایە سەرەتا هەموو شەش مانگ جارێك و دواتریش هەموو سێ مانگ کەرەتێك نوێ بکرایەتەوە، کەئەوەش تاکە کۆسپی ڕاستەقینەی هەوڵی عێراق بوو بۆ گرتنەوەی ناوچە بەرینەکەی باکووری وڵاتەکەی کە کورد وەك "ئەمرێکی واقیع" بەڕێوەی دەبرد. پانەهێڵی ٣٦ هەرەمەکیانە دانرابوو سەدی شەستی دانیشتوانی کورد، کە زۆریەیان لەهەڵاتووانی بەرەو سنووری ئێران بوون، بێپارێزگاریکردن هێڵرابوونەوە، بەڵام زۆربەی ئەو ٤٠٠-٥٠٠ هەزار ئاوارەیەی سەر سنووری تورکیای دەگرتەوە (تا مەترسی نهێنییە زۆرەکەی دەزگا سیخوڕییەکانی عێراق، لەوەی کەگوایە هاوپەیمانان ئارەزووی دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆیان لە باکووری عێراقدا هەیە) نەهێڵێت، ناوچە نەوتییەکانی کەرکوکیشی نەدەگرتەوە.

هاوپەیمانان دەبوایە ئەو بیرۆکە فەرەنساییەی ناوی "ڕێڕەوی مرۆڤایەتی "لێنرابوو، لەوێستگەی سەرەڕێی بەخواردن و ئاوو بەنزین و پێویستی پزیشکی دابینکراو پێکهاتبوو، تا ببوایەتە ڕێگە هاتنە خوارەوەی ئاوارەکانی چیا بۆناو ئەو خێوەتگایانەی لەتەختایی ناوچەی ئارامدا دادەمەزرێنرا.

ئەم ڕارەوانەی کەلەجنێك لەگەڵ نەتەوە یەککگرتووەکاندا دەستبەرێکخستن و داڕشتنیان کرا، هۆیەکی تری بۆ نەتەوە یەککگرتووەکان مسۆگەرکرد، تا وەڵامی تاوانبارکردنی خۆهەڵقورتاندنەکانی کاروباری ناوخۆی عێراقی پێبداتەوە.

بەڕێوەبەرایەتییەکەی بوش هێندە پەرۆشی ڕزگارکردنی سەربازە ئەمریکاییەکانبوو، بۆیە یەکبینە پێی لە دەستێوەردانە کەبدەستەڵاتەکەی نەتەوە یەککگرتووەکان دادەگرت و بەڕووی کارە مرۆییەکانی ناو عێراقیشدا دەوەستایەوە، بەشانازیشەوە باسی پێوەندی و هاریکارە زەرباییە بێسوودەکانیان دەکرا کە لەجەنگی ڕزگارکردنی کوێتدا، لەنێوان بەریتانیاو وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا بەردەوامبوون. لە کاتێکدا پەرلەمانتارو ڕۆژنامەنووس و خەڵکە ئاساییەکەی تری بەریتانیا، هەر لەسەرەتای نیسانەوە ڕۆژانە تووڕەیی و بێزاری خۆیانەدەربڕی، کاربەدەستێکی گەورەی هەڵسوڕێنەری کاروباری دەرەوەی بەریتانیا بیری کەوتەوە، کە بەدرێژایی "ئەو هەفتە سەختە پڕ مەترسییانە"، لەسەری تەلەفۆنەکەی واشنتۆنەوە کەسی لێنەبوو، دەشیوت: خۆ ئەگەر یەکێکیش وەڵامی بدایەتەوە، دواتر تەلەفۆنێکیان بۆ نەدەکردەوە.

ماندوێتی و بێبەرگی و کەمی خۆراك و ئاوی پاك و شوێنی خۆحاوێنکردنەوە لەناو کوردەئاوارەکاندا چەندین نەخۆشی کوشندەی وەك؛ مەلاریاو، دیزەنتری و، نەخۆشییە لەیەکترگرەوەکانی تریان تیادا بڵاوکردنەوەو، لەپڕیشا بەجۆرێك تەشەنەیانکردکەمەر لەباسکردن نایەت، بەڵام هێشتا بەو ڕادەیە نەبوو کەکاربەدەستە ئەمریکاییەکان و قسەکەرێکی نەتەوە یەککگرتووەکان لەلێران بیریان لێکردبۆوە، گوایە لەمانگی نیساندا وای لێدێ کەرۆژانە یەك دوو هەزار کەسێك بمرن. زۆری قوربانییەکان یان منداڵی خوار پێنج ساڵان بوون، یان پیرو پەککەوتە، لەسێ هەفتەی ڕەوەکەدا کاربەدەستانی تەندروستی وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا، تەنیا مردووەکانی سەر سنووری تورکیایان بە ٦٧٠٠کەس خەمڵاندبوو، کە ٦٢٠٠ کەسی لەمردنی ئاسایی باشووری عێراق زیاتربوو. قۆمیسەرێتی باڵای سەربە نەتەوە یەکگرتووەکان UNHCR وای بۆچووبوو کەمەر لەناو ئێراندا ١٢٦٠٠ پەنابەر مردبن، کەسیش نازانێت چەنێکی دی لەناو عێراق و سەر ڕێگاوبان و ئەو تولە ڕێیانەدا مردوون کەبەناو چیا سنوورییەکاندا درێژدەبنەوە، چونکە ژمارەیەکی بێشوومار ووربە تەلەبەرد، کەپێدەچوو گۆڕبن و ژمارەیەکی زیاتریش کێلی گۆڕی تەواو لەو ناوەدا بەرچاودەکەوتن.

ئەم مردنە زۆرەی کوردو، ڕەخنە دەروونییەکەی هاوپەیمانان و، ناوخۆییەکانی ئەمریکا، بۆ بوش ببوونە پەڵەیەکی شەرمەزاری و، بەزۆل و ترسنۆکیش دادەنرا، ئەوانە بۆ دواجار کاری

خۆیان لە بەڕێوەبەرایەتی و کاربەدەستە باڵادەستەکانی سوپاو مەدەنی کرد، بوش لە ١٦ نیساندا، واتە دوای زیاتر لەدوو هەفتە بەسەر دەستپێکردنی کۆڕەوەکەدا، کەمەرپوسەهاتێک بوو "دیڤید ماک"ی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی،بەنێردراوێکی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی وتبوو، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا "نەیەک تاکە دۆلارو نەتەنیا سەرباز"ێکیش بۆ رزگارکردنی کورد تەرخان دەکات، کەچی یەکسەر هەڵگەڕایەوەو، ناچار سەربازی ئەمەریکای بۆ "پرۆڤایت کۆمفۆرت" واتە "شوێنی حەوانەوە"، کەسەربازانی بەریتانیاو فەرەنساو هۆڵنداو ئیتالیاو ئیسپانیاش تیایدا بەشداریانکردو، بە هەر هەموویان پتر لە ٢١٧٠٠ کەسیان بۆ تەرخانکرد. دوای بڵاوبوونەوەی سەربازەکان، کوردیش کەوتنە خۆو بۆسەر ماڵ و حاڵیان گەڕانەوە، زۆرجار بەلای ئەو خێوەتگایانەدا گوزەریاندەکرد کەلە پانتاییەکی دەرەوەی شارۆچکەی "زاخۆ"ی سەر سنوور، پشت ئەستوور بەهێزی تایبەتی ئەمەریکاو توانای پزیشکی و پێوەندی پێکەوەیی تایبەتی خۆیان، پووەو چیاکان دامەزرێنرابوون و زۆر بەزوویش وورەی پەنابەرانیان لەشارەوە بۆ شارۆچکەو گوند بەرزکردەوە. جێگەی نیشتنەوەی کۆپتەرە کەلەکانیان دیاریکردو، ئەوانیش بەوپەڕی وریاییەوە، تا لەبەردانەوەی کارتۆندا، کەدیارە خۆ لێلادانیان زەحمەتە، کەس بەرنەکەوێت و بمرێت، کەوتنەخوارەوەی خۆراک و خێوەت و پەتۆ گەیاندن. سەرکەوتنی خێرای کارەکەوناژیریەتییەکەی پێشتری، کە پێداگرتن و سستیان هێنابووە ئاراوە، ئاشکراکرد. بەڵام راوێژکارانی کۆشکی سپی سووربوون لەسەرئەوەی کەسیستمە جیهانییە نوێکەی بوش هەر چەسپیوەو کەل نەبووە، ئەگەرچی سەرۆکی ئەمەریکاش لەم بڕیارە گرنگەدا زۆر دواکەوت و، کاتێک بڕیارەکەشیدا لای خەڵکی تا ڕادەیەک واکەوتەوە کەلەناچاریدا هەنگاوەکەی نابێت و ئەو رۆڵە تایبەتییەشی نەبوو. راستییەکەی ئەو دواکەوتنە بوشی تووشی رەخنەیەکی توندوتیژ کردو تۆمەتی "هیچ هەڵێنە بۆ لادان لەو بنەماکانی لەدەست نادا" یان هەوڵدانی بۆ "واز لە لەسەرتنەکان هێنان و گەڕاندنەوەی بۆ وڵات" دەدرایە پاڵ.

خەڵکی بەدەر لەنەڵقە سەرەکییەکەی بەڕێوەبەرایەتی، نەیاندەزانی گۆڕانکارییە پڕلە شەرمەزاری و پەژارە لەڕادەبەدەرەکەی بوش، کەبیست و چوار سەعات بەسەر زاری تەلەفزیۆنەوە بوو، بۆچی وانزۆری خایاند، بەڵام کە دەرکەوت پێوەندیان بەسیاسەتی بن لێڤەی ئەمەریکاوە هەیە، بەو زامە کۆنە قەتماغە بەستووانەی شەڕەکانی پێشووی پەنتاگۆن و سیاسەتە گشتییەکانی ئەمەریکا، کەلەگەڵ سیاسەتی دەرەوەیداو گێژاوی بەڕێوەبەرایەتییەکەی بوشدا، بەتایبەتی بەشی رێکخستنی رێکخراوە سیاسییەکانی دەرەوەی، نەدەگونجا، هەمووشیان لەخۆ بەدوورگرتن و کارنەکردن لەگەڵ بەرهەڵستکارە عێراقییەکاندا، بەتایبەتی لەگەڵ هەرە

گرنگەکەیاندا کە نەتەوەییە کوردەکانە هاوڕابوون. بەرهەڵستکارە عێراقییەکان خاڵی لاوازییان
هەرچییەك بوبێت، کەمزۆریشن، بەڵام هەر بێزوویان بەیارمەتیدانی هاوپەیمانانەوە دەکرد.
بەرهەڵستکاران کە لەلایەکەوە لەسەرکردایەتییەکی شارەزای پارتیزانە کوردەکان و لەو
سیاسەتمەدارە سنی مەزهەبانەی کەلەپارتی بەعسی جیابوونەوەو، لەلایەکی تریشەوە لەپیاوانی
ئاینی شیعەوە بیگرە تا دەگاتە سیاسییە کارامەکان پێکهاتبوون، کەس گومان لەوە ناکات کە
زانیارییەك، هەرچۆنێك بێت لەم هەمە جۆر خەڵکەوەبێت لەهیچ باشترە، هەر پێوەندییەکیشیان
لەگەڵدا بکرێت گەلێك لەو تیۆرییە هەڕەمەکییە ووشکە دروستکراوانە بنیاتنەرتر دەبن.

بەڕێوەبەرایەتییەکەی بوش، بەرلەجەنگی کوێت و تەنانەت لەحەوت حەفتەی دوای کۆتایی
هێنانیشیا، قایلنەبوو لەگەڵ بەرهەڵستکارە عێراقییەکاندا لەگیروگرفتە سیاسییەکان بدوێت،
کەئەوەش مەترسییەکی زۆرو ئەگەری بێسەروبەری دەگەیاند. پلانڕێژانی ئەمەریکا لەو
باوەڕەدابوون کەئەو بەرهەڵستکارانەی ماوەیەکی زۆرە لەڕووداوەکانەوە دوورن و لەمێژیشە
بەکردەوە لەبواری سیاسەتی عێراقدا جێدەستیان نییە، هیچ ڕۆڵێکی ووردو بەسوودیان نابێت.
وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا باوەڕی هیچ بەعێراقییەکان نەبوو، ترسی ئەوەشی لێیانبوو، گەر
لەهەر زانیارییەك ئاگاداربکرێن ئەوا بە بەغدا دەگاتەوە. ئاساییە کە پلانڕێژە سەربازییەکان
ئارەزووی دەستێوەردانی کاروباری ناوخۆی کۆمەڵە بیانییەکانیان نەبێت.

نە وڵاتە یەکگرتووەکان و نە هاوپەیمانەکانی هاوبەشی، هیچ هەواڵگرییەك و سەرچاوەیەکی
مەدەنی و سەربازیانەی گرنگیان لەناو ئەو وڵاتە داخراوە دەگمەنەی "سەدام حسێن"دا نەبوو،
ئەمەش هیچ سەر ئێشەیەکی بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا پەیدا نەکرد، کەهەموو
لێکۆڵینەوەکانی لەنگەو قووچەدەکردەوەو، واشی ڕادەگەیاند کە کوێت هەرلە ئاسمانەوە ڕزگار
دەکرێت و پێویست بەهیچ زانیارییەکی کۆمەڵگەی عێراق و مێژووە هەرە ئاڵۆزو پڕ ستەمەکەی
ناکات، چونکە وەختێك ئەوانەی دەویست کە خاکگرتن لەئارادابوایە هێزی زەمینی بۆ
بنێردرایە. جەنگی ئاسمانیش بەمانا شەڕی "خاوێن"، کە هەر هیچ نەبێ لەناو ڕیزەکانی
هاوپەیماناندا کەمترین قوربانی تیادا دەبێت.

وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا لەو بنەما ڕاستەقینە سەربازییە کۆنەوە، کە دەڵێت: "سەرباز
حەزی بەوەیە کەشەڕی دڵهاتووشی وەك شەڕی ڕابردووی بکات" لایدەدا، بۆیە ناچارە هێزی
دوژمن بەزیاتر لەوەی کەهەیە مەزەندەبکات. ژەنەراڵ "کۆلن پاوڵ" کەهێشتا سوکایەتییەکەی
سوپای ئەمەریکای لەڤێتنام و بێروتدا پێوە دیاربوو، داوای دەکردو "بۆشی چووەسەر"
کەزۆرترین سەربازو کەرەسەی جەنگی بۆ کەمترین ئامانج هەبێت کوێت، بێئەوەی هیچ کام لەو

گرنیانەی "دەستێکمان بەپشتمانەوە ببەستێتەوە"ی ڕۆژانی جەنگی کۆریا بێنێتەوە ئاراوە، کەمێکیشتا لەناو وەزارەتی بەرگریدا دانەمرکابۆوە، پەنگارکرا.

پڕوپاگەندەی هاوپەیمانان، تا بەڵگەی لەناوبردنی توانا ئۆتۆمی و بایۆلۆجی و کیمیاوییەکەی باسیان لێوە دەکرد، بەوهێزە سوپاییە زۆرەی لەژێر سایەی ئەمەریکادا خڕکرابۆوە بەدەستەوەبێت، زۆریان بەهێزە چەکدارەکانی عێراقەوە دەناو بەچوارەمین هێزی دونیایان دادەنا.

شەڕەکە دەستپێنەکردبوو "پاوڵ"یش سەبارەت بەسوپای عێراق دەیوت: "لەپێشدا لێکی دادەبڕین و ئەمجا لەناوی دەبەین". ئەمەریکا لەبەر چەند هۆیەکی سیاسی، پەلەی کۆتاییهێنانی ناڕاستییەکەی بوو، بۆیە وای لە "پاوڵ" کرد پشتگیری "سەد سەعاتی شەڕی زەمینی"یەکەی بوش بکات و ئەوبەڵێنەی بۆ لەناوبردنی دابووی نەباتەسەرو، لەخولاوووی وڵاتەوە ئەو ئەڵقەیە نەیەنێتەوەیەک کەبەدەوری سوپای عێراقدا دروستیکردبوو. هێزە چەکدارەکانی سەدام حسێن هەر بەقەبارە پچووککرانەوە، ئەگینا وەکوتر، تا ڕژێم بەسەر عێراقییەکاندا بەزاڵی بمێنێتەوە، بەشە گرنگەکانی سوپاو پۆلیسی ئاسایش وەك خۆیان هێڵرابوونەوەو، دەکری بڵێین هەر دەستیشیان بۆ نەبرابوو، توانایشی بەڕادەیەك مایەوەکە لێران ناچاربێ حسابی بۆبکات، بەڵام دۆستە کەنداوییەکانی خۆرئاوا مەترسییان نەمابوو(۹). بوونی هێزە سەربازییەکانی هاوپەیمانان، تەکتیکی و تەنیا بۆ کارێکی دیاریکراو، کەمڕزگارکردنی کوێت بوو، وەك پاوڵیش دەیویست هێزەکانی ئەمەریکا بەزووترین کات کەنداو جێبهێڵێت و لە ناوچەکەدا نەمێنێ، کەلەخۆ خستنە ناو ئەو بارە تایبەتی و ئاسکە ناوخۆییانەی کۆمەڵگەی عێراق ئاساترەو بەرهەڵستکارە عێراقییەکانیشی پێ پشتگوێ دەخرا.

بەڕێوەبەرایەتی بوش لەداگیرکردنەکەی کوێتەوە، ڕێگەیەکی بۆ خۆکەڕکردن لە ئاست پرسیاری ناپەسەندی: "چۆن هەڵس و کەوت لەگەڵ بەرهەڵستکارە عێراقییەکاندا دەکرێت؟" دۆزییەوە، بەرپرسیارێتی ئەوەیان بە "بەریتانیای مەزن" سپارد کەڕزگارێك ئاغاو داگیرکەریان بووەو ئارەزووی بەهەڵس و کەوتکردنیان بووەو لەواشنتۆنیش بەتواناترن، چونکە هەرچۆنێکبێ بەرهەڵستکارە عێراقییەکان لە لەندەن خڕبوونەتەوەو، کاربەدەستانی بەریتانیاش چالاکانە

---

(۹) دەرکەوت ئەوەش گێژاوێکە، چونکە چەند سالێك دوای جەنگ سەدام حسێن لەچەند بۆنەیەکدا سوپاکەی بەرەو سنووری کوێت بزواند یان وای نیشاندا کە دەیکات، کەئەوەش پێویستی بەبڵاوکردنەوەی هێزی ئاسمانی و دەریایی و زەمینی ئەمەریکایە لەناوچەکەداو زۆر گرانیشی لەسەردەکەوت.

لەگەڵیاندا پێوەندییان دەکردو، لەو بڕوایەشدا نەبوون کەبەڕێوەبەرێتییەکەی بوش بایەخی زۆر بەو زانیارییە تایبەتییانە بدات کەدەیاندانێ.

پلاندانەرانی واشنتۆن، لەم بارەیەوە خۆگێلکردنیان لەڕاپەڕین و سەرکەوتنی سەرەتاو پەرەسەندنی تەواو و بڵاوبوونەوەو تێکشکانی کوتوپڕو دووریيەکانی ڕەوەکەی کوردیان بەڕاستیبوو. بەڵام خۆ گێلکردن کامەرانی نابەخشێت، بەڵگەش "گۆڕ"ەکانی هەردوو بەری ڕێگاوبانەکەبوو کەبۆ داپۆشینی ئاوارەکان هەڵکەنرابوون.

ئەمەش سیاسەتێکی نابەجێ و چاوەڕواننەکراوی بەڕێوەبردنی کارەکەبوو. پلانەکەی ئەمەریکا ساویلکانەو تێکەڵ بەسیاسەتێکی زیاتر تەکتیکیانەی پشتبەست بەڕووداو بوو وەك لەوەی ستراتیژیانە بێت، رەنگە هەر لەو کاتانەشدا خۆیبگرێت و بەردەوامبێ کە شتە سەیرەکانی بۆیاندانراوە ڕاستدەرچن. ئەگەر یەکێك هەربۆ لێتێگەیشتن نەك بۆ کارلەگەڵدا کردنی، لەبارێکی ئاساییداو لەناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا، کە ناوچەیەکە حەزی بەگۆڕانی کوتوپڕە، ئاسایی بینرخێنێت، ئەگینا نەدەبوو کەس لەهەموو ئەوشتانەی دوای ئابی ١٩٩٠ ڕوویاندا، وەك گرتنەکەی کوێت و مانەوەی عێراق تامانگی ئازار لەئاریاو سەرکوتکردنی هەردوو ڕاپەڕینەکەی کوردو شیعەی دواتریش لەلایەن "سەدام حسێن"ەوە، سەرسامبێت.

واش سیاسەتەکەی ئەمەریکا هەر بەتاکە دووریيەکەی خۆیەوە مایەوەو هیچ لێکۆڵینەوەیەکیش لەسەر ئەگەری رەنگدانەوەی جەنگەکە بۆسەر رژێمی سەدام حسێن نەکرا. زۆرپێش یەکەم تەقەی جەنگەکە دەرکەوت کەئەمە بۆچوونێکی ساویلکانەو نازیرانەیە. بۆنموونە ئەمەریکاو بەریتانیا چوونە ژوورەوەی هێزەکانیان بۆناو خاکی عێراق بەنهێنی دادەناو هیچ جۆرە لێکۆڵینەوەیەکیشیان لەبارەوە نەدەکرد. بەهەرحاڵ سەرنجدانێکی نەخشە بەئاسانی دەریدەخات کەئەوە تەنیا کارێکی تەکتیکی سوپاییەو لە هەموو ژیرێك ئاشکرابوو کە "٣٠" هەزار سەربازی ئەمەریکایی بچنە ناو قووڵایی عێراقەوە، با بۆ بەغدای پایتەختیش نەبێ، هەر کاردانەوەیەکی وای لێدەکەوێتەوە کە رەنگە بیری لێنەکرابێتەوەو زۆر بەقووڵیش بەسەر سیاسەتی عێراقدا بشکێتەوە.

پێش جەژنی کریسمسی ١٩٩٠و لەکاتی کورتە سەفەرێکی واشنتۆنمدا، هەستمکرد کارەساتێکی هێجگار خراپ نزیکە، خۆ کە یەکێك لەپسپۆڕە بڕیاردەرو کاراکەو بەناوبانگەکانی خۆرهەڵاتم بینی، هەستەکەمی هێندەی دی لاچەسپاندم. دیاربوو بەڕێوە بەرایەتییەکەی ئەمەریکا تائەو کاتە بەزینێکی سەربازیانەی ئاسانی وای سەدام حسێنی دەویست کە ڕسوای بکات،

هیوای زۆربوو كە بۆخۆی لەكونت نەكشێتەوە، دوای چەند قسەیەكی كەم لێم پرسی: داخوا لەدوای جەنگ چۆن عێراقێك لەخەیاڵی ئەمریكادا بێت؟.

ئەوەی من و ئەوبرادەرەی سەرسامكرد كەقسەم لەگەڵدا دەكرد، ئا تەنیاییەكەمانبوو، كاربەدەستێكی دی لەولامانەوە تێبینییەكانی خۆی دەنووسی، بۆیە لێكۆڵینەوەكەمان زۆر ساكارانە مایەوە. دوای پرسیارەكەم ماوەیەكی باش بێدەنگبووین، ترسام پرسیارەكەمی لاڕوون نەبێت، خەریكبوو بەجۆرێكی دی دووبارەی بكەمەوە، بەڵام ئەو بەشێوازی خۆی، كاتێك كەوتە چاوگێڕانێكی لەسەرخۆ بەدیوارە بڵندەكەی كۆنەمەڵبەندی بەڕێوەبەرایەتییەكەی تەنیشت كۆشكی سپیداو، تا بنمیچەكەی هەر چاوی بەرزكردەوە، وەڵامێكی بێدەنگی دامەوە كە بەئاشكرا وایدەگەیاند، نەك هەر جەنگەكە بەڵكو دوای جەنگەكەش ڕوون نییەو تەم بەری گرتووە.

تەنانەت ساڵێكیش دوای شەڕەكە، كاربەدەستە گەورەكانی بەڕێوەبەرایەتی بەرگریان لەو هەڵوێستە دەكرد. "ریچارد هاس" بەرپرسی خۆرهەڵاتی ناوەراست لە ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەییدا، ئەگەرچی شارەزایی زەمینی نەبوو، بەڵام رۆڵێكی سەرەكی هەبوو، لەوتنەوەی راستییە كۆنە بیرۆكراتییەكەی كەدەڵێت "سیاسەت گۆڕین بۆ حكومەتەكان كارێكی وا ئاسان نییە" هیچی دی پێنەدەكرا، هاس كەلەمانگی كانوونی یەكەمی ١٩٩١ دا قایلبوو بمبینێت، نەك لەو كارە هەر پەشیمان نەبوو بەڵكو پێشی بایی بوو، دەیوت: بەڕێوەبەرایەتی ئەمریكا ماڵ ڕەوای خۆی بووە سەبارەت بە یاریدەدەرانی پەنابەرە كوردەكان دووردڵبێت. سەرەتا زۆری بۆهێنرا كەتا كوردەكان لەبرسا یان لەسەرمادا نەمرن یارمەتییان بۆ بەرداتەوە، ئەمجا تا بۆ گەڕاندنەوەی سەرماڵ و حاڵیان هانیانبدا ناوچەی ئارامی بۆ دابینكردن. وەك ئەو دەیوت، بەڕێوەبەرایەتی ئەمریكا بەردەوام لە كەوتنە ناو زەلكاوی عێراق ترساوە، چونكە عێراق ئەوەندەی هەبوو كەبتوانێ وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا لەئامانجە دیاریكراوەكانی جەنگەكە بەزیادەوە بگلێنێت.

چەند داڕێژەرانێكی هاوپەیمانانی دی لە واشنتۆن و دەری ئەمریكاش، زۆر پێیان لەسەر خۆبەدوورگرتنی "دووەم كەرتی غەزە"، كەدەربڕینێكی دیپلۆماتیانەیەو بۆكەوتنە ناو گێژاوێك یان گرفتێكی بێچارە بەكاردەهێنرا، دادەگرت. زۆری دیش "هەمان تێڕوانینی پڕ لەشادمانیتی كورد" یان هەبوو، وەك چۆن هاس لەدرێژەی قسەكانیدا وتی، بەتێوەگلانی وڵاتە یەكگرتووەكان خۆشحاڵ نەبوون. هەربەتەنیا هاس نەبوو كە گازاندە لەقوربانیدان بكات، فەرمانبەرێكی مامناوەندی بیرۆكرات لەوەزارەتی دەرەوە، پێی وابووكە دەبوا سەرۆك بوش داواكەی ١٥ی شوباتی و ئەو بەیاننامانەی پشتگوێ بخستایە كەبۆ هەڵاتنی سەربازە عێراقییەكان دەركرابوون.

قسەی لەوەشدەکرد کە "کوردەکانیش دەبوا پێش ئەوەی ڕاپەڕین دەستپێبکەن ئامۆژگاریان لەئێمە وەربگرتایە، نەک دوای تێکشکاندنەکەیان باس لەوەبکەن کەبوش بۆ ڕاپەڕین هانیداون". "فیبی مار" کەزانایەکی سیاسەتمەدارو مامۆستایەکی بەناوبانگی "زانکۆی بەرگری نەتەوەیی" بوو، لەداڕشتنی سیاسەتی بەڕێوەبەرایەتییەکەدا ئامۆژگارییەکانی ڕۆڵی خۆیان هەبوو، دەیوت: پێویستە لەپلاندا ترسی ئەوە دابنرێت کەسەربازە ئەمەریکاییەکان بەربەست "دوژمنانێکی دڵ پڕ لەقین" بکەون، بەتایبەتی لەو بەشەدا کە عەرەبە سنییەکانی تێدایە. هەرچەندە ئەم بۆچوونەی لایەنگری زۆری هەبوو، بەڵام بەکارهێنانی بۆ بەرگریکردن لەو چارە سەربازییەی بەڕێوەبەرایەتی دایناپوو، زۆر سەیر دەکەوتەوە، چونکە لەو ڕێکخراوانەوە هێنرابوو کەدژی بەشەڕگرتنەوەی کوێت بوون، ئەم قوتابخانەیە پێی وابوو بەتەنیا گەمارۆی ئابووری وا لەسەدام حسێن دەکات هۆشی بەبەردا بێتەوە، شەڕ هەڵگیرساندنیش مەترسی زنجیرە کاردانەوەیەکی دژ بەخۆرئاوای تیادایەو هەڕەشە لەڕژێمە ئارامەکانی جیهانی عەرەبیشدەکات[10]. بەکارهێنانی هێزیش بۆچوونە ناو بەغدا یان هەر شوێنێکی عەرەبە سنییەکان کەلەعێراقدا کەمایەتیین، بەرەنگاربوونەوەکەی ڕژێم بەهێزتر دەکات، خۆ ئەگەر لابردنی حکومەتی عێراقیش لەتوانادابێت ئەوا ڕژێمێکی دی جێگەی بگرێتەوە پەلەی سەر بەئەمەریکا بوونی پێوە دەلکێنرێت و لێکشانەوەی ئاڵۆزتر دەبێت و واشنتۆنیش بۆ زۆر ئیشی ناخۆش و ناپێویست ڕادەپێچێت. جگە لەوەش "مار" وتی: ئێمە وەک بڕیارێکی خۆمان کوردستانێکی سەربەخۆمان نەویستووە. پێدەچێ ئەمەو نە هیچ یەکێکی دی بەڕێوەبەرایەتییەکەی ئەمەریکا، بایەخیان بەو بەدرۆخستنەوە یەک لەدوای یەکانەی کورد دابێ کەلەپێش و کات و پاش جەنگەکەشدا، ڕایان نەدەگەیاند کەئامانجیان سەربەخۆیی بێت. ئەوەش وایئەشاندەدا کەدەبێت کورد یان دوژمن بێت یان هیچ لۆژیکێکیان نەبێت یان هەردووکیان نەبێت.

لەگەڵ دەستپێکردنی ڕاپەڕینەکەدا، عێراقییەکان زۆربەخۆشییەوە خۆپیشاندانی پڕسۆزیان بۆ پشتگیریکردنی هاوپەیمانان سازدەکردو پەرۆشی دووبارەستنەوەی سەدام حسێنیشیان بوو، کەچی بەڕێوەبەرایەتییەکەی ئەمەریکا، نەهیچ ئامادەییەو نەحەزیشی بەوەدەکرد کە وەک پێویست شتێکیان لەگەڵدا بکات. لەبەدبەختی بەڕێوەبەرایەتییەکەش ئاسەواری هاندانەکەی بوش و، ئەو بەیاننامانەی فڕۆکەکانی ئەمەریکا بەریاندەدایەوە، ئێزگەکەی "سی.ئای.ئەی"

---

[10] ئەو مەترسییە تەنیا لەزنجیرە کاردانەوەیەکدا نەهاتەدی، ڕاستییەکەی تا وڵاتەکە لەناوچەکە دوورتر بووبێ، بۆ نموونە بابڵێین لەباکووری ئەفریکادا بوایە، زیاتر پشتگیری حکومەتی بەغدای دەکردو، حکومەتی ئەو وڵاتە زیاتر دەکەوتە ژێر گوشاری ڕاپەڕشتنی خەڵکی وڵاتەکەیەوە.

لەخاکی سعودییەوە پەخشدەکردن، کەتیایاندا داوای هەڵاتن و چۆڵکردنی ڕیزەکانی سوپایان لەسەربازە عێراقییەکان دەکرد، بۆ دادگاییکردنیان ئاشکرابوون. پێداچوونەوەیەکی ساڵانی حەفتای هەڵسوکەوتی حکومەتی ئەمەریکا لەگەڵ کورددا، کەئەوسا هینری کیسنجەر هەڵسوڕێنەری بوو، میراتی ئەو خیانەتەو (ئەمەش مێژوویەکەو لەبەشی شەشەمدا دەگەڕێینەوە سەری) ئەو قسە دروستکراوانەن، کە گوایە کورد چالاکانە خەریکن هەوڵ بۆ خەڵەتاندنی ژیرانی سیاسەتی ئەمەریکا ئەدەن، پشتگوێخستن و بێنەمەکی، یان هەست بەتاوانبارێتییەکی بێوێنە نەبێت هیچی دی نەدەگەیاند. مەگەر هەر پشکنینێکی تاقیگەیی بتوانێت ئەو هەستەو نکوڵی لێکردنە هەمیشەییەی بەڕێوەبەرایەتی ڕالفەبکات، کەلەوڵاتە یەکگرتووەکاندا هەر لەبوشەوە بیگرە تا خوارەوە، هیچ یەکێکیان بەخراپەیان نەزانیوە.

مەترسی "تێوەگلان" لەوانێکبوو، لەمارت و نیساندا یەکبینە لەکۆشکی سپی دەوترایەوە، ئەو وانە تاڵەشی بەبیردێنانەوەکە دروستکەرانی سیاسەتی ئەمەریکا لە ڤێتنام و بێروتدا تووشی ببوون[11].

مەترسی چوونە جەنگ، بێ پشتگیریکردنی ڕای گشتی و یانزەیەمین ئامۆژگاری وەزارەتی دەرەوە، کۆشکی سپیش ترسی قوربانیدان و، یاریدەدانی کوردیش گیانبەخشینی سەربازە هاوپەیمانەکانی دەگەیاند. بەڵام مەزنەکانی بوش ڕاست دەرنەچوون چونکە چەند زیاتر بەڕووی یارمەتیدانی کورددا بوەستایەتەوە، وەك ڕاوەرگرتنی خەڵکەکە نیشانیاندەدا، ئەوەندە زیاتر حەز بەپارێزگاریکردنیان دەخرۆشا. ئەمەریکاییەکان سەبارەت بەشتە ڕەوشتییەکان

---

[11] دروستکەرانی سیاسەتی ئەمەریکا هەمیشە پەشۆکاوی کوشتنی ئەو ٢٤٣ سەربازە دەریاییە بوون، کەساڵی ١٩٨٣ بەدەستی شیعەکان، ئەوانەی ئێران لەبێروتدا پشتگیریدەکردن کوژران. بەڵام ئەو کوشتارە بۆناتەواوی دیاریکردنی ئەرکی مارینەکانی لوبنان دەگەڕێتەوە، کەئەوی ڕاستیبێ ئەوانی بۆناو گێژاوە سیاسیەکەی لوبنان و دواتریش هەموو ناوچەکە بەکێشکرد. کەساڵی پێشوتر ئیسرائیل لوبنانی داگیرکرد، مارین و سەربازانی هاوپەیمانیش بۆچاودێریکردنی کشانەوەی ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستین لەبێروت بڵاوبوونەوە. کە ئەویش تەواو بوو مارینەکان ئەوناوەیان بەجێهێشت، بەڵام ئیسرائیل کەبەڵێنەکەی خۆی، داگیرنەکردنی خۆرئاوای بێروتی نەبردەسەرو، هانی هاوپەیمانەکانی خۆیدا، واتە میلیشیا دیانە لوبنانییەکان، کە لەکەمپی سەبرا و شاتیلای پەنابەرەکاندا، بەسەدان فەلەستینی مەدەنی بکوژن. بۆیە مارینەکان گێڕرانەوە بۆ ئەوێ. کارەساتی پەنابەرە کوردەکان بەپێچەوانەوە، ئەنجامی ڕاستەوخۆی ئەو کارە سوپاییانەبوو کەئەمەریکا سەرکردایەتیدەکردو، ئەمەریکاییەکانیش ئەو جیاوازییەیان دەزانی

دیدێکی ڕوونتریان هەبوو، دەشیانزانی عێراقییەکان بەئەنجامی ئەگەرە چەواشەکەرانەکەی ئەمریکا، جالەبەر هەر هۆیەك بێت شەڕی زیاتریان ناوێ، چونکە بێتاوانانی تیادا دەکوژرێن.[12]

"مار" ڕێك لەبەرەنگاربوونەوەیەکی دژ بەبیانییەکان دەترسا، کەبەزۆری دیدی سیاسەتی نەتەوەییە عەرەبیەکان بوو بەگشتی و حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی عێراقی بەتایبەتی، چەندین ساڵی پێشووی و توندوتیژیی و گۆڕانکاری یەك بەدوای یەکی حکومەتەکانی بەغدای دوای ڕووخانی دەستەڵاتە شاپانەکەی ساڵی ١٩٥٨ی هەرگیز لەبەرچاو نەدەڕەویەوە. "مار" بەناسانی لەگەڵ بیروڕای عێراقییەکان نەدەگونجا، کە پارەمتییەکانی دەرەوە بۆ کۆتاپێهێنانی ١٧ ساڵ دەستەڵاتدارێتی بەعس کۆیدەکردنەوە، ئەو دەسەڵاتدارێتییەی بەچەندین جەنگی دەرەوەو چەوساندنەوەی گەلی عێراق ناسرابوو، چونکە پێدەچوو پڕوپاگەندەکانی بەعس، کەلاك گۆڕین و نوێکردنەوەو بەهێزکردنی عێراقیان بەپشت بەخۆبەستن و عیلمانیکردن لێدەدا، کاریان لەمار کردبێت.

بەهەرحاڵ ئەگەر عێراقییەکان خۆشیان بەعسیان بڕوخاندایە، ئەوا هەردەبوا حسابی ئەو پشێوی و ناهەمواریە بکرایە کەڕەنگە بەدوای ئەو ئاراميیە زۆرەدا بهاتبا. هەر مار بەتەنیا نەبوو کەلەناخەوە گوێ بە خەڵکە توندڕەوەکەی عێراق نەداو پیاچوونەوەیەکی تری بارودۆخەکەی نەکات. کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا یەکبینە باسی مەترسییەکانی خۆیانیان، لە" بەرگریکردنێکی شۆڕشگێڕانە"ی دژ بەبوونی هێزەکانی هاوپەیمانان لەعێراقدا دەکرد. هەرچەندە لەسەرکەوتنەکەی ئیسرائیلی شەڕی شەش ڕۆژەی ١٩٧٦ەوە، هەستی نەتەوەیی عەرەبە سنییەکان و خاڵە سەرەکییەکەی بۆ یەکێتی عەرەب، لەهەموو خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا بەرەو لێژی دەچوو، بەڵام کارگەرێتییەکی دیاری بە بەڕێوەبەرانی سیاسەتی خۆرئاواوە هەبوو، کەبەهۆی پەرەسەندنی ئیسلامییە ئوسوڵییەکانەوە، توانای پشتگیریکردنی دەزگا دیموکراتییەکانیان لا زەحمەت ببوو. لەدیدی نەتەوەییە عەرەبیەکانی ساڵانی شەست و حەفتاکانەوە، هیچ کام لەو هێرشانەی کەئیمپریالیزم و زایۆنیزم دەیانکردە سەر بیروڕاو بنەما سەرەکییەکانیان، ئەوەندەی نەتەوەی کورد، کەزەمینەیان بۆ تێکۆشانی کەمایەتییەکی نەتەوەیی ناعەرەب خۆشدەکردو، ئەوکاتە لەلایەن ئێران و ئیسرائیلەوەو دواییش لەلایەن وڵاتە

---

[12] بەپێی لێکۆڵینەوەیەکی گالوپ کەلەرۆژنامەی "ئینتەرناسیناڵ هێراڵد ترایبیون"ی ١١ نیسانی ١٩٩١دا بڵاوکرابۆوە، سەدی ٩٥ی ئەو کەسانەی پرسیاریان لێکرابوو لەوبارەڕەدابوون کەدەبوایە هاوپەیمانان تا ڕووخاندنی سەدام حسێن لەشەڕەکەیاندا بەردەوامبوونایە. سەدی ٥٧یشیان پشتگیری ئەوەیاندەکرد کەدەبوا ئەو هێزە جەنگیانەی کوردەکانیان پەشۆکاندبوو بخرانایەتە خوارەوە

یەکگرتووەکانی ئەمەریکاوە یارمەتی دەدران، بەلاوە گرنگ نەبوو. کوردی عێراق، نەك لەبەر سنیەتییەکەیان هەمزیان لەبەمێزی شیعە نەبوو، بەڵکو چونکە پەرۆشی دەزگایەکی دیموکراتیانەی جیهانی خۆرئاوایانە بوون، بۆیە بەتوندی بەرووی هەموو هەوڵە یەك لەدوای یەکەکانی ئایەتوڵا روحوڵا خومەینی وەستانەوە، کە دەیویست بۆناو ئیسلامی ئوسوڵی ئێران بەکێشیان بکات.

هەرچۆنێك بێت، نەردی خۆبەزلزانینە ئاناسایی و لەرادەبەدەری حوکمی سەدامیش، کەلەسەر بناغەی کەمایەتییەکەی خۆی لەناو کەمایەتیی عەرەبی سنی دامەزرێنرا بوو، لەبیرچووبوو. سالأنێکبوو ئەندامانی عەشیرەتە پەرش وبلاوەکەی ناو تکریتی کە بەردەوام لەزیادبوون و پەلهاویشتندابوون، بەراستی شانۆگەرییەکەیان بەرێوە دەبرد نەك کۆمەڵگەی عەرەبی سنی کە رەنگە خۆ لەسەدی بیستی دانیشتوانی عێراق بدا.

بەمجۆرە گشت فاکتەرە سیاسی و سەربازییەکانی داڕێژەرانی سیاسەتی ئەمەریکا لەبوارێکی تەسکدا قەتیسمایەوە، لەناوەڕاستی کانونی دووەمی ۱۹۹۱دا، زۆر پێش دەستپێکردنی شەڕ لەو بوارە تەسکەداو لەواشنتۆن، داڕێژەرانێك بیریان لەکودەتایەکی سپی سەربازیانە دەکردەوە، کەدیارە ئەوەش بۆ رێکخستنەوەی عێراقی دوای جەنگ، عێراقییەکان پێشبینی خراپیان بۆی دەبینیت، بەلأم ئەنجامەکەی سەرکەوتنی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکای تیادایە، بەتایبەتی پسپۆرو شارەزایانی خۆرهەلأتی ناوەڕاست کە لەوەزارەتدا بالأدەست بوون و لەلێژنە پلاندارێژەرەکاندا، سیاسەتی وەزارەتیان دادەنا.

هێمای گیروگرفتەکانی وەزارەتی دەرەوە ئەوەبوو: "بەیکەر"ی وەزیر بایەخی بەخۆرهەلأتی ناوەڕاست نەدەدا، چونکە ماوەیەك بەیەکگرتنەوەی ئەڵمانیاو مەرگی کۆمۆنیستەوە خەریکبوو، کەهەموو ئەورووپای خۆرهەلأت و یەکێتی شۆرەوی گۆتبووە. دانوستاندی کەمکردنەوەی چەکی ئۆتۆمی دەکرد. بۆیە لەدوای ۲ی ئوگوستۆسی ۱۹۹۰ەوە کەمتر بایەخی بەخۆرهەلأتی ناوەڕاست دەدا، چەند هەڵتەیەك هەربە سەر رۆخی بابەتەکەوە مایەوەو زۆر بەئاشکرا ئاثارامی خۆی لە "ئیسحاق شامیر"ی سەرۆك وەزیرە کەللە رەقەکەی ئیسرائیل، کەببوە هۆی بێزاری ناوچەکە دەردەخست. بەلأم بەهەرحاڵ "بەیکەر"ی کارامەی یەکلاکەرەوەی ناکۆکییەکان، کەمتر گرنگی بەکێشە سیاسییەکانی دەرەوە دەدا، تەنیا مەگەر شتێك راستەوخۆ بە واشنتۆن و بەهاوڕێ نزیکەکەی خۆی "جۆرج بوش"ەوە بەندبوایە. یاریدەدەرێکی سەرۆك دەڵێت: ئەگەر لەرووی دووربینێتی بەیکەرەوە، پرسیاری ئاکامی یەکگرتنەوەی ئەڵمانیا، یان هەرەسەکەی یەکێتی شۆرەوی لەدوای سەدەیەك چی بەسەردا دێت؟ لە بەیکەر بکەیت ئەوا هەردوو چاوی خێلدەکات،

بەڵام ئەگەر ئاسیاوی زۆرت لەگەڵیدا هەبێت ئەوا بەوجۆرە دەرینابڕێت. بەیەکەر دەستێکی بەوەزارەتەکەیدا هێناو وای ڕێکخستەوە کەلەگەڵ خۆیدا بیگونجێنێت، بەزوویش پشتی بەو چەند کاربەدەستانەی خۆی بەست نەك بەتیمی شارەزایان و پسپۆڕانی وەزارەتەکەی.

ئەگەر بەڕێوەبەرایەتی وەزارەتەکە بەدەست یەکێکی ترەوە بوایە ئەوا دەزگای خۆرهەڵاتی نزیك و خوارووی ئاسیا NEA دەبوا لەناو جەرگەی دەمەزرێنەرانی واشنتۆندا بوایە، بەتایبەتی کەشتەکە بەو پێوەندییە ئاڵۆزانەی نێوان کوردی عێراق و عەرەبی شیعەو عەرەبی سنی دەستەڵاتداری حوکمەتەوە هەیە، بەڵام ئەم دەزگایە بە ئاستەم خۆی لەکێشەکە دەدا. خۆ کە عێراق کوێتی گرت، کاردانەوەی بەیەکەر تەنیا خۆپەستکردنبوو، هەستیشی بەهەڵەو پشت تێکردن و دۆڕاندنی دەزگاکەی کرد.

"ئەپریل گلاسپی" باڵوێزی ئەوسای ئەمریکا لەعێراق، بەخۆ گێلکردن لەکێشەکە تووشی لێپرسینەوەیەك هات، کەبەیکەر خۆی و دامو دەزگاکەی و بەرپرسی ڕاستەوخۆی دەزگاکەی و "جۆن ئیج کیلی" یاریدەدەری وەزیری دەرەوە، زۆر توندوتیژانە لەگەڵیاندا کردو، کردیانە سوورەی بەر لەشکری ئەو سیاسەتە دۆڕاوەی، کە ڕەگەکانی زۆر لەساڵی ١٩٨٨ کۆتربوو کەئەوی تیادا چوبووە بەغدا. بەپێی پێوەندارێتی بوایە دەبوا هەموو دەزگاکە لەلایەن نزیکترین ئەڵقە لەبەیکەرەوە تاوانباربکرایە، خۆ ئەگەر ئەوەشیان نەکردبا، دەبوا شوێن گومان بونایە. وەك یاریدەدەرێکی پایەبەرز وتی: هەر کەبیر لەپسپۆڕێکی شارەزا بۆ ناوچەی خۆرهەڵات و عێراق بکرایەتەوە، بەیکەر یەکسەر ئەپریل گلاسپی بەبیردا دەهات، کەئەویش لەو کەسانە نەبوو دڵیپێخۆشکرێت.

ڕاستییەکەی، بەڕێوەبەرایەتیی ئەمریکا بەگشتی و بەیکەرو کاربەدەستانی ئەڵقە نزیکەکەی خۆی بەتایبەتی، لەکۆنەوە باجی ویستێکی فیکری کەڵەکەبوویان دەدا، کەلەرۆژانێکی مانگی تشرینی دووەمی ١٩٧٩دا شۆڕشی ئیسلامی ئێران، دەستی بەسەر باڵوێزخانەی ئەمریکادا گرت و بۆ ٤٤٤ڕۆژ کردنییە بارمتە، دەزگای NEAو هەموو سەرۆکە یەك بەدوای یەکەکانی ئەمەریکا،ڕاستتر هەر هەموو وڵاتەکە، زۆر بە توندی دژ بەئێران وەستانەوە، بۆیە بەڕێوەبەرایەتییەکەی بوش، سڵی لەخراپ کاردانەوەی هەر ئیشێك دەکردەوە، کە هەڵسوکەوتکردنی لەگەڵ شیعە ئوسوڵییەکانی تاراندا پێوەدیاربوایە. زۆربەی ئەمریکاییەکان ئەوەندە لەئێرانییەکان ترسابوون و بەرامبەریان ڕك ئەستووربوون، کە سەرجەم شیعەی دونیای گرتبۆوە ئیتر لەهەر کوێبوونایە.

سەردەمی شانشینێتی عێراق، شیعەکانی ئەوێ تا ڕادەیەك علمانی بوون و، زۆربەی کارگێڕانی حیزبی شیوعی عێراق شیعەبوون، دواتریش خومەینی، ئێرانی بەتایبەتی و شیعەی بەگشتی، وا لەبەرچاو ئەمەریکییەکان خست، کە شیعەی "باش" لەکاروباری سیاسیانەی ناوخۆی ئەمەریکادا هەر لەئارادا نەبێ. ئەی هەر ئێرانییەکان نەبوون لەناوەڕاستی ١٩٨٠دای، کاتی شەڕیان لەگەڵ عێراقدا "ڕۆناڵد ریگان"یان بەدەستناشکراکردنی "چەك بەرامبەر بارمتە" فریودا؟ کەمەر خۆشویستێتییە بێوێنەکەی ڕیگان بوو خۆی لەبەرئەو شتە ناهەموارانەی دواتردا گرت، کەپێوەندییەکانی ئێران- کۆنترایان پێدەوتراو سەرۆکایەتییەکەی پاراست. پرۆژە هەڵشەکەی ساڵی ١٩٨٦، کەئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی و CIA و ئیسرائیل، بۆ گۆڕینەوەی ئەو ئەمەریکاییانەی لوبنانییەکانی سەربەئێران ڕفاندبوویان و لەناو لوبناندا بەندیانکردبوون، بەفرۆشتنی چەك و پارچەی سپێر بەئێران کەبۆ شەڕەکەی عێراق پێویستی بوون، پارەکەشی شەڕی کۆنترای پێبەڵسووڕێنرێ، کە کۆمەڵەی کۆنترا دژبە حکومەتە مارکسییەکەی نیکاراگوا بەرپایانکردبوو، چونکە بەڕووی یاسا بەرهەڵستکارییەکاندا وەستابۆوە.

ئەمجۆرە ئیشە گەمژانەیەش تەنیا بە چاکەی عێراق شکایەوە. لەواشنتۆن، دوای لابردنی ئەدمیراڵ یاریدەدەر "جۆن پۆیندیکستر" و جێگری کۆلۆنێل "ئۆلیڤەر نۆرت"، پسپۆڕە شارەزایانی لێهاتوو کارامەی سیاسەتی دەرەوە، بۆ چارکردنی زیانەکانی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی دانرانەوە، بەڕێوەبەرایەتی پێیوابوو کاتی دڵدانەوەی عێراق هاتووە، لەساڵی ١٩٨٧دا ئاڵای بەئەستێرەو هێڵ ڕازاوە، بەسەر پاپۆڕە کوێتییە زەبەلاحە نەوت گوێزەرەوەکانەوە دەنرایەوە، کەدژایەتیکردنی ئێران و دڵهێنانەوەی عێراقی دەگەیاند. واشنتۆن بەمجۆرە هەنگاو بەهەنگاو خۆی لەبەغدا نزیکدەخستەوە، ساڵی ١٩٨٢، هەردووساڵ دوای پشتگیریکردنەکەی ئێرانی، بێلایەنێتییەکەی پێشووی کەلاخست و ڕێیدا کەعێراق بۆ کڕینی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان قەرزی بدرێتێ، ساڵی ١٩٨٣ هەڵمەتێکی دەستپێکرد کە چەك بەئێران نەفرۆشرێت، ساڵی ١٩٨٤یش پێوەندی دیپلۆماتیانەی لەگەڵ عێراقدا دەستپێکردەوە، ساڵی دواتر لایەنگیرێتی عێراقی ڕاگەیاند، تا لەدوارۆژانی جەنگی عێراق ئێراندا، بەڕێوەبەرایەتییەکەی ڕیگان و هاوپەیمانە ئەورووپاییە سەرەکییەکانی، بەناوی ڕێگرتن لەشۆڕشی ئیسلامییەوە کە دەیەوێت ڕژێمە ئارامەکانی سەربەئەمەریکا بگۆڕێت، یان هێرش بۆ ئیسرائیل بەرێت، زۆر زیاتر بەلای بەغدادا دایانشکاند. واشنتۆن لەڕێی سەتەلایتەوە بەوێنە سیخوڕییەکانی شوێنەکانی، سوپای ئێرانی

بەرێکوپێکی بەعێراق دەدا [١٣]. ئەو زانیارنەش بۆ وێرانکاریان بەکاردەهێنران، چونکە زۆر بەووردی شوێنە گرنگەکانی شارەکانی تیادا دیاریدەکراو، ئەمجا بەمووشەکی سکۆد کاولدەکران، ئەنجام لەبەهاری ١٩٨٨دا ئێران بەوە تێکشکێنرا. لە ئۆگستۆسی ١٩٨٨یشداو دوای کۆتاییهاتنی جەنگی عێراق ئێران، وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تەنیا هەرخۆی، پشتگیری عێراقی وەك بەتواناترین هێزی سوپایی ناوچەی کەنداوی فارس دەکرد.

دارێژەرانی سیاسەتی ئەمەریکا لەواشنتۆن، بوونی "سەدام حسێن"یان لەرووی ئێراندا بەدیواری قەلایەك دادەنا کە کوێت و سعودییەو وولاتە لاوازەکانی تری خاوەن سامانی نەوتی ناوچەکە پێویستیانبێ. گرفت لەبەجێهێنانی ئەم بۆچوونەدا، سەدام حسێنیکی لات و ئەدارا، بێئەوەی گوێ بەو پشتگیریکردنە بدات کەلەدوای جەنگەوە وولاتە یەکگرتووەکان دڵیان پێدەدایەوە، بەبلیۆن دۆلاری خەرجەکرد بۆ دابینکردنی کەرەسەی پێویست تا هێزەکانی پێ پڕچەك بکاتەوە، هەڵوێستەکەی ئەمریکاشی والێکدەدایەوە کەگرتنی کوێتی بۆ دەچێتەسەرو، گەر پێویستیشبێ ئەوا بەچاوی نەرم سەیری ئەمەریکا بکات، چونکە وەك لەسەر زاری سەدام خۆی دەوترا: ئەمەریکا ئامادەنییە لەشەڕێکدا "دە" هەزارکەس بەکوشتبدات، ئەمەچییە ئەو لەجێی خۆیدا رادەگرێ. بەتاقیکردنەوە دەرکەوتبووکەئەوە یەکێك لەتەکتیکەکانی سەدام خۆبیووەر سەرسوڕمانیشی ناوێت. بەلام پێدەچوو لەبەرێوەبەرایەتییەکەی بوشدا کەسێك بیری لەوە نەکردبێتەوە، کەمەنگە سەدام حسێن باشی کارە بەجێ و خۆشەکەی ساڵی ١٩٧٠ی دووپاتکردبێتەوەو، پشت ئەستوور بەئەمەریکا هەر ئەو دەوڵەتە ئەوتیانەی کەئەبوا ئێستا لەبن باڵیدا بحەوانایەتەوە بشلەژێنێتەوەو بیانخاتە بەر هەڕەشەو گوڕەشەی خۆیەوە. راستییەکەشی ئەو هیچ کاتێك دەستی لەو تەکتیکەی خۆی هەڵنەگرتبوو، چونکە بەدرێژایی شەڕەکەی لەگەڵ ئێراندا، ئەدلوای هیچ ئامۆژگارییەك و ئەئاگاداریشی کردبوون، بەلام تۆزێك کەمی کردبۆوە خۆ هەرکە شەڕەکە کۆتاییهات ئیتر هیچی لەبەرچاو نەماو، بەو بیانووی لەئێرانی پاراستوون و ئەیهێشتووە لەئاویان بەرێت، خۆی لەدانەوەی قەرزە زۆرەکەی دابوویانێ دەپەڕاندەوە.

لەواشنتۆندا کەس ئەبوو گومانی لەسروشتە خۆسەپێنەرەکەی ڕژێمی بەعسی عێراق نەبوبێت، بەلام ڕژێمە بکوژەکەی بەغدا دژ بەڕژێمە خوێنڕێژەکەی تاران بەکارهێنرا.

حکومەتە بەسامەکەی بەغدا تۆماری لەپێشێلکردنی ماڤ مرۆڤ و مل پێکەچکردنی ڕژێمە عەرەبییەکانی تردا، هەر وەك تۆمارە پڕ لەکارەساتەکەی ماڤ مرۆڤی تاران وابوو، ئەمە جگە

---

[١٣] لەئازاری ٢٠٠٠دا "مادلین ئۆلبرایت"ی وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا دانی بەو راستییەدانا و داخی لەو یارمەتیدانەی سەدام حسێن خوارد کە لەکاتی شەڕی عێراق ئێراندا دابوویان. (وەرگێڕ)

ئەوەی کەئەمیان بەردەوام پێی لەسەر ڕسواکردنی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو ناردنی هێزە ئیسلامییە ئوسوڵییەکانی خۆی بۆهەر لایەك دادەگرت. بەهەرحاڵ ئەم سیاسەتە گەر لەکاتی شەڕەکەی ئێران عێراقدا بەڕاست زانرابێت، ئەوا نابێ دوای شەڕەکەو، تەنانەت دوای زۆر بۆماتەمەکەی خومەینی و ژەهر نۆشینەکەی و ڕاگەیاندنەکەشی بەوەی واز لەسەدام و مانەوەی دەسەڵاتەکەی دەهێنێت بەڕاست بزانرێت و بەهیچ جۆرێك پیایدا نەچنەوە. هەرچەندە خومەینی کە لە ٢٠ی ئابی ١٩٨٨دا، بەم ووشە جوانانە، ئاگر بەستی شەڕەکەی کردو، کۆتاییشی بەخەونی ناردنی ئیسلامییە ئوسوڵییەکەی بۆ دەرەوەی ئێران هێناو، تەنانەت پاراستنی کۆمارە ئیسلامییەکەی ناو ئێرانیشی زۆر لەسەرکەوت.

کۆتاییهاتنی شەڕی عێراق و ئێران، هانی سیاسەت داڕێژەرانی ئەمریکای نەدا، تا بەڕاستی بە سیاسەتەکەیاندا بچنەوەو، گۆڕانکاری بەرامبەر بە عێراق تیادا بکەن، خۆ مەگەر خوابزانێ کەسەدام حسێن بۆ ئەوکارە چۆن ڕێی بۆ خۆشکردن: هەر پێنج ڕۆژ دوای چەسپاندنی ئاگربەست، بەپیلانێکی چاك داڕێژراو، فڕۆکەی جەنگی و هێزە چەکدارەکانی عێراق، زۆر بەخەستی کیمیابارانی کوردە عێراقییەکانی کرد کەبەدەیان هەزار کەسی ناچارکرد لەسنوورەوە بۆناو تورکیا هەڵێن و، ئەوەندەشیان لێبکوژن کە تا ئێستا ژمارەیان نەزانراوە. لەئەنجامدا ئەم کیمیابارانە وەزیری دەرەوەی ناچارکرد ووریاکردنەوەیەکی توندو تیژ دەربکات، بەڵام زوو لەبیر برایەوە، قسەکەرێکیش بەناوی وەزارەتی دەرەوە ڕایگەیاند، کە هیچ بیانوویەك بۆ ئەم دووبارەکردنەوەیەی بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی نییەو کارێکی ناهەموارەو، دونیای شارستانیی پێی قایل نابێت. من خۆم لە کوردستانی تورکیاوە هەواڵی ئەو پەنابەرە تۆقیوانەم دەگەیاند، بیرم دێت کەچەندێك دراوی ئاسنم کردۆتە ناو ئەو تەلەفوونە بەتەلیسمانەی، لەناو ئەو چیایانەدا کاریاندەکرد، هەربۆئەوەی لەواشنتۆن والەبرالەرێکم بکەم لای وەزارەتی دەرەوە شتێك بۆ کارەساتەکە بکات. داخۆ ئەو کارەساتەی کورد بۆ بەڕێوەبەرایەتییەکەی ئەمریکا دەرفەتێکی لەبارنەبوو تابە قووڵایی کارەساتەکە سیاسەتێکی داتوەرانە دژ بەوعێراق دابڕێژن؟ (چەند ساڵێك دوای ئەوە کاتێك هاوکێشەکەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست جارێکیدی گۆڕا بەڕێوەبەرایەتییەکەی کلینتۆن) سیاسەتی گرتنەوەی دوولایەنەی بۆ بەلاوازی هێشتنەوەی هەردوو ڕژێمە نالەبارەکەی بەغداو تاران هێنایەکایەوە، گەر لەساڵی ١٩٨٨ەوە ئەوە پێڕەوبکرایە ڕەنگە شەڕەکەی کوێت ڕووینەدایە، بەڵام لەناوەڕاستی ساڵانی نەوەتدا ئەو خزمەتەی پێنەکراو سیاسەتی ئەمریکای زیاتر ئاڵۆزاند.

هەرچەندە دەمتوانی خۆ ماندووبکەم، بەڵام شادم بەوەی ئەوکاتە وتوومن یان نووسیومن، چونکە قسەکان بەکردار ئەنجامێکی باشیان هەبووە. بەهەرحاڵ کۆتایی شەڕەکەی عێراق ئێران حکومەتەکانی خۆرئاوایان بەرەو زەلکاوی ماچماچەیی وڕیاییکردنی سەدام حسێن برد، بەو هیوایەی لەبیناکردنەوەی عێراقی دوای شەڕدا لەپاڵی گەورەیان بەربکەوێ. بەمجۆرە چاوبرسێتییە ساویلکەییانەیان، راستییە حەشاردراوەکەی عێراق، کە ٤٠ بلیۆن دۆلار کەوتبووە ژێرباری قەرزەوە (هێندێ سەرچاوە باسی ٨٠ بلیۆن دەکرد) بەلاوە نابوو، بەتایبەتی قەرزەکانی وڵاتانی عەرەب و یەکێتی شۆرەوی و بەراپێبوونەکانی خۆرئاوا. شتومەک ناردنی ئەمەریکا بۆ عێراق پەرەی سەند، لەساڵی ١٩٨٨یشدا بەڕێوەبەرایەتییەکەی بوش بەرەسمی زیاتر پشتی عێراقی گرت و، هەرچی کۆسپێکیش کەلەپێزگاری شەڕدا لەبەردەم ناردنی شتومەکدا دایاننابوو، بەرەبەرە سووککران. سەرەداوی چەند ڕیسوایییەکی نهێنی تایبەت بەکۆمپانیاکانی ئەمەریکاو فەرەنساو بەریتانیاو ئەڵمانیا، کە چەکیان بۆ عێراق دەنارد، کەوتنەڕوو، بەڵام نەتەوە یەکگرتووەکان ئێستاشی لەسەربێت ناوی ئەو کۆمپانیانەی مادەی کیمیاوی وایان بەعێراقدەدا، کە لەدروستکردنی چەکی کیمیاویدا بەکاربهێنرێن، دەشارنەوە.

هەرچەند ڕۆژێك دوای کیمیابارانەکە، ئەنجومەنی پیرانی ئەمەریکا، لەسەر پێشێلکردنی ڕێکەوتننامەی ١٩٢٥ ی جنێڤ [14]، کەتیایدا بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی قەدەغەکراوە، بەزۆرینەیەکی باش، دەنگیان بەپێشنیاری دانانی ئابلووقەیەکی ئابووری سەخت لەسەر عێراق دا. چالاکەکانی ماڵی مرۆڤ کەوتنە گرنگیدان بەو داوایانەی لەمێژبوو کوردە پشتگوێخراوەکان، کە بەڕاستی قوربانی جینۆسایدن، دونیایان تەیکردو هاواریان لێهەستابوو. کەچی پێشنیارەکەی ئەنجومەنی پیران لە ڕووبەڕووبوونەوەیەکی دادوەریانەدا، لەکۆنگرێسی ئەمەریکادا، کەلۆبییەکانی گەنم و برنج و لۆبییە بەهێزەکانی دی ئەوانەی لەگەڵ سەدام حسێندا خەریکی بازرگانی بوون، لووتیان تێژەن و خۆینەگرت، بەڕێوەبەرایەتییەکەش بەبینینی ئەم بازاڕە نایابەی خۆراکی ئەمەریکای بۆ دەنێردرێ، زۆر شادبوو، ئیتر بێئەوەی گوێ بەهیچ ئەنجامێکی چاك یان خراپی جدی بدات، کەلەمتاکامی ڕێگەپێدانی ئەو لۆبیانەی ناوەوە دەهات، بەوەی بڕیاری چۆنێتی سیاسەت بەرامبەر بە وڵاتێك بدرێت کە ئەو هەمووەشت و مرەی لەسەربێت.

---

[14] ناوی ڕەسمیانەی پرۆتۆکۆلەکەی ساڵی ١٩٢٥ی جنێڤ، کەتیایدا بەکارهێنانی گازە خنکێنەرو ژەهراوی و جۆرەکانی دی لەجەنگدا قەدەغەکرد:

The 1925 Geneva Protocol for the Prohibition of the use, in war, of Asphyxiating, Poisonous or other Gases.

هیچ کەسێك لەبەرپرسە بەڕێوەبەرایەتییەکەی پارتی کۆماری گومانی بۆنەوە نەدەچوو کە سەدام حسێن لەم دەستبڵاوییەیدا مەبەستێکی تری هەبووبێ، تا پاش چەند ساڵێك دەستە چەپەڵەکەی لەلقی ئیتالیای بانکی شاری ئەتلانتای ئەمەریکادا "بانکا نازیونالی لاڤۆرۆ" کەوتەڕوو، هیچ بەرپرسێکی ئەمەریکایی بەلایەوە سەیر نەبوو، بۆچی دەبێ وڵاتێکی وا، بایی چەندین بلیۆن دۆلار خواردەمەنی بکڕێت و، بەتەنیا وڵاتێکی عەرەبی واش ناسراوبێت کە بەرهەمی کشتوکاڵی خۆی هەبێت؟ وەڵامەکەی زۆر ئاسان بوو: چونکە دەستکەوتی نەوتی عێراق و بڕواپێکردنە (ئیعتمادات)ئاسانەکانی ئەمەریکا، وایانکرد کە ڕژێمی بەغدا بتوانێ دەست لەو زەوی و زارە کشتوکاڵییە بەپیتانەی کوردستان هەڵبگرێت و، هەمووشی بەڕووی خەڵکەکانیدا خڕابخات و، وەك سزایەکیش، بەبێ جیاوازی مەدەنی و چەکدارە کوردەکانی لێدووربخاتەوە. ڕژێمی عێراق مەترسی زۆری بەرامبەر بەلەدەستدانی ئەو دەستگیرۆیییە هەرزانەی ئەمەریکا هەبوو، بۆیە لەبەغداو لەبەردەم باڵوێزخانەی ئەمەریکادا، لەخۆوە خۆپیشاندانێکی نارەزا دەربڕین سازکرا، لەوکاتەدا سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوی بانکی ناوەندی عێراق رایگەیاند، کە ئیحتیاتی پارەی بیانی بەڕادەیەك کەم بۆتەوە، کەبەغدا تەنانەت خۆی لەبەر گەمارۆیەکی کورتخایەنیشدا بۆ ڕاناگیرێت.

سەرنەکەوتنی پێشنیاری گەمارۆکە، بەشی خۆرهەڵاتی نزیکی وەزارەتی دەرەوەی زۆرشادکرد، کە بەردەوام بەرهەڵستی خۆی نەدەشاردەوە، ئەویش بەهۆی ئەو مەترسییەی، لەدوارۆژەکانی ١٩٩١دا وەك برادەرێکی کۆنی خۆم کەلەوەزارەتی دەرەوەدا کاریدەکرد، بۆیدەچوو "کڕیاربۆ ئەورووپاییەکان زۆر دەبێت و سەرئەنجام ئێمەش دەستمان لەبنی هەمانەکەوە دەرنەچێت" ئەوسا وەك برادەرەکەم دەیوت: گەمارۆکە وای لەسەدام حسێن دەکردگرتنەکەی کوێتی دووساڵ دواتری پێشبخات. "ئەوەی ئێمە بیرمان لێدەکردەوە هێشتنەوەی پێوەندییەك بوو لەگەڵ عێراقدا، چونکە هێزێکی سەرەکی ناوچەکەیەو گەر وەك پەیکەرێکیش بوایە پاسەوانی کەنداوی پێدەکرلو، لەلایەکی تریشەوە تا ڕێی سەرکێشییە سەربازییەکانی تری لێبگیرێت و لەکارە شەڕانگێزییەکانیشی دووربخرێتەوە". بەڵام سەرئەنجام خۆ بەدەمەوەدانێکی وابوو بە کارەسات شکایەوە، چونکە "ئێمە هیچ حسابێکمان بۆ ئەو شێتییە تەواوەی سەدام حسێن نەکردبوو". باشە ئەی کیمیابارانکردنەکەی کوردی عێراقی دوای ئاگربەستی جەنگ، لەخانەی ئەوجۆرە شێتییەدا دانانرێت؟ کەبۆ تۆڵە سەندنەوەیەکی ناپەسەند بەجێهێنراو بەزۆریش مەدەنی تیادا بەرکەوتن، خۆ دەکرا گەر بڕیارێکی وەختی جەنگیش بوایە لەبیرخۆبرایەتەوە.

ئەو گومانە کورتخایەنەی ساڵی ١٩٩٠ی لێبەرچێ، کە پیلاندارێژە مەدەنییەکان هەستیان پێکردو، بەڵام زۆری نەخایاندو هەر زوو لەبیرچۆوە، تاکە کاریگەرێتی ئەمەریکایی، کەلەدوای ئاگربەستی ١٩٨٨ەوە سەدام حسێنی بەزۆردار دانا، ژەنەراڵ چوارزکۆف بوو کەساڵی ١٩٩١ بۆ رزگارکردنی کوێت سەرکردایەتی هێزی هاوپەیمانانیکرد. لەهاوینی ١٩٨٨دا ئەم ژەنەراڵە سەربازییەی کەلەبواری سیاسەتیشدا چالاکی هەبوو، کۆماندی سوپای ناوەندی ئەمەریکای پێسپێردرا کەلە ١٩٨٣ەوە بۆ بەرەنگاربوونەوەی هەڕەشەکانی شۆڕەوی لەکەنداوی فارس دامەزرێنرا. بەڕوویی بەو پلانە کۆنانەدا چۆوە کەڕێك بە بەمۆتەکە ئەچوون و بەبوونی هێزێکی خێراو هەڵگیراوی باکووری عێراقیشەوە بەندبوون. بەهەرحاڵ جەنگی سارد لە تەواو بووندابوو، بەڵام چوارزکۆف لەسەرکردایەتییەکەیەوە چەند خاڵێکی وەرگرت و، چالاکانە ئاگربەستی جەنگی عێراق ئێرانی هەڵسەنگاند، کە "عێراقی کردۆتە خاوەنی سوپایەکی یەك ملیۆن کەسی و ئابوورییەکی داتەپیوی وا نەتوانێت ئەو هەموو چەکدارە بۆ ژیانی مەدەنی و ئاسایی بگەڕێنێتەوە".

دیارە وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا، کە بەدرێژایی شەڕی عێراق ئێران جاروبار نارەزایی بەرامبەر بەبەکارهێنانی گازی ژەهراوی دەربڕیوەو، لەناو وەزیرەکانی دەرەوەی خۆرئاوادا تەنیا ئەو بەبێ هیچ پێچوپەنایەك گازبارانکردنەکەی ئابی ١٩٨٨ی تاوانبارکردووەو بەڵێنی لەحکومەتی عێراقیش وەرگرتبوو کە جارێکیدی چەکی کیمیاوی بەکارنەهێنێ، بەڵام حکومەتی عێراق بەپەیمانشکێن ناوی زڕاوە.

هەرچۆنێك بێت ڕێکەوتننامەی جنێڤ هیچ ئاماژەیەکی بۆ بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی دژبە هاووڵاتیانی ناوخۆی وڵاتێك تیادانییە، عێراق لەدواییدا بەبەشداربوونی لە کۆنفڕانسێکدا، کەهێزە خۆرئاواییەکان لەمانگی کانونی دووەمی ئایندەدا لەپاریس سازیانکرد، قایلبوو، ئەویش دوای ئەوەی فەڕەنسا بەڵێنی بەشداری نەکردنی کوردی، تەنانەت وەك چاودێریش پێدا.

بەشی خۆرهەڵاتی نزیکی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا، کەبۆ کۆتکردنی سەدام حسێن سیاسەتە هەمیشە سەرنەکەوتۆکەیەوە دامابوو. ساڵی ١٩٩٠ لاوازی ڕێکخستنەوە هێندەی دی بێزاری کردبوو؛ چونکە لەوەتەی هەیە شتی وای بەخۆیەوە نەدیبوو. لەناو ئەو چەند باڵادەستەی بەیەکەر ئەرکی وەزارەتەکەی لەگەڵدا بەڕێوەدەبردن و، بەپەنجەی دەست دەژمێردران، هیچکامێکیان گرنگی "دەینس ڕۆس"یان پێنەدەدرا، کە کاتی ڕێگان بۆ ئەرکی سیاسی دامەزرێندرابوو، لەم کاتەدا سەرپەرشتیکردنی کاروباری بەڕێوەبەرێتی پلاندارێژنی پێسپێردرابوو چونکە بەپێی بۆچوونی ناوخۆی وەزارەتی دەرەوە، خەڵکی کارامەو خاوەن

کەسایەتی لەبەشە سەرەکییەکانی تری وەزارەتەکەدا کەمتربوون، بەلام بەلای بەیکەرەوە ناوە ڕەسمیانەکەی فەرمانبەر بایەخێکی ئەوتۆی نەبوو. ڕۆسیش لەبەرئەوەی لەکاتی پڕوپاگەندەی هەڵبژاردنی ١٩٨٨دا ڕاوێژکاری سیاسەتی دەرەوە بوو بەئاسانی دەگەیشتەلای بوش، بەوەش بالادەستییەکەی خۆیی بەکاردەهێنا.

هەرکە بەیکەرو دەوروپشتەکەی ئیشیان پێی نەما، ئیتر بەشی خۆرهەلاتی نزیک NEA کەوەك گەمەی "ڕوبی گوڵدبێرخ"ی لێهاتبوو؛ دانیال کورتزەریش، کە دیپلۆماتێکی کارامەو پێشتر لەقاهیرەو تەلئەبیب بووە، سەرپەرشتی نوسیە پڕ گرفتەکەی عەرەب ئیسرائیلی دەکرد، بەلام وەك یاریدەدەری بەڕێوەبەر هیچ خۆی بەلێپرسراوێکی بەردەم سەرۆکەکەی دانەدەنا و ڕاستەوخۆ پێوەندی بەبەڕێوەبەرایەتی سیاسەت داڕێژەرانەوە دەکرد. چی پێوەندی نێوان بیست دەولەتەکەی دونیای عەرەب هەیە بەرەو ڕووی ئەم بەڕێوەبەرایەتییە کرابۆوە، ئیتر وەك خوێ بەزامەکەوە بکرێ، بێکەر ئاوا ((جۆن کێلی)) بە بەڕێوەبەری نوسینگەکە دانا، ئەوەش پێدەچوو ڕێکەوتنێکی گشتی بێت تا NEA سەرپێچیکەرترین و لاوازترین بەڕێوەبەری هەبێت، بەدوای ئەوانەشدا هاتبوو کە شارەزایی مەیدانی تەواویان لەبارەی عەرەبەوە هەبوو، وەك ڕیچارد فورمی پێش ئەم، یان لەناوچەکەدا پسپۆڕبێت وەك ((ئەلفرێد لیروی ئەتیرتون))، یان وەستایەکی کارامەی ململانێکانی ناو واشنتۆن بێت وەك ((جۆزیف سیسکۆ)). لە کاتێکدا تاکە شارەزایەکی کێلی لەخۆرهەلاتی ناوەڕاستدا بالوێزیتیەکەی لبنان، ڕاستتر بلێین ماڕۆنستانی بوو، کە بەشێکی دابڕاوی دیانەکانەو لە هەشتاکانیشدا تاکە شوێنی هاموشۆی بیگرفتی دیپلۆماتە ئەمەریکاییەکان بوو. کێلی، پیاوێکی ئەوەندە لووت بەرزو خۆبەزلزان بوو، هەموو ئەو کەسانەی لەگەڵیا کاریاندەکرد، بەوانەی واشنتۆنیشیانەوە ڕکیان لێی دەبۆوە، بۆیە ئەو بەڕێوەبەرایەتییەی کەپێشتر بە کارامەو چاك بەڕێوەبردنی ئەرکە تایبەتییەکانی و یەکگرتوویی و کارگێڕەکانی ناسراوبوو، بەدرێژایی مێژووشی بەلایەنگیریتی عەرەب [١٥] ناسرابو، شێواندو، خەونی لۆبە سەهیۆنزمەکانیش هاتەدی و، کۆتاییەکەشی بۆ بەشەکە کارەساتبوو.

لەدالگیرکردنی کوێتدا، NEA جێ باوەڕ نەبوو، لەشتی واشدا بێتواناو دەستەپاچە دەرەستا، ئەگەر حسابی هەڵسەنگاندنیش لەمەڕ پاشماوەی سیاسەتە نالەبارەکەی بۆبکرێت و بتوانرێت لەو بوارەدا ڕای نوێ گرنگی لەبارەوە بدرێ، ئەوا بەکورتییەکەی NEA ، پلاندارێژەرو دیپلۆماتێکی ئەمەریکایی وتەنی: وای لێکرابوو دەمی بۆ هەڵنەمێنرێتەوەو کەسیش داوای هیچ ئامۆژگارییەکی لێنەکات. دیسان دەیوت بەلام کە ((هاس)) بەڕێوەی دەبرد چونکە هیچ پسپۆڕبو

---

[١٥] زیاتر مەبەست حکومەتە ئەوتییە عەرەبییەکانە.

شارەزایەکی کارامەی تیادا نەمابوو، بڕیارە سیاسییەکان، ئەگەر هیچ پێوەندییەکیشیان بەئەرکە سەربازییەکانەوە نەبوایە، هەر لەکۆشکی سپی و ئەنجومەنی ئاسایشەوە دەردەکران.

سەرباری ئەم هەموو فاکتەرو ژێرکەوتن و ڕەخنانە، گازاندەی کوردیشی هاتەپاڵ، کەهیچ ڕۆڵێکیان لەسەر وەزارەتەکانی دەرەوەی ئەمەریکاو وڵاتانی تری خۆرئاوادا نەبووە. هەموو ڕەخنەگرەکان وایان دەزانی، ئەو بایەخە زۆرەی لایەنگرانی عەرەب هەیانە، بەتەنیا لەبەر پارێزگاریکردنی دەستپۆیشتنی خۆیان و ئەو قۆنتەراتە چەورانەیە کە لەوناوچە پڕ لەنەوتەکاندا هەیانبووە، بۆیە بەردەوام پشتگیری ئەو ڕژێمە دەستەڵاتدارانەیان کردووە، بەوانەشیانەوە کەلەڕووی پارێزگاریکردنی مافی مرۆڤەوە لێپرسینەوەیان هەڵدەگرت. بەکارە ناڕەواکانیشیانەوە ئەدەوەستان و چی پێویستی سەرەتایی و شارەزایەتی تەکنیکیانە هەیە، بەتەکنیکارەکانیشیانەوە دەدا بەعێراق تا لەکارگەی چەکە کیمیاوییەکانیدا کەئەو هەموو کوردەیان پێکوشت، بەکاریانبهێنێت.

کورد دەکرا لەخوێندنەوەی ڕۆژنامە ئەورووپییەکانەوە بە بەشێك لەو نووسراوو دەربڕینانەی چەند کۆمپیانیایەکی دەست بەخوێنی کورد سووربووی ئەم بازرگانییە سووکەو ئەوماوە زۆرەی چاوپۆشینی حکومەتەکانیشیاندا بچووناییەتەوە. لەو ڕەخنانەی لەناو ئازارو ئەشکەنجەدا نقوم ببوون و بەردەوامیش ڕوویان لەزیادی بوو، بڕوایەکی وا هاتبووە گۆڕێ، کە خۆرئاواییەکانی لایەنگری عەرەبن و بەو پەڕی ڕەزامەندێتی خۆشیانەوە چاویان لەو کارەپۆشیوە، یان هەر هیچ نەبێ لەڕووی ڕەوشتییەوە دووربین نەبوون، یان هۆی ڕەفتاری خۆسەپێنەرانەی حکومەتەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، کەئەمیان کرۆکی کاری دیپلۆماتیانەو ناسینی تەواوی خەڵکییە، جا چ لەدەرو چ لەناو بازنە گشتییەکەدا بن، ئاڵۆزاندبوو. کاربەدەستانی خۆرئاوا وەك ڕەخنەکان باسیان لێوەدەکەن، هەوڵیانداوە بەهەر نرخێك بێت خۆ لەسەرکردەوە نزیکبخەنەوەو ڕیایی یان بۆ بکەن و، دانیشیان بە زەحمەتی و بەردەوام خۆ دوورگرتنیان لەگەڵانەوە ئەدەنا.

دیپلۆماتە ئەمەریکاییەکان بەرگریان بەوە لەخۆیانەکرد کەدرەنگ عێراقی بەعسیان ناسیبێت [16]، چونکە لەساڵانی ١٩٦٧ – ١٩٨٤دا پێوەندی دیپلۆماتیانەیان لەگەڵیدا نەبووەو، تەنیا بەشێکی پچووکی بەرژەوەندییان، وەك نوێنەری گشتی لە بەغدادا مابۆوە. ڕاستییەکەشی حکومەتە پۆلیسییەکەی سەدام حسێن زۆر لەپێش کوێت گرتنەکەدا، خۆی هێنابۆوەیەك و

---

[16] بەهەرحاڵ لەمێژە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو بەریتانیای مەزن گومانی پەسەندکردنی کودەتا سەرەکییەکەی ١٩٦٣ی بەعس و یاخیبوونە چەکدارییەکەی ١٩٦٨یان، لەبەر چەند هۆیەکی ئاشکرا لێدەکرا، چونکە بەعسییەکان لەهەردوو کاتەکەدا، کەهەوڵی دەستەڵاتگرتنە دەستیانبوو دژ بەشیوعی و ناسرییەکان بوون.

دیپلۆماتە بیانییەکانیشی بەهۆی تۆقاندنی خەڵکی وڵاتەکەیەوە، بەجۆرێك کەلاخستبوو، کە باڵوێزخانەی ئەمەریکاو هەمووکارە دیپلۆماتییەکانی هێندە بەلاوە نرابوو، کەلەهەموو زانیارییەکانی پێوەند بەدەستەڵاتدارانی بندەستانەوە دووربن ((دیڤید نیوسنی)) باڵوێزی پێشووی ئەمەریکا دەڵێت ((ئێمە هەر بەپێی بۆچوون و ئەقڵبڕینی خۆمان کامانەکرد، زۆرکەم سەرچاوەمان لەبەر دەستدا بووە، هیچ کاتێك ئاگامان لەڕوودلو نەبووە، تەنیا ئەو پڕوپاگەندە ئەمان دەبیست کە تەلگرافی فریشتەمان لێنابوون". دەتوت مۆتەکەیەو لەدووبارە بوونەوەی هەرەسهێنانەکەی شای ئێران دەچوو، کەبێئاگایی بەڕێوەبەرایەتییەکەی ئەمریکای لە بەرهەڵستکارە ئێرانییەکان خستبووەڕوو. لە هەردووکیاندا سەرژمێرە خۆرئاواییەکان دەستخەرۆزی قسەو پڕوپاگەندەی دەزگاکانی راگەیاندن و جۆرەکانی دی سەدام حسێن و شای ئێران بوون، کە بەخواست و ئاواتی "نوێکەرەوە"یان و چالاکی و بۆچوونی "چارسازان"ەوە بەندبوون.

لەمڕووەوە "نوێکەرەوە"و "چارسازان" جیاوازییەکی زۆر کەمیان لەگەڵ پێشخۆیاندا هەبوو، کەلەنێوان هەردووجەنگی جیهانیدا لەناخی دڵەوە پشتگیری ئەتاتورکی تورکیاو ڕەزاشای ئێرانیان دەکرد، ئەو دووپیاوە سەربازییە خۆسەپێنەرانەی بەزۆر دەستەڵاتیان لەدەستگرت و بەبیانووی "نوێکردنەوە"ی وڵاتە کۆنەکانیانەوە، کە گوایە دەیانگەیێننە ڕیزی وڵاتە ئەورووپاییەکان، واتە وڵاتێکی نەتەوەییانەی نەریتە کۆنەکەی یەعقوب ئاسای شۆڕشی فەرەنسا، کەناوەندێتییەکی توندی هەبێت و چاریش لەهیچ نەپۆشێت. هەردوو ڕژێم زۆرکەم نەبێت حسابیان بۆ کەمایەتییە نەتەوەییەکان نەکردبوو. پێش داگیرکردنی کوێت، کورد و بەشەکانی تری بەرهەڵستکارانی عێراق بڕوایان وابوو کە عەرەبە سەربەخۆرئاواییەکان هیچ حسابێکیان بۆ نەکردبن بەڵام دوای گرتنەکەی کوێت عەرەبەکانی دۆستی ئەمەریکا، چونکە شوێنێکی وا گرنگیان نەبوو کار لە سیاسەتی ئەمەریکا بکات، شەرمەزار مانەوە.

ئەندامە ئاکادیمییەکانی قوتابخانەی "نوێکردنەوە"ی وەك! "مار"و "کریستین"و "مۆسی هێلمز"، کەپێشتر لەناو بەڕێوەبەرێتییەکەدا بوون و بەباشە باسی بەغدای بەعسیان کردبوو، بوش بۆخۆشی سەبارەت بەچۆنێتی ڕەفتارکردن لەگەڵ عێراقی دوای ڕزگارکردنی کوێتدا پرس و ڕای وەردەگرتن، خەڵکی پێیان وابوو کەئەوان مانەوەی ڕژێمەکە، با "سەدام حسێن" یشی تیادا نەبێت بەباش دەزانن. چونکە گەر هەوڵی دابەشکردنی دەستەڵات بدرێت ئەوا دوورنییە تەقینەوەیەکی سەرتاسەری لە وڵاتەکە ڕووبدات، کەئەویش جۆرە سووڕ بوونێکە بۆ هێشتنەوەی دەسەڵات. بەدەست عەرەبی سنییەوە، ئەویش بەژەنەراڵێکی وا کەهەم مل بدات و

هەم لەو ڕەگەزەشبێت‌و، تا بشکرێت لەخزمەی تکریتییەکانی "سەدام حسێن" بێت. بەڵام داخۆ دوای ئەم هەموو شەڕانگێزیەتیی‌و چەندین ساڵ خۆسەپاندنەی، هاوکێشە سەرنەکەوتووەکەی چاری هێجگارەکی دەکرد، یان هەر نووسینی سەرکاڵەز دەبێت؟. هیچ شتێکی وا بۆ گەیشتن بەو بنەمایەی کە عێراق خۆی وڵاتێکی دروستکراوەو، دوای جەنگی جیهانی یەکەم بەریتانیاییەکان لەسێ وولایەتی عوسمانی؛ موسڵ، کەزۆربەی زۆری خەڵکەکەی کوردن‌و نەوتی تیادایە، بەسرە، کەبەشێکی ڕەوای زۆرایەتی شیعەی وڵاتە نوێیەکەیە، بەغدای پایتەخت، کەنێوەندی کەمایەتی عەرەبی سنی خاوەن دەسەڵاتە. جاگە هەر بیر لە هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتەکەی بەعس نەدەکرایەوە، بگرە لە کانونی دووەمی ۱۹۹۱دا دیپلۆماتێکی ئەمەریکایی کەلەباڵوێزخانەی وڵاتەکەیدا لە لەندەن، ئەرکی بە دوادا چوونی کاروباری خۆرهەڵاتی ناوەڕاستی پێسپێردرابوو، هەر لەبەر ئەوەی هەوڵی بینینی سەرکردەیەکی نەتەوەیی کوردی دابوو، کەبەسەردان چووبووە بەریتانیا، گلەییەکی زۆر توندوتیژی لێکرا.

داخۆگەر بەشی خۆرهەڵاتی نزیک NEA کەمێك ڕێکوپێکتر بوایەو چاکتر بچوایەتە دڵەوە، نەیدەتوانی لەکاریگەرێتی خۆی بۆ ڕووداوەکان بپرسێتەوە؟ لە مانگی ئەیلولی ۱۹۹۰ەوە بوش ناچار نەبوایە نەیدەویست هیچ شتێك لە بڕیاری شەڕکردنەکەی دووری بخاتەوە، تائەشهات ئەوەی زیاتر لای دەچەسپی. بەوجۆرە "ڕاڕاییەکەی بوش" پێویستی بەیەکلابوونەوە هەبوو، کەئێزیکێکی خۆی ناوی "جۆرەڤۆوڕێکی داخراوی ناو کۆشکی سپی" لێنابوو. بەهەمان شێوە ئەو پێشنیارانەش، کە ئەگەر کوێت ئازادبکرێ ئەوا تەیۆرستێتی عێراق کەمتردەبێتەوەو پاریدەی دامەزراندنی دەسەڵاتێکی دادوەرانەی فرەلایەنیش دەبێت، پشتگوێ دەخران. پێدەچوو دروشمی "پشتگوێخستن لە دریژدادرییەی بەچەواشە باشتربووبێت". بوش خۆی بەچارەسەرێکی سەربازیانەوە گرێدابوو، کە لەگەڵ بۆچوونی خۆ بەهێز قایمکردنەکەی "پاوڵ"دا، بگونجایە. (خەڵك سەری لەوە سوڕدەمێنێ‌و هەموو دونیاش لەبارەی ئەو هێزە مەزنە ئاگرینەی هاوپەیمانانەوە دەپرسن کە پاوڵ لەناوچەکەدا پێکەوەینا، کەچی بەڕێوەبەرایەتییەکەی ئەمەریکا لەکردنی شتێك بۆ ڕاپەڕینەکانی عێراق پاشگەزبۆوە).

پێدەچوو ئەرکی دیپلۆماتیانە هەر بۆئەوە تەرخانکرابێت کەزۆرترین وڵات لەکەمترین کاتدا بۆ ڕیزی هاوپەیمانان رابکێشێت. ئەوەی بەیەکەر لەگەڵ "ئەدوارد شیڤەر نادزە"ی وەزیری دەرەوەی شۆرەویدا کردی‌و، بووەهۆی پەرەسەندنی پێوەندییە ئاسایشییەکانی ئەوروپا، هەم بەلای بەڕێوەبەرایەتییەکەی خۆیەوەو هەم لە دونیای پڕ گومانیشدا جێگەی سەرسوڕمانبوو، ئیشێکی نهێنی وا بوو کە سەدام حسێنی لەو پشتگیرییە مسۆگەرەی ڕوسیا بێبەشکرد. ئەم کارە

گرنگەی بەیکەرو چالاکییە تایبەتییەکانی تری لەبواری ڕێکخستنەوەی لایەنە ناکۆکەکاندا، زانیاری ووردو قووڵی بوشیش لەبواری سیاسەتی نێودەوڵەتیدا، یاریدەدەری یەکخستنی هاوپەیمانیەتییەکەو پەوزبابیکردنەکەی نەتەوە یەکگرتووەکان بوون.

بەڵام واش ئەم هاوپەیمانێتیە، وەك هەموو ئەریتێکی ڕێزلێنراوی تری هەر هاوپەیمانێتییەك، کەمترین فاکتەری هاوبەشی پێوەدیاربوو، بۆ نموونە، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە هاوپەیمانێتییەکەدا بوونی هەردوو وڵاتی میسرو فەرەنسای بەپێویست دەزانی، یەکەمیان چونکە گەورەترین دەوڵەتی عەرەبییەو، وایدەگمیاند کە ئەمەی هاوپەیمانان هەڵمەتێکی خاچدارانەی تری خۆرئاواییەکان نییە دژ بە وڵاتێکی موسوڵمان بکرێت، دووەمیشیان وڵاتێکی گەورەی خۆرئاوایەو، ترسی لەکاردانەوەیەکی بەسۆزی وڵاتانی ئەوبەری دەریای سپی باکووری ئەفەریقای موسوڵمانی کۆنە بندەستی خۆی و لایەنگرانی بەغدای هەبوو. هەردووکیشیان زیاتر لەدڵشکاندنی ئەو عەرەبە نەتەوەییانە دەترسان کە نابەنەدیان لێدەرکەوتبوو، هیچکام لەقاهیرەو پاریس نەیاندەویست سوپای هاوپەیمانان بچێتە بەغداو سەرزکی وڵاتێکی عەرەب، چەند دزێویش بێت، لابەرێت، کەواشنتۆنیش هەرئەوە خواستیبوو.

بوش، هەرچەندە سەدام حسێنی بەهێتلەر بەراورد دەکردو دیموکراسییەتی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستیشی بەلاوە مەبەستبوو، بەڵام بۆ خۆدان لەحوکمی کەمایەتییە سنیە چەسپاوەکە، بەبێ بەشداریکردنی بەشی خۆرهەڵاتی نزیك، ئەگەرچی ڕۆڵێکی واشی نەبوو، بەڵام بەڕێوەبەرایەتی زانیارییەکی زۆرکەمی لەبارەی دانانی چوارچێوەیەکی نوێی حوکمەتی بەغداوە هەبوو، خۆ ئەگەر لەکردنیشی بوایە لەهیچ نەکردنەکەی، وەك هەر نەشیکردو ئەو کارەساتە چاوەڕوانەکراوەی بەدوادا هات، باشتربوو. هەموو هاندانەکەی خانەنشینە کۆنە بالادەستەکانی خۆرهەڵاتی نزیکی لەمەڕ مەترسی کاری سەربازیانەی نیوەوتاچڵ و مانەوەی سەدام حسێن و پارتی بەعس لە دەستەڵاتدا خرابووە سەرشانی "ولیام نیگلتۆن" کەخانە نشینێکی شارەزای باروئۆخی کوردەو، زۆر لەپێش شەڕ ڕاگرتنە کوتوپڕەکەی بوشدا کەدوای ۱۰۰ سەعات شەڕی زەمینی وەستانی، ئەم دەیزانی کارەسات ڕوودەدات و، هەستیشیکردبوو کە سەدام حسێن سەرجەم یەکە چاپوکەکانی گاردی کۆماری و ۲٤تیپی ئاسایی جۆراو جۆرو پۆلیسی ئاسایش، کەمێژێکی تایبەت بوون بۆ هێشتنەوەی لەحوکمدا، نەخستبووە ناو شەڕەکەوە. نیگلتۆن سڵی لە بەبیرهێنانەوەی برادەرەکانی ناو بەشی خۆرهەڵاتی نزیك نەدەکردەوە. دوای ئەوەی واشنتۆن لە ۲۸ی شوباتی ۱۹۹۱دا بڕیاری ڕاگرتنی شەڕەکەیداو، وەك چۆن پێشبینیش دەکرا ئەهامەتی کوردو شیعەی لێکەوتەوە. بالادەستێکی وەزارەتی بەرگری ئەمەریکا مانەوەی سەدام حسێنی

لەحوکمدا بەوە کورتکردەوە کە "ئەو هیچ هەڕەشەیەکی بۆ ئێمە نەبووەو ئێمەش هیچ حسابێکمان بۆ هەڕەشەی خەڵکی وڵاتەکە نەکردبوو". بەشێك لەبۆچوونە ژیرانەکەی بەڕێوەبەرایەتی پارتی کۆماری، ڕۆتینەکەی واشنتۆنی بەرامبەر جیۆپۆلیتیکی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دەردەخست، بەتایبەتی عەرەبی سعودی، کەهاوبەشە سەرەکییەکەی خەلیجێتی، لەوبڕوایەدابوو کە حوکمە شایانە سنی مەزهەبەکەی عەرەبی سعودی زۆر ڕکی لەبیزکەی تاکە پیاو وتاکە دەنگەو، دەشترسا زۆرایەتییەکەی شیعەی عێراق ببنە نموونەیەکی کۆپیکراوی کۆماری ئیسلامی ئێران، کە تاکە دەوڵەتی شیعەیە لەدونیادا. بەڵام ئەم هاوکێشە ڕامیاری و ماتماتیکیانە ئەوەیان لەبیرکردبوو کە شیعەی عێراق، هەر لەکۆنەوە سەربە ئێران نەبوون و لە ساڵانی شەڕی ۱۹۸۰-۱۹۸۸ یشدا زۆر بۆ بەغدا دڵسۆزبوون. بەڵام بنەماڵەی شایانەی سعودی، کەلەسەر گەورەترین کانە نەوتی ناوخاکی تیرە شیعەکانی پارێزگای خۆرئاوا دانیشتوون، دژیە هەموو جۆرە سەرەڕۆییەکبوون، بوشیش کەلەئابی ۱۹۹۰دا هێزی ئەمەریکای بۆ کەنداوی فارس دەنارد، بۆ ڕزگارکردنی کوێت نەبوو بەڵکو بۆ پاراستنی نەوتی سعودییەی بوو. (بەو مەبەستەش کەئێران، کوێت، عەرەبی سعودی و، ڕاستییەکەشی زۆربەی حکومەتەکانی ناوچەکە ڕکێکی هاوبەشیان لەحکومەتە دیموکراتییەکان هەبوو) کەئەمەیانیان لەبەر ڕای گشتی بوو.

لەچەند مانگی پێش ڕزگارکردنی کوێتدا، بەریتانیا، فەرەنسا، وڵاتە یەککرتووەکان، هەریەکەیان بەجیا لێکۆڵینەوەی خۆیانکرد. سەیرەکە لەوەدایە هیچ کامێکیان بیریان لەوە نەکردبۆوە کەسەدام حسێن بەرگەی شەڕ بگرێت و بکەوێتەوە گیانی زۆرایەتی شیعەو کورد. ئاکامی لێکۆڵینەوەکانیش هەر بەهیوایی بوو، چونکە هیچ لایەکیان بەجێهێنانی ئەرکە پۆخڵەکەیان مەبەست نەبوو، ئەوەش بە تەنیا هیوای ئەمەریکا نەبوو، "مار" وتەنی کەدەڵێ "ئەگەر بەختەوەربین ئەوا سوپای عێراق ڕووەو بەغدا دەکشێتەوەو سەدام حسێن لەناو دەبات". کەچی واش هەرسێ حکومەتەکەی خۆرئاوا لەیەك کاتدا بەبۆچوونی: خۆ ئەگەر دوای ئازادکردنی کوێت سەدام حسێن مایەوە، ئەوا بێگومان لەبەرەدەم ئێراندا وەك قەڵایەکی هەرەسپێهێنراو دەوەستێت، بەڵام هەرچۆنێك بێ قەڵایەکی بەسوود دەبێت.

ئەمە بیرکردنەوەیەکی ئەوەو مژاوییەو بەئاشکرا دوو مەبەستی دژبەیەکتری تیادا بەدی دەکرێن، یان سەدام حسێن پچووك دەکرێتەوەو بەئینۆککراوی دەمێڵرێتەوە، یان ئەوەتا لەکاتی هەرای کوردو شیعەدا لادەبرێ و، بەڵام دواجار ئەو عەرەبە سنی مەزهەبانەی کارە سەرەکییەکانی سوپایان بەدەستە، بەسەر ئەو لەوانەشدا زاڵدەبن کە دژایەتیاندەکەن، بەهەرحاڵ بڕوابوونیان بەپارێزگاریکردنی هێزی کەمایەتی سنی عەرەب و ڕێسا شاراوە بێبناغەکەی کە گوایە عێراق

وەك وولاَتێكی پیشەسازیانە دروستكراوەو، عەرەبە سنیەكانیش هێندە پێوەی ماندوبوون، ئەگەر زۆرایەتی شیعە یان كەمایەتی كوردی سنی دەستیان لەبەرێوەبردنیا هەبێت ئەوا وولاَتەكە بەشبەش دەبێت، كە ئەوە راست نییەو شتێكیش كە باسی لێوە ئەكرابێت پێویستە تاقیبكرێتەوە، خاڵی هاوبەشیانبوو ئەوەی لەتۆماری ٧٠ ساڵانەی پڕ ئێشو نازاری حكومەتی عێراقدا دیارە، سووربوونە لەسەر هێشتنەوەی یەكپارچەیی خاكی عێراق، كەدیارە مەراییكردنی مانەوەی ئەو سنوورە دروستكراوانە، یا دەوڵەتانیش دانیان پیادانابێ، پێویستییەكی زەق و ئاشكرای بوونی هێزێكی سوپاییە لەڕووی ئێراندلو ختوكەدان و دڵدانەوەی دراوسێكانی عێراقیشە.

ئێران و سوریاو توركیا لەقسەكانیاندا یەكبینە دڵسۆزی خۆیان بۆ سەروەری و یەكپارچەیی خاكی عێراق دووپاتەكردەوە، كە لەووشەی دیپلۆماتیانە بەولاوە هیچی دی نەبوو كرابوونە حەشارگەی بەرهەڵستیكردنی شتێك كەبۆنی ئارەزووی سەربەخۆیی كوردی لێبهاتبایە بەئۆتۆنۆمییە راستەقینەكەی ساڵی ١٩٧٠ی سەدام حسێنیشەوە كە بەڵێنی بە كورد دابوو بیانداتێ. شتێكی نوێی تیادا نەبوو: تەنیا لێدانەوەی قەوانە كۆنەكانی رێككەوتننامەی سەعد ئاباد نەبێت، كەساڵی ١٩٣٧ لەكۆشكێكی تاراندا، لەنێوان ئەفگانستان و ئێران و عێراق و توركیادا، بەناویەوە دەركراو، تیایدا بەڵێنی پشتگیریكردنی یەكتریان بۆ دامركاندنەوەی هەر كارێكی گرنگی روخێنەرانەدا، ئەفگانستانی لێدەرچێ كاری گرنگ بەلای بەڵێندەرەكانی ترەوە كەلەو دەمەدا دەمەزڵی لەیەكچوونی حكومەتەكانی خۆیانیان بەمۆدێرنەكانی خۆرئاوا دەكوتا، ئەتەوەی كورد بوو، بەپەتایەكی وایان دادەنا كەمەترسی زۆری بۆ حكومەتەكانیان هەبێت. هەرئەو "گرنگ"انە دوای وەچەیەك سەریان هەڵدایەوە، بەلاَم ئەمجارەیان لەپەیمانی بەغدای ساڵی ١٩٥٠دلو بە پشتگیریكردنی بێپێچوپەنای خۆرئاوا، ناوەكەشی لە ١٩٥٨دا كە بەغدا لێیدەرچوو، گۆڕرا بەپەیمانی سێنتۆ.

پلان داڕێژە بالاَدەستەكانی سیاسەتە مەدەنییەكەی بەڕێوەبەرایەتی بوش، بەرهەڵستكارە عێراقییەكانیان بەكۆنە بووكە سەماكەرێیەكی دەست ئێران و سوریا دادەنا، كەهەرچۆنێك بیانویستایە وا هەڵیاندەپەڕاندن، راستە سوریا بۆماوەیەكی زۆر پێوەندی بە بەرهەڵستكارە عێراقییەكانەوە هەبووەو، ئێرانیش باهەر لەگەڵ چەند كۆمەڵێكی تایبەتیدا هەیبووبێت، بەلاَم (لێپرسراوانی عەرەبی سعودی بەرادەیەكی وا لەڕووداوەكانەوە دووربوون كەلەپایزی ١٩٩٠دا بۆناوی چەند كەسایەتییەكی بەرهەڵستكاری وا گەڕابوون كەپێشتر هانایان بۆ هێنابوون).

بێگومان ئێران بەلای واشنتۆنەوە جێی بڕوا نەبوو، سوریا ئەگەرچی بەشداریشی لەگەڵ

هاوپەیماناندا کردبێت، بەڵام بەهۆی کەللەڕەقیتی "حافز ئەسەد"ی سەرۆکییەوە، لەبارێکی باشدا نەبوو، چونکە بەڕووی ئەوشتانەدا دەوەستایەوە کە ئەمەریکا بەچاکی دەزانێ، کەهەر لە جیاکردنەوەی ئاشتی ئیسرائیل لوبنانەوە بیگرە تا بەگازاندەی پشتگیریکردنی حوکمەتەکەی لەتیرۆر دەکات. بەڕێوە بەرایەتییەکەی بوشیش بەردەوام دڵەڕاوکێی ئەوەی بوو کە دراوسێکانی عێراق بەجۆرێك پێوەندییەکانی ئەمەریکاو بەرهەڵستکارە عێراقییەکان لێکبدەنەوەو لەهاوپەیمانییەکەدا بیکەنە بیانووی کشانەوەیان.ڕاستییەکەی بوش تەنیا حسابی بۆ تورکیای تاکە هاوپەیمانی NATO ی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدەکرد. لەسەردەمی چەندین حکومەتو بەڕێوەبەرایەتی ئەنقەرەو واشنتۆنو بە درێژایی چل ساڵ مەراییکردن، کەزۆرجار شتێکی واگرنگ دەهاتە ئاراوە، نەدەبوا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەهیچ جۆرو لەهیچ شوێنێکیشدا کارێکی بکردبا کە داشکاندنی بەلای خواستەکانی کورددا بگەیاندایە، ئەمەریکا لەوڕووەوە ئەوەی لەتوانایدا بوو کردی بەکۆتایی جەنگی سارد ڕۆڵی تورکیاش وەك پارێزەرێکی باڵی خوارووی ناتۆی دژ بە یەکێتی شۆرەوی کۆتایی پێهات، بۆیە زۆر خەمی بوو کەلەدوا ڕۆژدا خۆرئاواییە هاوبەشەکانی کەلایبخەن. دالگیرکردنەکەی کوێت شتێکی نوێ بوو ڕۆژگار بۆنەی نارد، بەڵام ئەوەی سەرودڵی ئەنقەرەی گرت، ئەو بایەخپێدانە زۆرەی کێشەی کوردبوو، کەماوەیەکی زۆر خەفەکراو، کەچی بەهۆی ڕووداوەکانەوە تا دەهات پەرەی دەسەند. نزیکەی چل ساڵێکیش هاوکارانی ناتۆی، چاویان لەئاست پێشێلکردنەکانی ماف مرۆڤو کەموکورتییەکانی تری جێبەجێکردنی دیموکراسی، بەتایبەتی لە کوردستانی تورکیادا، نوقاندبوو. لەساڵی ۱۹۲۳یی دامەزراندنی کۆماری تورکیاوە، ئەنقەرە لەترسی هاندانی کەمایەتییە کوردە زۆرەکەی خۆی، نەیویستووە پێوەندییەکی باشی لەگەڵ کوردی عێراقدا هەبێت. تورکیا لە ۱۹۸٤ەوە لەشەڕێکی ناوخۆی فراوانی کوردەکانی خۆیدایە، ئێستا لەنەبوونی پێوەندی خۆی لەگەڵ کوردی عێراقو بگرە سەرجەم بەرهەڵستکارانی عێراق، کەبەپێچەوانەی ئێرانو سوریایەو، بەخراپەش بەسەریا شکاوەتەوە، بەئاگاهاتۆتەوە.

سەرۆك ئۆزال بە شێوازە تایبەتییەکەی، ئەتاتورك ئاسا، خۆی بەنەریتە کۆنەکانەوە نەبەستەوە، ئەگەرچی ئەویان لەبەرامبەر پتەوکردنی پێوەندیان بەهێزە ئەورووپاییەکانەوە وریایانە ناڕەزایی خۆی دەردەبڕی، ئۆزالیش لەکاتی شەڕی ئێران عێراقدا سوودی چاکی لەپێوەندی ئابووری بە هەردولایانەوە بەدەستهێنا، لەساڵی ۱۹۸۲وە سەدام حسێن، کە سوپاکەی بەدەست بەرەنگارییەکەی ئێرانەوە گیری خواردبوو، ڕێی بەهێزەکانی تورکیادا کەلەباکووری عێراقدا هەڵکوتێتە سەر کوردەکانی خۆی، چونکە لەدژایەتیکردنی ئەنقەرەیاندا

ناوچەیەکیان بۆحەواندنەوەی خۆیان بەکاردەهێنا. کەمترین سۆزی بیانی بەرامبەر بەکورد تورکیای دڵگراندەکرد، لەکاتێکدا پێناسەی نەتەوەییانی بەجۆرێك لێ قەدەغەکردبوون کەبەدەیان ساڵ وەك یەکێك لەشتە سەیرەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، ناوی تورکی شاخاویان لێنابوون (١٧).

ڕاستییەکەی بەلای تورکەوە پێوەندیکردنی بیانی لەگەڵ کورددا، جا کوردی هەر لایەك بێت بەڕادەیەك بڵەبوو، کەجارێك حکومەتی تورك نارەزایی بەرامبەر چاوپێکەوتنی بەرپرسێك دەربڕی ، کەساڵی ١٩٨٨بۆ فەرمانبەرێکی مامناوەندی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکاو جەلال تاڵەبانی ڕێکخرابوو،تا سەبارەت بەگازبارانکردنەکەی هەڵەبجەی سەدام حسێن کەبێزارییەکی زۆری لێچاوەڕواندەکرا، باسی دەردی دڵی خۆی بۆبکات، هەرئەوەش وڵاتە یەککرتووەکانی والێکرد نامەیەکی نارەزایی توند دژ بەبەکارهێنانی چەکی کیمیاوی بۆ عێراق بنێرێت. بەڵام دیپلۆماتە ئەمەریکاییەکە نەزیرو نەبەختیشی هەبوو، چونکە تاڵەبانی کەبەوە ناسرابوو شانازی بەخۆیەوە دەکات و زۆریش لەسەر قسە دەڕوات، کاتی بەفیڕ نەدلو قسەی بۆ ڕۆژنامە کرد، بەوەش (پەردە لەڕووی هەموو سیاسەتە توندەکەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا، کەڤیزەی لەسەرکردە کوردەکان قەدەغەکردبوو دامالی[١٨]. لەسەرو ئەوانەشەوە لێپرسراوە ئەمەریکاییەکە نەیدەزانی هەر لەوکاتەدا "کنعان ئیڤرین"ی سەرۆکی تورکیا لە واشنتۆنەو نارەزایی توندی لەوبارەیەوە پیشاندراوە.

---

[١٧] ساڵی ١٩٦٠ کەتورکیا نارەزایی خۆی دژی بەرنامەی کوردی، کەلەڕادیۆی "صوت العرب"ەوە بڵاودەکرایەوەو، زۆر بەپەرۆشەوە لەسەرتاپای خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا گوێی لێدەگیرا، دابە جەمال عەبدولناسر، ناسر کارە دیپلۆماتیانەکەی زۆر لەکورتی و بەپرسیارێك لەدیپلۆماتە تورکەکان بڕییەوە: باشە داخۆ کورد هیچ لەوڵاتەکەی ئێوەدا هەیە؟. چونکە دەیزانی بەرەسمی نەبوونی کورد لەو وڵاتەدا بڵاوکراوەتەوە، کەواتە نارەزاییتان لەچییە؟

[١٨] تا رادەیەك سەرکردەکانی کورد ڕێزیان لێنەدەگیرا، زۆر لەباڵوێزخانەکانی وڵاتانی یەککرتووی ئەمەریکا، لەڕووی دیپلۆماتیانەوە ئەوەندە دوورە پەرێزلێیانەوە دەوەستان، لەشارێکی وەك دیمەشقدا، کە کوردی عێراق و هێزە بەرهەڵستکارەکانی تریان دەزگای خۆیانیان تیادا هەبوو، کەچی نەیدەویست هەڵس و کەوتیان لەگەڵدا بکات، ئەوەش ڕاستی ئەو لافلێدانەیانی پووچەڵ دەکردەوە کەگوایە هەمووداوایەك بەڕێنسای حاڵەت بەحاڵەت لێیدەکۆڵرێتەوە، چوونکە سەرکردە کوردەکان کەبەپاریسدا ڕەتدەبوون، بۆچوونە ناو باڵوێزخانەی وڵاتە یەککرتووەکان، ئەویش نەك بۆ ڤیزە وەرگرتن بەڵکو هەر بۆئەوەی باسێکی کێشەکەیان لەگەڵ واشنتۆندا بکەن پەنایان بۆ یەکێکی وەك نووسەری ئەم کتێبە دەهێنا، کەئەریش بەهەمان ئەنجام دەگەیشت.

جۆرج شوڵتزی وەزیری دەرەوەی ئەوڕۆژگارەی ئەمریکاش بەهەمان شێوە ڕەفتاریدەکردو بەشێوەیەکی گشتی زۆری پێناخۆشبوو کەشتێکی لێبشاردرایەتەوە بەتایبەتیش گەر ئەو شتە بەهاوپەیمانێکی ناتۆوە بەندبوایە. لەوپەڕی تووڕەبوونیا، خۆی لەبەرپرسەکەی دەرەوەی ئەمریکاو چاوپێکەوتنەکەی تاڵەبانی بەدەرنا، کەهەر لە بنەڕەتا بۆ سەرنجڕاکێشانێکی دیپلۆماتیانەی عێراق داڕێژرابوو بەڵام خراپ شکایەوە، سەرەڕای ئەوەش بەغدا لە ئۆگستۆسدا دیسانەوە بەخەستی گازی ژەهراوی لەدژی چەکدارو بێچەکەکانی کورد بەکارهێنایەوە. هەندێک لەباڵادەستانی وەزارەتی دەرەوە لەوبڕوایەدا بوون، ئاکامی ئەو ڕووداوە سەدام حسێنی گەیاندە ئەو بڕوایەی کەپێی وابێت زۆرشتی بۆ دەچێتەسەر، بۆیە هەر دوای ئەوە بەچواردەمانگ کوێتی داگیرکرد.

بۆئەو خوتەو بێزاری تورکیا، کەیەکبینە لەوەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا درێژدادڕیان سەبارەت بەپێوەندی ڕەسمی لەگەڵ کورددا دەکرد وەك دواتر دیپلۆماتێکی ئەمریکایی دەربڕی وای لێهاتبوو لەگەڵ هەموو ئەو گۆڕانکاریانەی بەسەر بارودۆخەکەدا هاتبوو، کەس پرکێشی نەدەکرد بیکات. لەڕۆژانی کێشەکەی کوێتدا کوردو سەرچاوە بەئاگاکان لەندەن، ڕەفتارەکانی دەرەوەی ئەمریکا بەڕادەیەك سەرسامی کردبوون، تەنانەت بڕوایان بەو پڕوپاگەندانەش دەکرد گوایە لە ١٩٨٨دا فەرمانێکی سەرۆکایەتی دەرچوو جێبەجێشکرا، کەتەنیا CIA بۆیان هەبێت وەك بەرپرسێکی ئەمریکا لەگەڵ بەرهەڵستکارە عێراقییەکاندا بدوێن.

لەئابی ١٩٩٠دا کە عەرەبی سعودی ڕێیدا سوپای وڵاتە یەکگرتووەکان لەسەر خاکیابێت، تورکیا بەهاندانی سەرۆك ئۆزال، بڕیارێکی گرنگی دەرکردو دەستبەجێ بۆرییە گەورەکان کەبەناو خاکی تورکیادا نەوتی خاوی عێراقیان دەگەیاندە دەریای سپی داخست، بەوە تورکیا بووە یەکەم وڵاتی ناوچە کەبچێتە ناو ئەو هاوپەیمانێتییەی کە ئەمریکا دژبە سەدام سەرۆکایەتیدەکرد. هەرچەندە تورکیا دەبوا ملکەچی جێبەجێکردنی بڕیاری نەتەوە یەکگرتووەکانی تایبەت بەگەمارۆی ئابووری سەر عێراق بوایە، بەڵام هەڵبژاردنی کاتی داخستنەکە یارمەتیدەرێکی چاکی ئەمریکابوو بۆ هێنانەدی هاوپەیمانێتییەکە. ئۆزال پێی لەسەر ناردنی یەکەی سەربازی، گەر ڕەمزیش بێ دادەگرت. هێزە ئاسمانییەکەی ناتۆو ئەو یەکە سەربازیانەی تورکیا کە بەرامبەر یەکێتی شۆرەوەی ڕاگیرابوون، بۆ سنووری عێراق گوێزرانەوەو، ڕێگەشی بەهێزە ئاسمانییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان دا بنکەی ئەنجەرلیك بۆ بۆردومانکردنی عێراق بەکاربهێنن. تەنانەت تورکیا ئارەزووی ناردنی یەکەی سەربازی بۆ سعودییەی عەرەبیش هەبوو، تا بەشداری لەشەڕی زەمینیشدا هەبێت بەڵام ڕێکخراوە باڵادەستەکەی ژەنەراڵانی

تورکیا رایانگرت. ئۆزال بەمجۆرەو بەتوندی بەسەر هەردوو دەزگا سەربازیی‌و مەدەنییەکەدا زاڵبوو، کە ڕەتکردنەوەی دەستخستنە کاروباری ناوخۆی وولاتانی ئیمپراتۆریەتە کۆنەکەی عوسمانی، بەتایبەتی عەرەبییەکانیان بەپیرۆز دادەنا. ئامۆژگارییەکەی ئەتاتورکی لەسەر بێلایەنێتی لەگەڵ خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا "ئاشتی ناوماڵ‌و دونیا"، کە تورکێکی زۆری والێکردبوو "قژی عەرەب" بەمەسەل بۆ ئیشی نابەجێ‌و گاڵتەکردن بەکارێکی شەپرە بهێننەوە، گوایە لەمێشە ئاڵۆزەکانی دراوسێیانی خوارخۆیان دەچێت، توڕدایە زبڵخانەی مێژووەوە.

لەکاتێکدا واشنتۆن لەترسی زۆربەرەوونی تورکیا خۆی لەپێوەندیکردن بەکوردی عێراقەوە دەپاراست، چونکە هیچ حکومەتێکی خۆرئاوا بەبیریا نەدەهات ئۆزال بنەما پیرۆزەکانی ئەتاتورك پشتگوێ بخات، کەچی بۆ سوودی هاوپەیمانان‌و هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ کورددا، ئەوەی بەتەواوەتی هێنایەدیی‌و بیری لەپێوەندی توندتر بەکوردەوە کردەوە.

ئۆزال گەر ژیرانە بیری نەکردایەتەوە هیچ نەبوو، هەر لەدەستپێکردنی کێشەی کوێتەوە بەئاشکرا وتی، دەبێ سەدام حسێن نەهێڵین. تورکیا وەك تاکە دراوسێیەکی عێراق کەهیچ پێوەندییەکی بە بەرهەڵستکارە عێراقییەکانەوە نەبوو، نەیدەتوانی وەك واشنتۆنێکی دوور لەعێراق بکات، بەپێویستیشی نەدەزانی کەوا بەبێناگایی لەهەواڵی سیاسەتی عێراق بمێنێتەوە، چونکە عێراقی بێ سەدام حسێن قسەی زۆری هەڵدەگرت، شتێکی زۆر ئاساییە، ئەوەی زیاتر "خزمەتی تورکیا دەکات پێوەندییەکی باش‌و کۆکە لەگەڵ هەر لایەنێکدا کەدەستەڵاتی بەسەر ٢٠٦ کیلۆمەتری سنوورەکەیاندا هەبێت، دیاربوو کەئەو لایەنەش کوردەکانی عێراقن، بەتایبەتی مەسعود بەرزانی‌و "پارتی دیموکراتی کوردستان"ەکەی، ئەوەش وایەکەیاند کەدەبوا چاوپێکەوتنی لەگەڵ سەرکردایەتی کوردی عێراقدا ببێت.

لەدواڕۆژەکانی کانوونی دووەمی ١٩٩١دا، من بەبێنەوەی مەبەستم بێ کەوتبوومە ناوگێژاوی دژایەتی دەزگا ئاساییەکانی ئۆزالەوە. ئۆزال لەچاوپێکەوتنە ڕۆژنامەگەرییە یەك لەدوای یەکەکانییەوە، کە وەك هێڵێکی بەرهەمهێنانی تەکنۆلۆژیا، تەنیا چارەکە سەعاتێکی بۆ هەر ڕۆژنامەنووسێك تەرخاندەکردو، بەدەم کەمترین هەواڵی گرنگەوە کەڕۆژنامەنووس منەی بکەن ناوی نرابوو، قسەکانی خۆی دەکردو ئاکامیش هەر ئەو هەواڵە سەرەکییانەی دەرکاند کەلەسەرکردایەتی وولاتەوە دەردەچوون‌و ڕۆژنامە تورکییەکانی پێ شاددەکرد. لەکاتی چاوپێکەوتنێکی کوتوپڕی نیوەناچڵدا هەرچۆنێك بوو پرسیارەکەمکردو، لێم پرسی، بۆچی یەکبینە ڕێگرتنی تورکیا لەئاست دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆ کورد، لەباکووری عێراقدا دووپات دەکاتەوە. من تازە لەشام گەڕابوومەوە، لەوێ جەلال تاڵەبانی‌و چەند کوردێکی

دیش بەتووڕەییەوە تکوڵیان لەنیازێکی وادەکردو، پێیان لەسەر ئۆتۆنۆمی ناو عێراقێکی دیموکرات دادەگرتو هێنانەدی ئەوەیان بەباشترین هیوا دادەنا. لەئۆزالم پرسی، ئەگەر حکومەتێکی ناوەند لە عێراقی دوای سەدام حسێندا بەئۆتۆنۆمی کوردی عێراقی قایلبێتو لەناو خۆشیاندا هێند کۆکبن کە سنوور بەچاکی دابنێن، داخۆ بۆ دەبێ ئێوە بەئەنجامەکەی ناقایلبن؟ ئۆزال وەڵامەکەی بەئاماژەکردنێکی نادیار دایەوە، بەوەی کەلەگەل کوردی عێراقدا یەکدەگرن. کاتەکەی بۆیان دیاریکردبووم کۆتایی هاتو بێ هیوا ڕۆیشتم.

ڕۆژی دواتر "کایا تۆپێری" قسەکەری ئۆزالو سەرۆکی پێشووی ڕۆژنامەی وەزارەتی دەرەوە لەدووم هاتو باشترین ڕێزی لێگرتم کەپەیامنێرێك بەهیوای بێت، وتی: پرسیارەکانت لەوەڵامەکانی سەرۆکیان باشتر هەڵدەگرێت. بەڕای تۆ، داخۆ ئێمە پێویستە چاوپێکەوتن لەگەڵ کوردەکانی عێراقدا بکەین؟ منیش ڕەخنەم لێگرتو پێمڕاگەیاند کەمن پەیام نێرم نەك دیپلۆمات. زۆر چاك لەوە بەئاگابووم کە برادەرێکی کۆنو ژیری وەك تۆپێریش دەبێ گومانی دژایەتیکردنی ڕۆژنامەنووسە بیانییەکانی لێبکرێت، چونکە ئەوە ئەتواری خەڵکی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستو، ئەو لایەنەسەکە ئەو کاریان بۆ دەکات، من دوور لەبەرپرسیارێتی قسەکەی خۆم، پێشنیارم بۆکرد کەڕەنگە ئەو چاوپێکەوتنە هیچ خراپەیەکی بەدوودا نەیەتو، بەڕاستی پێشەچێ چاکەی لەدوابێت. لەگەڕاندنەوەمدا بۆ ئەورووپا، کەدەمویست لەوێوە بەفڕۆکە بۆ تاران بچمەوە، کورتەیەکی وەڵامدانەوەکەیم، لەسەر ئامێرە وەڵامی تەلەفۆنی نوێنەرێکی کوردی عێراق لە لەندەن تۆمارکرد. هەر ئەوەش هۆیەکی سەرەکی بوو، کە هەفتەی دواتر بەرزانی لەناوچەیەکی شاخاوی "ڕایات" دلو لەچاوپێکەوتنێکماندا، دووبارە تۆمارگەی حیزبەکەیم، لە شۆڕشەکەی ١٩٦١ی باوکییەوە بۆ بکاتەوەو، باس لەوەبکات کەسنووری عێراق تورکیا هەمیشە لەئاژاوە پارێزراوە.

خۆ ئەگەر ئۆزال دوای خوێندنەوەی ئامۆژگارییە کورتەکانی بەرزانی کەلەواشنتۆن پۆستدا بڵاوکرابۆوە شتێکی کردبێت، ئەوا قسەلێکردن هەڵدەگرێت. (واش سەبارەت بەڕوونکردنەوەکەی ١١ی مارتی ئۆزال، کە کارتی چاوپێکەوتنی کوردەکانی بەرزکردەوە، ڕۆژنامەی تورکیا، کەلەئاست ڕووداوەکاندا بەنەرم ناسراون ڕایانگەیاند، کە ڕۆژنامە نووسێکی ئەمەریکایی سەربە CIA دەستێکی زۆری لەوەدا بووە، بەڵام شانسی خۆم ناوم نەمێنرابوو). دوای دوو هەفتە، کەمێنشتا هەفتەیەکی بۆ شەڕی زەمینی مابوو، ئۆزال لەگەڵ چەند ڕۆژنامە نووسێکدا بەشەمەندەفەرێك ڕووداوەکانی بەسەرکردەوە، بەو هۆیەوە ڕێگای بۆ بانگهێشتکردنی سەرکردە کوردە عێراقییەکان، کە بەنهێنی چووبوونە ئەنقەرە، خۆشکرد. ئۆزال تەواو خۆی بۆ

چارپێکەوتنەکە ئامادەکردبوو. زۆر لەپێش گەیشتنی ئەواندا بۆ ئەنقەرە، فرمانی بەوەزارەتی دەرەوەو تۆژیری دابوو، زۆر بەقوولی بەهەموو سەرچاوە پێوەندیدارەکانی کێشەکەدا، کەلە ئەرشیفی دەوڵەتدا هەبوون بچنەوە. هەرخۆشی بۆی باسکردم کە "سێ سەد تا چوارسەد لاپەڕەم، لەبەسەرهات و ئەرشیفی عوسمانی و لێکۆڵینەوەکانی کۆمەڵەی نەتەوەیی و پەیمانی لۆزان، خوێندۆتەوە" ئەمەی دواییان وەك باسمکرد، بەهۆی پێدالگرتنی ئەتاتورکەوە، ناوی کوردی لەکۆلەکەی تەرپشدا نەهێنابوو، دیسانەوە گێڕابوونییەوە بۆ ئەو ساڵە دوورو درێژانەی کە بەرەسمی لەبیر کرابوون.

"جەنگیز چاندار"ی رۆژنامەنووسی تورك، لەشەڕی بیروتی ساڵانی حەفتاوە ئاگاداری دونیای عەرەب بوو. پێشتر لەگەڵ ئۆزالدا یەکتریان نەدەناسی، بەڵام دوای داگیرکردنی کوێت هەرزوو ناوە ناوە یەکتریان دەبینی. چاندار، کەلەنووسینێدا توانایەکی لەڕادەبەدەری هەیە، سەرۆك ئۆزال پێی راگەیاندبوو "ئەو شتانەی کەمێشتا من بیرم لێنەکردونەتەوە" بەتایبەتی ئەو دووانەی بەچاوی خۆیان دیویانە، دەبێت وەك میراتێکی ئۆزال کەبایەخی زۆری پێدابوون هەوڵی پیرۆزی پاکڕاگرتنیان بۆ بدرێت، چارەسەرکردنی کێشەی کوردی تورکیاو، پێوەندییە راگیراوەکەیان لەگەڵ عەرەبە دراوسێکانیاندا.

چاندار هەرئەوکاتە چاوی بڕیبووە ئەو شوورەیەی بەدەوری کەسانێکدا هەڵچنرابوو، کە پێدەچوون جێگرەوەی سەدام حسێن بن، ئەویش بووە هاندەرێکی تری گفتوگۆکردن لەگەڵ کوردی عێراقدا. ئۆزال بڕوای زۆری بەوەزارەتی دەرەوە نەبوو، چونکە زۆر بەزەقی ملکەچی بنەماکانی ئەتاتورك بوو. چاندار لەبارەی وەرگرتنی کوردەکانی لەندەنەوە، بۆ سەردانی ئەنقەرەو لێکۆڵینەوە لەدوارۆژ، ناوی هاتە پێشەوە.

ئەو لە لەندەن کەسی نەدەناسی، بەڵام لە ١٦ی شوباتدا کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ سەرۆکی بەرهەڵستکارە عێراقییەکان "ئەحمەد چەلەبی" دا رێکخست، کەمەلاتوومیەکی شیعەی شارەزای کاروباری بانکەو، دۆستێکی راستەقینەی کوردەو لە لاوێتییەوە، لە حەفتاکانەوە بۆ چەند کەڕەت یارمەتی ژەنەڕاڵ بەرزانی داوە.

چاندار کەناوی ئۆزالی لای چەلەبی هێنا، بەرێکەوت تاڵەبانی لە لەندەن بوو، بۆیە چەلەبی تەلەفۆنی بۆکرد. بۆ رۆژی دوایی چاوی بە تاڵەبانی و نوێنەری بەرزانی لە لەندەن، موحسین دزەیی، کەوت. لەسەردانە هیوا بڕەکەی ئابی رابردووی واشنتۆنی تاڵەبانییەوە، سەرکردەکانی کورد بەڕادەیەك لەبەرهەڵستکردنی تورکیا دڵنیابوون کەبەهیچ جۆرێك بیریان لەنزیکبوونەوەی

ئۆزال نەدەکردەوە، بەڵام کەخەریکبوو شەڕی زەمینی دەستپێبکات، تاڵەبانی و دزەیی قایلبوونی خۆیان بۆ سەردانێکی تورکیا دەربڕی.

ئەم گۆڕانکارییە کوتوپڕ نەبوو، چونکە شەوی پێشتر لەدەستەنبوڵەوە، کامەران قەرەداخی کە کوردێکی عێراقەو نووسەرێکی کاروباری دەرەوەی ڕۆژنامەی "الحیاة"ی لەندەنی سعودی خاوەنە، تازە لەچاوپێکەوتنێکی نائاسایی ۹۰ دەقیقەیی سەرۆك ئۆزال ببۆوەو، تەلەفونێکی بۆ تاڵەبانی کردبوو. لەو هەموو پرسیارانەی ئۆزال سەری سووڕمابوو، کەبەزۆری گوێی دەگرت و کەمتر قسەی دەکرد، تا سوود لەزانیارییەکانی قەرەداخی وەربگرێ و، بەهۆزیەوە قوڵتر لەباری کوردە عێراقییەکان بکۆڵێتەوەو بشزانێ سەرکردەکانیان کێن و کێ نین؟ بەو بۆنەیەوە نەخشەیەکی کوردستانی عێراقی لەبەردەم خۆیدا دانابوو. ئۆزال سەرسامێتی خۆی لە؛ بەزمانی خۆدوان و، بەکوردی نووسین و بڵاوکردنەوەو، بوونی زانکۆی تایبەتی، کوردە عێراقییەکانی پێنەدەشاردرایەوە.

تکایە، تکایە بەکوردە عێراقییەکان بڵێ دەبێ بڕوام پێبکەن. ئۆزال ئەوەی بە قەرەداخی دەوت و، ڕاشی دەگەیاند کەدەکرێ تورکیا کوردی عێراق بپارێزێت. ئۆزال لەدەمی دەرچووبووکە گوایە ئەنکی کوردەو، دەریشیخستبوو کەپلانی داناوە بەزووترین کات یاسا "زۆر خراپ"ەکەی تورکیا، کە لەڕژێمە سەربازییەکەی ۱۹۸۰-۱۹۸۲وە بۆی ماوەتەوەو قەدەغەی بەکارهێنانی زمانی کوردی کردووە، لابەرێت. کاتێك ئۆزال لەبارەی پێوەندیی کوردی عێراق بە کوردە یاخییەکانی پارتی کرێکارانی کوردستانی تورکیاوە پرسیاری کرد، قەرەداخی بەبەرپرسیارێتی و دەستپێشکەری خۆی وەڵامی دابۆوە "سەرۆکی بەڕێز بۆ چاوپێکەوتنێك لەگەڵ سەرکردەکانی پێشمەرگەدا ناکەیت؟ من زۆر دڵنیام کەئەوان حەز دەکەن ڕوو بەڕوو بتانبینن".

ئۆزال لەوێدا هیچی نەوتبوو، بەڵام بێگومان دەستپێشخەرییەکەی چاندلری لە مێشکابووەو، بەئەنقەستیش چاوێکی بڕیبووە ئەزپێری، کە خەریکی نووسینەوەی سەرنج و تێبینی بوو. قسەوباسەکانی دانیشتنەکە هەر هەمووی نووسرانەوە جگە لەو بەشەی بەکوردەوە بەندبوو. قەرەداخی پێشتر لەتشرینی یەکەمدا چاوپێکەوتنێکی تری لەگەڵ ئۆزالدا کردبوو، ئەو پێشنیاری بۆ کردبوو کە سەرکردەکانی کورد لەتورکیاو نزیکببنەوە، ئەوانیش لەوبڕوایەدا بوون کەتورکیا دوژمنێکی دڵڕەقەو جێی هیوانییە، بەڵام چاوپێکەوتنی دووەمی ئەوەی بڕییەوە. قەرەداخی ڕاست دەگەڕێتەوە بۆ ئوتێلەکەی و تەلەفۆن بۆ تاڵەبانی دەکات لە لەندەن: "داوام لەئۆزال کرد پێوەندیتان لەگەڵدا دابمەزرێنێت، داخۆ ئێوە ئەوە پەسەند دەکەن؟" تاڵەبانی

پەسەندیکردو بەقەرەداغی وت، کە بەڕەسمی بە ئۆزال رابگەیەنێت خۆی و بەرزانیش (ئەگەرچی پاشان دەرکەوت کەموحسین دزەیی نوێنەری بەرزانییە) دەیانەوێ چاوپێکەوتن لەگەڵ حکومەتدا بکەن. سەرلەبەیانی زووی رۆژی دواتر قەرەداغی، تا بەر لەگەڕانەوەی لەندەنی هەوڵەکە بگەیەنێت تەلەفۆن بۆ تۆپێری دەکات، بەڵام تۆپێری لەجێگەکەی خۆی دەرچووبوو دوای حەفتا ساڵ بەسەر یەکەم نامە گۆڕینەوەی رەسمییانەی نێوان کوردو حکومەتی تورکیا، ئاسایی بەنامەیەکی کورتی قەرەداغی بۆ تۆپێری دەستپێکردەوە، نامەکە چەند تێبینییەکی بەزمانی ئینگلیزی تیادابوو، خرابووە زەرفێکەوەو "تایبەتی و نهێنی" لە پشتەکەی نوسرابوو.

هێشتا هەفتەیەکی پێنەچووبوو، تۆپێری جەختی لەقەرەداغی کردەوە کەحکومەتی تورکیا چاوپێکەوتنی کوردە عێراقییەکانی مەبەستە، گەر رێك بکەوێت لە لەندەن یان ستۆکهۆڵم بەڵام هەرچۆنێك بێت با پێش ١١ی مارت بێت، چونکە ئۆزال لەو رۆژەدا سەفەری مۆسکۆی لەبەرە، هەدووڵا واپێکهاتن لە ٩،٨ی مارتدا لە ئەنقەرە چاوپێکەوتنەکە بکەن. ئەگەرچی بۆ کوردە واباشتربوو یەکسەر داوای کۆبوونەوەکەیان بکردایە، تا هانی ئۆزالیان بدایە کارێکی وابکات لەواشنتۆن بەڕەسمی پێشوازیبکرانایە، چونکە پەسەندکردنێکی لەم بابەتەی واشنتۆن بۆ کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی پێویستبوو. خۆ ئەگەر زووتر، پێش راپەڕین هەنگاویان بنایەو لەەی مارتدا کۆببونایەتەوە، ئەوا ئەو هەموو تەمومژو ئەشکەنجەو ئازارە ڕووی نەدەدا، کەچی تاڵەبانی لەبڕی وای بکردایە بەو نیازەی ئەمەریکاییەکان قایل بکات وازلەنەبینینی کورد بێنن، ئەوسا پێوەندی لەگەڵ ئەنقەرەدا دەستپێبکەن، ڕووەو واشنتۆن بووەوە. لەوەدەچێ دیسانەوە گوێیان پێنەدابێ، یان جارێکی تریش کورد دارەکەی لەسەرە چەوتەکەیەوە گرتبێ. سەرکردە کوردییەکان هیچ حسابێکیان بۆئەوە نەکرد کە دەبوا ڕاپەڕینەکەی کوردستانیان لەدوا رۆژەکانی شوباتدا بکردایە، کەهێشتا شەڕی زەمینی هەر بەردەوامبوو، ئەگەرچی هەنگاوێکی زۆر پڕ مەترسی بوو، بەڵام وەك دیپلۆماتێکی ئەمەریکایی بەناوبانگ دەرکی پێکرد، ڕەنگە لەبەرژەوەندیان بوایە چونکە "ئەوسا سوپای عێراق هەڵیدەکوتایە سەر کوردو، چوارزکۆڤیش لیدانیانی بەئەرکی خۆی دەزانی" دیپلۆماتەکە درێژەی بە بۆچوونەکەی داو "ئەوکاتە بڕیاری جیهانیشی نەدەویست و هێزی ئاسمانی ئەمەریکاش بەخۆشییەوە نیشەکەیانی مەیسەر دەکرد" دوور نەبوو شتەکان هەموو جێگای خۆیان بگرتایە، دیپلۆماتەکە وتی: "کورد دەبوا ئەوەندەیان لەچۆنێتی کارکردنەکەی ئەمەریکا بزانیبا" بەڵام خۆبەدوورگرتنی ئەمەریکا لێیان وایکرد ئەوە نەیەتەدی و "دەرفەتی گۆڕانکارییە بنەڕەتییەکەی عێراقیش لەدەستچی".

کارێکی بنەڕەتی وا لەئارادا نەبوو، بۆیە بەڕێوەبەرایەتییەکەی بوش هەر لەسەر بیروڕا کۆنەکەی مابۆوە، هەرچەندە لە دواساتەکاندا ترووسکاییەك بەدیارکەوت، کاتێك ئەبرا مۆفیتزی باڵوێزی ئەمەریکا بەئاسمانی ئەنقەرەوە بوو هەستی بە جووڵانەوەیەك کردو یەکسەر بروسکەیەکی بۆ وەزارەتی دەرەوە ناردو تیایدا پێشنیاری کرد، کە ئیتر کاتی ئەوەهاتووە قسە لەگەڵ کورددا بکرێت، بەتایبەتی ئەگەر بەشێکبن لە نێردراوێکدا کەنوێنەرایەتی سەرجەم بەرهەڵستکارە عێراقییەکان بکەن و، تورکیاشی لێئاگادار بکرێت. ئەبرامۆڤیتز دەڵێت: ئەوەی پەیوەندییم پێوەکردبوو "پێندەکەنی و دەیپرسی دەبێ بۆچی واملێهاتبێ؟" ئەوسا بەرهەڵستکردنەکەی خۆی بیرکەوتبۆوە، کە لەترسی زوێربوونی تورکیا، زۆر بەتوندی دژایەتی ئەوجۆرە پێوەندییانەی دەکرد. بەدەنگەوەنەچوونی بروسکەکە کوتبینێتی خاڵێکی چەواشەکردنی تری واشنتۆن بوو لە بەرپابوونی کارەساتەکەدا.

لەو ١٠.٩ی مارتدا، کە "تۆزنگای ئۆزچیری" یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی تورکیا، لەمیوانخانەیەکی سەر بە "رێکخراوی هەواڵگرانی تورکیا- MIT" پێشوازی لەتاڵەبانی و دزەیی دەکرد، تورك و کوردە عێراقییەکان ئەوەی بیریان لێنەدەکردەوە هەرەسهێنانی راپەڕینەکەبوو. ئۆزچیری گوێی بۆ سەرۆکە کوردەکان گرتبوو، کەبەدەنگێکی دلێر باسی دەستکەوتی پێشمەرگەی ناو عێراقیان دەکردو، چۆنێتی هێنانەدی هاوکاریکردنی دوابۆژیان لەگەڵ تورکیاشدا شیدەکردەوەو، داوای یارمەتی مرۆڤانەو سەربازیانەیان لە تورکیا دەکردو، ئەوەشیان لێدەویست کەمەولی لای کۆمەڵگە دەوڵەتییەکان، بەتایبەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایان بۆبدات تا هاریکارێتی بکەن.

لەوەدەچوو کاتی پشتگوێخستنی ئەو شتانەی ئەتاتورك هاتبێت کەببوونە کۆسپ لەرێگەیاندا، بەتایبەتی کەشەڕی سارد لەکۆتاییهاتنابوو، تورك لەگەڵ کۆنە دوژمنەکانی ئەرمینیایان کەوتبوونە وتووێژ. ئوزچیری تێبینییەکانی ئۆزالی بەدڵبوو! "کاتێك خەڵکی هەموو پێکەوە وتووێژ دەکەن، دەبێ ئێوەش لەکەوڵەکەی خۆتاندا نەمێننەوە"، ئۆزال ئەمەی بۆ هاوڕێ دیپلۆماتە بیرتەسکەکانی وەزارەتی دەرەوەی باسدەکرد کە زۆربەیان بڕوایان پێینەبوو.

دوای چاوپێکەوتنە چاوەڕواننەکراوەکەی یەکەمی ئۆزچیری و کورد، ئۆزال کۆبوونەوەیەکی بەئەنجومەنی وەزیرە باڵادەستەکان و سەرۆکی ئەرکانی سوپاکردو، شتێکی خستەڕوو کەزۆر کەم باسی لێوەکرابێت. لەو کۆبوونەوەیەدا کارێکی وایکرد کەزیاتر ئەوان قسەبکەن، تا بۆ جەختکردن لە دەستپێشخەرییەکەی یارمەتیدەرێن، ئەتەوەییە توندڕەوەکانیشی بەڕەوایی پاراستنی کوردی بەردەم هەڕەشەی عێراقییەکان بەو بەڵگەیە قایلکرد کە لەگەڵ کوردەکانی

خۆیاندا هاوڕەگەزن و، وەك چۆن بەرژەوەندی یاساییان لەپارێزگاریکردنی کەمایەتییە تورکەکەی ناو بولگاریاو قوبروسدا هەبوو، لەپارێزگاریکردنی ئەمانیشدا هەیانە. واش کە ئۆزال شتەکانی بۆ خەڵکی خستەڕوو، ڕۆژنامەو ڕێکخراوە تورکییەکان مەترسییان بەرامبەری پیشاندا، کەچی چەند هەفتەیەکی نەبرد ئۆزال بەئاشکرا پێشوازی لەسەرکردەکانی کوردی عێراق کرد، ڕاستییەکەی سیاسەتمەدارانی حوکمەت و بەرهەڵستکارە کانیشیان پێشوازیان کردن. ئۆزال لەپەیمانەکەیدا ڕاستگۆبوو، گورج پێشنیاری بۆ بەڕێوەبەرایەتییەکەی بوش کرد کە گفتوگۆ لەگەڵ کورددا بکات.

سەرەڕای زیرەکی و کارامەیی ئیبراماویتز، نەیتوانی پەی بە هەنگاوە خێراکانی ئۆزال بەری و جێپێنشی هەڵگرێت، تا ڕادەیەك دڵگرانیبوو لەوەی ئۆزال پێشەکی لەهیچ ئاگاداری نەکردبوو، تەنانەت کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ تاڵەبانی و دزەییدا لەڕۆژنامە تورکییەکانەوە زانیبوو. سەرجەم هەوڵ و مەبەستەکان بەلای وەزارەتی دەرەوەوە هیچ گرنگیپێدانێکیان نەدەهێنا، کاردانەوەکەشی لەڕێزی بایەخپێنەدانەکەی وەزارەتی بەرگری "پنتاگۆن" دادەنرا کە بەرامبەر بەو هەوڵە سەربازییە تەکتیکیانەی کورد لە کاتی جەنگەکەدا پێیان دەگەیاندن. بۆیە یەکەمجار کوردەکان ئەم هەواڵە نوێیەیان بە ئەندازیارێکی کوردی ئەمەریکایی گەیاند کە لەشاری میشیگەن دەژیا، ئەویش بە "پیتەر گالبرەیت"ی ئەنجومەنی پیران و لەوێشەوە بۆ پنتاگۆن.

٢٨ی شوبات، کە کوتوپڕ شەڕەکەی کوێتی تیادا ڕاگیرا، کاربەدەستە ئەمەریکاییەکان پێشوازیکردنی نێردراوێکی سەرکردایەتی کوردیان ڕەتکردەوە، کە بەداوای "کلەیبورن پیل"ی سیناتۆری دیمۆکراتی ولایەتی ڕود ئایلاندی سەرۆك لیژنەی پێوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجومەنی ئەوسابوو، گەیشتبوونە واشنتۆن. سەرکردە بەرهەڵستکارەکان، لە لێکۆڵینەوە ڕەسمی و ناڕەسمییەکانیاندا، زۆر بەڕوونی باسی ڕوودانی ڕاپەڕینێکی جەماوەریان لەماوەیەکی کورتدا دەکردو جەختیشیان لەوەدەکرد کە عێراقییەکان زۆر لەسەدام بێزارن و لایەنگری ئەمەریکا دەکەن، کەچی هیچ لێپرسراوێکی بالادەستی ئەمەریکا نەیەویست گوێیان لێبگرێت، تەنانەت "ریچارد چێفنەر"ی یاریدەدەری وەزیری دەوڵەت بۆ کاروباری مرۆڤایەتی کەبەڵێنی بینینی دابوونێ، لەبەڵێنەکەی خۆی پاشگەزبۆوە. کاتێکیش ٣ ئەندامی نێردراوێکی کورد بەپێی بەڵێنێك گەیشتنە هۆڵەکەی وەزارەتی دەرەوە، فەرمانبەرێکی ئاسایی پێشوازیکردن، ئەویش هەر پێشنیاری قاوە خواردنەوەیەکی لەدەرەوەی وەزارەت بۆ کردن کەبەپێی ڕەفتاری دیپلۆماتیانەی ئەمەریکا ڕێز لێنەگرتنی دەگەیاند، کوردەکانیش بەمشتانە ڕاهاتبوون. پێشتر لێپرسراوانی بەشی خۆرهەلاتی نزیك NEA بیانووی تۆماری مافی مرۆڤی بەغدایان بەدەستەوەبوو تا

بەهۆیەوە لەگەڵیاندا قسەبکەن و، ئەمجا بۆ دەزگایەکی چیلتەریان بنێرن. تەنیا "زاڵوەی خالد زادە" کەبەرپرسێکی بەشی جێبەجێکردنی پلانە سیاسییەکانی وەزارەتی دەرەوە بوو، بەڕووی ئەم بارەدا وەستایەوەو، لەسەردانێکیا بۆ واشنتۆن بەرپرسێکی کوردی لەبەڕێوەبەرایەتی دەزگای پیروکینز بینی و، رێکەوت چاوپێکەوتنێکی سەرپێیانەی لەگەڵدا بکات، بەڵام کەپێیانوت ئەوە پێویستی بە بڕیارێکی NEA هەیە، داوایکرد خۆی لەوەدا سەرپشکبکرێت، کە داواکەیان ڕەتکردەوە، رایگەیاند "بەر لەڕزگارکردنی کوێت هەر بیانوویەك لەئارادا بووبێت، ئابێ دوای جەنگیش هەر هەمان بالۆرە لێبدرێتەوە، بۆیە تەواو وڕبڕکردبووم".

چەند رۆژێك دواتر کەلەکوردستان و خوارووی وڵاتدا ڕاپەڕین دەستیپێکردو چەوتی ئەم سیاسەتە گەمژەییە بەدیارکەوت. لەیەکی مارتدا ئەندامێکی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی وتی: "سیاسەتەکەمان لابردنی سەدام حسێنە نەك ڕژێمەکەی"، کەوادیارە ئاکامی سەرەکی گەمەکەی ئەمریکا لەعێراقدا ئەوە بوو. کۆتاییەکەش واکەوتەوە کەدەبێت عێراق و کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی، تا دواڕۆژێکی دیار خۆ لەبەردەم سەدام حسێن و ڕژێمەکەیدا بگرن، ئەم بەئاشکرا گوێ پێنەدانەی وەزارەتی دەرەوە، دامەزراندنی ڕژێمێکی سەربازیانەی بۆ عێراق لەدەستدا، کەپێدەچوو ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی نیازێکی وای هەبووبێت، چونکە ڕەنگە سەرکردە سەربازییەکانی عێراق ویستبێتیان بزووتنەوەیەك دژ بەسەدام حسێن بکەن، بەڵام شتێکی ئەواویان لەخواستی واشنتۆن نەدەزانی و، سروشتی داخراوی ڕژێمە خۆسەپێنەرەکانیش وایانکردبوو، هێزی شاراوەی بەرهەڵستکارە سەربازییەکان دەبوا ئاماژەیەکی ڕوون و ئاشکرای پشتگیری واشنتۆنی بکەیشتایەتێ کەدژ بە عێراق سەرکردایەتی هاوپەیمانانی دەکرد. خۆ کە ڕاپەڕین بەرپاکراو تەشەنەی کرد، سەرکردە سەربازییەکانی عێراق لەکاری بەرهەڵستکاران وورد دەبوونەوە تا بزانن بەچیدەگات، کە زانیان واشنتۆن بایەخی پێنادا ئیتر ئەمانیش بێدەنگیان لێکرد.

زۆری نەبرد خۆدوورگرتنی هاوپەیمانان لەبەرهەڵستکارانی عێراق، کۆمەڵە گرفتێکی لێبۆوەو مەترسی زۆرتریشیان لەئەنجامی پشتگوێخستنە بەئەنقەستەکەی ئەمریکا بۆ پەیدابوو، کە تا مانگێك لەئاست ڕووداوەکانی عێراقدا خۆیان کردبووە کەڕەی شەریەت، وەك بڵێی ڕووداوەکان هەرچۆن و چییەك بن، هیچ پەیوەندییەکی بەوانەوە نەبێت دووراودوور سەریاندەکرد، تا لەمانگی نیساندا بەسەدان کورد لەچیاکاندا گیانیان لەدەستداو بووە زەنگلێدانێك بۆ بەئاگاهێنانەوەیان و، بەدوایدا کێشەی بەپەلەترین پەنابەرێتی لەمێژووی سەردەمدا تەنییەوەو تێیانئاڵا، ئەمجا وشیاریکردنەوە.

"فردریك كیونی" دەڵێ: سەرەتای نیسان واشنتۆن كەوتبووە ناو گێژاوێكی تەواوەوە، هیچ كەسێكیش لەوەزارەتی دەرەوەدا نەیدەزانی چیبكات، هەریەكەو بەرپرسێتییەكەی دەخستە ئەستۆی یەكێكی دی.

كیونی، كەخەڵكی تەكساسەو پێشتر شارەزاو پسپۆڕی كارەساتبووەو،دەیان ساڵ بیرۆكراتە بەتەمەنەكانی ترساندبوو، دواتر وازی هێناو ئیشی بۆ خۆی دەكرد، شێوازێكی زیرەكانەو سەرسوڕهێنەری هەبوو شتەكەی بەلاوە سەیرنەبوو، چونكە لەمانگی كانونی یەكەمدا سیناریۆیەكی لەبەردەم نووسینگەی كاروباری پەنابەرانی سەر بە وەزارەتی دەرەوە دانابوو: ڕاپەڕینێكی بەهێزی كورد، تێكشكانێكی گەورەی كورد، ڕەوێكی زۆر مەزنی كورد. كاتێكیش وەك ڕاوێژكارێك ئامۆژگاری بەحكومەتی دوور وڵاتی كوێت دەدا، تا دوای ڕزگاركردنی وڵاتەكەیان بزانن دەبێت چی بكەن‌و چی نەكەن. بیرۆكراتیەكانی وەزارەتی دەرەوە گوێیان لەبۆچوونەكانی گرت بەڵام هیچیان بۆ نەكرد، پێیان وابوو گەر پلانێكی وا دابنێن تیایدا حساب بۆ ڕەگەزێكی وەك كورد بكرێت، ئەوا ڕەنگە بەوەلێكبدرێتەوە كەدەیانەوێ ڕاپەڕینێكی وا بەرپابكەن كە پەرتكردنی عێراقی بەدوادا بێت. پێش ئەوەی بۆ كوێت بكەوێتە ئیش، لەپاشملە زۆریان گاڵتەپێدەكرد، بەڵام ئەو تا خۆشگوزەرانی بۆ خۆی دابینبكات چاوی لەسیناریۆی كارەساتەكە بڕیبوو، لەكاتێكدا بەڕێوەبەرایەتیی ئەمەریكا گاڵتەی پێدەهات، بەڵام واكەوتەوە وەك ئەو وتی.

بەهەرحاڵ بیرۆكراتییەكان لە خێرایی و بەربڵاوی ڕاپەڕینی كوردستان‌و شیعەی خوارووی عێراق (كە لەنزیك هێزە سەربازییەكانی وڵاتانی یەككگرتووەوە، یەكە سەربازییەكانی عێراق ڕاپەڕینەكەیان دادەمركاندەوە)و حەپەسابوون، چونكە هەر بیریان لەپەنجا- سەد هەزار پەنابەرێك كردبۆوە، وەزارەتی ئەمەریكا خۆی دانی بەوەدانا، ڕێنەدان بەگفتوگۆكردن لەگەڵ بەرهەڵستكارانی عێراقدا وای لێكردبوون كە ئەو پەلامارە گەورەیەو ڕەوەكە زۆر لێكنەدەنەوە. پلاندانەرانی بەڕێوەبەرایەتی ئەمەریكاش لەكاتی لێكۆڵینەوەكانیاندا یەكبینە كەمی زانیارییەكانی خۆیانیان دەكردە بیانوو، كە گوایە هەموو كارە گرنگەكانی خۆیانیان بەرپێیە داڕشتووە.

ئێمە بەشداریكردنی شارنشینەكانمان لەو ڕەوەدا بەلاوە سەیربوو. ئەوە قسەی پسپۆڕێكی بەشی خۆرهەڵاتی نزیك بوو، چونكە ڕۆژگاری ساڵی ١٩٧٥ی هەر لەیادبوو كەشارنشینییەكی زۆركەم تیایدا بەشداربوون، بەڵام ئەوەی لەبیرچووبوو كەدواتر سەدام حسێن بەپلانێكی داڕێژراوچی بەكورد كرد، ژیانی كۆمەڵایەتیانی لەبن‌و بێخەوە دەركێشاو بۆ مەبەست‌و

ئامانجەکانی خۆی هەموو کوردی کردە شارنشین، جا ئیتر لەشاردا بژیاتایە یان بەزۆرەملە لەخانووی پەرپووتی بەپەلە پێکەوەلکاو بناخنراتایە کەبە پێی پرۆژەیەکی نیشتەجێکردن لەنزیک شەقامە سەرەکییەکانەوە دروستدەکران، تا چاودێریکردنیان ئاسان بێت. کوردەکان هەموویان ترسی ئەوەیان هەبوو کەسەددام حسێن بەچەکی کیمیاوی تۆڵەیان لێبسێنێتەوە، لای هەمووان ئاشکرایە کەساڵی ١٩٨٨ئەوکارە ئاهەموارەیکرد، بالاٌنەستێکی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا کەزۆر دڵپاکانە وتی: "هەر هیچمان لەبارەی ڕووداوەکانەوە نەدەزانی" ئەوەی سەلماند.

ئەمجارەش وەك چۆن لەهەشتاکاندا، بەڕێوەبەرایەتییەکەی ئەمەریکا لەبەر گوشاری توندی بارە ئابوورییەکەو کاتە ئاسکەکەدا دەستەپاچە وەستا. بەڵام کەبەهۆش هاتەوە، ناچار کیونی بەکرێگرت تا چارەسەرێك بۆ کێشە ئاڵۆزەکەی کورد بدۆزێتەوە، لە ناوەڕاستی نیساندا کاتێك کێونی پێی نایە کوردستانەوە، ئەویش لەو "پشتگوێخستنە بێ ئەندازەیە"ی کاربەدەستە مەدەنی و سەربازییە ئەمەریکاییەکان حەپەسا. وەك کێونی دەڵێ: هیچ کەسێکیان تەنانەت بیرێکی لێڵی والشی نەبوو بزانێت دەبێ لەگەڵ کێدا بدوێت و داخۆ کوردیش کێبێت؟ کەمێجەر ژەنەڕاڵ "جەی. ئێم. گارنر"گەیشت و لە عێراقدا وەك سەرکردەی هێزی هاوپەیمانان کەوتە کار، چەند کورتە زانیارییەکی پرسی، کەس نەیدەتوانی وەڵامی ئەو پرسیارانەی بداتەوە کەبەکێشەی نەتەوەیی و بزووتنەوەو سەرکردەو ڕێکخراوو هیوالو ئامانجەکانی کوردەوە بەندبوون، ئامیلکەی کورتە زانیارییەکان زیاتر بەلاسەی ئەستەق دەچوون، وەك کیونی بیری کەوتەوە تێکەڵ و پێکەڵەیەك بوو دەربارەی سەرۆکایەتی پارتەکان و ئەوانەش کەپێوەندییان لەگەڵیاندا بووە، دوومانگ دواتریش ئەو زانیاریانە هەر ڕێك نەخرا. کۆمارییەکان دەبوا ڕەخنەیان هەر لە خۆیان بگرتایە، چونکە بەڕێوەبەرایەتییەکەی "ڕیگان" هەموو پسپۆڕو شارەزایانی شوێنە چەپەکانی وەك کوردستانی دوورخستبۆوە. پێویستە پێوەندییە بەردەوامەکەی حکومەتی بەریتانیار بەرهەڵستکارە عێراقییەکان بدرخێنەدرێ. کاتێك هێزی دەریایی شاهانەی بەریتانیا چەند کاربەدەستێکی هەرمبیزانی کارامەی بەگەڵ ئەفسەرێکی پلەبەرزخست کەزانیارییەکی زۆری لەبارەی، پێشمەرگەو، جۆری ژیانی عەشیرەتیان و، داب و نەرتیانەوە هەبوو، هێزی دەریایی هۆڵەندەش چەند لاوێکی کوردی پەنابەری سیاسی خۆیی، بەجل و بەرگی ڕەسمی هۆڵەندیانەوە، بۆ ڕێنماییکردن و وەرگێڕان برد.

بۆچوونە ئاساییەکانی بەڕێوەبەرێتی ئەمەریکا، لەڕووی سیاسییەوە سەبارەت بە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، بەهۆی چەند ئامـاژەکردنێکی چەواشەو ئادیاری، وەك دیموکراتی و کارە ڕووخێنەرەکانی شیعە، ناکۆکبوون، چونکە عەرەبی سعودی بەرەسمی ئەو کۆنە ترسەی لەوانەی

هەبوو بەلاوەی نا، سەرکردە دیارەکانی شیعەی ناو بەرهەڵستکارە عێراقییەکانیش بەئاشکرا دڵنیایانکردبوو کەهیچ کارێکی تێکدەرانە لەکانە نەوتی پارێزگاکانی خۆرهەڵاتی ئەودا ناکەن، بۆیە دەبوا بۆ پڕوپاگەندەش بێت ئەوانەی ڕەچاو بکردایە. ڕۆژانی ڕاپەڕینەکە "لێپرسراوانی سعودییە پێشنیاریانکرد کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو سعودییە هەردووك پێکەوە یاریدەی شۆڕشگێڕە شیعەو کوردەکان بدەن". بەڵام وەك دواتر لە ڕاپۆرتێکی ئەنجومەنی پیرانی ئەمەریکادا بەدیارکەوت، پێشنیارەکە پێوەندی بە :دەرئەنجام"ی هەواڵگرانی سەرۆکایەتی ئەمەریکاوە هەبووەو داوای یارمەتیدانی بەرهەڵستکارە عێراقییەکانی کردوە.

بەڕێوەبەرایەتی ئەمەریکا دەستی بەسەر ڕاستییەکانی بەردەمی خۆیداگرت، ئەمجا سعودییەو کوێت کەپارە خەرجکردنیان پێسپێردرابوو، مەترسیان لەسەرئەنجامی کارەکە پەیداکرد کە "گێژاوی ناوچەکە هەر بەعێراقەوە ناوەستێتەوەو ئێران و سوریاو تورکیاش دەگرێتەوە" ئەمە بەقسەی لێپرسراوێکی باڵای خاوەن زانیارییەکی زۆری هەواڵگران، لەسەر قسەکەی دەڕوات و "بۆیە بڕیاریاندا ئەو پشتگیریکردنەی بەپارە دەیکەن، رایبگرن". پێویستە سعودییەکان پرسیاری: "دەبێ ئەمەریکاییەکان بەنیازی چیبن؟" یان لەخۆکردبێت، ئیتر تا نزیك کۆتایی مانگی مارت، بەڕێوەبەرایەتی وەڵامی یارمەتییە سەربازییەکانی پێنەدرایەوە، بۆیە لە سێیەم هەفتەی مانگی مارتدا سعودییەکان "ووشیار زێباری"یان، کە یەکێکە لەنزیکە ناسراوەکانی بەرزانی، بۆشاری "ریاز" بانگکردو سەبارەت بە هاوکاریکردنی نێوانیان کەلە ئاستێکی بەرزو کۆکدایە، دەستیان بە لێکۆڵینەوە کردبوو. بەڵام کە "هاس" لەگەڵ "برینتسکۆکرۆفت" کەپسپۆڕێکی شارەزای خۆی بوو لەکاروباری خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا، بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو لە واشنتۆنەوە بەفڕۆکە، بۆ کارێکی نهێنی گەیشتبوونە ئەوێ، ئیتر سعودییەکان و کوردەکانیش هەرزوو لەمەبەستەکە گەیشتن و دوای گەڕانەوەی سکۆکرۆفت و هاس بەپەلە بلیتێکی فڕۆکەیان دایە دەست "زێباری" تا پێی بگەڕێتەوە بۆ "لەندەن" کە لێوەی هاتبوو، پێشیان ڕاگەیاند کەئیتر پێویستناکات لەوەزیاتر بمێنێتەوە.

کارەکەی سکۆکرۆفت بەخۆرهەڵاتی ناوەڕاستەوە بەندبوو، دوا بەدوای کۆبوونەوەیەکی بوش و حەوت ڕاوێژکاری باڵادەستی هاتبوو کەلە ٢٦ی مارتدا دوا بڕیاری نەمانی ڕاپەڕینەکەی کوردیان تیادا دابوو. عێراق هەڕەشەی لێکرا کەنابێت دژ بە کوردە شۆڕشگێڕەکان کۆپتەری جەنگی بەکاربهێنێ، بەڵام کەس نییە لەمەڵ ئەدانی عێراق بەو هەڕەشانە بەئاگا نەبێت، کەچی دواتر بڕیاردرا هیچ بۆ ڕاگرتنیان نەکرێت. ڕاپەڕینەکەی خوارووش لەبەرچەند هۆیەك تێکشکێنرا، کەخۆگێلکردنی هاوپەیمانان یەکێکیان بوو. بەگاردی کۆماری و کۆپتەرو سوپاو

موجاهیدینی خەلقی بەتاران دژو فەوارەی لای سەدام حسێن کەتانك و زرێپۆشی دابوونێ، هەموو دایان بەسەر کەرکوکداو گرتیانەوە. بڕیارە لەسەرخۆکانی ئەمەریکا بەوجۆرە دەماتنەدی، کورد چەکی باشی دژ بەتانك و فڕۆکەی زۆر کەمبوو، سەرکردایەتی و دەستڕۆیشتنێکی باشی نەبوو (ئەوەش شێوەیەکی زمانی سەربازیانەیە بۆچاك بەکارهێنانی هێزەکانیان). کەلەمەلومەرجێکی وادا، وەك قسەکەرێکی بەڕێوەبەرێتی رایگەیاند، ئەو داوایەی کوردیش هاواری بۆی لێهەستابوو تادەهات پەرەی دەسەند، گوایە هێزی چەکدار لەفڕۆکەوە بەربەدرێتەوە، شتێکی "بێکەلك و ڕەمزیە" و ڕەنگە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو هاوکارەکانی، بۆ خۆبەستنەوەیەکی لەبن نەهاتوو بەکێشبکات. دوای کۆبوونەوە بنبڕەکە کاربەدەستێکیان، دیسانەوە هەر بەئەنقەست داوا ڕوون و ئاشکراکەی بوشی پشتگوێخست، وتی: "ئێمە هەرگیز هیچ بەڵێنێکمان بەم خەڵکە نەداوە" و "درێژەپێدانی ئەرکە سەربازییەکانیش هیچ بەرژەوەندییەکی هاوپەیمانانی تێدا نییە". بێگومان تا دەستەپاچەیی هاوپەیمانان زیاتری بخایاندایە ئەوەی سەبارەت بەسەرنەکەوتنی کورد دەوترا ئاشکراتر دەبوو، بەڵام دەستێوەردان تێکشکانە مسۆگەرەکەی دواخست.

چەند رۆژو هەفتەیەك بەڕێوەبەرایەتی ئەمەریکا لەڕێی چەندین راگەیاندنی بەربڵاوەوە دەستەکەی خۆی سەبارەت ڕێپێدان بەپاشماوەی سوپاکەی عێراق تا ڕاپەڕینەکانی سەروو و خواروی وڵات تێکبشکێنێ، خستەڕوو. ژەنەراڵ چوارزکۆف بەزمانی خۆی دانی بەیەکەم هەڵەی تەکتیکی کۆبوونەوەکەی "سەفوان"ی سێی مارتدا نا، تا مەرجەکانی ئاگربەست بخاتە بەردەم سوپا دۆڕاوەکەی عێراق، بەداوایەکی فەریق سوڵتان هاشم ئەحمەد قایلبوو، هاوپەیمانان وەك لەبڕیارەکەیاندا بەناوی "بفڕی دەمرێت"یان لەسەر فڕۆکە باڵچەسپاوەکان دانابوو، بەڵام ڕێگایان لەفڕینی کۆپتەرو چالاکی "هێزی چەکدار" نەگرت، دەڵێت: دەبوایە چاکتر بیرم لێبکردایەتەوە. بەهەر حاڵ زۆری نەبرد بۆی دەرکەوت کەئەو "کوڕی قەحبەیە هەڵی خەڵەتاند"، چونکە لەبری ئەفسەر پێکواستنەوە، لەوڵاتە بەشەڕکاولبوەکەیدا، وەك ئەحمەد داوایکردبوو، ڕاپەڕینەکانیان پێ دامرکاندەوە. هەرچەندە بەیەکەر ڕێك دوای دووهەفتە رایگەیاند کەهێزی چەکداری عێراق هێند لاوازبووە "دەتوانم بڵێم دەمانتوانی بگەینە بەغدا". کەچی نەچوارزکۆف و نە کەسێکی دی فرمانی دەستبەجێ لەکارخستنی کۆپتەرەکانیان بەعێراق نەدا. راستییەکەی چوارزکۆف بەوەی کە "ئەوکاتە-واتە کاتێك خراپ بەکارهێنانی کۆپتەرەکان ئاشکرابوو- دەبوا کۆشکی سپی بڕیاری بدایە، کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەیەوێت تا چ رادەیەك دەست لە کاروباری عێراق وەربدات"، بەرپرسیارێتییەکەی لەخۆی لادەدا.

ڕۆژنامە لیڵایی دیاردەیەکی نوێی کارە ناڕەواکان لەواشنتۆن بەرچاودەکەوت، کە زۆر کەڕەت بەهۆی گوشارو تووڕەیی ڕای گشتییەوە چارەسەر دەکرا، بەڵام ناڕەواییەکی دی بەدوادا دەهات و ئەوی پێشووی لەبیر دەبردەوە. لە٩ی مارتدا بەیەکەر حکومەتی عێراقی لەبەکارهێنانی چەکی کیمیاوی دژ بە ڕاپەڕیوان بەئاگا هێنایەوە. ڕۆژی دواتر ژەنەراڵێکی پنتاگۆن ڕایگەیاندی، کەلەو باوەڕەدایە هاوپەیمانان بەرهەڵستی بەغدا نەکەن، گەر ئەو زیاتر لە ١٣٠ فڕۆکەیەی لەپێناو سەلامەتیاندا بۆ ئێران فڕێنران، تەنیا بۆ هێنانەوەیان بەکاربهێنێت، ئەویش ئەگەر ئێران بیاندا تەوە، کەپێناچێت بیکات. کاربەدەستێکی باڵادەستی ئەمەریکایی، ئەو قسە ئەستەقەی بەدرێژایی مێژوو بیرۆکراتییەکان شانازیان پێوەدەکرد هاوکاریکردن لەگەڵ سەدام حسێنێکی ڕامدا باشترە وەك لەیەکێکی نەناسی دی" دەرتەوە.

بێزاری دەربڕینی خەڵکیش بەڕادەیەك پەرەیسەندبوو، کەبوش لەکۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنووسی ڕۆژی ١٣ی مارتی شاری ئۆتاوادا ناچاربێت بڵێ "نابێ کۆپتەر لەناو عێراقدا بۆشەڕ بەکاربهێنرێت" بە کارهێنانیان دژ بە یاخیبوان پێشێلکردنێکی ڕێکەوتننامەی هاوپەیمانان و بەغدایە. کەلە ١٧ی مارتدا ئەفسەرە پایەدارەکانی هاوپەیمانان، جارێکی دی لە سەفوان لەگەڵ هاوکارە عێراقییەکانیاندا کۆبوونەوە، بەبیریانهێنانەوە کە بەردەوامبوونیان لەبەکارهێنانی فڕۆکە جەنگییەکاندا هەڕەشەیە لەهێزەکانیان. هەرچەندە وریاکردنەوەکەیان دووپاتکردەوەو دوو فڕۆکەی جەنگیشیان بۆیەکلاکردنەوەی مەترسی فڕۆکەی باڵچەسپ، خستەخوارەوە، بەڵام بەهیچ جۆرێك خۆیان لەتێکشکاندنی کۆپتەرە عێراقییەکان نەگەیاند.

لەچەند ڕۆژی داهاتوودا، دواگیرفانی بەرگریکردنی شیعەی خوارووی ڕامالرا، بەڵام کورد لە ٢٠ی مارتدا کەرکوکیان گرت، ئەویش سەرکەوتنێکی بەمەترسی ولبوو کە پێدەچێت لەواشنتۆن تەرازووی دژ بەکوردی لاسەنگکردبێت. لە ٢٦ی مارتدا بۆچوونێکی نوێ بۆ کۆپتەرە عێراقییەکان هاتەکایەوە "کۆپتەر هەر ئەوکاتە بەردەدرێنەوە کە هەڕەشەیان بۆ هێزی هاوپەیمانان هەبێت". لەهەوڵێکدا بۆ ڕەواییدان بەم پاشگەزبوونەوە ڕەوشتییەی، قسەکەرێکی کۆشکی سپی "مارلین فتزواتەر" ڕایگەیاند کەڕێکەوتنەکەی سەفوانی چوارزکۆ "زارەکی بووەو، هیچ شتێکی نووسراو لەئارادا نەبووە". ئەفسەرێکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کەنەیدەویست ناوی خۆی ئاشکرا بکات، لەبارەی سیاسەت داڕێژەرانی واشنتۆنەوە وتی "هیچ شتێکی سەدام حسێنیان پێباش نییە، بەڵام بەکارە ناڕەواکانیشی دڵگران نابن".

"کریستین مۆس هێلمز" بەڕادەیەك ترسی لەو ڕەخنانەبوو، کەهاوپەیمانان بەگەرمکەری شەڕی ناوخۆی عێراق تاوانبار بکرێت، سوپای هاوپەیمانانی لەدەستێوەردانی ڕووداوەکان

بەناگا دێنایەوەو دەبوت لەوانەیە بەرەو کردنەوەی "قووتووی پاندۆرە"کە ببێتەوە. ئەفسەرێکی ئەمەریکایی دی دوای دڵنیابوون لە لەناونەبردنی، بەتەوسەوە زۆر بەپەروونی وتی:" بۆ پێنجو پەنا ویستمان چاوەڕێی کۆتاییهاتنی شەڕی ناوخۆ بکەین تا دەستێوەردانەکەمان بەو چاوە سەیرنەکرێت کە بڕیاری یاریدەدانی ڕاپەڕیوەکان بێت، بەڵکو بەبڕیارێك دابنرێت کە یارمەتییە مرۆییەکان دابینەکات". دوای گرتنەوەکەی کەرکوك و بەرپابوونی ڕەوە جەماوەرییەکە، بەرزانی و تاڵەبانی لەبانگەوازێکی مەینەتباریدا بەسەرۆك بوشیان وت: "تۆ خۆت داوات لەگەلی عێراق کرد کەدژ بە ڕژێمە دیکتاتۆرییەکەی سەدام حسێن ڕاپەڕن، کەچی بۆشەوەزەنگی دەستەڵاتە خۆ سەپێنەرەکەی سەدام حسێنت بەجێتهێشت"

لەو شەوە ئەنگوستە چاوەی "پێشمەرگە"ی تیادا شکاو سەرکردەکانی خۆیانیان لەو بەزینە ناهەموارە مێژوویەدا بەجێهێشت، بەرزانی و تاڵەبانی مانەوەو هەریەکە لەشوێنی خۆی پێی لەسەر بەرگری و شەڕکردن نەك هەڵاتن داگرت. لەوکاتەدا تاڵەبانی و "هێزۆ"ی هاوسەری، لەگەل دەستەیەکی سەربەخۆیاندا، کەبەتەنیا پێنج کەسیان بەدەورەوە مابوو بەرگریان لێبکەن، بنکەیەکی بچووکی بەدووری چەند میلێك لە خۆرهەڵاتی سلێمانییەوە بۆ ڕووبەڕووبونەوە پێکەوەناو، کەللە ڕەقانە داوای خۆگەیاندنە شوێنێکی ئەمین و دوورە شەڕی ڕەتکردەوە. هەر ئەوەش وایکرد هێزێکی بچووك خۆبێتەوەو سەرکەوتووانە بەڕووی هێرشێکی عێراق ڕابووەستێ کەبۆ ڕێگایەکی شاخاوی گرنگ دەیانکرد.

هەر بەهەمان شێوە بەرزانیش لەباکوورەوە چەکدارەکانی بەجێیانهێشتبوو، بە نیمچە دڵنەوایی و نیمچە هەڕەشە هەندێك لەهاوەڵە تایبەتییەکانی خۆیی گلدابۆوە، کە بەشێکیان لەو جەنگاوەرە بەناوبانگانە بوون کە کاتی خۆی لەگەل باوکیا بەشداری کشانەوە ئەفسانەییەکەی ١٩٤٧ی مەهاباد و ١١ ساڵ ئاوارەبوونی یەکێتی شۆرەویان کردبوو. (تا چەند ساڵێکیش بەدرێژایی بەشێك لەڕێگا شاخاوییەکەی نێوان سەلاحەدین و شەقلاوە پاشماوەی یەك تابوور زرێپۆشی عێراقی، کەلەئەنجامی تێکشکاندنی هەموو هێرش و هەوڵەکانی عێراق بۆ زیاتر بەرەوپێشچوون، شایەتحاڵی سەرکردایەتییە ئازایانەی مەسعود بوون. ئەگەر ئەوە لەکلتوورێکی تردا بوایە ئەوا دەپارێزران و بەردەوامیش یاددەکرانەوە تا بۆ هەتاهەتایە پاڵەوانێتی خۆیانیان لەبیرنەچوایەتەوە، کەچی هەرچەند بەلای پاشماوەکانی لای دەربەندی کۆڕێدا ڕەتدەبووم دەمبینی تابێت کەم دەکەن، ئیتر یان دەدزران یان هەر نەدەمان، بەهەرحاڵ کاری ولائازایانەیان پەرشوبڵاوە).

ڕۆژانی ڕاپەڕین پزیشکێکی گەنجی پێشمەرگە بەناوی "سابیرخان گرنگ"[19] دەست بەسەر خەستەخانەی کەرکوکدا دەگرێت، کاتێک چاوپێکەوتنم لەگەڵدا دەکرد، ناوەناوە تۆپی عێراق بەسەر خەستەخانەکە دەکەوت، ئەو خۆی تا سەرلەبەیانی ڕۆژی ٢٨ی مارت لەوێ مابۆوە، ئەو بەیانییە لەپەنجەرەیەکەوە چوار زرێپۆشی عێراقی بەدەوری خەستەخانەکەوە بەدیدەکات، جار جارەش گوللە تۆپ دەکەوتەناو خەستەخانەکەوە، بۆیە تەواو ترسی لێدەنیشێ و لەگەڵ پێشمەرگەکاندا کەپاسکردنی خەستەخانەکەیان پێسپێردرابوو هەست بە نزیکبوونەوەی گرتنی ناوچەکە دەکەن، هەموو بەهەڵەداوان بۆی دەردەچن، پێشمەرگە بریندارەکانیش لەگرنگ دەپاڕێنەوە تا بەجێیان نەهێڵێت، یەکێکیان بەبرینێکی سەخت و لاقێکی بڕراوەوە، لەناو جێگاکەیەوە خۆی بەکێشدەکات و پانتۆڵی گرنگ دەگرێت، بەو هیوایەی ڕایبگرێت و هاوارێشی لێدەکات: "یارمەتیم بدە". گرنگیش پاڵێکی پێوەدەنێت و دەڵێ: "من یارمەتی خۆمم پێنادرێ ئیتر چۆن یارمەتی تۆ بدەم؟". پزیشکێکی کورد تووشی هیستریا دەبێت و بۆهێنانەوە سەرخۆی و هێورکردنەوەی، گرنگ شەپازلەیەکی لێدەدا، لەکاتێکدا ژنە برینپێچە عەرەبەکان لەخۆشی گەڕاندنەوەی دەسەڵاتی بەغدا خەریکی تلیلی کێشانبوون، ئەمان ڕادەکەن و لەبەردەم خەستەخانەکەدا گوللە تۆپێک شەوقەدەداتەوەو بەلای سەری گرنگدا کیلە دەکات.

نزیکەی مانگێک دواترکە بەقاچاخ خۆم گەیاندبۆوە کوردستانی عێراق لەڕانیە ڕێکەوتمکردو ئەو بەسەرهاتەی بۆ گێڕامەوە. لەسەر سنوور سەدان هەزار پەنابەر چاوەڕێی پەڕینەبوون تا بەو نزیکەی ملیۆن کەسە بگەنەوە کەناودیوی ئێران ببوون، من لەدیوی ئێرانەوە خەریکی ڕاپۆرت ناردنی کێشەی کورد بووم، نووسەری ڕۆژنامەکە داوای چوونەوە عێراقی لێکردم، تا بزانم داخۆ بۆچی خەڵکەکە لەدەستپێکردنەوەی وتوویژکردنی کوردو بەغدا حەپەسابن، بەتایبەتی ئالەبانی بۆ دەبێت ماچکردنەکەی سەدام حسێنی بەلاوە باشبووبێت کە لەتەلەفیزیۆندا نیشاندرا؟

دلوای وا ڕەنگە لەواشنتۆن بەجێ و تا ڕادەیەکیش ئاسان بێت، بەڵام من لەو باوەڕەدا نەبووم چوونەوەی ناو عێراقم بۆ بکرێت. چونکە دەبوا پێوەندیم بەنوێنەرانی کوردی ئەوبەرەوە بکردایەو ئەوانیش ئاگاداری سەرکردەکانی پێشمەرگەی ناو عێراقیان بکردبا تا ڕێی چوونەکەمیان بۆ خۆشکردمایە، بەڵام لەوکاتەدا ئەوان زۆر بەتووڕەییەوە چووبوونە واشنتۆن و دۆزینەوەیان زەحمەت بوو. بەهەرحاڵ زۆر لەوە بەئاگاتر بووم کەبیر لەدلوای ڕێپێدانی کەسێکی بیانی بۆچوونە ناو عێراق لەپاسەوانانی سنوور بکەمەوە، بە تایبەتی ئەو کەسەش پەیامنێرێکی ئەمەریکایی بێت، نیازی سنوور بڕینی نایاسایشم نەبوو، بۆ ڕێگەیەکی یاسایی دەرچوونم

---

[19] وەك دوایی دەرکەوت ئەم ناوە پزیشك (گرنگ ساحێبقڕان)ە، وەرگێڕ..

لەئێراندا دەگەڕام تا دوارۆژ هیچ گرفتێکم لەگەڵ ئێرانییە بیرۆکراتییەکاندا تووش نەیەت. لەئێرانیشدا ڤیزە وەرگرتن کارێکی ئاسان نییە، ئەمدەویست ناوی رۆژنامەکەشم بخەمە لیستی رەشەوە.

بەگومانی لێپرسراوە ئێرانییەکان لەوکەسانەی بۆچوونەناو و دەرچوون لەئێران رێسی زەمینیان بەکاردەهێنا، گرفتێکی راستەوخۆبوو. منیش وەک برادەرەکانی دیم پێمڕاگەیەنرا، رێک وەک چۆن لەفڕۆکە دابەزیوین هەرواش لەفڕۆکەخانەی تارانەوە دەرچین، بەڵام من دەمویست رێگای سنووری ئێران تورکیام بدەن، چونکە لەوێوە دەمتوانی جارێکی دی خۆم بگەیەنمە وە کێوە سەختەکانی نێوان تورکیاو عێراق و بەو هیوایەی لەوێشەوە، بەخۆدزینەوە بگەمەوە لای بەرزانی و تاڵەبانی و سەرکردەکانی دی. ئەو هەلومەرجە باشەشم بۆ لێکدابوٶە کەبەهۆی یارمەتییە مرۆییەکانی هاوپەیمانانەوە پەیدابیوو، تا بتوانم بەئاسانی بەناو پاسەوانە تورکە بەگومانەکانی سنوورە داخراوەکەدا رەتببم.

جگە لەوەش ئەمدەویست لەتارانەوە بەفڕۆکە بچمە ئەورووپا، چونکە ئەوسا دەبوا هەر بەفڕۆکە بەدرێژایی هەموو تورکیادا بۆشاری "ڤان" بگەڕامایەتەوەو، بەوەش لە ماوەی دوومانگدا بۆدووەم جار لەوشوێنە دەربەکەوتمەوە، کەئەوەش تەنانەت بۆ دەبەنگترین پۆلیسی تورکیا دەبووە زەنگێکی بەئاگاهێنانەوەی نیازەکەم. لەتاران چەند رۆژێک نەگبەتی گرتبوومی بەڵام دواجار بەریدامو ئێرانییەکان رێیاندام لەسنووری تورکیاوە ئێران جێبهێڵم. ئەوسا بەفڕۆکە چوومە شاری وورمێی خۆرئاوا و لەوێش چوومە دەزگا ئارچەییەکەی بەرزانی و تاماوەیەکی را چاوەڕوانیمکرد کەپیاو تەرلوێک پێی تێکدەچوو، نامەیەکیان دا ایە دەستم ناوی کۆمەڵەکەی خۆیانی لەشاری "یۆکسیکۆڤا"ی تورکیای لەسەر نووسرابوو، کە بەقاچاخچێتی ناوی دەرکردبوو، لەنامەکەشیاندا داوای یارمەتیدانمیان لێکردبوون. یوکسیکۆڤا ئەو شارەیە کە لەشویاتدا لێیبوومو لەیەکەم هەوڵدانی گەیشتنم بەپێشمەرگە پاشگەزبوومەوە.

ئەمجارەیان پێدەچوو کۆمەڵەکەی بەرزانی لە یوکسیکۆڤادا ئیش بۆ پۆلیسی تورکیا بکەن، هیچ یارمەتیان نەدام، راستە خۆیان نیشاندامو نامەکەشیان خوێندەوە، بەڵام دوای ئەوە سوورک و ئاسان بۆی دەرچوون و ئیتر چارەیانیانم نەدییەوەو وەڵامی تەلەفۆنیشیان نەدەدامەوە. رۆژی دواتر چوومەشاری هەکاری کەشارێکی شاخاوی پڕ لەقوڕو لیتەی ژێر چەپۆکی سوپای تورکە، چونکە هەڕەشەی چەکدارە کوردەکانی تورکیا لەوێ هێندە توندوتیژبوو، لەکاتی زۆر باشیشدا نەک ئەم رۆژگارە، پۆلیس و کۆماندۆی سوپا و هێزی تایبەت و جەندرمەو ئەوانەش کەلەبەرگی مەدەنیدا خۆیان حەشاردابوو بیست و چوار سەعاتە خەریکی پاسەوانی بوون.

چەند کوردێکی باشم بەرێکەوت لەوێ ناسی و ڕێزم بۆیان هەبوو، دوای دوو ڕۆژ کارێکیانکرد کەلەشارەوانی چا لەگەڵ لێپرسراوێکی شارەکەدا بخۆمەوە، تا تەلەفۆنێکمان بۆ دەرەوەی تورکیا لەگەڵ یاریدەدەرێکی بەرزانی لەواشنتۆن بۆ بەدەستبهێنێت، بڕیاردرا لەکاتێکی دیاریکراو لەتەلەفۆنێکی خۆیەوەو لەدەرەوەی بینای شارەوانی پێم بگاتەوە. بەڵام من بەوکارە ڕەشبین بووەو پێموابوو زۆر بەئاسانی دەستیان بڕیوم، بەخۆشمم دەوت، هەر قسەکردنم سەبارەت بەو کارەسەمەرەیەم بۆ لێپرسراوێکی تورك زیاتر لەشتێکی سریالیانە دەچێت، بەهەرحاڵ چارێکی ترم نەبوو.

ئەوپاش نیوەڕۆیە درەنگ گەڕامەوە بۆ شارەوانی و لەسەر چاخواردنەوە پێیان ڕاگەیاندم کەیارمەتیم دەدرێت، بەڵام هەر ئەو ئێوارەیەو بەرلەوەی لێپرسراوەکە دەرفەتی ڕاگوزینی هەبێت بەئۆتۆمۆبێل گەڕامەوە یوکسیکۆڤاو لەوێشەوە بۆ سیمیدینلی کەلەسنوورەوە نزیکتربوو. شەوی ناینەم لەگەڵ چەند کەسێکدا بەسەربرد کە دڵیان بە بەرزانی خۆشبوو پێدەچوو شتێکیش لەبارەی منەوە بزانن، ڕۆژی داهاتوو بە ئۆتۆمۆبێل بەچەند ڕێگایەکی پڕ چاڵ و چۆڵ و جۆگەلەی پیسدا بەخێراییەکی بەتەنیشت چەند پارگەیەکی سوپا بە گومانەکەی تورکدا ڕەتبووین کەس ،گ- ئەلساتییە زنجیرکراوەکانیان پێکدا هەڵەپڕان.

نزیك سنوور لە خێوەتگایەکی پەنابەراندا ئینگلیزی زانێکی شارەزام هەڵبژارد، پاسەوانە تورکەکانی سنوور لەڕۆژنامەنووسێتییەکەی من بێگومان بوون، بەڵام خۆم گێلکردو لەوەشدا بەختەوەربووم کەلەناو ئەوکەسانەدا بووم لەیارمەتییە مرۆڤایەتییەکاندا کاریاندەکرد لەگەڵ ئەو چەند کەسە بەجەرگ و ئازایانەش کەلەخزمەتی هێزە ئاسمانییە تایبەتەکەی ئینگلیزدا کارگێڕبوون. لەناو ئەو جیهانییە نەناسراوانەی بەئاسایی لەمجۆرە کارانەدان، تاکە کەسێکی بیانی نەبووم بەو سنوورە قەدەغە کراوەدا بپەڕمەوە. ئیتر بێئەوەی بۆ مۆرکردن داوای پەساپۆرتەکەمم لێبکەن (کەئەمەیان بۆهاتنەوە ناو تورکیا کێشەی مۆرکردنی چوونە ناوەوەمی بۆ پەیدا دەکردم، چونکە پاسپۆرتەکەم مۆری چوونە دەرەوەی تورکیای بەسەرەوە نەبوو).

لەدوالگوندی ناو تورکیادا ئێسترێکم بۆ هەڵگرتنی کەلوپەلەکانم پەیداکرد، کابرای وڵاخدار کە لە دەلیلەکەمی بیست من بۆلای بەرزانی دەچم، کرێکەیی لێوەرنەگرتم. زۆری نەبرد دەلیلی زل و شەپرە لەتەمەڵیا خۆی دواخست، پێموت سواری ئێسترەکەبێت. چوارانە سەعات بەڕێگایەکی سەختی شاخاویدا، بەناو ئەولوتکە بڵندانەی هەرکامێکیمان دەبڕی لەو بەرزترمان لێبەدیارەکەوت و، هی وانشیان هەبوو هێشتا بەفریان لێنەچووبۆوە، کە بەقەدپاڵیاندا ڕەتدەبووین هەمەجۆر پەلەی گوڵاڵەسوورەو لالەو وەنەوشەی شین و، خوارتریش لەدۆڵەکاندا

گوڵە بۆکانەی سوورو سەوسەنی شین و جووری زەردو بەیبوونمان دەبینی. ڕۆژەکەشی هەروبوو کە بۆ ڕۆیشتن زۆر لەبارە، چونکە خۆو بەخت نەباران دەباریو تەگەرماش بوو. پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ کاتێك ڕێگا سەختو ئالەبارەکەمان جێهێشت و کەوتینە سەر کۆنەڕێیەك کە لەدیوی عێراقییەوە ئاسەواری قیرتاوو چاڵوچۆڵێکی بێشوماری پڕ لەباراناوی پێوەدیاربوو، بەرێکەوتنێکی سەیر بەرزانی لەوێ چاوەڕوانیدەکردین.

ڕۆژی دوایی بەرزانی بە ئۆتۆمۆبیل ناردمی بۆ ڕانیە تا تالەبانی ببینم، کەلەوکاتەدا بەهۆی ماچەکەی سەر تەلەفزیۆنی سەدام حسێنییەوە، کەوەك خۆی وتی تەنانەت جێی ڕەخنەی هاوسەرەکەشی بووە بەرگری لەخۆیدەکرد. چۆن هێمایەکی وای بۆ دونیای دەرەوە نارد، کەتازە پەیوەندی هەوڵەکانی کوردیان لابردوونەبووەو بڕیاری پشتگیریکردنیان دابوو؟. خۆ ئەگەر وتووێژکردن لەگەڵ عێراقدا هەر لەکردن بوو بۆچی سەرەڕای ئەو هەموو شوێنە لەبەغدا کراو لەشوێنێکی بێلایەن و، لەهەموو حاڵەتێکیشدا بۆچی بەبێ چاودێریکردنی نێودەوڵەتی بێن، بۆچی نەتەوە یەکگرتووەکان سەرپەرشتی نەکردبا؟. داخۆ ئێستا ئەو لیژنەی کارە هاوبەشەی بەرهەڵستکارە عێراقییەکان لەکانوونی یەکەمی ڕابردوودا مەگەر خوا بۆخۆی بزانێت بەچ زەحمەتێك پێکهێنرا، چی بەسەرهاتبێت.

کارەکەی تالەبانی بیرۆکەیەکی وای بەهێزکرد کەهەموو دونیا بێزی لێدەکردەوە، گوایە سیاسەتمەدارانی کورد لەڕووی ڕامیارییەوە کامڵ نین و، ئەو چەند دەرفەتەی مێژوو پێی بەخشین لەدەستیان داوە. تەنانەت سەرۆکێکی وەك مێتران کە سەرۆکی وڵاتێکەو ئاساییە بۆی پشتگیری عێراق بکات، لە"کەنداڵ نەزان"ی ئینستوتی کورد، کەئەوەندە بەساردییەوە هەموو هیواو ئاسۆکانی کوردی هێنابۆوە سەر ئۆتۆنۆمی، لێی تووڕەببوو بەسەریشیا نەڕاندبووی "ڕۆڵە کەی ئەوە داوای ماف کوردە". کوردەکانی عێراق لەدوای هەرەسی ئیمپراتۆریەتی عوسمانییەوە باشترین دەرفەتی نێودەوڵەتیان لەدەست خۆیان دا. لە ڕەخنەگرانی ناوو دەری کوردستان هەرچییەکیان بوتایە، تالەبانی لەسەربوونی دەستکەوتی گرنگی دانوستان سووربوو: پێویستبوون بەکات تا کێشەکەی تیادا بنبڕبکرایە، بەرزکردنەوەی وورەی پێشمەرگە هەڵاتووەکان تا بەهەزارانیان بۆ جێگەکانی خۆیان بگەڕاینەتەوە، دیسان "وەك وتی" گەڕاندنەوەی بەکۆمەڵی خێزانەکان. گفتوگۆکانمان سەرەڕای گەشبینێتی لەنێوان تاڵوتیژیو بەهیواییدا دەهات و دەچوون، بەڵام سەبارەت بەرێککەوتنی گشتی لەگەڵ بەغدادا هەر بەقسەو بەشێوەیەکی تایبەتی وای ڕایگەیاندبوو، کە سەدام حسێن تەنیا هەوڵی کات بەسەربردنێتی، سەربارەت بەو داوایەی کورد بۆ دابەشکردنی نەوتی کەرکوك و ئەو شوێنانەی تری سەر ناوچەی

ئۆتۆنۆمی، وای پێشنیارکرد کە لەگەڵ مافی بەردەوامبوونی ئەو پێوەندیانەی کورد لەگەڵ خۆرئاوادا هەیانەو تایبەت لەپەرەسەندنایە، ناگونجێت. سەدام حسێن لەهەموو دانوستانەکانی رابردوویدا هەرگیز بەم مەرجانە قایل نەبووە، ئیتر بۆدەبێ ئێستا پێیان قایلبێت؟.

تالەبانی لەدرێژەی قسەکانیدا وتی: کورد بەدەم داوای بەڕێوەبەرێتییەکەی بوشەوە چوو، واشنتۆن یەکەم کەرەت هانی راپەڕینیداین، کەچی دواتر بەنەخستنی کۆپتەرە جەنگییەکان تیشکی کەسکی بۆ عێراق هەڵکرد تا هێرش بۆ کوردستان بێنێ.

جا ئەگەر ئەوە رابووبێت راپەڕین ورەوە جەماوەرییەکەی دەمێنا کەمەرگی ئەو هەموو خەڵکەی بەدوادامات کە کەس نازانێت بەژمارە چەندن؟ بەتایبەتی کە سەرکردایەتی کورد هەر لەبنەڕەتدا گازاندەی زۆریان لەخۆگرێدانە پڕکارەساتەکەی جەنگی عێراق ئێران لێدەکرێت.

تالەبانی لەوەڵامدا وتی: بەڵێ، دەکرێت بڵێی هەموو ئەو مردن و دەردیسەریانەی دەمێنا، چونکە رای جیهانی هەژاندو گوشار خرایە سەر حکومەتە خۆرئاواییەکان و، بۆ یەکەم جار گرفتی نەتەوەی کورد بکەوێتە بەردەم جیهان و، بڕیاری ٦٨٨ی ئەنجومەنی ئاسایش بەناو ناوی کورد بەرێت، لەم حەفتا ساڵەدا، یەکەم کەرەتە دەل بەگرنگی لەبەڵگەنامەیەکی نێودەوڵەتیدا ناوی بێت تەنانەت لەم دواییەدا وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا رایگەیاند کەبەتەنیا گرفتێکی مرۆڤایەتی نییە، بەڵکو بەکێشەی مافی سیاسی ناو چوارچێوەی کارەکانی عێراق دادەنرێت، بۆ یەکەمجارە تورکیا پێشوازی لەنێردراوی کورد دەکات و بەڵێنی پشتگیرێتیکردنیان دەدا، بۆ یەکەمجارە کۆمەڵگەی ئەورووپا...

تالەبانی دوور لەرەفتاری تایبەتیانەی خۆی بێدەنگ بوو، سەرم بەسەر کۆمپیوتەرە دەستییەکەمەوە بوو تێبینییەکانم تیا دەنووسی، وتی: ئێستا تۆ ئەوە دابخە ((سەری کۆمپیوتەرەکەمی دادایەوە تا نەتوانم چی تر بنووسم)) ئێمە کەسمان نییە، پارەو زەخیرەو چەکی بەتانەو لۆرکەمان نییە، کەس پشتمان ناگرێت، دەی کەواتە بێ پشتگیریکردنی دەرەوە پیاوەکانی خۆمم پێ تێر دەکرێت؟ ئەو پارەتیانەی بۆمان دێت ئێرانییەکان هەڵیدەلووشن، ئۆتۆمبیلەکانمان دەدزن و چەکەکانمان لەسەر سنوورەکە دەگرن.

قسەکانی هیچ بەرژەوەندییەکی خۆی تیادا نەبوو، بەڵام بەداخەوە راستبوون و ناوەڕۆکەکەشی بۆ واشنتۆن و ئەورووپاییەکانی هاوبەشی، کە لەبەدیهێنانی ناوچەی ئارامدا "Operation Provide Comfort" رۆڵیان هەبوو، گەورەو بەمانا بوون. بەڕێوەبەرایەتی واشنتۆن دەیویست کەمترین شت بۆ پەناهێندەکانی سەرسنوور بکات و بژێدەرچێ و کوردیش بخاتە بەردەم رۆژگارەوە. شتەکە وارێکخرابوو کە کەمترین پێویستی بۆ نەهێشتنی نازارو

ئەشکەنجەو گەڕاندنەوەی پەنابەران بوێت. یەکێك لەڕەخنەگرەکان بەبێزارییەوە هەستیدەکرد، ئیشەکە زیرەکانەو بەوردی لەواشنتۆن داڕێژرابوو، ئەو ناوچە کەمەی بەناوچەی ئارامیان دادەنا تەنانەت دهۆکیشی نەدەگرتەوە، کەلە سووچی باشووری ئەو سێگۆشەیەی بەناگاداری کیونی و لەو سەرژمێرە سەرپێییەی هێزە تایبەتییەکانی سەر سنووری تورکیا وەرگیرابوو، کە زۆربەی هەرەزۆری پەنابەرەکانیشی تیادا خڕببۆوە.

زۆربەی کورد بە بەجێهێشتنی چیا قایل نەبوون و هاتنی سەربازی هەڕپەیمانیان بۆناو دهۆکی نێوەندی ناوچەکەی بارەگای ئاسایش و بەندیخانەکانی بەعسی شوێن چەوساندنەوەو ئازارو ئەشکەنجەدانی تێدایە کردە مەرجێکی گەڕاندنەوەیان. ژەنەڕاڵ "پاوڵ" لەترسی شەڕو بەرەنگاربوونەوە سەربازە هاوپەیمانەکانی لەدهۆکدا ڕاگرت، بەوەش سەروەڵی بەریتانیایی و فەڕەنساییەکانیگرت، بەڵام عێراقییەکان لەوترسەی پێشتر چووبووە دڵیانەوە، بەفڕینی فڕۆکەی A-10 بەسەریاناو ناڵەو گرمەی دوای دیواری دەنگ بڕینیان، دهۆکیان جێهێشت، بەڵام پاشتر گەڕانەوە ناوی.

دواجار ڕاوێژکارە مەدەنییە ئەمریکاییەکان بەناچاری ڤێڵێکیان بۆچوونە ناو دهۆك دیب ،ە کەلەگەڵ هێزێکی ڕەمزی کاتیدا بچن، ئەگەرچی دەستبەستراوی بەرهەڵستکارانێك بوون کەووریایانەو زۆر بەووردی ڕێکیانخستبوو. ڕاوێژکارێکی مەدەنی وتی: "دوای گەڕانەوە بۆ واشنتۆن دەیانویست بەڕێساکانی – مارکیز.ی.کوینزبێر –ی کارەکە بەڕێوەبەرین، بەڵام سەدام حسێن ئەو پیاوچاکە نەبوو بۆیە دەبوا بیرمان لەوڕێیانە بکردایەوە کە لەیەك کاتدا بەغداو واشنتۆنمان پێ هەڵبخەڵەتاندایە".

کۆلۆنێل "ریچارناب"ی ئەفسەر پەیوەندیکردنی نێوان ئەمریکاو هێزە عێراقییەکان کەلەکاتی خۆیدا لە ئەڵمانیای خۆرهەڵات هەر لەو بوارەدا لەنێوان سوپای ئەمریکاو هێزەکانی یەکێتی شۆرەویدا کاریکردبووەو چەند فرتوفێڵێکی لێوە فێربوو. یەکەم: زۆری بۆ عێراقییەکانی بەرامبەری هێنا کەڕێی هێزێکی پچووکی بێ چەکی ئەمەریکا بدەن بچێتە ناو دهۆکەوە، واشی پێخۆشبوو بە دانوستانکردنی هێتلەری بچوواندایە. دووەم: ئەمەریکاییەکان بەواشنتۆنیان ڕاگەیاند کەزۆر لەچوونە ناو پایتەختی ستراتیژی ئەو ناوچەیەی کەئەوەندە بەووڵاتێکی چەپەك دەزانرا دڵنیان، ئەو قسەیە لەواشنتۆن بەجۆرێك دەنگیدایەوە کەچەند براەرێك لەپەنتاگۆن بەتەرس پێکردنەوە پێشنیارێکی وایان بۆ برادەرەکانی باکووری عێراقیان کرد کە "جا ئێوە گەر بتوانن وا لەعێراقییەکان بکەن ڕێی چوونە دهۆکتان بدەن، ئەی بۆ بەهێجکاری شتێکی وا ناکەن بچنە بەغداشەوە؟". کێشەکە لەوەوە بەرپابوو، ئیتر بێنەوەی پێوەندی بەواشنتۆنەوە بکەن

سەربازە مەدەنییەکان و بەڕێوەبەرانی ئیشە مرۆییەکان چوونەناو دھۆکەوەو هێزەکانی عێراقیش بەجێیانهێشت، هێشتا واشنتۆن پەستی ئەو کارە بەری نەدابوون کەلە حکومەتە هاوپەیمانەکانەوە نامەی پەرۆزبایی گەیشتە واشنتۆن پنتاگۆن.

ڕۆژی ٣٠ی مایس پاوڵ بەڕۆژکە چووە زاخۆو رایگەیاند کەمێزەکانی هاوپەیمانان "زۆر لەوە زووتر ناوچەکە جێدەهێڵن کەبیری لێدەکرێتەوە"، لەو کاتەدا تەنیا هەشت هەزار پەنابەر لەسنووری تورکیا مابوون، بەڵام قسەکە کوردو بەریتانیاو فەرەنساییەکانی دڵگرانکرد، هەرئەوەش وایکرد گەر سەدام حسێن ڕێکەوتنیشی لەگەڵ کورددا بوێستایە ئەوا قسەکانی پاوڵ بوونە بیانوو بۆ دەستی بەدەستی پێکردنیان. لەندەن و پاریس هیوایان بەبوونی هێزە ئەوروپاییەکان بوو کەهانی دانوستانەکە بدەن بەدواشیا کشانەوەیەکی بێنارەقی شەرمەزارێتی عێراقییەکانیش بکرێت، کەچی چەندیانکرد، لەترسی شەرمەزاربوونیان واشنتۆن لەدوو هەفتە زیاتر بواری مانەوەیانی نەدا. لە ١٥ی تەموزدا دوا سێ هەزارو سەدوھەفتا سەربازو ژەنەراڵ "گارنەر"ی سەرکردەیان لەسنووری تورکیاوە گەڕانەوە، ژەنەڕاڵ دڵی کوردە بەگومانەکانی بە "ئێمە هەر هێندەی قسە بە تەلەفونکردنێك لێتانەوە دوورین"، دەدایەوە، کەتارادەیەك واشبوو، چونکە فڕۆکە جەنگییەکانی ئەمەریکاو بەریتانیاو فەرەنسا لەبنکەیەکی تورکیادا پارێزگاری ئاسمانی باکووری پانەهێڵی ٣٦و کوردی دەرەوەی ناوچە ئارامەکەیان پێسپێردرابوو.

هاوپەیمانان کوردیان لەهێرشبردنەسەر عێراقییەکانی ئەو ناوچانە وریاکردەوە کە لەکۆتایی هێرشەکەیاندا گرتبوویانەوەو تیایاندا جێگیربووبوون، پێشیان راگەیاندبوون گەر شتی وابکەن ئەوا بەتەمای هیچ یارمەتییەکی ئەوان نەبن. چەند ڕۆژێکی نەبرد کوردە چەکدارەکان زنجیرەیەك سووکە شەڕیان لەگەڵ سەربازە بێوورەکانی عێراقدا نایەوە، لەمانگی تشرینی دووەمیشدا چەند شەڕێکی قورستریان بەرپا کردو زۆر بەئاسانی شارەکانی سلێمانی و هەولێریان گرتەوەو بەهەزاران سەربازی بێدەستەڵاتیش خۆیان بەدەستەوەدا، چونکە ئەوەیان لەمردن بەباشتر دەزانی. سەدام حسێن زۆر پەشۆکا، لە کۆتایی مانگی تشرینی دووەمدا مووچەی فەرمانبەرە مەدەنییەکانی بڕی و زۆر بەپەلەش سووتەمەنی و خواردنی لێکەبکردنەوەو، سەرەڕای گەمارۆی ئابووری نەتەوە یەکگرتووەکان کە وەك سزا لەسەر هەموو وڵاتەکە دانرا، گەمارۆیەکی توندی لەسەردانان. لەترسی ئەوەی بەغدا لابردنی ئەم دوو گەمارۆیە بکاتە بەڵگەیەك و داوای لابردنی لەسەر هەموو وڵاتەکە بکات، واشنتۆن بەردەوام دەولکاری کوردی بۆ ڕێپێدانی هێنانی کەرەسەی سپێری ئەو چەند کارگەیەی لەناوچەکەدابوو؛ تا بەهۆیەوە کەمێك قازانج بکەن و پارەی بیانیشی پێ دابینبکەن، ڕەتدەکردەوە. بەڵام لەبری ئەوە وڵاتە یەکگرتووەکانی

ئەمەریکاو هاوبەشەکانی ناچاربوون بەسەدان ملیۆن دۆلار لە شێوەی یارمەتیدا بدەنە کورد تا پێی بژین، لەهەمان کاتیشدا چاو لەقاست لۆریو تانکەرە توورکییەکاندا بنووقێنن، کەبەئاشکرا گەمارۆی بازرگانیکردنی سووتەمەنیو گازی عێراقی لەسنووری ناوچە کوردییەکانەوە دەشکاند. گازۆیل هەر لەبنەڕەتدا بەنرخێکی ئەوەندە هەرزان دەفرۆشرا کەلەسەری ڕێکدەکەوتن، بەلام بەدرلوی قورس کەم بەغدا بۆی تامەزرۆبوو هەم وەك داهاتی گومرگێکی نایاسایی سەرچاوەیەکی ژیانەوەی کوردو، باری ناوخۆی ئەو ناوچەیەی دیوی ناو تورکیاشی باشتر دەکرد، کە پێشتر نەبوونی هاتوچۆ بێدەرەتانی کردبوو. شێوازە خواروخێچییەکەی خۆرهەلاتی ناوەڕاستیش، کەلیتاوێکی لەناوچەکەدا دروستکردبوو کەوتەڕوو.

هێزە ناوچەیی و خۆرئاراییەکان ئەوەندە بایەخیان بەلەقاڵپدانی باری کوردو دەرنەچوونیان لەسەر سنووردابوو، تا لەکاردانەوەی دانانی گەمارۆی سەر عێراق کەئەوانیشی دەگرتەوە بەهەلەداچووبوون. هەروەك چۆن سەدام حسێنیش کەوتە هەمان هەڵەوە، چونکە لەبری ئەوەی گەمارۆ ئابوورییەکانی وورەیان پێنەهێلێ، ئەنجامەکەی بە رادەیەك پێچەوانەکەوتەوە تەنانەت مەسعود بەرزانی، کەتا تشرینی دووەمیش پێی لەسەر ووتووێژکردنی بەغدا دادەگرت، باوەڕی بەبێسوودی ئەوەمێنا، بۆیە دلوای هەڵبژاردنی پەرلەمانێکی بۆناوچەی ئۆتۆنۆمییە کۆنەکە کرد. لەمایسی ئایندەدا کوردی عێراق یەکەم هەڵبژاردنی خۆی بەسەربەستی کردو پەرلەمانێکیان بۆ ناوچەکە هەڵبژارد، کەئەوەش بەغداو ئەنقەرەو شامو تارانی هێجگار دڵگرانکرد، چونکە ئەوان سڵیان لەهەموو نیشێکی نەتەوەیی کورد دەکردەوەو بەنەفرەتیشیان دەکرد.

بمانەوێ یان نەمانەوێ، بەوە واشنتۆن کەوتە تەڵکەوەو ناچاربوو سیاسەتێکی نوێ بگرێتەبەر، لەکاتی بەڕێوەبەرێتی کلنتۆندا، دابینکردنی لایەنی یەکەمی یارمەتی بەرهەڵستکارە عێراقییەکانو، تا رادەیەکیش بۆ سوپای عێراق دابنێت، دەبوا زۆر بەووردیو بێ هەڵەبکرایە. کوردو سەرکردەکانی تری بەرهەڵستکارانی عێراق کەوتنە بارودۆخێکی باشترەو، بەلام بەو ڕادەیەش نا کەواشنتۆن پێ لەسیاسەتێکی ئاشکرای وا بکاتەوە، کەئەوانیش بەگوشارێکی تری پاڵ مانەوەی گەمارۆکەی سەر عێراق دابنێو، تا سەدام حسێنیش بمێنێ گەمارۆکە لانابرێ، یەکێك لە رەخنەگرانی ئەم سیاسەتە چەند ساڵێك دواتر رای ڕوونکردەوە کەواشنتۆن بەدەست "سیاسەتێکەوە داماوە بەڕێوەبردنێکی بەردەوامو هەمیشەیی دەوێ"، سیاسەتەکە ژیرانەش نییە چونکە "لەبری چاککردنەوە شتەکان هەربەلەتو پەتکراوی دەمێڵرێنەوە" و پارەیەکی زۆریشی دەوێت. کوردە عێراقییەکان دژ بەکارەکەو زۆرتێچوونەکەی بوون، کەزیاتر نەبووی دەکردنو نەشیاندەتوانی لەڕووی ئابوورییەوە خۆ بەڕێوەبەرنو، هاندەری کۆچکردنی چینی

ناوەڕاست و ڕۆشنبیرانیش بوو. بەراوردکردنی کوردی عێراق بەو پشتگوێخستن و ڕێزنەگرتن و یارییپێکردنەی بەدەیان ساڵ پێوەی دەتلانەوە، ئەگەرچی مابێتیشن بەڵام هەربەسەر تەختەی شەترەنجی جیهانییەوەن.

ساڵی ١٩٩١ لەمەڕلێکدا بۆ دیاریکردنی ئەو شتە، یەکێك لە NEA چاوێکی بەناو زنجیرەی هەموو فاکتەرەکانـدا گێـڕا، ئیشـێکی قـورس و گرانبـوو ڕۆژانـە بـۆ دۆزینـەوەی ئامانجـە دیاریکراوەکان و ئەو شتانەش کەبۆ ئەو شەڕەی خۆی بۆ ئامادە دەکرا خراپ لێکدرابوونەوە، بەتایبەتی کەسانێك کە لەوریشیارکردنەوەی بەڕێوەبەرایەتیدا کەمتەرخەمبووبن، جا چ لەناو کاربەدەستانی ڕێکخراوەی سیاسەتی دەرەوەدا، یان ڕۆژنامەنووس یان شارەزاو پسپۆڕاندا بووبن، ١٤ سەعات کاریدەکرد. کارگێڕەکە لەسەر قسەکانی دەڕوات و بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتر دەڵێ: "لە ٤٠ ساڵی ڕابردووی مێژووی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا، لەد ـگی کۆریاوە بۆ جەنگی کەنداوی بیست ساڵ دوای جەنگی ڤیتنام، دروشمی سەرەکی سەرجەم ڕۆژنامەنووسان و پسپۆڕان- سنووری خۆت بزانە- بووە".

واش کارەساتەکە سەرتاسەری نەبوو. دوای تێپەڕبوونی ماوەیەك بەسەریا پێناچێ ئەو بەشە سەرلێشێوێنەرەی "نەشیش بسووتێ و نە کەباب" لە "تفەنگ بەتاریکی نانەوە" بکات. ڕاستە بەرزانی و تاڵەبانی لەگەڵ یەکدی بەشەڕهاتوون و بەهەزاران کەس گیانیان لەدەستداوە [20] و بێزارییەکی زۆری لەناو کورد خۆیدا و دۆستەکانی دەرەوەیاندا بەرپاکرد، بەڵام واش ئێستا کورد دەستەڵاتیان بەسەر خەڵك و خاکدا لەهەموو ڕۆژگارێکی تری مێژووی سەردەمیاندا زیاتر هەیە، لەحوزەیرانی ١٩٩١دا زانایەکی بیانی لە کاروباری ناوچەکەدا، پاشنیوەڕۆیەك لەدەمۆك کە لەکۆبوونەوەی چەند سەرکردەیەکی کورد هاتبووە دەرەوە، لێیپرسی: داخۆ هیچ دڵەڕاوکێیەکی لەکشانەوەی سەربازە هاوپەیمانەکاندا هەیە؟ ئەی ئەگەر ناڕەحەتییەکی دی بێتە ئاراوە کورد ڕوو لەچیاکان دەکاتەوە؟ لەوەڵامدا وتی:

---

[20] لە١٢ی شوباتی ١٩٩٦دا، چاوپێکەوتنێکم لەگەڵ دیپلۆماتێکی بەریتانیایدا کرد، کوژراوەکانی بە ٤٠٠٠کەس خەمڵاند. سەرژمێری باوەڕپێکراو لەئارادا نییە، لەمنیستی ئەنتەر ناسیونالّ کە سەرەتای مانگی تشرینی دووەمی ١٩٩٤ی بۆ ئامارکردن تەرخانکردبوو، هەموو کوژراوە مەدەنی و سەربازییەکانی بە ٦٠٠-٢٠٠٠ خەمڵاندبوو. بەڵام شەڕی ئورستو ئوربانی تریش بەدوای ئەوەدامات لەناو ڕێکخراوێکیشدا ژمارەی کوژراوەکان جیاوازی تیادایە. ووشیار زێباری پارتی دیموکراتی کوردستان کوژراوەکانی بە ٣٠٠٠کەس مەزەندەکرد کەچی سامی عەبدولڕەحمان کەمەر لەپارتی دیموکراتی کوردستاندایە بەدەوروپشتی دوو هەزار کوژراو، کە زۆربەشیان پێشمەرگەبوون خەمڵاند. بەڵام ئەوەی کەزۆر ڕاستە هەزاران کورد لە شەڕی بەرامبەربوونەوەی یەکتریدا کەتا ناو ساڵی ١٩٩٨ درێژەی کێشا مردن.

-نەخێر ، هەرگیز.

سەرسامی خۆم لەوەڵامەکەی نیشاندا.

-باشە نەتبینی لەکارەساتەکەدا بەهیچ جۆرێك بیریان لەمانی خۆیان نەکردەوەو، واپێدەچوو مردنیان بەلاوە چوونە بەهەشت بێت.

بۆیەکەم جارە لەم سەدەیەی مێژووی کورددا، هێزەکانی دەرەوە لەبری کورد دەست لە کاروباری کوردستان وەردەن.

## پەراوێزەکانی بەشی چوارەم

### مردنو چوونە بەهەشت

* بۆچی؟ "ئەو دلگەرمییە بۆ کورد" چاوپێکەوتنێك لەگەڵ کاربەدەستێکی کۆشکی ئەلیزیە لەپاریس کەسووربوو لەسەر لەناوبردنی، ١٣ی تشرینی دووەمی ١٩٩١.
* "گرێی تەوانی مێژوویی" چاوپێکەوتنێکی ٢٨ی تشرینی دووەمی ١٩٩٢ لەگەڵ "دیڤید گۆر بوت"ی کاربەدەستی وەزارەتی دەرەوەی کۆمۆنوێلت/ لەندەن.
* "منداڵەکان جوانن..." لە ١٤ی تەموزی ١٩٩١دا بە تەلەفۆن لەگەڵ "ئالان پیزی" لەڕۆما.
*"فرۆشتنی فڕۆکەی هۆکەر هەنتەر". دەریك ڕۆلیە، چاوپێکەوتنێکی ڕۆلیە لە ١٦ حوزەیرانی ١٩٩٤ لەپاریس ٢٧ تشرینی دووەمی ١٩٩١ی باڵوێز بێنارد دورین، لەباڵوێزخانەی فەرەنسا لە لەندەن.

* "دەربازبوونەکەی گالبریت ڕۆژی یەکشەممەی ئیستر" چاوپێکەوتنێکی پیتەر گالبریت، لە ٢٩ی تەموزی ١٩٩١دا لەواشنتۆن دی.سی.
* "لەخۆکوشتنێکی سیاسیانەی حکومەتی تورکیا دەچێت" ٨ی ئابی ١٩٩١لە واشنتۆنی دی.سی. بەتەلەفۆن لەگەڵ "مۆرتون ئەبرامو وتیز" ی باڵوێزی وڵاتە یەکگرتووەکان لەئەنقەرەدا.
*"ڕستەی تەلیسمی" چاوپێکەوتنێکی ٢ی تشرینی دووەمی ١٩٩١ی "پاتریس پاولی" لە "ئەلکی دورسیە- بارەگای وەزارەتی دەرەوەی فەرەنسا" لەپاریس.
* "هەڕەشەکردن لەئاشتیو ئاسایشی جیهان" چاوپێکەوتنێکی ٢٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٩١ی "تۆنگای ئۆزچیەی" باڵوێزی تورکیا لەبارەگای ناتۆ لە برۆکسێل.
* "دوورخستنەوە" ٥ ساڵ دواترو دوای وشیاربوونەوە لەئەنجامی گێڕانەوەی پەنابەرە "هیوتو"ەکان، کەبەزۆرو بەبێ ڕەزامەندی خۆیان لە "تەنزانیا"و "زائیر"ەوە بۆ "ڕواندا"ی وڵاتی

ئەسڵی خۆیان. پسپۆڕێکی کاروباری "پەنابەران"دا لەو بڕیارەی ساڵی ۱۹۹۱ی هێنایەوە بیر تا کورد لەعێراقدا بهێڵرێنەوە نەك وازیان لێبهێنن کە بچنەناو تورکیاوە، نموونەیەك بوو بۆ دەست بەکۆتاییهێنانی پەنابەرێتی، بەو شێوە کۆنە ئاساییەی کە بۆ بەشی زۆری نیوەی دووەمی سەدەی بیست ئیشی پێدەکرا، واتە ئەو بۆچوونەوەی، کەکەمو زۆر، لەجەنگی جیهانی دووەمو کاتی جەنگی ساردەوە پشتی پێدەبەسترا. لەو ماوەیەدا پەنابەران لەوڵاتێکی سێیەمدا هەلسوکەوتێکی جیهانیان لەگەڵدا دەکرا نەك لەووڵاتەکەی خۆیاندا بپارێزرێن و یارمەتی بدرێن.
بڕوانە
The New York Times, December 22, 1996.

- "بەرێوەبەرایەتییەکەی بوش حەپەسابوو پێشیخۆش نەبوو بە پرۆژەیەك قایل بێت". چاوپێکەوتنێکی ۲۲ی تشرینی یەکەمی ۱۹۹۱ی "ئوزچیری" کەتیایدا وتی: "ئۆزال بۆ یەکەمجار بیرۆکەی ناوچەی ئارامی بە -بەیکەر- راگەیاند، بەیکەر تووشی ژانەسەرهات و پەنجەی بۆ ئەوە راکێشا کە وڵاتە یەکگرتووەکان خۆی ناخاتە ئەو کارەی، کەئاوی پلانێکی سامناك و لێڵە. بە تەواوی روونیکردەوە کە واشنتۆن بیر لەکێشانەوەی سەربازەکانی دەکاتەوە نەك هێزەکانی لەکاروباری باکووری عێراقەوە بگلێنێت".
- "بڕیاری ناردنی یارمەتییە مرۆییەکان" "ماریو بیتاتی"، پرۆفیسۆری پێوەندییە نێو دەوڵەتییەکان لەزانکۆی پاریس- ساور. بڕوانە وتارەکەی لە:
Washington Post April 14,1991دا.
- "رۆلیە بەدەرز دادانی -ئەبرا موڤیتز- خەریکبوو لەگەڵ سەرلێدانی دیپلۆماتی ئەمەریکایی بۆناوچە سنوورییەکان"، چاوپێکەوتنێکی ۲ی تشرینی یەکەمی ۹۹۱ی "مارك گروسمان" لەبالوێزخانەی وڵاتە یەکگرتووەکان لەئەنقەرەدا.
- "دەبێت هەمیشە لەجووڵەدا بێت"، ۸ی ئابی ۱۹۹۱ بەتەلەفۆن لەگەل "ئەبرا موڤیتز"دا.
- "لەچالاکییەکانی تایبەت بە پەنابەرییەوەی بالوێز ئاگاداربوو" چاوپێکەوتنی ۲ی تشرینی یەکەمی ۱۹۹۱ی "گروسمان".
- "دان بۆ کۆتر رۆکردن" -ئانا دیڤووی-و-مۆلی مۆر- وەك لە Washinton Post دا بلاوکراوەتەوەو لە Heral Tribune ی ۱۵ی نیسانی ۱۹۹۱دا دووبارە بلاوکراوەتەوە.
- "گرنگی سەردانەکەی بەیکەر"، چاوپێکەوتنێکی ۸ی ئابی ۱۹۹۱ی "ئەبرامۆ ڤیتز"ە.

- "باشترین ۱۲ دەقیقە لەمێژووی کاری پەنابەریدا". وەك "ئۆن گروم"ی سەرۆکی ڕێکخەری پەنابەریتی لەبالۆیێزخانەی ئەمریکا لەئەنقەرەدا، لە چاوپێکەوتنێکی نووسەری ۳۱ی تشرینی یەکەمی ۱۹۹۱ی جنێڤدا ڕوونی کردەوە.
- "بەکارێکی سەربازیانە نەبێت چارە ناکرێت". چاوپێکەوتنێکی ۲۱ی تەموزی ۱۹۹۱ی "جەین هوارد"، وەزارەتی دەرەوەی کۆمونوێلت/ لەندەن.
- بەکارهێنانی "هێرکیولیس C-130" کە لەڕاپۆرتێکی "ڤیکتۆر تانەر" دا لەژێر ناوی "کارێکی بێ هاوتاو ڤێربوونی وانە لێی، لە ۱۹۹۱دا" لەبڵاوکراوەکانی دەزگای ڕاوێژکاری –نەنتێرتیك فریدریك کەنی– بۆ هێزە چەکدارەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی کاتی "پرۆڤاید کومفورت".
- "ئەو هەفتە سەختە پڕ مەترسیانە". چاوپێکەوتنێکی ۲۸ی تشرینی دووەمی ۹۹۱ی لەندەنی گۆر–بوت.
- "ژمارەی مردووەکان" سەرچاوەکان ڕاپۆرتی هەفتانەی "نەخۆشی تووشبوون و مەرگ" بەرگی ٤٠، ژمارە ٢٦ی ٥ی تەموزی ۱۹۹۱ی بنکەکانی دەست بەسەر نەخۆشی گرتندا، سەبارەت بەسنوورەکانی تورکیا، سەبارەت بەژمارەکانی ئاوارەکانی ئاوێرانیش بەتەلەفۆن قسەکردن لەگەڵ U.N.H.C.R دا لەجنێڤ، ۱٤ کانونی یەکەمی ۱۹۹۳. بەڵام ئەو ژمارانەی کەمتر کاریان لەمرۆڤ دەکردو بەئاگایان دەهێنایەوە، کاربەدەستێك کەنەیدەویست ناوی بهێنرێت، لە سەرەتای نیساندا بەڕۆژنامە نووسانی ڕاگەیاند: "ڕۆژانە هەزار کەس دەمرن و ئێمەش هەر هەموومان لەوە بەرپرسیارین" کاربەدەستێکی نەتەوە یەکگرتووەکان لەئێران، ژمارەی مردووانی ڕۆژانەی ئەوێی بە ۲۰۰۰ کەس دەخەمڵاند. بەڵام وەك "بنکەی دەست بەسەر نەخۆشیگرتندا CDC " ڕایگەیاند، مردن لە کەم بوونەوەدابوو چونکە پیرو منداڵ زوو مردن. دەشبێت ڕێژەی دەستێوەردانە خێراکەی تەپلە سەوزەکان لەڕووی ئەرکی تەندروستییەوە، کە بەدابینکردن و دابەشکردنی ئاوی پاك و خوێنی دژی سکچوون گرنگیان بەو بوارە دا، دابنرێت.
- "نە یەك تاکە دۆلار.." چاوپێکەوتنێکی ۱۰ی نیسانی ۱۹۹۱ی جەلال تالەبانی لەهەولێر.
- "لەنانەت هیچ هەوڵێك لەدەست نادا". چاوپێکەوتنێکی "دیڤید بروئەر"ی "واشنتۆن پۆست" Ienternational Herald Tribune ۱۰ی نیسانی ۱۹۹۱.

- "وازهێنان لەسەرکەوتنەکانیو گەڕانەوەی بۆ وڵات" لەووتارێکی ولیام سەفاری "نیویۆرك تایمس"دا، لە Ienternational Herald Tribune ی ۲ی نیسانی ۱۹۹۱دا.
- "کاربەدەستانی بەریتانیاش ... لەو بڕوایەشدا نەبوون"، چاوپێکەوتنێکی ۲۳ی تەمموزی ۱۹۹۱ی چەند دیپلۆماتێکی بەریتانیایی – کەنەیاندەویست ناویان بێنرێ– لەوەزارەتی دەرەوەی کومنویلت.
- "کاتێك کەوتە چاوگێڕانێکی"، چاوپێکەوتنێکی ۲۱ی کانونی یەکەمی ۱۹۹۰ ی کاربەدەستێکە کە نەیدەویست ناوی بێنرێت.
- "سیاسەت گۆڕین بۆ حکومەتەکان کارێکی وا ئاسان نییە" چاوپێکەوتنێکی ۱۹ی کانونی یەکەمی ۱۹۹۱ە لەگەڵ "ریشارد هاس"دا لە "واشنتۆن دی. سی. دا، پێنج ساڵ دواتر کەهاس لەحکومەتتدا نەمابوو، لە ۲۰ی کانونی یەکەمی ۱۹۹۶داو لە چاوپێکەوتنێکی دی واشنتۆن دی. سی. دا، بەشەرمەزارییەوە وتی:"من کاتێك کورد پەنای بۆ شاخەکان دەبرد، هانی بەڕێوەبەرایەتیم دەدا بکشێتە دواوەو بیرم لەچارەسەرێکی سیاسیانە بۆ ئەو کارانە نەدەکردەوە کەلەدوای ئازادکردنی کوێت لەناو عێراقدا ڕوویدەدا، کەبەرپاکردنی ڕاپەڕینی کوردیش دوورنەبوو، هەڵەو سەنەکوتووبووم.
- "کوردەکان دەبوا پێش ئەوەی ڕاپەڕین دەستپێبکەن" چاوپێکەوتنێکی ۲۸ی تەمموزی ۱۹۹۱ە لەوەزارەتی دەرەوە لەواشنتۆن دی. سی. لەگەڵ کاربەدەستێکی بیروکراتیدا کە داوایکرد ناوی نەبرێت.
- "دوژمنانێکی دڵ پڕ لەڤین" چاوپێکەوتنێکی ۲۸ی تەمموزی ۱۹۹۱ ە لەواشنتۆن دی.سی. لەگەڵ "فیبی مار"دا.
- "لەبوارێکی ئەمسکدا ڤەتیس مایەوە" لەوتارێکی "دیڤڕی مووری" واشنتۆن پوستدا کەتیایدا دەڵێت: بڕیارەکە لەپایزی ۱۹۹۱دا درابوو، ووتارەکە لە ۱۵ی نیسانی ۱۹۹۱دا لە Ienternational Harold Tribune دا دووبارە بڵاوکراوەتەوە.
- "ئەگەر پرسیاری ناکامی ... لەبەیکەر بکەیت" لەچاوپێکەوتنی دیپلۆماتیکی پایەبەرزی وڵاتە یەکگرتووەکان، کەزۆر لە بەیکەرەوە نزیك بوو بەمەرجی ناو نەبردنی کەوتە قسەکردن.
- "۱۰ هەزار کەس بەکوشت بدات" سەرئەنجام تەنیا ۲۸ سەربازی هاوپەیمانان لەشەڕەکەدا کوژران، ئەویش بەقسەی ژەنەراڵ "نیچ نورمان چوارسکۆف"کە لەکتێبەکەیدا " It doesn't Take a Hero- کارەکە پێویستی بەپاڵەوانێك نییە" نیویۆرکو لەندەن

١٩٩٢ لاپەڕە ٥٤٦. بەڵام "تیودور دراپەر" لە کورتەی کتێبەکانی نیویۆرکدا- The New York Review of Book- لە ٣٠ کانونی دووەمی ١٩٩٢دا، لاپەڕە ٤٢، دەڵێت کوژراوانی وڵاتە یەکگرتووەکان ١٤٨ کەس بوون لەوانە ٢٨ یان بەر گوللەی خۆیان کەوتوون .Friendly fire

• "سەرەداوی چەند ڕسواییەکی نهێنی..." ئاژانسی نێودەوڵەتی ووزەی ئەتۆمی لە١٢ی شوباتی ١٩٩٦دا ڕایگەیاند کەزیاد لەدوانزە کۆمپانیای ئەوروپا لەنێو خۆیاندا پێشبڕکێی چەك دابینکردنیان بۆ عێراق دەکرد، کە ڕەنگە ئەو چەکانە لەجەنگی ١٩٩١دا لەدژی خۆرئاوا بەکارهێنرابن. ئەم ڕاگەیاندنەش هەرپێش ڕاپۆرتەکەی "سکۆت" بوو "بەئەنقەست ئەچووبووەسەر ڕاپۆرتەکەو" لەنیشەکانی حکومەتی بەریتانیا دەدوا کەدوای کۆتاییهاتنی شەڕی ئێران عێراق پەرلەمانی خۆیانی لەفرۆشتنی چەك بەعێراق ئاگادار نەکرد، ئەویش لەوترسەی ئەوەك ئەم چەك فرۆشتنە لە "ڕووی سیاسییەوە لەبار نەبێت". بەهەمان شێوە سانی ١٩٩٢ دەزگای لێکۆڵینەوەی ووزەو بازرگانی بەشە کۆمیتەی چاودێری لەشایەتی ئەو کاربەدەستانەی بەڕێوەبەرایەتی کەلە سیاسەتی ئەمەریکای بەرامبەر بە عێراق وورد دەبوونەوە، لە٨ی ئازاری ٩٩٢دا، "دی نیویۆرك تایمس" لەزمانی "گاری میلهوڵن"ی بەڕێوەبەری پرۆژەی دەست بەسەر چەکی ئۆتۆمی ویسکونسدا بوو" وتی: "لەنێوان ١٩٨٥و ٩٩٠دا وەزارەتی بازرگانی وڵاتە یەکگرتووەکان بڕیاری ڕێدان بەناردنی کەرەسە هێجگار ستراتیژییەکانی بۆ عێراق دا کە بایی ٥و١ بلیۆن دۆلار دەبوو". زۆر لەو کەرەسانەش یەکسەر بران بۆ شوێنی دروستکردنی چەکی ئۆتۆمیو کیمیاویو موشەك. ئەم زانیاریانە هەمووی لە Middle East International No.520 ی ١ ئازاری ١٩٩٦ەوە وەرگیراون.

* "سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوی بانکی ناوەندی عێراق". کوردێکی ناسراوی دوورخراوە کەپێوەندی چاکی بەو بانکەوە هەیە، لەچاوپێکەوتنێکی ٢٥ی ئەیلولی ١٩٨٨دا لەپاریس ئەم زانیاریانەی بەو مەرجە بەنووسەر داوە کە ناوی نەبرێت.

* "کرێکار بۆ ئەورووپاییەکان زۆر دەبێت" کاربەدەستێکی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا کە لەمەشتاکاندا لەناوچەی کەنداو کاریکردووە، لە٢١ی کانونی یەکەمی ١٩٩١دا بەو مەرجە چاوپێکەوتنی لەگەڵدا کردم کەناوی نەهێنم.

* "عێراقی کردۆتە خاوەنی سوپایەکی یەك ملیۆن کەسی". چوارتسکۆۆ لە کتێبەکەیدا "کارەکە پێویستی بەپاڵەوانێك نییە" پێشتر ناوی سەرچاوەکە براوە.

*"NEA - بەشی خۆرهەڵاتی نزیك وای لیکرابوو دەمی بۆ هەڵنەهینریتەوە" لە چاوپیکەوتنیکی ۲۲ی کانونی یەکەمی ۱۹۹۳دا لەواشنتۆن دی.سی. لەگەڵ کاربەدەستیکی NEA دا بەو مەرجە قسەی کرد کەناوی نەبریت.

* "ئیمە هەر بەپیی بۆچوونو ئەقڵبڕینی خۆمان کارماندەکرد" لە کتیبەکەی "روبرت دی کاپلان":
The Arabists: The Remance of an American Elite, New York, 1922, p.27.

*"خرابووە سەرشانی خانەنشینیکی شارەزای باروودۆخی کورد" "ولیام ئیگلتون" لە ۲ی کانونی دووەمی ۱۹۹۲دا لەڤییەنا.

*"ئەوەیچ هەرەشەیەکی بۆ ئیمە نەبووە"لەوروتارێکی دیڤری‌و مۆری واشنتۆن پۆست لە International Herald Tribune ی ۱۵ی نیسانی ۱۹۹۱.

*"وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکاو جەلال تاڵەبانی"چاوپیکەوتنیکی دیپلۆماتیکی "بەشی خۆرهەڵاتی نزیك- NEA" لە ۲۱ی کانونی یەکەمی ۱۹۹۲دا لە واشنتۆن دی سی بەمەرجیك ناوی نەبریت قسەی کرد.

*"بڕوایان بەو پڕوپاگەندانەش.... کەفەرمانیکی سەرۆکایەتی ...." لەگفتوگۆیەکی تەلەفۆنی لەگەڵ شبلی مەلات- پرۆفیسۆر لە Soas قوتابخانەی تویژینەوەی خۆرهەڵاتی‌و ئەفەریقی،
Schoolof Oriiental and African Studies.
لە۱۵ی شوباتی ۱۹۹۵دا لە لەندەن.

*"پرسیارەکانت لەوەڵامەکانی سەرۆکیان باشتر هەڵدەگرت" گفتوگۆیەکی "کایا توپیری" ۳۰ کانونی دووەمی ۱۹۹۱لە ئەنقەرە.

*"سێ سەد تا چوارسەد لاپەڕەم لەبەسەرهات .. خوێندۆتەوە" چاوپیکەوتنیکی "تورکوت ئۆزال" لەکۆشکی سەرۆکایەتی لەئەنقەرەدا، لە ۳۰ کانونی دووەمی ۱۹۳۰دا.

*"ئەو شتانەی کەمن هیشتا بیرم لینەکردوونەتەوە" گفتوگۆیەکی تەلەفۆنی لەگەڵ کامەران قەرەداخی دا، ۲ی شوباتی ۱۹۹٤ لەندەن.

*"شاندار کەچاوی بەتاڵەبانی‌و نوێنەری بەرزانی لە لەندەن، موحسین دزەیی کەوت" گفتوگۆیەکی تەلەفۆنی لەگەڵ شاندلردا، ۱۵ تشرینی یەکەمی ۱۹۹۱ ئەستەنبوڵ.

*"تکایە،تکایە،تکایە" چاوپیکەوتنیکی کامەران قەرەداخی، ۲۹ی تشرینی دووەمی ۱۹۹۱، لەندەن.

*"ئەوسا سوپای عیراق هەڵیدەگوتایە سەر.." چاوپیکەوتنیك لەگەڵ "پات تیروس"ی جیگری سەرۆکی کاروبار لە باڵوێزخانەی وڵاتە یەکگرتووەکان لە عەمان. ١٤ی نیسانی ۱۹۹۱. عەمان.

*"پێدەکەنی و دەپرسی بۆچی وام لێهاتبێ؟"، چاوپێکەوتنێکی ئەبراهام ڤیتز. ٨ی ئابی ١٩٩١.
*"کەیەکە مجار کوردو تورک کۆبوونەوە، دوایی تاڵەبانی وتی" دیارترین سەرئەنجام – ئەوەبوو – کە تورکیا وازی لەبەرهەڵستیکردنی پەیداکردنی پێوەندی راستەوخۆی لایەنی کوردی و وڵاتە یەکگرتووەکان هێنا. بڕوانە کتێبەکەی "میخائیل ئیم گونتەر" The Kurds of Iraq: Tragedy and Hope New York 1992 p.51.
هەروەها ئۆزچیری لەچاوپێکەوتنی ٢٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٩١یدا، گێڕابوویەوە: ئەزگای ژەنەراڵانی تورک لەو بۆچوونەیاندا، کەپاشماوەکەی سوپای عێراق دەتوانێت کوردەکان کەتەنیا چەکی سوکیان هەبوو، بشکێنێت راستبوو، بەڵام ئەك "بەیەك لیوا زرێپۆش" وەك حسابیان کردبوو.
*"ئەم هەواڵە نوێیانەیان بەئەندازیارێکی کوردی ئەمەریکایی گەیاند". لە چاوپێکەوتنێکی "پیتر گالبرایت"ی ٣٠ حوزەیرانی ١٩٩٣دا لەمزەغریب.
*"ریهتارد چیڤتەر ... لەبەڵێنەکەی خۆی پاشگەزبووە". چاوپێکەوتنێکی "کەندال نەزانی" سەرۆکی ئینستیوتی کوردی پاریس، لە ١٨ شوباتی ١٩٩٤ دا.
"نەزان" لەکۆبوونەوەکانی وەزارەتی دەرەوەدا.
*"بەر لەرزگارکردنی کوێت هەر بیانوویەك لەئاراد بووبێت" گفتوگۆیەکی تەلەفونییە لەگەل زالوەی خالید زادە لەواشنتۆن دی. سی رۆژی ٢١ی کانونی یەکەمی ١٩٩٣ دا کەدەڵێت:لەشایەتیدانەکەی "جون کیلی" بەردەم لیژنەی پێوەندییەکای دەرەوەی ئەنجومەنی پیرانی ئەمەریکای ٢١ی تشرینی دووەمی ١٩٩١ی تایبەت بەلێکۆڵینەوەی کەسایەتی، پێش دامەزراندنی بە باڵوێز لە فنلندا، سەرەتا کیلی سووربوو لەسەر ئەوەی کەوەزارەتی دەرەوە بەنهێنی پێشوازی لەنوێنەری کوردەکان کردووە، بەڵام کەسیناتۆر "کلەی بورن پیل"و "تالان کرانستون" پێیان لەسەر پرسیارلێکردنی داگرت، ناچار بووکە بڵێت: کوردەکان لە ٢١ی نیساندا، ئەك پێشتر لەوەزارەتی دەرەوە پێشوازیان لێکرا. بۆ زیاتر زانیاری سەبارەت بە سیاسەتی وەزارەتی دەرەوە بڕوانە "
"Civil War in Iraq لەراپۆرتی کۆمیتەی پێوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجومەنی پیرانی ئەمەریکادا
* سیاسەتەکەمان لابردنی سەدام حسێنە ئەك رژێمەکەی" بڕوانە سەرچاوەی پێشوو Civil war in Iraq

*"هەربیریان لە ٥٠ – ١٠٠ هەزار کەسیك کردبۆوە" لەچاوپێکەوتنی کاربەدەستێکی "بەشی خۆرهەلاتی نزیك – NEA" لەواشنتۆن دی. سی، ٢٨ی تەموزی ١٩٩١، بەمەرجێك قسەیکرد کەناوی نەهێنرێت.

*"هەر هیچمان لەبارەی رووداوەکانەوە نەدەزانی" لەچاوپێکەوتنی کاربەدەستێکی "بەشی خۆرهەلاتی نزیك – NEA" لەواشنتۆن دی. سی، ٢٢ی کانونی یەکەمی ١٩٩٢، بەمەرجی ناونەبردنی قسەیکرد.

*"ئیپرسراوانی سعودیە پێشنیاریانکرد" سەرچاوەی پێشووتر "Civil War in Iraq" .

*"ئیتر پێویست ناکات لەوەزیاتر بمێنینەوە" گفتوگۆیەکی تەلەفونی لەگەل کامەران قەرەداخی، ٨ی شوباتی ١٩٩٤.

* "ئێمە هەرگیز هیچ بەڵێنێکمان بەم خەلکە نەداوە" بڕوانە دیقوری‌و مووری: International Heorald Tribune Apil 15 1991.

*"کۆبوونەوەکەی سەفوانی ٣ی مارت..." بڕوانە سەرچاوەیەکی پێشوتر "کارەکە پێویستی بەپاڵەوانێك نییە" کەپێشتر ناوی هێنراوە.

*"دەتوانم بڵێم.." بەیکەر لەپرۆگرامی "چاوت بەڕۆژنامەنووسان بکەوێت"، ١٧ی ئازاری ١٩٩١، ڕۆژی دواتریش لەڕۆژنامەکاندا بلاوکرایەوە.

*"هیچ شتێکی سەدام حسێنیان پێ باش نییە": جۆزێف فیچەر کەلە International دا بلاوکراوەتەوە. March 27/1991

*" کردنەوەی قوتوی باندورە..." – کریستین مۆس هیلمز- کەلە International Heorld Tribune March 20,1991دا بلاوکراوەتەوە.

*"بێ پێچوپەنا ویستمان چاوەڕێ کۆتایی شەڕی ناوخۆ بکەین" بڕوانە دیقروی‌و مووری International Heorld Tribune April 15,1991 دا بلاوکراوەتەوە.

*"لەو شەوە ئەنگوستە چاوەی.." قسەی بەرزانیی‌و ئالەبانییە سەبارەت بە هەرەسەکە. نیسانی ١٩٩١ کوردستانی عێراق.

*""سەرگوزەشتەکەی گرنگ ساحێبقران"، چاوپێکەوتنێکی "گرنگ"ی ١٩ی نیسانی ١٩٩١، لەڕانییە.

*"ڕۆڵە کەی ئەوە ماڵ کوردە؟"، چاوپێکەوتنی "کەندال نەزان". پاریس.

*"ئەکرێت بڵێین ئەو هەموو مردن‌و دەردیسەریانەی دەمێنا..." چاوپێکەوتنی ئالەبانی. ٢٩ی نیسانی ١٩٩١. ڕانیە، کوردستانی عێراق.

*"دوای گەڕانەوە بۆ واشنتۆن دەمانویست..." چاوپێکەوتنێکی "دون کرۆم" ۳۱ی تشرینی یەکەمی ۱۹۹۱. جنێڤ.
*"جا ئێوە ئەگەر بتوانن وا لەعێراقییەکان بکەن رێی چوونە دەزگتان بدەن". چاوپێکەوتنی "کەمێ". پاریس، ۱۰ی کانونی یەکەمی ۱۹۹۱.
*"بەدەست سیاسەتێکەوە داماوە بەڕێوەبردنێکی بەردەوام‌و هەمیشەیی دەوێ" چاوپێکەوتنێکی ۲۲ی کانونی یەکەمی ۱۹۹۲ی کاربەدەستێکی بەشی خۆرهەڵاتی نزیک NEA، لەواشنتۆن دی سی، بەمەرجی ناو نەهێنانی قسەیکرد.
*"لە چل ساڵی رابردووی ..." هەمان سەرچاوەی پێشوو.
*"باشە دەتبینی..." چاوپێکەوتنێکی ۲۲ی حوزەیرانی ۱۹۹۱ی دیپلۆماتێکی ئەمەریکایە، تکای ناو نەبردنی کرد، عێراق، زاخۆ.
*" خەملاندنەکان زێباریو سامی عەبدولڕەحمان کردویانە. چاوپێکەوتنی ۱۰و ۱۱ی شوباتی ۱۹۹٦ لەگەڵ زێباریو سامی عەبدولڕەحمان، لە سەلاحەدین.

(٥)

# کیمیاگەریی کۆن - یان زێڕ بەناڵی ئاسن بوون

سالّی ١٩٩٣ وێنەی چەند ئاوداڕێکی ئەم سەدەیەی کێشەی نەتەوەیی کورد، کە شانازیان پێوەدەکرا، لەشاری سلێمانیدا بەدیوارێکی بەرزی ڕووەو شەقامێکی بازنەییەوە هەڵواسرابوون، وێنەی بەشێك لەو شەهیدە شکۆدارانەبوون کەلەشەڕەکانی ناوچەکەدا ببوونە قوربانی کێشەی کوردستان، لەگەڵ وێنەی هەندێ پێشەوای سیاسەتمەداری بەدبەختی نەتەوەکەیان، کەبەهۆی بەشداریانەوە لەبزووتنەوەکانی ئێران، عێراق، تورکیا، بەو ئاکامە گەیشتبوون، هیوایان تیادابوو کاتی گیانبەخشینی پۆستاڵەکانی هەر لەپێدابووە. ئەم جۆرە پێشانگایە لاساییکردنەوەیەکی پرۆژە بێگیانەکەی ئەو بەهەزاران وێنەیەی سەدام حسێن بوو کەبەهەمەجۆر جل و بەرگەوە، لەشێوەی بڵاوکراوەدا بۆ چەندین ساڵ بەدیوارەکانی سەرتاسەری عێراقەوە بە جۆرێکی وا لکێنرابوون کە کەس نەتوانێت شتێك بکات و چاوی لێیان نەبێت یان هەر هیچ نەبێت خۆی لێیان بپارێزێت، هەر هەمووشی وێنەی زەیتی و بریقەداری هونەری بازرگانانەی هیچ و پووچی گۆترەکاریبوو. بەڵام وێنە کوردییەکان زۆر ئاسایی و بەشێك لەکۆنە نەریتەکەی جیهانی سێیەمی پێش سەردەمی وێنە ڕەنگاو ڕەنگە هونەرییەکان و هاتنەکایەی پڕوپاگەندە تەلەفزیۆنییەکان بوون.

بەم بەخۆڕایی دڵبەڕابردوو خۆشکردنەو بەم شێوە سەیرە، بمانەوێ و نەمانەوێ تیشکێکمان بۆدەخاتە سەر دەستەڵاتە ناتەواوە لەڕابردوو گرنگترەکەیان، بەڵام گرنگ ئەوەبوو لە بیرەوەری کورددا یەکەمجارە لەشوێنێکدا سەربەستانە یادی سەرکردە بەدبەختەکانیان بکەنەوەو، هەستبکەن نەتەوەکەیان ئەو سنوورە دەستکردانەیان شکاندووە کە حکومەتەکانی ناوچەکە سەپاندبویان، ئاودێری وایان هەیە دوور لەوناوچانەی چاویان تیا هەڵهێنابوو بەچالاکی وارە خەریکبوون، کەهەندێ جار سەرنجی زلهێزەکانی دونیایان بەلای خۆیاندا ڕاکێشاوە، ئەگەرچی ئەوان هەمیشە خۆیان لەهەمووی گێلکردووەو گەر نیوە دەرفەتێکیشی بۆیان تیادابوایە هەربە پشتگوێخراو دەیان هێشتەوە، بەڵام ئێستا سەیرەکە لەوەدایە ئەم وێنانەی بەمجۆرە لەشوێنێکی

واگشتیدا دانراون، چاکەی پارێزگاریکردنەکەی بۆ ئەو خۆرئاواییانە کە کردویانەتە ئەمرێکی واقع.

وێنەی: "شێخ سەعید" کەپیاوێکی ئایینی و سەرکردەی شۆڕشێکی کورت تەمەنی جیاخوازی تورکیابووەو ساڵی ١٩٢٥ کۆتایی پێهاتووە، "قازی محەمەد" کە ئەمیشیان سەرکردەیەکی ئایینی بووەو "محەمەد ڕەزا پەهلەوی" شای ئێران، لەسەر دامەزراندنی کۆمارە تەمەنکورتەکەی "مەهاباد" لەسێدارەی دا، "عەبدولڕەحمان قاسملۆ"ی ئێران کە ساڵی ١٩٨٩ پۆلیسی نهێنی کۆماری ئیسلامی لەشاری ڤییەنا تیرۆریانکرد، "مەلا مستەفای بەرزانی" کەبانی بەسەر هەرسێکیاندا کێشابوو، نیو سەدەی ژیانی تێکەڵ بە کێشە نەتەوەییە یەك لەدوای یەکەکانی کورد ببوو، بەرزانی، ئەگەرچی هەڵەی زۆری هەبوو، بەڵام لەناو ڕێزلێگیراوەکاندا شایانی ئەو شوێنە دیارەبوو.

لەناو هەموو شەهیدە پاڵەوانەکانیاندا تەنیا وێنەی بەرزانی لەهەموو شوێنێك بەرچاودەکەوت، هەر لەماڵی کوردە ئاساییەکانی ناو تورکیا یان ئازەربایجانەوە بیگرە تا دەگاتە دامو دەزگای ڕۆژنامە نووسە بەناوبانگەکانی واشنتۆن. ژیانی دوورودرێژی بەرزانی ببووە نەفسانەو کورد شانازی بە چاپوکێتی و هەڵمەتە کەم هاوتاکانی شەڕکردنەکانییەوە دەکردو تا دەیان ساڵ وەك باوەڕێکی ئەمری نەتەوەییان، لەهەرکوێ بژیانایە بەسەدان جار بۆ یەکتریان دەگێڕایەوە. بەرزانی مەرجی سەرەکی سەرکردایەتی، کەبەدەستهێنانی هەست بەگوێڕایەڵیتی خەڵکەکەیە بەڕادەیەك بەدیهێنابوو کە بەژن و پیاریانەوە دەست لەهەموو کارێکی خۆیان هەڵبگرن و بەدویکەون، تەنانەت لەو شتانەشدا کە هێنانەدییان مەحاڵبێت.

لەکاتی باڵادەستی خۆیدا، جەنگاوەری بێسەوادی عەشیرەتەکانی لەگەڵ هەزاران پزیشك و ئەندازیارو مامۆستاو پۆلیس، کەژیانی ئارامی شاریان بە ئەشکەنجەیەتی خەباتی ناو چیا گۆڕیبۆوە، یەکخست، بەڵام واش دەبوا یەکبینە لەبەربەرەکانی عەشیرەت و هێزە سیاسییە ناحەزەکانی خۆیدا بوایە، جاشەکانیش کەبەردەوام ویستویانە تۆڵەی کۆنە قین و دوژمنایەتیان بەچەك هەڵگرتن و پارەی میری و چوونەپاڵی نوێ بکەنەوە. لە لایەکی تریشەوە بەلای کەمەوە خۆسەپێنێکی کەم سەودای قنج و وەستاو ئەچەماوەی وابوو کە هەرگیز ڕێی نەدەدا ئەو کوردانەی لەخۆی ڕۆشنبیرتربوون بەشداری دەستەڵاتدارێتی بکەن، باوەڕی ساویلکانەشی بەهێزە بیانییەکان وای لێکردبوو کۆ لەدانەوەی کوردە ئێرانییەکان بەڕژێمە دوژمنەکەیان نەکاتەوەو کارەساتی گەورە بۆ کورد بێنێتەکایەوە، ئەم ناکۆکیانە هەندێ لە دڵڕەقیتی ئەم پیاوەی دەربەخست، کەژیانی لاوێتی لە دونیایەکی بێ یاسار پۆلیسدا بەسەربردو لەمجا

بەرەبەرە ڕووەو هێزە پۆلیسی و دایلۆسینەرەکانی حکومەتە نیوەندییەکان بووەو. دواتریش وەك سەرکردەیەکی کامڵ هەڵسوکەوتی لەگەڵدا کردن. لەبەرابەرودا وەك عەشایەرو دەربەگ بیریدەکردەوە، کەهەموو هیوایەکی ڕووخاندنی حکومەتە ناوەندەکانە، چونکە وەك سروشتێکی کۆنی چیاییەکان پارێزگارێتی ئەو سنوورەی بۆ نەدەکرا کەبۆی دیاریدەکرا، هەربۆیەش زیاتر کاری لەبەرزانی کردبوو کەوەك نیشە ناراموو ڕێکخراوەکانی دی هەر بزووتنەوەیەکی ئازادیخوازانەی نەتەوەیی پێویستێتی، شتەکە بەباش بگەڕایە بەرزانی دەبووە سەروەری کوردستان و بەسەرکردەی سوپایەکی مۆدێرن لەقەڵەم دەدراو، بە بەناوبانگترین سەرکردەی کورد "سەلاحەدین" کەسەرکردەی لەشکرێکی ئیسلام بوو خاچدارەکانی شکاند بەراورد دەکرا، خۆ ئەگەر نیشەکەش خراپ بکەوتایەتەوە ئەوا بەجۆرێکی وای لێدەهات کەتەنانەت یەکێك لەکوڕەکانی خۆی گومانبکات و بپرسێت و بزانێت باوکی ئەو قوربانیانەی لەهێزی عەشایەرەکان و تەنانەت لەوانەی خۆشی دەیدات بەڕاستی بۆ هێنانەدی ئامانجە نەتەوەییە ڕاگەیەنراوەکانێتی. باسکارانی کوردو بیانی کە لەبەرزانییان دەکۆڵییەوە دەگەیشتنە بڕوایەکی وا کەدژە ناوەندییەك لە بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورددا بەدیبکرێت، نووسەرێك دەڵێت: "خەباتی نەتەوەی کورد بەدرێژایی سەدەی بیست هەر لەنێوان کوردو دەستەڵاتدارە ناکوردەکاندا نەبووە، بەڵکو لەنێوان چەمکی عەشایەریانەو حکومەتە مۆدێرنەکاندا، ژیانی توندڕەو ژیانی ڕوو لەڕۆشنبیرێتی، (ژیانی ئەو خەڵکە چیاییانەی پێیان ناگەیت و ئەوانەی لە پانتاییەکاندا دەژین و ملدەدەن) لەمجۆرە ناڕێکییە بۆتەهۆی پەرتبوونی بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد"، کەتائێستاش بەشێوەی جۆراو جۆر زیاتر هەر پەرتپەرتە.

مەلا مستەفای بەرزانی ساڵی ١٩٠٤ی زاینی هاتۆتە دونیاوە، سەرەتای بیرکردنەوەی؛ تایبەتمەندێتی هەردووخێزانەکەی، چ وەك ئاغاو موڵکداری ئەوکاتەو چ وەك لایەنی گیانی شێخانی ئاین پەروەر کاریان تێکردبوو، کەبەجووتە سەرچاوەی زۆربەی ئەو هێزانەن کەبەسەر دەرەوەی شارەکانی کوردستاندا زاڵبوون. ساڵی ١٩٧٩ بەدەم ئەشکەنجەیەکی دەروونی زۆرەوە کۆچی دوایکرد. ئەوەندەی هێز خڕ کردبووەو سنووری بزوتنەوە نەتەوایەتییەکەشی وا پێشخستبوو کەلەناو ئەو حکومەتە دڕندەو خوێنڕێژە بێشەرمانەدا، توانای بەرگریکردن و مانی هەبێت. کەئەم خەریکبوو هەراش دەبوو بەرزانییەکان بەوە ناسرابوون کەلەهەموو ئەوانی دی دڵڕەقترین، عەشیرەتێکی پچووکی هەژاری ٧٥٠ماڵ، وەك خێزانێك لەسەر پارچە زەوییەکی چەپەکی ناو چیاکانی ئەوبەری باکووری خاکێك بڵاوببوونەوە کە بەعێراقی بوونیان لەچارە نووسرابوو، لەسەردەمی عوسمانێکانیشدا ناویان بەوە دەرکردبوو کە سڵ لە سەروخۆیان

ئاکەنەوەو "تاوبانگەکەشیان لەجۆری شەڕکردنەکەیانەوە هاتبوو" ئەویش بەهۆی ئەو دەسەڵاتەی وەك میانگرێکی سەرکردایەتیی ئاینیی تەریقەی نەقشبەندی لەناو دەروێشە سۆفییە ئیسلامەکاندا بۆیان مابۆوە.

ئەوسا هێشتا خەڵك ڕەوەندبوون و گەرمیان و کوێستانیان دەکرد، "بەرزان"یش "شارۆچکەیەکی پچووکی بادینان بوو کە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی لەچیاکانی هەکاری جوێکەرەوەی عێراق و تورکیای ئەمڕۆدا بۆی ڕام نەکرابوو، چەقی ئەو ڕەوەندانە بووە بەکۆمەڵگەیەکی سەیرو خاوەنی بیروڕایەکی باشی وا کەبۆ پەرەسەندن ئەملواو، جوتیارو موسوڵمان و دیانی پەنامەندەیان تێدابوو کەسەریە هیچ عەشیرەتێك نەبوون. عوسمانییەکان بەهۆی ئەو ملنەدان و بەڕوودا وەستانەوەو یاخیبوونانەیانەوە باپیرو باوك و برایەکی مەلا مستەفایان لەسێدارەدا، مەلا مستەفا شانازی بەوەوە دەکرد کە بە شیرەخۆری لەبەندیخانەدابووە، بەڕاستیش ئەو هەر نۆ مانگان بووە کەدایکی و چەند ئەندامێکی تری خێزانەکەیان لەموسڵ بەندکرابوون. وەك برا پچووکێك لەناو کۆمەڵگەیەکی دەرەبەگانەدا کە سەردارێتی خێزان تیایدا هەردەبێت بۆ بەتەمەنترین نێرینەیان بێت ڕێگەی بوونە سەردارێتی لێگیرابوو.

مەلا مستەفا کە"مەلا" کەی (هیچ پێوەندییەکی بەمەلایەتیی ئاینییەوە نییە) پەروەردەی دەستی "شێخ ئەحمەد"ی برای بووە، کە ١٢ ساڵ لەو گەورەترو زۆریشی کارتێکردبوو. لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمدا، باپیریان کەلەپەری تەریقەی نەقشبەندییەوە کۆنفیدراڵییەتی بەرزانی خستبووە سەر نەخشەو ئەو بۆشاییەی پڕکردەوە کە عوسمانییەکان بەڕوخاندنی میرنشینە کوردییەکان هێنابوویانەکایەوە. شێخ ئەحمەد ئەگەرچی بەبڕوای کۆنیشی نەبووبێت بەڵام هەر ڕێزی سەرکردەیەکی ئاینی لێگیراوە، لەسەر پارێزگاریکردنی سروشتیش سووربووەو ئەیهێشتووە بەرزانییەکان ڕاوەکەو و بەرانە کێوی و ئاسک بکەن و فرمانیشی پێکردبوون کەدارنەبڕنەوە، ئەوەش گەڕانەوەیە بۆ پێش ئیسلام، دوژمنەکانیشی پڕوپاگەندەی ئەوەیان بۆ دەکرد کەوتاری نوێژی هەینی بەناوی خۆیەوەیەو لەبری ڕوو لە "مەککە"کردن ڕوو لەبەرزان دەکەن، فرمانی بەوانەش دەکرد کەلەسەر ڕێ و شوێنی دەرویشتن گۆشتی بەراز بخۆن و شەرابیش بخۆنەوە، ئازادی سێکسیشی بەلاوە ئاسایی بووە. جا ئەوانە ڕاستبووبن یان درۆ ڕۆڵیان لەناوبانگزڕاندن و لەنێوەند دەرچوونیا هەبووە. کەمەلا مستەفا لەناو خێزانەکەیاندا ناوی دەرکرد، لەحزووری شێخ ئەحمەددا بەوپەڕی ڕێزەوە هەر بەپێوە دەوەستا، پێشی لەسەر ئەوە دادەگرت کەدەبێت لەسەرخوان پێش هەموو کەس خزمەتی ئەو بکرێت.

خێزانی شێخ ئەحمەد خۆیان وا دادەنا کەنیمچە پەرستنێك بپەرسترێن، گەلێك لە کوردەکانیش پێیان وابوو لەکاتی تەنگانەدا دەستێکی نهێنی یاریدەدەری بەرزانییەکانە، رەنگە کەمی زەوی و زاریان و بێ پیتی خاکەکەشیان وای کردبێت کە لەشەردا زۆر بەتەنگ زەرەرو زیانەوە نەبن، کوردیش پەندی وایان هەیە کەدەڵێت:"شەر لەبەتاڵی باشترە" و "بەرخی نێر بۆ سەربڕینە". بەرزانییەکان لەکاتی شەردا دیسپلینێکی بێهاوتایان هەیە، یەکگرتنەوەی ئاین و دەستەڵاتدارێتی دونیایان سەرکردایەتییەکی سەرکەوتووی وای لا بەرجەستەکردوون کە هێند ملکەچی شێخەکانیان بن، تەنانەت لای ئەو بیانیانەی دەچوونە ناویان دەیان وت، پیاوانی عەشیرەتی بەرزان هەر کەداوای خۆ بەکوشتدانیان لێکرا ئیتر بێنەوەی لەهۆکەی بپرسن خۆی بۆ دەکوتن.

مەلا مستەفا کورتەباڵایەکی تێکسمراوی بەهەڵپەبوو، لەشێکی بەتوانای وای هەبوو بەرگەی زۆر شتی دەگرت، برۆ پڕو چاوە ڕەشە تیژەکانی بەجۆرێکبوون ڕێزی بەسەر بەرامبەرەکەیدا دەسەپاند، کەسایەتییەکی هێند بەهێزیشی هەبوو کە کوردەکان چەند لێی دووربوونایە هەستیان بە کارتێکردنەکەی دەکرد. سەرکردەیەکی نزیك لە بەرزانی خۆیەوە دەیوت:" ئەندامانی خێزانەکەی بەرزانی هەریەکەو خۆی بەمیرێك دادەنێ"، کەهەڵس و کەوتی بەرزانی بیر دەکەوتەوەو دەیانگێڕایەوە بۆ سالانی زووی بەرزان، دەیوت:"لەو شاخ و بن داربەڕووانەدا دەکرێت پێشبینی هەموو شتێك بکەیت و خەیاڵ و خەونی دوور لەواقیعیش ببینی" بەلام ڕۆژێك بێت و خەیاڵەکەت راست دەرچێت و بێتەدی، خەونەکانی مەلا مستەفا هاتنەدی ئەگەرچی ماوەیەکی خایاند. جارێك مەلا مستەفا لەتەمەنی ٢٦ ساڵیدا و لەنێوارەیەکدا کەسەرکردایەتی یەکەم شۆڕشی دەکرد دەرکی بەشتێکی والکرد کەدەبێت "سەرکردایەتی لەدەستبگرێت".

مەلا مستەفا بەهەرەی خێرابۆچوون و تێگەیشتن و توانایەکی سروشتی لە لێکدانەوەو شیکردنەوەدا هەبوو، زۆر بەدەستوبردانەش بڕیاری دەدا، هەرچەندە تەنیا قۆناغی سەرەتایی و- شەش ساڵێك خوێندنی تایبەتی و چوارساڵێکی لەحوجرەیەکی ئاینی چەپەکی ناو دارستاندا خوێندبوو- بەلام ئەوانە جێی سەرسوڕمان نەبوون. (ئەگەرچی سیستمی دەرەبەگایەتی کورد کەبەرزانی تیادا پەروەردە ببوو لەگەڵ حکومەتەکانی دژیان، تاماوەیەکی زۆر پێکەوە گومانیان لەخوێندن و ئەو سەربەستیانەش هەبووکە بەدوایدا دەهاتنە ناو چینەکانی خوارەوە). بەرزانی جگە لەزمانی-ئەتەوایەتی خۆی، شێوەی کرمانجی ژووروو، بە عەرەبییەکی تا ڕادەیەك ڕەوان و فارسی و ڕووسیش دەدوا، قسەکانی بەکورتە چیرۆکی کوردی و فارسی خەرافیانەی وا دەڕازاندەوە کە کەسایەتییەکانیان ئاژەڵ بوون. لەساڵانی دوایشدا بەردەوام لە ڕوودلوە

دەرەکییەکانەوە نزیکبوو یەکبینە رادیۆیەکی "بڕاون"ی ئەڵمانیایی، کە یەکێك بوو لەشتە ئازیزەکانی خۆی، بە گوێوە دەناو لەسەر شەپۆلی کورت هەواڵەکانی دونیای بەعەرەبی لێوە دەبیست.

مەلا مستەفاش وەك زۆر لەسەرکردەکانی جیهانی سێ حەزی بە ڕووبەڕووبونەوە نەدەکردو نادیموکراتیش بوو، هەمیشە لە پیاهەڵدەران و خۆنزیککەرەوەکان بەگومان بوو هەستیشی بەفرت و فێڵەکانیان دەکرد، لەدونیایەکی واشدا دەژیا کەلەناست هەڵسوکەوت کردنە ئاساییەکەی خۆیدا دەبوا دەست و پێوەنی، ئەگەر ئەوە بۆ وتن بشێت، بەدەورەوەبن. بەخەنجەرە درێژە چەماوەکەی ناو پشتێنی سەر شەرواڵە پان و پۆڕەکەی و، سیفاری بەتووتنی خۆماڵی پێچراوەی بەسەری دارجگەرەیەکی درێژەوە دەکرد کەهەمیشە بەچەقۆکەی لەدار گێلاس دایەتاشی و بەچوار مەشقییەوە پێشوازی لەمیوانەکانی دەکرد، لەکاتی چا خواردنەوەشیدا بەردەوام کلۆ شەکرێکی ڕەقی لەنێوان ددانەکانی دادەنا، جاروبارێش لەکاتی پشوودانیدا شەترەنجی دەکرد. ڕوودلوەکان هەرچەنێك ناخۆشبوونایە بۆ ئەو جیاوازی نەبوو چونکە هەمیشە کاتی بۆ پێشوازیکردنی میوانی بیانی و پێشمەرگەی ئاسایی و سەرکردەکانیان دەدییەوە.

بۆ لەش سووکی خۆی، لەکاتی کارکردنیا جل و بەرگی قورس و ئەستووری لەبەر نەدەکرد، ئەزموونی ڕۆژگاریش وای لێکردبوو شەوانە، بۆ چەواشەکردنی ئەو سیخوڕانەی کەپێی وابوو لەنزیکەوە ئۆتۆماتیکیانە بەدوای هەموو جوولەیەکییەوەن، خۆی و پارێزەرەکانی لەگوندێکەوە بۆ گوندێکی دی جێگۆڕکێیان دەکرد. ناپاکیکردن لەناو کۆمەڵگەی کوردەواریدا بنجی داکوتابوو بۆشیان مابۆوە. ئازووقەو کەلوپەلە ئاشکراکانیان ئەوەیان نەدەهێنا تۆماربکرانایە، بەلام بەنهێنی لەناو ئەشکەوتە زۆرو زەبەندەکەی لەکاتی بۆردومانی فڕۆکەدا خۆیانیان تیادا حەشاردەدا، چاو برنج و شەکریان دەشاردەوە. لەنوستنی سەر زەوی و ئاسمان بەخۆداندا هاوبەشی پیاوەکانی خۆیی دەکرد. ئەگەرچی پەندێکی تورکی هەیە دەڵێت: "کورد بەڵەدەر کافرێك موسوڵمانە" بەلام مەلا مستەفا ئەگەر پێنج فەرزە فریای نوێژکردن نەکەوتبێ ئەوا نوێژەکانی بەیانی و ئێوارەی بەڕێکوپێکی کردووەو کاتی بۆ دەدۆزیەوە. ئازایەتییەکەشی بەڕادەیەك بووە لەگەرمەی بۆردومانی خەست و چڕدا ناسرابوو کە هەستیشی پێناکات. بڕیاری تەکنیکی سەربازیانەی بۆ سەرکردەی لەشکرەکان جێدەهێشت، کەپیاوانی هەڵبژاردەی عەشیرەتەکەی بوون و، یەکبینەش وای حەز دەکرد کەبڵێت: "دەتوانم بەهەزارو پێنج سەد بەرزانییەوە بەرگری لەپاشماوەی وڵاتەکەم بکەم" زۆرجار ئەوقسەیە کوردە نەتەوەییەکانی لەوە دڵگران دەکرد کە بۆئەو بەرزانی لەکورد گرنگترە.

هەندێك بێزەحمێتیشی هەبوو، "مارگرێت جۆرج" ئافرەتێكی گەنجی دڵگەرمی دیان بوو لەریزی پێشمەرگەدا، لەسەرەتای شەستەكانەوە وەك سەرلقێكی سەركەوتوو، كەهەموو پێشمەرگەكانی پیاوبوون، خۆی سەپاند. پڕوپاگەندەی كورد كردیانە جاندارکی خۆیان و، پێشمەرگەكان لەكاتی شەڕدا وەك تەلیسمێك وێنەكەیان بە بەرزكی خۆیان دەدا. بەڵام كە چوونە پێشەوە لەكەڵلەی داو ویستی لەئەنجومەنی باڵای سیاسەتدا دەنگ بەدەست بهێنێت، كارەكەی لەخۆی تێكداو دەستێرەشی كەوتە كزی، هەرچەندە بەسەرهاتی سێكسیانەی لەگەڵ "عوبێدوڵا"ی كوڕە گەورەی بەرزانی و زۆری تریشدا هەبوو بەڵام چاوی لێپۆشرابوو. گەیشتە ئەوەی كەرۆژنامەنووسە بیانییەكان لەسەردانی كوردستانیاندا داوای كۆبوونەوەیان لەگەڵدا دەكرد، وایان پێ ڕادەگەیاندن كە گوایە تووشی نەخۆشی گەڕی هاتووەو چۆتەوە گوندەكەی خۆی. ڕاستییەكەشی مەلامستەفا وەك ڕێسایەك لە بەڵێوزدانی ژیانی پێشمەرگەكانی، ووریایانە فرمانی كوشتنی دابوو.

بەرامبەر نەریتە تیەگەرییەكانیش زۆر دڵڕەق بووە، ڕۆژنامەنووسێكی ئیسرائیلی گێڕایەوە كە مەلا مستەفا چۆنچۆنی لەگەڵ پێشمەرگەیەكدا ڕەفتاریكردووە، كاتێك لە ئاشتبوونەوە، ڕێككەوتنەوە، یان لە خوێندانەوەی تاوانێكی شەرەفدا ملی نەداوەو لەسەر كوشتنی پیاوەكە سووربووەو ویستوێتی بەدەستی خۆی تۆڵە بستێنێتەوە، بەرزانی دەستی درێژكردووەو لەژێر پەتۆیەكەوە لەجانتاكەیدا، كەخۆی ناوی دەزگای لێنابوو، قەڵەمێكی پاركەری زێڕ كەبەدیاری بۆی هاتبوو لەگەڵ دەفتەرێكەو چارێلكەیەكی چوارچێو زێڕینی لێدەرهێناو فرمانێكی نووسی كە دەستدرێژیكەر بگیرێت و دادگایی بكرێت و بەكوشتن تاوانباریكرێت و بەرلە خۆرهەڵاتن بكوژرێت. كەئیسرائیلییەكە لێیپرسیبوو داخۆ بۆچی خۆی بەنووسینی ئەو كاغەزەوە خەریككرد؟ بەرزانی بە توندی وەڵامی دابۆوەو، وتبووی: ئەی دادوەری چۆن دێتەدی؟.

ئەم ڕادەربڕینەو بەوجۆرە گاڵتەجاڕێتییە، ئەو دوورییە دەربەخات كەبەرزانی لە كەسایەتییەكی ناسراوو ناوداری جیاوە بڕیوێتی تا گەیشتۆتە سەركردایەتیكردنی نەتەوەكەی، كە ئەم هاتۆتە دونیاوە بیرو باوەڕی نەتەوایەتی كورد هێشتا زۆركەم ناسراوو بڵاوبووە. ڕاستییەكەشی زۆر لەمێژە نووسەرانی كورد شێوەی نوێی نەتەوەیی كوردیان تەنیا بە پەرەسەندنی ڕۆشنبیری و خوێنەوارییەوە بەندكردووەو، كوردستانیشیان بەیەكێك لەوردوا بەشانەی عوسمانییەكان داناوە كەئەوشتانەیان بگاتێ. فرمانەكانی بابی عالیش لەگەڵ ئەو سەرەك عەشیرەتە كوردانەی بەڕوویا دەوەستانەوە زۆر ئاشكرابوو، یان لەلاوە دەیكوشتن یان

دیلی دەکردن یان بە بەرتیل و بەرتیلکاری و شەرەف لەدەستدان ڕسوای دەکردن و کۆتایی پێدەهێنان.

لەسەرەتای سەدەی نۆزدەیەمەوە کوردەکان هەوڵە یەک لەدوای یەکەکانی خۆیانیان بۆ بەرەنگاربوونەوەی راستەوخۆی عوسمانییەکان، لەپێناو یەکگرتنەوەی کوردستاندا دەستپێکرد، هێزەکانی عوسمانی خۆیان هۆی بەرپابوونی ئەوشۆڕشانەبوون کە لەدژیان کرا، سووربوون لەسەر راگرتنی ئەو ئەمات و تێکشکانانەی کە لەگرتنی ڤییەنای سالی ١٦٨٣و بەرەنگاریکردنەکانی دواتری بەڵقان، لەشێوەی شۆڕشی هەمەجۆردا دژیان دەکرا مەترسی دەستگرتنی. ڕووسەکانیش بەسەر ماڵ و حاڵیاندا، وای لێکردن زیاتر بایەخ بە کۆنترۆڵکردنی تەواوی ئەو ناوچە مێرنشینە نیمچە خودموختاریانە بدەن کەلەبەشە بەرینەکەی کورددا بڵاوبیوونەوە.

چاکسازییەکانی سالی ١٨٣٩ ی عوسمانییەکان کەبەناوی "تەنزیمات"ەوە بۆ کۆتایی پێهێنانی سێ سەدە لەو شێوە حوکمڕانێتییە ناتەواوەیان دایانڕشتبوو، وەک میراتی پاش شەڕی چالدێرانی ١٥١٤و سەرکەوتنە دڕندانەکەی سولتان سەلیم بەسەر شا ئیسماعیلی ئێراندا بۆیان مابۆوە، بەردەوام بەرەو ئاڵۆزتر دەبۆوە، کەلەو شەڕەدا بابی عالی عەلی زۆربەی عەشیرەتە کوردەکانی بەلای خۆیدا راکێشابوو. کەچی لە سالی ١٦٣٩دا هەردوو ئیپراتۆریەتی عوسمانی و فارس نەخشەی سنووری نێوانیان بەدابەشکردنی کوردستانی سەروو ڕێکوپێک کردەوەو ئێستاشی لەسەربێت ئەو سنوورانە وەک سنوورێک بۆ دەوڵەتە مۆدێرنەکانی ئەمڕۆی عێراق، ئێران، تورکیا، ماونەتەوە. عوسمانییەکان وەک پاداشدانەوەیەکی لایەنگرێتی رەسمیانەی کورد بۆیان ١٦ حوکمەتۆلکەی کوردی خاوەن دەستەڵاتی خودموختاری دانێ، بەمەرجێک ئەوانیش دەستکەوتیان لەباج وەرگرتنیان و چەکدار لەکاتی پێویستدا بنێرن و خۆشیان دەبینی لایەنی کەمی ڕێکخستن و یاسا بکەن.

بۆچاکردنی ئەوبارە چل ساڵییە، عوسمانییەکان چەند پەلامارێکی سەرلەمێزی یەک بەدوای یەکیان بۆ ڕێکسختن و چۆکیان بەزۆربەی ئەو مێرنشینانەی کوردستان کە دەیانویست بارەکەی خۆیان بپارێزن دادا. هەندێ کوردی ناو هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی هاریکاری یەکتریان لەدژی گەورە دووردەستەکانی کونستانتینۆل و تارانی خۆیان دەکرد، بەڵام زۆرجاریش کورد لەو سێ جەنگەی نێوان عوسمانییەکان و ڕوسیادا شەڕیان بۆ عوسمانییەکان دەکرد، لەکاتێکدا چەند کوردێکی ناسراو بێلایەن مانەوە. عەشیرەتە دیانەکان هەندێ کەڕەت پشتگیری شۆڕشگێڕەکانیان دەکردو جارجارەش ملیان بۆ نێوەند کەچدەکرد عوسمانییەکان هەمیشە لە

ڕاكێشانی چەند عەشیرەتێكی كورد بەلای خۆیاندا دڵنیابوون، بەڵام شۆڕشگێڕانی كورد منەی پارەیان لەڕوسیاو بەریتانیا دەكردو جاروباریش دەستیان دەكەوت. عوسمانییەكان بەپارەڕشتن و تەڵەنانەوە پاشقولیان لە كورد دەگرت، خۆ ئەگەر جاروبار كورد لەجەنگێكدا سەركەوتنیان بەدەستبهێنایا ئەوا لەدانوستانە یەك لەدوایەكەكانی دوای جەنگەكە بێگومان بەفێڵ سەركردە كوردەكانیان دووردەخستەوە یان دیلیان دەكردن یان لەلاوە دەیانكوشتن.

بەرامبەر بە دڵساف و خۆشباوەڕی كورد دوژمنەكانیان هەمیشە فێڵبازو پاشقولگربوون. ساڵی ١٨٨٥ میر نیزار كە سەرتیپێكی سەربازیی ئێران بووە، سەركردەیەكی كورد "هەمز ئاغا"ی قایلكرد كە "تا پێت لەسەر زەوی بێ هیچ خراپەیەكت لەگەڵدا ناكرێت" بیباتە ناو چادرەكەیەوە، كەچی هەر كە قاچی نایە ناو خێوەتەكەوە كابرای فارس فرمانی كوشتنی بەچەند سەربازێك دا كەلەناویا خۆیان قایمكردبوو، ئەوانیش تەقەیان لەمیوانەكەی كردو كوشتیان، هێشتا لاق دەوەشی لێدەدا كەڕێزی بۆ لەسەكەی خۆی داناوە" چونكە شەیتانانە پێشتر فرمانی هەڵكەندنی زەوی ناو چادرەكەی داوەو بەڕەیەكیشیان لەسەر چاڵەكە دانابوو تا هەركاتێك لەنێچیرەكەی دەدرێت لەسەر زەوی نەبێت. بەرامبەر بەوە كوردیش دەبێت دڵڕەق و پاشقولگربێت: ئیسماعیل سمكۆ ئاغای سەرۆك عەشیرەتی شوكاك لەیەكەمین ٣٠ ساڵی ئەم سەدەیەدا چەند چەكدارێكی هەڵاتووی بە بەڵێنی سەرسەلامەتی و ئازادكردن بەدیل گرت، دوایش پیاوەكانی مەچەكی دەستی ڕاستیانی تاسەر ئێسك بڕیوەتەوەو دەمارەكانی ملیشیان قرتاندووەو سەریان بەسەر شانیانەوە كەوتۆتە تەكە تەك ئەمجا بەرەڵایانكردوون.

بزووتنەوەی نەتەوەیی كورد جاروبار بەكۆڕپەیی لەدایك دەبوو دەكەوتە جموجوڵ و باڵەفڕە. شێخ عوبەیدوڵای شەمدینان هەردووساڵ پێش سەركردایەتیكردنی شۆڕشەكەی ساڵی ١٨٨٠ی نزیك سنووری عوسمانی و ئێرانی، كەلەسەرەتادا سەركەوتنی بەدەستهێنابوو، سووربوو لەسەر "كورد گەلێكن تایبەت بەخۆیان، ئاینی جیاوازو یاساو دابونەریتیان ئاشكرایە" دواتر لەنامەیەكیدا كەبۆ جێگری كۆنسڵی بەریتانیای ناوچەكەی ناردبوو، ڕایگەیاند كەسەرەك عەشرەت و كاربەدەستانی كوردستان چ تورك بن یان فارس و دانیشتوانی سەراپای كوردستان خۆشی، ڕێكن لەسەر ئەوەی ئەم حاڵەتە لەگەڵ هەردوو حوكمەتەكەدا تاسەر بەڕێوە ناچێت. سوپای عوسمانی و فارسیش بۆلەناوبردنی شۆڕشەكەی عوبەیدوڵا یەكیانگرت و دایانمركاندەوە، كەلە مێژە هێزەكانی ناوچەكە لاریان لەوە نییە پێكەوە بۆ هاڕینی هەر ڕاپەڕینێكی بزووتنەوەی نەتەوایەتی كورد كەهەڕەشەیەكی ڕاستەقینەی لەسەلامەتی سنوورەكانیان هەبێت، كاربكەن. ئەمجۆرە ڕێكەوتنەش هیچ ڕێگایەكی لەوە نەدەگرت كە حكومەتەكانی ناوچە، تەنانەت لەم

سەدەی بیستەمەشدا ڕاپەڕینی کوردان بۆ کارکردنە سەر ڕژێمەکانی دراوسێیان بەکاریهێنن. حکومەتانی ناوچە هەرلەکۆنەوە لەوکارەیاندا وەستایانەو زۆر وریایانە کەم کەمو بە باشی لەدەستخستنە ناو شۆڕشەکەیانیان دەکۆڵییەوە ئەمجا ڕێگایان پێدەدان کەلەتاو خاکیانەوە دەستپێبکەن و تەنانەت پشتگیری ئابووری سوپایشیان دەکردن. شۆڕشگێڕانی کورد لەهەریەکێک لەم وڵاتانەوە دەرسێکی وایان وەرگرتووە کەلەیەک کاتدا ڕاپەڕین لەدژی تەنیا یەک هێزی ناوچەکە بکەن، پشتگیریکردنی تەواوی حکومەتێکی ناوچەکە یان هەر هیچ نەبێت بێلایەنییەکی پۆزەتیڤانەیان هەمیشە پێویست بووەو ئەوەش دەرئەنجامێکی ئاساییە.

لەگەڵ پتەوکردنی چارەسەرو ڕێکخستنەکاندا "تەنزیمات" کۆنە هاوسەنگییەکەی کوردستان لەچارەسەر دەرچووبوو، لەبری ناکۆکی هەمیشەیی نێوان عەشیرەت و تیرەکانیان بەپێی بوون و نەبوونی یاساو ئاسایش، سامانیان زیادو کەمیدەکرد، ئەو یاساو ئاسایشەی کەلەسەرەتای سەدەی بیستدا "بەهیچ جۆرێک لەدەری شارە گەورەکاندا نەمابوو". بەهۆی دەستەڵاتی برایانەو دەروێشانەی نەقشبەندی و قادری کەعەشیرەتەکانی لەیەکتر نزیک کردبۆوە، ڕادەیەکی بۆ پشێوییەکەی نێوانیان دانابوو، ئەگەر لەوەنەبوایە دوژمنایەتییە کۆنەکە زۆر کەرەت شەیتانی دەخستە نێوانیانەوە. بەڵام لەسەرو ئەوانەشەوە کۆمەڵانی کورد بە دواکەوتوویی مابوونەوەو سەرکردەکانیشیان دوورخرابوونەوە یان حکومەت لەکونستانتینۆپل کڕیبوونی. بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد سەریهەڵداو، لەپاڵ هەمان هەستی کۆمەڵانی عەرەب و بلقانەکانی عوسمانیدا گەورە نەشونماکردن، بەڵام دواتر هەموویان بەدەست "ترکیا الفتاة" وە، کە ساڵی ١٩٠٨ هێزیان گەرتە دەست دەمکوتکران.

ئەم ڕۆچوون و لێژبوونەوەیە پێشوییەکی وای هێنایە کایەوە کەهەرگیز کاتی لەوە باشتری بۆ هەڵنەکەوتبێت. یەکەم جەنگی جیهانی ئیمپراتۆریەتەکانی عوسمانی و نەمساوی و هەنگاری و ڕووسی ڕامالی و بەهیوایی مافخوراوانی ئەو خاکە بەرینەی گرتەوە. لەم جەنگەدا کورد کەلە قەلاچۆکردنەکەی ساڵی ١٩١٥ی ئەرمەنییەکانی دراوسێیاندا بەشداربوون زۆریان لەسەرکەوت و، تورکیا کوردیشی وەک ئەرمەنییەکان، لەترسی ئەوەی نەچنە پاڵ ڕوسە دوژمنەکانیانەوە لەناوچەی شەڕەکەو لەباکووری خۆرهەڵاتی دوورخستبوونەوە، کەبەکاروان لەبەر سەرمای زستانی ١٩١٥ - ١٩١٦دا ڕووەو خۆرئاوا ڕادەگوێزران بەدەیان هەزار کەسیان لێ ڕەقبۆوەو مردن.

بەمجۆرە کورد لەچاکترین دەرفەتدا کەبۆ نەتەوەکەی ڕەخسا، نەیتوانی چاک خۆی ئامادەبکات کەئەوەش سەیر نییە. دوانزەیەمین خاڵی پەیمانی سەرۆک وودرۆ ویلسون کە لەچواردە خاڵ پێکهاتبوو، پەنجە دەخاتە سەر "دەرفەتی بێ چەن و چوونی ئۆتۆنۆمییەکی پەرەسێن" بە

سەرجەم کەمایەتییە نا تورکەکانی دەوڵەتی عوسمانی، بەڵام بەریتانیاو فەرەنساو ڕوسیای قەیسەری کە پەیماننامەی سایکس بیکۆی ١٩١٦یان مۆرکردبوو، لەسەر دابەشکردنی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی لەنێوان هاوپەیمانانی شەڕدا ڕێککەوتن.

لەو بارودۆخەدا چەند کۆمەڵە کوردێك سەربەخۆیی تەواویان بۆ کورد دەویست، لەکاتێکدا بەشێکی تریان داوای مانەوەی ناو تورکیایان دەکرد، کەمێنەیە پچووککرابۆوە تەنیا ناوچەی ئەنادۆڵی مابۆوە. ڕوو لەمائیین و پێوەندی کۆنیان بە خەلافەتەوە، ئاغاو شێخە بەدەستەکانی والێکردبوو کە لەبیروبۆچوونی چاکخوازە ڕۆشنبیرە شارنشینەکان بسڵەمێنەوەو ترسیان لێیان هەبێت، چونکە داوای ئەوان کەسەربەخۆیەتی بوو، لەمێژو توانای ئەمانی کەمدەکردەوە. "لۆرد کارزۆن"ی بەرپرسی ئێردراوی بەریتانیا بۆ دانوستانی ئاشتی دیاریکردنی "خواستەکانی کورد"ی پێنەدەکرا، وتی: " دوای پرس و ڕا لە کونستانتینپۆل و بەغداو شوێنانی دی، بۆم دەرکەوت کە دیتنەوەی نوێنەرێکی کورد مەحاڵە...." وەك دەڵێت "هیچ کوردێك نییە جگە لەعەشیرەتەکەی خۆی نوێنەرایەتی شتێکی تر بێت".

واش دانوستانی پەرتکردنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەنێوان هاوپەیماناندا (بێجگە لە ڕوسیای سۆڤیەتی کە وازی لەداواکانی ١٩١٧ی ڕوسیای قەیسەری هێنا، هێمایەکی زۆر گرنگ بوو بۆ کورد، چونکە یەکەمین جاربوو بەڕەسمی لەپەیماننامەی سیڤەردا، کە شارۆچکەیەکی دەوروبەری پاریسەو بەدروستکردنی ناسکە فەرفوری بەناوبانگە، دان بەمافی کوردا بنرێت و پێ لەسەر ئەوەش دابگیرێت کە پێ بەدامەزراندنی حکومەتێکی کوردی بدرێت، بەڵام دەرکەوت ئەویش هەر ناسك بوو. پەیماننامەکە لە ١٠ی ئابی ١٩٢٠دا مۆرکرا، دوای سێ ساڵ مردارببۆوە، بەڵام بڕگەکانی ٦٢و٦٣و٦٤ی لە یاسای نێو دەوڵەتیدا، سێ بەڵگەن بۆ وەچەکانی داهاتووی کورد کە مافەکانیان و ئەو ناپاکیتییەی زلهێزەکانی دونیا لێیانکردن، بزانن).

بڕگەی ٦٢ کۆمیتەیەکی بۆ چاودێریکردنی بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمییەك بۆ کورد دیاریدەکرد کەلەڕێی کۆمەڵەی گەلانەوە سەرپەرشتی بکرێت، بەڵام تەنیا ناوچە چیاییەکانی کوردستان بگرێتەوە کەئێستا لەخۆرهەڵاتی تورکیاو خوارووی ڕووباری فوراتدان و بەشێکی بەرینی خۆرئاوای ئەو ڕووبارەشی لێدادەبڕا. فەرەنساو بەریتانیاش دەستیان لە ئینتیدابەکەی خۆیان هەڵنەدەگرت کە کۆمەڵەی گەلان دابوویەنێ و ناوچە کوردییەکانیشیان تیادابوو (دواتر بەدوای یەکدا سوریاو عێراقیان لێپێکهێنرا). دەبوا باکووری سنوورەکانی کوردستان بۆ حکومەتێکی نەرمەنی نەخشە بکرانایە. سەرەڕای بیرە پیرۆزو دڵسۆزانەکەی ویلسۆن سەبارەت بە چارەی خۆنووسین، بەڵام وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا نەدەچوو بەبیریا کەمەردوو دەوڵەتی

کوردستان و ئەرمینیای دواڕۆژ ئینتیداب بکات و بیانخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە، کاتێکیش ئەنجومەنی پیرانی ئەمەریکا تەنانەت ڕێی نەدا وڵاتە یەکگرتووەکان بەشداری لەکۆمەڵەی گەلانیشدا بکات، پرۆژەکەی ویلسون هەرەسی پێهات.

برگەی ٦٢ ڕژێمی عوسمانی ناچارئەکرد کە بە بڕیارەکانی کۆمیتە کەملیل بێت. برگەی ٦٤یشیان دیپلۆماتییەتێکی نایاب بوو: ئەگەر ساڵێك دوای جێبەجێکردنی سیڤەر، کورد بیتوانیایە ئەوە بسەلمێنێت کە "زۆربەی خەڵکی ناوچەکە زیاتر حەزیان بەسەربەخۆییە وەك لەوەی لەگەڵ تورکیا بن، کۆمیتەکەش بگاتە ئەو باوەڕەی کە ئەوان توانای بەڕێوەبردنی سەربەخۆیەتی خۆیان هەیەو، رابسپێرێت کە سەربەخۆیەتییەکەیان بدرێتێ، ئەوا تورکیا بەوە قایلدەبێت و وەك ئێستای ملکەچی جێبەجێکردنی راسپاردەکە دەبێت و هەموو مافەکانیشی لەناوچەکەدا رادەگەیەنێت" دیسان برگەکە ئەوەش دەردەخات کە "هێزە سەرەکییەکانی هاوپەیمانان نابێت بەهیچ جۆرێك بەڕووی ئەوەدا بووەستنەوە کەئەگەر کوردی ئەو بەشەی کوردستان کە ئێستا لەناو ولایەتی موسڵدایە بیانەوێت لەناو دەوڵەتە کوردییە سەربەخۆ نوێکەدا بن". هەموو "ئەگەر"ەکان نکوڵیان لەبوونی دەوڵەتێکی کوردی دەکرد.

سەربەخۆیەتی "کوردستانی بەپیت و بەرەکەت" کەرەنگە ببوایە، ولایەتی موسڵی بەنەوت دەوڵەمەندو کانە نەوتەکانی دەوروبەری کەرکوك بەجۆرێکدەبوو کەپشت بەتورکیای دواڕۆژ ببەستێت. واتاکەشی زۆر ئاشکرابوو: بەریتانیا کەچوار ڕۆژ دوای راگیرانی ڕەسمی هێرشەکانی مانگی تشرینی یەکەمی ١٩١٨موسڵی داگیرکردو دەیویست کۆنترۆڵکردنەکەی بەسەر ولایەتەکەداو ئەو کانە نەوتانەشدا بەردەوامبێت کەهێشتا بەگەڕ نەخرابوون. (کە لەبنەڕەتدا هەر هەموو ولایەتەکە بەرەو ڕووی فەرەنسا کرابۆوە، بەڵام پاریس بەسەدی بیست و سێی نەوتی کەرکوك دەستبەرداری داواکارییەکانی بوو). زمانحاڵی برگەی ٦٤، بەکردەوە وای دەگەیاند کە لیژنەی کۆمەڵەی گەلان، داوا لەبەریتانیا بکات ئینتدابی خۆی بەسەر موسڵ و نەوتەکەشیدا مسۆگەر بکات.

لەساڵانی دواییدا، بەریتانیا پێی وابوو لەڕووی سیاسییەوە وای بۆ باشتر دەبێت کەلەکانە نەوتەکانی ولایەتەکەدا بەشداری کۆمپانیاکانی هۆڵەنداو فەڕەنساو ئەمەریکا بکات. لەدەربڕینێکی ڕەوانبێژیانەو زمانێکی بێپەردەی ئابڕووبەرانەدا، بەڵگەنامەیەکی CIA، کەساڵی ١٨٧٩ دەرچووەو شۆڕشگێڕە ئیسلامییەکانی ئێرانیش هەر لەوساڵەداو لەکاتی دەستبەسەراگرتنی باڵوێزخانەکەی ئەمەریکادا دەستیانکەوت و بڵاویانکردەوە، کەلەساڵی ١٩٢٧ کاتێك نەوت لە نزیك کەرکوکەوە دۆزرایەوە ڕێدرا بە ئەمەریکاو ئەورووپا نەوت لە کانەکاندا دەربێنن، سۆزی

خۆرئاوای بەرامبەر بە بزوتنەوەی سەربەخۆیی کورد کەمکردەوە" لەناوەڕاستی حەفتاکاندا کانە نەوتەکانی کەرکوک، کە "لەساڵی ١٩٢٠ دا شارێك بوو تێکەڵاو خەڵکی تیادا دەژیا، دوو کەمایەتی تورکمان و عەرەب و ژمارەیەکی زۆری کورد" ئەو کانە نەوتانەی تری ناو ئەو زەویانەی کە کورد بەشی خۆیانی دادەنێن، ڕاستیشە کەوایە، نزیکەی سەدی ٧٥ی بەرهەمی نەوتی عێراقیان دابیندەکرد.

پەیماننامەی سیڤەر کە هەرگیز دانی پێدا نەنراو ئەنجامەکەشی واکەوتەوە کەلەناو هەموو ژێردەستەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا تەنیا کورد مایەوە دەوڵەتی سەربەخۆ بۆخۆی دانەمەزرێنێت، بەڵکو خاکەکەشیان بەسەر تورکیاو سوریاو، عێراقدا دابەشکراو، تا ئەمڕۆش هەروا ماوەتەوە.

مستەفا ئەتاتورك چارەنوسی کوردەکانی تورکیای دیاریکرد سەرۆکی نەتەوەیی تورك، لەکاتێکدا پلانی بۆ ملپێدانی کورد دادەنا؛ بەوە هەڵیخەڵەتاند کە هاوکاری لەگەڵدا بکەن. سەرەتا بۆ ڕزگاربوونی لەهەموو دوژمنەکانی؛ بەتایبەتی هێزەکانی فەرەنساو یۆنان کە خۆرئاوای تورکیایان داگیرکردبوو، لەگەڵ ئەوەی لە هێزی ئەمەرنییەکان لەباکووری خۆرهەڵاتی وڵاتەکەیەوە مابوونەوە؛ کوردەکانی کردە سەربازو لەڕیزی هێزەکانی خۆیدا دایناو، بە "برا"ی تورك و "یەکسان" پێیان باسیدەکردن. کاتێك لەساڵی ١٩٢٢ دا ئامانجەکانی بەدیهێنا، لەهاوپەیمانە کوردەکانی هەڵگەڕایەوەو خواستە نەتەوەییەکانیانی تێکوپێکدا. فەرەنساو بەریتانیاش بەهۆی یەکەم جەنگی جیهانی یەکەمەوە تەواو شەکەت ببوون، حەزیان نەدەکرد بۆ بەگژاچوونەوەی ئەتاتورك و دامەزراندنی دەوڵەتێك بۆ کورد هێزبنێرن و پارەش بەفیڕۆ بدەن. دڵیان بە دەستەڵاتگرتنە دەستی ولایەتە عوسمانییەکانی عەرەب خۆشبوو، والشیاندەکرد کە تورکیا بکەنە سەنگەرێك بەڕووی هەر هەوڵێکی یەکێتی شورەویدا گەر بیەوێت لە باشوورەوە باڵ دربێژێکات.

مێژوونوسی کورد "کەندال نەزان" وای بۆدەچێت کە "پەیماننامەی سیڤەر سەرشۆڕی تورك و بێئینسافیتی بەرامبەر بەکورد" تێدابوو. بەڵام لەسەر قسەکەی دەڕوات و دەڵێت "پەیماننامەی لۆزان"؛ کەلە ٢٤ی گەلاوێژی ١٩٢٣دا مۆرکرا، لەسەر حسابی ئەو کوردانەی کە "سەردەمێکی نوێی کۆیلایەتی"ی بەسەردا سەپاندن، دانی بە دەوڵەتی تورکیای نوێدا نا. چونکە ئەم پەیماننامەیە هیچ ئاماژەیەکی بۆ کوردو مافەنەتەوەییەکانی نەکردبوو، هیچیشی لەوشتانەی کەبۆ کەمایەتییە ئاموسڵمانەکانی وەك جولەکەو ئەرمەن دزکسە یۆنانییەکان مسۆگەریکردبوو، بۆکوردی نەکرد.

لەماوەی چەند مانگێکدا ئەتاتورک ئیمپراتۆریەتی عوسمانی پووچکردەوەو کۆماری تورکیای دامەزراند. سالی دواتریش سیستمی خەلیفایەتی، کەخەلیفەی لەڕووی رۆحیو سیاسییەوە بەموسولمانانی دونیا دەبەستەوە لابرد، بەزمانی کوردی ئاخافتنو بەرگی کوردی لەبەرکردنیشی قەدەغەکرد، کۆمەلەو بلاوکراوەو برادەرایەتی ئاینی کوردانەش لەولاوە وەستێنت. بەوەش پێناسەی کوردی نەهێشت، ئیتر لەوساوە ناوی "تورکی چیا"یان لێنرا. دروشمی کەمالییەکان، "ئای لەبەختەوەری ئەوکەسەی دەڵێ من تورکم" بەپیتی گەورە گەورە، لەسەر بەردی چیا هەڵدەکۆڵراو بەبۆیەش لەسەر دیوارەکان دەنووسرا. بەلام هەموو ئەو کارسازیانە زەبری گەورەیان بەکورد گەیاند، سەرەتای ١٩٢٥ شێخ سەعیدی سەرۆکی تیرەی پیران، بۆ بەرگریکردن لەنەتەوەی کوردو بێزاریدەربڕین لەبڕیاری سالی پێشووی پووچەڵکردنەوەی خەلافەت، شۆڕشێکی کورت تەمەنی لەکوردستانی تورکیادا بەرپاکرد، ئەگەرچی شۆڕشەکە سێیەکی کوردستانی تورکیای گرتەوە، بەلام ئەتاتورک بەئاسانی تێکی شکاند.

کۆمارە کۆرپیلەکە زۆر بەئاسانی دلنی بەشتێکدا نا کەعوسمانییەکان بەدرێژایی چەند سەدەیەک نەیاندەویست بەئاشکرا دانی پێدا بنێن، ئەویش پەرۆشی کوردبوو بۆ دامەزراندنی وولاتێکی سەربەخۆی خۆیان، دادوەری گشتی سەربازیانەی یەکێک لە "دادگا سەربەخۆ تایبەتییەکان" کەبڕیاری توندوتیژی دەردەکرد، بەپەلە لەشاری دیاربەکر دانرا، ڕووی لەدەمی شێخ سەعیدو نزیکەی پەنجا کەس لەچەکدارەکانی کردو، پێی وتن:"لەپێناو ئامانجێکی دیاریکراودا، با بلێین لەخۆتان بەولاوە کەسی دی هاندەرتان نەبووە، کەئەویش کوردستانێکی سەربەخۆیە، هەر لەبەرئەوەشە کەدەبێت نرخەکەی لەسەر سێدارە بدەن". داشیان.

پاش دووسال کە "دادگا سەربەخۆ"کان هەلوەشێنرانەوە، ٧٤٤٠ کوردی ترگیران و ٦٦٠یان لێ لەسێدارە دران، بەسەدان گوندی کوردیش سووتێنران و لەئەنجامی کارە دڕندانەکەی تورکیاشدا، کە "ئارام" کردنەوەی پێدەوترا، چل هەزار تا دووسەدو پەنجا هەزار جووتیاری کورد مردن. بەدرێژایی نزیکەی دە- دوانزە سالی ئایندەش، رەنگە یەک ملیۆن پیاو و ژن و منداڵی کورد لەجێی خۆیان هەڵکەنرابێتن و بۆ خۆرئاوای ئەنادۆڵ راگوێزرابن. هەموو ئەوکارانەش نەیانتوانی ڕێ لەهەڵگیرساندنی شانزە شۆڕشی کورد لە تورکیادا بگرن کە لەپانزە سالی ئایندەدا بەرپابوون و هەمووشیان بەدڕندانەترین شێوە تێکشکێنران. هەر کورد ئاکە قوربانی شۆڕشەکەی شێخ سەعید نەبوو. ئەتاتورک کردییە دەرفەت بۆ لەناوبردنی

بەرهەڵستکارانی سیاسی و ڕۆژنامەگەریتیی ئازاد کە لەتورکیادا خەریکی گەشەکردن بوون. بەڵام سەرکەوتنەکەی زۆری نەخایاندو هەردوو دیاردەکە، تەنیا دوای یەك وەچە سەریان هەڵدایەوە.

بەریتانیا و تورکیا، لەسەر نەوتی موسڵ کەوتنە کێبەرکێ و، هەریەکەیان خۆی وا نیشاندەدا کە پارێزەری کوردی و ولایەتەکەیە، کەچی خواستە ڕوون و دیارەکانی کوردی عێراقیان، کەلە ١٩٢١دا بۆ دامەزراندنی وڵاتێکی سەربەخۆ دەریانبڕیبوو، پشتگوێخست. بەریتانیاییەکان ڕاپرسییان بۆ میر "فەیسەڵ"ی برادەری "لورنس العرب" و هاوڕێی شەڕی لەشۆڕشی عەرەبدا، کەبەر لەوەی فەرەنساییەکان لەساڵی ١٩٢٠دا لایبەرن ماوەیەکی کەم شای سوریاش بوو، بۆ کردنی بەشای عێراق ڕێکخست، بەڵام هەستی کورد لەدژی لکاندنیان بەعێراقی عەرەبییەوە، بەرادەیەکی واتوندبوو کە کوردی سلێمانی بەشداری ڕا وەرگرتنەکەیان نەکرد، لەکاتێکدا کوردەکانی کەرکوك لایەنگیری دواخستنیانکرد، ئیتر کوردی موسڵ و هەولێری لێدەرچێت ئەوانی دی بەشداریان لەڕاپرسییەکەی فەیسەڵدا نەکرد.

لەڕووی سیاسییەوە بەریتانیاییەکانیش ڕێچکەی عوسمانییەکانیان گرت و کەمایەتی عەرەبی سنییان لە زۆرینەی شیعە، کە بە لەسەدا پەنجاو پێنجی سەرجەم دانیشتوانی عێراق مەزەندەدەکران و، لەسەر حسابی کەمایەتییە کوردە سنیەکەی کە بەلەسەدا بیست و سێ ی دانیشتوانی عێراق دادەنرێن، بۆ بەڕێوەبردنی دامودەزگاکانی عێراق بە پەسەندترزانی. بەلام لەناو هەموو کوردەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا، کوردەکانی عێراق، هەر هیچ نەبێت لەئاستی تیوریدا، بەهۆی تا ڕادەیەك ژمارە زۆری و باڵادەستیان لەشەڕداو چیا سەخت و دوور دەستەکانیانەوە باشترین دەرفەتی بەدیهێنانی ئامانجە سیاسییەکانیان لەبەردەمدا بوو. خۆ ئەگەر پشت بەڕاپۆرتێکی سەربازیانەی "هەواڵگران – ئیستخبارات"ی بەریتانیا ببەستین کەلە ١٩٤٥دا دەرچووە، ڕەنگە لەهۆکانی ئەم دەرفەتەی کوردی عێراق تێبگەین. ڕاپۆرتەکە جەخت لەسەر ئەوەدەکات کەمێژووی دوورو درێژی عێراق وادەگەیەنێت عێراقییەکان ڕۆژێك نەبووە بۆ ماوەیەکی زۆر حکومەت و گەورەکانی خۆیانیان بەدڵبووبێت. هیچ شتێکی واش لەئارادا نییە کەوا بگەیەنێت ئەم ئادگارە نیشتمانیتییە نەمابێت... لەدونیادا کەم وڵات هەیە، وەك عێراق بەدەست گرفتی ئاسایشی وا پڕ مەترسییەوە توشهاتبێت. جا دابینکردنی ئاسایش لە سایەی ئەم ململانێ و گرفتە زۆر نالەبارانەدا، بۆ وڵاتێکی زۆر پێشکەوتووش زەحمەتە، ئیتر دەبێ بۆ وڵاتێکی وەك عێراق چۆن بێت؟.

بەریتانییەکان زۆریان لەسەرکەوت تا بەم پوختەو دەرئەنجامانە گەیشتن. بەڵام ئاوە ئاوە، بەنووساندنی کورد بەو دەوڵەتەی دروستیانکردو ناوی "عێراق"یان لێنا، هەستیان بە

تاوانبارێتی و ئازاری دەروونی دەکرد، بۆیە هەرچەند بکەوتنایەتە تەنگەژەیەکەوە، لایەنگیری داواکارییەکانی کوردیان دەکرد، لایەنی کەم ئەوانەیان کە بە بەکارهێنانی زمانی کوردی لەقوتابخانەو بەڕێوەبەرایەتییە حکومەتییەکانەوە بەند بوونایە، ئەویش تا ئەوەندەی کەمەرمشە لەدەسەڵات و هێزیان نەکات. ڕاستییەکەی هیچ شتێکی تریشیان پێنەدەکرا، چونکە پێیان لەسەر پارێزگاریکردنی ئاسایشی عێراق دادەگرت، جا تا ئەو پارێزگاریکردنە کەمترین نرخیان لەسەر بکەوێت، دەبوا لەبری ناردنی هێزی پیادە، هێزی ئاسمانی شایانەی بەریتانیا بنێرن. لەو ڕۆژگارانەشدا، چەند بۆمبێك بنرایە بەنیشانێکی دیاریکراوەوە، کوردی پێدەتۆقێنراو، گەر شۆڕشێکیش لە ئارادابوایە پێی دادەمرکێنرایەوە.

لەبەرامبەر گوشاری ئەتاتورك و سووربوونی لەداواکردنەکەی ولایەتی موسڵیاو، بۆ دەرپەڕاندنی ئەو هێزە سەربازیەی لەڕەواندوزی باکووری عێراقدا جێگیرببوو، بەریتانیاییەکان لەساڵی ١٩٢٢دا، بەو هیوایە شێخ مەحمود بەرزنجیان هێنایەوە، کە بوونی پشتگیری یاداشتە ئامادەکراوەکەیان بێت، بەوەی کە کورد دەستەڵاتدارێتیی تورکیان لەناوچەکانیاندا ناوێت، هەرچەندە سێ ساڵ پێش ئەوە شێخیان کردبووە دەستەڵاتداری شاری سلێمانی و هەر زۆر زووش لێی پاشگەز ببوونەوە. چونکە لەنیسانی ١٩١٩دا شێخ مەحمود سەربەخۆیەتی کوردستانی ڕاگەیاندو، ئاڵایەکی کوردی تەخت کەسکی هەڵکرد کە کەوانەیەکی مانگ ئاسایی بەسوور لەسەرکرابوو، ئەو هێزە بەریتانیاییەشی تێکشکاند کە بۆ سەرکوتکردنی نێردرابوو، بۆیە بەریتانیاییەکان تا فڕۆکەی جەنگی شایانەی موشەك هاوێژیان بەکارنەهێنا نەیانتوانی دەستبەسەری بکەن. حوکمی لەسێدارەدانیان دلو، ئەمجا کەمیانکردەوە بۆ تا هەتایی و ڕەوانەی هندستانیان کرد. بەڵام هەرکە شێخ مەحمود گەیشتەوە سلێمانی، ئەو ڕێوشوێنانەی بەزاند کە بەریتانیاییەکان بۆیان دیاریکردو، خۆی بەمەلیکی کوردستان ڕاگەیاندو ناوی "مەحمودی یەکەم"ی لەخۆی نا، یەکەم حکومەتێکی کوردی تەواوی سەدەی بیستەمی پێکهێنا کە هەشت وەزیری تیادابوو، باج و ڕەسمی دانا، پولی پۆست و ڕۆژنامەیەکیشی بەناوی "ڕۆژی کوردستان"ەوە دەرکرد، داوای "مافی ژیانی بۆ گەلێکی مەزنی سەربەخۆ لە وڵاتێکی سەربەخۆدا کرد".

لەبەیاننامەیەکی هاوبەشدا، کەلە ٢٢ی کانونی یەکەمی ١٩٢٢دا پێشکەش بە کۆمەڵەی نەتەوەکان کرا، هەردوو حکومەتی بەریتانیای مەزن و عێراق بەڵێنی "ڕێزگرتنی مافی کوردەکانی دانیشتوانی ناو عێراقیان دا، کەحکومەتێکی کوردی لەچوارچێوەی سنووری عێراقدا دابمەزرێنن"و "بەهیوایی خۆشیان بۆ هەموو کوردنیشاندا، تا بەزووترین کات لەناو خۆیاندا

لەسەر شێوەی حکومەتەکەیان و ئەو سنوورەی کاری تیادا بەڕێوە دەبات ڕێکبکەون و نوێنەری خۆشیان بۆ بەغدا بنێرن تا لەشێوەی پێوەندی ئابووری و سیاسی، کە لەداهاتوودا لەنێوان کورد و حکومەتی خاوەنشکۆی بەریتانیاو حکومەتی عێراقدا بەڕێوەدەچێت، بکۆڵنەوە". ئەم بەیاننامەیە بووەهۆی دامرکاندنەوەی قەیرانی کوردستان. لەبەهاری ١٩٢٣دا هێزە تورکییەکە ناچارکرا ڕەواندوز بەجێبهێڵێت. بەڵام دواتر بەریتانیاییەکان کەوتنە هاندانی سەرۆک تیرە نەیارەکانی شێخ مەحمود، تا لەموسڵ و کەرکوك بەرەنگاریتی بکەن، کاتێکیش ئەم، فرمانە حکومەتییەکەی سەبارەت بەچوونە بەغدا ڕەتکردەوە، هەڵمەتێکی سەربازیانەی بە بەشداری چەند یەکەیەکی پیادەو فڕۆکەی مووشەك هاوێژی هێزی ئاسمانی شاهانەی بەریتانیای لەدژ ڕێکخراو دیسانەوە کەوتنەوە بۆردومانکردنی هێزەکانی. لە سێی ئازاری ١٩٢٣دا، شێخ مەحمود پەنای بۆ کوردستانی ئێرانی هاوسێیان بردو، بەڵام زۆری تیا نەمایەوەو گەڕایەوە بۆ عێراق چونکە بەهۆی هێزی ئاسمانی بەریتانیاوە هێزە سەربازییەکەی عێراقەوە، کە تازە بە دەوری سلێمانیدا بڵاوبووە، شارەکەیان لەهەڕەشەی ئەو دوورخستبووەوە.

لەوماوەیەدا ئەتاتورك دانوستانێکی دەکرد، لەمانگی تەمموزی ئایندەدا ناوی "پەیماننامەی لۆزان"ی لێنرا. ئەم پەیماننامەیە نکوڵی لەهەموو مافەکانی کوردی تورکیا کردو، پاشەکشەی لەبەڵێنەکانی "پەیماننامەی سیڤەر"یش کرد، بەریتانیای وەك دەوڵەتێك کە عێراقی بەدەستەوە بوو والێکرد بوار بە کوردەکانی ولایەتی موسڵ بدات بچنە ئەو دەوڵەتە کوردیەی کەڕەنگە لەداهاتوودا لەتورکیادا دابمەزرێت. دوای گۆڕانکارییەکەی تورکیاو، کەلاخستنی شێخ مەحمود لەکوردستانی عێراق چی بەڵێندرابوو سەبارەت بە ئۆتۆنۆمییەکی بەرفراوان بۆ کورد، کە حکومەتی عێراقیش دانی پیادانابوو پشتگوێخران، بەریتانیاش بەوە خۆشحاڵبوو. کۆمیسەریتی باڵای بەریتانیا، پێی وابوو کە "بەهۆی کەمی ئەو پڕوپاگەندەیەی لەکاتی دەرچوونی بەیاننامەکەی هەردوو حکومەتی بەریتانیاو عێراقدا کران، کەس باسی مەسەلەی ئۆتۆنۆمییەکەی نەکرد". خۆ ئەگەر کوردەکانیش مەسەلەکەیان وورووژاندەوە، ئەوا کۆمیسەری باڵا پێشنیاری وابوو، بەکوردەکان رابگەیەنرێت کە پرۆژەی ئۆتۆنۆمییەکە "بەسەرچوو چونکە زۆری بەسەردا ڕۆیشت".

تا ١٦ی کانونی یەکەمی ١٩٢٥، ئەنجومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان قایل نەبوو، عێراق ماوەی ٢٥ ساڵ لەژێر ڕکێفی بەریتانیادا بێت، بەڵام ئەوکاتە ولایەتی موسڵیان بەڕەسمی خستە سەر بەغدا. پاش حەوت مانگ ئەتاتورك پەیمانێکی لەگەڵ بەریتانیادا بەست و تیایدا بەرامبەر سەدی

دەی بەشداری لە "کۆمپانیای نەوتی عێراق" وازی لە هەموو داواکارییەکانی تورکیای ولایەتەکە هێناو بەریتانیاش بەڵێنی دا، بەیاریدەدانی کوردو ئەرمەن دەست لەکاروباری تورکیا وەرنەدات.

لیژنەیەکی لێکۆڵینەوەی سەر بە کۆمەڵەی نەتەوەکان پشتگیری سەربەخۆیی ملی کوردی ولایەتەکەی کرد، چونکە پێنج لەهەشتی دانیشتوانەکەی بوون، گەر تورکمانەکانو یەزیدییەکانیشیان بۆ زیاد بکرابایە ئەوا دەبوونە حەوت لە هەشتی دانیشتوانەکەی، لیژنەکەش سۆزی بۆ دەوڵەتی عێراق نەبوو. کەچی ئەنجومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان بە هەڵوێستەکەی بەریتانیا قایلبوو، کەمەر لەبەرهۆی ئابووری دەیویست موسڵ بخرێتە سەر عێراقو داواشیکرد کە رێبدرێت لەقوتابخانەو بەڕێوەبەرێتییەکانی ناو خۆیاندا، زمانی کوردی بەکاربهێنرێت. ئەوەش نابەدڵانە جێبەجێکرا، هەر بۆ نموونە زمانی کوردی تەنیا لە پۆلەسەرەتاییەکانی پارێزگای سلێمانیو هەندێ شوێنی پارێزگای هەولێردا دەخوێنرا. جگە لە "عەبدولموحسین السەعدون"ی سەرەک وەزیرانی عێراق کەسی دی لەم سیاسەتە لایان نەدا، بەلام ئەو لە واتای مەترسی شۆڕشە سەرتاسەرییەکەی ساڵی ١٩٢٥ی تورکیا گەیشتبوو بۆیە کەساڵی ١٩٢٦ دەستیکێشانەوە حکومەتەکەی پێشکەشکرد، تیایدا وەك وریاکردنەوەیەك وتبووی: پێویستە دەرز لەڕووداوەکانی تورکیا وەربگرین ... کورد چ مافێکیان هەیە بیانەیەینێ". بەلام ئامۆژگارییەکەی هیچ گرنگییەکی پێنەدرا، ئەگەرچی "بیٚ ئارامی بەریتانیا بەرامبەرك" بووە تێکەیشتبوو کەزاڵبوونیان بەسەر باکووری عێراقدا بەهۆی چەند فڕۆکەیەکی کۆنو ئۆتۆمۆبیلو زرێپۆشو هێزە ناوخۆییەکانەوەیە، چەندین جار لەبەردەم حکومەتەکانی بەغدادا کەعەرەب دەستی بەسەردا گرتبوو، قسەکەیان دووپاتدەکردەوە، کەچی دەستەلاتدارانی عێراق بەدرێژایی ئەو ساڵانە هیچ دەرزێکیان لەراپەڕینە یەك لەدوای یەکەکانی کورد وەرنەگرت لەکۆتایی ئەو دە ساڵەدا، بەرپرسە بەریتانیاییەکان لەوە بێزاربوون کە "عێراق هێشتا هەر زاراوەیەکی جوگرافیانەیە".

لەبەرامبەر گوشاری نەتەوەییە عەرەبەکاندا، کە تادەهات لەزیادبووندا بوو. لە حوزەیرانی ١٩٣٠ دوو بەپێی پەیماننامەی "پۆرتسمۆس" کە دوای دووساڵ جێبەجێکرا، لەپڕ بەریتانیا دەستبەرداری عێراق بوو، سەربەخۆیەتییەکیشیان دایە کە هەر بەناو سەربەخۆیی بوو. ئەمیش ڕێك وەك پەیماننامەی لۆزان"، دوورو نزیك ئاماژەی بۆ کوردو مافەکانی نەکرد. هەروەها حکومەتی بەریتانیاو عێراق داواکارییەکانی کوردیان بەلاوەنا، چونکە وەك لەراپۆرتێکی بەریتانیادا هاتبوو "یەکێتی سیاسیانە، کە پێویستییەکی ئۆتۆنۆمییە لەنێو کوردا نییە". بۆیە

هەردوو حکومەتەکە بەخاوەن داواکارییەکانیان ڕاگەیاند، کە "لەکوردستانی عێراقدا بواری دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی وانییە کە کۆمەڵەی نەتەوەکان چاودێرییکات".

لەساڵی ١٩١٩ەوە، بۆ سێیەمین جار شێخ مەحمود سەرکردایەتی شۆڕشێکی لە سلێمانیدا کرد. نامەیەکی بۆ کۆمەڵەی نەتەوەکان نارد، تالاوی لیدەباری، تیایدا جەختی لەسەر ئەوەکردبوو کەدەستهەڵگرتنی بەریتانیا دەبوا ژیرانە ئازادی بە کوردی ولایەتی موسڵ ببەخشیایە، داوایکرد "هەموو پێوەندییەکانی لەگەڵ بەغدادا، بەهەر شێوەیەك بێت" دەبێ ببڕێت، لەدرێژەی نامەکەیدا دەڵێت:"ناکرێت بەوە قایلبین کەچەند گەلێکی سەرەتایی وەك - لیبریا- خاڵی چارەی خۆنووسینی بدرێتێ و ئێمەشی لێ بێبەش بکرێت. گەر حکومەتی عەرەبی بەغدا، بەهێزو فڕۆکەی ئینگلیز، کە کۆمەڵە بەڕێزەکەتان بەڕێوەبردنی ئەم وڵاتەی بەماوی ئێوەوە پێسپاردبوو، یارمەتی نەدرایە، ئەوا دووبارە بوونەوەی مێژوو کەبەرەو بەغدا کشان و داگیرکردنی بوو هەر چەند ڕۆژێکی دەویست".

شێخ مەحمود بۆچوونەکەی ڕاستبوو، چونکە دیسانەوە فڕۆکەکانی هێزی ئاسمانی شاهانەی بەریتانیا هەر وەك چۆن پێشتر لەتێکشکاندنی شۆڕشەکانی پێشوویدا یارمەتیدەری هێزە عێراقییەکان بوون، ئەمجارەش بۆ لەناوبردنی شۆڕشەکەی یارمەتیان دایەوە. بەڵام شاری سلێمانی ڕاسانگرتنێکیان کرد کەتا ئەوکاتە مێژووی کورد شتی وای بەخۆیەوە نەدیبوو، چونکە بۆ یەکەمین جار، کرێکارو بازرگان و دانیشتوانی شارەکە، هەستی نەتەوایەتی خۆیانیان بەئاشکرا دەربڕی. هەر کە لەمانگی نیسانی ١٩٣١دا و دوای شەش مانگ بەسەر هەڵگیرساندنیدا، شۆڕشەکەی شێخ مەحمود کوژێنرایەوە لەمانگی تشرینی دووەمی ئایندەدا، ئەمجارەیان لە "بادینان" کەناوچەیەکی دڕەو، لەو ڕۆژگارانەدا و لەئاکامی بێزاری دەربڕین بەرامبەر بەوەرگرتنی عێراق لەکۆمەڵەی نەتەوەکاندا، ئاژاوە سەرتاسەری گرتبووە، شۆڕشێکی دی سەریهەڵدا. بەڵام ئەمجارەیان داواکاریی کورد چەند مەسەلەیەکی دیارو کۆنی گرتبۆوە. پەلپیان لەو پلانانەی حکومەت گرت، کەئەو دیانە ئەستوورییانەی لەناوچە سنوورییەکانی هەکارییەوە هاتبوون و، پێشتر لەهێزە بەریتانیاییەکانی ناو عێراقدا کاریانکردبوو لەناوچەکانی لای خۆشیانەوە دەستیان لەزۆربەی سەرکوتکەرییەکانی کورددا بووە، لەناوچەکانیاندا جێنشینیبکەن. هەروەها کورد بەدانانی پۆلیسخانە عێراقییەکان و چەسپاندنی وەرگرتنی باج لەکوردستاندا ناڕازیبوون.

لەبەهاری ١٩٣٢دا، هێزەکانی عێراق بەیارمەتی چەکی ئاسمانی شاهانەی بەریتانیا، ئەم شۆڕشەیان دامرکاندەوە، کەبەسەرهەڵدانی ئەستێرەی شێخ ئەحمەد بەرزانی و مەلا مستەفای برا بچووکی بێ هەڵگری باپیرانیان، ئەوانەی بەرووی حکومەتی نێوەندی عوسمانییەکاندا

ڕاپەڕیبوون. هەرئەوەندەی جووتەبرا بۆ تورکیا هەڵاتن، دەستەڵاتدارانی تورک گرتیان و دایاننەوە بەکاربەدەستانی عێراق. بۆجارێکی تریش حکومەتەکانی ناوچەکە بەرژەوەندی نێوانیان وای لێکردن لەڕوو بەڕووبوونەوەی کێشەی کورددا هاوکاری یەکتربکەن و، جووتە براش جۆرە سزایەکی باوی ئەو سەردەمە دران، واتە بەدوورخستنەوەیان بۆ خوارووی عێراق کەعەرەب تیایدا زۆرینە بوو، ئەویش بەرلەوەی دوورخستنەوەکەیان بگۆڕێت بۆ نیشتەجێکردنی زۆرەملەی ناو شاری سلێمانی لە سلێمانی پایتەختی ڕۆشنبیری کوردستانی عێراقدا، مەلا مستەفا لەتاقیکردنەوەیەکدا دەژیا، کەلەیاخییەکی ناوچەیەکی دووردەستەوە ببێتە سەرکردەی بزوتنەوەیەکی ڕزگاریخوازی نیشتمانی کورد. لەو ماوەیەشدا کوردستانی عێراق چەند شۆڕشێکی وای بەخۆیەوە بینی کە لەمەودوا بەرینی و بەهێزیا جیاوازیان هەبوو، یەکبینەش دەستەڵاتدارە عێراقییەکان لەسەرکوتکردنیا سەرنەکەوتن.

ئەو نەتەوەییە کوردانەی مەلا مستەفایان لەوکاتەدا ناسی کەلەسلێمانی دەژیا، جەختیان لەسەرئەوە دەکردەوە کە گۆڕانکارییەکەی مەلا مستەفا زەحمەت و لەسەرخۆ بوو، بەڵام هەرچۆنێک بوو هاتەدی. ئەو نەتەوەییە کوردانە، چەپە شارنشینەکانبوون (کورد ڕۆڵێکی دیاری لەناو پارتی کۆمۆنیستی عێراق و گەلێک ڕێکخراوو پارتی نەتەوەیی نهێنی تردا دیوە)، سەرەتا بەرزانیان زۆر بەخۆپارێز دادەنا، بەڵام سووربوون لەسەرئەوەی کەلێیانەوە فێربێت، دواجار بەلای بۆچوونە سیاسی و نیشتمانییەکانیاندا دایشکاند. بەڵام پێوەندی بەرزانی و ئەو نەتەوەییە کوردانە هەمووکات ئاسان نەبوو، کاتێک باسەکە بەلای ئەرکی پراکتیکی سیاسیانەدا دەچوو، بەرزانی خۆسەپێن و خاوەن ڕۆشنبیرییەکی کەم، هەستی بەبێزارییەکی زۆر دەکرد لەئاست ئەو پوختە شارنشینانەی سەرسەخترین بەرهەڵستکاری بەریتانیا بوون و بەهۆی دەستەڵاتگرتنە دەستی ئەوانیشەوە، لەدواناوەندی و زانکۆکانی دەمی ئینتدابدا، زانیاریان بەدەستهێنابوو. یەکێک لە یەکەمین کوردناسان، پێی وابوو کە "گاڵتەی ڕۆژگار وایکرد بەرزانییە دواکەوتووەکانی، پێگەیشتووی ژێر سایەی سیستمی دەرەبەگایەتی، ببنە پێشەنگی بزووتنەوەی نەتەوەیی چەپڕەوی کورد، بەتایبەتی کە نەتەوەییە شارییەکان ڕکیان لەشێوە ژیانی تیرەگەرێتی دەبۆوەو ترسیشیان لەهێزی تیرەکان هەبوو، هەوڵی لەناوبردنی ئەم سیستمە دەرەبەگایەتییەشیان دەدا".

بەڵام کوردە شارییەکان دەیانزانی هیچ هێزێکی سەربازیانەی تایبەت بە خۆیانیان نییەو، بەرزانیش لەڕێی توانای کاریگەرێتی بەسەر تیرە گوند نشینەکاندا، دەتوانێت هێزی پێویست بۆ هێنانەدی خەونەکانیان، کە دامەزراندنی ئۆتۆنۆمییە لەکوردستانی عێراقدا و، کۆششکردنیشە بۆ سەربەخۆیی، دابینبکات. بە درێژایی دەیان ساڵی ئایندە بزووتنەوەی کوردی عێراق، بەهۆی ئەم

پێکهاتە سەرەکییەی کۆمەڵگەکەیانەوە لاوازتر دەبوو. ئەویش لەئەنجامی دوژمنایەتی چەکدارانەی نێوان بەشە سەرەکییەکانی کۆمەڵەکەیان، کە لەبنەڕەتدا پێکهاتەکەشیان وەک یەک وابوون. سەیرەکەش لەوەدایە کەدەستەڵاتدارێتی مەلا مستەفا تەنیا لە کاتی شەڕە یەک لەدوای یەکەکانی لەگەڵ حکومەتی عێراقدا گەیشتە لوتکە، چونکە بەهەزاران کوردی خوێندەوار، لەشوێنی دووری وەک بەغداوە ڕوویان تێدەکردو، لەترسی سەرکوتکردنەکەی عێراق و خزمەتی سەربازی و، شەڕکردن لەپێناو کێشە نەتەوەییەکەیاندا پەنایان بۆ چیاکان دەهێنا.

دوای دە ساڵ دەستبەسەرێتی مەلا مستەفا دەرفەتی لەو سووکە چاودێرییە بینی کە بەرتانیا بەهۆی رۆڵی لە جەنگی جیهانی دووەمدا گرتبووی و لەساڵی ١٩٤٣دا هەڵات. بەپێی گێڕانەوەیەک کەهێشتا راستییەکەی یەکلا نەکراوەتەوە، بەرزانی بۆیە لە سلێمانییەوە بەرەو چیاکانی لایخۆیان چووبوو، چونکە ئەو موووچەیەی لە حکومەتی وەردەگرت بەهۆی هەڵئاوسانی جەنگەکەوە، هێندە کەم ببۆوە بەشی خواردنی خێزانەکەیی نەدەکرد، دەشڵێن رۆژێک کەدەست بەقوڕی ژنەکەیدا دەهێنێت و لەبری ئەو لیرانەی خێزانەکەیان گلیاندابۆوە ئاڵچەی ئاسنی بەقژییەوە کردبوو ئەوسا هەستی بەم کەم دەرامەتییە کردبوو، چونکە هاوسەرەکەی لەبەرئەوە لیرەکانی بۆ دابینکردنی خۆراکی خێزان فرۆشتبوو. بەرزانی پەستی دایدەگرێت، لەپێشدا بەسنووردا چووبووە ناو ئێران و ئەمجا هاتبۆوە ناو عێراق و یەکسەر ڕووەو بەرزان بۆوە. هەر بەگەیشتنەوەی و کەوتە رێکخستنەوەو یەکگرتنەوەی عەشیرەتەکانی باکوور کە (عەشیرەتەکانی "دۆڵەمەڕی" و "شیروانی" و "مزووری" و "باروشی" دەگرێتەوە)، کە بەتێرەی بەرزانییەکان ناسراوەو سەرۆکایەتی شۆڕشەکەی دەکات، حسابە کۆنەکانی خۆی لەگەڵ عەشیرە کێبەرکێکانی کەپارەیان لەحکومەت وەردەگرت و پێش دە ساڵێک ناپاکێتیان لەگەڵدا کردبوو یەکلاکردەوەو هێزە عێراقییە نە شارەزاکانیشی تێکشکاند کەبۆ سەرکوتکردنی نێردرابوون.

راست کاربەدەستە بەریتانیاییەکان، لەڕێبازی ئەم "سەرکردە عەشایەرییە گێرەشێوێنە، فێڵبازە بێنابڕووە" تووڕەبوون و بە "جەردەو بەخۆنازو دیکتاتۆر"یش باسیاندەکرد. راپۆرتێکی هەواڵگرە سەربازییەکانی بەریتانیا لەبارەیەوە دەڵێت "لاف نوێنەرایەتی بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد لێدەدات؛ بەڵام راستییەکەی بۆ مسۆگەرکردنی دەستکراوەیی خۆی بەپێی کۆنە شێوازی تیرەگەرێتیی لەدزێتی و جەردەیی هەوڵدەدات". بەڵام "سێرکیناهان کۆرنوالیس"ی کۆمیسەری باڵای بەریتانیا، دەڵێت، بەداخەوە حکومەتی بەغدا بەپاشگەزبوونەوەی لەو "پەیمانانەی جەختیان لەسەر کرا" و "دواخستنی بەدەنگەوە چوونی داوا رەواکانیان" خۆی خستە گێژاوەوە ئامارەش بۆ ئەوە دەکات کە بەچۆکهێنانی مەلا مستەفاش، جگە لە "شوێنقایمکردنی لە ناو

کورددلو سەرئەنجام بەشەهیدکردنی" شتێکی تر ناکات. بەهۆی نەبوونی هێزو فڕۆکەی جەنگی بەریتانیاوە کەمبۆ شەڕی کورد پێویستبوون، نوری سەعیدی سەرۆك وەزیرانی عێراق، کە کوردێکی لیبرالو لەڕیزەکانی سوپای عوسمانیدا کاریکردبوو، وای بەباشدەزانی کە لەگەڵیاندا رێك بکەون. لەمانگی نیسانی ١٩٤٥دا لێبوردنێکی گشتی بۆ بەرزانی و هەموو ئەو یاخیانەی لەگەڵیدا بوون دەرکرد، بەڵام سەرکردە کوردییەکە ئەمەی بەنیشانەی لاوازی دانا.

رەخنەگرێکی ئەمەریکایی توندو راستگۆ، گومانەکانی بەریتانیاییەکانی پەسەند نەدەکرد کە لەبارەی هەستی نەتەوەیی بەرزانی دەیانکرد، بەڵام ئاماژەی بەوە دەکرد کە "ئەگەر بەرزانی بە توانایی و نەترسییەکەی ناسرابێت" ئەوا "شتی خراپی وەك لەخۆبایی و خۆویستی و ڕاڕایی و کورتبینی و کەللە ڕەقێتیشی هەیە". بەڵام ئەو کوردانەی ئەم کەموکورتیانەیان دیاریکردبوو، هەر هیچ نەبێت لەو رۆژگارانەدا کەمبوون و ئەوساش مەلا مستەفا کاریگەرێتییەکی زۆری لەسەر کورد هەبوو. موحسین دزەیی، کە لەوەتەی بیریکردۆتەوە لەخزمەتی بنەماڵەی بەرزانیدایە، باسی ئەو خۆشحاڵییەی خۆی دەکات کە لە١٩٤٣دا، کاتێك لەشاری هەولێر قوتابی قۆناغی سەرەتایی بووە، بیستوێتی مەلا مستەفا لەسلێمانی هەڵاتووە. جەخت لەسەر ئەوەشدەکات کە "ئەوکاتە هەستی نەتەوەیی لەوپەڕیدا بوو"، ساڵێك دواتر، بەرزانی بەماوەڵی دوانزە پاسەوانی تایبەتی خۆیەوە کە بەفیشەکدان و تفەنگی چیکی لوولە درێژی "بڕنەو"و، بە جامەدانی سوورو سپی تایبەت بە بەرزانییەکانەوە، هاتەناو شاری هەولێرەوە. دزەیی دەڵێت: "ئێمە هەموومان بۆ بینینی لەقوتابخانە هاتینەدەرەوە، هەرچەندە خۆی کورتە باڵابوو بەڵام بە بەرگە کوردییەکەیەوە بەپیاوێکی بەشان و شەوکەت دەهاتە بەرچاوم". وەچەیەك دوای ئەوە یاریدەدەرێکی تری بەرزانی بەبیریدێت، کەرۆژێکی بەهار، کاتێك بۆ یەکەمین جار مەلا مستەفا دەبینێت بەسەر ئەسپە سپییەکەیەوە پێش "کۆمەڵێك لە پاسەوانە تایبەتییە شکۆمەندەکانی خۆی" کەوتووەو لەدەشتاییەکی پڕ لەگوڵە کێویلەوە هاتۆتە دەرەوە، ئەم چۆن دڵی کەوتۆتە پەلەپەل.

بەکۆتاییهاتنی دووەم جەنگی جیهانی، لەئابی ١٩٤٥دا مەلا مستەفا شۆڕشێکی سەرتاسەری راگەیاند. لەگەڵ ئەو سەرکەوتنە گرنگانەی سەرەتا بەرزانی دژ بەهێزە ساواکەی حکومەت بەدەستی هێنا، دیسان تێکشکێنرایەوە. وەزیری ناوخۆی عێراق کەوتە هاندانی ئەو تیرە کوردیانەی کێبەرکێی بەرزانیان دەکرد تا بەرەنگاری ببنەوەو پارەی پێویستیشی دانێ، ئەوانیش پەرۆشی شەڕکردنی کۆنە دوژمنەکەیانیان و، خۆشحاڵی ئەوپارە زۆرەبوون کە حکومەتی عێراق وەك خەڵاتێك لەپێناو هەوڵەکانیاندا دلبووینێ. زۆری نەبرد بەرزانی ناچاربوو هەڵێت و، لەناوەڕاستی تشرینی یەکەمدا لەگەڵ دە هەزار کەسی خۆیدا، کەهەرسێ یەکێکیان

جەنگاوەربوونو، هەمووشی لەتیرەکەی خۆی نەبوون، لەسنووری ئێران پەڕینەوە. بەڵام ئەمجارەیان هەڵاتنەکەیان ئاسانبوو، چونکە سنووری ئێران کراوەبوو هاتنیشی بۆ کوردستانی ئێران خۆرپەیەکی خۆشبوو بۆ نەتەوەییە کوردەکانو بەڕێوەبردنی کۆڕبەلەکەی مەهابادیان. هێزەکانی ئێران ڕێیان لەبەرزانیو جەنگاوەرەکانی نەگرت، چونکە زۆربەی کوردستانی ئێران ناوچەی لێکدابڕانی هێزە داگیرکەرەکانی بەریتانیاو شۆرەوی بوو هیچ هێزێکی ئێرانیشی تیادا نەمابوو. لەساڵی ١٩٤١ەوە کەسوپای سوور چۆتە ئەویو، کاتێکیش شۆرەویو بەریتانیاییەکان دەستیان لەکاروباری ئێران وەرداو ڕەزا شایان لابردو لەترسی لایەنگرێتییەکەی ئەڵمانیای دوریانخستەوە، شۆرەویو بەریتانیاییەکان ناوچەیەکیان لەنێوان ئەو هێزانەیاندا دابڕی ئایارەتییە سەربازییەکانی خۆرئاوا، کە لەکەنداوی فارسییەوەو بەکوردستاندا تا سنووری شۆرەوی-ئێرانو، لەوێشەوە بۆ مۆسکۆ کە هێجگار پێویستی بوو، بگەیەنێت.

شۆرەویو کوردەکانی ئێران سوودیان لەو بۆشاییە بینی کەنەبوونی دەستەڵاتی ئێران لەکوردستاندا جێیانهێشتبوو. بەتایبەتی بۆ کوردی ئێران کەلەساڵی ١٨٧٨ەوەو لەوەتەی ئێران "میرنشینی ئەردەلان"ی لەناوبرد کە دوامیرنشینی کوردبوو، باری واچاکیان بەخۆیانەوە نەدیبوو. بەرزانی لەنزیك سنوورەوە چاوی بە ژەنەڕاڵێکی شۆرەوی کەوت، داوای لێکرد هێزە پەککەوتەکەی خۆی لە مەهاباد بخاتە ژێر دەستەڵاتی قازی محەممەدەوە. قازی محەمەد کەنەوسا پەنجا ساڵ تەمەنی بوو، سەرکردەیەکی ئاینی ئیسلامانەی خاوەن زانیارییەکی زۆرو قازییەکی شەرعی ولبوو کە گەلێك ڕێزی لێدەگیرا. بۆ دامەزراندنی ئەوەی بە "کۆماری مەهاباد" ناسراو خۆی سەرۆکایەتییەکەیی گرتەدەست، لەلایەن شۆرەوییەوە یارمەتی دەدرا قازی کەسایەتیەکی خاکیو لەخێزانێکی گرنگی مەهابادی ولبوو کە لەهەموو خێزانەکانی دی ناودارتربوو، هەبوویەش کاتێك دەستەڵاتدارانی ئێران لەناوچەکەدا نەمان، ئەم بەڕاستی بووە بەرپرسی ناوچەکە. هاتنی بەرزانیو جەنگاوەرەکانی بۆ قازی محەمەد، کە لەسوپای کەمبوو، خەڵاتێکی چاوەڕواننەکراوی یەزدان بوو، چونکە جگە لەلایەنگرێتی دانیشتوانی شاری مەهابادو چەند کەسێکی تیرە کوردییەکانی ئێران هیچی تری نەبوو. بەڵام بەرزانییەکان بەهۆی سەرنەرچوونیان لەهونەری شەڕی ناوچەیادا، بەپێچەوانەی ڕۆڵە تازە چەکدارکراوەکانی ئەو تیرانەی هەرکەلەناوچەکانی خۆیان دوورخرانەوە ئەژنۆیان دەشکێت، سەلماندیان کە هێزێکی بەزەبری چالاكو کاریگەرن.

"کۆماری مەهاباد" وێنەیەکی کالبوەی "کۆماری ئازەربایجانی دیموکراتی" خاوەن ئۆتۆنۆمی بوو کەهاوپەیمانە ناوخۆییەکانی شۆرەوی بەیارمەتی سوپای سوور، لەکانونی

یەکەمی ١٩٤٤دا تەبریزی پایتەختیانگرت و دایانمەزراندبوو. لە١٦ی ئابی ١٩٤٥دا قازی محەمەد، بەهاندانی شورەوی "حیزبی دیموکراتی کوردستان"ی پێکهێنا. هەرچەندە قازی محەمەد دوودڵبوو، بەڵام ئەویش وەك ئازەرییەکانی کردو، لە٢٢ی کانوونی دووەمی ١٩٤٦دا لەگۆڕەپانی "چوار چرا" کەتاکە دووشەقامە قیرتاوەکەی شارەکەی پێك دەگەیاند، "کۆماری گەلی کورد"ی راگەیاندو، بەئامادەبوونی سەرۆك عەشیرەتەکانی کوردی ئێران و، بەرپرسانی حیزبی دیموکراتی کوردستان و، سێ ئەفسەری شورەوی کە بەجیپێکی سەربازیانەی چەك لەسەر دامەزراوەوە هاتبوون و، بەرزانیش کەبەرگی ژەنەراڵیانەی سەرشان پانی شورەوی و چەکمەیەکی درێژ لەپێ هەڵکێشراوەوە ئامادەبوو، قازی ئاڵای کوردیشی هەڵکرد.

دامەزراندنی حیزبی دیموکراتی کوردستان و حکومەت راگەیاندنەکەش، لەئەنجامی سەردانێکی کوتوپڕی "باکۆ"ی پایتەختی ئازەربایجانی شورەوییەوە هات، کە لەئەیلولی ١٩٤٥دا قازی محەمەدو چەند سەرەك عەشیرەتێکی کورد بەبانگهێشتێکی شورەوی کردبوویان. چونکە لەو ماوەیەدا ستالین هەوڵی ئەوەی بوو کەباکووری خۆرئاوای ئێران بخاتە سەر وڵاتەکەی و کوردیش بەشێکی پلانەکەی بوو. لەباکۆ کوردەکان بەڵێنی پارەو، چاپخانەیەك تا رۆژنامەیەکی پێدەرکەن، چەکی قورس و، بەخشینی چەند کوردسییەك لەئامۆژگا سەربازییەکانی شورەویان پێدرا. وەك ئەوکاتە حیزبی دیموکراتی کوردستان رایگەیاند، هەول بۆ "بەدیهێنانی ئۆتۆنۆمی (کوردستان)لەچوارچێوەی دەوڵەتی ئێران"دا دەدا نەك سەربەخۆیی تەواو. بەڵام لایەنگرانی حیزب و "هەندێك لەمێژوونووسان"یش، تا ئەمرۆ پرسیاری ئەوە دەکەن کە، ئاخۆ کۆماری مەهاباد بەراستی هەوڵی سەربەخۆیی تەواوی بوو؟. ئاڵای کورد لەهەرسێ رەنگی سووروو سپی و کەسك پێکهاتبوو، واتە کۆپییەکی هەڵگەڕاوەی ئاڵای ئێران بوو، وەك کورد نەتوانن بەتەواوەتی خۆیان لەئێران جیابکەنەوە. ئەو دەمە ئەم وردەکاریانە بەلای حکومەتە شایانە لاوازەکەی ئێران و ئەمەریکاو بەریتانیای دۆستیانەوە بایەخی نەبوو. محەمەد رەزا پەهلەوی کەشایەکی گەنجی بێتاقیکردنەوەبوو، لەسەر تەختی تاووس جێگەی باوکی گرتبۆوە، دەرکی بەوەکردبوو کە کوردو بلوش و ئازەرو تورکمان و عەرەب، هەموویان پێکەوە لەنێوەی دانیشتوانی ئێران زیاترن،ن هەر ئۆتۆنۆمییەك چەند کەمیش بێت بەدەست بهێنن، بەرەنگاربوونەوەیەکی راستەقینەی دەستەڵاتە ناوەندییەکەیەتی. تا دەهات دنەڕاوکێی هاوپەیمانانیش، لەزۆربوونی رۆڵی کورد لەناو چوارچێوەی پلانەکانی شورەویدا زیادیدەکردو یەکەمین پێکدا هەڵپژانی پەلەی ناو جەنگی ساردی هێنایە ئاراوە.

لەسەرەتاوە شۆڕەوی حەزی بەهەڵسوکەوتکردنی سەرکردە کۆنەکانی کوردی وەك قازی محەمەدو سەرەك عەشیرەتە پارێزگارەکان کردووە، نەك ئەو ڕێکخراوە نەتەوەییانەی دەستیان لەدامەزراندنی حیزبی دیموکراتی کوردستاندا هەبوو، وەك "کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد"و هەندێك لەکۆمۆنیستەکان و نوێنەرانی حیزبێکی نهێنی کوردی عێراق "هیوا". "کۆمەڵە"کە ساڵی ١٩٤٢ بەنهێنی دامەزرابوو، لقی لەزۆربەی شارە گەورە کوردییەکانی عێراقی وەك: هەولێرو کەرکوك و ڕەواندوزو شەقڵاوەو سلێمانی و، لەسوریاو تورکیاش دامەزراندبوو. چونکە لەهەڵسو کەوتە دیموکراتیانەکەی کۆمەڵە پەیڕەویدەکرد بەگومانبوون، بۆیە شۆڕەوییەکان سوور بوون لەسەرئەوەی قازی محەمەد، کە لەگەڵ زمانشیرینیەکەیدا بەخۆسەپێن ناسرابوو، لەنیسانی ١٩٤٥دا بچێتە حیزبەکەوە.

کۆماری مەهاباد دەستی بەسەر سێیەکی خاکی کوردستانی ئێراندا بۆ گیرا، دەستەڵاتیشی بەدەوری مەهابادا، کەدەکەوتە ناوچە دابڕاوەکەی ژێر دەستەڵاتی شۆڕەوییەوە، هەر تادووری ٦٠ میلێك بڕیدەکرد. بەڵام ئەم کۆمارە کوردی هەموو شوێنەکانی بەلای خۆیدا ڕاکێشا، بەتایبەتی ئەو لاوانەی پارتە کۆنەکان بێهیوایکردبوون. بەگەرمی پێشوازی نوێنەرایەتی کوردی سوریاو تورکیاو عێراق دەکرا. لەگەڵ ئەوەی ئەم کۆمارە یارمەتی لەیەکێتی شۆڕەوییەوە دەگەیشتێ، بەڵام (بەپێچەوانەی‌ڕژێمە ئازەرییە سەرکوتکەرەکەی باکووریان)ەوە، هەوڵی دەرزاداتی مارکسیانەو، شۆڕشی کۆمەڵایەتی و، بەڕاستی دابەشکردنی زەوی و زاریان نەدەداو، پۆلیسی نهێنیشیان دانەمەزراند. کتێبی خوێندنی قوتابخانەو ڕۆژنامەیەك و بڵاوکراوەیەکی رامیاریانەی مانگانەو دوو گۆڤاری ڕۆشنبیری یان دەردەکرد، کەهەمووی بۆچاکەی ئەو چاپخانەیە دەگەڕێتەوە کە سوپای سوور دابووینێ. ڕاستییەکەی کۆمار بەڕادەیەکی دیار ئازادو کراوەبوو. کۆمار لە ماوەی تەمەنە کورتەکەیدا، وەك نێوەندێکی کلتووری کوردانەو بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد کێبەرکێی دیمەشق و سلێمانی دەکرد.

بەڵام کۆمار، دوای پشتتێکردنی دۆستە شۆڕەوییەکانیان، ڕووخا. ستالین لەژێر گوشاری بەردەوامی بەریتانیاو ئەمەریکاو، بەجێهێنانی ئەو بەڵێنەی کاتی جەنگ دابووی و، کشانەوەی لەئازەربیجانی مانگی ئایاری ١٩٤٦داو، دەمشیرینکردنی مۆسکۆش بۆ کێشانەوەکەی سوپای سووری، بەڵێنی ئێران بوو کە ڕێبدات پشکنینێکی گرنگی نەوت بکات، ئەوەش هاندەربوو تا دەست لەدۆستە ئازەری و کوردەکانی هەڵبگرێت. ئیتر هەر ئەوەندەی هێزەکانی شۆڕەوی کشانەوە، ئێران کەلەبەرێکی یاسایی بۆ ئەو مافە نەوتییەی بەشۆڕەوی دابوو، دییەوە. زۆری نەخایاند کوردو سەربازە ئێرانییەکان دەرکیان بەنەگەڕانەوەی سوپای سوورکردو، مەهابادیش

کەپشتگیری کردنەکەی شۆڕەوی لێبڕا، ئیتر وەك بەرێکی گەییوی درەختێك بەربۆوە. کوردەکان کەمەر لە کۆنەوە لەهەموو حکومەتێك بەگومانبوون، نەیاندەزانی ئەمجارە ئەوانەی حوکمیاندەکەن وەك خۆیان کوردن‌و، پێویستە بەرگری لەمیانبکەن. کەچی لەقازی محەممەد، کەپێوەندی لەگەڵ شۆرەوییەکاندا کردبوو، دووردەکەوتنەوە، چونکە بەردەوام ڕاووڕوتەکەی سوپای ڕوسیای قەیسەری بەبیردێنانەوە کەلەکاتی جەنگی جیهانی یەکەمدا لەکوردستان کردبوویان.

لەبەرامبەر کۆکردنەوەی هێزە ڕوو لەزیادبووەکەی ئێراندا، قازی محەممەد هەوڵێکی بێهوودەی بۆ بەدەستهێنانی پشتگیریکردنی سەرەك عەشیرەتە کوردییەکان دا، کەبەپێی ئارەزووی تایبەتی خۆیان کاریاندەکردو، گوێیان بەچارەنووسی کۆمارەکە نەدەدلو، سەرپێچیشیاندەکرد. بێجگە لەهێزەکەی بەرزانی، قازی محەممەد تەنیا لایەنگرێتی عەشیرەتێکی بچووکی مەهابادو، بەشێکی کەم بایەخی عەشیرەتێکی تری بەدەستهێنا. بەرزانییەکان لەلایەکەوە بۆ سەرکوتکردنی چەند عەشیرەتێکی بەرهەڵستکاری قازی محەممەدو بەرەنگاربوونەوەی بەرێوەبەران، یان لە لایەکی تریشەوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی سوپای ئێران‌و ئازەرییەکان، بەکاردەهێنران. بەڵام بەڵێنەکانی شۆرەوی کەلەباکۆ، سەبارەت بە دانی زرێپۆش‌و تۆپ‌و چەکی قورسی دی بەکورد دابوویان، هەر بەمەرەکەبی سەر کاغەز مایەوە، قازی محەممەدیش پلەی وەزیرەکانی بۆ بەرێوەبەری بەش دالگرت‌و، خۆشی وازی لەنازناوی سەرکۆمار هێناو هەر بەسەرۆکی حیزبی دیموکراتی کوردستان خۆی دەناساندو، لەبەردەم میوانەکانیشیا پێی لەوە دادەگرت کەئۆتۆنۆمی تاکە ئامانجی بووە.

قازی محەممەد هەوڵی بێهودەی بۆ قایلکردنی دەستەلاتدارانی ئێران دا، تا بیکەنە دەستەلاتداری ناوچەیەکی بەرینی نوێ، کەلەسنووری شۆرەوییەوە تا باشووری کرمانشا بگرێتەوەو، شێوە ئۆتۆنۆمییەکیشی هەبێت. لەئایاردا شەڕی پچڕ پچڕ لەگەڵ هێزەکانی ئێراندا، لە ئاکامی کشانەوەی هێزەکانی شۆرەویدا دەستیپێکرد. لە ناویشەوە بازرگانێتیان لەگەڵ هەموو ئێراندا پچڕاو، بەرووبوومی کوردستان، لەدانەوێڵەو تووتن بەسەریەکدا کەڵەکەبوون کەزیاتر بێوورەیکردن. کوردستان خۆرکی کەمبۆوە، ئەویش کاتێك قازی محەممەد ناچاربوو نانی هێزەکەی بەرزانی بداتو، ئەو پێشوازییەگەرمەی سەرەتا بۆیانکردا بۆ ئەو مەبەستە بەکاربهێنێت، لەمە جگە لەنانداني خەڵکە هەژارەکە. بەرزانی خانەخوێکەیی بەدڵ نەبوو، بەدرێژایی سالانێکی زۆر بە "پیاوی خراپ"و، جگە لە "گیرفانی خۆ پڕکردن"هیچ ئامانجێکی تری نەبوو، باسی دەکرد. ئەگەرچی بەرزانی دانی بەوەدا نا کەقازی محەممەد ١٢٥٠ تفەنگ‌و ٢٠

رەشاشی بەهێزەکەی دلوە، بەڵام هەربە ((ناپاك))و لەبەر چەند هۆیەکی نادیاریش بە "بازرگانی بەکوردستان"ەوە کردن، دانەنا.

لە ١٠ی کانونی یەکەمی ١٩٤٦دا، هێزەکانی ئێران هێرشیان بۆ دەربەندێکی سەرەکی کرد، کەئازەرە دیموکراتییەکان دەستیان بەسەرداگرتبوو، بیستو چوار سەعاتی نەبرد ئازەرییەکان بەرگرییەکەیان و لەگەڵیشیا کۆماری ئازەربایجانی دیموکراتی تێکشکێنرا. یەکسەر قازی محەممەدیش خۆی بەدەستەوەدا. بەپێچەوانەی سەرکردایەتییەکەی ئازەر کەبۆ سەلامەتی خۆیان پەنایان بۆ یەکێتی شوورەوی برد، قازی لەکوردستاندا مایەوە تا بەرووی چارەنووسی خۆیدا بووەستێتەوە. بەپێی کولتووری شەرەفمەندانەی خۆبەدەستەوەدانی کوردانە شەڕی نەکرد، کەبووەهۆی ئەوەی لاوە کوردە نەتەوەییەکان ڕەخنەی لێبگرن. بگرە قازی لە ١٧ی کانوونی یەکەمدا کاتێك سوپای ئێران بێ تەقە چوونە مەهابادەوە، پێشوازیکردن. دوو ڕۆژ دواتر قازییان گرت و، لەگەڵ برایەکی و ئامۆزایەکی، لەسەر ڕۆڵی سەرەکی هەر یەکەیان بۆ دامەزراندنی کۆمار، لەگۆڕەپانی "چوارچرا"داو لە سەعات سێ ی بەرەبەیانی ڕۆژی ٣١ی ئازاری ١٩٤٧دا، لەسێدارەیاندان. سەرجەم شارەکانی کوردستانی ئێران شەپۆلی لەو جۆرە سێدارەدانەیان بەخۆیانەوە بینی و، بەوەش یەکەم کۆماری کوردی مێژووی نوێیان لەناوبرد.

بەرزانی ئەو ئازناوەی قازی محەممەد پێی بەخشی شایانی بوو، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ، کۆمار زیاتر پشتی بەهێزەکانی دەبەست تا بەرگری لێبکات، لەکاتێکدا بەرگری عەشایەرە کوردییە ئێرانییەکان، کەلایەنگرێتییەکەیان بەردەوام دەگۆڕا، لەکەمبوونەوەدابوو. ئەو گرفتەی لەپێوەندی قازی محەممەدو عەشایەرەکانەوە بەرەوڕووی قازی دەبۆوە، نموونەیەکی کۆنی ئەو ناکۆکییانەی نێوان پوختە سیاسییە شارنشینەکەو هێزە سەربازییەکە بوو کەگاڵتەی بەو سەرکردایەتییە سیاسییە دەکردو لەسیاسەتەکانیشی نەدەگەیشت. زۆری نەبرد ئەو عەشایەرانەی لایەنگری کۆماربوون، دەستیان بەنەریتە خراپە کۆنەکەیان کردەوەو کەوتنەوە پلوورپوتکردنی گەشتیاران و سەرانە سەندنی جوتیاران.

بەرزانی ڕۆژێك چییە بێزاری خۆی لەکوردی ئێران نەشاردەوەو بووەهۆی ژەهراویکردنی پەیوەندی دەیان ساڵی ئایندەی پێیانەوە، کەپێدەچێ تەنیا ڕۆژێکیش بیری لەمەترسی پشتبەستنی کورد بەهێزە دەرەکییەکان نەکردبێتەوە. نەیتوانی لەو دەرزە ئاشکرایەی ئەزموونەکەی کۆماری مەهابادیش سوود وەربگرێت و، بگرە ئەو ڕووداوە باوەڕی بەڕاستی بۆچوونەکانی خۆی و داواکردن لەهەموو کورد کەکوێرانە دوای بکەون، چەسپاند. هەرئەوەش وای لێکرد لەسەر حسابی کوردی ئێران ئەو ڕێکەوتنانە لەگەڵ شادا بکات. چەندین کەرەت

ئەوەی دووبارە دەکردەوە کەخەباتی کوردی عێراقی پێپێشدەخرێت و، رۆژێك چییە لەو باوەڕەی، کە پێویستە کوردی ئێران و سوریا و تورکیا لەپێناو هێنانەدی خواستە سیاسییەکانی ئەودا، قوربانی بەمەبەستە رامیارییەکانی خۆیان بدەن، ئەهاتە خوارەوەو هەرواش ڕەفتاری ئەکرد.

سالی ١٩٦٨، لاوانی کوردی ئێران شۆڕشێکیان لەدژی شا بەرپاکرد، ئەویش لە کاتێکدا بووە کە بەرزانی فرمانی پێکردبوون شتی وانەکەن، بۆیە خراپ هەلچوو، سەرکردەیەکی کوردی ئێرانی بەناوی "سلێمان مەعینی"کوشت و لاشەکەشی دایەوە بە پیاوەکانی شاو ئەوانیش بەناو هەموو شارەکانی کوردستانی ئێراندا گێڕایان، لەنێوان ١٩٦١و ١٩٧٥یشدا ٤٢ ئەندامی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران کەهەولی پەنا بۆ عێراق بردنیانەدا، بەفرمانی بەرزانی گیران یان کوژران و درانەوە بەئێرانییەکان. کە بەرزانیش پێویستی بەیارمەتی ئەوان بوو، کوردەکانی ئێران بەرادەیەك لاوازبوون و ژیانیان لێ تالکرابوو کە نەتوانن یارمەتی بدەن. ئەم کرژیانە لەنێوان کوردی ئێران و عێراق و تورکیادا بەدرێژایی سالانی دواتر بەردەوامبوون و بنجیشیان داکوتا.

دوای وەچەیەکیش کوردی عێراق کە بۆ پێوەندیکردنی دونیای دەرەوەیان دەبوا بەتەواوەتی پشتیان بەئەنقەرە ببەستایە، شەڕیان لەگەل کوردی تورکیادا کرد، چونکە ئەمان پێیان وابوو کە گرنگیدان بەخەباتی دژ بەتورکیایان دەبێت لەپێش هەموو شتێکی ترەوەبێت.

مانـەوەی بـەرزانی وەك لایـەنگرێکی کۆمـاری مـەهاباد، تەنانـەت دوای ئـەوەش کـە هـەموو عەشیرەتەکانی کوردستانی ئێران لێی تەکینەوە، شتێکە نابێت لەبیربکرێت چونکە لەوەزیاتر هیچی تری پێنەدەکرلو، هیچ شوێنێکی تریش نەبوو ڕووی تێبکات. لەو قۆناغەدا بەرزانی دانی بەقەیرانی خۆی و ئەو قەیرانەشدا نا کە کۆمارەکەی تێکەوتبوو، کە وتی: "سوپای ئێران بەسەر کورددا زال نەبوو، بەلکو وولاتە یەکگرتووەکان و بەریتانیای مەزن بەسەر یەکێتی شۆرەویدا زالبوون". چەند رۆژێك دوای کەوتنی مەهاباد، بەرزانی پاسێکی درایە کەبەئێراندا گوزەربکات، مانگێك زیاتریش لەتاران مایەوە، هەولێکی بێهوودەشی بۆ رازیکردنی بەریتانیادا تا بۆ بەرزان بگەرێتەوە، لەهەلوێستی ئەمەریکاش بگات ئەگەر داوای وەرگرتنی وەك پەناهەندەیەکی سیاسی بکات. شا پێشنیاری نیشتەجێکردنی بەرزانییەکانی لەنزیك شاری هەمەدان باکووری خۆرئاوای ئێران بۆکرد، کەناوچەیەکی زۆر دوورە لەسنووری عێراقەوە. مەلا مستەفا هەستیکرد، (هەستەکەشی راستبوو) شا هەولی تواندنەوەی بەرزانییەکانێتی لەناو ئێراندا.

مەلا مستەفا، بەر لەوەی پێشنیارەکە بەهێجگاری رەتبکاتەوە، بڕیاری لێکۆلینەوەییدا چونکە لەو سەختی زستانەدا دەیویست کات بەسەربەرێت، بەرزانییەکان دوای ئەوەی چاکترین چەکی کۆماریان دەستگیربوو (نزیکەی سێ هەزار تفەنگ و ١٢٠ رەشاش و نارنجۆك و دوو تۆپی

مەیدان)، لە "نەغەدە"ی باکووری مەهابادەوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی چارەنووسیان خۆیان ئامادەکرد. دوالکاگ سوپای ئێران ئارامی لێبڕاو، بەپیاوەری عەشایەرە کوردەکان کە پێشتر هاوپەیمانێتی لەگەڵدا کردبوون و تاران بەڵێنی لێخۆشبوونی دابوونێ، کەوتە ڕاونانی بەرزانییەکان.

لە١١ی ئازاردا بەرزانییەکان، بۆ کشانەوە ئەفسانەییەکەیان کەوتنە شەڕەوە، "سەلماندیان کەدوژمنێکی سەرسوڕهێنەرو فێڵزانن و لەکاتی خۆشیداو، لەشوێنێکی گونجاودلو لەوکاتانەشدا کەخۆیان دیاریدەکەن، شەڕی چاك دەکەن". لەکاتی پێکهەڵپڕژانی ڕۆژانەیاندا، زیانی زیاتر لەوانەی لە خۆیان دەکەوت بەدوژمن گەیاند. بەڵام ئەوبۆردومانە بەردەوامەی دولنزە کۆنە فڕۆکەی جەنگو، گوشاری بەردەوامی مەیدانی ئێرانییەکان، بەرەبەرە کاری لەوورەی جەنگاوەرو ژن و منداڵ کرد، بۆیە بەرزانییەکان هێزەکانی خۆیانیان کرد بەدوو بەشەوە. لەسەرەتای نیساندا، شێخ ئەحمەدو چوار ئەفسەری هەڵاتووی سوپای عێراق و زۆر لەجەنگاوەرو خێزانە ئاساییەکان، بڕیاریان دا هەرچۆنێك بکەوێتەوە بچنەوە بۆ عێراق، خۆیان دا بەدەست هێزێکی عێراقەوە، کەلەسەر سنوور چاوەڕوانیدەکردن عێراقییەکان شێخ ئەحمەدیان بەپانزە ساڵ و، دوورخستنەوەی براەرەکانیشی بۆ بۆ خوارووی عێراق سزادا. ئاگادارێکردنەوەکانی مەلا مستەفا، سەبارەت بە ئەنجام خراپی خۆبەدەستەوەدانی چوار ئەفسەرەکە ڕاستدەرچوو، چونکە عێراقییەکان لەسێدارەیاندان.

پاش چەند ڕۆژێك، مەلا مستەفاو ٤٩٢ جەنگاوەرەکەی لەگەڵیا مابوونەوە، ڕێگەیەکی پڕ مەترسیان گرتەبەر. پێش هێزەکانی ئێران کەوتن و، شەوی ١٢ی نیسان لەسنوورەوە خۆیان بەخاکی عێراقدا کردو، بەرەو چیا دووردەست و سەختەکانی باکووری بەرزان بوونەوە. دوو هەفتە دواتر، کەنەیتوانی لێبوردنی بەغدا بەدەستبهێنێ، ڕەوەکەی دەستپێکردەوە، کە ڕەنگە هیچ ڕێکەوتنێکی لەگەڵ ئێران و تورکیادا بیر لێنەکردبێتەوە، کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ پیاوەکانیدا کردو، باسی ئەوەی بۆکردن کە بێجگە لەڕووکردنە یەکێتی شۆرەوی هیچ شتێکی تریان بۆ نەماوەتەوە. وتەیەکی بۆدان وتی: "ماندوو، برسی و، پێخاوس دەبن"، ئەمجا لاف ئەوەی لێدا کەقسەیکردووە "لەگەڵ ڕووسەکانداو، ئەوانیش وتوویانە ڕەنگە پێشوازیبکرێین". بێئەوەی باس لەوە بکات، کەچۆن و کەی و لە کوێ پێوەندی بەشورەوییەکانەوە کردووە. ئەمیش وەك زۆربەی ئەفسانەکان، مەلا مستەفا ملی بە ڕۆژگارەکەی خۆی داو، ئەفسانە تایبەتییەکەیی دروستکرد، چونکە هیچی تری لەبەردەمدا نەبوو. لەم قۆناغەی کشانەوەکەدا سێ هەفتەی خایاند، بەرزانی لە٢٧ی ئازاردا، بۆ ماوەیەکی کەم چووەناو خاکی تورکیاوە، ئەمجا دوای دوو

ڕۆژ چووەناو خاکی ئێرانەوەو، لەوێشەوە ڕووەو باکوور بڕۆوە. لەکاتی کشانەوەکەیدا، بەرزانی چەند جارێک، بۆ ماوەی کەم کەم پێش ئەوەی بێتەوە ناو ئێران، کەوتوو لیوای ئێرانی بەدواوە بوو، ناچاربوو بچێتە ناو خاکی تورکیاوە. کوردەکان جگە لەچەند وڵاخێکی پێویست بۆ هەڵگرتنی بریندارانو ئەو پێویستییە کەمەی پێیانبوو، هیچی تریان نەبوو. بۆیە بەرزانیو پیاوە ساغەکانی، ناچاربوون ٣٥٤ کیلۆمەتر بەناو چیاکانی "زاگرۆس"دا، کەجار هەیە ١٢ پێ بەفری لەسەرە بەپێ بڕن.

"ئەنارادا دزڵەمەڕی" یەکێک بوو لەوانەی بەشداری کشانەوەکەیانکردبوو، تاساڵی ١٩٩١یش هەر پاسەوانی تایبەتی بنەماڵەی بەرزانی بوو، جەختی لەسەر ئەوە دەکرد کە مەلا مستەفا "پیاوێکی هێجگار خاکی بوو، قایل نەدەبوو هیچ کەسێک شتو مەکەکانی بۆ هەڵبگرێتو، گاڵتەی لەگەڵ هەموانیشدا دەکرد، سووریش بوو لەسەرئەوەی کە لەناوجەرگەی ڕووداوەکاندا بێت". ئەمجا بەشانازییەوە دەیوت:" بەدرێژایی ژیانم بۆ مەلا مستەفا شەڕمکردووە، ئەک بۆ کوردستان". لەترسی ئاشکرانەبوونی شوێنی هێزەکانی، بەرزانیو پیاوەکانی شەوانە بەناو چیاکاندا جێگۆڕکەیاندەکرد نەک بەڕۆژ، پێڵاویشیان لەکۆنە تایەی لاستیک دروست دەکرد، چونکە "زیاتر بەرگەیاندەگرتو دەنگیشیان لێوە نەدەهات"، لەبەر قورسی چەکە ئۆتۆماتیکییەکان وازلێهێناو پیشتیان بە ئەمنگە کۆنە برنەوە هاژر بەدەستەکان بەست، کەلەپۆژانی خۆشی رابردوویاندا شا پێی بەخشیبوون، فیشەکەکانیشیان لەناو خۆیاندا بەشکردو هەریەکەو ٥٠٠ دانەی بەرکەوت. کوردی ئەو ناوچانەی بەرزانی پیایدا رەتدەبوو، "دەترسان" نانو پێڵاو بەپێشمەرگەکان بدەن، هەر لەبەرئەوەش مەلا مستەفاو پیاوەکانی، دەگەمەن دەبوایە لەو گوندانەی پیایدا گوزەریان دەکرد نەدەنوستن، بەرد یان بەفریان رادەخست. ئەو گرفتە سەرەکییانەی بەهۆی کەمی ئاوەوە تووشیانهاتبوو، ((لەشمان دەخورا))و بەهۆی دڕان پرنۆلپرنۆلی جلو بەرگیشیانەوە، "چونکە زۆرجار ناچاردەبووین لەسەرچۆک بڕۆین، تاکەس نەمانبینێت". خۆ زۆرجار ڕێگەکە هێندە سەختبوو کە "ئێسترەکانمان نەیاندەتوانی پیایاندا بڕۆن" ناچاری دەکردین، "بریندارەکانمان جێبهێڵین". لەو پاشە کشەیەدا، بەرزانی ٢٨ کەسی لەشەڕدا لەدەستداو، زیاتر لە ٢٠ کەسیش بەهۆی برینەکانیان یان زۆر ماندووبوونیانەوە مردن. بەرزانی ناچاربوو سێ شەڕی قورسو نزیکەی شەش سووکە پێکدادەهەڵپڕژان بکات بەڵام ئەو هێزە ئێرانیانەی بۆ ڕاونانی نێردرابوون، هێزەکانیانی بۆ تێکنەشکێنرا.

دوای چلو چوار ساڵ لەهۆی سەرنەکەوتنی ئێرانییەکان تێگەیشتم. ساڵی ١٩٩١ کە لەدەست هێزەکانی عێراق هەڵدەهاتم، چاوساغەکەی ڕێگام جۆگەلەیەکی پچووکی لە سنووری عێراق

تورکیا نیشاندام، کەبەهاران بەهۆی تواندنەوەی بەفرەوە ئاوەکەی بە شێوەیەکی ترسناك زیادیدەکرد، بەرزانی و جەنگاوەرەکانی لەهەڵاتنیاندا لەوێوە پەڕیبوونەوە. ئەو جۆگەیە هیچ شتێکی تایبەت بەخۆیی نەبوو کەلەوانی دی جوێی بکاتەوە، بەڵام وەك پێیان وتم، بەهاران کاتی توانەوەی بەفر، لەناوچەکەدا ئەوی بەربڵاویی چەند میلێك تاکە ڕێی بێترسی پەڕینەوەیە. بەرزانی شارەزاییەکی چاکیشی لەڕووەك و ئاژەڵی کوردستاندا هەبوو، شانازی بەوەشەوە دەکرد کە هەموو ئەو ڕێگایانەی ئەسکەندەری گەورە بۆ چوونە سەر هندستان، لەناوچەکەدا گرتوێتی دەزانێت. بەرزانی چونکە ڕێوبانی کوردستانی بە وردی دەزانی، ئەوانەی چەولشە دەکرد کە دوای دەکەوتن. ئێرانییەکان تا ١٨ی حوزەیران پێیڕانەگەیشتن و، ەگەیشتنە کەناری ڕووباری "ئاراس" کە سنووری نێوان ئێران و ئەرمینیای شوورەوی دیاریدەکرد، کاتێکیش گەیشتن لەلاشەی دوو پیاو کەلەپەڕینەوەی ڕووبارەکەدا خنکابوون و چەند تفەنگێکی خراپ و هەندێ زەخیرە بەولاوە هیچی دیان نەدۆزیبۆوە، بەڵام بەرزانی و جەنگاوەرەکانی، هەشت ڕۆژ پێشتر گەیشتبوونە ناوچەیەك کە ٢٥ میل لەباشووری خۆرهەڵاتی چیای ئاراراتی بە بەفر داپۆشراوە دووربوو، ڕووبارەکەشیان لێوەوە دیاربوو، بەرزانی دوو کەسی نارد تا شوورەوییەکان بەپێشوازیکردنی خۆی و جەنگاوەرەکانی قایلبکەن، لە ١٥ی حوزەیراندا لە ڕووبارەکە پەڕینەوەو، پانزە دانە سالی ڕەبەق لە ئاوارەییدا مانەوە.

شوورەوی، کوردەکانی کرد بەچەند کۆمەڵەیەکی پچووکەوەو، بەپێی تەکتیکی هەڵس و کەوتکردنی ستالین، لەگەڵ کەمایەتییە نەتەوەکاندا، بەسەر وڵاتە بەرینەکەیاندا پەرش و بڵاویکردنەوە. لەزستانی ١٩٤٩ - ١٩٥٠دا بەرزانی خانە خوێکانی، بە ڕەتکردنەوەی دامەزراندنی حکومەتێکی دوورە وڵات، بەسەرۆکایەتی خۆی، وەك سەرەتایەك بۆ دەستپێکردنەوەی شۆڕشی کورد، تووڕەکرد. ئەوەش هەڵوێستی ئایدۆلۆجی نەبوو بەڵکو هەڵوێستێکی کەسێتی خۆی بوو. بڕوادەیەك قینی لەقازی محەممەد بوو کەگومان لەهۆی سووربوونی شوورەوی بکات بۆ دانانی "ڕەحیم"ی ئامۆزای سەرکردەی خوالێخۆشبوو بە وەزیری دەرەوەی ئەو حکومەتە پێشنیارکراوە. شوورەوییەکانیش هەڵس و کەوتی مەلا مستەفایان بەدڵ نەبوو، بۆیە گرتیان و دووریانخستەوە، ئەویش ناچار لە لەباخێکی مەریدا وەك میوەکێشێك ئیشیدەکرد. لە باکۆی پایتەختی کۆماری ئازەربێجانی شوورەوییەوە بۆ "تاشقەند"ی ئاسیای ناوەڕاست گوێزرایەوە، ئەویش بەرلەوەی، جارێکی دی بەفرمانی ستالین بۆ مۆسکۆ بگوێزرێتەوە. کار وای لێهات شوێن دیاریکردن بۆ بەرزانی ستەمبێت. جەلال تاڵەبانی کەئەوسا لاوێك بوو بەرزانی زۆر بەدڵبوو، گێڕایەوە کەچۆن بەهۆی بانگهێشتکردنی بۆ میهرەجانی لاوانی

کۆمۆنیستی ساڵی ١٩٥٧ەوە، بوونی خۆی لەپایتەختی شورەویدا بۆچاوپێکەوتنی نموونە باڵاکەی خۆی تەرخانکرد. خۆی لەیاوەرە شورەوییەکانی دزییەوەو دوای هەوڵێکی زۆر بەرزانی لەفلاتێکی پچووکی مۆسکۆدا دییەوەو، چەند وێنەیەکی خێزانەکەی و هەواڵیانی پێگەیاند. بەدووقوڵی و لەکاتی بێکاری تاڵەبانیدا، سەبارەت بە داهاتوی کوردستان قسەیانکردووە. لەو رۆژانەدا تاڵەبانی مارکسی بوو، زوو هەستیکرد کەبەرزانی مارکسی نییە، بەڵکو خۆی (دڵنی بەوەدا تا کەڵەو بارەیەوە ئەوەندە زانیاری کەمە، وازی لەقوتابخانەیەکی سەر بە پارتی کۆمۆنیستی شورەوی هێناوە، چونکە لەتاقیکردنەوەیەکیدا، بیری چووبۆوە کە لێنین دامەزرێنەری شورەوییە).

بەڵام هەموو ئەم شتانە رای خۆرئاوا بەگشتی و وڵاتە یەکگرتووەکان بەتایبەتی نەگۆری کە بەرزانی دەستکەلایەکی شورەوی نەبێت. هەر بۆ نموونە، لە راپۆرتێکدا کە ساڵی ١٩٥١ راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی سەرۆک کۆمار ئامادەیکردبوو، جەخت لەسەرئەوە دەکات کە "شورەوی بەڵێنی بە کورد داوە پشتگیری داواکاری ئۆتۆنۆمیان لەعێراقدا بکات و لەرێی مەلا مستەفای بەکرێگیراویشیانەوە، کە ئێستا لە رووسیا دەژی، چاودێرییەکی تایبەتیان بکات". ئەم بۆچوونە لەبەر دوو هۆ هەڵەبوو: بەرزانی نەتەوەییەکی ئەوەندە توندڕەو بوو شورەوییەکان هیچ حسابێکیان بۆ نەدەکردو، کرملنیش لەو جۆرانە نەبوو بەڵێن بەو پەنابەرانەی لای خۆی بدات و جێبەجێکردنیشی لەئەستۆ بگرێت. بەرزانی زۆر لەنازناوی "مەلای سوور"، کە ئەو رۆژنامە خۆرئاواییانەی حەز بە نازناو بەخشینەوە دەکەن لێیان نابوو، پەستدەبوو، ئەم نازناوەش لەبەر هەمان ئەو دوو هۆیەی سەرەوە هەڵەبوون. بەرزانی دواتر لەبەردەم میوانە خۆرئاواییەکانیا پێی لەسەرئەوە دادەگرت کە "کۆمۆنیست نیمو، کەپەناشم بردەبەر روسیا، ئەوکاتە هیچ چارێکی ترم نەبووە".

بەدرێژای ساڵانی ئایندە، بەرزانی میوانەکانی بەوە قایلدەکرد کە ئاوارەییەکەی روسیای وا چاک نەبووە. بەڵام ئەوانەی گومانیان لە راستگۆییەکەی دەکرد، پێیان وابوو بەرزانی دوای ئەوەی لە شەستەکاندا چارەنووسی خۆی بەئێران و ئیسرائیل و، لەدوای ١٩٧٢ شەوە بە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاوە بەستەوە، ئەمجۆرە هەڵوێستانەی ئاساییە. راستییەکەشی بەرزانی ساڵانێکی زۆر پێش ئەوە، راستی هەڵبژاردەکانی خۆی ئاشکراکردبوو، لەو سەردەمەی وڵاتە یەکگرتووەکان، بەهۆی شەری ڤێتنامەوە لە ئوشوستیدابوو، ئارەزووی کوردستان کردنە "پەنجاو یەکەمین ولایەتی ئەمەریکا"ی بەمیوانە خۆرئاواییە هەپەساوەکانی رادەگەیاند. ئەوی راستی بێت گۆرانی هاوپەیمانێتییەکانی بەرزانی، لەنێوان دوو زلهێزەکەو لەکاتی جەنگی

سارددا، ئادگارێکی سەرەکی سەرکردەی بزووتنەوە ئازادی نیشتمانییەکانی جیهانی سێیەم بوو. بەرزانی بەپێی رەفتاری کۆنی دەرەبەگایەتی ئەو قسانەی بۆ میوانە بیانییەکانی دەکرد، چونکە پێی وابوو بەدڵی ئەوان دەدوێت. تاڵەبانی ئەوەی باسکرد، کەلەسەرەتای شەستەکاندا کاتێك وەك وەرگێڕێکی بەرزانی کاری دەکرد، ژەنەراڵ لەرۆژێکدا چەند چاوپێکەوتنێکی رۆژنامەنووسییەك لەدوای یەکی جیاوازی لەگەڵ چەندین رۆژنامەنووسی بیانیدا دەکرد بەسەردان هاتبوونە کوردستان. بەرزانی بە ئەمەریکاییەکی وت، ئامادەیە کوردستانی عێراق ببێتە "ولایەتی پەنجاو یەکەمین"و، لای رووسیەکیش ئامادەیی کوردستان کردنە "شانزەمین کۆماری شۆرەوی" نیشاندابوو.

پێدەچوو بەرزانی هیوای بەدوورگرتنی رۆژنامەنووسەکانی، لەجەنگی سارد مەبەستبووبێت. بەهەرحاڵ ئەوانەی کەدەیانناسی رێزیان لەگومانە غەریزەییەکەی دەگرت، بۆئەو سەغاوەت و دڵخۆشکردنەی لەکاتی باسکردنی قووڵی کێشەی کورددا هەیبوو.

"جۆن فۆستەر دالاس" کە ١٩٥٢ – ١٩٦٠ وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا بوو، گومانی لەهەموو سەرکردەیەکی دونیا دەکرد گەر بەتەواوەتی لایەنگری سەربازگەی خۆرئاوا نەبوایە. بەڵام دواتر جەمال عەبدولناسر سەلماندی کە سەرکردەکانی جیهانی سێ بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانیان ئامادەن هاوپەیمانێتی شەیتانیش بکەن، چونکە هەستیانکرد لە چوارچێوەی گەمەی گەلاندا لاوازن. بەرزانیش لەسەرکردەکانی جیهانی سێ جیانەدەکرایەوە، لەگەڵ ئەوەی لایەنگرێتییەکی توندی وڵاتە یەکگرتووەکانی دەکرد (ئەمیش لەبەرهۆی ئادیار) هەندێ جاریش پرۆژەی پشتگیریکردنی شۆرەویشی ئامادە دەکرد. بێجگە لەکوردستان لایەنگرێکی هەمیشەیی هیچ لایەکی تر نەبوو، هەرچەندە رەخنەلێگرانی پێناسەی کوردستانەکەیان وا یەکلا دەکردەوە کەلەسنووری عەشیرەتە پچکۆلەکەی خۆی تێناپەڕێت. خۆبەستنەوەی بەسامانی کوردستانەوە کەنەوتەکەی کەرکوك پێشهەموویان دەهات، یەکێك لەو دیارترین کەمە چەکانەی بەرزانی دەنواند کە لەخەباتیا بۆ نیشتمانەکەی، بەدەستییەوەبوو.

پێدەچێ بەرزانی لەروسیا، جگە لە فێربوونی زمانی رووسی، کە لەگەڵ ئەو برادەرانەی لەئاوارەیی شۆرەویدا لەگەڵیابوون، یان لەگەڵ ئەو میوانانەی روسیان دەزانی، بەتایبەتی ئەگەر بیوبستایە یاریدەدەرەکانی، یان هەموو ئەندامانی خێزانەکەی، کەروسیان نەدەزانی لەقسەکانیان نەگەن پێیدەدوا، هیچی تری نەکردبێت. واش راهاتبوو کە بەر لەمەی خواردنەوە، نان و کەرە بخوات، ئەویش فێڵێك بوو تا زۆر خواردنەوەی پێوەدیارنەبێت، لەروسیاوە فێری بیوو. بەرزانی تا ساڵی ١٩٧٢، کە مۆسکۆ رێکەوتننامەی دۆستایەتی و هاوکاری بۆ ماوەی ١٥

ساڵ لەگەڵ ڕژێمی بەعسیدا مۆرکرد، کەئەوکاتەو تا ئەو ڕۆژە بەگرنگترین دەستکەوتی کرەملین لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا دادەنرا، پێوەندی چالاکی بەڵێپرسراوانی شۆڕەوییەوە هەبوو. ئەو پەیماننامەیە مۆسکۆی خستە ناو ڕاڕەوی دەستەڵاتی گەورەترین وڵاتی بەرهەمی نەوتی ناوچەکەو بازاڕێکی گەورەی بۆ پیشەسازی چەکی شۆڕەوی‌و، گۆڕەپانێکی فراوانیش لەبەردەم شارەزایانی سەربازی‌و مەدەنیاندا کردەوە. بەڵام پێوەندی کۆنی مۆسکۆ بەکوردی عێراقەوە بەلاوەنرا. بۆ نموونە لەساڵی ١٩٦٣ دا شۆڕەوی لەنەتەوە یەکگرتووەکاندا بەتوندی بێزاری خۆی بەرامبەر بەوە دەربڕی کەناوی "لەناوبردنی بەکۆمەڵ"ی ڕێناو عێراق بەرامبەر بەکورد دەیکات، وەك گوشارێکیشن لەسەر ڕژێمە یەك لەدوای یەکەکانی بەغدا بەکاریدەهێنا. دەبێ ئەوەش بوترێت کە شۆڕەوی، لە ساڵی ١٩٧٤دا هەوڵێکی ڕاست، بەڵام بێسوودی بۆ هەڵنەگیرسانەوەی شەڕی نێوان کوردو هێزەکانی بەغدادا.

یەکلاییە دوای ڕووخانی ڕژێمی شایانەی عێراق کە بەریتانیای لەپشتبوو، شۆڕەوی هانی گەڕاندنەوەکەی تشرینی یەکەمی ١٩٥٨ی مەلا مستەفای لەدەربەدەرییەکەیەوە بۆ عێراق دا کە پشێوییەکی زۆری بۆ عێراق هێنایەکایەوە. چونکە بڕیاری ئاسانکردنی هاتنەوەکەی مەلا مستەفا بەلای عێراقەوە، وەك بڕیارەکەی ئەڵمانیای جەنگی جیهانی یەکەم، کەسەبارەت بەگەڕانەوەی لنین بۆ ڕوسیا دای‌و لەشەمەندەفەرێکی لۆککراودا ناردییەوە، چارەنووس سازبوو. لەکاتی نەبوونی بەرزانیدا، عێراقی نوێ‌و کوردستان بە "قۆناغێکی گەشەدار" دا دەڕۆیشت‌و ئارامی‌و خامۆشی‌و گەشەکردن، لەسایەی نوری سەعید دا، کە ئەوسا چی لەعوسمانییەکانەوە فێربوو جێبەجێیدەکردن. لەو ماوەیەدا ئەفسەری کورد دووکەڕەت سەرۆکایەتی ئەرکانی سوپای عێراقیان گرتە دەست‌و، سەرکردایەتی هێزی ئاسمانیشیان کرد، یەکێك لەدووتیپە پیادەکەی سوپاش زۆربەی کورد بوو. زۆر لەسەرکردە عەشایەرە کوردییەکانیش، ئەگەرچی حەزیان بە ئۆتۆنۆمی کوردستان دەکردو هەستیانکردبوو کە خوێندن‌و بەڕێوەبەرایەتییەکانی میری، دەستیان لەپەرتکردنی بنەمای دەستەڵاتە عەشایەرێتییەکانیاندا دەبێت، بەپێوەندی‌و هاوکاریکردنیان لەگەڵ حکومەتی عێراقدا بەختیاربوون. دیپلۆماتانی بیانیش بێنەوەی کەسیان بۆ پارێزگاریکردن لەگەڵدا بێت هەموو کوردستانیان تەیدەکردو سەریشیان لە چیا هەرە دوورەکان دەدا. بەڵام گەڕانەوەی بەرزانی دەستی لە بەرپاکردنی شۆڕشێکی ڕاستەقینەی سەختترین ناوچەی دونیاو، هەڵگیرساندنی پێنج شەڕی دژ بەکورد لەماوەی حەڤدە ساڵدا هەبوو، کە ژمارەیەکی بێشومار قوربانی لێکەوتەوەو زیانێکی زۆریشی بەکوردستان گەیاند.

عەبدولکەریم قاسمی دایک کورد کەهێشتا مەستی سەرکەوتنەکەی بوو دانی بە "مافی نەتەوەیی" کورددا ناو بە"هاوبەش" لەدەوڵەتی عێراقدا دایەنان. سەردەمی ئەو، خۆرە زەردە هەوت تیشک سوورەکەی کورد وەک هێمایەکی هاوبەشێتییان لەئاڵای عێراقدا بوو. شێخ ئەحمەدیش، کەلە ١٩٤٧ەوە لەبەندیخانە خزێنرابوو بەرداو پۆلێکی زۆری قایلکردنی قاسمدا هەبوو لەبانگهێشتنکردنەوەی مەلا مستەفادا. مۆسکۆ سەفەرەکەی مەلا مستەفای وا رێکخست، کەلەپێشا بچێتە بوڕاگو، ئەمجا تا بایەخی ئەو مانەوە زۆرەی یەکێتی شۆرەوی کەمکاتەوە بۆ قاهیرە. هەتا ئەمڕۆ، ئەو کوردانەی بەسەر فڕۆکەخانەی بەغدادا دلبارین، ئەو بەپیرەوە چوونە راتسکۆیانەو پڕ سۆزەیان لە بیرە کە بۆ مەلا مستەفا کرا. زۆری نەبرد پاپۆڕێکی شۆرەوی هاوڕێکانی بەرزانی لە بەندەری ئۆدیسای شۆرەوییەوە بۆ وڵاتی خۆیان هێنابووەو لەبەندەری بەسرەدا لەنگەریگرت.

هەرکەمەستی سەرکەوتن بەریدا، قاسم هەستیکرد رژێمەکەی بنکەیەکی پتەوی نییە، بۆیە هەوڵی مانەوەی دەستەڵاتەکەیی، لە رێی سوود وەرگرتنی ناکۆکی نێوان پارتە شۆڕشگێڕە سیاسییە جیاوازەکان و، بەگژ یەکتر کردنیاندا دا. ئەوسا بەراستی دەستەڵات لەشەقامەوەبوو، ١٠ ساڵێکی پڕ لەپشێوی و گێرەشێوێنی لەبەغدا دا دەستپێکردو، هەر لەسەرەتاشەوە کوردی تێوەگلا. قاسم لەدەستەڵات وەرگرتنییەوە تا ئەو ساتەی لە نووسینگەکەیدا[21]، لەکودەتا خوێناوییەکەی شوباتی ١٩٦٣ی بەعسییەکاندا کوژرا، لەبەڕاو لەزنجیرەیەک کاری سەرکوتکەرانەی توندوتیژدا، کەوتە گیانی بەرهەڵستکارانی. بەرزانی لەیەکەم پانزەمانگی دەستەڵاتەکەی قاسمدا، کاریگەرترین هاوپەیمان و دەستە بەزەبرەکەی بوو.

بەو پێیە، ساڵی ١٩٥٩ جەنگاوەرانی بەرزانی وەک هێزێکی بەزەبر بۆ سەرکوتکردنی موڵکدارە گەورەکانی کورد (ئەو سەرەک عەشیرەتانە بوون کەلەسەردەمی شانشینیدا شەڕیان لەگەڵ مەلا مستەفادا کردبوو)،ئەوانەی دژ بە چارەسەرکردنی کشت و کاڵ بوون کە عەبدولکەریم قاسم هێنابوویە ئاراوەو، بۆ سەرکوتکردنی یاخیبوونێکی شاریستان و نەتەوەییانەی عەرەبی، کەلەهەمان ساڵدا لە موسڵ بەرپابیوو کۆمۆنیستەکانیش بۆ سەرکوتکردنیتورکمانەکانی کەرکوک بەکارهێنران کوردەکان بەدەنگ قاسمەوە چوون و، کۆمۆنیست و بەعسییەکانیشیان داپڵۆست، بەعسییەکان ئەمەی بەرزانیان لەبیر نەچووەو بەهیچ جۆرێک چاویان لەو کارەی نەپۆشی.

---

[21] عەبدولکەریم قاسم لەنوسینگەکەی خۆیدا نەکوژرا، بەڵکو لەوێ لەگەڵ چەند ئەفسەرێکی ناسراوی تری ئەوکاتەدا خۆیان بەدەستەوەداو لەئێزگەی رادیۆو تەلەفزیۆنی "ساڵحییە"دا دوای رتو وێژێکی سەرپێییانەی دادگا لەگەڵ برادەرەکانیا گوللە بارانکرا (وەرگێڕ)

لەکانونی دووەمی ١٩٦٠دا قاسم بەربەندانی پارتی دیموکراتی کوردستان و ڕەوانەسینی، کەدەسال بوو ڕژێمی شایانەی عێراق ڕێی لێگرتبوو، پاداشتی بەرزانی دایەوە، ئەمەش ئەوپەڕی هاوپەیمانێتی لەنێوانیاندا هێنایە ئاراوە. لەوماوەیەدا بەرزانی حسابە کۆنەکانی خۆی لەگەڵ عەشایەرە بەریەیکەرەکانیا پاککردەوە، سەرۆکی عەشیرەتی زێباری کوشت. بەڵام قاسم دەرکی بەوە کردبوو کەبەرزانی سەرۆکایەتی ڕێکخراوێکی سیاسییانەی ڕەوای وادەکات کەتەنیا ڕێکخراوبێت هەڕەشە لەدەسەڵاتەکەی بکات. بۆیە ڕێگای گەڕانەوەی بۆ سەرۆک عەشیرەتە کوردییەکان خۆشکرد کە لەڕابردوودا بەرزانی بەگژدا کردبوون و کردبوونی بە دیوی ئێراندا.

بەڵام جیاکردنەوەی لایەنگرییە سیاسییە تێکئاڵاوەکەی ڕۆشنبیرە نەتەوەییەکانی کورد بەلای بەرزانییەوە بەرەنگاربوونەوەیەکی زەحمەتتربوو لەوەی کەدەسەڵاتی خۆی بۆ ئارچە عەشایەرییەکانی باکووری عێراق بگێڕێتەوە. لەکاتی دەربەدەرییەکەیەوە ژمارەی خوێندەوارانی کورد چەند قات زیادیکردبوو، کەهاتەوە کوردستانی عێراق زۆر لەکاتی جێهێشتنەکەی جیاوازتربوو. لەو ماوەیەدا کەبەرزانی دوورخرابۆوە گەلێک لە کوردە شارنشینەکان چووبوونە ڕیزی پارتی کۆمۆنیستی عێراقەوە، کەلقێکی تایبەتی لە کوردستاندا پێکهێنابوو لەپارتی دیموکراتی کوردستانیش جەماوەری زیاتربوو، هەرچەندە پارتی لەبەیاننامەی دامەزراندنیدا، خۆی وەك پارتێك ناساندبوو کە "سوود لە مارکسیزم – لینینزم دەبینێت" ئەوە تاماوەیەکی زۆر تۆوی ناکۆکی لەناو پارتەکەدا بڵاوکردەوە.

کاتێك بەرزانی بەرەو دەربەدەری شۆرەوی بۆوە پوختەیەکی دڵسۆزی لێدەرچێت لەبیر هەموو کورد چۆوە، ئیبراهیم ئەحمەدی ئەمینداری گشتی پارتی دیموکرات، لەپەنجاکاندا پارتە نهێنییەکەی بەزیندوێتی هێشتەوەو نهێنیانە چالاکییەکانی بەڕێوەدەبرد. کە مەلا مستەفا گەڕایەوە، ئیبراهیم ئەحمەدی بەپیشە پارێزەر، ملی بۆ ئارەزووەکانی بەرزانی نەداو دەستی لەسەرکردایەتی پوختە شارییەکە هەڵنەگرت، بەرزانیش لایبردو هەمزە عەبدوڵای کۆنە کۆمۆنیستی خستەجێ کەپێشتر بەرلەگەڕانەوەی بەرزانی، ئیبراهیم ئەحمەد لەپارتی دەریکردبوو. بەڵام زۆری پێنەچوو بەرزانی ڕایگۆڕی و، چەکدارەکانی خۆی نارد تا بارەگای مەڵبەندی سەرکردایەتی پارتی بگرن و، هەمزە عەبدوڵاو لایەنگرەکانی دەربکەن.

ئەوان لەسەر کێشە رامیاری و کەسێتییەکان ناکۆکبوون، لەسەروو هەموویانەوە لە کاتی ڕووخانی "کۆماری مەهاباد"دا، هەمزە حەزیدەکرد لەگەڵ عەشیرەتە پارێزگارەکاندا ڕێکبکەون، کەپێی وابوو هەر ئەوان توانای دابینکردنی هێزە پێویستییەکانی بزووتنەوەی نەتەوەییان هەبێت، هەرچی ئیبراهیم ئەحمەدیشە وای پێباشبووە لەکاتی بڕیارداندا کوردە شارنشینەکان

رۆڵێکی زیاتریان هەبێت، بەرزانیش گومانی لەوهاوپەیمانێتییەك دەکرد کەلەنێوان هەمزە عەبدوڵاو کۆمۆنیستەکاندا هەبێت. کاتێك بەیاننامەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئەوسا دەخوێنینەوە، کە قسە بە "ئیمپریالییەت"و "دەرەبەگ" و "بورژوازی" دەڵێن، پیاو ئەو کۆمەڵە ئایدۆلۆژیانەی پەنجاکانی بەبیردێتەوەو، دەرك بەوەشدەکات کە چۆن یەکتریان بە شتێك تاوانبارکردووە کەزۆربەی کورد، بەتایبەتی نەخوێندەوارەکانی ناو عەشیرەتە شاخاوییەکان لە ماناکەی نەگەیشتوون.

پێوەندی نێوان ئیبراهیم ئەحمەدو بەرزانی بەرادەیەکی وا کرژبووە کەلقەکانی پارتی لەوشارانەی سەربە ئیبراهیم ئەحمەدبوون، کاتێك شەڕی توند لەنێوان هێزەکانی حکومەتو چەکدارانی بەرزانیدا لەئەیلولی ١٩٦١داو لەباکووری عێراق هەڵگیرسا، دەیانویست بێلایەن بووەستنەوە. شەڕی نێوان هێزەکانی میریو کورد تا ساڵی ١٩٧٥ بەردەوام دەبێت، ئەگەرچی ناوەناوە لەگەڵ یەکتریدا دەگەیشتنە ئەوەی شەڕ راگرن. بەلام کە قاسم لەکانونی یەکەمی ١٩٦١دا بریاری قەدەغەکردنی پارتی دیموکراتی کوردستانی دا، پارتی ناچاربوو بەشداری شەرەکە بێت. ئیبراهیم ئەحمەدو زاوا بەهرەدارو خوازیارەکەی، جەلال تالەبانی، هێزێکی تایبەتیان لەناو پارتی دیموکراتدا، لەقەڵەمڕەوی سنووری نێران باشووری خۆرهەلاتی سلێمانیدا پێکهێنا، ئەوەش سروشتی لێکدابرانە دوورو درێژەکەی کوردی نیشاندەدا. راستییەکەی بەرزانیو ئیبراهیم ئەحمەد هەریەکە خۆی بەسەرکردەی بزووتنەوەی کورد دادەنا. بۆیە ئەو لێکترداپرانەی ئەم بزووتنەوەیە، لەنێوان بەرزانی کەبەسەر ناوچەی باکووردا زاڵبوو، ئیبراهیم ئەحمەدیش کەلەباشووری خۆرهەلاتی کوردستانی عێراقدا دەستی دەڕۆیشت بەهێچگارەکی بنبڕ نەکراو تا ناوەراستی ئەوەتەکان کەمەسعود بەرزانی کوڕی مەلامستەفا لەناوچەکانی باکووردا دەستەلاتی بەدەستەوە گرتو، جەلال تالەبانیش دەستەلاتی بەسەر ناوچەی هێزی خەزووریو مەلبەندە بنەرەتییەکەیدا گرت، ئاوە ئاوە سەری هەڵدەدایەوە.

لەگەڵ تێهەڵکێشبوونی هەموو ئەم گرفتانەدا گرفتی سەرەکی، کە بەرەو ڕووی کوردو دوژمنەکانیشیان ببۆوە وەك خۆی مایەوە. لەوەتەی لقی عێراقی پارتی دیموکراتی کوردستان، لەئابی ١٩٤٦ەوە دامەزراوە، ئامانجە رامیارییە راگەیەنراوەکان، کە بەرزانی بۆ هێنانە دیان تێدەکۆشا، وەك خۆیان ماونەتەوە. بەرزانی وا ڕاهاتبوو کە بڵێت کورد سەربەخۆیی ناوێت بەڵکو "دیموکراتی بۆ عێراقو ئۆتۆنۆمیشی بۆ کوردستان" دەوێت. لەو رۆژگارانەدا ئەم ئامانجانە تەنیا لەسەر کاغەز بەجێبوون. بەلام راستییەکەی کارەکە بەو ئاسانییە نەبوو، بۆیە دوژمنە

یەکبەدوای یەکەکانی بەرزانی، شاویستبووبن یان نەتەوەیی عەرەب یان بەعس یان کۆمۆنیستەکان، بڕوایان پێنەدەکرد.

بەلای بەربەرەکانێکەرە سیاسییەکانیانەوە کورد دەیویست بەشتێك لەعێراق و گەر بتوانێت چەند بەشێك لەتورکیاو ئێرانیش، کەبەخاکی خۆی دەزانی، بپچڕێت بەدیهێنانی ئامانجەکانی کوردیش لەوارە فشەڵەکەی عێراقی هەڵدەوەشاندەوە. دوژمنانی کورد لەم شیکردنەوەیەیاندا هەڵەنەبوون، چونکە دوای شەڕ هەڵگیرسانەکەی ساڵی ١٩٦١و کوردێکی زۆر بەڕاستی وایاندەزانی شەڕەکەیان لەپێناو بارێکی تایبەتی کوردستان و ڕەنگە سەربەخۆیشا بێت، جا بۆ نەبێت؟ یەکێك لە دیارترین یاریدەدەرانی بەرزانی، جەخت لەسەر ئەوەدەکات و دەڵێت: " تەنانەت لەو ڕۆژانەشدا دەمانزانی بەرزانی هەوڵ بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی دەدات".

لەخۆرهەلاتی ناوەڕاستدا بەگشتی و، لەوناوچەیەی ئیفریقییەکان ناوی "میزۆپۆتامیا"یان لێنا، دەستەلات وەك یاری بە "سفر" کردن وابووە، بەشناکرێت، یان بەخۆتە یان بەخۆت نییە. خۆ ئەگە دەستەلاتت بەدەستەوە نەبێت ئەوا بەدەست یەکێکی ترەوەیە کەلایەنی کەم ئەویش هەمان بۆچوونی تۆی بۆ دەستەلات هەیە. بیرۆکەی دابەشنەکردنی دەستەلات، جێبەجێکردنەکەی لەهیچ شوێنێکی دونیادا، بەقەدەر عێراقی نوێ دروست نییە، کە گەمەی قەوارەیەکی دروستکراوی بەریتانیاییەو لە ناوچەیەکدا دروستکراوە هەر لەکۆنەوە شوێنی دەستەلاتە زۆردارو خوێنڕێژەکانە، هەندێ جار دەستەلاتی خۆسەپێنەری واشی تێکەوتووە کە خوێنڕێژێتییەکەی کەمتر بێت. سەبارەت بەمەسەلەی دابەشکردنی دەستەلات لە عێراقدا، ئەوەندە بەسە کەسەیرێکی بەپەلەی پەیکەرە کەتەو مۆنە ترسناکەکانی شا ئاشوورییەکان بکەین کەلە مۆزەخانەکانی لۆڤەرو، بەریتانیاو، مترۆپۆلیتانی شاری نیویۆرك دانراون، تا هەر گومانێکمان سەبارەت بە دابەشکردنی دەستەلات لەعێراقدا هەبێت بیڕەوێنێتەوە.

بەهەرحاڵ هیچ کام لەزلهێزەکانی دونیا، ئامادە نەبوو پشتگیری دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆ کورد بکات، یان تەنانەت ئاماژەیەکی واشبدات کە ئامادەیی پشتگیریکردنی ئۆتۆنۆمی کورد بگەیەنێت. خۆ دەوڵەتەکانی ناوچەش، گومانێکی زۆریان لەسیاسەتی عێراق هەبوو،چونکە بەغدا لەهاوسێکانی زیاتر تێپەڕاندبوو، ڕێی بە کورد دا بەرگی کوردی خۆیان لەبەربکەن و لەقوتابخانەکانیاندا بەزمانی خۆیان بخوێنن و لەبەڕێوەبەرایەتیەکانیشیاندا بەکاربهێنن و ڕۆژنامەو کتێبیشی پێدەربکەن.

لەم گومانەی هەموو لایەکیان بەسەرەکیان دادەناو لەسیاسەتی هەریەکێکیاندا بەکردەوە کاری پێدەکراو لە "پەیماننامەی سەعدئاباد"ی ساڵی ١٩٣٧یشدا، ئێران و تورکیاو عێراق،

بەڵێنیان دابوو لەکاتی پێویست دا پێکەوە شاڵاویان بۆ بەرن، لەبەڵێننامەی "پەیمانی بەغدا"شدا، کەلەساڵی ١٩٥٥دا ئەمەریکاو بەریتانیا ئاڕەوایانە بەبیانووی دژایەتی کۆمۆنیستەوە بەسەر وولاتانی ناوچەدا سەپانیان. گەر سەرنجێکی ڕووداوەکانی دواوە بدەین، ئەوا بۆمان دەسەلمێت کە هەوڵە ڕاگەیەنراوەکانی بەرزانی بۆ دەرچوون لەیاری سفر، واتە مەحاڵی دەرچوون لەدابەشنەکردنی دەستەڵات لەعێراقدا، هەرلە سەرەتاوە سەرنەکەوتنی بۆ دانرابوو. خۆ ئەگەر کورد بەڕاستی جەخت لەوەبکات کە ڕژێمی بەغدا بەتەنیا بەو ئاڕوخێنرێت، ئەوا دەستەڵاتدارانی عێراقیش بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردیان پێ لەناوناببرێت. بەهەرحاڵ، ڕژێمە یەک لەدوای یەکەکانی بەغدا، کەبەرزانی تەنیا هەوڵی لاوازکردنی دەدان، بەهۆی دەستکەوتی نەوتی کەرکوکەوە کە کورد بە بەشێك لەسامانی زەوتکراوی خۆیی دادەنێت، تا دەهات درندەتر دەبوون و چاکتریش خۆیان ڕێکدەخست. بەرزانی تەنانەت لەوپەڕی باشیا کە کوردی هەموو دونیا گوێیان لەئێزگەیەکی نهێنی کوردی سەر شەپۆلێکی کورت دەگرت، تا لەدەستکەوتەکان ئاگادارببن، دیارە گەر پشتگیری دەرەوەی نەبووایە، کەبەغدای تەواو پەستکردبوو، زۆربەی ئەو سەرکەوتنانەی بۆ بەدەست نەدەهێنرا.

لەشێوازی شەڕی کورداو ئەو ئامانجانەی لێیانکەوتنەوە، ڕەنگە سەرزەنشتکردنی بەرزانی و تاوانبارکردنی، بە بەفیڕۆدانی دەستکەوتی جەنگ لەسەر مێزی دانوستان، کە بەدەردێکی بنەرەتی و کۆنی کورد دادەنرێت، کارێکی ئاسانبێت. هەندێ جار لەبری ووردبوونەوە لە هۆی ڕەتکردنەوەی ئۆتۆنۆمییەکی دیاریکراو کە حکومەت بە کوردستانی دەداو، دەکرا بەخاڵی چوون بەرەو دەستکەوتی زیاتر دابنرایە، شانازیدەکرد کەڕۆڵی لەخستنی حکومەتە یەك لەدا یەکەکانی عێراقدا هەبووە. بەڵام کاتێك بەرزانی لەدەربەدەرییەکەی گەڕایەوە، کەسێك پێشبینی ئەوەی نەدەکرد کە دوژمنەکانیان ئەو کارە دڕندانانەیان لەگەڵدا بکەن. بەرلەوەی ساڵی ١٩٦١ ئاوابێت، لەسەردەمی عەبدولکەریم قاسمدا فڕۆکەی عێراق، ١٢٧٠ گوندی کوردی، لە شێوازی کاری تۆڵەسەندنەوەو ملپێدان، وێرانکرد، کە وولاتانی دونیا تا ڕادەیەك بەلایانەوە پەسندبوو.

بێئەوەی هەوڵی بیانوو دۆزینەوە بۆ هەڵەکانی بەرزانی بدەین، پێویستە ئاماژەی ئەوە بکرێت کە لە کەشێکی وادا کاریدەکرد وتەی "زلهێزەکان" دەستەڵاتی سیاسی کۆتدەکرد، پیاوێکی شەرەفمەندو ڕێز بۆ قسەی خۆ دانەربوو، بڕواشی بەبەڵێنی خەڵکانی دی هەبوو. بەپێی ئەو کەشەی تیاشیا ژیابوو، بەرزانی پێی وابوو دەرفەتێکی باشی بۆ پارێزگاریکردنی ئەو قسە بنەڕەتییەی کورد بۆ هەڵکەوتووە، کە جەخت لەسەر جیاوازی کورد لەگەڵ هەموو گەلانی

ناوچەکەدا دەکات، بەوەی ئەوان نە عەرەبو، نەتورکو، نەئێرانین [22] و، شایانی چارەنووسێکی باشتریشن لەوەی کەمەیانە. بەڵام هەڵسوکەوتەکانی دونیا، بەپێی یاسای "گریشام"، گۆڕراوەو، ڕەوشتیش لەسەرحسابی کوردو خەڵکانی دی تا بێت ڕوو لەکەمبوونەوەیە.

یەکەم جەنگی کورد، تا شوباتی ۱۹٦۳ کە بەعسییەکان عەبدولکەریمیان کوشت نەوەستا. هەرئەوکاتە بەعسییەکان ئارەزووی ستەمکارانەی خۆیان ئاشکرا کردو، بەهاندانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کەبەپێی چەند سەرچاوەیەك، ئەوکاتە هەوڵی لاوازکردنی بەهێزترین پارتی کۆمۆنیستی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستی دەدا، حەوت هەزار کۆمۆنیستیان کوشت. قۆناغێکی نوێ دەستپێیکرد، کەچەندین دانوستانی پچڕپچڕی نێوان بەغداو کوردی بەخۆوە بینی. وەك هەموو ئەو دانوستانانەی ساڵانی داینەدە، ئەمیش بەهۆی کەرکوکەوە، کە کورد بە بەشێکی کوردستانی دادەنێت نەگەیشتنە ئەنجام. حکومەتە یەك لەدوا یەکەکان داواکاری کوردیان سەبارەت بە کەرکوك و نەوتەکەشی ڕەتدەکردەوەو، ئاماژەیان بۆ ئەوە دەکرد کە شارەکە لە سەرەتای ئەم سەدەیەداو بەرلەوەی نەوتی لێدەربهێنرێت، لە بنەڕەتدا شارێکی تورکمانی بووەو، لەگەڵ کۆمەڵگا گەورەکانی کوردو عەرەبیشی تیادا ژیاوە. لە حوزەیراندا بەعسییەکان شەڕیان لەکوردستان دەستپێکردەوە، وەزیری بەرگری سالح مەهدی عەماش خۆی وا هەڵدەکێشا، کە ئەمجارەیان سوپا ئامادەیەو پەلامارەکەش لە "گەشتێکی سەربازی یان سەیرانێکی ناو چیا" بەولاوە هیچی تر نییە. بەڵام سوپای عێراق دوبارە زیانێکی زۆری لێکەوتەوەو لە ۱۸ی تشرینی دووەمی ئەو ساڵەشدا دەستەڵات لەبەعسییەکان سەندرایەوەو، فەریق عەبدولسەلام عارف دەستەڵاتی گرتە دەست. دانوستان دەستی پێکردەوەو، لە ۱۰ی شوباتی ۱۹٦٤دا شەڕ وەستایەوە.

دووەم جەنگی کورد کۆتایی پێهات، بەڵام لێکدابڕانێکی هەمیشەیی لەنێوان ڕیزەکانی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورددا هێنایە ئاراوە. کۆمەڵی ئەحمەدو تاڵەبانی، بەمرزانیان بەوە تاوانبارکرد کە ئاگربەستنەکەی لەگەڵ بەغدادا ناپاکییە لەگەڵ کوردا کردویەتی، بەتایبەتی بێپرسی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستانیش بڕیارەکەی داوە. بەرزانی زۆر بەتوندی وەڵامی دانەوە، ناچاریکردن کە لەمانگی تەموزی ئەو ساڵەدا، لەگەڵ چوار هەزار کەس لەلایەنگرەکانیان بۆ ئێران هەڵبێن. بەڵام حکومەتی عێراق ڕێی گەڕاندنەوەی دان و بۆ دژایەتیکردنی بەرزانی، کەملمانێکەیان پرۆژەی لەبەر بڕیبوو، کۆیکردنەوە. ناوهێنانی تاڵەبانی

---

[22] لێرەدا ئێرانی مەبەست (فارس)ە، چونکە گەر وانەبوایە دەبوا بۆ دوانەکەی تریش عێراقی و تورکیایی نەك عەرەب و تورك دابنرایە (وەرگێڕ)

بۆ هەڵچوون و تووڕەبوونی مەلا مستەفا بەسبوو، کەلەو لاوە کێبەرکێکەرەیدا کەسێکی بەهرەمەند لەسەرکردەیی و سەربازیانەی وای دەبینی خۆ لەکارامەیی ئەم بدات، بەتایبەتی کەهەردووک سەرکردایەتیکردنیان مەبەستبوو.

لەئازاری ١٩٦٥دا شەڕ لەکوردستاندا دەستپێکردەوە، عەبدولسەلام عارف لەکارەساتێکی تەمومژاویدا، کەتووشی کۆپتەرە سەربازییەکەی هات کوژرا، لیوا عەبدولڕەحمان عارفی برای دەسەڵاتی گرتەدەست. لە ئایاری ١٩٦٦دا عێراقییەکان هێرشێکی گەورەیان کرد، تا بەرەی کورد کەرتبکەن و بەرزانی لەو یارمەتییە گرنگەی ئێران بێبەشبکەن. لەگەڵ ئەوەی سوپای عێراق یارمەتی لە "جاش"ەکانی تاڵەبانی وەردەگرت، بەڵام پیس دۆڕاندی و بەرزانی لەچیای "هەندرێن" کەبەسەر ڕەواندوزدا دەیڕوانی گەورەترین سەرکەوتن بەدەستهێنا، بۆیە مانگی دواتر عەبدولڕەحمان بەزازی سەرەڵە وەزیرانی عێراق بەئاشکرا دانی بە "دووهاوبەشی نەتەوەیی عێراق"دا نا. بەڵام سوپای عێراق پێشێلی ئەو وتوویژەی کرد کەلەگەڵ بەرزانیدا دەکرا، ئەویش دوای دەستپێکردنی وتووێژێکی لەوجۆرە لەگەڵ تاڵەبانیدا. بۆیە بەرزانی هەڵوێستی توندتری نواندو، وتی: "جەلال تاڵەبانی ناپاکەو من ناچمە هیچ جۆرە وتو وێژێکەوە کە ئەوی تیادابێت". بەرزانی تاڵەبانی بەوەش تاوانبارکرد کە "بەکرێگیراوی هەموو لایەکە". تا ئەمڕۆشی لەسەربێت لایەنگرانی بەرزانی ناوی "شەست و شەشەکان"یان لە لایەنگرانی تاڵەبانی ناوە، لەبری ئاشتی هەر بڕیار لەسەر ئاگربەستێکی دی درا.

لەتەموزی ١٩٦٨دا بۆ جارێکی دی پارتی بەعس دەسەڵاتی گرتەوە دەست، ئەومندەی نەبرد سەدام حسێن وەك بڕیاردەری راستەقینەی ڕژێمە نوێیەکە بەدیارکەوت، ئەگەرچی ئەحمەد حەسەن بەکریش سەرەك کۆماربوو. سەرەتا بەعسییەکان، لەگەڵ کورددا هەوڵی کات وەدەستهێنانیان بوو، چونکە بەڕادەیەك خەریکی پاککردنەوەی سوپابوون لەهێزە نەیارەکانیان کەشەڕیان لەدژی بەرزانی پێنەدەکرا، بۆیە لەوماوەیەدا "کۆمەڵەکەی ٦٦" لەبری پارتی بەعس شەڕی بەرزانیان دەکرد. لەسەرەتای ئەیلولی ١٩٦٩دا عێراقییەکان شەڕی دژی کوردیان دەستپێکردەوە. سوپا زیانێکی وای لێکەوت کە لەکانونی دووەمی ئایندەدا سەدام حسێن ناچاریکات بۆ دانوستانکردن لەگەڵ بەرزانیدا بەرەو کوردستان ببێتەوە. لە ١١ی ئازاری ١٩٧٠دا ئەحمەد حەسەن بەکری سەرۆکی عێراق لەئێستگەی بەغداوە، بەشە ئاشکراکراوەکەی ئەو ڕێکەوتننامەیەی کە لەگەڵ کورددا لەسەری ڕێککەوتبوون و، دانی بە "بوونی نەتەوەی کورد"دا دەنا، پێشمەرگەی دەکردە پاسەوانی سنووری، دانی بەماڤ زانستیانەی کوردو گرتنەدەستی فەرمانبەرایەتی کورددا دەنا، جێگرێکی سەرەك وەزیران و چەند وەزیرێکی لەحکومەتی

نێوەنـدا لێـدانان و، ناوچـەیەکی ئۆتۆنـۆمیش کەپایتەختەکـەی هـەولێربێت لەکوردسـتاندا دادەمەزراند، خوێندەوە. ئەمڕۆشی لەسەربێت، کورد چوار ساڵی دوای ئەو رێکەوتننامەیە، بە سەردەمی زێڕین دادەنێت، کە تیایدا ئاشتی و گەشەکردن و داهێنانی رۆشنبیری پەرەی سەند.

بەڵام جارێکی تریش دەرکەوت کورد زیرەکتر نەبوون. بەرزانی بڕیاری عێراقییەکانی لەبارەی کێشـە سـەرەکییەکانی، کـەرکوک و، پانتـایی ناوچـەی ئۆتۆنـۆمی و، مـەرج و کـاتی سـەرژمێری پێویسـت بـۆ دانیشـتوانەکەی بـەدی نـەهێنا، تـا داواکارییـەکانی کـورد لەسـایەی رێکـەوتنێکی یەکجارەکیدا بچەسپێنێت. بگرە بەرزانی بە پاشکۆیەکی نهێنی گشتی قایلبوو،کەماوەی ساڵێکدا سەرژمێری کورد، بۆ دیاریکردنی ناوچەی ئۆتۆنۆمی بکرێت و، ئەم رێککەوتنەش لەچوار ساڵدا تاقیبکرێتـەوەو، لـەکۆتایی ئـەو چوار ساڵەدا بەتـەواوەتی ناوچـەی ئۆتۆنـۆمی دابمـەزرێنرێت. کـوردە عێراقییـەکان جـەخت لەوەدەکـەن، کـە حکومـەتی عێـراق چـی فرتـوفێڵ هـەبوو، بۆسەرژمێرنەکردنی کوردستان کردی، لەهەمانکاتیشـدا بەپەلە کەوتە نیشتەجێکردنی عەرەب لەناوچە کوردییەکاندا بەگشتی و، دەوروبەری کەرکوک و ناوچە نەوتییەکانیتر بەتایبەتی، هەرچی کرێکـاری کـوردی کانـە نەوتـەکانی کـەرکوک هـەبوو دەریکـردن. لێکۆڵـەرەوە کوردەکـان ئـەوە یەکلادەکەنەوە کەمیری عێراق، لەماوەی گواستنەوەکەدا، تـەنیا لـە سـەدی حەوتـەوە تا سـەدی دوانزەی بوودجەی عێراقی بۆ ناو ئۆتۆنۆمییەکە تەرخانکردو، هەرچوار پرۆژەی پیشەسازیشی تیادانکردەوە، ئەو زەمالانەی بۆ قوتابییانی کوردی زانکۆو ئەو کورسیانەش کە لەئەکادیمییە سەربازییە عێراقییەکاندا بۆیان دانەنرا هێجگار کەمبوون.

لەکاتێکـدا دانوسـتان لەگـەڵ کورددا پچڕپچـڕبوو، بەغـدا رایگەیانـد کـە یەکلایانـە، ئـەرکی ئۆتۆنۆمییەکـەی لەسـەرێتی لـەیادی چـوارەمین سـاڵرۆژی مـۆرکردنی بەیاننامـەی ١١ی ئـازاردا جێبەجێـدەکات. چـونکە بڕوایـان بەیـەکتر نـەمابوو (سـووکە شـەڕی چـەکدارانەش هێنـدەی دی نێوانیـانی تێکـدابوو)، ئـەم جـۆرە تەکتیکانـە ئـارامێنەبڕاوی و خۆئامـادەکردنی بەعسـی بـۆ شەڕکردنەوە دەگەیاند، لەویش ئەگەر کورد بەوەی پێیدەدرێت قایل نەبێت. بەڵام دواتر هەندێک لە کوردەکان گومانیان لەوە پەیدا کرد کەدەبێت بەرزانی رێککەوتنەکەی بەڕاست بووبێت (مەلا مستەفا خۆشی دەستی لەوبۆچوونەدا هەبوو، چونکە دەیوت، ئەم رێککەوتنە "لەفێڵ بەولاوە هیچی دی نەبوو. تەنانەت پێش ئەوەی مۆریشیبکەم ئەوەم دەزانی).

عوبەیدوڵای کوڕە گەورەی مەلا مستەفا، لەوانەبوو کە گومانی لەمەڵوێستی باوکی دەکرد، هەڵات بۆ بەغداو لەوێ رایگەیاند، کە بەرزانی "گەر کەرکوک و هەموو نەوتەکەیشی بدرێتێ، ئۆتۆنۆمی جێبەجێ ناکات، چونکە ئەگەر یاسای ئۆتۆنۆمی جێبەجێبکات هیچی لەبن دەستدا

ئامێنێت و، ئەویش دەیەوێت هەرخۆی خاوەن دەسەڵات بێت". بەهەرحاڵ سەدام حسێن سێ رۆژ بەر لەیادی مۆرکردنی رێککەوتنەکە، بەیەکسانی دابەشکردنی نەوتی کەرکوکی بۆ بەرزانی پێشنیارکرد، بەڵام بەرزانی ئەم پێشنیارەشی ڕەتکردەوە. یەکەمجار رەنگە رەتکردنەوەکەی بەرزانی بیانووی هەبێت و ئاشکراش بێت. چونکە دوای ئەو هەموو توندوتیژییەی هەردوولایان بەرامبەر بەیەکتری کردیان (کەچەند هەوڵێکی بەعسییەکانی بۆ کوشتنی بەرزانی تیادابوو) هیچ لایەکیان بڕوای بەلاکەی تریان نەمابوو، وەکوتر ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ دواوەو سەرنجێکی ڕێککەوتنەکەی ١١ی ئازار بدرێت، بریتییە لەپشوویەکی نێوان دووشەڕ.

عەبدولڕەحمان قاسملۆ، کەسەرکردەیەکی کوردی ئێران بوو، بەدرێژایی ساڵانێکی دوورودرێژ هۆی بەجێی بۆ گومان لەسەرکردایەتیکردنەکەی بەرزانی هەبوو، بەتا بەتی لەو رەتکردنەوەیەی سەبارەت بەکەرکوکی زۆر دودڵبوو ١٠ ساڵ دوای ئەو ئاکۆکییە، قاسملۆ لەڕەتکردنەوەی ئەو چارەسەرەی بەرزانی کە دەستکەوتێکی زۆری بۆ بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لەدونیادا و لەزۆر ئاستدا تیادابوو، زۆر بەداخبوو، چونکە بەهۆی هەڵوێستی بەرزانییەوە لەدەستچوو. بەبڕوای سەرکردە کوردەکەی ئێران، بڕیارەکەی مەلا مستەفا هەڵەیەکی بۆچوونەکانی بوو، پێشی لەسەرئەوە دادەگرت کە ڕاکەی لەئیمانەوە هاتووە نەک لەپشتبەستنییەوە بە یاریدەدانەکەی بەغدا، کە لەملمانێ سیاسییە تێکچڕاوەکانی ناوچەکەدا دەیداتێ. قاسملۆ دەشیوت "کوردی عێراق تا ئێستا هیچی بەدەست نەهێناوە، چونکە لەسیاسەتدا لەبری ئەقڵ پشتی بەسۆز بەستووە. یان دەبێ هەموو شتێکیان دەستبکەوێت یان هیچ، شتەکان بەلای ئەوانەوە یان دەبێت رەش بێت یان سپی، هەر بۆیە هیچیان بەدەست نەهێنا. چونکە لەسیاسەتدا ناکرێت بەپێی رەش و سپی کاربکەیت. ئەوەی ئەمڕۆ بۆت بەدەست نایەت، رەنگە سبەینێ بەدەستهێنانی ئاسان بێت. وادەزانم ئەبوا بەرزانی بەو چارەسەرەی کەرکوک قایلبوایە، ناوچە ئۆتۆنۆمییەکەی بچەسپانایەو، دواتر شەڕی بۆ گشت دەستکەوتەکانی تری بکردایە، لەگەڵ ئەندا بیربکەرەوە، لەساڵی ١٩٧٩دا کە شۆڕشی ئێران هەڵگیرسا، ئەگەر ناوچەی ئۆتۆنۆمی لەئارادابوایەو چەکدارەکانی بەرزانی لەبارودۆخێکی باشتردا بوونایە چی دەبوو. لەوکاتەدا تەنیا بیر لەگرنگی ئەو دەرفەتە بکەرەوە کەبۆ کوردی ئێران دەڕەخسا".

بەهەرحاڵ، لە ١١ی ئازاری ١٩٧٤دا بەغدا لەناوچەیەکدا ئۆتۆنۆمی بۆ کورد ڕاگەیاند کەنەختێک لەنیوەی ئەو ٢٩ هەزار میلە چوارگۆشەیەی کورد داوایدەکرد زیاتربوو، کەرکوکیشی نەگرتبۆوە. بۆیە دەستپێکردنەوەی پێنجەم شەڕی کورد لەگەڵ دەرچوونی بڕیارەکەدا کوتوپڕ نەبوو. بەرزانی و لایەنگرەکانی لەبەتوانایی خۆیان دڵنیابوون، ٤٠٠٠٠ جەنگاوەریان لەبەرەکانی

شەڕدابوون و ٦٠٠٠٠ میلیشیاش پشتگیریاندەکردن. لەشوێنە دوورەکانی کوردستانەوە وەک بەغداو جێگەیدی کوردی بەسەردا دابارێ. ٦٠ پزیشک و ٤٥٠٠ مامۆستای قۆناغە جیاجیاکانی خوێندن بەزانکۆشەوە، ٥٠٠٠ پۆلیس و ١٦٠ ئەندازیارو ١٠٠ ئەفسەریش ڕیزی سوپای عێراقیان بەجێهێشت و هەرهەموویان چوونە پاڵ هێزەکانییەوە.

بەڵام دواتر دەرکەوت شەڕکردنەکە بۆ کورد کاولکاربوو لە وورەشیانی هێنایە خوارەوەو ناکۆکی ڕوخێنەرو درێژخایەنیشی لەڕیزەکانیاندا پەرپاکرد. هەر لەسەرەتاوە "پێشمەرگە" لەبەردەم هێزە عێراقییەکاندا پاشە کشەیکرد، ئەوانیش لە شەش مانگدا دەستیان بەسەر ناوچەیەکی بەرینی وادا گرت، کە پانتاییەکەی لەپانتایی هەموو ئەو ناوچانە بەرینتربوو کەلەساڵی ١٩٦١ەوە بەدەست بەغداوەبوون. ماوەیەکی زۆر بەرلەوەی بەفر بتوێتەوە، نەتەوەییە کوردەکان هەموو ئەو شوێنانەیان لێسەندرایەوە کە بەدەستیانەوەبوو، تەنیا قەڵەمڕەوێکی باریکی پاڵ باکووری خۆرئاوای ئێران نەبێت کە بەسوودوەرگرتن لەپارێزگاریکردنەکەی تۆپە دوورهاوێژو مووشەکە دژ بەفڕۆکەکانی ئێران مابوونەوە، هیچی تریان بەدەستەوە نەمایەوە. ڕاستییەکەی کوردی عێراق بەڕادەیەک پشتیان بە شا ئەستووربوو، کە خۆراک و تەنانەت جگەرەی ئەمریکاییشی بۆ دابین دەکردن، تا وایان لێهات دەستبەرداری کشتوکاڵکردنی خاکەکەی خۆشیان بن. لە٦ی ئازاری ١٩٧٥دا، شا لەپڕێکا هەرچی یارمەتی هەبوو لێشیبڕین، بەرزانیش بەوە زەبرێکی وا جەرگبڕی خوارد کەتامرد پێوەی دەتلایەوە. بەڕادەیەکیش پەشۆکا فرمانی بەپیاوەکانی دا دەست لەشەڕ هەڵبگرن و هیچ بەرەنگارییەک نەکەن، چونکە بەڕای ئەو شەڕکردنیان لەگەڵ ئێران و عێراقدا لەیەک کاتدا کۆمەڵکوژییەکی کوردی لێدەکەوتەوە. بەڵام ئەم بڕیارەی قەوارەی بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردی لەڕەگو ڕیشەوە هەژاند.

دواتر پارتی دیموکراتی کوردستان دانی بە کوژرانی ٢٠٠٠ پێشمەرگەدا نا کەلەشەڕدا کوژرابوون، بەڵام پێدەچێت زۆر لەوەزیاتر کوژراو هەبووبێت، تەنانەت گەر قوربانیانی خەڵکە مەدەنییەکانیش حساب نەکرێن. نەتەوەییەکی کورد کە ئەوکاتە بیست ساڵان بووە، گێڕایەوە کەچۆن بەکوڵ گریاوەو لەبڕیارەکەی مەلا مستەفاش پەستبووە، دەیوت: "بەرزانی بەلای ئێمەوە وەک خوا وابوو، ئێمەی خستەسەر نەخشەی ناوچەکە" لەسەر قسەکانی دەڕوات و دەڵێت، گەر بڕیاری بەردەوامبوونی شەڕەکەی بدایە ئەوا "لەنین بۆ شۆڕەوی و جۆرج واشنتۆن بۆ ئەمریکا چۆنبوون، ئەویش بۆ ئێمە وابەبوو".

دوای ئەم زەبرە، وێنەی کوردی فرەلایەن بەڵام یەکگرتوو لەڕووی چەوسێنەرانیاندا خۆی بۆ نەگیرا، زۆر لەکوڕە بەرهەڵستکارەکانی بەرزانی (بەتایبەتی لاوانیان)، باوەڕیان وابوو کە "ئەو"

دەستبەرداربوونی شەڕەکەی بەباشتر زانیوە وەك لەوەی سەرکردایەتییەکەی بەیەکێکی دی بدات. بڕیارەکەی مەلا مستەفا کەلەبەرێکی قووڵی خستەناو کوردی عێراقەوە، بەڕادەیەکی وا کەدیسانەوە کەوتنەوە یەکتر کوشتن، دەساڵێکی تری برد تا ڕیزەکانی خۆیانیان لەدژی سەدام حسێن ڕێکخستەوە.

ژەنەڕاڵ بەرزانیش دواساڵەکانی تەمەنی بەرپرسوایی لەو دوو وڵاتەدا، ئێران و وڵاتە یەککگرتووەکان کەناپاکیان لەگەڵداکرد، بەسەربرد. کاتی تەواویشی بۆ بیرکردنەوە لە دانایەتی رەتکردنەوەی پێشنیارەکەی سەدام حسێن لە هاوبەشێتیکردنی کەرکوکیدا، گەمژەیی بڕوا کردنی بەو بیانیانەی کاریان تێکردو ئەو بڕیارەیان پێدا، دەگەیاند خۆمەڵواسین بەهێزی بیانیدا ئەو ئەنجامە راستەوخۆیەی دەبێت کە ڕێبا ٠ە دووردورودرێژدک . بەرزانی، یەکەمجار لەسەرەتای شەستەکانەوەو دوای گەڕاندنەوەی لە تاراوگەی شۆرەوی گر .رزیابانە گرتی و، دواتریش بێ هیچ سلکردنەوەیەك،کە رەخنەگرانی والد ٠رد پرسیا . لە چاکبیرکردنەوەی و نەتەوە پەروەرییەکەشی بکەن.

## پەراوێزەكانی بەشی پێنجەم

# كیمیاگەری كۆن - یان زێڕ بەناڵی ناسن بوون

*"خەباتی نەتەوەی كورد بەدرێژایی سەدەی بیست، بڕوانە دیڤید دراڵ:

The Kurd A Nation Deniel, London 1992 p.20.

*"تاوبانگەكەشیان لەشێوەی شەڕكردنەكەیانەوە بوو" بڕوانە سوسراوەكەی:

The Kurdish Tribes of the: Sir mark Sykes Ottoman Empire

- The Journal of the Royal Anthropologecal Institute of Great Britain and Irland vol. XXX V III, January 28, 1908.

*"بەشێرەخۆری لەبەندیخانەدا بووە" بڕوانە كتێبەكەی دانا ئادەمس شمت:

Journey Among Brave Men, Boston, 1946,p.138.

*"ئیتر بێ ئەوەی لەمۆكەی بپرسن خۆی بۆ دەكوتن"، بڕوانە كتێبەكەی مارتن ڤان برونسن:

Agha, Sheikh and State Utreth University, 1978, p.311;

*"ئەندامانی خێزانەكەی بەرزانی" چاوپێكەوتنێكی ١٠ی تشرینی یەكەمی ٩٩١ لەگەڵ سامی عەبدولڕەحمان لە رەواندوز.

*"دەتوانم بەهەزارو پێنج سەد بەرزانییەوە بەرگری لەپاشماوەی... بڕوانە ڕینی مۆریس" Le Kurdistan ou la mort, Paris 1956 p.158.

*"ئەی دادوەری چۆن دێتەدی؟" لەچاوپێكەوتنێكی حاییم لیڤاكۆڤ تشرینی یەكەمی ١٩٩١ تەلئەبیب.

*"ڤێڵبازی پاشقوڵگرتنی میر نیزار، باسیل نیكیتین

it historigue1956, p.188. Les Kurdes: Etude sociologique, Paris.

*"دلڕەقی سمكۆ: بڕوانە كتێبەكەی ئارشی روزیڤێلت For lust of knowing

Memories of an Inteelligence office, Boston.1988p.251.

هەروەها بڕوانە كتێبەكەی میهرداد ر.ئیزادی:

The Kurds: Aeonise Handbook, Washington and London 1992 p.57
کەتیایدا هاتووە: لەڕۆژانی جەنگی جیهانی یەکەمدا سمکۆ ناپاکانە، کەمینێکی بۆ —سەرۆکی ڕۆحی فەلەو ئاشوورییەکان— "مار شەمعون بنیامین" کە ئەوکاتە ئەوەت ساڵان بوو، دانا و کوشتی و لەبڕ و تووڕەییشدا کوژرانە خوێنەکەی خواردەوە. ستەمکاری و نارەوایی سمکۆ بەزۆری کوردی شەرمەزارکردبوو. مێژوو نووسێکی کورد دەڵێت: تۆمارگە دڕندایەتییەکەی دەمیخاتە خانەی خوێنمژە ڕسولکانی مێژوو، وەک ئەتیلای مەگۆلی کەلای تورکەکان ئەمڕۆشی لەسەربێت هەر پاڵەوانە، جا با بەلای کوردو خۆرئاواییەکانەوە بەپێچەوانەی ئەوەشەوەبێت.
*"نامەکەی شێخ عوبەیدوڵڵای شەمدینان" وەک لەکتێبە شینەکەی حکومەتی بەریتانیا، تورکیا، ٥، لەساڵی ١٨٨١دا هاتووەو کینانی لەکتێبەکەیدا:
The Kurds and Kurdistan, London 1964, p.24 گەڕاوەتەوە بۆی.
*"بەهیچ جۆرێك لە دەری شارە گەورەکاندا". بڕوانە کتێبەکەی ئیلی بانیستەر سون:
Kurdistan in Disguise, London 1926 p. and To Mesopotamia
*"لۆرد کارزون"، لە "ویلسون ئیبن هویل" لە:
The Soviet Union and the Kurds: Astudy of a Natieonal Minority,- unpublished Ph.D. thesis: Universty of Virginia, 965, p.143.
*"کاتێك نەوت لەنزیك کەرکوکەوە دۆزرایەوە" لە:
CIA document, Den of Spise: The Kurdish Problem in Perspective, research paper, June 30, 1979.
وەرگیراوە.
*"کەرکوك شارێك بوو تێکەڵاو خەڵکی تیادا دەژیا" کەببوە هۆی کێبەرکێ: چەند سەرچاوەیەك، تورکمانەکان ئەگەر زۆرایەتیش نەبن بە بەشی گەورەی کەرکوك لەقەڵەم دەدا، کوردیش بەچارەکی دانیشتوان و بەش بەشی کەمتری عەرەب و فەلەو جوو
*"نزیکەی سەدی ٧٥ی نەوتی عێراقیان دابینەدەکرد". Financial Times ٢٠ی ئۆگستۆسی ١٩٧٤. گیرارد شالیاند لەکتێبەکەیدا:
Apeople Without a Country- London 1980, Brooklyn 1993, p161.
گەڕاوەتەوە بەهۆی زیادبوونی بەرهەمی بیرەکانی بەسرە نەوتی کەرکوك تا ڕادەیەك کەمی دەکرد.
*"پەیماننامەی سیڤەر سەرشۆڕی تورك و بێ ئینساف بەرامبەر بەکورد تیادابوو" لەکتێبەکەی شالیاند Apeople Without aCountry- London 1980, Brooklyn 1993, p.45 کەپێشتر ناوی هاتووە، وەرگیراوە.
*" چل هەزار تا دووسەدو پەنجا هەزار جوتیاری کورد مردن". ماك دوال:

The Kurds: A Nation Denied, London 1992 p.37 پێشتر ناوی هاتوه.

*" رەنگە یەك ملیۆن پیاوو ژن و منداڵی کورد" باسیل نیکیتین Les Kurdes p. 134 دا دەڵێت: هەر دوای تێکشکاندنی شۆڕشەکەی شێخ سەعید، یەك ملیۆن کورد راگوێزران.

*"هەستی کورد ... بەرادەیەکی وا تونبوو ...". بڕوانە شاندریال:

Apeople Without a Country- London 1980, p. 191. کەپێشتر ناوی براوەو تیایدا هاتووە کە Sir Arnol Wilson ی کەساڵی ١٩١٧ – ١٩٢٠ کاربەدەستی سەرەکی بەریتانیا بوو لەبەغدا. لە:

Mesopotamia 1917-1920 دا دەڵێت: "کوردەکان نە حەزیان بەمانەوەی ژێر دەسەڵاتی حکومەتی تورکەو نەبەخستنە ژێر دەستەڵاتی حکومەتی بەغدایە ... لەباشووری کوردستاندا لەهەر پێنج کەسێکدا چواریان بۆ دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ پشتگیری پلانەکەی شێخ مەحمود دەکەن."

*"راپۆرتێکی سەربازیانەی هەواڵگرانی – ئیستخبارات-ی بەریتانیا" بەناوی :

Public Record Office, Kew, England, 453340 e 199, July 14, 1945.

*"حکومەتی مەحمودو دوا بەدوایدا بەیاننامەی بەریتانی..." بڕوانە سی.جەی.

ئیدمونس Kurds, Turks, and Arabs: Politics, Travel and Research in Northeast Iraq, 1919 – 1925London 1957, p.301.

*" کۆمیتەی باڵای بەریتانیا" لە نامەیەکی ١٠ی شوباتی ١٩٢٦ یدا لەگەڵ وەزیری موستەعمەراتدا، دیسان کۆمیتەی باڵای بەریتانیا دەڵێت: "دڵن بەوەدا دەنێم کە پێدەچوو تا بەهاری ١٩٢٣، پێویست بێت جۆرە ئۆتۆنۆمییەکی ناوچەیی بە بەشە کوردییەکەی عێراق ببەخشرێت. بەڵام دەرکردنی بنکە سەربازییەکەی تورکەکان لەڕەواندوز، لەنیسانی ١٩٢٣دا گومانکارییەکی مەزنی لە باروبۆخەکەدا هێنایە ئاراوە. سەرچاوەی پێشتر:

Public Record Office, Kew, England, Fo 371/1146 132 121

- پەیمانەکەی ئەتاتورك لەگەڵ بەریتانیادا بڕوانە ((ئاغاو شێخ و دەوڵەت)) نووسینی ڤان برلونسون پێشتر ناوی هاتووە.
- *وریاکردنەوەکەی سەرۆك وەزیرانی عێراق ماك دوال.

the Kurds A Nation Denied London 1992 p. 84 کەپێشتر ناوبرا.

- بێ ئارامی بەریتانیا

Public Record office, kew, England secret report , cabinet 24/201, copy 28. p 338, February 1929.

لەئەنجامدا بەریتانییەکان، هەر بۆ پشتگرتنی ئەو یاسا چەوتە ستەمکارانەو "دلو"مکانی دی لەقاوەخانەکانی بەغداوە دادەنران بە بۆردومانکردنی عەشیرەتەکانی فورات یان کوردستان لەلایەن فڕۆکەکانی بەریتانیاوە، زەبریان دەچەشت.

*"نامەکەی شێخ مەحمود کەلە ۲ی ئازاری ۱۹۳۱دا بۆ کۆمەڵەی نەتەوەکانی نارد. سەرچاوەی پێشتر "نیکیتین" Les Kurdes, p. 300 ..

* "بەرزانییە دواکەوتووەکانی" Wiliam Eagleton Jr. the Kurdish Republic of 1946 London 1963 p. 50.

*"بە هەزاران کوردی خوێندەوار" عیسمەت شەریف وانیلی ژمارەی ئەو کوردانەی کەلە ۱۱ی ئازاری ۱۹۷٤دا بۆ ناو کوردستانی ئازاد گوێزرانەوە بە ۱۰۰۰۰۰ کە دەخەمڵێنێت. شالیاند:- Apeople Without a Country p. 165.

*"کەم بوونەوەی مووچەی حکومەت". رۆزفیلت For Lust of knowing p.140 دا دەڵێت:" ئەگەر بهاتایەو حکومەتی عێراق لەو تاکە بارەدا زیاتر گونجاوانە دەستبلاوانەتر کاری بکردایە ئەوا ژیانو پارەو شکۆی حکومەتەکەشی دەپاراست، کە هەزاران جار لەزیادەی مووچەکەی مەلامستەفا بایەخدارتر دەبوو.

*"رەخنەگرێکی ئەمەریکایی". William Eaglet on, Jr, The Kurdish Republic of 1946 لاپەرە ٥٠ - ٥٤ی سەبارەت بە بەرزانییەو لاپەرە ۱۰۲ - ۱۲٦ی لەبارەی کشانەوەکەیەتی.

*" ئەوکاتە هەستی نەتەوەیی" چاوپێکەوتنێکی موحسین دزەیی لە لەندەن ۲۸ی تشرینی دووەمی ۱۹۹۱.

*"لەدەشتاییەکی پڕ لەگوڵە کێویلە هاتۆتە دەرەوە" چاوپێکەوتنی سامی عەبدولڕەحمان. ۱۰ تشرینی یەکەمی ۱۹۹۱ رەواندوز.

*" بەدووردو درێژ مەهاباد" ئیگلتونو. The Kurdish Republic The Middle East Jornalvol. No, 3, July, 1947.ی رۆزفیلتدا هاتووە

*"بەرزانی خانەخوێکەیی بە پیاوی خراپ..." چاوپێکەوتنێکی عەبدولڕەحمان قاسملۆ لەپاریس ۲۰ ئەیلولی ۱۹۸۸.

*"ئەندامانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران درانەوە بە ئێرانییەکان" سەرچاوەی پێشوو.

*".... بەسەر کورددا زاڵ نەبوو".

William Eaglet on, Jr., The Kurdish Republic p. 113 ff

* کۆبوونەوەیەکی بەرزانی لەگەڵ پیاوەکانی چاوپێکەوتنی سامی عەبدولڕەحمان ۱۰ تشرینی یەکەمی ۱۹۹۱ رەواندوز.

*"بیرەوەری تێکۆشەرێك لەوانەی بەشداری کشانەوەکەیان کردبوو" میخیل مینگەر لە ( NRC Handelsblad) ی ۲ی ئۆگوستۆسی ۱۹۹۱دا دەڵێ ژمارەی تەواوی کشاوەکان و ماوەی کشانەوەکەش ڕوون نییە، بەرزانی خۆی بەئادەمس شمدتی وتبوو کە ٤٩٦ پیاو بۆماوەی ٥٣ ڕۆژ بەشداریان تیادا کرد.

*"تاڵەبانی و بەرزانی لەمۆسکۆ". چاوپێکەوتنی جەلال تاڵەبانی. هەولێر. ١٩ی کانونی دووەمی ١٩٩٢.

*"راپۆرتێك کە راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی سەرۆك کۆمار ئامادەیکردبوو

:00229 – 1951.بڕوانە Den of SpiesP. 92

*"کۆمۆنیست نیم" لە Mauries ,Le Kurdistan 1967 p. 135. دایە کە بەرزانی لەساڵی ١٩٦٢ دا هەمان قسەی بەئادەمس شمیدت راگەیاندووە.

*"بەرزانی و میوانەکانی" چاوپێکەوتنی تاڵەبانی. هەولێر ١١ی شوباتی ١٩٩٦.

*"قۆناغێکی گەشەدار" چاوپێکەوتنی بالۆیز ئەنتونی پارسون. ٢١ی تشرینی دووەمی ١٩٩١. لەندەن.

*"پشتگیری دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆ کورد" چاوپێکەوتنی عیسمەت شەریف وانلی. ٣١ی تشرینی یەکەمی ١٩٩١. لۆزان. چاوپێکەوتنێکی سامی عەبدولرەحمان. ١٠ تشرینی یەکەمی ١٩٩١. ڕەواندوز.

*"١٢٧٠ گوندی کوردی وێرانکرد":

Robert D. Kaplan, The Arabists: The Romance of an Amrican Elite. New York, p. 251.

*"حەوت هەزار کۆمۆنیستیان" ڕوانە: Marion Faouk – Sluglet and Peter Sluglet: Iraq Since 1958, From Revolution to Dictatorship, London 1987. وەك لە John Bulloch and Harvy Morris, No Friends but the Mauntains: The Tragic History of the Kurds, New York 1992, p. 124. شدا ئامارەی بۆ کراوە.

* "گەشتێکی سەربازیانە" بڕوانە .Mauris, Le Kurdistan, 1967 p. 167

*"جەلال تاڵەبانی ناپاکە" بڕوانە ئەو بروسکەیەی سوپای عێراق کەلە: Mauries, Le Kurdistan, p.141. دایە.

*"بەکرێگیراوی هەموو لایەکە" بڕوانە ئیدمۆند غەریب:

The Kurdish Question in Iraq, Syracuse, 1981 p.181.

*" ئاماری ئابوری بودجەی عێراق" بڕوانە:

Chaliand, A People Without aCountry pp. 159-160.

*"فیل" بڕوانە: Izady, The Kurds, p.68.

*"عوبەیدوڵا" قسەکردنی لەگەڵ "غەریب"دا. ١٩ی تەموزی ١٩٧٤. بڕوانە:

ئیدموند غەریب The Kurdish Question in Iraq, p 155. سەرەتای جەنگی عێراق ئێران، دوای دەمە قاڵێیەك لەگەڵ سەدام حسێندا عێراقییەکان عوبێدوڵا یان کوشت چونکە نەفامانە بەرگری لەمەلا مستەفا کردو وتبووی: هیچ نەبێت ئەو دەزانێت کێ باوکێتی (لەناو ناحەزانی سەدام حسێندا، قسەوباس لەسەر باوکی سەدام حسێن دەکرێت.)

*"کوردی عێراق تا ئێستا هیچی بەدەست نەهێناوە" چاوپێکەوتنێکی قاسملو ٣٠ ئەیلولی ١٩٨٨. پاریس.

*"هێزی کوردەکان" بڕوانە: McDowa' The Kurds p. 95

*"بەرزانی بەلای ئێمەوە وەك خوا وابوو". چاوپێکەوتنێکی ئەحمەد بامەرنی نوێنەری تاڵەبانی لەپاریس. ٢٥ی ئەیلولی ١٩٨٨. پاریس.

(٦)

## (( کیسنجەر: کاری خێرخوازانەی ناو عەشیرەتێکی چیایی ))

گەشتە فڕۆکەییەکەی ٣٠ ئایاری ١٩٧٢ ی نێوان مۆسکۆو تاران، بۆ "ڕیچارد م. نیکسۆن"ی سەرۆکی ئەمەریکا پشوو بەخشبوو، وەک دوکتۆر هەنری کیسنجەری ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی ئەوسا دەریبڕی، بۆ سەرۆک و خۆشی لە "ئەومن دەربازبوون"ێک دەچوو. چونکە لە کرملین هەشت ڕۆژیان بەدانوستانێکی سەخت، سەبارەت بەمەرجەکانی پەیماننامەی "سالت - ١-" لەگەڵ یەکێتی شۆرەویدا بۆ کەم کردنەوەی چەکە کۆکوژە ستراتیژییەکان بەسەر بردبوو، کەنیکسون بە "خاوێنکەرەوەیەکی تەواو"ی دەردەبڕی. بەڵام ئەو بەهارە هەرچەندە هێرشەکەی جەژنی "ئیستەر"ی هێزەکانی "هانۆی" دژ بەڤێتنامی باشوور کراو، بەو بۆردومانکردنە چڕوخەستی ڤێتنامی باکوورو مینڕێژکردنی بەندەرەکانی ئەبوایە، کەئەمەریکا کردنی، ڕاگرتنی هەروا ئاسان نەبوو، بەڵام دەرئەنجام بەسەرکەوتنی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا شکایەوە. بڕیارەکانی نیکسون "بوونەهۆی شەرمەزارییەکی زۆری یەکێتی شۆرەوی پشتگیریکەری سەرەکی هانۆی" و مقۆمقۆیەکی واشی وورووژاند کە تا دواسات سەفەرەکەی مۆسکۆی سەرۆک یەکلایی نەبۆوە.

بەرامبەر بەوە، سەفەرە ٢٢ سەعاتییەکەی تاران تا ڕادەیەک بێئەزییەتبوو، بەتایبەتی کەپێداچوونەوە ستراتیژییە دوورییەکەی کیسنجەر پێیخۆشبوو لەگەڵ شادا بکرێت و پێنەچوو ئەمەریکاییەکانیش ئاڕاستەیەک پێیانخۆشبووبێت، لەبەرنامەیاندا بوو. بەڵام شا شتەکانی بەجۆرێکی دی دەبینی. بۆیە هەروەک ئیشەکە بەپەلامارێکی سەربازیانەوە بەندبێت، زۆر بەچاکی سەفەرەکەی ڕێکخستبوو بایەخی بە وردترین شتیش دابوو. بەرنامەکەیان جگە لەنێولرەخوانێکی ڕەسمیانەو نیوەڕۆژەیەکی پچووککراوە، دوو زنجیرە دانیشتنیشی بۆ وتووێژ تیادا دیاریکرابوو. نیکسون و شا هەردووک ئەیانزانی چیاندەوێت، دەرکیشیان بەئارەزووە

چوون یەکەکانیان کردبوو. نیکسون پێی لەسەر وەدەرخستنی وڵاتە یەکگرتووەکان لەمیندیٔ چینی دادەگرت و، لەئاسیاشدا بۆ دیتنەوەی ئەو هێزە ناوچەییانە دەگەڕا، کەلەبەرامبەر کۆمۆنیستدا بتوانن بەرگری لەبەرژەوەندی خۆیان و واشنتۆنیش بکەن، بێئەوەی هێزەکانی ئەمریکا ناچاربێت لەناوچەکەدا بڵاوببنەوە.

ئەوکاتە، وادیاربوو ئەوەی کەدواتر بە "بنەمای نیکسون" ناسرا، ڕێک بەسەر شادا جێبەجێدەکرا. بەریتانیا کەخۆی هێنابۆوەیەدا و دەستی لەبوونە مێژووییەکەی کەناڵی سوێسی هەڵگرتبوو، ئێرانیش خۆی پێیوابوو کەئەو بۆشاییەی پێپڕبکرێتەوەو ئارامی کەنداوی فارسیش، کەدوو لەسێی داهاتی نەوتی دونیای لێهەڵدەقوڵێت، بپارێزێت. بە ڕاستی زۆر ڕوونتر دیاربوو کەخواستی تاران لەوەدا بێزاری عەرەبی سعودی ـ گەورەترین بەرهەمهێنەری نەوتی کەنداو دەوروژێنێت، جگە لەعێراقیش، کەدەوڵەتێکی رادیکاڵیانەی لەخۆباییەو دووەمین مەزنترین ئیحتیاتی نەوتی دونیاشی هەیەو هەوڵی ڕۆڵێکی ناوچەیی واشبوو کەلەگەڵ گرنگی نەوتەکەیدا بگونجێت. وتارێکی زۆر وردبینانەی گۆڤاری "هارپر" بەناوی "شا هەرچییەکی بوێت بیدرێتێ"، ئاماژەی بۆ ئەم سیاسەتەی نیکسون کردبوو، کەئەوەی بەڕێوەبەرایەتییەکانی پێشووی ئەمەریکا بە شا یان نەدەبەخشی و تیایدا وریاتربوون، ئەمان بەخشیان (واتە چی لەچەکی پێشکەوتوو مەشق ویست دایانێ). نرخی نەوتی خام دوای ئەوەی ماوەیەکی زۆر لەکزیدابوو بەرزبۆوەو، شا ش هێندەی پارە هەبوو کە گشت ئارەزووە سەربازییەکانی خۆیان پێ جێبەجێبکات.

کاتێک "ئەمیر ئەسلان ئەفشار"ی باڵوێزی ئێران لە ئەمەریکا لە شای پرسی، داخۆ ئەوەی دەیویست نیکسون لەسەفەرەکەی تارانیدا داویێتی؟، وەڵامەکەی "بەڵێ، لەوە زیاترم دەستکەوت کەدەمویست و کەبیریشم لێدەکردەوە". ڕاستییەکەی ئەم سەردانە ئاماژەیەکی ترسناکی بەدیهێنانی خەونەکانی شاو مەلا مستەفا بەرزانی سەرکردەی کوردە عێراقییەکان بوو. نیکسون بەهاندانی ئارەزووە خۆسەپێنەکەی شا و، چاوبرسێتییە هەمیشەییەکەی ئەمیش بۆ چەک و پێویستییە سەربازییەکانی ئەمەریکا، بێئەوەی خۆی بیەوێ دەستی لە ڕوخاندنی شاو نا ئارامییە بەردەوامەکەی کەنداودا هەبوو. چونکە یەکگرتنی ئەو دوو فاکتەرە پەکی ئابووری ئێرانیان خست و بڕواشیان بەشا لەقکردو، بوونەهۆی ڕێخۆشکردنی شۆڕشە ئیسلامییەکەی ئایەتوڵا ڕوحوڵا خومەینی حەوت ساڵ دواتریش.

سەرۆکی ئەمەریکا، بێئەوەی بەچاکی بیر لە ئاکامی ئەم سیاسەتەی خۆی بکاتەوە، بڕیاریدا لەسەر سیاسەتی قایلکردنی شا بەردەوامبێت. بەهاوکارییەکی پچووکی دەستگیرۆوەکردنی

شۆڕشە بەرەولەمەکەی بەرزانی و بەهەوو وەستانەوەی بەغدای قایلبوو، ئەم بڕیارە پاشە کشەیەکی کوتوپڕی سیاسەتێکی کۆنی وڵاتە یەکگرتووەکان بوو کەتاماوەیەکی زۆریش بەتوندی بەرگریان لێدەکرد. نیکسون کوردەکانی بۆ ناهەموارترین تێکشکان لەمێژوویاندا بەکێشکردو کۆتاییشی بەدەسەڵاتدارێتی دەیان ساڵەی بەرزانی لە ناو بزووتنەوەی نەتەوەیی کورددا هێنا.

"جۆرج دەبلیو. باڵ"، کەیاریدەدەرێکی پێشووی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکابوو، لەکۆشکی سپییەوە بۆ بەشداربوون لەدوا هەوڵدانە سەرنەکەوتووەکەی ڕزگارکردنی شا لەو گرفتەی ساڵی ١٩٧٨ تێیکەوتبوو بانگکرا. باڵ لە ڕاپۆرتێکی نهێنیدا نووسیبووی: لەسەردانەکەی نیکسوندا بۆ تاران "هەرئەوەندەی لە کەنداوی فارسدا کردمانە- مەبەست شا بە- پارێزەری بەرژەوەندی خۆمان، ئیتر بەتەواوەتی پشتمان پێبەست و، واش ڕەفتارمـ[illegible] کە ئێران زلهێزێکی وەک ئەمەریکا بێت". ڕاستییەکەی "کاریگەرێتی هاو[illegible]انەکەمان لەسەر سیاسەتی ئەمەریکا هێندە بەهێزبوو کە ئەو- مەبەست شا یە- هیچ خۆی ئەزییەت نەدەدا ئەمەریکای لەخۆ کەمتری هاوکاری، لە نزیکبوونەوەی کۆتاییهاتنی پرۆژەکەمان ئاگاداربکاتەوە". ئەمە ئەو دەربڕینەبوو کە "لیژنەی لێکۆڵینەوە لە چالاکییەکانی دەزگا هەواڵگرەکان"ی کۆنگرێسی ئەمەریکا کە "ئۆتیس.جی. پایک"ی سناتۆری دیموکراتی شاری نیویۆرک سەرۆکایەتی دەکرد، بەکاری هێناو، کەلەساڵی ١٩٧٥دا لەهەندێ بەڵگەنامەی نهێنیدا دەرکەوتن کە پێوەندییان بەکارە نهێنییەکانی نیکسون و فۆردەوە هەبووە، ئەوکارە نهێنییانەی لێکۆڵینەوەی کارە ڕسواییەکەی ووتەرگێتی لەسەر کرا و ئەنجامەکەی نیکسونی ناچارکرد لەمانگی ئابی ١٩٧٤دا دەست لەسەرۆکایەتی ئەمەریکا هەڵبگرێت.

ڕاپۆرتە نهێنییەکەی پایک کە زۆر بەووردی کارە نهێنییەکانی ئەمەریکای، لە ئەنگۆلاوە تا دەگاتە کوردستان گرتەوە خستە ڕوو. ساڵی ١٩٧٦ دزەیکرد، دەریخست کە چۆن شا بەچاوپۆشینی ئەمەریکاو، لەکاتێکدا مەبەستی بوو کورد لەپێویستییەکانی سەرکەوتن بێبەریبکات، بەرزانی بۆ دژایەتیکردنەوەی عێراق هاندەدایەوە. دوایش "بێنەوەی ئەمەریکا دەمهەڵبێنێتەوە"، شا لە ئازاری ١٩٧٥دا، دوای ئەوەی هەرچییەکی لەعێراق ویست بەدەستیهێنا، کوتوپڕ دەستی لێبەردان و بەدەم مەزەییە پوچەڵەکەی بەغدایەوە دلن. ڕاپۆرتی لیژنەکە بەو ئەنجامە گەیشتبوو کە کورد بەلای تاران و واشنتۆنەوە لە "کاغەزێکی یاری" بەولاوە هیچیدی نەبووەو کەرەسەیەکی دەگمەن و ئایابیشبووە بۆ لاوازکردن و نەهێشتنی "توانای عێراق، تا سەرکێشیکردنە سیاسییە نێو دەوڵەتییەکەی نەهێڵێت". سەرەڕای ئەو زەبرە

گەورەیەی دزەکردنی ئەم راپۆرتە هێنایە ئاراوە، بەڵام خۆی لەباسکردنی هاندانە ناکۆکەکانی لایەنە جیاجیاکان و، لێتێکچوون و بۆچوونە هەڵەکان نەداو، وایان لە کێشەی کورد کرد کەببێتە حاڵەتێکی نموونەیی لەناپاکێتی و دەستبڕیندا.

بڕیارە بنەڕەتییەکانی نیکسونی تاران، پاشگەزبوونەوەیەکی گرنگی سیاسەتی ئەمەریکابوو، کەبەردەوام رێگەی لەخواستە سەربازی و جیوپۆلەتیکەکانی دەگرت. شای ئێران سەبارەت بە یارمەتیدانی شۆڕشگێڕە کوردە بەرزانییەکان بۆ دژایەتیکردنی حکومەتی عێراق، رای بەواشنتۆنیش گۆڕی. راپۆرتە پوختە "٤٢ لاپەڕەییە" کەی خوێنەری ماندوو نەکردو ئەنجامی سەردانەکەی نیکسونیشی بۆ تاران تیادابوو، گەیشتە وەزارەتی دەرەوە، هیچ پێشنیارێکی بۆ یارمەتی دانی بەرزانی تێدا نەبوو، (هەرچەندە کیسنجەر لەوە نەدەچوو بەهیچ جۆرێک ئەو پێشنیارەی بە "ولیام.پ. ڕوجرز"ی) وەزیری دەرەوە وتبێت، چونکە بەردەوام بەچاوی سووک سەیری دەکردو، ساڵی دواتریش خۆی جێگەکەی گرتەوە). کیسنجەر بەپێی عادەتەکەی خۆی هەموو شتێکی بە نهێنی هێشتەوە، ئێستاشی لەسەربێت ئەو کاتەی دیاری نەکردووە کە وڵاتە یەککگرتووەکان بیری لەیارمەتیدانی کورد کردۆتەوە. بەڵام "دیڤید کمعی" کە ئەو کاتە ئەفسەرێکی گرنگی هەواڵگرانی ئیسرائیل بوو شتێکی لەوبارەیەوە درکاندووە کە کیسنجەر "بەردەوام لەهەوڵەکانی" ئیسرائیل و ئێران "بۆ هاندان و بەهێزکردنی بەرزانی" ئاگادارکراوە، ئەویش بەرلەوەی "بۆهاتنە ڕیزمان قایلی بکەین"، ئەگەرچی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا بەرهەڵستی ئەو هاتنەڕیزەی بەرزانی دەکرد. ئەو بەڵگەنامە رەسمیانەی کە تا ئێستا ئاشکراکراون، هەرئەوە دەردەخەن کە شا داوای لەنیکسون و کیسسنجەر کردووە پێوەندی لەگەڵ بەرزانیدا دابمەزرێنن، ئەوانیش فرمانی بەجێهێنانی کارەکەیان داوە. ئەم وەرچەرخانە سیاسییە بەرادەیەکی وا گرنگبوو کە کیسنجەر زۆر بەنهێنی بیگرێت و لەوەزارەتی دەرەوەشی بشارێتەوە، چونکە وەزارەت و بەرپرسانی "سی.ئای.ئەی"یش، لەماوەی سێ ساڵی رابردوودا سێ کەڕەت رایانسپارد کە بۆ یاریدەدانی کورد، بەدەنگ پێشنیارەکانی شاو ئیسرائیلەوە نەچن، "راستییەکەی هەرسێ مانگ بەر لەکۆبوونەوەکەی تاران، کیسنجەر بۆخۆی بەبڕیارێکی وەزارەتی دەرەوە قایلبوو کە ئەو پرۆگرامەی ڕەتدەکردەوە". بەرزانی لەبەدیهێنانی پێوەندیکردنی بە "تۆماس کارولان"ی ئەفسەری سەرەکی باڵوێزخانەی وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا لەبێروت، کەلەمانگی تشرینی دووەمی ١٩٧١ەوە دەستیپێکردبوو، سەرکەوتنی بەدەستهێنا، ئەگەرچی واشنتۆن بێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە کارولان تەنیا گوێیان لێبگرێت و نەهیچ پێشنیارێکیان بۆبکات و نەهیچ بەڵێنێکیشیان بداتێ. دوای رێکەوتنەکەی تاران پێوەندییەکەی بێروت، بێئەوەی

کاریگەرێتییەکی وای هەبێت، هەروامایەوە. گۆڕانکارییە کوتوپڕو کشتییەکەی نیکسون هێندە بەنهێنی گیرا کە "ریچارد هێلمز"ی بەڕێوەبەری "سی.ئای.ئەی" وا لێبکات لەمایی ١٩٧٢دا بەڕێوەبەری مەلبەندی تارانیان "ئارتەر کەلەمان" ئاگادار بکات کەلەلای "جۆزێف فارلەند"ی بالوێزی خۆیان باسی نەکات. هێلمز لەوەدا باشی بۆچووبوو، چونکە "رۆجەرز"ی وەزیری دەرەوەی لێ ئاگادار نەکرابوو.

بۆچوونە کۆنەکەی واشنتۆن، بەوەی کە عێراق دەوڵەتێکی دروستکراوە، بنەمای ئەم گۆڕانکارییە سیاسییە بوو. دوای کۆتاییهاتنی یەکەم جەنگی جیهانی، بەریتانیا بۆ پاراستنی بەرژەوەندییە نەوتییەکانی خۆی لەکەرکوکدا، ولایەتی موسڵی عوسمانی، کەکورد زۆرینەی دانیشتوانێتی بەست بەخوارووی عێراقی زۆرینە عەرەبەوە. سەرەتا واشنتۆن تا دەساڵی ڕەبەق دانی بە دەوڵەتی عێراقدا نەدەنا کە بەریتانیا دایمەزراندبوو، دوای ئەوە دانی پیادانا، ئەویش کاتێك لەندەن ڕێی بە کۆمپانیا نەوتییە ئەمەریکاییەکان دا کە لەکانگا نەوتینەکانی کەرکوکدا بەشیان هەبێت. لەو دەمەوە، ڕێزگرتنی تەواوی سنووورە نێودەوڵەتییەکان بوونەتە بەشێکی سەرەکی سیاسەتی ئەمەریکا لە بەرگریکردنی سەربەخۆیی دەوڵەتان و سەروەریی یەکێتی خاکیاندا. بەوەش وای لێهات واشنتۆن گومان لەهەرشتێك بکات کە لەناوچەکەدا ببێتەهۆی جۆرە ئۆتۆنۆمی دانێك بەکورد. بەڕێوەبەرایەتییە یەك لەدوای یەکەکانی ئەمەریکا پشتگیری حکومەتەکانی، ئێران و تورکیاو عێراقی لەڕووبەڕووبوونەوەی کوردەکاندا دەکرد، چاوی لەو هەوڵانەش دەپۆشی کە بۆ سەرکوتکردن، یان تواندنەوەی کەمایەتییە کوردەکان دەدران (ئەو پشتگوێخستنە بیروکراتیانەیەش، بەتایبەتی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا کە ڕۆژێك لە ڕۆژان سیاسەتێکی گشتی بۆ سەرنجدانە کورد، کە کۆمەڵێکی گەورەی یەك ڕەگەزو جیاوازو خاوەن شێوە دیموگرافیایەکی خۆیانن، نەهێنایە ئاراوە. بەڵکو ئەویش و سەرجەم وەزارەتەکانی دەرەوەی وڵاتە خۆرئاواییەکان، تورکیایان بە بەشێك لەئەورووپاو عێراق و ئێرانیشیان بەبەشێك لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاست دادەنا، کوردەکانی ئەو وڵاتانەشیان بەکەمایەتییەکی چەوساوە نەبێت، کەئاوە ئاوە پشێوی دەخەنەوە، بەهیچی دی دانەدەنا).

لەمپۆشی لەسەربێت، هێشتا نەزانراوە نیکسون و کیسنجەر تا چ ڕادەیەك بیریان لە ئاکامی دەستبەردانی ئەم سیاسەتەیان کردبۆوە، بەڵام تێبینییەکەی کیمەی ئەوەی دەگەیاند کە هەرچەندە وەزارەتی دەرەوە بەرهەڵستیانکردبێت، بەڵام پێش بەیەکگەیشتنەکەی مانگی مایسی ١٩٧٢ی تارانیش ئەوان بەڕاستی بیریان لەم کارە کردبۆوە. هەرچەندە هیچکام لەنووسینەوەی کۆبوونەوەکانی سەرۆکی ئەمەریکاو شای ئێران نەخراونەتە ڕوو، پرسیار سەبارەت بەوە

دەکرێت کە داخۆ نیکسۆن و کیسنجەر هیچیان لەبارەی کوردەوە دەزانی؟ یان پێش چوونە تارانیان بایەخیان بەزانینی دابوو؟. دوای بیست ساڵ نیکسۆن شتێکی وای درکاند کە دڵن بە پشتگوێخستن و پەشیمانی بگەیەنێت، "زۆرمان لەبارەی کوردەوە نەدەزانی. پێمان وابوو یەکێکن لەعەشیرەتە چیاییەکان". هیلمزیش، کەنیکسۆن لەسەرەتای ١٩٧٢دا لە "سی.ئای.ئەی" لایبردو کردییە باڵوێز لەتاران، پێی وایە ئەم هەڵسەنگاندنەلەڕاست دەچێت. ئەوپێ لەسەر ئەوەش دادەگرێت کە (سی.ئای.ئەی" بەهۆی "کالەهان"ی بەرپرسی بنکەی تارانییەوە کەشارەزاییەکی کاروباری خۆرهەڵاتی ناوەڕاستیش بوو، زۆری لەبارەی کوردەوە دەزانی). ئەگەرچی سەرۆکایەتی ئەمەریکا سوودی لە زانیارییەکانی دەزگا هەواڵگرییەکانی وەرنەگرت بەڵام سەرچاوەیەکی کۆنی شکستی "سی.ئای ئەی" بوو. هیلمز وای دەدەچێت کە "ڕاستییەکەی نیکسۆن و کیسنجەر مەبەستیان دڵڕاگرتنی شا بووە، دوورین لەئاکامی کارەکە وورد نەدەبوونەوە". بەڵای "مۆریس دراپەر"یشەوە کە ئەوسا بەرپرسی بەدواداچوونی کاروباری عێراق بوو لەوەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکادا، "کیسنجەر کوردی بە بەشێک لەبەڵێنی چەکفرۆشییەکەی" ئێرانی دادەنا.

سێ ڕووداوی گرنگ وای لەوڵاتە یەکگرتووەکان کرد کە سیاسەتەکەی بەرامبەر بەکورد بگۆڕێت. یەکەمین ڕووداو ئەو ڕێککەوتننامەیە بوو کەبەرزانی لەگەڵ سەدام حسێندا لە ١١ ئازاری ١٩٧٠دا مۆریکردو بۆ یەکەمین جار لەمێژووی نوێدا ناوچەیەکی ئۆتۆنۆمی بەکورد بەخشی و کۆتایی بەنۆ ساڵ شەڕی پچڕ پچڕ هێنا. کە هەر ئەوەش شای پەستکردو بۆ ماوەیەکی زۆر، بۆ لاوازکردنی عێراق بەئەنقەست چەک و پارەی بە بەرزانی ئەدا. کەچی بەمەبەستی کودەتایەکی پشێو کە بەکارەسات کۆتاییهات[٢٢]، یارمەتییەکەی ڕاگرت. هەرچەندە کوردەکان بەر لە ڕێککەوتننامەکە سەبارەت بەبڕیاری ئەو ئۆتۆنۆمییەی کۆتایی بەشەڕەکە هێنا، بەهیچ

[23] یەکێتی شۆرەوی ناوبژیکەری ئەم ڕێککەوتنەبوو. لەتشرینی یەکەمی ١٩٦٩دا کوردێکی چەپڕەو "دارا تۆفیق" ناوی بە نامەیەکەوە لەبڕاگەوە نارد بۆلای بەرزانی، کەتیایدا داوای لە بەرزانی دەکرد دانوستان لەگەڵ پارتی بەعس دەستپێبکات. بەرزانیش یەکسەر ژەنەڕاڵ "نیعمەت الله ناسری"، سەرۆکی دەزگا ئاسایشییەکانی ئێران "ساڤاک"ی ئاگادارکرد، کەهات بۆلای بەرزانی پێیوت، بەرامبەر بەسووکە یارمەتییەکی ئێران دەست لەدان و ستانەکە هەڵدەگرێت، ئێرانیش هەرچەندە بەڵێنی ناردنی یارمەتییەکەی دا بەڵام نەیبردەسەر. هەمان کات، شا بەبێ ئاگادارکردنی کوردەکان، پشتگیری هەوڵێکی سەرنەکەوتووی ڕووخاندنی ڕژێمی بەغدای کرد. کەئەویش پیلانێک بوو بەعسییەکان تێکەڵی ببوون و دەرئەنجامەکەشی بەکارەسات شکایەوە، دریکەی ٧٠ ئەفسەری عێراقی تیادا گیراو لە ٢٠ی کانوونی دووەمی ١٩٧٠دا گوللەبارانکران. ڕێک بەدوای ئەوەشدا دانوستانی ئۆتۆنۆمی دەستپێکرد.

جۆرێك بەڕەسمی ڕاوێژی شایان نەکردبوو، بەڵام ئەوەی پێ سەیر نەبوو. تەنانەت بەرلەوەی بەڕەسمی ڕێککەوتننامەکە ببەستن، شا بە نهێنی بەگوێی "ئەسەدوڵا علم"ی وەزیری تەختی شایانەیدا دابوو، کەترسی لەعێراقە "هێزەکانی خۆی لەسەر سنووری ئێران خڕبکاتەوە".

کاتێك شا بەرزانی بۆ شەڕکردنەوەی عێراق لەپێناوی بەدیهێنانی ئۆتۆنۆمییەکی ڕاستەقینەی چەسپاو بۆ کوردی عێراق هاندەدا، سەرکێشی بەوەوە دەکرد کەهەمان خواستی پڕمەترسی کوردەکانی تورکیاو ئێرانیش بووروژێنێت. شا ئەم ناکۆکییەشیانی باش لێکئەدایەوەو، وای بۆ دەچوو کەپشتگیریکردنەکەی بەرزانی کوردەکانی خۆی قایل‌و هێوردەکاتەوە. ڕاستییەکەشی شا دەیویست عێراقی دوژمنی سەرەکی بشڵەقێنێت، بۆ ئەوەش کوردی عێراقی لەبەردەستدابوو دەیتوانی بۆ هێنانەدی ئامانجەکەی بەکاریان بهێنێت‌و، لەکاتی پێویستیشدا دەستبەرداریان ببێت. شا کوردەکانی عێراقی بۆ لاوازکردنی بەغدا دەویست، ئەوەشی لەئازاری ١٩٧٤دا، تا رادەیەکی زۆر بەهۆی نیکسون‌و کیسنجەرەوە بۆهاتەدی.

ئەم مەبەستەی شاو مەبەستێکی لەو بابەتەی ئیسرائیل، کە بەردەوام لەناکۆکییەکانی عەرەب‌و ئیسرائیلدا چاوی لە دوورخستنەوەی عێراق بڕیبوو، یەکیان دەگرتەوە. بەڵام شا دەیزانی بەرزانی بڕوای پێی نییە، بەتایبەتی ئەوان لە زووەوە یەکتریان دەناسی، لەمانگی کانوونی یەکەمی ١٩٤٦دا، هێزەکانی ئێران کۆماری مەهابادی کورت تەمەنیان تێکدا کە بەرزانی بەرگری لێدەکرد، هەر ئەو هێزانەش لەکشانەوە ئەفسانەییەکەیدا، لە ئێرانەوە بۆ عێراق‌و تورکیا و هەمیسانەوە بۆ ئێران‌و دوا جاریش بۆ یانزە ساڵ ئاوارەگەیی پڕ ئەشکەنجەی ناو یەکێتی شۆرەوی بەدولوەیبوون. شا ئەوەشی دەزانی کە بەرزانی بڕوایەکی کوێرانەی بەووڵاتە یەکگرتووەکان هەیە، بۆیە بەو هیوایەی گومانەکەی بەرزانی بڕەوێنێتەوە، هەوڵی بەدەستهێنانی پشتگیریکردنی ئەمەریکای بۆ شۆڕشی کورد دەدا. بەڵام بەرزانی بەوەی کەلەڕاڵە بەدەر داوای لەشاو ئیسرائیل دەکرد، تا کەناڵێکی ڕاستەوخۆ لەنێوان کوردو کاربەدەستە ئەمەریکاییەکاندا بکەنەوە، بەدەستی خۆی تەڵەکەی بۆخۆی نایەوە. شا، سەرەڕای ڕەتکردنەوەی بەردەوامی ئەمەریکا، بۆ ئەو مەبەستە دەستبەرداری ئەمەریکا نەبوو.

با بۆ ساڵی ١٩٤٦ بگەڕێینەوە، کەجارێکی تریش شەڕی سارد شای لەگرفتەکەی ڕزگارکردو ئەمەریکا لە یەکەمین قەیرانی ئەو ململانێ جیهانییەی نیو سەدەی خایاند، بۆ ڕاگرتنی مەترسی بڵاوبوونەوەی شۆرەوی لەگێڕانەوەی دەسەڵاتی شا بۆ ئازەربایجان‌و کوردستان پشتگیری شایکرد، چونکە بە پشتگیریکردنی مۆسکۆ لە هەریەکەیاندا کۆمارێك دامەزرێنرابوو. دووەم ڕووداوی گرنگ کە ڕۆڵی لەگۆڕینی سیاسەتی ئەمەریکادا بەرامبەر بە کورد هەبوو، "پەیماننامەی

برایەتی و هاوکاری"یەکەی یەکێتی شۆرەوی و عێراق بوو، کەلە ٩ی نیسانی ١٩٧٢دا لە بەغدا بۆ ١٥ ساڵ مۆرکرا. لەپڕا شا بەئاسانی کەوتە گەمەکردن بەپەڕەی کێبەرکێی نێوان دوو زلهێزەکەوە بەتایبەتی کەشۆرەوی پێشتر، پەیماننامەی لەم جۆرەی لەگەڵ هەریەك لەمیسرو سوریادا مۆرکردبوو. واشنتۆن ترسی لەوەشی لێنیشتبوو کە مۆسکۆ گوشار بخاتەسەر وولاتی عەرەبی سعودی کەم دانیشتوان و ئەو میرنشینە نەوتینانەی کەنداو، کەتوانای خۆپاراستنیان نییە. بۆیە کیسنجەر پشتگیریکردنی شاو کارکردن بەشێکردنەوەکانی ئەو لەبارەی شەڕی سارد بەپێویست دانا.

رۆژێك دوای گەڕانەوەی نیکسون لەتارانەوە بۆ وولاتەکەی خۆی، شا دای بەگوێی "عەلەم"دا کە کیسنجەر "گرنگی و ڕێز بەئارامی باروودۆخی ئێران و ئەو بەرپرسیاریەتیانەی لەکەنداوی فارسدا هەمانە دەدات". دیسان وتی کیسنجەر پێی وایە کە "شۆرەوی لەپێوەندیکردنی بەعێراقەوە تەواو پێی لێهەڵبڕیوە، بۆیە پێویستە شتێك بۆ راگرتنی بکرێت...". وەك کیسنجەر خۆی دوای چەند ساڵێك وتی "ستراتیژمان ڕوون و ئاشکرابوو، ئەویش هەروولاتێك پێوەندی بەیەکێتی شۆرەوییەوە هەبێت دەبێ لاوازبکرێت". هەربۆیە کە "شۆرەوی پێوەندی سەربازیانەی لەگەڵ عێراقدا بەست، ئیتر یارمەتیدانی کوردیش بۆ ئێمە لە جێی خۆیدابوو".

ئەمە ڕێك ئەوەبوو کە شا ئاواتی بۆ دەخواست. لەماوەی دە ساڵی ڕابردوودا ئەو یارمەتیانەی بەشێوەیەکی نهێنی لەڕێی ئیستخباراتی ئیسرائیل "مۆساد"ەوە بەکورد دەدران، ڕۆڵی لەهاندانی بەغدای بێچارەدا هەبوو کە بڕیاری بەستنی ئەم بەڵێننامەیە لەگەڵ شۆرەویدا بدات "(لەلایەکی ترەوە ئەو یەکگرتنەوەیەی مۆرکردنی ئەو پەیمانەو سەفەرێك لەسەرەفەرە نهێنییە یەك لەدوای یەکەکانی "گۆڵدا مائیر"ی سەرەك وەزیرانی ئیسرائیل بۆ تاران بەمەبەستی چاوپێکەوتنی شای ئێران هەروا ڕێکەوت نەبوو، چونکە لەچەند ساڵێکدا کاریگەریتی ئیسرائیل بۆسەر وولاتە یەکگرتووەکان و ئێران، بێحساب و بەجۆرێك پەرەی سەند، کەپێشتر ڕووی نەدابوو، مائیریش لەبەرچەند هۆیەکی خودی ئیسرائیل خۆی زۆری حەز بە یاریدەدانی بەرزانی دەکرد. مۆسکۆش بەرامبەر بەپەیماننامەکە، دەستی لەیارمەتیدانە نهێنییەکەی کورد، بۆ هێنانەدی ئۆتۆنۆمی هەڵگرت و، شاش بەشێوەیەکی ناڕاستەخۆ سوودی لێوەرگرتبوو. بەڵام شای ئێران لەو بەسەرهاتانەی کە ڕەنگە لەئەنجامی پەیماننامەکەی نێوان عێراق و یەکێتی شۆرەویدا بهاتنایە کایەوە زۆر ڕاڕابوو، دڵنیشی بەوەدا نا کەزۆر لایەنی چوون یەك لە نێوان کاریگەریتی ئەمەریکا لە ئێراندا (لەو بەهەزاران ڕاوێژکارە سەربازی و تەکنیکییە ئەمەریکاییانەی ناو ئێران)

لەگەڵ گەیشتنی ژمارەیەکی بێشوماری راوێژکارانی شۆڕەوی بۆ عێراق، کە گومان لەگەیشتنیاندا نییەو، کاریگەرێتییان لەسەر دراوسێکەی دەبێت.

بەدرێژایی سالانی شەڕی سارد، ئیسرائیل ئەو دەمانە ئەبێت کە ئەمریکاییەکانی پارێزەری و کرملین ناکۆك دەبوون، ئەگینا هیچ کاتێك ئەوەندە شادنەبووە. بەڵام بەلای نیکسون و کیسنجەرەوە، پشتگیریکردنی سیاسەتی شا، "بنەمای نیکسون"ی لەناوچەی کەنداودا، کە ناوچەیەکی وایە چاوەڕوانی تەقینەوەی لێدەکرا، بەجێ دەهێنا، ئەمە جگە لەوەی دەرگای فرۆشتنی چەکی ئەمریکای بەبڕی بلوێنان دۆلار بۆ ئێران والاکردەوە. هەموو یارمەتییەکانی ئەمریکاش بۆ کورد لەساڵانی نێوان ١٩٧٢ و ١٩٧٥دا لە ١٦ ملیۆن دۆلار تێپەڕی نەکرد کە زۆربەشی بۆ کڕینی ئەو چەکە شۆڕەویانە بوو کە ئیسرائیل لەشەڕی شەش ڕۆژەی ١٩٦٧دا دەستی بەسەردا گرتبوون. دەستگای هەواڵگری ئێرانی "ساڤاك"یش زۆر بەوردی سەرپەرشتی ئەو یارمەتیانەی بۆ بەرزانی تەرخانکرابوو دەکرد "بەرادەیەك مووچەی پێشمەرگەکان ڕیالی ئێرانی دەدران"و هەموو مانگێکیش یارمەتییەکانی ئەمریکایان بەکوردی عێراق دەگەیاند.

سەرکردەکانی کوردی عێراق ژەنەڕاڵ "نعمت الله ناسری" بەڕێوەبەری "ساڤاك"و چەند ئەفسەرێکی پایەبەرزو چاوچنۆکی ئێرانیان بەوە تاوانبارەکرد کە بەشێك لەو یارمەتیانە لووشدەدەن کە بۆیان تەرخانکراوە[24]. هەرچەندە بەشداریکردنەکەی ئەمریکا گرنگ نەبوو، بگرە لەچاوئەوەی کە شا خۆی بەپارەو خواردەمەنی و چەك و تەقەمەنی و سەرباز دەیدا شتێکی هێجگار کەمبوو، بەڵام گرنگییەکەی لەو باوەڕەی بەرزانیدا خۆیدەنواند کە زەمانەتێکی راستی ئەمریکا بۆ کورد هەیەو، ئەم خەیاڵە ترسناکەش تا دەمات زیاتر لەبیریا دەچەسپی.

سێیەم ڕووداو کەوای لەواشنتۆن کرد سیاسەتەکەی بگۆڕێت، بەدوای گەڕانەوەی نیکسون و کیسنجەر بۆ واشنتۆن ڕوویدا. بەغدا "کۆمپانیای نەوتی عێراق – ئای.پی.سی" خۆماڵیکرد کە لەمێژبوو کۆمپانیاکانی نەوتی بەریتانیاو هۆڵەندەو ئەمریکاو فەرەنسا خاوەندارێتیاندەکرد. ئەمە لەکاتێکدا خەریکبوو ناوی "رێکخراوی وڵاتانی نەوت بەرهەمهێن –ئۆپیك–" لەسەرتاپای جیهاندا دەنگی دەدایەوە، هەنگاوێکی گرنگی ئەهێشتنی بالادەستێتی کۆمپانیا نەوتییە خۆرئاواییەکانبوو لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا. بەم پێیە خۆماڵیکردنی "کۆمپانیای نەوتی

---

[24] تاوانبارکردنی ئێرانییەکان بەدەستپیس، بۆئەو خوتەیەکی بەردەوامی کوردبوو، لەبەهاری ١٩٩١دا دووبارە بۆوە، ئەویش کەسەرکردەکانی پێشمەرگە، ئەفسەرە ئێرانییەکانیان بەوە تاوانباردەکرد کە خۆراکی چاك و ئەو جلوبەرگەی لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییەوە بۆ کورد تەرخانکرابوو، ئەوان بۆ خۆیان دەخستەلاوەو، لەبەریان هەمانجۆر شتی خراپیان دەدانێ.

عێراق"، بیانوویەکی دی رێککەوتننەکەیانی بۆ هەریەک لەئێران و بەرزانی و وولاتە یەکگرتووەکان هێنایە ئاراوە، بەتایبەتی هەریەکە هۆی تایبەتی خۆیانیان هەبوو کە لەسەرکەوتن و چوونە ناوەوەی یەکێتی شۆرەوی بۆ ناو یەکێك لەگەورەترین وولاتی بەرهەمهێنی نەوت لە خۆرهەلاتی ناوەڕاستدا بترسن.

لەسەرو هەموویەوە ئەم سیاسەتەی ئەمەریکا ئەمەندە شوێن گومانبوو کە بەرهەلستکارانی بەڕێوەبەرایەتی ئەمەریکا، زیاتر لەوەزارەتی دەرەوەشدا بەشداریکردنی مادی ئەمەریکایان بەرزویی لای رۆژنامەکان دركاند، (ئەمەش وەزارەتی دەرەوەی ئەگەیاندە ئەو ئاستەی کەلای دیپلۆماتە واقوڕماوەکانی خۆی نکوڵی کردنەکەیان سەبارەت بە هەرپێوەندییەك کەلەگەڵ کورددا هەیانبێت ولێیبهێنێت. بۆ نموونە واشنتۆن "تۆماس کارولان"ی بەرپرسی سیاسی ئەوسای سەفارەتی ئەمەریکا لە بێروت دەمکوتکرد، کەسەردتا -بەرلەهەلچوونی و بێزهاتنەوەی- تەواو پەشۆکابوو، بەتایبەتی کەسەرچاوە ئاگادارەکانی خۆی بەلگەو زانیاری تەواویان سەبارەت دەستتێکەلکردنی "CIA" ی تارانیان لەگەڵ کورددا خستبووە بەردەمی). خواستی نیکسون لەبەنهێنی گرتنی رووداوەکان بە رادەیەکبوو کە "جۆن.ب.کونالی" وەزیری خەزێنەی بەناوێکی نهێنییەوە لەواشنتۆنەوە نارد بۆ تاران تا شا لەدەستپێکردنی بەردەوامی پرۆژەکە دڵنیا بکات. بەپێی راپۆرتەکەی "پایە" کۆبوونەوەکەی مانگی حوزەیرانی شاو ئەو دیپلۆماتە تەکساسییە لەنێشی نێوان دوو بازرگانی نەوت دەچوو.

دوای گەڕانەوەی "کونال"بۆ ئەمەریکا، ئەوەی هەبوو بەکورتی بە "کۆمیتەی چل"ی کۆنگرێس، کەچاودێریکردنی ئەرکە سیخوڕیتییە نهێنییەکانی پێسپێردرابوو، راگەیاند. هەرچەندە کۆمیتەکە داوای نەکردبوو گرنگیشی پێنەدابوو، تەنانەت ئەو کورتەیەشی کە ئاسایی لەدوو سێ لاپەڕەیەکدا بۆ قسەلەسەرکردن ئامادە دەکرێت نەدرایە ئەندامەکانی واتە هیچ مشتومڕێکی لەبارەوەنەکراو نەشخرایە دەنگەوە. لەبری ئەوە، بەگوێرەی "راپۆرتەکەی پایك" (پێیان راگەیەنرابوو کەدان بەوەرگرتنی تەنیا پەرەگرافێکی زۆر کورت، کەچەند زانیارییەکی پەرشوبلاوی تێدابوو بنێن، هەرئەوەندەشیان لەئەندامانی کۆمیتەکە دەویست کەبزانن کارێکی وا هەیە). چوار ساڵ دوای ئەوە لێکۆڵەرەوەکانی کۆنگرێس لەکاتێکدا ناو ئەو فایلە سیخوڕییە تایبەتانە دەگەڕان کە بەو کارە نهێنیانەوە بەندبوو، بەلگەنامەتایبەتییەکانی ئەم کارەیان دییەوە کە یاداشتێکی نهێنی سەرەکی بە نیمزای کیسنجەریان لەئاودابوو.

هەر لەسەرەتاوە بەرزانی دەیویست بۆ باسکردنی ئەم کارە لەگەڵ لێپرسراوانی سەرەکی بەڕێوەبەرایەتی ئەمەریکادا، بچێتە واشنتۆن. هەرچەندە باوەڕێکی کوێرانەی بەوولاتە

یەکگرتووەکان هەبوو، بەڵام لەژیان و ناسینی خەڵکیشدا ئەوەندە شارەزایی هەبوو کە چاوی بەهەرکەسێك بکەوتایەو راستەخۆ لەگەڵیدا بدوایە رای خۆی لەبارەی ئەوکەسەوە لادروستدەبوو. بەڵام کیسنجەر، بەربیانووەی ئەوەك سەفەرەکەی ئاشکرابێت و کارەکە تێك بدات، داواکەیی رەتکردەوەو ڤیزەی نەدایە، ئەمە یەکەمین رەتکردنەوەی زنجیرە داوایەکی تری لەوبابەتەی بەرزانی بوو کە بەڕێوەبەرایەتی ئەمەریکا لەبەرئەو هۆیە بەچاوپێکەوتنی بەرزانی قایل نەبێت. هەرچەندە بەرزانی لەکاری نهێنی و باروودۆخەکەیاندا شارەزایی تەواوی هەبوو، بەڵام چاوی لەم سوکایەتیپێکردنەپۆشی و بەبێ هیچ مشتومڕێك پێی قایلبوو. لەتەموزی ئەوساڵەدا، "ئیدریس"ی کوڕی و دوکتۆر مەحمود عوسمان، کەبەوەزیری دەرەوەی دادەنرا، نزیکترین کەسی دەری خێزانەکەی بوو نارد بۆ واشنتۆن، لەبارەگای ((سی ئای ئەی)) لەلانگلی – ڤرجینیا– لەلایەن هیلمز و ژەنەڕاڵ ئەلیکساندەر ئێم هەیگ جونیوری سەرۆکی ئەرکانی کۆشکی سپی و کۆلۆنێل ڕچارد کندی یاریدەدەری سەرەکی کیسنجەر لەئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی پێشوازیکران.

هیلمز چەپکە گوڵی ئەخستە بەردەممان، وەك دوکتۆر عوسمان دەیگێڕێتەوە "زۆر بەڕوونی پێیوتین کەئەو هەرلەبەر ئەوەی شا دەیەوێت حکومەتی ئەمەریکا یارمەتیمان بدات بۆیە پێشوازیمان دەکات" و "هەر لەبەرئەوەبوو واشنتۆن یارمەتیدەداین و تا شاش لەسەر ئەو سیاسەتە بمایە وڵاتە یەکگرتووەکان لەیارمەتیدانماندا بەردەوامدەبێت. من خۆم هیچ بەوە خۆشحاڵ نەبووم. هەرلەبەر ئەوەی بەرزانی ناردبوومی چووبووم بۆ واشنتۆن، ئەوەی پێم سپێردرابوو بردمەسەر. بەڵام پێموانەبوو پێوەندیکردنیان پێمانەوە بەڕاست بووبێت، چونکە دەمزانی بەلای ئەمەریکاییەکانەوە شا کلیلی کارەکەیەو خۆیان بەتەواوەتی نەکەوتوونەتە ناوی.

هیچ گرەنتییەکمان نەبوو، من خۆم زۆر گەشبین نەبووم)) بەڵام بەرزانی هەر هیچ نەبێت سەرەتا گەشبینبوو، چونکە دوای ١٠ دانە ساڵی ڕەبەق پێوەندی لەگەڵ کاربەدەستە ئەمەریکاییەکاندا کرد، کەپێی وابوو ئەو ئەمەریکاییانەی لەگەڵیاندا کۆبەبووەوە، بەڕۆژنامەنووسەکانیشەوە کاربەدەستن و بە بەرگێکی ترەوە خۆنیشاندەدەن[25]، پێوەندییەکە چەند لاوازیش بوایە پێی گرنگ نەبوو.

---

[25] ئەم گومانەی بەرزانی لەخۆوە نەبوو، لەساڵانی شەستدا ئیسرائیلییەکان ... بوسکردنی پێوەندی لەگەڵ بەرزانیدا، رۆژنامە نووسیان بەکارهێنا لەوەزیاتر "سی ئای ئەی"ش بۆ ...رکردن لەگەڵ کوردی ئێراندا رۆژنامەنووسی ئەمریکایی و بیانی بەکارهێنا.

ڕۆژنامەنووسە خۆرئاواییەکان و میوانەکانیشی، لەو باوەڕەدابوون کە بەرزانی هیچ بایەخێکی بەکەوتنە زەلکاوی ئەو جەنگە ئایدۆلۆژییە جەرگبڕەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ناو ڤێتنام، کەببووە جێی بێزاری و ناڕەزایی زۆر لەنەتەوەییەکانی دونیای سێیەم و زۆربەی دانیشتوانی ئەمەریکا خۆشی، نەدابێت. دوکتۆر سامی عەبدولڕەحمان کەیاریدەدەرێکی سەرەکی ژەنەڕاڵ بەرزانی بوو دەڵێت "مەلا مستەفا لەناخییەوە ئەمەریکاییەکانی خۆشدەویست". ئەم ئەمەریکا پەدڵبوونەشی بەوەوە بەندبوو کە ۳۰ ساڵ لەوەبەرو لەشەوی سەری ساڵی ۱۹٤۷دا، چاوی بە "ئارچی ڕۆزڤلت"ی یاریدەدەری پاشکۆی سەربازی ئەوسای سەفارەتی ئەمەریکا لەتاران کەوت. تا ئەمڕۆشی لەسەربێت کوردەکان لەو هۆیانە دەپرسنەوە کەبەرزانی والێکرد بەتەواوەتی بەلای وڵاتە یەکگرتووەکاندا بکەوێتەوەو بگرە پەرلەمەیەکی واش پێی شابێت کەخۆی و گەلەکەی بەوە قایلبکات کە واشنتۆن زەمانەتێکی تەواوی ڕاستێتی پلانەکانی شایە، ئەگەرچی دژە بەڵگەکانی ئەم بۆچوونەش ئاشکرابوون پەرەی دەسەند.

پێدەچێ بەرزانی قوربانیی بۆچوونە لاوازەکانی‌خۆی بووبێت، چونکە پیاوێکی هێندە ڕۆشنبیرنەبوو کەناسۆیەکی فراوانی هەبێت، مەودای بیروبۆچوون و زانیارییەکانیشی لەبارەی سروشتی گەلەکەیەوە ئەوەندە بەرتەسکبوون، کەوای لێبکەن چارەنووسی گەلەکەی بەسیاسەتی دەوڵەتێکی زلهێزی وەوە ببەستێتەوە کەئەگەرچی بایەخ بێت پێیداداتو دوای بیرکردنەوەیەکی زۆریش بڕیارێکی وا بدات کە خزمەتی یەکێک لە هاوپەیمانە سەرەکییەکانی خۆی لەسەر حسابی کورد بکات. بەچاوپۆشین لەهەموو هەڵەو ئاڕەوانییەکانی بەریتانیاو تورک و عەرەب و ئێرانییەکان، مەلا مستەفایان فێری ئەوە کردبوو کە ماوەی دەیان ساڵ بزانێت چۆن چۆنی ڕەفتاریان لەگەڵدا بکات و، شتە ئاڕەوانکانیشیان هەرچۆنێك بووبێتن، ئەدەگەیشتنە ناهەموارییەتەکانی ئەو ئەمەریکایەی کەبەدرێژایی ئەو هەموو ساڵە وێنەیەکی نموونەیی لەبارەیەوە پێکهێنابوو. بەم پێیە هەڵە سەرەکییەکەی بەرزانی، لەکامڵ نەبوونی سیاسیانەو کەم تێگەیشتنی لەسیاسەتی نێودەوڵەتیدا خۆی دەنواند، ئەویش لەکاتێکدا کە کیسنجەر لەساڵی ۱۹٦۸ەوە وەك کۆپییەکی هاوچەرخانەی سیاسەتی واقعی مێتەرنیخ بوو – کە کڕیار دەبێت لە چاکی شتەکەی وردبێتەوە[٢٦] بەڵام ئەو پرسیارەی هەر بەکراوەیی دەمێنێتەوە چۆن سەرکردەیەکی کارامەی خاوەن ئاقیکردنەوەی وەك بەرزانی، کەبەسەر چەندین ناهەموارێتیدا زاڵبووە، کە دەریەدەرییەکەی بۆ یەکێتی شورەوی یەکێکیانە، وا بەئاسانی و، بێئەوەی وەك دەردەکەوێت،

[26] مێتەرنیخ لەسەدەی نۆزدەیەمدا ڕاوێژکاری نەمسا بوو، ڕۆڵێکی باڵای لەسیاسەتی ئەورووپادا بینی- (وەرگێڕ).

بزانێت کە زلهێزەکە لەوانەیە لەسەر حسابی ئەم بەرژەوەندی تایبەتی خۆی بپارێزێت، کەچی بڕوا بەزلهێزێکی تر بکات؟. بەڵام تاقیکردنەوەی بەرزانی، گەلێك پرسیاری لای ئەو خەڵکە دەوورووژاند کە باوەڕیان نەدەکرد کە چۆن دەبێت بەرزانی لەم پیلانەی ئەمەریکا تەواو وورد نەبووبێتەوە؟ ئەو بیانیانەی سەردانی بەرزانیانکردووەو باشیان ناسیوە، باوەڕیان نەدەکرد کەبەو جۆرەی خۆی نیشاندەدا ئەوەندە سادەلکەبێت، ئەوان وایان پێشبینیدەکرد کە، هەر بۆ نموونە کاتێك پێشنیاری ئەوەی دەکرد کوردستانی عێراق ببێتە پەنجاویەکەمین ولایەت یان نیوەی بیری نەوتی کەرکوك بەکۆمپانیا نەوتییە ئەمەریکاییەکان بدرێت، هەڵوێستێکی تەکتیکی بەکاردەهێنا. بەڵام ئاشکرایە کەسەلەری زۆری نەکردووەو، بێجگە لە یەکێتی شورەوی، رۆمانیا، ئێران، ئیسرائیل هیچ شوێنێکی دی نەدیوە، کورسی سەبارەت بەجیۆپۆلیتیك وەرنەگرتووە، کەچی دوای دانیشتنیان لەگەڵ بەرزانیدا، بە یەکێك لەڕەقترین سەرکردە نەتەوەییەکانی دونیایان دادەنا کەبینیبێتیان و، بەخاتوو مائیر"مائر"یان دەشوبهاند، کەوەك ئەو بۆ ماوەی نیو سەدەو لەبارودۆخی زۆر ناهەمواردا بەسەر گەلێك چەرمەسەریدا زاڵبیوو.

خۆنەگەر واشی دابنێین کەبەرزانی لەو مەترسیانەش بەئاگابوایە کەلەئەنجامی تێکەڵبوونی بەوولاتە یەکگرتووەکانەوە سەریهەڵدەدا، بەڵام خۆ بەهاتنی سالی ۱۹۷۲ دەکرێ بڵێین دەبوا بەناچاری ملی بۆ ئەم سیاسەتەی بدایە چونکە هیچ چارێکی تری نەمابوو. ئەو بارودۆخە چاکەی مۆرکردنی رێککەوتننامەی سالی ۱۹۷۰ی ئۆتۆنۆمی هێنابوویە ئاراوە، زۆری نەخایاند. لەگەڵ بەهاری ۱۹۷۲دا و لەو هەوڵەوەکەبۆ کوشتنی بەرزانی درا، ئیتر مەلا مستەفا بڕوا بەوە بێنێت کە پارتی بەعسی خاوەن دەسەڵات نایەوێ رێز لەرێککەوتننامەی ئۆتۆنۆمییەکە بگرێت. بۆیە لەبری ئەوەی دەست بە سەرژمێری دانیشتوان بکەن کە لەدەقی رێککەوتنەکەدابوو، دەستەڵاتدارانی عێراق کەوتنە راگوێزانی کورد لەکەرکوك و شوێنە نەوتیە گرنگەکانی دی و، لەبریان خێزانی عەرەبیان تیادا نیشتەجێکردن و بەپیترین خاکی کشتوکاڵی کوردیشیان دانێ.

بێگومان رێکی بەرزانی لەگەڵ شاو ئەمەریکاییەکاندا رۆڵی خۆی لەبەدەنگەوە چوونەکەی عێراقی سالی ۱۹۷۳دا هەبوو کەپێشنیارێکی نوێی بۆ بەشکردنی داهاتی نەوتی کەرکوك لەنێوانیاندا کرد، بەرزانی یەکسەر ئەم داوایەی رەتنەکردەوە، بەتایبەتی کەچەند کوردێك هەوڵیان لەگەڵدا دا تا سوود لەو دەرفەتە ببینێت، دواییش ئەوانە پێیان وابوو کەرێککەوتنەکە بەهەموو کەموکورتی و کەلەبەرەکانیشییەوە لە شکستەکەی ئازاری ۱۹۷۵ دەیپاراستن و لەشەڕەکەی عێراق و ئێرانیشدا دوورە پەرێز دەبوون. بەڵام بەرزانی فشاری زۆرو بەردەوامی شای لەسەربوو تا بەو پێشنیارە نوێیەی عێراق قایل نەبێت، ئەگەرچی چەند داوایەکی کوردیشی

هێنابووە دی و بەرزانیش تا دواسات لەپەتکردنەوەیدا دوودڵبوو. بەڵام بەغدا کەلەمانزاری ١٩٧٤دا ڕێککەوتنامە ئۆتۆنۆمییەکەی بەرتەسک کردەوەو بڵاویشیکردەوە کە کورد بییەوێت یان نا لەماوەی دوو هەفتەدا جێبەجێدەکرێت، بەوە بۆ بنبەستکردنی کارەکە زارەکە هەڵدرا، ئیتر لەوساتەشەوە هەردوولا کەوتنەخۆ، چونکە دەیانزانی شەڕەکە لەهەڵگیرسانەوەدایە.

بەرزانی ئەلەپێش و ئەیەکسەر لەکاتی هەرەسی ڕاپەڕینەکەی ١٩٧٥دا و نە دوای ئەویش، نەیدەهێشت هیچ کام لەیاریدەدەرەکانی خۆی لەبڕیارداندا بەشداری بکەن. بەرزانی بەو هیوایەی بەڕێوەبەرایەتییەکەی جیمی کارتەر بۆ پشتگیریکردنی کێشەی نەتەوەکەی ڕابکێشێ، تا کانوونی دووەمی ١٩٧٧ کە ئاهەنگی دانانی سەرۆکی نوێی ئەمەریکای تیادا کرا بەبێدەنگی مایەوەو بەئاشکرا بەرگری لە کێشەکەی نەدەکرد. بەرزانی لەمانگر ـوباتی ئەو ساڵەدا، کەلەدوای هەرەسەکەو ڕسوابوونی خۆی، لەئاوارگەی ناوچەیەکی نزیک واشنتۆن بوو، بەدەم شێرپەنجەی سییەوە دەیناڵاند کە تەواو زەیفی لێسەندبوو، دەکبینە نامەی بۆ سیناتۆرەکان و ئەندامانی کۆنگرێس ئەنارد، تیایاندا ئەوەی یەکلادەکردەوە، گەر یاسادانەرانی ئەمەریکا لەو پاشقولە ئاگاداربوونایە کەلە ڕێککەوتننامە سەرەکییەکەی ساڵی ١٩٧٢ی نێوان بەڕێوەبەرایەتی ئەمریکاو خۆی گیرا ئەوا یان دژی دەوەستان، بەوەش لێدەگەڕان کە ئێمە سەربەستانە یەکێک لەو ڕێگایانەی بەردەستمان بگرتایە، یان ئەوەتا پەسەندیاندەکردو ئەوساش نەیاندەهێشت ئەو ناپاکییەی لەکورد کرا ڕووبدات. لەنامەیەکی تری هەمان مانگیدا بۆ کارتەر دیسانەوە جەختی لەسەر تەنیا بەڵێنانەی ئەمەریکای ساڵی ١٩٧٢دا بۆیانی دەکرد کە وایان لێکرد ڕێککەوتن لەگەڵ بەغدادا نەکات، چونکە ڕێککەوتنەکە "لەبەرژەوەندی ئەمەریکادا نەدەبوو گیروگرفتی بۆ دراوسێکانی عێراق بەرپا دەکرد .. ئەوسا گەر بڕوام بە بەڵێنەکانی ئەمەریکا نەکردایە، دەمتوانی گەلەکەم لەو ئەهامەتییە بپارێزایە کە بەسەریهات" دەشڵێت پەیمانەکانی باڵادەستانی ئەمەریکا قایلیانکردنی ئێران و وڵاتە یەکگرتووەکان ئۆتۆنۆمی بۆ کوردو دیموکراتییەت بۆ عێراق دابیندەکات. ئەم قسانەی بەرزانی، ڕاستبن یان نا، لای زۆربەی کوردە عێراقییەکان ببوونە ڕاستییەکی تەواو.

گەر بەووردی سەرنجی ڕووداوەکان بدرێن، ئەوا دەکرێ مۆرکردنی پەیماننامەی ١٩٧٢ی دۆستایەتی نێوان یەکێتی شۆرەوی و عێراق بەوەرچەرخانێکی گرنگ و بنبڕ دابنرێت. بۆ یەکەمجارە بەغدا بەپێی پەیماننامەکە، دەستی لەو چەک و پێویستییە سەربازییە گرنگانە گیردەبوو کەپێشتر نەیبوون. پەیماننامەکە بەرزانیشی بەرەو تەڵەکەی ئێران و وڵاتە یەکگرتووەکان بۆیان نابۆوە بەکێشکرد. هەر کە ڕێککەوتننامەکە مۆرکرا ئیتر مۆسکۆ یارمەتی

خۆی لەبەرزانی بڕیو ژمارەیەکی زۆریش فڕۆکەی جەنگی مووشەك هاوێژو تۆپی دوورهاوێژو کۆپتەرو چەکی تری نوێی بەعێراق دا. یەکێتی شوورەوی کەسالی ١٩٦٣ کێشەی "کورد قڕان-جینۆسساید"ی ناو عێراقی لە نەتەوەیەککرتووەکاندا وورووژاند، ئێستا پێوەندییەکانی خۆی بەدونیای عەرەبەوە بەگشتیو بەووڵاتێکی عیلمانی بەنەوت دەوڵەمەندی وەك عێراق بەتایبەتی پتەوکردووە. شیوعییە عێراقییەکان کوردێکی زۆریان تیادا بوو، بۆیە کەپشتگیریی دەستەڵاتدارانی عێراقیانکرد ئیتر تەریکبوونەکەی بەرزانی هێندەی دی زیادیکرد. پێدەچوو هەر کەبەغدا دەستی لە کۆپتەری سەربازیانەگیربوو، ئیتر شەڕی پارتیزانی برەوی نەمێنێت.

پێدەچوو لەم هەلومەرجەدا یاریدەدانەکەی ئەمەریکا بۆ کورد لەوەیان باشتربێت کە بەتەنیا پشت بەشای ئێران ببەستن. بەهەرحاڵ، بەرزانی بەهۆی یارمەتییەکانی رابردووی شا وەو لەساڵی ١٩٦١ەوە ناوەناوە دەستی بەسەر ناوچەیەکی بەرینی باکووری عێراقدا دەگرتو، خۆی وتەنی لەبەردەم پێنج ڕژێمو حەوت حکومەتی یەك لەدوای یەکی بەغدادا راوەستا. بەڵام هەندێ لە کوردەکان پێیان وایە کەبەرزانی لەساڵی ١٩٧٢ەوە وەك قومارچییەك، تەنانەت گەر بۆ پیاوێکی تەمەن شەستو هەشت ساڵانی لەش ساغو بیرتیژی وەك ئەویش بێت، هەستی بە کۆتاییهاتنی یارییەکە کردبوو. جا ئەگەر شتەکە بەڕاستی وابووبێت ئەوا بەهەموو ئەو کەموکورتیانەی دوکتۆر عوسمانیشەوە، کەلەکاتی سەفەرەکەی واشنتۆنی تەمووزی ١٩٧٢دا بەبیریا هاتبوون ڕەنگە سەرئەنجام ڕۆڵی ئەمەریکا بە بەرژەوەندی کورد بشکایەتەوە. لەساڵی ١٩٧٣دا بەرزانی بە "جیم هوگلاند"ی پەیامنێری "واشنتۆن پۆست"ی ئەمەریکایی وتبوو: "ئێمە بڕوا بە شا ناکەین" بەڵام "من بڕوام بەئەمەریکا هەیە، چونکە ئەمەریکا وڵاتێکی لەو گەورەترە کەناپاکی لەگەڵ گەلێکی پچووکی وەك کورددا بکات".

لەمانگی ئازاری ١٩٧٥دا دانی بەقەبەیی هەڵەکەیدا نا، ئەو هەڵە گەورەیەی کە سەرجەم دەستکەوتەکانی ژیانیان بۆکردە سووتو. کاتێك "هۆگلان" بۆ گەیاندنی هەواڵی هەرەسی کورد سەردانی کوردستانی کرد، بەرزانی پێڕاگەیاند "حکومەتی ئەمەریکا هیچ زەمانەتێکی رەسمی نەدایینێ؛ بەڵام ئێمە لەو بڕوایەدابووین کە هەرگیز دەستمان لێبەرنادات". لەقسەکانیدا بەردەوامبوو "ئێستا هەستدەکەین چەنێك هەڵەبووین". بڕوای زۆری بەرزانی بەووڵاتە یەککرتووەکان، لە سەرێکەوە بەهۆی ئەو هەموو ئەشکەنجەو ئازارەی پانزە ساڵی تاراوگەیی یەکێتی شوورەوییەوە، کەهیوای بەهیچ شتێکی ڕووس پێنەهێشتبوو، لەسەرێکی تریشەوە، کاریگەرێتی شێخ ئەحمەدی برا گەورەی، کە ئامۆژگاری زۆری دەکرد تا هەوڵی پێوەندیکردن بەئەمەریکاوە بدات. موحسین دزەیی یاریدەدەرێکی گەورەی بەرزانی ئەوەی یەکلایەکردەوە کە

"بەرزانی لەو بڕوایەدابوو کەلەخۆرهەڵاتی ناوەڕاست، یان زۆربەی دونیاشدا، هیچ شتێك بەبێ پشتگیریکردنی وڵاتە یەکگرتووەکان ناکرێت". دوکتۆر عوسمانیش جەختی لەسەر ئەوەدەکردەوە کە "ژەنەراڵ بەرزانی، پێی وابوو وڵاتە یەکگرتووەکان زلهێزە سەرەکییەکەی دونیایە. دەریشکەوت لەو ڕووەوە راستیکرد".

تادواکات، باسکردنی تەواوی ڕادەی خۆبەستنەوەی ئەمەریکا بە کوردەوە زۆر بەنهێنی مایەوە، ئەندامانی خێزانی بەرزانی و چەند یاریدەدەرێکی گەورەی لێنەرچێ کەسی دی نەیدەزانی. بەڵام لەناوەندە کوردییەکاندا واباوبوو کە جۆرە پێوەندییەك لەگەڵ ئەمەریکادا هەبێت. مێژوونووسێکی کورد پێی وابوو "ئەوی راستی بێت، هیچ سیاسییەکی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، پێشبینییەکی وای بۆنەدەکرا، کەشا بێپرس و ڕاوەرنەگرتنێکی پێشەکی وڵاتە یەکگرتووەکان، لەکوردستاندا خۆی بخاتە ژێرباری پرۆژەیەکی مالی و سەربازیانەی وا گرنگەوە". لەیەکەم ئیوارەی شەڕدەستپێکردنەوەکەی ئازاری ١٩٧٤ی نێوان کوردو هێزەکانی بەغدا، هەتا ڕۆژبوونەوە چەند کادرێکی کوردی پارا، سەبارەت بەزەمانەتکردنە دەرەکییەکان، وتووێژێکی زۆریان لەگەڵ بەرزانی و نزیکەکانیدا کرد. بەرزانی و ئیدریسی کوڕی و دوکتۆر مەحمود، لەدووپاتکردنەوەی زامنێتەکە بەولاوە هیچ شتێکی تریان بەدەستەوە نەدەدا. هیچ کامێکیشیان خۆی بەگوێ لێگرتنی ئەو داوایانەوە ماندوو نەدەکرد کەبۆ وریابوون و بەئاگاییان لێیان دەکرا. بەرزانی، تا بەتەواوەتی کات بەسەرچوو، هەر لەو بڕوایەدا بوو کەوڵاتە یەکگرتووەکان "وەك زلهێزێك، کەبەپێوەندیکردنمان ئاپلبووە، ناتوانێت دەستمان لێبەردات". لەو نامەیەی ساڵی ١٩٧٧یشیدا کەبۆ کارتەری نووسی، بەرزانی ناڕاستەوخۆ دانی بەوەدا نا کەهیچ زەمانەتێکی نووسراوی ئەمەریکا بۆ کورد نەبووە. لەبڕگەیەکیدا دەڵێت، کەکورد "خۆیان بەو بەڵێنە زارەکیانەی وڵاتە یەکگرتووەکان و ئێران دابوویاننێ، بەستەوە". لە بڕگەیەکی تریشیا وتبووی، کورد "بڕوایان .. بەپێتەوی بەڵێنەکانی ئەمەریکا هەبوو، جا بەزارەکی بوونایە یان بەنووسراوی".

بەڵام بەرزانی زۆرچاك دەیزانی کە ڕێککەوتنی زارەکی وەك بەڵێنی نووسراو نییە. لەکۆمەڵگەیەکی وەك وڵاتە یەککگرتووەکاندا کە بڕوایان بەپارێزەرە. خۆ بەستنەوەیەکی نووسراو ڕەنگە ئەوەندە هانی بەڕێوەبەرایەتییەکەی بدایە، کە هەر هیچ نەبێت، تاخۆی لەئاشکرابوونی بەڵێن نەبردنە سەرەکەی و، شەرمەزارێتییەکەی بپارێزێت، دوورنەبوو بەڕاستی خۆی بەڵێنەکەیەوە ببەستێتەوە. بەڵام واش، کارەکە هەر چەنێکیش تەواو بوایە، بەتایبەتی لەم سەدەیەی کەزۆر گەورە پیاوانی ئەم دونیایەمان بینیوە، چاکترین پەیماننامەی لەئاستی

ووردترین یاسادا شەڕو وەرکردووە، بۆیە پرسیاری داخۆ بەڵێننامەیەکی نووسراو، شای لە کوردەکان ڕادەگرت؟ دێتەکایەوە، نەبوونی هیچ پەیماننامەیەکیش کەلایەنەکان پێوەی بەندبن، لەلایەك بۆ ئارەزووە "مێتەرنیخ"ییەکانی کیسنجەر دەگەڕایەوە. تا کارەکانی خۆی پێداپۆشێ و، لەلایەکی تریشەوە، بۆ ئەوپەڕی خۆشباوەڕی بەرزانی دەگەڕایەوە، کەوایدەزانی هاتنەدی خواستەکانی بوونەتە ڕاستییەکی چەسپاو. بەڵام بەرزانی لەوەدا هێندە بەهەڵەداچووبوو کەبەسەرئەنجامێکی دڵتەزێن شکایەوەو، ئەوەندەش ژیا کەدان بەناهەموارترین هەڵەی ژیانیدا بنێت. تووشی ڕسوایییەکی زۆرهات، ناچاربوو دواساڵەکانی تەمەنی بەئاوارەیی لەئێران و وڵاتە یەکگرتووەکاندا بەسەربەرێت و، نەشتوانێت پەردە لەڕووی ناپاکیکەرانیدا هەڵماڵێت و تاوانباریان بکات. لەدواڕۆژانی ژیانیشیا لەوەندە زیاتر کەبەتەوسەوە بڵێ:" بەهیوام دواڕۆژانی تەمەنم لەپەکێن بەسەربەرم، تائەوسا چیم هەیە لەبارەی شۆڕەوی و ئەمەریکاوە بیانڵێم"، هیچی تری بۆ نەمابۆوە. بەهەرحاڵ بەرزانی، وەك تاکە سەرکردەیەك، کە ١٠ ساڵی ڕەبەق لەیەکێتی شۆرەویدا بەسەربەرێت و، ناوی لە سەر لیستی مووچەی "سی.ئای.ئەی"هەبێت و، هەریەك لەستالین و شای ئێران، بەر لەدەست لێبەردانی، سوودیان لێوەرگرتبێت، جێگەیەکی تایبەتی لەکتێبی "گینیس"ی ژمارە نموونەییەکانی دونیای سێدا هەیە.

بەڵام کەسێتی بەرزانی و حوکمدانی ئەو حکومەتانەی بۆ مەرامی خۆیان بەکاریان دەهێنا، بەشێکی سەرەکی گەمەیەکی نموونەیی زلهێزەکانە بەکەمایەتییەکی تەریك و بێچارە. تێڕوانینە ساویلکەییەکەی بەرزانی بۆ وڵاتە یەکگرتووەکان، واشنتۆنی سەرسامکردبوو، بۆیە واشنتۆن پێی وابوو یان گومان لێکراوە یان بایەخی پێنەدەن. بیست ساڵ دوای ئەوە، کیسنجەر کەبەرگری لەخۆی دەکردپێیوتم: "تێناگەم چیدەگوترا"خۆ ئەگەر بیزانیبا بەرزانی چەند لایەنگری وڵاتە یەکگرتووەکان بووە وای نەدەووت، بەڵام دیارە هەرگیز لەوە نەگەیشتووە. هیلمز، ڕەنگە هەر لەسەرەتاوە هەستیکردبێت کە لەگەڵ کورددا ڕاستگۆیە، بۆیە لە جۆرو ئاستی پێوەندیی وڵاتە یەکگرتووەکانی تێگەیاندبوون، وتی هەرکەسێك پێوەندییەکی بەمەسەلەی کوردەوە هەبووبێت، لەگەڵ بەرزانیدا، کەهەموو ژیانی لەپیلانگێڕی و شۆڕشدا بەسەربردووە، وەك "گەنجێکی کامڵ" ڕەفتاری کردووە. لەبەرامبەریشدا نەتەوەییە کوردەکان "ئەوانەیان نەبێت کەلە مەلا مستەفا خۆیەوە نزیکن"، پێیان وابوو بەرزانی بەبێ زەمانەتێکی ڕەسمی ئەمەریکا نەدەکرا لەئازاری ١٩٧٤دا شەڕبکاتەوە جا با زەمانەتەکانی ئەمەریکاش لەوپەڕی بەهێزی و جێگای خۆیاندا بونایە، خۆ گیروگرفتی وا دەهاتنە ئاراوە، کەهیچ حسابێکیان بۆ نەکرابێ.

ڕێبازێکی وا لەئارادانەبوو کەبەرزانی ڕابگرێت و، واشی لێبکات هەڵوێستی بگۆڕێت. هەرئەوەندەی شەڕی نێوان کوردو هێزەکانی بەعس هەڵگیرسایەوە، ئیتر ژەنەڕاڵ ئەندریە گریچکۆی وەزیری بەرگری شۆرەوی، کە لەڕۆژگاری ئاراوگەییەکەیدا بەرزانی ناسیبوو، هەرکەهەستی بەنزیکبوونەوەی ڕوودانی کارەساتێکی ڕاستیکرد، تا یارمەتی حکومەت بدات لەدۆزینەوەی چارەسەرێکی نێوان حکومەتی بەعس و کوردا، بەفڕۆکە بەرەو بەغدابۆوە. بەڵام بەرزانی بەهاندانی تاران و واشنتۆن نەچوو بەدەنگییەوە. سەدام حسێن لەشەوی دەستپێکردنەوەی شەڕداو، لەکۆبوونەوەیەکی بەغدایدا، بەشکردنی نەوتی کەرکوکی دووپاتکردەوە. بەڵام ئیدریسی کوڕی بەرزانی. ئەوەی ڕەتکردەوەو وتی:"ئێمە لەوە بەهێزترین کەبیری لێدەکەیتەوە، ناچاریشتدەکەین بەهەموو داواکانمان قایلبی" سەدام حسێنیش پیاوی ئەوەنییە لەهەڕەشەی کەس بێدەنگ بێت، بەهەڕەشە وەڵامیدایەوە" "ئەگەر شەڕ ببێتەوە ئەوا ئێمە دەیبەینەوە". ئەوساکە سەدام هەرتەنیا چەکی پێشکەوتووی شۆرەوی شکنەدەبرد، بەڵکو دەشیزانی کەشا پێ لەسەر دەستبەسەرداگرتنی "شەتولعەرەب"، کەبەندەری نەوتی عەبادانی ئێران و بەندەری بەسرەی عێراق بەکەنداوەوە دەبەستێتەوە، دادەگرێ.

لەساڵی ١٩٣٧دا، چونکە بەریتانیاییەکان لەئیمپراتۆرییەتی عوسمانییەوە مافی سەروەری ئەولایان بەسەر دەریاکەدا بۆمابۆوە، عێراقیان قایلکردبوو کە لەبەندەری خوڕەمشەهرو عەباداندا هەڵکردنی ئاڵای ئێران و چەند مافێکی کەم بەو کەشتیانە بدات کەلێیان ڕادەوەستان. بەریتانیاییەکان لەوەدەترسان پێداچوونەوەی ئەو بارە، ببێتەهۆی ڕێگرتنی کەشتییە سەربازییەکانی خۆیان و نەهێڵن بگەنە پاڵاوتەکانی عەبادانیان، کە دەکەوێتە بەری ئێرانی ئاوچەی تێڕژانەکەوە. تا ساڵی ١٩٦٩ش هەموو ئەو پاپۆڕانەی دەچوونە بەندەرەکانی ئێرانەوە، دەبوا پاپۆڕەوانانی عێراق بیانبەرنایە. شا ڕێکەوتننامەی ١٩٣٧ی، بەسووکایەتییەك دەزانی کە بەسەر شا محەممەد ڕەزا پەهلەوی باوکیا سەپێنرابێت، بەتایبەتی کەملیان بەئێران دابوو، سنووری نێودەوڵەتی لەگەڵ عێراقدا لەبەری ئێرانی شەتولعەرەبەوە بێت و، کەشتییە ئێرانییەکانیش ناچاربکرێن بۆچوونەناو شەتولعەرەب ئاڵای عێراق هەڵبکەن. سەدامیش لەبەرامبەر ئەوەدا ئاگادارکردنەوەی وابوو کە "گەر لەسوچێکدا قەتیسیان کردین، ئەوا لە دەستهەڵگرتنی نیوەی شەتولعەرەب، یان هەموو عێراق بەولاوە شتێکی دیمان لەبەردەمدا نامێنێتەوە، بێگومان ئەوساش بۆ پارێزگاریکردنی تەواوی عێراق، وەك چۆن خۆمان بمانەوێ سێ و دوو لەدەستهەڵگرتنی شەتولعەرەب ناکەین". لەچەند مانگێکدا سەدام بەڕاستی کەوتە لێکدانەوەی ئەو بۆچوونەوە "بۆ سی.ئای.ئەی دەرکەوتبوو کەسەدام حسێن لەمانگی تشرینی

یەکەمی ١٩٧٢ەوە دەستی بەوکارە کردووە". لەمانگی ئابی١٩٧٤یشدا، جەزائیر کۆبوونەوەیەکی لەنێوان هەردوو وەزیری دەرەوەی ئێران و عێراقدا، لەئەستەمبوڵ سازکرد، کەتاڕادەیەك بۆ ئاکۆکی نێوانیان بێت و لەمەمانگاتیشدا "نزیك"ی پێ بەمێژبکات، کێشەی شەتولعەرەب خاڵێکی سەرەکی کۆبوونەوەکەبوو. بەڕزانی کەبەوەی زانی، "لەجارێك زیاتر" لەگەڵ نزیکەکانیاو، لەبارەی ئەگەری ڕێککەوتنێکی نێوان ئێران و عێراقدا کەوتەو وتوێژ. بەڵام "پێشبینی تەواوی جێبەجێکردنەکەی نەدەکرد". بەبیریشیدا نەدەهات کەڕەنگە شا هەموو جۆرە یارمەتییەکانی لێببڕێت و بگرە لەناچارکردن و خۆ بەدەستەوەدانی کوردیشدا هاوکاری بەغدا بکات. بەڕزانی هەرچەند ئەو ترسەی لای ئێرانییەکان باسبکردایە، دڵنیایان دەکردەوەو پێشیان دەوت، پێویست ناکات لەوبارەیەوە ئەوەندە دووڵ بێت و لەبیر خۆتی بەرەوە. بەڵام لەهاوینی ١٩٧٤ەوە، کەئێریك رولیەی نووسەری کاروباری خۆرهەڵاتی ناوەڕاستی ڕۆژنامەی "لۆمۆند"ی فەرەنسایی، بە کوردەکانی ڕاگەیاند، کە شا لەچاوپێکەوتنێکی نوێی ڕۆژنامەییدا، بە شانازییەوە وتوێتی، بوونی کورد وەك ئاوی بۆرییەك وایە کەی بیەوێ بەریدەداتەوەو کەیش بیەوێ دەیگرێتەوە. دەبوا کورد لەناوەڕۆکی ئەو هەڕەشەی شا بگەیشتنایەو ووریاتر بوونایەتەوە ڕولیە کە کورد هیچ بایەخێکی ئەوتۆیان بەلسە ناهەموارەکەی شای ئێران نەداو دەرکیشیان بە دوالەتەنەکانی نەکرد، سەری لێیان سوڕماو گومانێکی زۆریشی لەلێکدانەوەی سیاسیانەیان پەیدالکرد. گێڕایەوە وتی: "کەزانیارییەکانم بەرامبەر بە ڕووداوەکان چاوی پێنەکردنەوە، پێموابوو لەکەم شارەزایی سیاسەتی نێودەوڵەتییانەوە بێت". ڕاستییەکەشی، زۆربەی ئەندامانی سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان "بەتایبەتی نزیکەکانی بەڕزانی"یان، تا دواساتیش دەستخەڕۆی ئەوەبوون کە ئێران هیچ ڕێککەوتنێك لەگەڵ عێراقدا ناکات. جا کەوابێت، واشنتۆن دەتوانێت ڕێی لەمجۆرە ڕێککەوتنە لەشا بگرێت ئەمە ئەو پرسیارەیە کەتائێستا نەتوانراوە وەڵامی بدرێتەوە.

کورد بەهیچ جۆرێك گوێی بەزیادبوونی‌دیاردە بەمەترسیەکان نەدەدا، کەئەوەش ستەمو کاریگەربوو. وایاندەزانی ئۆتۆنۆمی و، ئەوی ڕاستبێت سەربەخۆیشیان، لەبەر دەمدایەو، لەچەند ساڵێك یان چەند مانگێکدا دێتەدی. ئەگەرچی هەر کەسێکی ژیر دەیتوانی بە زۆرەو ووریایانبکاتەوەو ئەم خۆشباوەڕی و پێدالگرتنەیان دابمرکێنێتەوە. بەڵام لەبەرکەم ووشیاری سیاسیانەی کورد نەکرا. پێیان وابوو ئێرانییەکان باشدەناسن. واش ڕەفتاریاندەکرد هەروەك گومان لەنیازەکانی ئێرانیان بۆمابێتەوە. بۆیە ڕەنگە هەر ئەم گومانە، ڕێی لێونکردن و بەرەو تێڕوانینێکی سادەی کارەکانیشی بردبن و، گوێشیان بەکۆکردنەوەی بەڵگە پەرشوبڵاوەکان

نەدابێت، تا لەڕووداوەکان بگەن و وەڵامی خۆیانی بۆ ئامادەبکەن. ڕاستییەکەی بەرزانی تا درەنگ نەیدەزانی، شای ئێران سوود چۆن لەکات وەردەگرێ و، چەنێکیش ئارەزووی لەخوێنی سارد ڕشتن و دڕەقێتییە. هەر لەسەرەتاشەوە، گەمەکە تەنیا بە دەست شای ئێرانەوە بوو.

باری کورد لەڕووی سەربازیشەوە لەوەباشتر نەبوو خۆشیان لەبەردەم هێرشی هێزە ئامادەو پڕ چەکەکەی ئەمجارەی عێراقدا نەدەگرت. لەسەرکاغەز کورد لەهەموو کاتێکی تری بەهێزتربوو، چونکە شارەزایانی ئەمەریکایی و ئیسرائیلی و ئێرانی مەشقیانی دادەدا. بەپێچەوانەی ساڵانی شەستیانەوە، کەهەر چەکی سووکیان هەبوو، ئەمجارەیان چەکی نوێ و چەند تۆپێکیشیان هەبوو، کەهەمووی چەکی شۆڕەوی بوون و ئەمەریکاییەکان لەڤێتنام، یان ئیسرائیلییەکان لەشەڕی عەرەبدا گرتبوویانن، بەوەش هەموو ئەو لایەنانەی چەکیان بەکورد دەدا، نکوڵی پێوەندیبوونیان بەڕووداوەکانی ناو عێراقەوە دەکرد. جگەلەوەی کەلەناو عێراقیشدا دوو کەتیبەو نیو تۆپی ئێرانی "واتە لە سەد تۆپ زیاتر" و مووشەکی فڕۆکەشکێنی "ڕاپیەر"ی بەریتانیاییش کەلەسنوور جێگیرکرابوون و سەربازانی خانەنشینی بەریتانیایان لەسەربوو، پشتگیری کوردیانەدەکرد. ئەگەرچی کورد هەموو ئەو چەکانەشی هەبوو، کەچی زۆر بەپەلە ناچارکرا لەدەشتاییەکان بکشێتەوەو، بەپشتگیری ئێرانیش نەبوایە لەشوێنە قایمە شاخاوییە کۆنەکانی خۆشیا خۆی بۆ نەدەگیرا.

بەڵام خراپترین ئەنجامی گۆڕینی تەکتیکە سەربازییەکان، پشتبەستنی تەواوی کوردبوو بە هێزە دەرەکییەکان، بەتایبەتی شا. بەرزانی لەنامەکەی بۆ کارتەری نارد، بێزاری لەوە دەربڕی، وتی:"درەنگ" زانیمان ئێمە کەڕووبەڕووی هەشت تیپی سوپای عێراق بووینەتەوە، کەبەسەدان زرێپۆش و زیاد لەسەد فڕۆکەی نوێی جەنگیان بەکاردەهێناو، هەندێکیشیان فڕۆکەوانی ڕووس و هندیان لەسەربوو، کەچی یارمەتی دۆستەکانمان، لە جۆرو ژمارەشیاندا لەوەکەمتربوون کەلەسەریان ڕێککەوتبووین". هەرکاتێکیش کورد سەربکەوتنایە، تا عێراقییەکان زاڵ نەبوونایەتەوە ئێران یارمەتییەکەی لێدەبڕین، ئێرانییەکان نەیاندەهێشت کورد لەبەشی سێ ڕۆژ زیاتر گوللە تۆپیان لابێت. دوایی هەستمانکرد کە هاوپەیمانەکان کوردیان هەربۆ لاوازکردنی سوپای عێراق ویستووە نەك بۆ سەرکەوتن بەسەریا.

بەسەیرکردنێکی ئەم ڕووداوانە، وادەردەک[illegible]ێت کورد بەلای چ[illegible]یرد بیانییەکانەوە، یان گێلبووە یان بەڕادەیەکی زۆر بڕوایان بەقەدەر کردووە. کوردە [illegible]ـراقییەکان کە بەرگریان لەبەرزانی دەکرد، لاوازکردنی سوپای عێراقیان بەپێی ستراتیژە کۆنەک[illegible]یان بە [illegible]ـارێکی نا ماقووڵ یان نەگونجاو دادەنا. بێ دوودڵیش دەیانوت، لەشێواندنی حکومەتەکانی عێراق بەولاوە

شتێکی تریان پێنەدەکراو نەشیاندەتوانی لە بەغدادا دەسەڵات بگرنەدەست. لە ١٩٦١ەوە کەم و زۆر لەخۆگرتن و هەڵوێستپارێزیدا سەرکەوتوون. هەر ئەم تەکتیەکەشیان ڕێککەوتنی ئۆتۆنۆمی ساڵی ١٩٧٠یانی هێنایەدی. ڕێککەوتنەکە بەهەموو کەموکورتییەکانیشیەوە، یەکێکە لەو بەرهەمانەی کەتا ئەمڕۆش کورد بەسەرنەمێکی زێرینی دادەنێت.

بەهاتنی مانگی ئەیلولی ١٩٧٤، عێراقییەکان دەستیان بەسەر ناوچەیەکی بەرینا گرت، شکستییەکانی کوردیش ئەوەندە بەمەترسیبوون کە ئێرانییەکان ناچاربن تۆپی دوورهاوێژو مووشەکی دژە زرێپۆش بە بەرزانی بدەن. بەڵام لەسەرەتای ١٩٧٥دا، کورد کەوتە بارێکی سەربازیانەی ترسناکەوە. لەو یادداشتانەی "عەلەم"ی وەزیری تەختی ئێرانیدا، کەلەدوای مردنی خۆی بڵاوکرانەوە، لە ٣ی کانونی دووەمی ١٩٧٥دا هاتووە، کە شا زۆر بەو ڕاپۆرتانەی گەیشتبوونێ شادبوو، چونکە سەربازەکانی شەڕێکیان کردووەو کوردیان لە ڕۆژێکی وادا ڕزگارکردووە کەبەهیچ جۆرێك خۆیان لەبەر شەڕەکەدا بۆ نەگیراو لەهەڵاتندابوون، و بە "شەڕی شێران"یش لەڕاپۆرتەکەدا ناوبرابوو. ئەگەرچی شای ئێران شانازی بەو "خراپ تێکشکانەی" عێراقییەکانەوە دەکرد، بەڵام بەرزانی لەوە تەواو دووردڵبوو، دەیویست چاوی بە شا بکەوێت کەچی چەند هەفتەیەك، لەتاران گلدرایەوەو چار لەدوای چار چاوپێکەوتنەکەی دوادەخرا. پڕوپاگەندەی دەستپێشخەری دەکرا، کەخەریکن لەسەرحسابی کورد ناکۆکی نێوان ئێران و عێراق نامێنن، یەکەمیان جەزائیری ئەوی تریشیان ئەردەنی. لەو نامەیەی ساڵی ١٩٧٧یدا بۆ کارتەر، بەرزانی نوسیبووی کە عێراقییەکان ناڕاستەوخۆ چەند ئاماژەیەکی وایان بەواشنتۆن دا، کەئامادەن ئاستی پێوەندییەکانیان بە مۆسکۆوە کەمبکەنەوەو، خۆ "ئەگەر" شاش دەستبەرداری کوردبێت ئەوا لەگەڵ ئێرانیشدا ڕێکبکەون. جا ئەگەر ئەمەی لەکاتی خۆیدا زانیبێت ئەوا ئەویش پرسیارێکی بێ وەلامە. بەچاوپۆشین لەوەی کەمەلا مستەفا ئەوسا بەم کارە خشکەییەی زانیبێت یان نا، بەڕادەیەکی وا تووشی دڵەڕاوکێ ببوو کە لەدوا سەعاتدا، پرۆژەیەکی ڕێککەوتنی بە بەغدا دا. بەڵام سەدام حسێن پێی قایلنەبوو، چونکە دانوستانی لەگەڵ شادا قۆناغێکی باشی بڕیبوو.

شای ئێرانی کەڵەکچی، کەوتە هەڵخەڵەتاندنی کوردە ساویلکەکان، سەبارەت بە دامەزراندنی حکومەتێکی تاراوگە، بەهاوکاری بەرهەڵستکارە عێراقییەکانی دی، بەدرۆوە هانیدان ڕای شا حسێنی ئەردەن و وەربگرن. بەڵام لە کانونی یەکەمی ئەو ساڵەدا هەرئەوەندەی نێردراوانی کورد گەیشتنە عەمان، بەرلەوەی پێیان بڵێن شا حسێن نایەوێ بیانبینێت یەك هەفتەی تەواو گلیان دانەوە. لەمانگی شوباتی دوایشدا، ئەنوەر ساداتی سەرۆکی میسر نامەیەکی بۆ بەرزانی ناردو

دوای لێکرد کەسامی عەبدولڕەحمان بۆ قاهیرە بنێرێت. لەکاتی چاوپێکەوتنەکەدا سامی عەبدولڕەحمانی قایلکرد کە میسر دوایەکی کورد بۆ رێکخستنەوەی کوردو عێراق لەباتی کوردەکان بگەیەنێتە سەدام حسێن. بێئەوەی نوێنەرەکەی کورد ئاگاداربێت، سامی دانیشتنەکەی تۆمارکردو، شریتە تۆمارکراوەکەشی نارد بۆ شا، ئەویش یەکسەر گوێی تووڕەبوو.

نوێبوونەوەی هەوڵی بەرزانی بۆچوونە واشنتۆن، بەو هیوایەی پشتگیری پێویستی بۆ باشکردنی بارە ناهەموارە سەربازیو دیبلۆماتییەکەی دەستبکەوێت. شتێکی کوتوپڕ نەبوو، ئەگەرچی وولاتە یەکگرتووەکان لەساڵانی رابردوودا چەند جارێك ئەوەیان رەتکردبوەوە بۆیە پێکانەکەی مسۆگەر نەبوو، بەڵام هەوڵدانەکەی دەهێنا. بۆئەم مەبەستەکو خۆیرەتە پێشتەوە لەواشنتۆن، لەپێشەوە بەرزانی، بەبۆنەی ژنهێنانی کیسنجەرەوە. کەسی ماڵینێری هێنادەسی فەرشی بۆناردو، ملوانکەیەکی زێڕو گەوهەریشی بەدوادا چوو. بەڵام هەمووی بێسوودبوو، کیسنجەر کەمبووە وەزیری دەرەوە، کەوتبووە کەمکردنەوەی ئەو یارمەتیانەی کەلەساڵی ١٩٧٢ەوە بەکوردیان دەدا. لەگەڵ هەموو ئەو ڕووداوانەدا، بەرزانی لەونامەیەی ٢٢ی کانونی دووەمی ١٩٧٥یدا کەبۆ کیسنجەری نارد، مەسەلەی سەردانی واشنتۆنی وورووژاندەوە. موکتێر عوسمان وتەنی، کیسنجەر لەمێژبوو "لەوکارە بەئاگابوو هەموو شتێکیشی لەبارەوە بەدووی دریژی دەزانی" بەڵام کیسنجەر تا یەك مانگی رەبەق، وەڵامی نامەکەی "زەنەراڵی بەرێزم"ی نەدایەوە. دوای ئەوە نامەیەکی بۆ بەرزانی نارد تیایدا "خۆشەویستیمان بۆ خۆت و گەلەکەت و ئەو هەوڵە جەسوورانەیەی دەیدەیت" یەکلا دەکردەوەو، لە ستایشدا نوقمیکردبوو، کەچی بەدەنگ داواکەیەوە نەچوو. کیسنجەر لەنامەکەیدا دەڵێت: "ئەوستەمانەی بەرەو ڕووتانبوونەتەوە هێجگار سەختن و" دەڵێت:

> ڕێزی زۆرم بۆ هەڵسەنگاندنو شیکردنەوەی بارەسیاسیو
> سەربازییەکەتان هەیە، دەشتوانم دڵنیاتان بکەم کە نامەکانت
> لەبەر ئەو گرنگییەی کەبەلای ئێمەوە هەیەتی بایەخی دڵسۆزانەی
> لەباڵاترین ئاستی حکومەتی ئەمەریکدا پێدەدرێ. گەر حەزتان
> کرد نوێنەرێکی شوێن باوەری خۆتان بۆ واشنتۆن بنێرن، تا زانیاری
> تر بەحکومەتی ئەمەریکا بگەیەنێت ئەوا زۆر خۆشحاڵدەبین و
> شانازی بەپێشوازیشییەوە دەکەین. من دڵنیام کەبەنهێنی کار
> ڕۆڵێکی زۆر گرنگی لەوەی کەتائێستا کردومانە بینیوە. هەر لەبەر

ئەوەو-ترسی سەلامەتی خۆشتان- لەپێشنیاری پێکگەیشتنەکەی

خۆتان دوودڵبوم. ئەوەش بزانە کەمن هەمیشە پەرۆشی بیستنی هەواڵتانمە.

تکایە ڕێزو باشترین ئاواتم قەبوڵ بفەرموون.

ڕاستییەکەی ڕەتکردنەوەی بینینەکەی بەشێوە بەڕەوشتییە، وای دەگەیاند کە کیسنجەر هەرگیز پەرۆشی بیستنی هەواڵی بەرزانی نەبووە. لەنامەیەکی تری دوای دوو هەفتەی بەرزانیدا، لەڕێی "کالەهان"ی سەرۆکی بنکەی "سی.ئای.ئەی" ناردنەوە، کەبەڕاستی بەرامبەر بەڕووداوەکە تووشی دڵەڕاوکێ هاتبوو، بنێردرێت، مەلا مستەفا بێووڕەیی خۆی تیادا دەربڕیبوو. ئەم نامەیەی کاتێك نارد، کە شا و سەدام حسێن، لە پێککگەیشتنێکی تایبەتی پەراوێزی کۆبوونەوەی سەرۆکی دەوڵەتانی ڕێکخراوی "ئۆپێك" لەجەزائیر، کە لەسەعات دوونیوی بەرە بەیانی ڕۆژی ٦ی ئازاردا بەستراو، وای لە شای ئێرانکرد لەپڕێکا دەست لە کورد بەربدات. ئەویش لەبری سەروەری ئێران بەسەر نیوەی شەتولعەرەب و، دەستهەڵگرتنی عێراق لەداواکردنی خوزستان کە دەوڵەمەندترین ناوچەی نەوتی ئێرانە. بەغداش یارمەتی یاخیبوونەکەی بلوشستانی ئێرانی، بەدرێژایی سنووری پاکستان ڕاگرت. چونکە عێراق، هەروەك چۆن ئێران یارمەتی بەرزانی دەدا ئەویش ساڵانێکی دووروودرێژ پشتگیری ئەو یاخیبوونەی خوزستانی دەکرد کە بەعسییەکان ناوی عەرەبستانیان لێنابوو، دەیانوت بەناهەق لەنەتەوەی عەرەب زەوتکراوە، بەوجۆرە بەغدا دەستی لە پشتگیریکردنی یاخییەکانی بلوشستانی ئێرانیش هەڵگرت کە لەڕێی پاکستانەوە بۆی دەناردن.

کیسنجەر هیلمز و ولیام کۆلبی بەڕێوەبەری "سی.ئای.ئەی" و هەموو ئەو بەرپرسە ئەمەریکاییانەی بەکێشەی کوردەوە خەریبکوون، دیاریکردنی کاتی ڕێککەوتننامەکەیان بەلاوە سەیربوو، نەك ناوەڕۆکەکەی. خۆ بەلای "سی.ئای.ئەی"ەوە ئەم ڕێککەوتنە کولبی وتەنی، هەمیشە "یەکێك بووە لەهەڵبژاردنەکانی شا". سەرەڕای زۆربوونی بانگەوازەکانی کورد کەچی بەڕێوەبەرایەتی ئەمەریکا هیچی نەکرد هیچیشی نەوت. کولبی دواتر وتی: ئەوە "جوان نەبوو بەڵکو کارەساتبوو"، وتیشی "لەو بەهارەدا لە باشووری خۆرهەڵاتی ئاسیادا بەسەرهاتی تری دڵتەزێن ڕوویاندا، کەبەلای ئێمەوە بایەخیان زیاتربوو"، مەبەستی کەوتنی کەمبۆدیاو ڤێتنامی باشووربوو.

ئەگەرچی وڵاتە یەککگرتووەکان ئەوکاتە چەند دەلاقەیەکی تێکرابوو، بەڵام هەر بەرزڵهێزێتی خۆی مابۆوە. هەر ئەو بەهارە کیسنجەر لەناوچەی هیندی چینیدا لەوەدابوو ملبدات، بەڵام سەرقاڵی دانوستانی جوێکردنەوەی هێزەکانی میسرو ئیسرائیلیش بوو. خۆ نەدەکرا ئەمەریکا

وەك ئیسرائیل خۆی بەووڵاتێكی بچووك دابنێ بڵێ بەرگری لە هاوپەیمانێكی زۆر چەپۆك پێناكرێت، بەڵام لەو بەڵگەنامانەی كە تا ئێستا ئاشكراكراون، یەكێكی وا بەردەست نەكەوتووە كە وابگەیەنێت رۆژێك لە رۆژان بەرپۆەبەرایەتی سەرۆك فۆرد بیرلەوە بكاتەوە. هێلمز دوای چەندین ساڵ وتی: "واشنتۆن بە رێككەوتننامەكەی جەزائیر خۆشحاڵبوو"، چونكە ئێرانی هاوپەیمانی بەسەر عێراقدا زاڵبوو كە چاكترین دۆستی شۆڕەوییە. كیسنجەریش لەیادداشتنامەكەیدا دەڵێت: شا "بەلای ئێمەوە، یەكێكە لەو سەركردە دەگمەن و هاوپەیمانە بێمەرجانەی، كەتێگەیشتن و شیكردنەوەیان بۆ باروودۆخی دونیا، تێگەیشتن و تێڕوانینی ڕووداوەكانمانی بەهێزدەكرد".

بەپێی بروسكەی ٢٢ی ئازاری ١٩٧٤ی "سی.ئای. ئەی" واشنتۆن دەیزانی كە شا ناوەرۆكی ئەو رێككەوتننامەیەی ساڵی ١٩٧٢ی پێشێلكردووە كەلەگەڵ كیسنجەردا بەستبووی. لەساڵی ١٩٧٦دا بروسكەیەكی CIA كەلە ٢٢ی ئازاری ١٩٧٤دا لەراپۆرتەكەی پایكدا خرایەڕوو، خاڵە سەرەكییەكانی بەمجۆرە دیاریكردبوو، "ئێرانیش وەكو ئێمە، بەوەی زانیبوو كەدەكرێت سوود لەم قەیرانە وەربگیرێت ... كە نە ئێمەو نە ئێرانیش حەزمان نەدەكرد ئەم گرفتە بەم یان بەو شێوە چارەسەربكرێت". بەڵام وەك دەردەكەوێت، بێئاگاداركردنەوەی كورد یان ئیسرائیل و وڵاتە یەكگرتووەكان، ئەویش ئەگەر بڕوا بەلێپرسراوانی ئەو دوو دەوڵەتە بكەین، شا هەرخۆی ئەم قەیرانەی كۆتایی پێهێناو چارەسەری گرفتەكەشیكرد. دواتر كیسنجەر وتبووی، كەبەرێككەوتننامەكەی جەزائیری زانی وەك لەسەربانێكەوە بەربدەنەوە وابوو وتبووشی هەربۆیە ئەم رێگەم گۆڕیو بەرەو زیوریخی سویسرا بووەوە تا شای ئێران ببینم، كەبەرەو وڵاتەكەی خۆی دەبۆوە. كیسنجەر بەرگری لەخۆی بەوە دەكرد كە شای ئێران "كەم رێككەوتنەیدا رای ئێمەی نەپرسیوە". بەڵام پێدەچێت بیركردنەوەكەی راستی لەگەڵدا نەكردبێت، چونكە چاوپێكەوتنەكەی زیوریخی شای پێش جەزائیربوو، بۆیە تەنانەت گەر شای ئێرانیش بەچەند ووشەیەك لای باسنەكردبێت، دەبێت بۆنی شتێكی هەر كردبێت[27].

---

[27] ئەحمەد چەلەبی كەئەوسا لاوێكی ئاراوگەی شیعەی عێراق و، بنكەی لەبیروت هەبوو، دۆستی كوردیشبوو، پێش رێككەوتنەكەی جەزائیر بەهەڕۆكە بۆ تاران چووبوو تا بەرزانی ووریابكاتەوە، چونكە "بۆنی مشكە كوێرەكەی كردبوو". بەلای چەلەبییەوە كۆبوونەوەكەی زیوریخ تاكە نیشانەیەكی سەرەكی ئەوە نەبوو كە بەشارداراوەیی ڕوویدەدا، بەڵكو لە كورتە سەردانەوەكەی شا بۆ تاران، تا بەر لەچوونی بۆ جەزائیر، لێپرسراوە سەرەكییەكانی حكومەتەكەی لەئەنجامی كۆبوونەوەكە ئاگاداربكاتەوە. نیشانەیەكی گرنگتربوو. شا حسێن و ساداتیش لەنزیكبوونەوەی رێككەوتنەكە بەئاگابوون "ناسری" فرمانی بەچەلەبی دا كەهیچ گیرنەێتو بۆ بیروت بگەڕێتەوە

بەگوێرەی سیاسەتی ڕاستەقینە، ئاکرێت بوترێ، شا ترسی نزیکبوونەوەی تێکشکاندنێکی سەربازیانەی هەبوو، بۆیە ئەو ڕەفتارەی کرد، ئەگەرچی هێزەکانی پەنگیان خواردبۆوەو کوردیش ئەو چەند مانگەی زستان، کە کەمبوونەوەی شەڕ تیایدا ئاسایییە، کەمتر توانای بەرەنگاربوونەوەیان مابوو، یەکەمجاریشە عێراقییەکان لەناو چیاکاندا بمیننەوەو نەچنەوە بنکە زستانییەکانیان. شەڕی ڕاستی، بەهەموو چەرمەسەریو مەترسییەکانییەوە بەهاران گەرم دەبێت. بۆیە شاو کەسانی دیش گەیشتبوونە باوەڕێك، کە شا دەبێت بیر لە ڕێککەوتنێك بکاتەوە ئەگینا هەڵگیرسانی شەڕێکی ڕاستەقینە لەگەڵ عێراقدا دەکەوێتە ئەستۆی ئەوەوە. ڕاستییەکەی شا لەپێناو بەرژەوەندی خۆیدا ئەوەی کرد، هاوکارە بیانییەکانیشی نەیاندەتوانی، یان نەیاندەویست ڕایبگرن. ئەوەی لەکەللەی دیپلۆمات و سیاسەتمەدارە کەللەڕەقەکانی ئەوسای دابوو، دەستهەڵگرتنی سەدام حسێن بوو لەو هەموو شتانە، بەتایبەتی سەرلەنوێ دیاریکردنەوەی سنوورەکەی شەتولعەرەب، کە وای لێهات بەدرێژایی هێڵی "تالوك"بێت، واتە ناوەندە هێڵی قووڵایی ئاو. شا لەبەرهۆی تەکتیکی و خێزانی، ڕێك ئەوەی لە هەموو شتێکی دی زیاتر مەبەستبوو.

کیسنجەر تا ساڵی ١٩٩١لە یادداشتنامە ڕەسمییە قەبەو گرانەکەیدا، بێئەوەی بەهیچ جۆرێك ناوی شەتولعەرەب بەرێت، تەنیا بە بڕگەیەکی کورت و پەراوێزێك بەرگری لە خۆی کردو بەڵێنیشی دا لەبەرگێکی تردا بۆ "کێشەی کوردو کۆتاییە جەرگبڕەکەی" بگەڕێتەوە کەچی نەشیکرد. لەپەراوێزەکەیدا، کە دیاریوو بۆ ڕەوادان بەبڕیارەکەی شابوو دەڵێت:"بڕیارەکەی شای ئێرانی ١٩٧٥ بۆ چارەسەری گرفتی کورد لەگەڵ عێراقدا، کەپێدەچێت ڕاستی پێکابێت، لە نزیکبوونەوەی هەرەسی کوردەوە هاتبوو، ڕزگارکردنیشیان بێ بەشداریتی دووتیپی سەربازیی ئێران و ٣٠٠ ملیۆن دۆلار یارمەتی ئەمەریکا مەحاڵبوو". ئەمجا مەسەلەی نزیکبوونەوەی هەرەسی ئەوکاتەی هێزەکانی بەرزانیش تا ئەمڕۆ لەگوماندایە. پێش کۆبوونەوەکەی جەزائیر، کە چەلەبی چووبوو بۆلای بەرزانی تا لەو شتە نهێنیانەی لەدژی دەکران ئاگاداری بکاتەوە، بینیبووی بەرزانی "پەست و خەمبارە، پێشی وتم کەلەمیان سەدی ٣ێی پێشمەرگەکان شەڕ دەکەن". بەڵام کوردە عێراقییەکان تا ئەمڕۆش لەو باوەڕەدان، شا هەر هیچ نەبوا دەیتوانی

---

"ئەگەر بەرژەوەندی خۆت بزانی" بەڵام چەلەبی هەر چاوی بە بەرزانی کەوت، ئەگەرچی لەناو خانوویەکی "ساڤاك"یشدا کە سەرکردە کوردەکەی تیادا میوان بوو.- جا چونکە خانووەکە ئامێری گوێگرتنی تیادا چەسپکرابوو، لەباخچەکەیدا گفتوگۆیانکرد- بەرزانی هەرداخی هەڵدەکێشاو ئەطرەتی لەکاربەدەستە ئێرانییەکاندەکرد کە نەیاندەهێشت چاوی بەشا بکەوێت

مەرجی شەرەفمەندانەتر لەوانەی کە لەڕێککەوتننامەکەی جەزائیردا هەبوون بۆ کورد دابین بکات. کیسنجەر لەیاداشتنامەکانیدا ئەوەی هیچ ڕووننەکردۆتەوە کە "چی" قایلیکرد "بۆچوونەکەی شا زۆر لەڕاستییەوە نزیکبووە"و، چۆنچۆنیش ۳۰۰ ملیۆن دۆلارەکە دیاریکرا، یان وڵاتە یەکگرتووەکان، دوای کەمە بەشداریکردنێکی چەند ساڵە، چۆنچۆنی ئەو لیستە گەورەیە دەخاتە سەرخۆی. کیسنجەر بێئەوەی هیچ ڕەخنەیەك لە بڕیارەکەی شا بگرێت کەمەر بۆخۆی دابووی، ئاماژە بۆ دەست لەکورد بەردانەکەی دەکات کە بڕیارێکبوو هەر لەسەرەتاوە تا کۆتایی، شای ئێران خۆی وەك "وڵاتێك کەخاوەنی سەروەری خۆی بێت دابووی" هەر لەبناغەشەوە شەڕەکە شەڕی شا بووە نەك واشنتۆن.

بەڵام کوردەکان وایاندەبینی کە پەراوێزەکەی کیسنجەر ناتەواوەو لەخزمەتی خۆیدایە. کیسنجەر تالەکاتی چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەنووسی ساڵی ۱۹۹۲دا تەنگی پێهەڵچنرا، دانی بەوەدا نەنا کە شا "پێش نزیکەی چوار یان شەش هەفتە" لە ڕێککەوتننامەکەی جەزائیر، باسی ۳۰۰ ملیۆن دۆلارەکەی لەگەڵدا کردووە. ئەمجا کیسنجەر درەنگانێك دانی بەوەدانا کە قسەکانی شا لەبارەی پێویستی ئەوبڕە پارە زۆرەوە بۆ کورد، ڕەنگە هەر بۆکردنە بیانوویەکی باشی ڕێخۆشکردنی ڕێککەوتنە تەنیاییەکەی جەزائیر بووبێت. جا ئەگەر کیسنجەر "بۆنی مشکە کوێرەکەشی کردبێت" ئەوا نەیویستووە بیخاتەڕوو، هەرچەندە ئەو ژمارە گەورەیەی شادلوایکردبوو، لەسەرەتای ساڵی ۱۹۷۵دا نیشانەیەکی ڕوونی شێوەی نیازەکانی بوو. ئەوەش بەئاشکرا بێئارامی شای بەرامبەر بەکوردو گەڕان بەدوای بیانوویەکدا دەگەیاند تا دەستیاز لێبەرداو دەستە چەورەکەی خۆشی بە خەڵکی تردا بسوێت، بۆ نموونە واشنتۆن.

داواکردنی بڕێك پارەی وازۆر- بەردی زل نیشانەی نەهاویشتن-ی دەگەیاند، کە شا بەوە نەیویست خۆی لەبەردەوامبوونی یارمەتیدانی کورد بکێشێتەوە. شا لە نزیکەوە چاوی لە سیاسەتی واشنتۆن بڕیبوو، لە ۱۹۷۵دا هەستی بە تا ڕادەیەك پیسبوونی ڕێنەی کیسنجەر، وەك سیاسەتمەدارێکی سوپەر، کردبوو. کارە نهێنییەکان کە وەك وەزیری دەرەوە ملیانگرتبوو، خەریکبوون لەدەستیا دەشکانەوە. ڤێتنامی باشوور لەکەوتندابوو، ئیسرائیلیش لەوەدابوو کشانەوەکەی سینای، کە لەگەڵ میسردا هەیبوو [illegible]. تێبینی کرد، کیسنجەر کۆنگرێسی بۆ تەرخانکردنی ئەوەندە پارە قایلپێنەدەکرا کە سایگۆنی لەکەوتن پێ ڕزگاربکرێت، جا ئیتر چۆن بۆ ۳۰۰ ملیۆن دۆلاری پشتگیریکردنی کورد پێی قایل دەکرێت! بەرامبەر بەوە شا خۆی هیچ ڕێگرییەکی دەستووری و مالی لەسەر بڕیارەکانی نەبوون، بەتایبەتی کەنرخی نەوت، بەو ڕۆڵەی لەکاتی شەڕی عەرەب ئیسرائیلی ساڵی ۱۹۷۳دا، لەڕێکخراوی

"نۆپیك"دا بینیبووی، چوار قات زیادیكرد، بەوە ئێران هێنجگار دەوڵەمەندبوو. ئیتر پارە سیاسەتی ئێرانی دیاری نەدەكرد.

لەیەكەم نامەی ١٠ ئازاری ١٩٧٥ی بەرزانیدا بۆ كیسنجەر، واتە دوای رێككەوتنەكەی جەزائیر، راستەوخۆ باسی گەوهەری بابەتەكەی كردبوو كەدەڵێت:

"... كە دەبینین یەكەم ئاكامی لاوەكی رێككەوتنەكەیان - لە جەزائیر -تێكشكاندنێكی وای گەلە بێتواناكەمانە كەپێشتر ڕووی نەدابێت، خوێن لەدڵمان دەچۆڕێت. لەكاتێكدا - عێراقییەكان- هێرشێكی گەورەی وایان كردۆتە سەرمان كەلەوەتەی هەن نەیانكردووەو تا ئێستاش بەردەوامە، ئێران سنوورەكەی خۆی بەتەواوەتی بەڕووماندا داخستووە. ڕووداوەكەی ئێستا، لەئاست قڕوقەپكردنی تەواوی هەموو لایەنەكاندا، لەناوبردنێكی ئابەجێی بزووتنەوەو گەلەكەمانە لەناوبردنێكی وا كەباوەڕناكرێت. بەڕێز ئێمە وایدەبینین وڵاتە یەكگرتووەكان بەرامبەر بە گەلەكەمان، كەپابەندە بە سیاسەتی وڵاتەكەتانەوە، لێپرسینەوەیەكی ڕەوشتی و سیاسیانەی لەئەستۆدایە ... وەزیری بەڕێز ئێمە بە دڵەڕاوكێیەكی زۆرەوە چاوەڕوانی وەڵامتانین".

دوای دوانزە ڕۆژ، كەلەهانی سەرۆكی بنكەی "سی.ئای.ئەی" لەتاران بروسكەیەكی بۆ كۆلبی ناردو، بۆی نوسیبوو كە كیسنجەر هێشتا وەڵامی نامەكەی بەرزانی نەداوەتەوەو، ئاگاداریشیكرد كە ئەگەر واشنتۆن بیەوێت "هەنگاو بۆ ڕوونەدانی قڕكردنێك بنێت، ئەوا پێویستە دەستبەجێ ڕوو لە ئێران بنێ" بەڵام واشنتۆن هیچی نەكردو، وتەكانی بەرزانیش بۆ چەندین ساڵ لەگوێی كیسنجەردا دەزرنگانەوە. ئەو بەهارە كیسنجەر گوێی بەداوایەك لەداوایەكانی كورد، بۆ یارمەتیدانی بەپەلەی ئەو دەیان هەزار كوردە ئاوارەیە نەداو، لەبری ئەوە بەرگرییەكی بێئابڕوانەی لە خۆیكردو بڵاویكردەوە، بەڵام پاشتر بەدڵ لێی پەشیمانبوو. كیسنجەر كە راپۆرتەكەی "پایك"بە "لێپرسراوێكی پایەبەرزی نەناسراوی ئەمەریكای دادەنا" دەڵێت "كارە نهێنییەكانو كارە خێرخوازییەكان -مرۆیی- ناكرێ تێكەڵبكرێن".

بەرزانی دوای هیچ زەمانەتێكی ڕەسمیانەی لەئەمەریكا نەدەكردو تەنانەت لەوپەری تووڕەییشیا هەرەشەی سەبارەت بەخستنەڕووی هەمووشتەكانی دیشی نەدەكرد، ئەگەرچی یەكبینە پێی لەسەر ناپاكیكردنو پاشقول لێگرتنی كورد دادەگرت، بەڵام پەردەی لەسەر

ڕووداوەکە لانەدەداو بێزاری خۆی بە دونیا ڕانەدەگەیاند. دەیزانی هەڵوێستی زۆر لاوازەو، ترسی ئەوەش هەبوو کە ئاشکراکردنی ڕووداوەکە شا والیبکات سنووریان بەتەواوەتی بەڕوودا دابخات. بەڵام کەلەحەمان زیاتر لەوە دوو دڵبوو کە کورد هەر بەوەوە نەوەستێت لەڕێی کەناڵەکانی پشتەوە ناڕەزایی خۆی دەربڕێت و کارەساتەکەشیان بەهەموو دونیا ڕابگەیەنێت. کەلەحەمان داوایکرد کە:

ئایا بنکە سەرەکییەکانی "سی.ئای.ئەی"لەم بارەیەوە پێوەندیان
بە بەڕێوەبەرایەتیی کیسنجەرەوە هەیە؟ ئەگەر
حکومەتی وڵاتە یەکگرتووەکان بەچاکی هەڵسوکەوت لەگەڵ
ئەم بارو دۆخەدا نەکات و، شتێکی واش نەکات کە کورد
وابزانێت پشتمان تێکردوون، ئەوا پێدەچێ ئەوان هەموو شتێک
بخەنەڕوو. ئەوەی ئێران کردی، نەک هەر خواستە سیاسییەکانیانی
لێک هەڵتەوەشاندن، بەڵکو ژیانی هەزارانیشیانی خستبووە مەترسییەوە.

هەموو نامەکانی بەرزانی، کە بۆ "سی.ئای.ئەی"و، سەرۆک جیراڵد فۆردو، کیسنجەری ناردن وەڵامیان نەبوو. لەناو سەرجەم ئەو شتانەی ڕاپۆرتەکەی "پایک" ئاشکرایکرد، بێدەنگییەکەی بەڕێوەبەرایەتی ئەمەریکای دوای ڕێککەوتنەکەی جەزائیر لەهەموویان دڵتەزێنتربوو. ناوەڕۆکی ئەم ڕاپۆرتە، بۆ یەکەمجار "دانیال سخور" کە پەیامنێرێکی گەورەی تەلەفزیۆنی "سی.بی.ئیس"بوو، ئاشکرایکرد، ئەمجا لەگۆڤاری "ڤیلج ڤۆیس"دا، کەهەفتەنامەیەکی لیبرالییەو لەشاری نیویۆرک دەردەچێت، تەواوی دەقەکەی لەژمارەیەکی تایبەتدا، کە لەمانگی شوباتی ١٩٧٦دا دەرچوو، بڵاوکرایەوە، ئەوەش تاماوەیەکی زۆر "ولیەم سافایر"ی پارێزگارخواز، کە نووسەری ستوونێکی "نیویۆرک تایمس" بوو، تووڕەکرد. سافایر کەیەک ڕۆژ چییە دەستی لەبەدڵ بەرگریکردنی کوردەکانی عێراق هەڵنەگرت، داوای لێپرسینەوەی ئەو "ناپاکیتییە بێوێژدانییە"یدەکرد کە لەبەرزانی کرابوو، داواشی لە "فۆرد" کرد کە کیسنجەر لەسەر کارەکەی لابەرێت، چونکە بەڕێوەبەرایەتی ئەمەریکای تووشی "ئەم ئابڕووچوونە" کردوە. پەستبوونە زۆرەکەی سافایری بەتەنیا لەسەر بێدەنگییەکەی بەڕێوەبەرایەتی ئەمەریکاو فشارخستنە سەر شا نەبوو کە "ڕێککەوتنێکی پیاوانەی بۆ ئۆتۆنۆمی کوردی عێراق نەهێنایەدی"، یان پێندانی "بڕە پارەیەکی کەم بۆ یارمەتی مرۆڤانەی پێویست" یان نەبوو. ئەوەش بەکورتی لەڕاپۆرتەکەی "پایک"دا هاتووە:

هەریەک لەسەرۆک و دوکتۆر کیسنجەرو شای ئێران، هەرلە

> سەرەتاوە بەهیوای سەرنەکەوتنی دۆستەکانمان- کەمەبەست
> کوردە بەرزانییەکانە-بوون، بەڵکو مەبەستیان بەردەوامبوونی
> یاخیبوونەکەیان بوو، تا داهاتی سروشتی وڵاتەکەی دراوسێی
> دۆستەکەمان - عێراق- یەکبینە لەداچۆڕاندا بێت. ئەوانەی لە
> گەڵیشماندا بوون لەم سیاسەتە ئاگادارنەکرابوونەوە. هەربۆ
> بەردەوامبوونی شەڕ هاندەدران. جا ئەوەش گەر بەپێوەری کارە
> نهێنییەکانیش بێت، بەڕەفتارێکی بەدو بێشەرمانە دادەنرێت.

دیسانەوە ڕاپۆرتەکەی پایك دەڵێت، چەند بەڵگەنامەیەك لەوانەی "خرابوونە بەردەستی کۆمیتەکە" بە ڕۆژو کات دەریاندەخست، کەچۆن بەڕێوەبەرایەتی ئەمریکا وەك "هاوبەشێکی پچووك" ڕەفتاریکردووەو لەم پیلانەی شادا پشتگیریکەری بووە، "ڕاستییەکەشی دەستبەرنەدانی شای لە یاخییەکان -واتە کورد- یەکلاکردبۆوە، کەچی واش، دوای سێ ساڵ، کە بەهەزاران کەس کوژراو، واشنتۆنیش بە ١٦ ملیۆن دۆلار یارمەتی کوردیدا، شا وازی لەکورد هێنا". ڕاپۆرتەکە لەسەر باسەکە دەڕوات و گرنگترین دەرئەنجامی دەخاتەڕوو "ئەگەر وڵاتە یەکگرتووەکان نیازپاکی شای لەخۆ نەگرتایە، ئەوا دوورنەبوو، کوردو حکومەتی ناوەندی - عێراق- بەیەك بگەیشتنایەو، هەر هیچ نەبوایە شێوە ئۆتۆنۆمییەکیان وەربگرتایەو ئەو هەموو خوێنەشیان نەڕژایە. بەڵام کوردەکان لەشەڕەکەدا بەردەوامبوون و، هەزاران قوربانیان داو ٢٠٠ هەزار کەسیشیان لێدەربەدەربوو".

لەوانەیە ڕاپۆرتەکە، لەبارەی ڕێککەوتنی ١٩٧٢ی نێوان کوردو بەغداوە هەندێك زیادەڕۆییکردبێت. بەڵام یەکلاییە کە شەڕ بوونەوەکە کاولکارییەکی زۆر بەسەر کوردستانی عێراقدا هێناو، زیانێکی زۆریشی بەکێشەی کورد گەیاند. یەکلاییشە کە شا بەڕووداوی ١٩٧٥ زۆر خۆشحاڵبوو. چونکە کە لەجەزائیر گەڕایەوە، دیاربوو لە خۆشی ئەو دووڕووییە میکاڤیلییەی، کەلەسەر حسابی بەرزانی کردبووی لەڕاددەبەدەر شادمانبوو. "عەلەم" وەزیری تەختی ئێرانی، ئاماژەی بۆ ئەوەکرد، کاتێك پێیانووت گەشتەکەی جەزائیری "سەرکەوتووترین گەشتیبووە". شای ئێران هەستیکرد دوو گرفتی وای چارکردووە "کەلەباوکمەوە بۆم مابۆوەو، پێیان شەرمەزاربووم- واتە باوکی ناچارکرا چۆك بۆ کۆمپانیای نەوتی ئێران، کەبەریتانیا خاوەنیبوو بدات و، عێراقیش دەستی بەسەر هەموو شەتولعەرەبدا بڕوات-".

کەلەبارەی کوردی عێراقیشەوە پرسیاری لێکرا، شا بەساردییەکەوە وەڵامی دایەوەو وتی: ئۆتۆنۆمییەکەی هەوڵیان بۆیەدا "هەر لەسەرەتاوە خۆهەڵخەڵەتاندن"بوو. ئەگەرچی ئەم جۆرە

قسەکردنە توندوڕەقەی شا پێش بینینی بەرزانی بوو، بەڵام "عەلەم" تێبینی "پەشۆکاوێتی و بێگومان لەڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو پیاوەشدا، هەستی بە هەندێك شوورەییەکرد". شای ئێران، بۆ بەرگریکردن لەسیاسەتەکەی خۆی، لای باوەڕپێکراوانی خۆی درکاندبووی، کە کورد لەتێکشکاندنێکەوەبۆ تێکشکاندنێکی دی دەچوو، خۆ "ئەگەر پشتگیرییەکەی ئێمە نەبوایە ١٠ رۆژ چییە خۆیان لەبەردەم عێراقییەکاندا نەدەگرت". بۆ قایمکردنی هەڵوێستەکەشی، قسەیەکی سەدام حسێنی دەهێنایەوە، کە کاتی چاوپێکەوتنەکەی جەزائیریان کردبووی، وتبووی: "هێزەکانمان و تۆپەکانمان زۆر کەڕەت، تاکە ڕێگری عێراقییەکانبوون بۆ سەرکەوتنی تەواو بەسەر کورددا". عەلەم دەیگێڕێتەوە؛ چۆن پار، شا بەرزانی ماندا[illegible] تایلبوونەکەی عێراق، کە داواکانی کوردی پەسەندکردبوو، رەتبکا[illegible]وە "[illegible]" لەیادداشتنامەکەیدا نووسیوێتی هەردوولایان دەیانزانی عێراق ڕێزی بە[illegible]ێنەکانی خۆی ناگر[illegible]ت..... بۆیە شتەکە بە خەڵەتاندنێکی هەرزان دەچوو وەك لەوەی پەیمان[illegible] بێت..."

جائەوە هەڵخەڵەتاندن بووبێت یان نا، کورد پێشەکی لەڕێککەوتننامەی جەزائیر ئاگادار نەکرابۆوە، ئێوارەی ٦ی ئازار بۆ یەکەمجار لەو میوانخانەیەی کە "ساڤاك" لە تاران بەتایبەتی بۆ بەرزانی تەرخانکردبوو،بیستیان. هەرکە ئێزگەی "بی.بی.سی" بەریتانیایی، هەواڵەکەی بەعەرەبی و فارسی بڵاوکردەوەو "بەرزانی و موحسین دزەیی و دوکتۆر عوسمان، بەپەرۆشەوە گوێیان بۆ راگرتبوو". دزەیی گێڕایەوە کەئەوکاتە وتبووی "کۆتاییمان راگەیاند"، لەکاتێکدا دوکتۆر عوسمان بایەخی بەڕاپۆرتەکان نەداو دەیوت: ئەوە جگە "لەگەمەیەکی دیپلۆماتیانە شتێکی دی نییە"، بەڵام بەرزانی، دوای بیستنی ئەم هەواڵانە پەستبوو هیچی نەدرکاند. هەر ئەو شەوە، دوای ماوەیەك تەلەفزیۆنی ئێران وێنەی گەیشتنەوەی شای ماندوو، بەڵام سەرکەوتووی، لەفڕۆکەخانە نیشانداو پێش جێهێشتنی فڕۆکەخانەی، سەرەك ئەرکانی سوپاکەی لێدەرچێت لەگەڵ هیچکام لەپێشوازیکەرانیدا نەدوا. دزەیی دەڵێت:"نەمانزانی چی پێدەوت، چونکە هەر چاومان لەقسەلەگەڵ کردنەکەی بوو. ئەوکاتە وتم "پێموایە باسی ئێمە دەکەن". دیسانەوە دوکتۆر عوسمان لەگەڵ بۆچوونەکەمدا نەبوو، بەرزانیش هیچی نەوت.

رۆژی دوایی لەکاتی بەرچاییکردندا، نوێنەری کورد لەتاران، کە برووسکەیەکی پشتشکێنی، شەوی رابردووی ئیدریس بەرزانی ناو کوردستانی عێراقی پێبوو، گەیشت. هەر ئەو شەوە کوتوپڕ، بێئەوەی پێشەکی کەس ئاگاداربکەن هەموو هێزەکانی ئێران، بەگشت و تۆپ و تفاق و تەقەمەنی و، تەنانەت خواردنیشیانەوە، بۆناو خاکی ئێران کشاونەتەوە. ڕێك لەگەڵ کشانەوەکەی ئەوانیشدا هێزەکانی عێراق هێرشێکی گەورەیان بۆسەر کورد کردبوو. دزەییش بەدوکتۆر

عوسمانی وتبوو: "دوێنێ پێم نەوتی شا باسی ئێمە دەکات؟". هەر ئەو بەیانییە ژەنەڕاڵ ((عەبدولعەلی مەشوورپوور)) کە ئەفسەرێکی کوردی ئێرانەو یاریدەدەری ژەنەراڵ "نەسیری" بەڕێوەبەری "ساڤاک"ە، نکوڵی ناپاکی کردنی لەگەڵ کورددا دەکرد، زۆر بەتوندی نارەزایی بەرامبەر بەو قسەیە نیشاندەدا کە "شا رۆژێک لەڕۆژان ناپاکیتان لەگەڵدا بکات". ماڵی جێهێشت و دوای نیو سەعات بەشەرمەزارییەوە گەڕایەوەو راستی ترسەکانی کوردی یەکلاکردەوە، ئەمجا لەگەڵ بەرزانیدا چوونە لاوە، دوای چەند دەقیقەیەک بەدەمگریانەوە رۆیشت، دواتریش تەلەفۆنی بۆ کردبوون و لێیان پاڕابۆوە کەهیچ لەبارەی گریانەکەیەوە نەدرکێنن.

بەرلەچاوپێکەوتنەکەی شا، ژەنەڕاڵ نەسیری خۆی کوردەکانی هێورکردبۆوە. وایپیشاندابوو کە هەرشتێک توورەیی و چاوبرسێتییەکەی شای ئێرانی پێدەرنەکەوێت، وتنی خراپ نابێت. بۆ ئەو مەبەستە نەسیری وتی، کاتێک شا شریتە تۆمارکراوەکەی ساداتی دووبووی پێکەیشت بەجۆرێک توورەبوو، کە پەلە لە رێککەوتننامەکەی جەزائیردا بکات، فشارێکی توندی سادات و، وڵاتە یەکگرتووەکان و، لایەنی تریشی لەسەربوو، تا دەست لە کورد هەڵبگرێت، سەدام حسێنیش سیاسەتی دەرەوەی بگۆڕێت و دژایەتی شۆڕەوی بکات و پێوەندییەکی باشیش لەگەڵ ئێراندا ببەستێت. یارمەتیدانی کورد، تەگەرەیەکی سەرەکییە لەڕێی کۆتاییهێنانی پشتبەستنی هێجگارەکی عێراق بە مۆسکۆوە.

دزەیی وای بەبیردێتەوە کە بەرزانی "بەڕادەیەک تووڕە ببوو دەلەرزی". ئەمجا لە بەڕێوەبەری "ساڤاک"ی پرسی، ئەی بۆ ئاگادارتان نەکردین؟ چۆن بڕوا بەسەدام حسێن دەکەن و لێی دڵنیادەبن کەهەر شۆڕشەکەی کوردی لەکۆڵبۆوەو لەجارانی بەهێزتربوو پەشیمان نابێتەوە؟ زۆر لەوە پەشیماندەبنەوە کە کردتان". نەسیری وەڵامی دایەوەو وتی، کورد لەبەردەوامبوونی شەڕەکەدا سەربەستە، بەڵام بەبێ هیچ پشتگیرییەکی ئێران، ئێرانیش وەک پەنابەر پێشوازیاندەکات. یەکسەر دزەییان بۆکوردستان ناردەوە، تا لەنزیکەوە بارەکە هەڵسەنگێنێت. هەر کە گەڕاشەوە بەبەرزانی راگەیاند، هەرچەندە پێشمەرگەو سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان هەست بەبێزارییەکی زۆر دەکەن و بێهیواشن، بەڵام دەیانەوێ لەشەڕدا بەردەوامبن. بەرزانی ئەیدەزانی کە شا لەچاوپێکەوتنەکەی جەزائیردا بەڵێنی تری بەسەدام حسێن دابێت، پێی وابوو کە بەرەبەرە خۆکشانەوە لەکورد بۆ شا باشتربێت.

شای ئێران چاوپێکەوتنەکەی بەرزانی تا ١١ی ئازار دواخست، "کەمەندێک لە کوردەکان پێیان وابوو بەئەنقەست ئەوەی کردبێت، تا لەگەڵ یادی پێنجەمی رێککەوتنی

نۆتۆنۆمییەکەیاندا یەکبگرنەوەو، نرخی گوێ پێنەدانی بەرهەڵستیە یەك لەدوای یەکەکانی شای کاتی ڕێککەوتنەکەشیان بدەن". کۆبوونەوەکەی کۆشکی "نیاڤاران"، نموونەیەکی ئاسایی شێوازە بەپێچوپەناکەی هەرباسێکی شا بوو، بێجگە لەوەش بەرزانی دەیزانی شا ڕسوابوونەی خۆی بەسەر کورددا هێناوە، ئەوەندە پێخۆشە بۆی دەشاردرێتەوە. شا وتی تەنیا کورد خۆی لە ڕێککەوتننامەی جەزائیر بەرپرسیارە، چونکە یەك ساڵ دوای شەڕبوونەوە، نەك هەر سەدام حسێنیان پێنەڕووخا، بگرە ناوچەیەکی بەرینی واشیان لەدەستدا کەبۆ دەربازکردنیان دەبوا ئێران هێزی خۆی بە ڕادەیەك لە شەڕەکەدا زیادبکردایە، کە لەگەڵ عێراقدا بکەوتایەتە شەڕێکی سەرتاسەرییەوە. شا ویستی زیاد بە بیانووەکانی پێشتری ژەنەراڵ نەسیرییەوە بنێت، بۆیە وتی: هاوپەیمانانی ئێران نزیکبوونەوەی عێراق و یەکێتی شورەویاز لەئێران دەناسی. ئەوکاتە بەرزانی مشتومڕەکەی بۆ بارێکی ڕەوشتیانە بردەوەو، بەشای وت: "دەستمان خستەناو دەست تانەوەو، لەوبڕوایەشدا نەبووین بیبڕنەوە؟ دوکتۆر عوسمانیش لێی پرسیبوو "ئێمە بەئێران پشتئەستووربووین، ئێستا چی بە گەلەکەمان بڵێین؟، شا زۆر تووڕەو کرژبوو، ئەمجا سەرزەنشتی کوردی بەوەکرد کە درێژ دادڕە. دزەیی پێیوت، کوردی عێراق تاقیکردنەوەیەکی دووروودرێژی لەگەڵ سەدام حسێندا هەیە "کە بەڵێنەکانی ناباتەسەرو هەرئەوەندەی لەئێستای بەهێزتربێت ئیتر پاشگەز دەبێتەوە". ئەمجا دزەیی نمونەی تاقیکردنەوەی خۆیی وەك باڵوێزێکی عێراق هێنایەوەو وتی:" من دەزانم، بەڵگەنامەی ڕەسمی عێراقم سەبارەت بەکەنداوو خوزستان بینیوە"، عێراق دانیشتووە بەرەچەڵەك عەرەبەکانی خوزستان، هەرچەندە بە بەراوورد لەگەڵ سەرجەم دانیشتوانەکەیدا زۆر کەمن، بۆچوونە سەر عێراق هاندەدا.

شا زۆر لەسەرئەوە ڕۆیشت کە کورد لەشەڕ بەردەوامبوونیدا ئازادە، بەلام بەبێ یارمەتیدانی ئەوو، ئێرانیش پێشوازی لەو پەنابەرە کوردانە دەکات کە سوود لەو ئاگربەستە دوو هەفتەییەی لەیەکی نیساندا کۆتایی دێت وەردەگرن، "بەلام عێراق هەرزوو پێشێلیکرد" وورووژمیان بۆ ئێران هێناوە. یاداشتنامەکانی "عەلەم"یش باس لەوەدەکەن کە شا زۆر لەو ڕەخنە نێودەوڵەتیانە پەستبوو، کە لەسەرجۆری هەڵسوکەوتی لەگەڵ کورددا لێیاندەگرت. "کۆمەڵگای نێو دەوڵەتی ئێمەیان بە خیانەتکار تاوانبارئەکرد- بەلام- هەرچۆنێك بێت کوردستانێکی سەربەخۆ هیچ باشییەکی بۆ ئێمە تیادانەبوو". کارەساتی دەیان هەزار پەنابەری کوردی عێراق [illegible]ناو ئێران، بەرادەیەك ویژدانی "عەلەم"یان بزواند، کە لە ٢٠ی ئازاردا سەبارەت بەداوا یەکبەدوا یەکەکانی بەرزانی، تا کاتی زیاتریان بۆ ئەمدیوکردنی خێزانی پێشمەرگەکان بداتێ، قسە لەگەڵ شادا بکات. بەلام شا خۆی بەدەقی ڕێککەوتننامەکەوە بەستەوە، کە مافی پەنابەرێتی تەنیا

بەپێشمەرگە ئەدلو لەو باوەڕەشدابوو بەغدا هیچ لەژن و منداڵەنیان ناکات. :منیش لەوەڵامدا وتم، تەنانەت ئەگەر واشبێت، زەحمەتە کوردەکان باوەڕبێبکەن و خێزانەکانیان لەدوای خۆیانەوە جێبهێڵن". کەچی تەنیا کاردانەوەیەکی شا بۆ قسەکەم پێشنیاریکرد کە باخاچی سووری نێو دەوڵەتی ئەرکی پاراستنی خێزانە کوردەکان لەئەستۆ بگرێت. پێدەچوو ئەوە تەنیا ئاکامی بەدەنگەوەچوونی واشنتۆنی بەدەنگ پاڕانەوەو داوا بەدوای یەکەکانی بەرزانی بووبێت، کەبۆ دەستێوەردان و نەرمکردنی هەڵوێستی تاران دەیکرد.

لە١٢ای ئازاردا، لە حاجی هۆمەرانی ناو کوردستانی عێراقدا، سەرکردایەتی پێشمەرگە، ئەو شەوە تا درەنگەو ڕۆژی دواییش باسیان لەوە دەکرد کەچیبکەن. سەرەتا بەرزانی بەشێوەیەکی گشتی پشتگیری بۆچوونی توندڕەوەکانی دەکرد، کە هەرچەندە هێزەکانیشیان کەم بووبنەوە، بەڵام پێیان لەسەر شەڕکردنەوە دادەگرت. شای ئێران بەپەلە ژەنەڕاڵ مەنسوور پوری بە هەواڵی ناخۆشەوە بۆلای بەرزانی نارد. شا بیریکردبۆوە کە لەچاوپێکەوتنەکەی جەزائیردا بەڵێنی بەعێراقداوە، چیدی چاولە کورد نەپۆشێ و ڕێگا بەهێزەکانی عێراقیش بدات کەبۆ جێبەجێکردنی ڕێککەوتننامەکە بێتەناو خاکی ئێرانەوە. ئەگەرچی لەم دواییەدا بۆ ڕێگادان بەکوردە دووردەستەکانی بادینانی باکووری خۆرئاوای عێراق کە بەپێ ڕێیاندەکرد تا بگەنە ناو ئێران، ئاگربەستەکە هەر بەناو بوو، بەڵام بەهیچ جۆرێك درێژ نەکرایەوە. وەك مەنسوور پووریش ڕایگەیاند، "ئێوە بێجگە لەخۆ بەدەستەوەدان هیچ ڕێگەیەکی دیتان لەبەردەمدا نەماوە، جا خۆتان سەرپشکن خۆ بەدەست عێراقەوە دەدەن یان ئێمە".

بەرزانی هەستی بەبێئوومێدی و تەنیسماریتی خۆی کرد، بۆیە بروسکەیەکی بۆ بەغدا ناردو تیایدا پێشنیاری دانوستانێکی نوێی لێکرد. بەڵام عێراق یەکسەر وەڵامی بە بروسکەیەك دایەوەو تیایدا داواکەی بەتەواوەتی ڕەتکردەوە. لەو شەوەدا، لەکاتێکدا چەند دادوەرو پارێزەرێك کۆبیبوونەوە تا گوێ لە بەرزانی بگرن، مەلا مستەفا وتەیەکی بۆدان کەتیایدا، مێژووی ڕاستەقینەی پاڵەوانێتی و خەباتی خۆیی بۆکێشەی کوردی بەبیرهێنانەوە، دیاریوو کە "نامەیەکی خوداحافیزی ئاشکرا"یە، لەپڕێکدا فرمانی ڕاگرتنی شەڕی بۆ سەرجەم کورد دەرکرد. هیچ ڕاوێژکارییەکیش لەگەڵ دەری خێزانی بەرزانی و نزیکەکانی، یان کۆمیتەی ناوەندی یان مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستاندا نەکرا. بەرزانی پێی ڕاگەیاندن کە، لەو دوو بەڵایە، شەڕ ڕاگرتنەکەیان لەوی دی باشترە، ئەوەی دەیەوێ بڕوات بۆ تاران بابڕوات. چەند کوردێك هەوڵیاندا بەرزانی قایلبکەن کە هەڵوێستەکەی بگۆڕێت و پێشیان ڕاگەیاند، کە ئەوان دەزانن بەساڵاچوونەکەی وای لێکردووە بەرهەڵستی درێژەپێدانی شەڕەکەبێت، تکایان لێکرد تا

"ڕێگا بە یەکێک لە کوڕەکانی بدات بەرگریکردنەکەی لەدەستبگرێت". ڕۆژی پولتر کادری بارەگای سەرکردایەتی "شۆڕشەکە تەواو" یان دەوتو دەوتەوە.

تا ئەمڕۆشی لەسەربێت بڕیارە چاوەڕواننەکراوو کوتوپڕەکەی بەرزانی، باری دۆخی سیاسیانەی کوردو وێنەی مەلا مستەفا خۆیشی شێواندووە. سەرەتا بڕیارەکە زۆربەی ئەو کوردانەی خێکرد کە ئاگایان لەودیوی کێشەکە نەبوو، وایاندەزانی لەئاسمانەوە بەسەریاندا داباریوە. بۆ ڕاگۆڕینی هەوڵی نوێی لەگەڵدا درایەوە، بەڵام "بێسوود بوو"، بەقسەی سامی عەبدولڕەحمان کە دەیوت: "دەبێ لەبیرمان نەچێت، ئێمە ئەومان بەنیوە خوایەک دەزانی. پێشم وایە گەر بەرزانی گەنجترو خێزانەکەشی هەژارتر بوایە، شەڕی ڕانەدەگرت. بەڵام پیربوو، ئێرانییەکانیش چەندین ملیۆنیان دابویە"[28] دەرکەوت ... پارێزگاریکردنێکی ئەمریکا، کەمزیکەکانی بەرزانی باسیان لێوەدەکرد هەر لەئارادانەبوود ... ەهات هەستکردن بە زەبرو ناپاکی، لەناو پێشمەرگەو خەڵکی سادەی کورددا زیاتر پەرەی دەسەند، نکوڵیکردن و باوەڕنەکردنیشیان بەساویلکەیی سەرکردەکانیان لێنێچەوانەدەبووە. هەر دوو هەفتە دوای فرمانەکەی بەرزانی، هێزەکانی پێشمەرگە، کە ژمارەیان پەنجا هەزار کەسێک دەبوو، نەمان. ئەمڕۆ هەندێك لەدڵسۆزترین کەسی بەرزانی، وەك موحسین دزەیی، ئەوە یەکلا دەکەنەوەهەرنەوسا بیریان لەوەکردبۆوە کە "بەرزانی بەدەم ئەم بڕیارەیەوە زۆر دەتلێتەوە" بەڵام کەسانێکی دیکەمن بڕوایان بە نیازپاکی بەرزانی نەدەکرد. کادیرێکی شارەزای کورد وتی "ئەگەر بەرزانی لەخاکی کوردستاندا بەسەرکردەی کورد بمایەتەوە، یان خۆی بکوشتبا، ئەوا دەبووە پاڵەوانێك و کەسیش برکێشی ڕەخنەلێگرتنی نەدەکرد".

مەلولی بەدەست دەست لەسەکردایەتی شتنەکەیەوە تەواو پێوەدیاربوو، تەنانەت پەرلەوەی بۆدواجار وەك پیرێکی نەخۆش و داماو دڵشکاو کوردستان بەجێبهێڵێت و بەسنووردا ئاودیوی ئێران ببێت، ئەم جۆرە کۆتاییەی بەرزانی هەموو شتێکی گرتەوە، هەر لەدۆستایەتی و خۆشەویستێتی پۆلەکانی عەشیرەتەکەی و خێزانەکەی خۆی، نهێنی پارێزییەکەیەوە بیگرە تا دەگاتە خۆسەپاندنی و بڕوای لەئەندازە بەدەری بەهاری پەیمانە بیانییەکانی. خەڵکە سادەکەش لەپڕێکا بۆی دەرکەوت کە سەرکردایەتییەکەی زیاد لەپێویست و بەڕادەیەك بەخۆی نازیوە، کە چارەنووسی بزووتنەوەیەکی ڕزگاریخوازی نیشتمانی بخاتە دەست شایەکی موخەنەتیەوە، ئەویش بەو خەیاڵەی پشتگیری زلهێزێك بەدەستبهێنێت کە بەدژایەتیکردنی خواستەکانی کورد

---

[28] ڕەخنەگرە کوردەکان، لەڕووی پارەوە، دەیانوت بەرزانی بە ٧٠ ملیۆن دۆلارەوە کوردستانی بەجێهێشت.

ناسرابوو. ئەم ئەنجامە، بەتایبەتی کەلەسەردەمی زاڵێتی ئایدۆلۆژیای چەپڕەوو، ناهەموارترین باری دەستگای ئەتەوە یەکگرتووەکانیشدا بوو کەبەهۆی تێکشکانەکەی ڤێتنامەوە تێیکەوتبوو، کوردی هێجگار بێزارکرد، چونکە نەیتوانی رای گشتی دونیای سێی بەلای خۆیدا رابکێشێت و، کارێکی واشیکردبوو کە چەوسێنەرەکانیان بەپشتگیریکردنی "سەربازگەی سۆشیالیزم" و "هێزە پێشکەوتووەکان" شادبن، بۆیە بێجگە لە سەرزەنشتکردنی خۆی هیچیتری بۆنەمابۆوە. بەلای زۆر کەسەوە، پشتگیریکردنەکەی بیانییە پارێزگارخوازەکان، تەنیا کۆسپی بەردەم بەرزانی نەبووە. کەپشتگیریکردنی چەپڕەوەکانی دونیای بەدەستنەهێناوە. بگرە لەو "مەلای سوور"ەیەش بێزاربوو کە رۆژنامە بەریتانیاییەکان لەدوای مانەوە دووروودرێژەکەی یەکێتی شۆرەوی بەسەریاندا دابڕی.

کورد کەهەستیکرد بۆ شەڕێکی پارتیزانانەی زۆرخایەن تەنیایەو چەك و کەرەستەی پێویستی واشی نییە، تۆڵی. هەرەسە سەربازییەکەش، بۆ گەلێکی شاخاوی وا کەشانازی بەشۆڕەت و ئازایەتی خۆیەوە بکات لەهەموو شتێکی دی زیانبەخشترە. کورد بەرادەیەکی وا پشتی بەو تۆپە قورسانەی ئێران، کەلەپڕا کێشرانەوە، بەستبوو، کە بەرزانی والێبکات بۆ قایلکردنی شا چەند سەرکردەیەکی پەنابەری کوردی ئێرانی بداتەوە. شۆڕشەکەی کورد بەئاسانی لەدوو هەفتەدا تواپەوە.کشانەوەشیان بۆناو ئێران وای لەمێژوونوسێکیانکرد، پەستی خۆی بە: "هیچ شۆڕشێکی ترم بەبیردا نایەت، بەم شێوە دڵتەزێنەو لەکاتێکدا گەل هەموو شێوازێکی پێویستی شەڕکردنی هەبێت و بەردەوامی شەڕەکەشی بوێت، ئاوا بەبڕیارێکی سەرکردایەتییەکەی کۆتایی پێهاتبێت" دەربڕێت. کەمتەرخەمی کورد بەرادەیەکی وابوو کەلەبری خەریکی کشتوکاڵبن هەر بەتەمای ئەوشتانەبوون کەلەئێرانەوە بۆیان دەناردن. ئەمە ئەو کێشە سەرەکیانە بوون کەدواتر، لەناو بزووتنەوەی نەتەوەیی کورددا شەڕو ناکۆکی لەسەر کەوتەوەو لاوازیانکرد. لەوساکەوە، لەسەر ئەم شتانەو هەر دەمەو بەجۆرێك ناتەباییەکەیان درێژەی بووە، دەوڵەتانی دراوسێش، بێگومان، ئەو ناکۆکیانەیان پێخۆشبووە.

ئەوکاتە زۆربەی کوردی عێراق فرمانەکەی بەرزانیان بەجێهێنا، چونکە چارێکی تریان نەبوو. جا کورد پێیخۆشبووبێت یان نا، شا راستیکردبووە، چونکە ئێران تاکە پەنجەرەی سەر دونیایانبووەو شاش بەتوندی بەڕوویاندا دایەخست. چەند پێشمەرگەیەك چەکیان دانەناو لەسەر شەڕ بەردەوامبوون، هەندێکی تریشیان خۆیانکوشت، بەشێکیان، بەرلەوەی رێگای سەختی دەربەندە شاخاوییە بەبەفر گیراوەکانی بەرەو سنووری ئێران بگرنەبەر، تا بەو چارەکەملیۆن کوردە پەنابەرە لەشەڕ هەڵاتوانەی چەند مانگێك پێشتر بگەنەوە، بێزاری خۆیان

لەو کارەساتەی تێیکەوتبوون، بە ئاگرتێبەردانی ئەو شتە کەمانەی هەیانبوو دەریدەبڕی. هەرچەندە کشانەوەکە بەڕێکوپێکی کراو بەدەیان هەزار کەس، کەمەندێکیان پێخاوس و جلوبەرگی سووکی لۆکە یان نایلۆنیان لەبەردابوو، بەڵام هەرچۆنێك بێت هەرکشانەوەبوو. تورکیاش، بەبیانووی یاساکەیانەوە کەتەنیا ڕێ بەپەنابەری ئەورووپایی دەدات، سنووری لەبەردەم کوردە عێراقییەکاندا والا نەکرد.

هەوڵە یەکبەدوا یەکەکانی بەرزانی، بۆ قایلکردنی ئەمەریکاو ئێران کەماوەی ئاگربەستەکە درێژبکەنەوە، تا پێشمەرگەو خێزانەکانیان لەشوێنە دوورەکانەوە خۆیان لەتۆڵەی سەدام حسێن دەرباز بکەن، بێسوودبوون. هەموو ئەوەی کەمەلا مستەفا لەدەستی هات، ئۆتۆمبێلێکی بۆ عیسا سواری سەرلەشکری پێشمەرگەی ناوچەی بادینان و خێزانەکەی نارد تا پێی دەرچن. بەڵام کەپێشمەرگە ئاساییەکان هەستیان کرد بەرزانی گوێیان ناداتێ، داخی دڵی خۆیان بەعیسا سوار ڕشت و کوشتیان. بکوژەکان چاکیان دەزانی کەلای سەدام حسێنی بەتۆڵە چ چارەنووسێکی ڕەش چاوەڕوانیانە. ڕاستییەکەشی هێزەکانی عێراق بەهەزاران کوردیان کوشتبوو، کەزۆربەشیان چەکدار نەبوون و، دەیان هەزاریشیان ناچاری هەڵاتن کردبوو.

زۆربەی کورد باوەڕیان بەبێسوودێتی خەباتی چەکداری هێناو، بەو لێبوردنە گشتییەی عێراق قایلبوون و، لەچەند مانگێکدا بەویستی خۆیان گەڕانەوە، لەکاتێکدا ئێران ئەوانی تری بەزۆر ئاودیوی سنوور کرد. لەماوەی چەند هەفتەیەکدا، بەغدا بەپێی سیاسەتێك، تا وا دەریانبخات کەئەوانە هەر لەناخەوە دوژمنی دەوڵەتی عێراقن، کەوتە ڕاگوێزانی بەکۆمەڵی زۆرەملانەی کورد. نێوان ١٢٠ هەزار تا ٣٠٠ هەزار کەسی لەو کوردانەی کەبەپێی لێبوردنە گشتییەکە لەئێران گەڕابوونەوە، بۆ ناوەڕاست و خوارووی عێراق گواستەوەو، تا ساڵێکیش دەبوا لەوێ نەبزواناییە. بەڵام کوردە چالاکەکانیان بەگشتی و قوتابیان و مامۆستایانیان بەتایبەتی، سزایەکی جیاواز دەدران، کە لەبەندکردن و ئازارو ئەشکەنجەدانەوە تیایدا بوو تا دەگاتە لەسێدارەدان.

عێراق دەستبەجێ بەدرێژایی ئەو ٦٠٠ میلە سنوورەی تورکیاو ئێران و سووریای، بە قووڵایی ٥ تا ١٥ میل ناوچەیەکی حەرامی دیاریکرد، تا کوردەکان نەتوانن ئیتر هەروا بەئاسانی پێوەندی بەبراکانی دەرەوەیانەوە بکەن. نزیکەی ١٥٠٠ گوندی لەو ناوچەیەدا. کەناوی "ناوچەی ئاسایش"ی لێنرا، بەبلدۆزەرو ئارنجۆك تەختکردو، ڕەزەکانی بڕینەوەو. کانیاوەکانیشیان بەچیمەنتۆ پڕکردەوە. دانیشتوانی ئەو گوندانەش کە ٧٥٠ هەزار کەس بوون، بۆ ئەو کۆمەڵگایانەیان ڕاگوێزان کە بەپەلە لەنزیك سەربازگەو بنکە پۆلیسییەکانەوە دروستکران، تا

بەئاسانی چاودێریبکرێن و "گوندی سەرکەوتن" یشیان ناولێنان. هانی عەرەبیشیان دەدا کە دەست بەسەر زەوییە کشتوکاڵییەکانی کورددا بگرن، جا زەوییەکان لەناوچە سنوورییەکاندا بن یان لە ناوەندە نەوتییەکانی، وەك کەرکوك و شوێنەکانی تر، کەلەگەڵ کورددا ناکۆکیان لەسەری هەبووە، ئەویش بەناوی "ئاسایشی ستراتیژی" پارتی بەعسەوە، کە ڕێی راگوێزانی کورد دەدات. بەمجۆرە تۆوێکیان چاند کەدواتر بە "جینۆسایدی کەلتور"ی ناسرا، واتە وورده ووردەو بەپێی بەرنامەیەکی زۆر کاریگەرانە، ڕیشەکێشی ژیانی گوندیانکرد، کەشادەماری کۆمەڵگەی کوردەوارییە. دەمەو پایزێکی درەنگی ١٩٧٥، دوای ئەوەی کوردەکان سەردانی "ڕێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی- ئەمنستی ئەنتەرناسیناڵ-"یانکرد، ئەویش لەراپۆرتەکانیدا کەسەبارەت بە پێشێلکردنی ماڵ مرۆڤ دەریدەکردن، رایگەیاند کە ٣٨٩ ئافرەت و منداڵی کورد گیراون، لەسەر ئەوەنا کە شتێکیان کردبێت، بەڵکو هەر لەبەرئەوەی مێردیان یان باوکیان یان برایان پێشمەرگەن.

وەك دواتر ئاشکرابوو، کەلەهانی بەرپرسی "سی.ئای.ئەی"ی تاران، داوایکردبوو، باشترین شتێك کەوولاتە یەکگرتووەکان بیکات کەمکردنەوەی ئازارەکانی کوردە. بەلایەنی کەمەوە لە ١٠ی نیساندا رۆڵێکی تایبەتی هەبووکە ئەمەریکای لەگرنگی مەسەلەیەکی سەرەکی ووریایکردبۆوە، کەئەگەر "گەورە لێپرسراوانی ئەمەریکای وەك کیسنجەر هیچ نەکەن ... هەرشتێك بێت، کەلە کارەساتەکەی ئێستایاندا یارمەتیانبدات، ئەوا دەبێ بزانن کە ئەوان زیندەبەچاڵ بکرێن دەستەوەستان دامێننەوەو بەسەرهاتەکەیان بەهەموو دونیا رادەگەیەنن...".

کەچی بەرزانی تا چەند ساڵێك بەسەرهاتەکەیی هەرباس نەکرد. بێدەنگییەکەی ئەو کوردو بیانییەکانیشی سەرسامکردبوو. ئەم لەسەنەکردنەش بۆ کۆنە شۆڕشگێڕێکی پیری وەك ئەو، کەلەسالانێکی دوورودرێژی ژیانیدا، تێکشکانەکانی لەسەرکەوتنی زیاتربوون، فێریانکردبوو، شتێکی وانەکات سۆزی بەسەردا زاڵبێت و کار لەدواڕۆژی بکات و لاوازییەکەی ئێستاشی لێگەورەبکات، ئەمەشی لەجێگای خۆیدابوو. دەشیزانی کە نابێت چاوەڕوانی زۆرشت لەشا بکات، بەڵام لەو قۆناغەدا هێشتا بەواشنتۆن پشتئەستووربوو. لەکۆنگرەیەکی رۆژنامەنووسی مانگی ئازاری حاجی هۆمەرانیدا، کە چەند هەفتەیەکی کەم بەسەر رێککەوتنەکەی جەزائیردا رابوردبوو، بەرزانی "هۆگلاند"ی، کەلەسەفەرێکی پێشتریا ناسیبووی، بردەلاوە. بەرزانی لەو بڕوایەدا بوو کەهۆگلاند لێپرسراوێکی ئەمەریکاییەو، بۆ چاوبەست خۆی بەرۆژنامەنووس دەردەخات، ئەگەر چی ئەم هەردوو جار نکوڵی لەوەکردبوو. مەلا مستەفا پێیوت، دوای

پەنابەریتی سیاسیانە بۆ خۆیی و دابینکردنی پاراستنی کوردیش بەحکومەتی ئەمەریکا بگەیەنێت.

بەرزانی کەبەدرێژایی تەمەنی جگەرەکێشێکی خراپبووە، بەدەم ئازاری شان و ملییەوە پەرێشانبوو "پاشان دەرکەوت شێرپەنجەی سییەتی"، بڕیاریدا بۆ باری تەندروستی و سەلامەتی خۆی، هەوڵی چوونە وڵاتە یەکگرتووەکان بدات. هەڵی خۆشیبوو کە لەکوشتن بترسێت. بەرزانی دەرکی بەوەکردبوو کەمانەوەی لەئاراندا وایدەگەیاند کە ئەو یارمەتییە کەمەی دەزگای "ساڤاک" بە پەنابەرانی کوردی دەدات لەبری بێدەنگی و تەریکییەکەی ئەم [illegible]. بۆیە بەرزانی لەگەڵ هۆگلاند و سەرجەم رۆژنامەنووسەکانی تر [illegible] زۆر زوو [illegible] شێوەیەکی گشتی باسی "ناپاکی- خیانەت-"ەکەی دەکرد، دەیوت وڵاتە یەکگرتووەکان "پشتیان تێکردین و بەفڕکردن- جینوسساید-یاندایین. ئێران بەئاشکرا هانی داین و بەهەمە جۆر شێوەش پشتگیریکردین و بەڵێنی زۆریشی دایێنی و ئەی بردەسەر". بەلام پرسیارە دڵتەزێنەکەی پووتربوو کە وتی "دەبێت تاوانەکانی گەلی کورد چیبن وا هەموو گەلانی دونیا لە دژین؟".

بەرزانی ئازار هێندە زەیفی لێسەندبوو، کەلەمانگی حوزەیرانی ١٩٧٥دا وڵاتە یەکگرتووەکانی ناچارکرد بۆچارەسەر رێی چوونە ئەمەریکای بدات. بەلام کە ساڤاک ئەفسەرێکی خۆی لەگەڵدا نارد، تەواو توورەبوو. کەلەفڕۆکەخانەی کەنەدیش ئەفسەرێکی "سی.ئای.ئەی"و "موریس درایەر"ی سەرۆکی نووسینگەی عێراق لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا، هاتبوون بەپیرییەوە تا بیبەنە خەستەخانەی "مایو"ی شاری "روچستەری" ولایەتی "مینیزوتا"، توورەییەکەی بەرینەدابوو. پزیشکە ئەمەریکاییەکان بۆیاندەرکەوت شێرپەنجەی سییەتی و چاری نییەو رەنگە شەش مانگ زیاتریش نەژی. بەرزانی ویستی یەکسەر بەرەو واشنتۆن بێتەوەو پچێت بۆلای محەممەد دۆسکی کونە دیپلۆماتی عێراق. کەبووە نوێنەری بەرزانی لەئەمەریکاو، پشتگیریکردنی هەردوو ئەندامی ئەنجومەنی پیران "هنری ر. جاکسون" و "ریچارد ستون"و، "جورج مینی" سەرۆکی یەکێتی کرێکارانی ئەمەریکا "A.F.L, C.I.O"ی بۆ کێشەی کورد راکێشابوو، بەرزانی بەهیوابوو زۆر بەزۆر کاریگەرێتییەکیان هەبێت. بەلام دوو یاوەرە ئەمەریکاییەکەی رێیان پێنەدا. ساتێك وای بەسەردا هات کە بەمبنی بلیت فرۆکەیەکی پچووکی بۆ بەکرێبگرێت و بۆ واشنتۆنی "بفرێنی"، بەلام دوو فریشتەکەی پاسەوانی پلانێکی تریان بۆی هەبوو. کاتێك دۆسکی بیری لەهۆی نەگەیشتنەکەی بەرزانی و دوو [illegible] دەکردەوە، چونکە بڕیاربوو بگەنە واشنتۆن، ئەوان تا نەهێڵن مەلا مستەفا بەبەرچاوەوە بێت، بردیان بۆ گەشتێکی ولایەتەکانی خۆرئاوا، کە دەریاچەی تاهوو کالیفورنیای گرتەوەو یەك مانگی رەبەقیشی خایاند.

بەهەرحاڵ، پاریەدەرێکی بەرزانی، کە بیانوویەکی لەباری بۆ خۆدزینەوە لەو خانووەی "سی.ئای.ئەی"ی شاری "ماکلاین"ی ولایەتی "ڤرجینیا"، کە مەلا مستەفایان تیادا لەدونیا دابڕیبوو، دیبۆوەو بەنهێنی تەلەفۆنێك بۆ دۆسکی دەکات، تا چاوپێکەوتنێکی لەگەڵدا ڕێکبخات. بەپەلە سەبارەت بەڕووکردنە سویسرا، کە مەسعود بەرزانی- کوڕی مەلا مستەفا باسیکردبوو، هەرچۆنێك بێت "لەو دەست بەسەرییە"ی وڵاتە یەکگرتووەکان باشترە، قسەیانکرد. دۆسکی بەڕادەیەکی واتووڕە ببوو کە سەرپێچی فرمانە ڕاستەوخۆکەی بەرزانی بکات و، بۆ ڕۆژنامەنووسان بدوێت. نوێنەرە کوردەکە سووربوو لەسەرئەوەی بەڕێوەبەرایەتی ئەمەریکا ناچاریکات ڕەفتاری لەگەڵ سەرۆکەکەیدا چاکبکات، بۆیە پێوەندی بە "دانیال سخوڕ" "سی.بی.ئیس"ەوەکرد. سخوڕ ویستی چاوپێکەوتنێك لەگەڵ بەرزانیدا بکات، تا ناپاکییەکانی واشنتۆن بەرامبەر بەکورد ئاشکرا بکات. بەڵام مەلا مستەفا بەوە قایلنەبوو، چونکە دەیویست لەووڵاتە یەکگرتووەکاندا بمێنێتەوەو، دەشیزانی هەڵوێستی لاوازەو نەشیدەویست مانەوەکەی هیچ مەترسییەکی تیادابێت.

بەرزانی هەستیکردبوو، لەبەرئەوەی پروپاگەندەی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی لەدەستپێکردنایە، سەرۆك فۆرد دەیەوێت ناچاری گەڕانەوەی ئێرانی بکات. واشبوو لە تشرینی دووەمی ١٩٧٥دا بەشی شەش مانگ دەرمانیان دایەو، لێپرسراوە ئەمریکاییەکانیش دڵنیایانکرد کە دوکتۆرە ئێرانییەکان لەوانەی خەستەخانەی مایو کەمترنین، ڕەوانەی ئێرانیانکردەوە. ئەوسا ڕاستی بۆچوونەکانی دراپەر، کەئەویش وەك خەڵکانێکی دی بەرزانی بەدڵبوو، دەرکەوت. سەرەتا کە داوایان لێکرد پێوەندی بەمەلا مستەفاوە بمێنێت و، ڕایانسپارد تا بزانێت بەرزانی بەئاشکراکردنی ڕووداوەکان بۆ دونیا پشێوی بۆ ئەمەریکا دروستدەکات. هەرزوو بۆ دراپەر دەرکەوت کەبەرزانی هیچ گرفتێك بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئەمەریکا ناهێنێتە کایەوە.

زۆری نەبرد، کۆنگرێس لەبری بەرزانی، کەئەوکاتە لەئێران بوو، گرفتەکانی خستەڕوو. ڕاپۆرتەکەی پایك دزەیکرد، بەڵام مەلا مستەفا هەر بەبێدەنگی مایەوە. کۆلبی وتی "گەر بەرزانی لەمانگی ئازاری ١٩٧٥و دواتریدا نیازی خستنەڕووی هەمووشتێکی ببوایە، ئەوا کارێکمان دەکرد رایبگرین". بێگومان چاودێریکردنە زۆرەکەی "سی.ئای.ئەی"، کاتێك بەرزانی لەووڵاتە یەکگرتووەکاندا بوو، بەو مەبەستەبوو. کولبی دوای ساڵانێکی دووروودرێژ وتی، بەڵام لەبەهاری ١٩٧٦دا "ئێمە ئەوکاتە تا بنا گوێمان لەتوێژینەوەکەی کۆنگرێسدا نوقمبیوو"، کەسەبارەت بەکارە نهێنییەکانی "سی.ئای.ئەی"ی ئەنگۆلاو هەرەسەکەی هندی چینی دەکران.

"حەزمانەدەکرد لەو تاوانانە بەدووربین کە بەرزانی ئاشکرای دەکردن"، دەشڵێت "هەرچەندە ئەوکاتە زۆریش بەلامانەوە گرنگ نەبوو".

بەهەرحاڵ، بەڕێوەبەرایەتییەکەی فۆوردی ساڵی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی ئامادەی هیچ سەرکێشیکردنێك نەبوو. بەرزانی چارەسەرە کیمیاییەکان زەمیفیان لێسەندبوو، دەرمانەکانیشی لەتەواوبووندابوو، بۆیە ویستی بۆ وڵاتە یەککگرتووەکان بچێتەوە، کەچی زۆر بەتوندی داواکەیان رەتکردەوە. ئەوسا دۆسکی تەلەفۆنی بۆ نووسینگەی "جوزیف سیسکو"ی یاریدەدەری وەزارەتی دەرەوەی کاروباری سیاسیکرد، داوای ڤیزەی بۆ بەرزانی کرد تا بۆ نەخۆشی سەر لەوڵاتە یەککگرتووەکان بدات. دوای دواخستنێکی زۆر، یەکێك لەیاریدەدەرەکانی سیسکۆ پێشوازی دۆسکی کردو پێیڕاگەیاند کە بەڕێوەبەرایەتی ئەمەریکا هیچی پێناکرێت، چونکە بەرزانی پاسپۆرتی ئێرانیانەی هەیەو، تارانیش رێی سەفەرکردنەکەی نادات. دۆسکی هەڵچوو، واشنتۆنی تاوانبارکرد کە دەستی لەکورد شتبێت و بەتوورەییەوە وتی "بەرزانی سیاسەتمەدارتان کوشت و ئێستاش دەتانەوێ بەرزانی مرۆڤ بکوژن".

سەرئەنجام دۆسکی لەمەیاندا سەرکەوتنی وەدەستهێناو، وەزارەتی دەرەوە ڤیزەی بە مەلا مستەفادا، بەڵام پێشیان راگەیاند کەئەوە بێسوودە چونکە ئێرانییەکان رێی دەرچوونی نادەن. دۆسکی لەخۆدزینەوەکانی وەزارەتی دەرەوە زۆر تووڕەبوو چونکە دەیانویست بەبیانووی شاوە ڤیزە بە بەرزانی نەدات، کەوتە هەڕەشەی وا کەبەرزانی لەبنی دەهۆڵ دەدا و هەرچی هەیەو نییە بەدونیای رادەگەیەنێت. جا ئیتر بەڕێوەبەرایەتییەکەی ئەمەریکا لەهەڵوێستی خۆی پاشگەزبۆوەو، داوای لەو لێپرسراوە کوردە کرد بچێت بۆ وەزارەت تا لەسەر ئەو مەرجانە رێکبکەوێت کە بۆ سەردانی وڵاتە یەککگرتووەکانی دادەنرێن. مەرجەکانی وەزارەت، دەبوا بەهۆی هەڵبژاردنەوە مەلا مستەفا بۆ رۆژنامە نەدوێت، بەپێچەوانەی جاری پێشووشەوە کە هەموو سەفەرەکەی لەسەر "سی.ئای.ئەی"بووە ئەمجارەیان هەمووی لەسەرخۆی دەبێت، بەڵام بەڵێنی پارێزگاریکردنیان دا. بەرامبەر بەوە دۆسکی مەرجی ئازادی هاتوچۆکردنی بەرزانی، وەك خۆی چۆنی دەوێت و، هەرکەسێکیشی بوێت پێوەبکات و هیچ چاودێریکردنێکیشی لەسەرنەبێت، لەحکومەتی ئەمەریکا داواکرد.

کەچی بەرزانی کە لەحوزەیرانی ١٩٧٦دا گەیشتە فڕۆکەخانەی کندی، دەرکەوت دەزگای ساڤاك چاودێری دەکات و دراپەرو ئەفسەرێکی دی "سی.ئای.ئەی"ش بردیان بۆ خەستەخانەی مایو کلینك. دوای فەحسکردن مەلا مستەفا لەواشنتۆن جێگیربوو، لەئوتێلەکەیەوە بۆ ڤلانێدو لەوێشەوە بۆ خانوویەکی ناو شارو ئەمجا بۆ خانوویەکی دی شاری ماکلین. کەپێنج ژووری

نوستنی تیادابوو لەسەر تەرزی کۆلۆنیالیانەش دروستکرابوو. ئەمجارەیان بەرزانی بەراستی لەهاتوچۆکردنیا ئازاد بوو، بەدڵی خۆی دەهاتو دەچوو، هەرکاتێکیش بۆلای مینوسوتا، بۆ چاوپێکەوتنی پزیشکەکانی بچوایە، فڕۆکەیەکی تایبەتی بەکرێدەگرت. هەرچەندە ئازارێکی زۆری هەبوو، بەڵام دانی بەخۆیدا دەگرت و لەبەردەم خەڵکیدا خۆی بەلاواز نیشان نەدەدا، ئەگەرچی ئەشکەنجەو ئازار بە ئاشکرا باز ئاسایەکەیەوە دیاربوو.

هەموو ئەو بیانیانەی بەرزانیان لەکوردستانی عێراقەوە دەناسی، بەو ئەهامەتییەی زۆر پەست و دڵگیربوون. هوگلان کەلەیەکەم چاوپێکەوتنی مەلا مستەفاوە، وێنەیەکی لە نوسینگەکەیدا دانابوە، چەندیان پێ وت سەری ئەدا. دواتر وتی: "چاوم بەرایی نەدەهات ئەو هەڵۆیە لەناو قەفەزدا ببینم" و "هەرچەند گوێیشم بەخۆم نەدا دەمزانی توانای بینینی ئەو دیمەنەم نییە". حاییم لیڤاکۆڤی کۆنەپیاوی "موساد" لە کوردستان، هەوڵیدا لەوخانووەی بەرزانی تیایاندا دانابوو سەرێکی بدات، بەڵام ئەمەریکاییەکان ڕێیان نەدابوو، وتی ئەگەر بەرزانی منی بدیبایە ئەوا بێگومان دەیوت "با پێکەوە بمرین". بەرزانی لەکاتی واشنتۆنیا، سووربوو کەخۆی لەباشترین شێوەدا نیشانبدات.

بەرزانی خۆی بەتاوارگە دائەنەنا، پێی لەسەر دروستکردنی پێوەندی بەئەمەریکاوە دادەگرت، هەربۆیە میوانداریتی هەموو ئەوانەی دەکرد کە پێوەندیان بە بەڕێوەبەرایەتی ئەمەریکاوە هەبوو، بەڵام دەستەپاچەیی لەزماندا کۆسپێکی تەواوی سەرڕێی هەوڵەکانی بوو. ئەگەرچی هەوڵێکی زۆری بۆ فێربوونی زمانەکەدا، بۆئەو مەبەستەش پەنای بۆ فەرهەنگێک برد کەبەدووزمان نووسرابوو، بەڵام فێربوونەکەی لەسنووری "خواردنێکی خۆشە" و "سوپاستدەکەم" تێنەپەڕی. بەرزانی زۆر کەرەت بۆ ئانخواردنی نێوەران میوانداریتی، جاکسون و وستون و، درایپەر، کەهەردووک ئەندامی ئەنجومەنی پیرانبوون و، ڕۆژنامەنووسانی وەک، جاك ئەندرسون و سمت هیپستونی دەکرد. بەرزانی لەبەردەم میوانەکانیدا بێپەردە قسەیدەکرد، بەڵام هەرگیز بەتۆمارکردن و نووسینی قسەکانی قایلنەدەبوو، هەموو ئەو هەوڵانەشی ڕەتکردەوە کە برادەرەکانی بۆ نووسینەوەی یاداشتەکانی لەگەڵیان دەدا، یان هەر هیچ نەبێت ڕێبدات کە بیرەوەرییەکانی لەسەر کاسێت تۆمار بکرێت. درایپەر پێی وابوو کەبەرزانی، بەرامبەر تۆمارکردنی بیرەوەری و گێڕانەوەی بەسەرهاتی ژیانی ڕەشبینبێت، چونکە پێی وابوو ئەوە پەلە لەمردنی دەکات. دوای چەند مانگێکی کەم، دەرکەوت ووریاییەکەی بەرزانی لەقسەنەکردنەکەیدا لەجێگای خۆیدابووە، چونکە دیسانەوە هەوڵی دوورخستنەوەیی و ناردنەوەی بۆ ئێران، درایەوە. سەرەتای پایز بەرزانی بروسکەیەکی لەشای ئێرانەوە پێگەیشت، کە ڕەنگە بەدوای

ئەمەریکا خۆی بوویێت، داوای لێدەکات تا بەڕێوەبەرایەتییەکەی فورد لەو دوا مانگانەی مەلمەتی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتیدا لەمەترسی هەڵچوونێکی پڕ سۆزی بەرزانی بەدووربێت، بگەڕێتەوە بۆ تاران. بەڵام ئەمجارەیان مەلا مستەفا دەیزانی پشتی بە براەرەکانی ئەنجومەنی پیران و بزووتنەوەی کرێکاریانەی ئەمەریکا قایمە، بۆیە گەڕانەوەکەیی ڕەتکردەوە.

بەرزانی بەسەرهاتە ناماقوولەکەی ژیانی خۆی، کەپڕبووە لەناپاکێتی بەردەوای، ئێران و عێراق، تورکیا، یەکێتی شۆرەوی، ئیسرائیل و، دواجاریش ئەمەریکاو، ڕووبەڕووبوونەوەی هەلومەرجی وا کەهیچ هیوایەك ئەمێنێ، بەتایبەتی لەکاتی شەڕدا، لەسەر خوانی ئێواران و بەدەم خواردنی کوردانەوە بۆ میوانە ئەمەریکاییەکانی دەگێڕایەوە. لەو ڕووەوە دراپەر وتی: "ڕێك لەگێڕانەوەی چینییەکانی ئەکرد کە بەسەرهاتی ڕێڕەوە مەزنەکەی خۆیان باسبکەن". بەرزانی زۆر بەئاسانی دانی بەهەڵەو حسابە ناتەواوەکانی خۆیدادەنا، بەڵام لەهۆی زۆر پێداگرتنی سیاسەتی ئەمەریکای خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و خۆبەستنەوەی بەململانێی عەرەب-ئیسرائیل، کەلەهەموو شتێکی ناوچەکە زیاتر بایەخیان پێدەدا، نەدەگەیشت. بەرزانی دراپەری سەرسامکردبوو، بۆیە بەمجۆرەی باسدەکات:

> بەگشتی پیاوێکی زۆر وورىایە، دوای هەموو ئەو تێکشکان و سەرکەوتنانەی لەو ساڵانەدا بەسەری هاتووە، ڕاست و ڕەوان و، سووریشبووە لەسەر هەر شتێك کە مەبەستی بوایە. چاوپێکەوتنی زۆرم لەگەڵیابووە، پێی زۆر لەسەر ئەوە دادەگرت، کەئەگەر ئەمەریکاییەکان نەبوونایە، لەساڵی ١٩٧٢دا بەهیچ جۆرێك هاوپەیمانێتی لەگەڵ ئێراندا نەدەکرد. پێی وابوو کە ئێرانییەکان زۆر لەعێراقییەکان خراپترن و، هەرگیز بڕوانی بەتورك نەکردووە.

بەرزانی یەکبینە جەختی لەسەر تاکە ئەنجامەکەی "ئۆتۆنۆمییەکی دیاریکراو" بۆ کورد، کەزمان و کلتوری کوردی تیادا بپارێزێت و بەشێکی ماقولیشی لەداهاتی نەوت پێببەخشرێت، ئەکردەوە. دراپەریش هەرئەوە یەکلاەکاتەوەو دەڵێت "ئەو قسەیەیم نووسی و بەئەمانەتەوە گەیاندمە دەستەڵاتداران". بەڵام زۆر ئاشکرابوو کەهێنری لەو ئەوۆمی هەوتەمینەی وەزارەتی دەرەوەدا چیدەکات، کارەکەی هەر شەرمەزارێتی بوو کیسنجەر هێند پێی لەسەر چاکڕاگرتنی پێوەندی بە ئێرانەوە دادەگرت کە ئەویش و شای ئێرانیش، لەکۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنووسی هاوبەشی مانگی ئابیانداو، لەکۆشکی ئیمپراتۆریانەی سەر دەریای قەزویندا، هیچ بایەخێکیان بۆ ڕاپۆرتەکەی "پایك" دانەنا. وولاتە یەکگرتووەکان تا ئەهات چەکی زیاتری بەئێران

دەفرۆشت، شا بەفیزێکەوە بەکیسنجەری وت :جا هیچی ترتان هەیە بیکەن؟". لەتێبینییەکی تریدا، کە کیسنجەر حەزی بەدووپاتکردنەوەی بوو، شای ئێران وتی "ئەگەر وڵاتە یەکگرتووەکان یارمەتی دۆستەکانی نەدات، ئەوا جەنگی ئەرەوی و کۆکوژی ڕوودەدلو، لەزۆرلایەنی تری دونیاشدا ڤێتنامی تر دێتەکایەوە". وەك چەند جارێکیش بەڕوونی دەرکەوت کیسنجەر کوردی بەدۆست دانەدەنا. لەبەرامبەر ئەوەشدا، کوردەکان لەداخی دڵیان هەرچەند دەیانبیست، کە کیسنجەر هەر بەناوهێنانیان هەڵدەچێت، زۆر خۆشحاڵدەبوون. بەناو سەرجەم کارگێڕانی وەزارەتی دەرەوەدا بڵاوبۆوە کە هەرکەسێك لەبەردەم کیسنجەردا ناوی کورد بهێنێت، ئەوا وەزیر توورە دەکات و خۆشی بەدەرکردن دەدا.

لەهەڵبژاردنی سەرۆکایەتییەکەی تشرینی دووەمی ئەو ساڵەدا، کە جیمی کارتەر بەسەر فۆرد دا سەرکەوت و، کیسنجەر لەشوێنەکەی لادرا، بەرزانی هەستی بە خۆشییەکی لەڕادەبەردەرکرد. جالەبەر ئەوەی کارتەر پارێزگاریکردنی مافی مرۆڤی لە سیاسەتی وەزارەتی دەرەوەیدا لەڕیزی پێشەوە دانا، بەرزانی بەوەی کەلەوانەیە بەڕێوەبەرایەتییە نوێکەی ئەمەریکا بایەخێکی زیاتر بە کوردی عێراق بدات هیوالکانی زیاتر دەبوون. بەڵام زۆری نەخایاند هیوا بڕاوبۆوە. چونکە بۆ چاوپێکەوتنێکی "دۆستانەو چاخواردنەوە" بۆ وەزارەتی دەرەوەیان بانگکردو، لەوێش یاریدەدەرەکانی کارتەر لەکاروباری خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا، بەڕوونی تێیانگەیاند، کەهیچ گۆڕانێك لەسیاسەتی ئەمەریکای ئەو ناوچەیەدا ڕوونادات و، سەرۆکی نوێش ناتوانێت پێشوازی بکات. بەرزانی دوای دڵەڕاوکێیەکی زۆر بەو چارە نووسەی خۆی قایلبوو. دراپەر دەڵێت: "بە هەموو ئەو دۆستانەی ناو کۆنگرێس و ئەو ڕۆژنامەنووسانەی هەیبوون، کەچی هێشتا بەرزانی نەیتوانی پێوەندی لەگەڵ باڵادەستانی دەستەڵاتی جێبەجێکردنی ئەمەریکادا دابمەزرێنێت" لەسەر قسەکەی دەڕوات و دەڵێت: "من لەگەڵ کورددا زۆر لەڕوو قسەمدەکرد، پێموتن مەحاڵە ئەوە ڕووبدات". بەرزانی لەگەڵ میوانە بیانییەکانیا هەمیشە هێمن و بەڕەوشت و دڵ و دەروون باش و، لەبەردەمیاندا دانی بە خۆیدا دەگرت و هیوا براوییەکەیی دەرنەدەخست. بەڵام لەناوەڕاستی کانونی دووەمی ۱۹۷۹دا، کە شۆڕشگێڕان شای ئێرانی نەخۆشی شێرپەنجەیان بەزەبر لەئێران دەرپەڕاندو ڕووەو تاراوگەیانکردەوە، بەرزانی شادمانبوو، بەخۆشحاڵییەوە دەیوت: "سەیرکەن بزانن ئەو پیاوەی ناپاکی لەگەڵدا کردم چی بەسەرهات!".

لەو ماوەیەدا بەرزانی زۆر بەخێرایی دەتوایەوە. دراپەر دانی بەوەدانا کەنەیتوانی ئەو سەرۆکەی کەهەمیشە ڕێزی لێگرتووە بەو حاڵە هەرە لاوازیەوە ببینێت: بۆیە لەبری خۆی ماری نان کەیسی نارد،کە کاربەدەستێکی کاروباری عێراق بوو لەوەزارەتی دەرەوەدا. کاتێك کەیسی

چووەلای، بەرزانی هەناسەی زۆر بەگران بۆ دەدرا، دەشیزانی ئەمە دوا دەرفەتێتی تا هەرچییەکی لەدڵدایە دەریبڕێت، کەبەڕاستی دەیویست بۆیەکێک لەبالادەستانی ئەمەریکای باسبکات. هەرچەندە پێشتر نزیکەکانی خۆی زۆریان دلوالیکردبوو کەلەبنی هەمانەکە بدات، نەیکرد، بەلام بەدووروودرێژی کەوتە قسەپێوتنی ئەمەریکا. هیچی تیادا نەهێشتەوەو هەرچی هەبوو نەبوو سەبارەت بەو زۆرستەمەی بەرامبەریکراو، چەنێك ناپاکی لەگەڵدا کرابوو دەرکاندنی، دەشیوت نابێت بەهیچ جۆرێك بڕوا بەئەمەریکا بکرێت و پشتی پێببەسترێت. دۆسکی دەیوت "بەرزانی، هەروەك بزانێت مەرگی نزیکبۆتەوە، بەدەم قسەکردنەکەیەوە تادەهات هەناسەی قورس دەبوو". تا ئەمڕۆشی لەسەربێت کەیسی هیچی سەبارەت بەو چاوپێکەوتنەی نەدرکاندووە.

دوانیوەڕۆی شوباتی ١٩٧٩ بەرزانی بەبێهۆشی لەخەستەخانەی زانکۆی جۆرج تاون کەوتبوو. کەسوکارەکەی بیست و چوار سەعاتە نۆرەیان لێدەگرت و بەسەرییەوەبوون. راسپاردەی بەرزانی، ناشتنی بوو لە "بەرزان"ی شوێنی لەدایکبوونی، ئەو بەرزانەی کەلە مێژوو هێزەکانی عێراق لەتۆڵەی ئەو سەلماندنی نەهێشتنی بەرد بەسەر بەردی کوردستانەوە، ڕووخاندبوویان. جا چونکە دەیزانی ڕەنگە عێراق رێگا بەهاتنەدی ئاواتەکەی نەدا، داوایکرد لە "شنۆ"ی کوردستانی ئێران، کە ٣٠ سال پێشتر شەڕێکی گرنگی لەبەرگریکردنی کۆماری مەهاباددا تیاکردبوو، بنێژرێت. گەورەترین ئاواتیشی ئەوەبوو لەکوردستان و لەکۆشی کەسوکارەکەیدا بمرێت. بەلام نەخۆشییەکەی زەیفی لێسەندو باری تەندروستیشی وانەبوو کە سواری فڕۆکەیەکی ئاسایی بکرێت، بۆیە فڕۆکەیەکی تایبەتی بە بوتڵە ئۆکسجینەوە بۆ بەکرێگیرا تا یارمەتی هەناسەدانی بدات و، لەدووی ئازاری ١٩٧٩دا بۆ کوردستانی ببەنەوە. رۆژی یەکی ئازار بەرزانی ویستی دایبنیشێنن. دۆسکی بەپەلە خەریکبووە پشتییەکەی بۆ دابنێ، وتوویەتی نا، ویستبووی لەسەر کورسی دایبنیشێنن. دۆسکی وتی " لەپڕێکا سەری بەپێشدا کەوت و مرد".

سی و دوو سال لەوەوبەر، بەرزانی بۆ سزادانی بەرگریکردنەکەی کۆماری مەهابادی، کە پێش ماوەیەکی کەم تێکشکێنرابوو، هێنرابووە تاران، لەوێ چاوی بە ئارچی ڕۆزڤێلت کەوتبوو، کەیەکەم لێپرسراوێکی ئەمەریکاییە دیبێتی، بەرزانی پێیوتبوو "من لەمەرگ باکم نییە" لەسەری دەڕوات و دەڵێت: "تەنیا دووشتم بەلاوە گرنگە، شەرەفم و بەڵێن بردنەسەر". کەچی ئەوەشیان پێ ڕەوا نەبینی. خۆنەگەرچی ئاواتی ناشتنەکەی کوردستانی هاتەدی. بەلام ئەوەش بەسەرهاتێکی تاڵی بەخۆوە بینی. بەیارمەتی حکومەتی نوێی شۆڕشی ئێران، لاشەکەی لەتارانەوە بەفڕۆکە بۆ ئورمێ برایەوە. وەك پێشتریش لەسەری رێککەوتبوون، دەبوا لەوێوە تەرمەکەی بەرێگای

زەمینیدا بۆ شنۆ بگوێزرایەتەوە. کەچی دەسەڵاتدارانی شۆڕشی ئیسلامی ئێران، لە دواساتدا بڕیاریاندا کە بەکۆپتەرێکی سەربازیانە بگوێزرێتەوە، ئەوەش لەنێوان لایەنگرانی بەرزانی و چەند کوردێکی ئێرانیدا، کەمەرگیز لێیخۆش نەدەبوون پێکدادان ڕوویدات، چونکە پێشتر بۆ دڵنیاکردنی شا، سەرکردە سەربازییەکانیانی گرتبوون و کوشتبوونیشی

لە شنۆ دە هەزار کوردێك، کەلەناوچە دوورەکانی وەك شاری سنەی باشووری کوردستانی ئێران و، ناوچەی بادینانی باکووری خۆرئاوای کوردستانی عێراقەوە، بۆ بەشداریکردن لەناشتنی بەرزانیدا کۆببوونەوە. تەرم ناشتنەکەی هیچ شتێکی وای تیادا ڕوونەدا کە باسکردن هەڵبگرێ. بەڵام سەرەتای ١٩٨٠ کۆمەڵێکی مارکسی ڕادیکاڵیانەی کوردی ئێران، گۆڕە ئاساییەکەیان لەکەدار کرد. بەرزانییەکان لاشەکەی مەلا مستەفایان هێنایەوەو لەناوچە شاخاوییەکانی ناوچەی ڕایاتی و ناو خاکی ئێرانی نزیك سنووری عێراق، ناشتیانەوە. لەپایزی ١٩٩٣دا، کۆپتەرێکی ئێرانی لاشەکەیی بۆسەر سنوورەکەی خۆیان گێڕایەوەو، لەوێشەوە جەلال تاڵەبانی کۆنەدۆستی و دوژمنی سەرسەختی دواتری و، ئەمجا مەسعودی کوڕی، بەڕێگەی زەمینیدا تەرمەکەیان بۆ بەرزان بردەوەو، لەوێش وەك خۆی ویستبووی نێژرا. لەکاتێکدا دوو کۆپتەر بەسەر مەردەمەکەدا دەسووڕانەوە، دوو فڕۆکەی مووشەك هاوێژی جەنگی "ئێف ١٦"ی ئەمەریکاییش بۆ ڕێزلێنان بەنزمی دووکەڕەت هاتن و چوون. بۆدواجار وڵاتە یەکگرتووەکان ویستی بەوە ناپاکێتیەکەی ١٩٧٥ی بسڕێتەوە.

ئەمەریکاییەکان لەناو ئەو بیانییە زۆرانەدابوون کەدەستیان لەپیسکردنی شەرەفی بەرزانی و، ڕێنەدان بۆ بەسەربردنی هەڵێنەکانیدا هەبوو. وڵاتە یەکگرتووەکان پێش چارەکە سەدەیەك، لەساڵی ١٩٧٢دا بڕیاری کیسنجەر بۆ پشتگیری لەپلانەکانی شا، خۆیان لەکێشەی کورد هەڵقورتاند. ئەگەر بۆ ساڵی ١٩٤٧ بگەڕێینەوە، ئارچی ڕوزڤێڵت دووربینییەکی تەواوی بۆ خواستە نەتەوەییەکانی کورد هەبوو، کە وای لێکردبوون سەرکێشی دامەزراندنی کۆماری مەهاباد بکەن، لەکاتێکدا زۆربەی چاودێران هەر بەشی یەکەمی جەنگی ساردیان دەبینی، کە مۆسکۆ پشتگیری کوردو ئازەربایجانییە یاخییەکانی لەدژی شا دەکرد، شاش بە پشتیوانی هێزەکانی بەریتانیاو ئەمەریکا سەرکەوتنی بەدەستهێنابوو. بەڵام ڕوزڤێڵت هەرکەزانی لە٢٢ی کانونی دووەمی ١٩٤٧دا فرمانی لەسێدارەدانی سێ کەس لەدیارترین سەرکردەکانی کۆماری مەهاباد دەرچووە، بەهەڵەداوان چوو "جۆرج ئەلن بۆ"ی باڵوێزی ئەمەریکا قایلبکات، کە دەبێت لەگەڵ شادا هەوڵی ڕاگرتنی جێبەجێکردنی فرمانی لەسێدارەدانەکە بدات. ئەگینا "گەر ئەو حوکمانە جێبەجێکرێن، ئەوا هەموو نەتەوەییەکوردەکانی دونیا ئێمە بەهاوکاری ئەو تاوانە

ئەم دیمەنە، دواجار کیسنجەری ناچارکرد زمان هەڵبێنێتەوە، بەشێوە تایبەتییەکەی خۆی دان بەوەدا بنێت، کە ئەو وای لەکورد کرد بڕوا بەووڵاتە یەکگرتووەکان نەکات. لە٥ی ئایاری ١٩٩٥دا و لە ستوونێکدا کەلەچەند ڕۆژنامەیەکدا بڵاویکردەوە، نووسیبووی "کەس چاوی بەرایی نایەت سەیری ئەو دیمەنە جەرگبڕو پڕ لە ئازارو ئەشکەنجانەی سەر سنووری تورکیاو ئێران بکاتو خوێن لەدڵی نەچۆڕێتو، بە شتێکیش خۆشحاڵنەبێت کە کارەساتی پەنابەرە کوردەکان نەمێنێت". بەڵام کیسنجەر کارەساتەکەی ١٩٧٥ی کورد، کەلەمە کەمتر نەبوو، بەم شێوەیەکاری تێنەکرد، ئەگەرچی ئەوکاتە تەلەفزیۆنەکان بڵاویان نەکردبۆوە. وەك ڕاپۆرتەکەی پایك دەڵێت، ئەوسا هیچ یارمەتییەکی مرۆڤایەتیانەی ئەمەریکای بۆ پەنابەرەکان دابین نەکرد. بەڵام ئەمڕۆ بۆ یەکەمجار دان بەوەدا دەنێتو دەڵێت:"ئەوسا بڕیارەکە بەسوودبوو، بگرە بۆ ئێمە وەك حکومەتی ئەمەریکا، بەئازاریشبوو"، بەرلەوەی بەتەواوەتی لەگەڵ سەرنجە کارییەکەی بەرژەوەندی نەتەوەیی ئەمەریکادا بگونجێت، دەڵێت:"ئەو دەرزەی لەو تاقیکردنەوەیەوە فێربووین بەدوا ناکامی تاقیکردنەوەکەوە بەند نەبوو؛ بەڵکو بەو بەڵێنەوە بەندبوو کە دابوومان. ووڵاتە یەکگرتووەکان دەبوا هەر لەسەرەتاوە مەودای یاریدەدانی کوردی دیاریبکردایەو، دەشبوا بەر لەیارمەتیدانەکان، زۆر بەڕوونی دیاریکردنەکەی نیشانبدایە".

لەمانگی ئابی ١٩٩١دا، نوێنەرایەتییەکی کورد لەسەردانی ئەمەریکایدا، بەدەستپێشخەری خۆی داوای سازکردنی چاوپێکەوتنێکی کیسنجەریکرد. دەرکەوت ئامانجی ئەو دەستپێشخەرییە لێخۆشبوونی ڕەسمیانەی کۆنە وەزیر بوو، دەربارەی ئەو هەڵانەی بەرامبەر بەکورد کردبوونیو لەبەرپرسیاریەتییەکەی ساڵی ١٩٧٥یشی خۆشببوون. کەمۆی ئەو چاوپێکەوتنەیان لەنوێنەرایەتییەکە پرسی، یەکێك لە ئەندامانی وەڵامی وا دایەوە، "هەر دۆستایەتییەکمان پێبکرێت پێویستمان پێیەتی". ساڵێك دواترو دوای چاوەڕوانییەکی زۆر کیسنجەر بەچاوپێکەوتنی خۆم ڕازیبوو، تا باسی کێشەی کوردی لەگەڵدا بکەم. ئەو پسپۆڕە کەلەسیاسەتی دەرەوەدا بەهێمنو دانبەخۆگر ناسرابوو، پەشۆکانی پێوەدیاربوو. هەر یاری بەکاتی چاوپێکەوتنەکە دەکرد، ئەمجا لەبەر چوونە فڕۆکەخانەو سەفەرکردنی، تەنیا بیست دەقیقەی بۆ من هێشتەوە. بەدرێژایی چاوپێکەوتنەکە کیسنجەر هەر لەسەعاتەکەی دەستی ووردەبۆوە، وەڵامەکانیشی بەڕستەی "ئەگەر پێویستبێت ئەمڕۆ سەرزەنشتی خۆم بکەم، یان ((کاتێك لەو ڕووداوەی ئەوسا وورد دەبمەوە، وادەزانم کە دەبوا زۆر ووریاتر بوومایە)) یان "زۆر بەووردی یارەکەم شێنەکردبۆوە". بەڵام سەبارەت بەڕەفتاری شا بەرامبەر بەکورد، دەیوت "ئەوساکە ڕەفتاریم بەڕەق دەزانیو، زۆر دڵڕەقانەو بەشێوەیەکی سامناکیش ڕەفتاری لەگەڵدا

دەکردن". ئەمجا بەرگری لەخۆی دەکردو دەیوت" خۆ شای ئێران پێش مۆرکردنی ڕێککەوتنامەی جەزائیر، ڕای ئێمەی نەپرسی".

سەبارەت بەو نامەیەی کەخۆی نوسیبووی و "ئێستا لای دۆستێکی ماوە"، لێمپرسی، بۆ داواکارییەکەی بەرزانی سەبارەت بەسەردانی واشنتۆنی لەمانگی کانونی دووەمی ١٩٧٥دا ڕەتکردبۆوە؟ وای وەڵام دامەوە کە، بیری نایەت، پێیوابوو نووسینی ئەو جۆرە شتانە بۆئەو "کەم ووریایی" دەگەیەنن. ئەی بۆ ئەو سەرنجەی لەراپۆرتەکەی پایکدایە، لەتێکەڵ نەکردنی کاری نهێنی و، تەبشیری، چی دەڵێت؟ ئایا قسەی خۆیەتی. وەڵامی دامەوە "ڕەنگە وتبێتم"، ئەمجا پرسیاریکرد: "جا بەڕاستی وتوومە؟"، ئەی دوای ساڵانێکی دوورودرێژ، دوای چاوپێکەوتنی کوردەکان، دەبێ گرنگترین شت بەلایەوە چی بێت؟ وتی: "ویستم ئەوەیان بۆ ڕوونبکەمەوە کە پێموابووە ئەوەی کردوومە دەبوا بمکردایە".

# پەراوێزەکانی بەشی شەشەم

## کیسنجەر- کاری خێرخوازیەکەی ناو مەشیرەتێکی چیایی

*"خاوێنکەرەوەیەکی تەواو" بڕوانە "ئەسەدوڵا عەلەم" من و شا
The Confidential Diary of Iran`s Royal Court, 1969-1977 London and New York, 1992 p. 224.

*"کاتێك ئەمیر ئەسادن ئەفشار" بڕوانە: William Shaweross. The shas Last Ride: The Fate of an ally, New York and London, 1988,p.164

*"هەر ئەوەندەی لە گەندەوی فارسدا -مەبەست شایە- بە پارێزەری بەرژەوەندی خۆمان" بڕوانە:
George W. Ball, (Issues and Implications of the Iranion Crisis, December 1978.

*"ئەمە ئەو دەربڕینەبوو کە": The Pike Committee ReportNottingham, 1977 p.195-198- 212-216.

*" ڕاپۆرتە پوختە ٤٢ لاپەڕەییەکەی" بڕوانە: "سەرلێدانەکەی ڕیتشارد نیکسون ی مایسی ١٩٧٢ بۆ ئیمپراتۆرییەتی ئێران" دوکومێنتی ژمارە ٠٠٧٦٧ی ئەرشیفی ئاسایشی نەتەوەیی واشنتۆن، وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا. نزیکەی چوار لاپەڕەیەکی ئەم دوکیومێنتە سڕاوەتەوە کاتێك کە بەشێکی بە "نهێنی"و بەڵام بەشی زۆری بە "هێجگار نهێنی" ڕێکخراوە. بەهەرحاڵ پێناچێ دراوەکەپێوەندی بەکوردەوە هەبێت.

*" ئەفسەرێکی گرنگی هەواڵگرانی ئیسرائیل" دیڤید کمحی:
The Last Option, After Nasser, Arafat, Saddam Hussein: The Quest of Peas in the Middle Eest, London 1991 p. 1194.

*"بەرزانی لەبەدیهێنانی پێوەندیکردنی بە- تۆماس کارولان-" چاوپێکەوتنێکی ئەحمەد چەلەبی.
١٠ی ئابی ١٩٩٦، لەندەن.

*"گۆڕانکارییە کوتوپڕە گشتییەکەی نیکسون" بڕوانە: Tad Szulc, The Illusion of Power, Foreign Policy in the Nixon Years, New York 1978 pp 582-585.
*"زۆرمان لەبارەی کوردەوە نەدەزانی". چاوپێکەوتنێکی هێنری کیسنجەر. مارتا ڤاینیارد/ ماشاسوتس. ٢٣ی حوزەیرانی ١٩٩٢.
زۆری لەبارەی کوردەوە دەزانی ((چاوپێکەوتنێکی)) ریتشارد هێلمز واشنتۆن دی سی ٢١ی کانونی یەکەمی ١٩٩١.
*"کوردی بەبەشێك لەبەڵێنی چەك فرۆشییەکەی دادەنا". چاوپێکەوتنێکی موریس دراپەر. واشنتۆن دی سی. ١٨ی کانونی یەکەمی ١٩٩١.
*"پەراوێزەکە بەچاوپێکەوتنێکی "ئەحمەد چەلەبی"یەوە بەندە کەلە ١٠ی ئابی ١٩٩١دا لە لەندەن لەگەڵیدا کراوە.
*"ئەنانەت پەرلەوەی بە رەسمی رێککەوتنامەکە ببەستن" بڕوانە ئەسەد عەلەم، من و شا. لاپەڕە ١٢٩.
*"رۆژێك دوای گەڕاندنەوەی نیکسون" هەمان سەرچاوە لاپەڕە ٢٢٥.
*"ستراتیژمان روون و ئاشکرابوو" چاوپێکەوتنێکی کیسنجەر. ٢٣ی ئاب ١٩٩٢.
*" سەفەرێك لە سەفەرە نارەسمییە یەك لەدوای یەکەکانی گۆڵداماتیر"، بڕوانە ئەسەد عەلەم "من و شا" لاپەڕە ٢١٥.
*"هەموو یارمەتییەکانی ئەمەریکاش بۆ کورد ... لە ١٦ ملیۆن دۆلار تێپەڕی نەدەکرد". کەمحی: The Last Option p.194. کە دەڵێت: "یارمەتییەکانی ئەمەریکا بۆ کورد لەڕێگای تارانەوەبوو، با بەو شێوە زۆرەش نەبووبێت کە بە تەمای بوین.
*"بەشێك لەو یارمەتیانە لووشدەدەن" لەنامەیەکی سیامەند عوسمانی ٢٧ی کانونی دووەمی ١٩٩٣دا بۆ نوسەر.
*"واشنتۆن .... دەمکوتکرد". چاوپێکەوتنێکی تۆماس کارولان ئەستەنبوڵ. ٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٩١.
*"زۆر بەڕوونی پێیوتین"، چاوپێکەوتنی دکتور مەحمود عوسمان. سلێمانی. ٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٩١.
*"لەناخییەوە"، چاوپێکەوتنێکی سامی عەبدولڕەحمان. ١٠ی تشرینی یەکەمی ١٩٩١ ڕەواندوز.
*"کەبەرزانی چاوی بە ئارچی رۆزڤێلت کەوت"، بڕوانە: Archie Roosevelt For Lust of Knowing: Memoirs of an Intelligence Officer, Boston 1988, p. 284.

*"چەند کوردێکی کە" چاوپێکەوتنێکی عەبدولڕەحمان قاسملو. ٦ی تەموزی ١٩٨٩. پاریس.

*" ئەوا یلن دژی دوستان.."، نامەیەکی بەرزانی بۆ کۆنگرێس و سیناتۆرەکان ٢٤ی شوباتی ١٩٩٧.

*"لەبەرژەوەندی ئەمریکا نەئەبوو.."، نامەیەکی بەرزانی بۆ جیمی کارتەر. ٩ی شوباتی ١٩٩٧.

*"هیچ زەمانەتێکی نەدابێنی"، لەچاوپێکەوتنێکی جیم هۆگلاندی ٥ی تشرینی دووەمی ١٩٩١ وەرگیراوە.

*"کاریگەرێتی شێخ ئەحمەدی برا گەورەی"، چاوپێکەوتنێکی ١٠ی تشرینی یەکەمی سامی عەبدولڕەحمان، لە ڕەواندوز.

*"لەو بڕوایەدا بوو ... کە هیچ شتێك ... ناگرێت"، چاوپێکەوتنێکی موحسین دزەیی. لەندەن. ٢٦ی تشرینی دووەمی ١٩٩١.

*"ژەنەڕاڵ بەرزانی پێی وابوو وڵاتە یەکگرتووەکان"، چاوپێکەوتنێکی دکتۆر مەحمود عوسمان ١٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٩١. سلێمانی.

**"ئەوی ڕاستی بێت هیچ سیاسییەکی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست پێشبینییەکی وای بۆ نەدەکرا" نامەیەکی سیامەند عوسمان بۆ نووسەر. ٢٧ی کانونی دووەمی ١٩٩٤.

*"لەیەکەم ئێوارەی دەستپێکردنەوەی شەڕدا"، چاوپێکەوتنێکی سامی عەبدولڕەحمانی ١٠ی تشرینی یەکەمی ١٩٩١. ڕەواندوز.

*"خۆیان بەو بەڵێنە زارەکیانەی ... بەستەوە" نامەیەکی بەرزانی ٩ی شوباتی ١٩٧٧ بۆ جیمی کارتەر.

*"بەهیوام دواڕۆژانی تەمەنم لەپەکێن بەسەربەرم". چاوپێکەوتنێکی محەممەد دوسکی ٢٧ی تەموزی ١٩٩١. لەواشنتۆن دی سی دا بڵاوکراوەتەوە.

*"تێناگەم چی دەگۆڕا" چاوپێکەوتنێکی کیسنجەر. ٢٣ی ئابی ١٩٩٢.

*"گە نجیکی کامل" چاوپێکەوتنێکی هێلمز لە واشنتۆن دی سی. ٢١ی کانونی یەکەمی ١٩٩١.

*"گریهکۆ لەبەغدا" بڕوانە: William Safire, Safires Washington, Times Backs 1980 p. 85. کەتیایدا سافیر بۆ قسەیەکی خۆی دەچێتەوە، کە لەنیویۆرک تایمسی ١٢ی شوباتی ١٩٧٦دا لە ستوونێکدا بڵاوی کردبووە.

*"ئێمە لەوبەهێزترین کەبیری لێدەکەیتەوە" و "شەڕبێتەوە ئەوا" بڕوانە:
Elaine Sciolino, لە کتێبەکەیدا: The Outlaw State : Saddam Husseins Quest for Power and the Gulf Crisis, New York 1991,pp

*"بریتانییەکان و شەتولعەرەب ... بەریتانیەکان لەوە نەترسان کە ئەگەر ئێران لە شەڕێکی دوا ڕۆژدا بۆ لایەن بمێنێتەوە ئەوا دەشێ نەیەڵێت پاپۆڕە جەنگییەکانی بەریتانیا بگەنە بەسرە. بڕوانە کەممی: .The Last Option p.193

*"ئەگەر لەسوچێکدا قەتیسیان کردین" بڕوانە: -Sciolino, The Outlaw State, pp. 277 278

*"لەجارێک زیاتر قەرەداغی لەکتێبەکەی:

Gererd Chaliand, A People Without a Country p. 226.

*" بوونی کورد وەک ئاوی بۆرییەک وایە" چاوپێکەوتنێکی ئێریک رولیە لە پاریس. ۲۳ تشرینی یەکەمی ۱۹۹۳.

*"تۆپی ئێرانی لەگەڵ موشەکی راپێری بەریتانی لەسەر سنوور". ئەسەدولعەلەم. من و شا. لاپەڕە ٤١٨.

*"ڕەنگ زانیمان" نامەی ۹ی شوباتی ۱۹۷۷ بەرزانی بۆ سەرۆک جیمی کارتەر.

*"بەهاتنی مانگی ئەیلولی ۱۹۷٤". ئەسەدولعەلەم. من و شا. لاپەڕەی ۲۸۷و ۲۹۱.

*"شەڕی شێوان" هەمان سەرچاوە لاپەڕە ٤١١.

*" کەچی چەند هەفتەیەک ... چاوپێکەوتنەکەی دوادەخرا". چاوپێکەوتنی موحسین دزەیی ۲۸ی تشرینی دووەمی ۱۹۹۱. لەندەن.

*"تەڵە لەعەمان و قاهیرە" چاوپێکەوتنی موحسین دزەیی ۲۸ی تشرینی دووەمی ۱۹۹۱ لە لەندەن، و چاوپێکەوتنی چەلەبی ۱۰ی ئەیلولی ۱۹۹٦.

**"نامەکەی ۲۲ی کانونی دووەمی ۱۹۷٥ی بەرزانی بۆ کیسنجەر" چاوپێکەوتنی دوسکی لەواشنتۆن دی سی ۲۷ تەمموزی ۱۹۹۱.

* کیسنجەر لەمێژوویوو لەوکلە بەتەواوی بەئاگابوو چاوپێکەوتنی((دوکتۆر مەحمود عوسمان ۹ی تشرینی یەکەمی ۱۹۹۱ سلێمانی)).

*"نامەکەی ژەنەراڵی بەرێزم-". چاوپێکەوتنی دوسکی لەگەڵ واشنتۆن دی سی. ۲۷ی تەموزی ۱۹۹۱.

*"یەکێک بووە لەهەڵبژاردنەکانی شا" و "هەندێ قسەی کەش". چاوپێکەوتنی "ولیام ئی کوڵبی" لە واشنتۆن دی سی. ۲۱ی کانونی یەکەمی ۱۹۹۱.

*"وابزانم واشنتۆن بە ڕێکەوتننامەکەی جەزائیر خۆشحاڵبوو". چاوپێکەوتنێکی هێلمز لەواشنتۆن دی سی. ۲۱ی کانونی یەکەمی ۱۹۹۱.

*"بەلای ئێمەوە یەکێکە لەو سەرکردە دەگمەنە..." بڕوانە:

Kissinger, White House Yeers, New York 1975 p. 1261.

*"ئێرانیش وەکو ئێمە..." بڕوانە ڕاپۆرتەکەی کۆمیتەی پایک.

*" وەک لەسەرپانێکەوە بەربدەنەوەخوارێ وابوو" و "لەم ڕێککەوتنەیدا ڕای ئێمەی نەپرسیوە". چاوپێکەوتنێکی کیسنجەر. ٢٣ی ئابی ١٩٩٢.

* پەراوێزەکە، چاوپێکەوتنێکی ئەحمەد چەلەبی. ١٠ی ئابی ١٩٩٦.

*"ئاو کەسانی دیش": ئەنتۆنی پارسونس باڵوێزی پێشووی بەریتانیا لە ئێران و لەناوەڕاستی حەفتاکاندا جێگری وەزیری دەرەوە بوو بۆ کاروباری خۆرهەڵات و بیانی، دەڵێ: لەزستانی ١٩٧٤ – ١٩٧٥ دا بەرگریکردنی کورد بەتەواوەتی کۆتایی پێهاتبوو، بۆیە شا دەبوایە ڕێکبکەوتایە یان لەگەڵ عێراقدا بکەوتایەتە شەڕێکی ڕاستەقینەوە. چاوپێکەوتنێکی "پارسونس. ٢١ی تشرینی دووەمی ١٩٩١. لەندەن.

*"کێشەی کوردو کۆتاییە جەرگبڕەکەی". بڕوانە:

Kissinger, White House Yeers, New York 1975 p. 1261.

*"بڕیارەکەی شای ئێرانی ١٩٧٥". هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ١٢٦٥.

*"کەچەلەبی چوو بۆلای بەرزانی ... ئاگاداری بکاتەوە". چاوپێکەوتنی چەلەبی ٤ی کانونی یەکەمی ١٩٨٦.

*"بڕیارێک بوو .. وەک وڵاتێک کەخاوەن سەروەری خۆی بێت دابووی".

Kissinger, White House Yeers, New York 1975 p. 1261.

*"پێش نزیکەی چوار یان شەش هەفتە" چاوپێکەوتنێکی کیسنجەر. ٢٣ی ئابی ١٩٩٢.

*"خوێن لەدڵمان دەچۆڕێت": ڕاپۆرتەکەی کۆمیتەی پایک لاپەڕە ٢١٥-٢١٦.

*"کارە نهێنییەکان و کارە..." بڕوانە ڕاپۆرتەکەی کۆمیتەی پایک لا ١٩٨.

*"دەیزانی هەڵوێستی زۆر لاوازە". چاوپێکەوتنی موحسین دزەیی ٢٨ی تشرینی دووەمی ١٩٩١. لەندەن.

*"ئایا بنکە سەرەکییەکان ... پێوەندیان؟". بڕوانە ڕاپۆرتەکەی کۆمیتەی پایک.

*"سەرکەوتووترین گەشتبووە". بڕوانە: عەلەم: من و شا، لا ٤٢٧-٤٢٨.

"کۆتاییمان ڕاگەیاند" چاوپێکەوتنێکی موحسین دزەیی. ٢٨ی تشرینی دووەمی ١٩٩١. لەندەن.

*"بەرادەیەک تووڕە ببوو دەلەرزی". چاوپێکەوتنێکی موحسین دزەیی. ٢٦ی تشرینی دووەمی ١٩٩١. لەندەن

*"شای ئێران چاوپێکەوتنەکەی تا ١١ی ئازار دواخست". کامەران قەرەداخی، لە

Chiliad, S People Without a Country, The Kurds and Kurdistan p.215.
خراوەتە بەرچاو.
*"ئێستا چی بەگەلەکەمان بڵێین!" چاوپێکەوتنێکی دوکتۆر مەحمود عوسمان. سلێمانی. ٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٩١.
*"من دەزانم بەڵگەنامەی رەسمی عێراقم سەبارەت بە کەنداو بینیوە". چاوپێکەوتنێکی دزەیی. لەندەن، ٢٧ی تشرینی دووەمی ١٩٩١.
*"منیش لەوەڵامدا وتم" عەلەم "من و شا" لاپەرە ٤١٩.
*"خۆ بەدەست عێراق یان ئێمەوە دەدەن". لەچاوپێکەوتنێکی جید هۆگلاندی ٥ی تشرینی دووەمی ١٩٩١دا لەپاریس، دەرکەوت.
*"هەستی بەبێوەییو قەتیسماوی خۆی کرد" عیسمەت شەریفی وانیلی لە: کتێبەکەی
Chaliand, A People Without a Country, p.173n.
* "نامەیەکی خواحافیزی ناشکرا، قەرەداخی لەکتێبەکەی
Chalind A people whithout acouttry, p. 198n.
*"رێگا بەیەکێك لەکوردەکان بدات، چاوپێکەوتنێکی سامی عەبدولرەحمان ١٠ی تشرینی یەکەمی ١٩٩١. رەولندوز.
*"بەڵام بێسوود بوو، عیسمەت شەریف وانیلی لە:
Chalind A people whithout acouttry, p..ا

*"بەرزانی بەدەم ئەم بڕیارەوە زۆر دەتلێتەوە" چاوپێکەوتنێکی موحسین دزەیی ٢٨ی تشرینی دووەمی ١٩٩١. لەندەن.
*"ئەگەر بەرزانی ... بمایاتەوە" چاوپێکەوتنی سەرکردەیەکی کوردی باڵادەست کە نەیدەویست ناوی ببرێت. ١١ی تشرینی یەکەمی ١٩٩١. شەقڵاوە.
*"هیچ شۆڕشێکی ترم بەبیردا نایەت" عیسمەت شەریف وانیلی، لە:
Chaliand, A People Without a Country, p. 177.
*" مردنی عیسی سوارە" چاوپێکەوتنێکی وەشبار زنباری. ١٨ی کانونی یەکەم ١٩٩٢. سەلاحەدین.
**"سزاکە عێراق بەدووڕو درێژی"، قەرەداخی:
Chaliand, A People Without a Country, p. 216
*"جینۆ سایدی کەلتور" چاوپێکەوتنی ولیام نیکلتون. ٢ی کانونی دووەم ١٩٩٢ ڤیەننا

*" ئەگەر گەورە ئیهرسراوانی ئەمەریکا". بڕوانە ڕاپۆرتەکەی پایك.

*"لەو باوەڕەدابوو هۆگلاند ئیهرسراوێکی ئەمەریکاییە"، چاوپێکەوتنێکی هۆگلاند. ٥ی تشرینی دووەمی ١٩٩١. پاریس.

*"تەواو تووڕە ببوو"، چاوپێکەوتنێکی دوسکی لەواشنتۆن دی سی. ٢٧ی تەموز ١٩٩١.

*" ئەوا کارێکمان دەکرد" کەرایگرین"، چاوپێکەوتنێکی کۆڵبی لەواشنتۆن دی سی. ٢١ی کانونی یەکەمی ١٩٩١.

* حاییم لیڤاکۆڤ- چاوپێکەوتنێکی حاییم لیڤاکۆڤ لەواشنتۆن دی سی ٢٠ تشرینی یەکەمی ١٩٩١.

**"بەرزانی سیاسە تەمەدارتان کوشت"، چاوپێکەوتنێکی دوسکی لەواشنتۆن دی سی ی٢٧ تەموزی ١٩٩١.

*"دراپیر پێی وابوو"، چاوپێکەوتنێکی دراپیر لەواشنتۆن دی سی. ١٨ی کانونی یەکەمی ١٩٩١.

*بەرزانی بروسکەیەکی لەشای ئێرانەوە پێگەیشت، چاوپێکەوتنێکی دۆسکی ٢٧ تەموزی ١٩٩١.

*رێك لەگێرانەوەی چینییەکانی دەکرد چاوپێکەوتنێکی دراپیر لەواشنتۆن دی سی ٨/ی کانونی یەکەمی ١٩٩١.

*"کیسنجەر هێند پێی لەسەر .... دادەگرت"، James A. Bill, The Eagle and the Lion, New Haven, Connecticut, 1988, p.219.

*"چاهیچی ترتان هەیە بیکەن". بڕوانە: Kissinger, White House Yeers, p. 1265.

*" بەرزانی هەستی بە خۆشییەکی لەڕادەبەدەر دەکرد"، چاوپێکەوتنی دزەیی. ٢٨ی تشرینی دووەمی ١٩٩١. لەندەن.

*"بەهەموو ئەو دۆستانەی ..." چاوپێکەوتنێکی دراپیر. ١٨ی کانونی یەکەمی ١٩٩١.

*"سەیرکەن بزانن ئەو پیاوەی ناپاکی لەگەڵدا کردم بزانن چی بەسەرهات" چاوپێکەوتنێکی دوسکی ٢٧ی تەموزی ١٩٩١.

*"من لەمردن باکم نییە". بڕوانە: Roosevelt. For Lust of Knowing, p.284.

*"ترسی گوللە بارکردنیان هەیە!" هەمان سەرچاوە لاپەڕە ٢٨٨.

*"ئەو پسپۆڕە لەسیاسەتی دەرەوەدا کەبەهێمنو دان بەخۆگر ناسرابوو". چاوپێکەوتنی کیسنجەر لەگەڵ نووسەردا. ٢٣ی ئابی ١٩٩٢.

*"چلەکە بەدووږو درێژی"، لەچەند چاوپێکەوتنێکی ١٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٩١دا، لەگەل، حاییم لیڤاکوڤ، مەناحیم ناڤوت، تسوری ساگای لە تەلئەبیب.

*"بالادەستێکی مۆساد"، چاوپێکەوتنێکی ئەلوف هاریڤێن. ئورشەلیم. ١٧ تشرینی یەکەمی ١٩٩١.

*"ئەنگلۆ ساکسۆنییەکان هەمیشە کەیفیان بەگەلە سەرکەکان هاتووە"، بڕوانە کتێبەکەی Archie Roosevelt Jr. For Lust of Knowing: Memoirs of an Intelligence Officer Boston 1988. p.205.

*"کوردێك بەتفەنگێکەوە ... لەسەر شاخێ دابنێ" چاوپێکەوتنی ساگای. تەلئەبیب. ١٨ی تشرینی یەکەم ١٩٩١.

*"بەلام چار چار دابڕاوە کەللە رەقەکان"، بڕوانە:

I an Black and Benny Morris, Israel s Secret War: The Untold Story of Israel Officer, Boston, London 1991 . pp. 77-78.

*"سیاسەتی دووروبەر" بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو لەگەل:

Dan Raviv and Yossi Melman, Evry Spy a Prince, The Complete History of Israils Intelligence Community, Bosten, 1991, p.21.

*"هەردوو ... ترسی زۆریان ... هەبوو"، بڕوانە:

David Kimche, The Last Option, After Nasser, Arafat and Saddam Hussein, The Quest of Peace in the Middle East, London 1991. p. 190.

*"کامەران عەلی بەدرخان"، بڕوانە سەرچاوەی پێشتر:

Joyce Blau و چاوپێکەوتنێکی Blach and Benny Morris, Israel s Secret War. Dairy of Mayor Noel on Speear پاریس ١ی کانونی دووەمی ١٩٩١. و یاداشتەکانی Duty in Kurdistan بەدرخان دەلێ، بنەماڵەکەی لای عوسمانییەکان بەڕادەیەك بەئاژاوەچی ناسرابوو کە لەشفرە تورکییەکاندا کۆمەڵێك شفرەی تایبەت بە بەدرخان هەبووە.

*" رۆژنامەنووسێکی بیانی ... نارد"، چاوپێکەوتنی ئیبراهیم ئەحمەد. ٢٥ی تشرینی دووەمی ١٩٩١. لە "سەتن. سەری" ئینگلترە. جۆرێکی کەی سەرگوزشتەکە ئەوەیە کە دوو سیخوڕی ئیسرائیلی بەناوی رۆژنامەنووسی ئەڵمانییەوە لەشتەکەدابوون: بڕوانە نامەی دکتۆرای سیامەند عوسمان:

Contribution historique a l etude du- Parti Demokrati Kurdistani – Iraq 1946 – 1970, Eccole des Hautes Etudes en Seinces Sociqls: Paris 1985.

*"ئیسرائیلییەکان پەتاتەی بچووك بوون"، چاوپێکەوتنێکی سیامەند عوسمان. لەندەن ٢٤ی تشرینی دووەمی ١٩٩١.

## (٧)

# سواڵکەرە کوێرەکە: چلەیەك بەبەشداریتی هەموو دونیا

ئەو ئێوارەیە، تەنانەت گەر بەمێژووی لێڵی کارە نهێنییە "هەواڵگرییەکان- ئیستخبارات"ی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستیش حسابی بۆ بکرێت، ئێوارەیەکی سەیربوو. لەیانەی فەرمانبەرانی شاری تەلئەبیب، بە سەدان ئیسرائیلی، کە بە بانگەوازێکی نووسراو بۆ ئامادەبوونی کۆڕێك بانگهێشتکرابوون، "ئیسحاق ڕابین"ی سەرۆك وەزیرانی پێشوو، هەروەها سەرۆکی پێشووی ئەو سەردەمەی دەزگای "مۆساد"و چەند ئەفسەرێکی دەزگاکەیانی لەناودابوو، ئەمە جگەلە چەند ئەفسەرێکی سوپای ئیسرائیل کە لە شتێکدا بەشداریانکردبوو ئیسرائیل هەمیشە بەکاری نهێنی ناوی دەهێناو پێشی لەسەر ئەوە دادەگرت، ئەگەرچی لەزۆربەی نهێنییەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستیش ئاشکراتربوو[٢٩]. لەو کۆڕە ٤٥ دەقیقەییەی، کە بەدەم سروودی مەرگی تیپی مۆسیقای سەربازییەوە، چەند وتەیەکی کورت و بەسۆزی وا کە لەگەڵ کاریان دەکرد تیادا خوێنرایەوە، ئاڵای ئیسرائیل هەڵکرا، بەڵام بۆ ڕێزگرتن و یادی هاوڕێیەکی چەك ئاڵاکە نەویکرا. بێهاوتایی ئەم کۆڕە لەوەدابوو کە دوای چل ڕۆژ بەسەر مردنی ئەو پیاوەدا بەسترا، بەتایبەتی "چلە"ش لەئیسلامدا یادی مردووی پێدەکرایەوە، ئیسرائیلییەکانیش حەزیان بە یادکردنەوەی مردووی موسوڵمانان نەدەکرد.

بەڵام ئەوکەسەی ئەو شەوە کۆڕی ڕێزگرتنەکەی بۆ سازکرا مەلا مستەفای بەرزانی بوو، کە بەدرێژایی دە ساڵێك ڕەخنەی لێدەگیرا، چونکە بۆ لاوازکردنی حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی

---

[29] مەناحیم بێگنی سەرۆك وەزیران یەکەم باڵادەستی ئیسرائیلیبووە، کە لە ٢٩-٩-١٩٨٠دا دابینکردنی پارەو چەکو مەشقکردنی ئیسرائیلی بۆ کورد ئاشکرا کرد، بەوەش کاربەدەستانی مۆسادی تووڕەکرد. بۆ ڕۆژی دوایی ڕۆژنامەکانی ئیسرائیل سەردانەکانی بەرزانیان لە ١٩٦٠ەوە تا ساڵانی حەفتا، کە چەند جارێك بەنهێنی بۆ ئیسرائیل هاتبوو، ئاشکراکرد.

عێراق هاوپەیمانێتی ئیسرائیلی دەکرد. لەنەخۆشخانەی زانکۆی جۆرج تاون بۆ یەکجارەکی چاوی لێکنا، لەئاوارەییە پڕ سوێکەی ئەمەریکایدا، ئەسکینی بەوەدەمات کەهەموو ئەو سەرۆکە دەوڵەتانەی نەخشەی ناپاکێتییە نارەواکەی ١٩٥٧ی جەزائیریان داڕشتبوو بەسزای خۆیان گەیشتن. ریچارد نیکسۆنی سەرۆک کۆماری وڵاتە یەکگرتووەکان، بەهۆی رسوایییەکەی واترگەیتەوە ناچاربوو خۆی دەست لەکاربکێشێتەوە. هێنری کیسنجەری وەزیرە پیسەکەی دەرەوەی ئەمەریکاش بەهەڵنەبژاردنەوەی جیراڵد فورد لە ١٩٧٦دا، لەکارەکەی دوورخرایەوە. "هواری بۆمیدیەن"ی سەرۆکی جەزائیریش کەلەکورد فرۆشییەکەی ١٩٧٥دا دەستی هەبوو، تا ماوەیەکی زۆر بەدەم ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆرەوە تلایەوەو لەکانونی ١٩٧٨دا سەری نایەوە. هەر دوو هەفتەش پێش ئەو شۆڕشی ئیسلامی، محەممەد رەزا شا پەهلەوی بەرەو ئاوارەیی دەرپەڕاند.

وەك کۆڕی چلەکەی بەئاشکرا دەریخست، هیچ کام لەو ئیسرائیلیانەی کە بەشداری چلەکەیانکردبوو، لەتێکشکاندنەکەی بەرزانیدا هەستیان بەهیچ ناپاکێتییەك نەدەکرد، بەڵام واش وەك دوایی باڵادەستێکی مۆساد درکاندی، هەرچەندە ئەو رێزە ئاسایی و راستگۆییەیان بۆ بەرزانی و کێشەکەی هەبووە بەڵام "بیرەوەرییەکانیان نەئاسایی و نە ئاسانیش بووە" تا لەبیریان بچنەوە. ئەوانەشیان کە دەستیان لە کاروباری کورددا هەبووە، بەدەم رۆژگارەکەوە دڵی خۆیان بەوە دەدایەوە کە ئیسرائیل بەهیچ جۆرێك دەستی لەو ناپاکییەی ئێران و وڵاتە یەکگرتووەکاندا نەبووە کە لەگەڵ کورد دا کردیان. ئیسرائیلییەکانیش وەك چەندین ئەفسەری دەزگا هەواڵگرەکانی دی، کەلە هەر شوێنێکی ئەم دنیایەدا بەشداری کارێکی نهێنیانکردبێت، حەزیان دەکرد کەیادی سەرکەوتنەکانی رابردوویان و دەستکەوتە بەدیهێنراوو ئەو دۆستایەتیانەشیان بکەنەوە کەلەدووروڵات بەدەستیان هێنابوو.

لەناوەڕاستی شەستەکانداو بەدرێژایی دوو ساڵی رەبەق، پارمەتییەکانی ئیسرائیل بزووتنەوە ئاڕادمیەك ئەناسراوەکەی بەرزانیان لەتیاچوون و، نیمچە سەربەخۆیەتییە ١٠ ساڵییەکەی زۆربەی باکووری عێراقی ژێر سایەیدا رزگارکرد. مۆساد پێی وابوو هەموو پشتگیریکردنەکەی کورد، کەهەر بەچەکی سووك چەند تیپێکی سەربازیانەی عێراقیان بەتەواوەتی خەریك و ماندووکردبوو، نەدەگەیشتە نرخی فڕۆکەیەکی مووشەك هاوێژی "میراج"ی فەرەنسایی. بەدوور لەئاکامی کارەساتەکە، دوا مەبەستیشیان کە خەریککردنی سەرجەم تیپەکانی سوپای عێراقبوو، چونکە ئەگەر وانەبوایە، ئەوا بەپێی بۆچوونەکانی مۆساد سوپای عێراق لەهەردوو شەڕی ١٩٦٧و ١٩٧٣ی عەرەبدا، لەدژی ئیسرائیل بەشداریاندەکرد، بۆ

ئەچووەسەر. ئەو ئیسرائیلیانەی بەشداری سەرکێشیکردنەکانی کوردیانکردبوو، دوای ١٠ ساڵ زیاتر لەچاوپێکەوتنێکمدا ئەیانتوانی پەرۆشیان بۆ ئەو رۆژگارە بشارنەوە، رێی کاریگەرێتی سەرنجەکانیان بۆ دونیایەکی وا ئاوەوا بگرن، بەشانازییەوە ئەو وێنانەیان نیشانئەدا کە لەپاڵ سەرکردەکانی کوردەوە گرتبویان، لەسەر قاوە خواردنەوە پێیان لەو شەڕانە ئەکردەوە کەبەشداریان تیادا کردبوو، رەخنەشیان لەو تەکتیکە نوێیە ئەگرت کەلەم دواییەدا کوردی تێکەوتبوو، لەچاوەنوورسی بەرامبەرە کۆنەکانیشیان ئەپرسییەوەو ئاواتی لەنوێ پێکگەیشتنەوەیانیان ئەخواست. باڵوێزێکی بەریتانیایی، کەلە چلەکاندا لەعێراق بووەو چارەی کوردی نەویستووە، ئەیوت، "ئەنگلۆساکسۆنییەکان هەمیشە کەیفیان بەگەلە سەرپەرەکان هاتووە ئەو ئیسرائیلیانەش دڵیان بەکوردە چیاییەکان و، کراوەییان و، ئازایەتییان لەشەڕدا و، خۆگریان لەبەر کارەسات و ناخۆشیدا چووە". ئەفسەرێکی مۆساد بەپێداگرتنەوە ئەیوت: "کوردینە بەتفەنگێک و سەلکەپیازێکەو لەتە نانێکەوە لەسەر شاخێک ئەبنێ، جا بزانە چۆن پەک تابووری تەواو سەربازت بۆ رائەگرێت". ئیسرائیلییەکان رایانئەگەیاند کە کوردیش وەک خۆیان بە کەمایەتییەکی چەوساوە ئەبینن، ئەگەرچی ئەم کەمایەتییە پشتگیرییەکی سیاسیانەی نێو دەوڵەتی و، هیچ دەروازەیەکی سەر دەریاو، کۆمەڵێکی کوردی رۆشنبیری وڵاتیان نییە کەبە هەموو دونیادا بڵاوبوبنەتەوەو پشتگیری پێویستیان بۆ دابینبکات. بەڵام جار جار دابڕاوە کەللە رەقەکان، ئەوەیان یەکلائەکردەوە کەئیسرائیل کوردی بۆ بەدیهێنانی ئامانجە تایبەتییەکانی خۆی بەکارئەهێنا.

وەک دواتریش دەرکەوت، ئەزموونە کوردییەکە بۆ ئیسرائیل میوەیەکی تفت و تاڵ بوو، کەبەردەوام ئارەزووی ترسناکی کارە نهێنییە بەگومانەکانی لا پەیدا ئەکردن. دواتریش دەرکەوت کەئەو ئیسرائیلیانەی لەکوردستاندا کاریانئەکرد، لەچەندین کاری نهێنی زۆر شوێنی دونیادا، هەر لەباشووری سودان و ئەسیوبیاوە بیگرە، تا ئەگاتە لبنان و ئەمەریکای لاتینی، کەلەماوەی بیست ساڵی دواتردا ئاوبانگی ئیسرائیلیان زڕاند، بەشداریانکردبوو. هەندێکیشیان کەوتنە دوای پێوەندییە ئەشیاوەکانی مارۆنییەکانی لبنان و، چەتەی موخەدەرات و، دیکتاتۆرانی وڵاتانی ئەمەریکای ناوەڕاستی وەک ئەناستاسیو سوماز و دیبەیلی نیکارا گواو، مانوێل ئەنتۆنیو نوریگای پەنەماوە.

لەپێژانی شەڕی ١٩٥٦ای سوێسی عەرەب ئیسرائیلدا، کەلوکاتە ئیسرائیل هێشتا وڵاتێکی تەریکبوو "سیاسەتی دەورووبەر"ی بۆ ئەهێشتنی تەریکییە ناوچەییەکەی ئەخستبووەگەڕ، پێشبینی ئەو چالاکییە فیلاوریانەی لەچەند شوێنێکی دونیادا لێنەئەکرا. بنچی ئەو سیاسەتەش

هی "پرۆڤین شلیوا"ی بەڕێوەبەری گشتی ئەوسای مۆساد بوو، چالاکییە سیخوڕییەکانی سەردەمی لاوێتی شلیوای ناو عێراق، کەبۆ "وەکالەتی جولەکە"ی دەکرد، وەکالەتەکە لەکاتی ئینتدابی بەریتانیای فەلەستیندا بەنیمچە دەوڵەتێکی سەهیونی دەچوو. شیلوا لەسەرەتای سییەکاندا بۆماوەی ۲ ساڵی بەردەوام خۆی وەك مامۆستایەکی قوتابخانەو رۆژنامەنووسێك ناساند. بەناوی کۆکردنەوەی زانیاری پێویست بۆ نووسینی چەند وتارێك کەهەر بڵاونەکرانەوە، بەناو عێراقدا دەسووڕایەوەو، پێوەندییەکی فراوانیشی لەگەڵ کوردو هەموو کەمایەتییە ناعەرەبییەکاندا پەیداکردبوو.

بەستنی پێوەندی نهێنیانەی مۆساد بە کەمایەتییە ناعەرەبییەکانی ناو وڵاتە بەناو عەرەبییەکان‌و، وڵاتە موسوڵمانە ناعەرەبییەکانی دراوسێیان. بەپێی ئەو پەندەکۆنەی: "دوژمنی دوژمنم دۆستمە" بەهەموو کارەکانی مۆسادەوە دیاربوو. ئەم سیاسەتەشیان لەلایەکەوە بەمەبەستی هێنانەکایەی گرفتبوو بۆ رژێمە عەرەبییەکان‌و، لەلایەکی تریشەوە تا ئیسرائیل لەناوچەکەدا کەلەبەرێك بۆ خۆی بدۆزێتەوە، بۆ ئەوەش پشتی بە رێکخستنە نهێنییەکانی نێوان هەوالگرانی ئیسرائیل‌و وڵاتە ئیسلامییە ناعەرەبییەکانی وەك ئێران‌و تورکیاو، دواتریش ئەسیوبیای ناوچەی "قۆچی ئەفەریکا - القرن الافریقی"، بەستبوو.

هەربۆئەوەش مۆساد لەساڵی ۱۹۵۸دا بەشی پێوەندییەکانی دەرەوەی، بۆ کەمکردنەوەی کاریگەرێتییە پوو لەزیادبوونەکەی جەمال عەبدولناسری سەرۆکی میسر، کە ئیسرائیل بەهاوپەیمانی کۆمۆنیستی نێودەوڵەتی دادەنا، دامەزراند.

ئەو رێکخراوەی بەرێکخراوی "سی لکی- ترایدانت"ناودەبراو، ئیسرائیل‌و تورکیاو ئێرانی تیادابوو. لەساڵی ۱۹۵۸ەوە کۆبوونەوەی بەردەوام لەنێوان دەزگا هەوالگرییەکانیاندا، لەسەر بنەمای پێوەندی هەریەکەمیان بە وڵاتە یەکگرتووەکانەوە لەلایەکەوەو، لەترسی بزووتنەوە نەتەوەییە دەم بەهاوارەکەی عەرەب‌و بزووتنەوەی کۆمۆنیستیش لەلایەکی ترەوە، دەکرا. ئێران بەلای ئیسرائیلەوە تا لابردنی شاو بیست ساڵ دواتریش گەوهەری تاجەکەی بوو، بەتایبەتی کە ئیسرائیل چی بویستایە، لەنەوتی خامەوە بیگرە تا دەگاتە پێویستییەکانی چەکی نوێی خۆرئاوا، بۆی دابیندەکرد، چونکە ئێران بەبیانوی خۆقایمکردن‌و بەرەو پوو وەستانەوەی یەکێتی شۆرەوییەوە، لەکاتێکدا ئامانجی سەرەکی ئەوکارەی تۆقاندنی عێراقبوو، چەکێکی زۆری دەکڕی. دەرکەوت ئیسرائیل‌و ئارییە شیعەکانی ناو ئێران، کەزۆر لەمێژە دژی عەرەبن، بەرژەوەندییەکی هاوبەشیان لەپشتگیریکردنی کوردی عێراقدا هەبوو.

دیڤید کمحی ئەفسەری بالادەستی مۆساد پێی وابوو کەهەردوو حکومەتی ئێران و ئیسرائیل ترسی زۆریان لە بەهێزی و پێکەوە گونجانی عەرەبی سنی خۆرهەلاتی ناوەڕاست هەبووە. "ئیسرائیل نەیدەویست سوپای عێراق لەهیچ جەنگێکی نوێدا یارمەتی سوریاو ئەردەن بدات". ئێرانیش نەیویست سوپای عێراق خەریک بکات و لەناوچەی "شەتولعەرەب" کەلەگەل عێراقدا لەسەری ناکۆکن و، "خوزستان"ی بەنەوت دەولەمەند، کە پروپاگەندەی عێراق، بەهۆی بوونی زۆرینەیەکی عەرەب تیایدا ناوی "عەرەبستان"ی بەسەردا بڕیوە، دووربخاتەوە. جا چونکە عێراق تاکە وولاتێکی شەڕەکەیە، کەلەدوای جەنگی ١٩٤٨ەوە رێککەوتنی ئاگربەستی لەگەل ئیسرائیلدا مۆرنەکردووە، بۆیە ئامانجی ژیوستراتیژی پشتگیریکردنی کوردی عێراق بەلای دەولەتی عبرییەوە، هەولدانیبوو بۆ خەریککردنی زۆرترین ژمارەی تیپە سوپاییەکانی عێراق و ماندوکردنیان. ئیسرائیل پارسەنگی کەمی دلنیشتوانی، بەوە پڕەکردەوە کەچەند بتوانێت زۆرترین پشێوی بۆ عەرەب بنێتەوە.

ئیسرائیل بەبیانووی ئەوەی کەعێراق، هەمیشەو لەسەردەمی رژێمە جیاوازو یەکبەدوای یەکەکانی بەغدایدا، هەرلو پروپاگەنتە دژی سەهیونیزم دەکات، ڕەوایی بەسیاسەتەکەی خۆی ئەدا ئیسرائیل چاک دەیزانی کەئەم پروپاگەندانەی بەغدا بە رادەیەکی زۆر لەبیتوانایی کۆتاییهێنان بەپێوەندییەکانی نێوان کوردو ئیسرائیلەوە هاتبوو. کەچی هەموو ئەم فاکتەرانەش رێیان لەعێراق نەگرت کەبەشێکی سوپاکەی بۆ یاریدەدانی عەرەب لەهەردوو شەڕی ١٩٦٧و ١٩٧٣ دا بنێرێت، ئەگەرچی لەبەرەی لای کوردیشەوە وا لاوازبیوو کەڕۆلی گەورەی لە کێشەی فەلەستیندا بۆ نەبینرێت.

ڕووخانی رژێمی پاشایەتی لەتەمووزی ١٩٥٨دا، کۆتایی بەسایەی بەریتانیای سەر عێراق هێنا، کە لەکۆتایی جەنگی جیهانی یەکەمو دامەزراندنی ئەم دەولەتەوە بەردەوامبووە. لەشۆڕشەکەی ژەنەڕال "عەبدولکەریم قاسم"ەوە، بۆماوەی ١٠ سالێك نائارامی سیاسی دەستیپێکردو، بارێکی گونجاویش بۆ خۆتێهەلقورتاندنی ئیسرائیل هاتەئاراوە. ئیتر پشێوی عێراق بووە ئامانجێکی هەمیشەیی هاوبەشی هەریەك لە ئیسرائیل و ئێران و کوردی عێراق، ئەگەرچی هیچ هاوسەنگییەکیش لەنێوان ئەم سێ لایەنەدا نەبوو. لەسالی ١٩٥٠دا ئێران بە ڕەسمی دانی بەئیسرائیلدا ناو ڕێگای بە فڕۆکەکانی "العال"دا کەلەفڕۆکەخانەی تاراندا بنیشنەوە، بەلام هیچ کاتێك ڕێگای بە دەزگا دیپلۆماتییەکەی ئیسرائیل نەدا ئالای ئەستێرەی داود لەسەر بارەگاکەیان هەلبکەن، یان تابلۆی مسینی ناسینەوە بەدەرگاکەیانەوە هەلواسن. جا چونکە پێوەندییەکەی ئێران بۆ ئیسرائیل زۆر گرنگبوو، نەیدەتوانی لەسەر هیچ شتێك،

چەندێکیش گرنگبوایە بەڕووی ((شا))دا بوەستێتەوە. بەهۆی ئەم لاسەنگییەی نێوان تاران و تەلئەبیبەوە، کورد لەپێوەندییەکانی دەرەوەی ئیسرائیلدا هیچ گرنگییەکی سەرەکی نەبووە، هەرچەندە هەندێك ئیسرائیلی خواستێکی ڕۆمانتیکیانەی والیشیان هەبووبێت کە پێوەندییەکەیان بەکوردەوە بەپارمەتی کەمایەتییەکی چەوساوە لەکەمایەتییەکی تری چەوساوەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستەوەبەندە کەباری ژیانیان چوون یەکە. لە بەرامبەریشدا بەرزانی هەژارو تەریك، لەسالی ١٩٦١ەوە کەشۆڕشەکەیی دژی بەغدا ڕاگەیاندووە چەك و تەقەمەنی کەمی هەبووە، بۆیە ناچار بەتەواوەتی پشتی بە ئێرانی تاکە پەنجەرەی سەر دونیای دەرەوەی و ڕێگای ژیانی بەستووە.

بەدرێژایی ١٠ ساڵێك ئێران یارمەتییەکی چاکی کوردەکانی عێراقی دەدا، بەڵام ئەم یارمەتیانە بەپێی هەڵوێستی شا لەڕژێمی عێراق لەهەڵچوون و داچووندا بوون. بۆ نموونە، ئەم یارمەتیانە لەدوای هاتنی عەبدولسەلام عارڤ لایەنگری عەبدولناسر کەلە ١٩٦٤دا دەسەڵاتی گرتەدەست، کوتوپڕ زۆری زیادکرد. شا دەستتێوەردانەکەی ئیسرائیلی پێخۆشبوو، چونکە ئەوکاتە ئیسرائیل دەوڵەتێکی پچووك بوو، وەك ئێرانیش ناوبانگی نەزڕابوو، کەلەلایەکەوە مێژوویەکی دوورودرێژی پڕ لەفرتو فێڵی لەگەڵ کورددا هەبوو، لەلایەکی تریشەوە یەکێکبوو لەگرنگترین لایەنی کارە هەواڵگرییەکان، واتە دەیتوانی نکوڵی لەڕووداوەکانیش بکات.

لەبەرهەموو ئەو شتانە، ئێران لە شەستەکاندا ڕێی بەئیسرائیل دا کەپێوەندی بە بەرزانییەوە بکات. ئەگەرچی تا ئێستا ڕوون نییە کام لایان دەستپێشخەری پێوەندییەکەبووە، بەڵام ئەوەی تەواو یەکلایە "کامەران عەلی بەدرخان" کەلەبنەماڵەی میرەکانی کوردی تورکیایە، کەلەناوەندی سەدەی نۆزدەیەمەوە هەر بەشۆڕشگێڕ ناوبانگیان دەرکردووە، نەتەوەییەکی توندڕەوە، ڕۆڵێکی سەرەکی لەو پێوەندییەدا بینیوە. لەو ماوەیەدا بەدرخان قسەکەری ڕەسمی بەرزانی بوو لەپاریس، ئەگەرچی تەمەنی ٧٠ ساڵ زیاتربوو بەڵام بەناونسکی مامۆستایەتی زمانی کوردی لە" قوتابخانەی نیشتمانی زمانە خۆرهەڵاتییەکان-

"Ecole National des Langues Orientalis Vivante" کەزیاتر بە Langues ناسرابوو. بەدرخان بەچالاکییە هەواڵگرییەکان ئەناس بوو، پێشتر لەجەنگی جیهانی یەکەمدا و هەر دوای تێکشکاندنی عوسمانییەکان، وەك ڕابەرو وەرگێڕی بەناوبانگترین پسپۆڕی بەریتانیایی کاروباری کورد، رائید "ئیدواردو.س.نۆیل" کە نێردراوەکەی نیسانی ساڵی ١٩١٩ی بۆ کوردستانی تورکیا، دەسەڵاتدارانی تورکیای بەرادەیەکی وا پەستکرد ... لەندەن بکەن بیگێڕنەوە. تورکەکان لەسەر چالاکی لەڕاپەڕینەکانی کورددا و بینەوەی بەدرخان خۆی لە دادگاکەدا ئامادەبێت، حوکمی لەسێدارەدانیان دا. پاشان لەنێوان بیروت و دیمەشقدا، کەئەوکاتە

لەژێر سایەی فەرەنسای کۆمەڵەی نەتەوەکاندابوون، لەوێیاو چەندین گۆڤاری کوردی دەرکردو پارێزەریش بوو. لەساڵی ١٩٤٧دا، بەدرخان بەداوای ڕوجەر لیسکۆت و چەند خۆرهەڵاتناسێکی فەرەنسایی دی، کەئەوانیش هەر لەبواری هەواڵگرێتی لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا کاریاندەکرد، چووە پاریس. کاتێك "لیسکۆت" بۆ بەرژەوەندی هەواڵگرانی فەرەنسا، کەوتەکاری هەواڵگریانەوە، ئیشەکەی خۆی وەك مامۆستایەکی قوتابخانەی زمانە خۆرهەڵاتییەکان دا بە بەدرخان. بەدرخانیش مەڵبەندێکی بۆ توێژینەوەی زمانی کوردی دامەزراند، بەڵام ئەوەندە هەژاربوو، نەیدەتوانی لێکۆڵینەوەکانی خۆی چاپ بکات، بۆیە بە میمۆگراف هەر لەبەری دەگرتنەوە.

بەدرخان لەمێژووەوە ژێر بەژێر پێوەندی بە سەهیۆنییەکانەوە هەبووە، چەند مانگێك دوای ئایاری ١٩٤٨ کە دەوڵەتی ئیسرائیلی تیادا دامەزرێنرا، ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستی تەیکردو سەری لە؛ میسر، سوریا، لبنان، مێرنشینی شەرقی ئوردن دا. لە هاوینی ئەو ساڵەدا، بەدرخان مەرجەکانی شا عەبدوڵای، سەبارەت بەچارەسەرکردنی گرفتە گەورەکانیان لەگەڵ ئیسرائیلدا، بۆ ئیسرائیل برد. لەرێی چەند کەسێکی دورزی و مارۆنی و سەرکەشییەوە، کەشوێنی گرنگیان لەدەزگاکانی هەردوو دەوڵەتەکەو هێزی چەکدارییاندا، کەتازە فەرەنسا پێکیهێنابوون و مەشقیشی دادابوون هەبوو، ئەگەرچی زۆریشی نەمابوو ماوەی ئینتیدابەکەی فەرەنسای کۆمەڵەی نەتەوەکان بەسەربچێت، هەوڵێکی بێهوودەی لەگەڵ ئیسرائیلییەکان دا کەپشتگیری پرۆژەی ڕووخاندنی هەردوو حکومەتی لبنان و سوریا بکات. بەدرخان پێی وابوو کەئەم پرۆژانە لبنان و سوریا لەشەری ئیسرائیل دووردەخاتەوەو،دەشبێتە نموونەیەك و چاولێکەری بۆ پەیدا دەبێت.

ئەوە بەلای ئیسرائیلییەکانەوە بیرێکی نوێ نەبوو. سەرکردە زایۆنییەکانی وەك داڤید بنگۆریۆن و ئەوانەی دواتریش بۆچوونی وایان بۆ ڕاهێنانی دونیای عەرەب هەبوو، کەداوای دامەزراندنی "دەوڵەتۆکەی مۆزاییکیانە" بۆ کەمایەتییە رەگەزییە جۆربەجۆرەکانی ناوچەکە بکەن، بەڕادەیەك کەچاو بەسنووری ئەو دەوڵەتانەدا بخشێنرێتەوە کە لەسەر پاشماوە دارووخاوەکەی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی دامەزرابوون. دواکات ئیسرائیل ملی بۆئەوە داو، لەساڵانی حەفتاو هەشتادا هاوپەیمانێتێکی ژێربەژێری لەگەڵ موارنە لبنانییەکاندا بەست و، بووەهۆی ئەو کارەساتانەی ڕوویاندا، ئەو ئیسرائیلیانەش بەشداریان لەجێبەجێکردنەکەیدا دەکرد کەلە کوردستاندا کاریانکردبوو.

بەپێی بۆچوونی برادەرە فەرەنساییەکانی، حەزی بەدرخان بەو کارە نهێنیانە لەو باوەڕە پڕ ئەندێشانەیەوە سەری هەڵدا، کەلەدوای تێکشکانە خێراکەی شۆڕشی ١٩٣٠دژ بە تورکیا،

کەکوردو ئەرمەنییەکان بەچاکی خۆیان بۆ ئامادەکردو، بەدرخان خۆشی یەکێك لەسەرکردەکانی بوو، ئیتر سەرکەوتنی شۆڕشی چەکدارانە مەحاڵبێت.

دوای جەنگی جیهانی دووەمیش، کەخۆرهەلاتی ناوەڕاست بەهۆی جەنگی ساردەوە بووە جەمسەرگەرێتی و، زەبری دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیل و، کەوتنەناو گێژاوی رادیکالی و ئایدۆلۆژیای جیهانی سێ و، گەرمەی جۆشی نەتەوە پەروەری عەرەب، ئەوانە هیچیان رایان پێ نەگۆڕی. چونکە لەبارێکی وادا، بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد زەحمەتە لایەنێکی گرنگی نێودەوڵەتی بۆ یارمەتیدانی خۆی بدۆزێتەوە، بەتایبەتی کە داوا نەتەوەییەکانی کورد هەریەك لەعێراق و ئێران و تورکیاو سوریاش بگرێتەوە، کە ئەوە لەخۆیداو لەکاتی هاتنەدی ئەو ئاواتەیانەدا، دەبووەهۆی پیاداچوونەوەی سنوری ئەو دەوڵەتانە. بۆیە بەدرخان هەستیکردبوو، کە کورد ئەوپەڕەکەی دەتوانێت لەڕێگای بەشداری ژێربەژێرانەی کارە نهێنییە شاراوەکانی دونیاوە دەستیان لەچەند شتێك گیربێت. کورد بەگشتی و کوردی عێراقیش بەتایبەتی نرخێکی زۆری ئەو میراتییەیان دا، کەنەیاندەتوانی بەتەواوەتی خۆیانی لێدەربازبکەن، کەزۆر نەهامەتی بۆ دروستدەکردن.

مۆساد لەبەهاری ١٩٦٣دا، ئەزموونەکەی "شلیوا"ی بەرلە ٣٠ ساڵی دووبارەکردەوە، رۆژنامەنووسێکی بیانی دانیشتووی پاریسی بۆ کوردستانی عێراق نارد. رۆژنامەنووسەکە چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ بەرزانی و ئیبراهیم ئەحمەدی سکرتێری گشتی پارتیدا کرد. پێشنیاری بۆکردن کە نوێنەرێکیان بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ ئیسرائیلییەکاندا بنێرن و، با چاوپێکەوتنەکەشیان لەپاریسدا و، لەهوتێلێکی بەری ڕاستی ڕووباری "سین" بێت کەنزیك باڵوێزخانەی ئیسرائیلە؛ باڵوێزخانەکە لەکۆشکێکی کۆنی خێزانی رۆچیلدە لەشەقامی واگرام. لەگەڵ توندی ئەو هێرشانەی هێزەکانی عێراق لەوکاتەدا دەیانکردە سەری، کەچی مەلا مستەفا کە بەپێشنیارەکە قایلبوو هیچ پەرۆشییەکی پێوە دیارنەبوو، چونکە حەزیدەکرد لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکان یان عەرەبدا رێکبکەوێت. بەڵام هیچ کام لەم دوولایەنە کەمترین بایەخیان بەڕێککەوتن لەگەڵیدا نەدەدا. ئەگەرچی هەر کوردێکی نەتەوەیی چەند ڕقی لەچەوسێنەرەکانیشی بێت، جا عەرەب، ئێرانی، یان تورك بێت، بەڵام مێیەکەیان تێکەڵ بەڕێزێکی دروست و بەهێزی دەوڵەتە ناوەندییەکانیانە، حەزیشیان بەو دەستکەوتانە بوو کەلەئەنجامی دانوستان کردنیانەوە بێت نەك لەشەڕێکی سەرتاسەریانەوە.

بەرزانی رۆژێك چییە بیری لەدەستەڵاتگرتنە دەستی بەغدا نەکردۆتەوە، بەڵکو هەموو خواستێکی ئەوەبوو کە ئەو یارمەتییانەی لەدەرەوە پێیدەگەیشت، لەباکووری عێراقدا بەکاریان

بهێنێت، بەمەرجێک لەژێر دەسەڵاتی خۆیدا بمێنێتەوەو راستەخۆ نەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی عێراقەوە. مێژوونووسێکی کورد لەم ڕووەوە دەڵێت: "ئیسرائیلییەکان پەتاتەی پچووک بوون، مەلا مستەفا دەیتوانی لەچاوتروکاندنێکدا دەستبەرداری بێت"و دەشڵێت:"ئەویش ئەگەر عەرەبەکان شتێکیان بدایەتێ!" بەڵام نەیانکرد. بەرزانیش وەک فەلەستینییەکان هەستیکرد، جگە لەوەی گرەو لەسەر هەموو ئەسپەکانی پێشبڕکێکە بکات، بەڵکو یەکێکیان بیگرێت، هیچ شتێکی تری بۆ نەماوەتەوە. راستییەکەی جارێک وەڵامی رەخنەیەکی دایەوە کە نێردراوێکی ئافرەتانی فەلەستین سەبارەت بەپەیوەندی بە ئیسرائیلەوە لێیانگرت، وتی:"من وەک سواڵکەرە کوێرەکەی بەردەمی مزگەوتی گەورەی سلێمانی وام کەدەستی راگرتووە، نازانێت کێ پارەی بۆ تێدەخات".

لەپاییزی ١٩٦٢دا ئیبراهیم ئەحمەد چوو بۆ پاریس و لەوئوتێلەی کەلەسەری ڕێککەوتبوون دابەزی و ژوورێکی گرت، ئەمجا تەلەفۆنی بۆ رۆژنامەنووسەکە کرد، ئەویش بەپەلە ئیسرائیلییەکانی ئاگادارکرد، ئەوانیش لە یەک کاتدا سەرسام و شادمانیشبوون.

چونکە دڵنیا نەبوون کەبەرزانی پێشنیارەکە بەجێدەهێنێت، یان بایەخێکی وای پێدەدا کە کەسێکی وەک ئیبراهیم ئەحمەد بنێرێت. مەناحیم "ئامیک" ئافوت کەئەوسا لە مۆساد کاریدەکردو (دواتریش بووە یاریدەدەری بەڕێوەبەری دەزگاکە)، یەکەم ئیسرائیلی بوو کەلەگەڵ ئیبراهیم ئەحمەددا کۆبێتەوە، کەئەوکاتە ٤٩ ساڵبوو، بەڵام وەک هەموو ئەوکەسانەی لەژیانیاندا تەنیا ناخۆشی دەچێژن پیرتر دیاربوو. دواتریش ئیبراهیم ئەحمەد چاوپێکەوتنێکی دووروودرێژی لەگەڵ "والتر نیتان"ی بالوێزی ئیسرائیلیدا کردو، بەسەرهاتی گەلەکەیی بۆ باسکردو داوای پشتگی -١٥٥- ریشی لیکرد، دەشیزانی چۆن دەست بەدرگمە راستییەکاندا دەنێت. بەراوردی باری کوردی بە جوولەکە دەکردو دەیوت پێشمەرگەی کورد پارەی شەکرو چای نییە، ختوکەی هەستی دایکایەتی گۆڵدا مائیری وەزیری دەرەوەی دەدا. هەرچەندە بەرپرسە ئیسرائیلییەکان بە بەزەیی نەناسرابوون، کەچی "ئافوت" چەند ساڵێک دواتر رایگەیاند کە ئەو قسانەی ئیبراهیم ئەحمەد زۆر کاری لەوو نیتان کرد. هەرئەوەندەی رووداوەکەیان بۆ مائیر باسکرد، ئەویش گورج رایسپارد کەپەیوەندییە شومەکەیان لەگەڵدا بکرێت ئیبراهیم ئەحمەد چونکە زیرەکانە رەفتاریکردبوو کارەکەی بەلاوە سەیرنەبوو.

ئەوەشی بەلاوە سەیرنەبوو کەبەرخانی بێئاگا لەچاوپێکەوتنەکەی ئیسرائیلییەکان، چونکە بەئەنقەست نەیهێشتبوو بەشداری تیادا بکات، بردی بۆ مەلهای لیدوی شەقامی شانزلیزیە، خۆی وانیشاندا کەقسەی لابەلا لەگەڵ یەکێکی سەرمێزەکەی تەنیشتیا دەکات، دواتر دەرکەوت

بەفسەی ئەکادیمیایەکی ئیسرائیل، کەپێوەندییەکی نایابی لەگەڵ مۆسادا هەبووە، مۆساد لەهەموو شتێکدا گەر پاراستن ویستبێتی ئامۆژگاری کردووە. مۆسادەکان کەمێ کوردستان بچوونایە، سووربوون لەسەر ئەوەی جل و بەرگی ئێرانی یان کوردی، بەپشتێن و جامەدانە بەستنەکەشیەوە لەبەربکەن و، هەندێجار تا سەرنجی ئەو کەسانەی لەهەمووشت دەکۆڵنەوە رانەکێشن، ناوی بارەگاکەیان "بەڕێوەتی رۆژنامە" دەبرد.

هیچ کاتێك لەچەند ئیسرائیلییەك زیاتر لەناو کوردستاندا نەبووە، ئەوانیش هەرگیز لەناوچە سنوورییەکەی ئێران دوور نەکەوتونەتەوە، چونکە تا ڕادەیەك ئەمین بووە. سەیرەکەش لەوەدایە مۆساد پەنای بۆ ئەو دەیان هەزار ئیسرائیلیانە نەبردووە کە لەکوردستاندا لەدایك ببوون، بەڵکو ئەو ئیسرائیلیانەیان بەباشتر دەزانی کەعەرەبی دەزانن. یان وەرگێڕێکیان بۆ راوێژکارە سەربازیە ئیسرائیلییەکان دەهێنا کەعەرەبی بزانیایە[٢١]. هەرچەندە عێراق یەکبینە تۆمەتی یارمەتیدانی بەرزانی دەدایە پاڵ ئێران و ئیسرائیل، بەڵام رۆژنامەنووسە بیانییەکان و ئەوانەش کە سەری کوردستانیان داوە هیچ تیمێکی مۆسادیان نەدیوە. "ئیریك رولیە"ی پسپۆڕی کاروباری خۆرهەڵاتی ناوەڕاستی رۆژنامەی لوموندی فەرەنسایی، بەرێکەوت لەسەردانێکی کوردستانیدا شارەزایانی ئیسرائیلی بینیبوو کە مەشقی چۆنێتی بەکارهێنانی چەکیان فێری کوردەکانکردووە.

---

[٢١] بەر لە بەکۆمەڵ رۆیشتنەکەی ١٩٥٠ یان بۆ ئیسرائیل، سی چل هەزار جولەکەیەك، کە لە؛ زاخۆ، ئاکرێ، ئامێدی، دهۆك، هەولێر، سلێمانی گردبببوونەوەو وەك بیانەکان بەئارامی لەگەڵ کوردیدا دەدوان و، لاڵ چوونەوە سەر جولەکەکانی ژێر دەستەڵاتی بابلییەکانی سەردەمی نەبوخود نەسری ٦٠٥ – ٥٦٢ی پێش زاینییان لێدەدا، بەکوردستانیان دەوت نیشتمان. ئەگەرچی سەدی نەوەدیشیان نەخوێندەوار بوون، بەڵام بازرگان و دوکاندار و خەڵکیان بەسەر ڕووباری خابووردا بەکەڵەك پەڕاندۆتەوەو، کاری وەك مۆڵکداری و جوتیاریشیان کردووە کە لەگەڵ سروشتی خۆیاندا نەگونجاوە زۆربەی جوولەکە دێهات نیشینەکان، لەگوندی تێکەڵ لەگەڵ کوردە موسوڵمان و بیانەکاندا دەژیان "سندور" کە گوندێکی چوارسەد خێزانی بوو دەکەوتە نێوان ئامێدی و زاخۆوە، تاکە کۆمەڵگایەکی کوردستانی عێراق بوو کە سەراپای جوولەکە بێت. زۆر لەکوردە جوولەکەکان تا دوای دوور وەچەش هێنجگار ئامەزۆری هەموو شتێکی کوردانەبوون. بەپەرۆشیشەوە پشتگیری حکومەتیان لە لەهاوڕیەدانەکەی کوردەکانی عێراقدا دەکرد. تا ئەم ساڵانەی دوایش باسی گەشت و گوزاری ئیسرائیلییە بەبنەچەکوردەکان، کەپێیان بە جەرگی خۆیاندا دەناو، بۆ گەشتی غوربەتیان و نوێکردنەوەی کەسایەتیان. لەسنووری تورکیا نزیکدەکەوتنەوە.

ئەفسەرێکی مۆساد پێشنیاری کوشتنی کردبوو، دواتریش بڵێن بەکارەساتێکی ناخۆش مردووە. بەڵام کوردەکان پێشنیارەکەیان ڕەتکردبۆوەو واشیان لێکدابۆوە کە ڕۆڵی ئیسرائیلییەکانی هەر نەبینێت، دواتریش دەرکەوت بۆچوونەکەیان ڕاستبووە.

بەهەرحاڵ، لەچەند گەورە لێپرسراوێکی کورد بەدەر کەسی دی لەبوونی ئەفسەرەکانی مۆسادی ناو کوردستان بەئاگا نەبوو (هەرچەندە لە دانوستانێکی کوردو عێراقییەکاندا، نوێنەرایەتییەکەی کورد ئەفسەرێکی ئیسرائیلی تیادابوو، بەئەنقەستو پێدەچێت بەڕەزامەندی بەرزانیش بووبێت، خۆی ئاشکرا کرد). مەشقە سەربازێتییەکەش لەکوردستانی عێراقو ئێرانو ئیسرائیلدا دەکرا. بەلێشێك کەناوی "ئومۆنێت تۆڤا" واتە "پەروەردەکەرێکی جوی باش"ی لێنا کوردەکانیان بۆ مەشقکردن، لەتارانەوە بەفڕۆکە برد بۆ حەیفا. سەرەتا تەکتیکێکی ئاسانی پیادەییان فێرەکردن، کە چۆنێتی بەکارهێنانی هاوەن،وئەو چەکانەی لەتەقاندنیاندا بەدوادا ناگەڕێنەوە، دواتر موشەکی دژەتانك و فڕۆکەی دەستکردی شۆرەویشی گرتەوە، کەئیسرائیلییەکان لە سوپا عەرەبییەکانیان زەوتکردبوو.

ئیسرائیلییەکان نەیاندەویست شێوە سەرەکییەکەی شەڕکردنی کورد بگۆڕن، "گۆڕینی پێویست نەبوو"، وەك "حاییم لیڤاکۆڤ"ی ئیسرائیلی بەعەرەب بووکە خاوەن ئەزموون، کەلەماوەی نێوان ١٩٦٦و ١٩٧٢دا لەنێوان ئیسرائیلو کوردستاندا هاتوچۆی دەکرد وتی، چونکە "کورد شارەزای ناوچەکەیەودەزانێت چۆن شەڕ دەکات". لیڤاکۆڤ ئەزموونی کوردی بەئەزموونەکەی سەردەمی لاوێتی خۆی بەراورد دەکرد، کە لەکۆتایی سییەکاندا لەو یەکە جوولەکەییانەدابوو کە "لوردی وینگەیت"ی ئەفسەری بەریتانیایی لایەنگری زایۆنیزم، خاوەنی ڕۆڵی دیاری جەنگی جیهانی دووەمە کەلەبورمادا دژ بەیابانییەکان کردوێتی، هونەری شەڕی چەتەگەریانەی فێرکردبوو. ئەفسەرەکانی مۆسادیش، کوردەکانیان بەبەکارهێنانی "کلاشینکۆڤ"ی ڕووسیو "کارل ڤۆستاڤ"ی سویدی، کەتفەنگی تایبەتی هێرشبردن مەشقدا دەدان، ئەو کوردانەشیان زۆر بەدڵبوو کەبەو تفەنگە بڕنەوە ماوزەرە لوولە درێژە چیکیانەی پێشتر شا دابویێ، لەدووری ٥٠٠یاردەوە نیشانیان دەپێکا. کۆنە مەشقپێکەرێکیان دەیوت: "هەریەکەیان نیشانگرەوەیەکی کارامەیەو، کورد باشترین نیشانپێکە کەلەژیانما دیبێتم". ئیسرائیلییەکانو هەموو ئەو بیانیانەش کەسەردانی کوردستانیان دەکرد، سووربوونی کوردیان لە کێشانەوەی بریندارانی شەڕ، بێئەوەی کۆ لەهیچ مەترسییەك بکەن، بەلاوە سەیربوو، ئەوانیش وەلامی ئیسرائیلییەکانیان بەوە دەدایەوە، کەهەر بۆ "شەڕکردن دروستبوون".

ئامۆژگاری ئیسرائیلییەکان، لە ١٢ ئایاری ١٩٦٦دا گەورەترین سەرکەوتنی سەربازیانەی سالانی شەستی لەچیای هەندرێنی نزیک ڕواندوز بۆ کورد بەدەستهێنا، یەک لیوای تەواو سەربازی عێراقی تیادا لەناوبرا. ئیدریسی کوڕی مەلا مستەفا سەرکردایەتی شەڕەکەی دەکردو پێشمەرگەی تێکۆشەر "فاخر مێرگەسووری"ش لەمەیدانی شەڕەکەدا یارمەتیدەربوو، ئەویش یارمەتی چاکی لەئەفسەرە عەرەبە کۆمۆنیستو چەپڕەوە هەڵاتووەکانی سوپای عێراق وەرگرت [32]، شەڕەکە دەستکەوتێکی پوختی کوردانەبوو. لەبەرئەوەی چەندین کەس سەرکەوتنی ئەو شەڕەیان بۆ خۆیان ڕادەکێشا، نەدەتوانرا ڕاستیو لا لێدان لێک جوێبکرێتەوە. ڕاستییەکەشی، زۆر لەئەفسەرەکانی مۆسە ' . لە ڕ.دی بای- ی ڕۆ-ی ئیسرائیلی شەڕەکەدا ئاگۆکبوون، بەتایبەتی ئەو ڕۆڵەی کۆلۆنێل تسوری ساگای، ـە ڕاوێژکاری سەربازیانەی کورد بووەو ڕۆڵی سەرەک ئەرکانیانی بینیوە، تا ئەمڕۆ ساغ نەبۆتەوەو قسەی لەسەرە. ساگای لەبروسکەکانی سوپای عێراقەوە، لەوەگەیشتبوو کە ئەفسەرانی سەر تۆپەکانی عێراق، کەلاق چوونە پێشەوەی تۆپەکانیان لێدەن، دڕیان لەگەڵ سەرکردەکانیاندا دەکردتا لێیان ڕازی بن. ساگای سروشتی ناوچەی شەڕەکەی لێکدایەوە، مەشقی سەرکردە سەربازییە کوردەکانی لەتاران و ئیسرائیلدا لەئەستۆگرت. ئەو ئامۆژگاریانەی پێی ڕاگەیاندبوون، جەختی لەسەر ڕێسا کۆنەکانی کورد خۆیانکردبۆوە کەزۆر لەمێژبوو ڕەچاویانکردبوو، نەچوونە دەرەوەو خۆ لەھۆزکەو تانکی عێراق شاردنەوەو، دروستنەکردنی هیچ شوێنێکی خۆقایمکردن نەکا لەئاسمانەوە ڕەچاوبکرێت، لەبری ئەوە بۆ خۆ حەشاردانی خۆیان، پەنا بۆ خۆخستنە پاڵ درەختو گاشەبەرد بەرن.

هەرکە هێزە زۆرەکەی عێراق، چیاکانی دەوروپشتی شاری ڕواندوزی بەدوای یەکدا دەگرت، بەرزانیو ئیسرائیلییەکان تەواو تەنگەتاو دەبوون. بەرزانی دەیزانی لەم جۆرە شەڕانەدا، هێزەکانی پێویستیان بەچەکو شێوازە سەرکردایەتییەکان هەیە،تا سەرکەوتن بەدەستبهێنن لەو ڕۆژەداو لەساتێکی گرنگدا، سەرکردەیەکی کوردی ئازا، لەو باوەڕەیەوە کە پێشمەرگەکانی دەتوانن هەموو هێرشێکی عێراق، چەند بەهێزیش بێت تێکبشکێنن، بەپاشەکشەکردنی هێزەکانی قایلنەبوو. ناچار مەلا مستەفا بۆ خۆی فرمانی [illegible] کرنەکەی دا. سەرکردەکەشی بەکشانەوەو قایمکردنی ئەو تەڵەیەی دژ بەعێراقییەکان نابوویانەوە قایلکرد، ئەوەی کەدواتر بەکەمینێکی ئەفسانەیی دانرا. کوردەکان بەسەر چەند کۆمەڵەیەکی کەم کەمی

---

[32] دواتر پاراستنی مێرگەسووریو هەموو خێزانەکەیی، بەتۆمەتی -گەورەترین ناپاکیتی- کە زۆر ڕوونیش نەبوو، بەبێ دادگاییکردنو گوللەبارانیکردن

نیشانیێکی تفەنگو سووکە هاوەندبەدەست، کەنزیکەی ٢ بەتالیۆنێکیش پشتگیریدەکردن دابەشبوون. لێکەران عێراقییەکان بێنە پێشەوەو بێنەوەی تەڵەیان لێبکەن بەسەر چیاکاندا سەریکەون. هەر لەوەندەی عێراقییەکان گەیشتنە بەرزایی نزیکەی ٦٠٠٠پێ، ئیتر کوردەکان لە هەرئوولاوە گوللەبارانیانکردن و، لیوای چواری ١٨٠٠کەسی تیپی دووی عێراقیان، لە ماوەی تەنیا سێ سەعاتدا تەفروتونا کرد. بەوەش کوردەکان کارامەیی خۆیان لەجێبەجێکردنی ئەو تەکتیکەدا سەلماند کە ڤێتنامییەکان پێیاندەوت "خۆ بەپشتێنی دوژمنەوە هەڵواسین"، واتە نزیکبوونەوەیەکی وا کەدوژمنی پڕچەکتر، لەترسی پێکانی سەربازەکانی خۆی نەتوانێت فڕۆکە یان تۆپەکانی بخاتەگەڕ. زیانی کورد لەبیست کوژراو کەمتربوو، لەکاتێکدا لەلیوایەکی عێراقی ١٢٠٠ سەرباز کوژران و، لە شارۆچکەی دیانای تەنیشتیان نێژران و، شووشەی بەتاڵی "سیڤن ئەپ"یان بۆ نیشانکردنی گۆڕەکان دانا، ئەویش بەپێی ئەو راپۆرتەی سەرتیپی لیواکە دواتر دابووی. دوای ١٠ رۆژ شەڕکردن لەدەوروبەری شاری ڕەواندوز، زیانی عێراقییەکان لایەنی کەم ٢٠٠٠سەرباز بوو، ئەمە جگە لەکوشتاری جاشەکان.

پێش شەڕەکە بەرزانی بەڕادەیەکی وائترسی کوژرانی زۆری لە لەشکرەکەیدا هەبوو، کەناچار بەو پلانەی لەتێکەڵەیەکی شەڕی ئاسایی و پارتیزانی پێکدەهات و توانایەکی زۆریشی دەویست، قایلبێت. کەئەنجامی شەڕەکەی پێکەیشت هێنگار تووڕەبووە، بە ساکای وتبوو "٣٠- یان ٤٠ کەس لەعێراقییەکان بکوژرێت بەجێیە، بەڵام ٢٠٠٠یان لێبکوژرێت، کەواتە لەمەولا چۆن قسە لەگەڵ سوپای عێراقدا بکەم". ساکای هەولی بێ ئەنجامی لەگەڵداو پێی وت، عێراقییەکان هەڵدەگرن ئەو زیانەیان لێبکەوێت چونکە دەستپێشخەری هێرشکردنە سەر کوردن، بەڵام بەرزانی گوێی لێنەدەگرت. کاتێک نێردراوە عێراقییەکان، بەسواری دوو جێبەوە، ئاڵای سپییەوە گەیشتن و دلوای چاوپێکەوتنی بەرزانیان کرد، ساکای بە بەرزانی وت گەر پێنج لیوایەکەی تری لەناو ببرێن ئەوا پێشنیارەکانی عێراق باشتر دەبن، بەڵام بەرزانی پێشنیارەکەی رەتکردەوەو وتی: "بەداخەوە، من بەدرێژایی تەمەنم چاوەڕێی ئەوساتەبووم کەناچاربن قسەم لەگەڵدا بکەن". دەستێرە بەشانەکانی ئیسرائیل، کەهەواڵەکەیان بیست و قەوارەی زیانەکانی عێراقیان بەرگوێ کەوت باوەڕیان نەدەکرد. ژەنەڕاڵ "ئەهارۆن یاریڤ"ی سەرۆکی "هەواڵگران – ئیستخبارات"ی سەربازیانەی ئیسرائیل بەساکی وت: "شتی وا مەحاڵە ئەمە شەڕی پارتیزانییە ، تۆ باسی چی دەکەیت؟". بەهەموو ئەم گومان و پرسیارانەشەوە ئەو سەرکەوتنەی لەشەڕی چیای هەندرێندا بەدیهات، حکومەتی عێراقی ناچارکرد لە٦ی حوزەیراندا ئاگربەست رابگەیەنێت و بۆ دووساڵیش بەردەوامبێت.

ئیسرائیل دەستکەوتی چاکی لە پێوەندیکردنەکەی کورد بەدیهێنا، لە١٥ی ئابی ١٩٦٦دا کوردەکان لەمەڵاتنی "منیر ردفا"ی "دیان"دا، کە فڕۆکەوانێکی عێراقی بوو فڕۆکەیەکی "میگ ١٢"ی بەتاوبانگی هێزی ئاسمانی عێراقی بۆ ئیسرائیل فڕاند، یاریدەی موسادیان دا. بەکرێگیراوانی مۆساد ئەندامانی خێزانەکەی ردفایان بەناوی سەیرانەوە لە بەغدا دەرکردو دایاننە دەست کوردەکان، ئەوانیش بەسەلامەت لەسنوور ئاودیویان کردن و گەیاندیاننە ئێران. مۆساد کەبەڵێنی بە ردفا دابوو یەك ملیۆن دۆلاری ئەمەریکایی و مافی پەنابەریتی سیاسیش بەخۆی و ئەندامانی خێزانەکەی بدات، پێیان وابوو پارەکەیان بەفیڕۆ نەچووبێت. چونکە ئەم کارە بۆ مۆساد زۆربوو، لەواشنتۆنیشدا هێندەی دی دەنگی دایەوە، بەتایبەتی کەئەمەریکاییەکانیان بانگکرد تا لەنزیکەوەو بەووردی سەیری فڕۆکە شۆرەوییەکە بکەن، ئەمەریکاییەکانیش کارەکەیان زۆر پێخۆشبوو.

کوردیش کارامەیی خۆیی لەفڕاندنی ئەو جوولەکانەدا نواند کە لەناو عێراقدا مابوونەوە، لەڕێی ئێرانەوە دەریدەکردن، ئەوەش بۆ ئیسرائیلییەکان کارێکی زۆر تایبەتبوو، جوولەکە بەر لەو کۆچکردنەی سالّی ١٩٥٠یان کەبە ئاشکراو بەڕەوایی کردیان، لەناو عێراقدا نزیکەی سەد هەزار کەسێك دەبوون. کوردەکان لەم کارەیاندا سوودیان لەئاگرپەستی هاوینی هەردوو سالّی ١٩٧٠و ١٩٧١ بینی، ئۆتۆمۆبیلی کوردیان لە گواستنەوەی جوولەکەکانی بەغدادا بۆ باکووری عێراق بەکاردەهێنا.

ئەویشیان وا رێکدەخست کە بکەوێتە کاتێکەوە خەڵکی سەرجەم شارەکانی عێراق لەتاو گەرمای هاوین ڕوو لەچیاکانی ناوچە کوردییەکان بکەن. هەرچەندە ژمارەی ئەو کەسانەی ئاودیوکران زۆربوون – نزیکەی ٢٠٠٠- دەبوون، بەلام دەستەلاتدارانی عێراق لەبەر هەندێ هۆی تایبەتی خۆی چاوی لێدەپۆشی. بەلای کۆنە ئەفسەرانی مۆسادەوە، سوودوەرگرتنی ئیسرائیل لەپێوەندییەکەی بەکوردی عێراقەوە، هەرئەو جوولەکە فڕاندنە بەسە.

لەئازاری ١٩٦٩داو، بە قایلبوونی شا، ئیسرائیلییەکان تا بەدونیای دەرەوەی بگەیەنن کەبەرزانی و پیاوەکانی توانای لەکارخستنی ئابووری عێراقیان هەیە، یارمەتی کوردیان لەدانانی پلانێکدادا تا هێرش بکەنە سەر بیرە نەوتەکانی کەرکوك، بە تایبەتی ئەوکاتە ئەم کانە نەوتانە لایەنی کەم سەدی ٦٥ی بەرهەمی عێراقبوون. لەو وێنە ڕەش و سپیانەی لیفاکۆلاّ هەڵیگرتوون، ئەندامانی یەکێك لەو دوو کۆمەڵە بەرچاو دەکەون کە دەمامکیانکردووەو ڕێدەکەن و چوار وولاخیش لەتەنیشتیانەوە بەتۆپی هاوەن و تۆپی بێجووڵە بارکراون. سامی عەبدولڕەحمان کە ئەندازیارێکی دەرچووی بەریتانیایەو، ئەستێرەیەکی گەشی ئاسمانی کوردایەتییە،

ڕاستییەکەی کۆسپی زۆرهاتە بەردەمی ئیسرائیل و نەیانهێشت پێوەندی تەواو لەنێوان بەرزانی و خاوەنی بڕیار لەواشنتۆن پەیدا بکات، هەرچەندە ئەوە ئامانجی سەرەکی و ئەگۆڕی بوو. لەساڵی ١٩٦٢دا ئیبراهیم ئەحمەد بەبێ هیچ پێچوپەنایەک داوای ڤیزەی لەوولاتە یەکگرتووەکان کرد تا بچێت. کەچی بەرپرسە ئەمەریکاییەکان بەساردییەکەوە ڕەتیانکردەوەو پێشیان ڕاگەیاند کە واشنتۆن هیوای چارەسەرکردنی پێوەندی نێوان ئێران و عێراقە، پێشوازیکردنی هەر نێردراوێکی بەرزانیش کاری خراپی بۆ ئەم هەوڵەی دەبێت. بەڵام بەرزانی بۆ کردنەوەی ئەو دەرگایە بەئیسرائیلییەکان پشت ئەستووربوو بەڵام ئەوەندەش سەرکەوتوو نەبوو.

"عیسمەت شەریف ڤانلی" کە کوردەو لەسوریا لەدایکبووەو لەئەورووپاشدا ئیشی بۆ بەرزانی دەکرد، ساڵی ١٩٦٤، دوای ناڕێکێتییە ڕاستییەکەی نێوان بەرزانی لەلایەک و ئیبراهیم ئەحمەدو جەلال تالەبانی و چەند ئەندامێکی تری پارتی دیموکراتی کوردستان لە لایەکی ترەوە، سەرێکی لەئیسرائیل دا، لەوێ چاوی بە "یاکۆڤ هیرزۆگ"ی بەڕێوەبەری گشتی وەزارەتی دەرەوە کەوت، دواتریش "شەمعون پێرس" کەلەوە دەچوو یاریدەدەرێکی هەمیشەیی وەزیری بەرگری بێت، "لیڤی ئەشکۆل" سەرۆک وەزیرانیشی بینی، لەگەڕانەوەیدا گەشبینبوو دەشیوت: "هەموو ئەو لێپرسراوە ئیسرائیلیانەی چاوم پێیان کەوتووە، دەڵێن کوردستانی عێراق بەرەو، وەک ڤانلی دەیگێڕایەوە، بەرزانی دڵنیایی و بڕوای تەواوی پەیداکردبوو دەیوت: "هاریکاریکردنی وڵاتە یەکگرتووەکانمان لەچنگدایە"، چونکە بڕوای تەواوی بەدانایی و توانایی ئیسرائیل هەبوو. ساڵی دواتری ڤانلی چوو بۆ وڵاتە یەکگرتووەکان و لەوێش سەردانی باڵوێزخانەی ئیسرائیلیکرد، ئەوانیش بەرەو ڕووی دەزگایەکی لایەنگری خۆیانیانکردەوە "دەزگای پێوەندییە گشتییەکان"ی سەر شەقامی مادیسۆن، لەیانەی نیشتمانی ڕۆژنامەنووسان لەواشنتۆن قسەیکردو چاوی بەچەند سیناتۆرێکیش کەوت، بەڵام دواتر وتی:" زوو زانیم ئیسرائیلییەکان ئەمەریکاییەکانیان بۆ قایل نەکراوەو ئەمەریکاییەکانیش نایانەوێت تێکەڵ بەکارەکە بن". ولیام ئو دوگلاسی دادوەر، کە پێشتر لەبەرژەوەندی کورد شتی نوسیبوو نەیویستووە بیبینێت، دەشڵێت:"بۆ هەر کوێیەک بچوومایە بەساردییەکەوە دەیانبینیم، هەر هیچ شتێکیش نەبوو".

کاربەدەستەکانی وەزارەتی دەرەوە نەیانویستووە چاوپێکەوتنی لەگەڵدا بکەن، بەڵام ڕۆڵێکی سەرەکیان لەڕێکخستنی کۆڕێکدا بۆ دیوەو هەموو پسپۆڕانی کاروباری خۆرهەڵاتی ناوەڕاستی وەزارەتەکەیان لەکۆڕەکەیدا ئامادەبوون. (وەزارەتی دەرەوە لەماوەی ٣٠ ساڵی داهاتوویاندا، ئەوەیان کردبووە چاکترین شێوازی خۆیان).

کاتێک ڤانیلی ئەنجامی سەفەرەکەی وڵاتە یەکگرتووەکانی بە بەرزانی ڕاگەیاند، "سەری سوڕمار تووشی بێ هیوایی بوو"، بەڵام تا ئاپاکیییەکەی ١٩٧٥هەر لەو بڕوایەدابوو کە ئیسرائیل توانای کارکردنە سەر وڵاتە یەکگرتووەکانی هەیە. بەرزانی بەردەوام داوای لە ڕاوێژکارە مۆسادییەکانی دەکرد کە "یەکبینە بە گوێی سەرۆکی ئەمەریکادا بچرپێنن". لەدوا سەردانی ئیسرائیلیدا بەرزانی کەچاوی بە چەند وەزیرو زەنەراڵێکیان کەوت، بەشەمعون پێرسی ڕاگەیاند، ئەگەر ئیسرائیل ڕژێمی سوریا بڕوخێنێت ئەوا کوردیش ئامادەیە ڕژێمی عێراق بخات. کاتێک پێرس بەوە پەڵپی لەقسەکەی گرت کەپەیمانەکەی نێوان ئەم دوو دەوڵەتە عەرەبییەو یەکێتی شورەوی ڕێ بەم سەرکێشییە نادات، بەرزانی وەڵامی دایەوە وتی:" منتان پێهەڵدا خەڵەتێت. ئێوە دیگۆڵو نیکسونتان ڕووخاند". هیچ شتێك ڕای پێ نەدەگۆڕی

ساڵی ١٩٧٢ بەرزانی بەختی سواربوو -یان خۆی وای بیرلێدەکردەوە- مانگێك بەر لەسەردانە دووقۆڵییەکەی نیکسون و کیسنجەر، کەشای ئێران وای لێکردن واز لەو پەڵپگرتنە کۆنەی پێوەندی نەکردن بە کوردەوە بهێنن، گۆڵدا مائیری سەرەك وەزیرانی ئیسرائیل سەری لەتاران دا تا کارێك بکات شا یارمەتی زیاتری کورد بدات.

لەئەنجامی پەیمانی دۆستایەتی تازە مۆرکراوی نێوان شورەوی و عێراقدا، چەکێکی زۆری شورەوی بەسەر بەغدادا داباری، کەئەوەش ئاکامێکی ڕاستەوخۆی کاریگەرێتی یارمەتییە سەربازییەکانی ئێران و ئیسرائیلی بەرزانی بوون، شا زۆر لەوە دوودڵبوو، سیاسەتی ئەمەریکا لەئاست کورددا گۆڕا. هەرچەندە کەمی مۆساد چاکەی گۆڕانی سیاسەتی ئەمەریکای بەرامبەر بەکورد بۆ ئیسرائیل دەگێڕایەوە، بەڵام گۆڕینی سیاسەتی واشنتۆن بەهۆی شاوەبوو. سەیرەکە لەوەدابوو کەهەرچەندە ئیسرایل لەو ماوەیەدا یارمەتییەکەیی زیادکردبوو، کەچی بەهۆی یارمەتییەکانی واشنتۆن و تارانەوە ئیسرائیل لە کوردستاندا کەمتر دەستی دەڕۆیشت.

ئیسرائیل لەیارمەتیدانی کورددا بەردەوامبوو، بەرزانیش ناوە ناوە پرس و ڕای بەو ئەفسەرە ئیسرائیلییانەی لەتاران بوون دەکرد. لەجەنگی عەرەبی ئیسرائیلی ١٩٧٣دا، قسەیەکی نهێنی وابوو کە کورد بەرەیەکی تر لەعێراقدا بکاتەوە، تا نەهێڵن بەغدا هێزەکانی خۆی بۆ پشتگیریکردنی سوپای سوریا دژ بەسوپای ئیسرائیل لەبەرزاییەکانی جۆلاندا بەکاربهێنێت. تا ئەمڕۆشی لەسەربێت ئاشکرا نەبووە کە ئیسرائیلییەکان ئەو پێشنیارەیانکردبوو- پێدەچێت وابووبێت- یان لەکورد خۆیانەوە بووە. یەکێك لەیاریدەدەرە نزیکەکانی بەرزانی جەختی لەسەرئەوە دەکرد کە ئیسرائیلییەکان داوایان لەکورد کرد تا "پشێوی بۆ عێراق دروستبکەن"

بەرەیەکی دی بکەنەوە، بەڵام بەرزانی "زۆر گرنگی بەو پێشنیارە نەدا" بە تایبەتی ئامۆژگارییەکی ئەمریکای پێگەیشتبوو کە خۆی لەقەرەی ململانێی عەرەب و ئیسرائیل نەدات.

بەرزانی پشتی بەئەمەریکا ئەستووربوو وەک بەئیسرائیل. بەپێی راپۆرتەکەی پایک دەڵێت، ئەوە ئامۆژگاری کیسنجەری وەزیری دەرەوەی ئەو کاتە خۆی بوو. کیسنجەر لەیادداشتەکانی خۆیدا "لە ناڵیش ئەدلو لەبزماریش" واتە بەهەردوولادا دەیشکێنێت، وای دەگەیەنێت کە هانی کردنەوەی بەرەیەکی دی نەدلوە کەڕۆڵی کورد لەوەدا دەرکەوت عێراق تەنیا تیپێکی بۆ بەشداریکردنی شەڕەکە مابۆوە. کەچی پاش پانزە ساڵ، ئەمجا کیسنجەر جەخت لەسەر ئەوە دەکات کەئەو لەگەڵ پلانەکەی ئیسرائیلدا نەبووە، چونکە ترساوە لەوەی هێزەکانی عێراق "ئەگەر کوردەکان لەچیاکانیان بێنەخوارەوە بەتەواوی لەناویان بەرن" بەتایبەتی کە کورد لەچەکی سوک بەولاوە هیچی تر شک نابات، حەزیشی نەدەکرد ئەمریکا لەوە زیاتر یارمەتی بەرزانی بدات و ئەوەندەی بداتێ کە بۆ هێرشێکی سەرتاسەر پێویست بێت، ئەویش لەترسی تۆڵەی عێراقی دوای شەڕەکەی "یۆم کیپور". لێپرسراوانی هەواڵگرانی ئیسرائیل، لەبەر چەند هۆیەکی خۆیان جەختیان لەسەر ئەوە دەکرد کە کورد خۆی پێشنیارەکەی کردووە، ئیسرائیلییەکانیش پێشنیارەکەیان رەتکردۆتەوە چونکە کوردیان لەتۆڵە چاوەڕوانکراوەکەی عێراق بۆ نەدەپارێزرا.

بۆ لێکدانەوەی هۆی ئەو ناکۆکییە دیارە، دەکرێ پەنا بۆ قسەیەکی کیسنجەر ببرێت "من بۆچوونێکی وام لا گەڵاڵەبوو کەلێپرسراوانی ئیسرائیل لەتەلئەبیب لێم تێگەیشتبوون، کەچی ئەوانەی کوردستان کارەکەیان لاپەسەندبوو". بەڵام هیچ نەکرلو، عێراق هێزێکی ۳۰ هەزار سەربازو ٦٠ فڕۆکەو ٤٠٠ زرێپۆشی بۆ جۆلان نارد. سەدام حسێن بەڕادەیەک وا دووڵبوو کە بەڵێن لەشا وەربگرێت سوود لەوبارە نەبینێت. راستییەکەشی شا لەو رۆژانەدا دەیوت: "من حەزناکەم کورد بەوە لەکەداربکرێن کە پیاوی ئیسرائیل و وڵاتە یەککگرتووەکانن". بەڵام شای ئێران بە بەڵێن بردنە سەرەکەی، دەستپێکردنەوەی پێوەندی دیپلۆماتیانەی نێوان ئێران و عێراقی بەدەستهێنا. (بەشداری کردنەکەی عێراق بووەهۆی کوشتنی ۱۲٥ سەربازو کەوتنی ۲۱ فڕۆکەو تێکشکانی ۸۰ تانکی عێراقی لەشەڕی ئیسرائیلی جۆلاندا)، دوای کۆتایی شەڕەکە ئیسرائیل بڕێکی باشی چەکی شۆرەوی و تۆپ کە لەسوپا عەرەبییەکانی زەوتکردبوو بۆ کورد نارد، لەگەڵ مووشەکی "ستریلا"ی دژە فڕۆکە کەبەسەر شانەوە دەتەقێنرێت و "دەریشکەوت بێکەڵکن" لەگەڵ مووشەکی ((ساگر))ی دژە تانکیشیان تیادابوو.

هەر کە لەمانگی ئازاری ١٩٧٤دا شەڕی کوردو عێراق دەستیپێکردەوە، ئەمجا مۆساد پەشۆکاو دەرکیکرد کە ڕۆڵی ئیسرائیل بە بەراورد لەگەڵ شاو ئەمەریکادا مامناوەندییە. ئێران بۆ پاراستنی کورد لەو هێرشە بەربڵاوەی عێراق، بەتارییەیەک تۆپی ١٢٠ ملیمەتری دەستکردی شۆرەوی و یەکێکی تری ١٣٠ ملیمەترو، ژمارەیەکی زۆری تریشی بەدوای یەکدا کرد بەناو عێراقدا. لەسەر سنوورەکانیش مووشەکی فڕۆکە شکێنی "ڕاپیر"ی بەریتانیانەی دامەزراند. بەڵام یەکێتی شۆرەوی چەکێکی بێشوماری هەمەجۆری پێشکەوتووی بەعێراق دا، هەر لە کۆپتەرو فڕۆکەی جەنگییەوە بیگرە تا دەگاتە تانک.

هێزەکانی عێراق بەپشتیوانی تانک و فڕۆکە، بە خێرایی کو ەکانیان لەدەشتاییەکانی هەولێرەوە بەرەو چیا سەختەکانیان کردەو . ئەگەر ی کورد پرد ی سەرێکی ڕێگای چیای سەختی "گەلی عەلی بەگ"یان تەقاندەوە. بەڵام کاری لەئەندازیارانی سوپای عێراق نەکردو ڕێگایەکی تریان بەچیاکەدا ڕاکێشا. عێراقییەکا پشت بەهێزی تانکەکانیان لووتیان بەدامێنی چیای کۆرەک و دەشتاییەکانی دەوروبەری شاری دیانا"[24] وەنا ، لەکاتێکدا لەڕیزی پێشمەرگەکاندا پڕوپاگەندەی ناپاکێتی بڵاو بۆوە. "زڤی زامیر"ی بەڕێوەبەری گشتی مۆساد کەشارەزایی تەواوی لەکوردستاندا هەبوو، جارێکی تر ساگی ناردەوە، هەرنەوەندە گەیشتە کوردستان و بۆی دەرکەوت بەرزانی و کوڕەکانی لەسروشتی فرمانی شەڕکردنەکەی سەرکردایەتی عێراق تێناگەن، دەستێکی کەوتە ئەملاو دەستێکی کەوتە ئەولا. وەک دەیوت "دەستەڵاتیان لەدەستدا نەمابوو".

لەئەشکەوتێکی نزیک چیای زۆزکی لای شاری ڕەواندوز، ساگی کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ فەرماندەی هێزەکانی کورددا کرد، بۆی دەرکەوت کورد لەڕووی تەکنیکییەوە لەمەلوەرجێکی ترسناکدان. ساگی چەند کەمینێکی نایەوە کەپێشمەرگەکان بە مووشەکی ساگرو ئاسن و ئەو تۆپە ١٠٦ میلمەترانەی لەتەقاندندا بەدوادا نایەن، تیایاندا بەشداریکرد. ساگی کەزانی تانکە عێراقییەکان لەسەر ڕێگای قیر لانادەن، کەمینێکی بۆنانەوە لەنێو سەعاتدا ١٠٠یانی تێکشکاندو، لە کەمینەکانی تریشدا عێراقییەکان زیانێکی زۆریان لێکەوت. کەچی عێراقییەکان ئەوە ڕاینەگرتن و لەهێرشەکانیاندا بەردەوامبوون و چیای زۆزگیان گرت، هەرچەندە هەردوولا لەشەڕەکەدا چەند جارێک چیاکەیان دەگرت و بەریاندەدایەوە، پاشان بەهۆی بەفربارینەوە

[24] لەڕیزی پێشمەرگەدا دەنگێک هەبوو کە گوایە ناپاکێتی لەئارادایە، چونکە لەکاتێکدا دەستە پێشمەرگەیەک شەو کشاونەتەوە هەر لەوکاتەدا کۆمەڵە تۆپێکی عێراق لەچیاکەوە بەرەو هەمان شوێنی پێشمەرگە لەپانتاییەکاندا شۆڕ بوونەتەوە، ئەویش پرسیار هەڵدەگرێت. دەستە پێشمەرگەکە لەناو خۆیاندا دەمەقاڵێیەکیان بووە – جا ڕاستبێت یان درۆ– گوایە گەڕاونەتەوە بۆلای سەرکردایەتییەکەیان تا ناکۆکییەکەیان بۆ چارەسەربکەن

شەڕەکە خاوبۆوە، بەڵام بەبێنەوەی بەهێجگارەکی بووەستێت. هێزە عێراقییەکان بۆ یەکەمجار لەمێژووی ململانێیاندا لەگەڵ کورددا، لەزستاندا شەڕی ناو چیایان کردو، بۆ دەشتاییەکان نەکشانەوە. ساگای لەمەترسی باروودۆخەکە زۆر ڕاڕابوو، ڕۆیشتەوە بۆ ئیسرائیل تا بە دوای کاردانەوەیەکی لەباردا بگەڕێت.

لەکاتێکدا ساگی هێشتا بیری لەکاردانەوەیەکی بەجێنەکردەوە کە کورد لەوچەڵەمەیە ڕزگاربکات، ڕێککەوتننامەی جەزائیر لە ٦ی ئازاردا بڵاوکرایەوە. شا بەرامبەر گۆڕانکارییەکی گەورە کە لەسنووری نێوان عێراق و ئێراندا کرا، دەستی لە کورد بەردا. لەپڕێکا دوو لیواو نیوی تۆپهاوێـژو تـۆپی دژە فڕۆکەی، لەعێراقـەوە بـەرەو سـنوور. دەبـەردەمی کـوردو ئیسـرائیلییە حەپەسـاوەکاندا کشـانەوەو ئـاودیوی سـنووریکردنەوە، "شـتو، کەکانیان کـۆکردەوەو ئـەو ناوەیـان بەجێهێشـت". ئەفسـەرە ئێرانییـەکان هەسـتیان بـە شـەرمەزارییەکی زۆر دەکـردو ڕاستیشیان بەکوردەکان نەدەوت و کشانەوەکەیان بەگۆڕینی هێزەکان لە قەڵەمدا. ئەمجا لەپڕێکدا ئەفسـەرەکانی مۆسـادیش فرمانیـان لەدەسـتگای سـاڤاکەوە پێگەیشـت کـە یەکسـەر خۆیـان بپێچنەوەو ئەو ناوە بەجێبهێڵن. ئەوەش کۆتاییەکی تاڵی سەرکێشییەکەی کوردبوو.

بەڵام لەتاران، "ئوری لوبرانی" سەفیری ناڕەسمیانەی ئیسرائیل، کە یەکێکبوو لەو کارگێڕە هـەرە کۆنانـەی دەزگـای مۆسـادی جێبەجێکـەرانی "سیاسـەتی دەوروبـەر"، هـەر لەئەسیوبیاوە بیگـرە تـا دەگاتـە لوبنـان، سـەری لـە "تونداییـەتی و دڵرەقـی" شـا سـوڕمابوو. بـەڵام گـەورە لێپرسـراوێکی ئێرانـی گـوێی خـۆی لەناسـتی نارەزاییـەکانی ئیسـرائیل خـەوانـدو ڕەخنەشـی لێدەگرت کە "سیاسەت و سۆز تێکەڵ بە یەکدەکات"، سەبارەت بە ڕێککەوتننامـەی جـەزائیریش پێیوابوو "یارمەتیدانی کەمایەتییەکان خۆی لەخۆیدا ئامانج نیە، بەڵکو شێوازێکن بۆ سـەندنی دەستکەوتی زیاتر لەزۆرینە" و"سیاسەتی چاک"یش ڕاگرتنی یارمەتیەکانە لەکاتی خۆیاندا، تا زۆرترین دەستکەوت لـە زۆرینەکە بە دەستبهێنێ، شاش هەر ڕێک ئەوەیکرد. لوبرانی زانـی کـە ئیسرائیل لـەوەدا بەهەڵەدا چووبوو گوایـە دژایەتییە مێژووییەکـەی فـارس و عـەرەب ناگۆڕێت و تاهەتاشە بەردەوامـدەبێت، هـەر ئـەو بۆچوونەش پـاڵی بەئیسـرائیلەوەنا کە هـانی کـورد بـدات هاوکاری ئێران بکات، کەبیری لـەوە کردەوە هـەرکات شا بە خەیاڵیدا بێـت، ئـەوا چارەنووسـی پێوەندییەکەی ئیسرائیلیش بەئێرانەوە لەچارەنووسی ئەوەکەی کورد باشتر نابێت، موچڕکە بە لەشیدا دەهات.

بەڵام لوبرانی وای یـەکلا دەکردەوە کـەدەیوت:"هـەرگیز شتێکی وام بۆ نەهاتووە کەمشتومڕ لەگـەڵ شـادا بکـەم و بـەرگری لـەکورد بکـەم یـان داوای یارمەتیـدانی مرۆڤایـەتی ئـەو دە هـەزاران

پەنابەرەی لێبکەم کە بەسەر ئێراندا دادەبارین". وتیشی: "بێگومان لەبەرئەوەی ئیسرائیل راستەخۆ لەکارەکەدا بوو، هەستمان بە گوناهباریدەکرد" چونکە وەك رایگەیاند لەسەربڕینی سەدانیان و سەرگەردانکردنی هەزارانیشیان بەناو ئێران و بیابانەکانی خوارووی عێراقدا بەئاگابوو. دوای چەند ساڵێك لوبرانی دەیوت "ئەگەر ئیسرائیل وڵاتێکی پچووکی چوار ملیۆن و نیوی نەبوایەو، بۆ نموونە وڵاتێکی گەورەی بیست و پێنج ملیۆنی بوایە، ئەوا بێگومان بەجۆرێکی تر رەفتارمان دەکرد، دەمانکێشا بەمێژەکەدا بەڵام ئەم قسانەش هەر بۆ بیانوو هێنانەوەی خۆیانبوو. ئەگەرچی ئیسرائیل لاق چوارەم بەهێزترین سوپای دونیایان" لێدەدا، بەڵام ئیسرائیل لەهێزێکی ناوچەیی تاڕادەیەك پچووك بەولاوە کەلەدووری بنکە خۆرهەڵاتییەکەی ناوەڕاستی خۆی بەولاوە نەیتوانیوە پەلبهاوێت هیچی تر نەبووە. هەر رێك لەبەر ئەوەشبوو لەسەرتاوە شا ئیسرائیلییەکانی بۆ تێوەگلان لەکێشەی کورد هاندەدا، چونکە دەیزانی ئیسرائیلییەکان بەتەولومتی پشت بەو دەبەستن و ناشتوانن هیچ هەڕەشەیەك لەسیاسەتەکەی بکەن.

ساڵی دواتر لوبرانی شای ئێرانی بەتەنیا لەدورگەی کیش کەنداوی فارسدا بینی و دەیتوانی زۆر لەڕوو قسەی لەگەڵدا بکات. لەشای پرسی ئەو هاوپەیمانێتییەی لەگەڵ ئیسرائیلدا هەیەتی، بەڕاستی چی دەگەیەنێت. شا زۆر بێپێچوپەنا وەڵامی دایەوە، کە گرنگی ئیسرائیل خاڵێکبوو لەبەکێشکردنی رووزەو قینی عەرەبدا، ئەوەش کاتی پێویستی بۆ ئێران دابیندەکرد تا خۆ بۆ ئەو بەرەنگاربوونەوەیە ئامادەبکات کە دەبوا ڕووی بدایە. لەسەری رۆیشت، پێوەندییە پەتینەکەی نێوان تەلئەبیب و واشنتۆنیش یارمەتی تێگەیاندنی هەڵوێستی راستەقینەی ئێرانی لای ئەمەریکا دەداو، هەر لەو رێگایەشەوە هەڵوێست و سیاسەتی ئەمەریکای بۆ ڕووندەکاتەوە. ئەگەرچی شا لە قسەکانیدا باسی کوردی نەکرد، بەڵام ئەوانیش کاتیان بۆ رەخساند.

گەورە لێپرسراوانی کورد دڵنیان بەوەدا دەنا کە، نزیکەکانی بەرزانی لەو کۆبوونەوە نهێنیانەی هەردوو وەزیری دەرەوەی ئێران و عێراقی ناوەڕاستی ١٩٧٤ بەئاگابوون، کە هەرچی کۆسپی بەردەم رێککەوتننامەکەیان بوو نەیهێشت. بەڵام پێشیان لەسەر ئەوە دادەگرت کەهیچ شتێکی وایان سەبارەت بەنزیکبوونەوەو سەرکەوتنی رێککەوتننامەی جەزائیر نەدەزانی و هەر بەبیریشیاندا نەدەهات. بەهەرحاڵ، بەڵام کورد لە ئیسرائیلییەکان تووڕەبوون. چونکە لە نزیکبوونەوەی دەستبەرداربوونەکەی ئێران ئاگاداری نەکردبوونەوە، پێیان وابوو مۆساد لەهەموو شتێك بەئاگایە، ئەویش بەهۆی ئەو گەشێتییەی بەمۆساد درابوو. بەڵام مێژوونووسە ئیسرائیلییەکان، ئەوەیان رەتدەکردەوەو، دەیانوت ئەوانیش وەك هەموو کەسێکی دی

هەڵەمەکەن، بێئاگاییشیان لەڕووداني شەڕەکەی عەرەبیان بەنموونە دەهێنایەوەو، دەیانوت ئەی حکومەتی ئیسرائیل هێرشەکەی ١٩٧٣ی میسرو سوریای بەلاوە کوتوپڕ نەبوو؟

کەمی نکوڵی لەوە دەکرد کەئێران لەناپاکێتییەکەی جەزائیریدا، پێشەکی هیچی لای ئیسرائیل دركاندبێت. بەڵام مێژوونوسێکی ئیسرائیلی کە لەتاقیکردنەوەکەی هاوپەیمانێتی ئیسرائیل‌و کوردی کۆڵییەوە، دانی بەوەدا نا کەناتوانێت جەخت لەسەر ئەوەبکات کە حکومەتی ئیسرائیل سەبارەت بەنزیکبوونەوەی ناپاکێتییەکە زانیاری لە کورد نەشاردبێتەوە ئەگەر کۆنە هەوڵەکانی ئیسرائیل بۆ لاوازکردنی عێراق لێکبدرێنەوە، ئەوا بەدڵنیاییەوە راگرتنی شەڕی کورد زیانیان پێنەگەیەنێت‌و هیچ سوودێکیشی بۆیان نابێت، بەتایبەتی کەئیتر عێراق لەناردنی هێزەکەیدا بۆ خۆرئاواو بەرەنگاربوونەوەی ئیسرائیل دەستی بەرەلا دەبێت. لەو ماوەیەدا "جۆزێف کرافت"ی رۆژنامەنووس کە نووسینەکانی لەیەك کاتدا لە چەند رۆژنامەیەکدا بلاودەکرێنەوەو لەکیسنجەریشەوە نزیکە، لەو مەترسیانەو باسکردنی رێککەوتننامەی جەزائیر، وای دانابوو کە ئەوانە "زەبرێکی توندە بەڕووی وڵاتە یەکگرتووەکاندا" کە پارێزەرێکی سەرەکی ئیسرائیلە.

دواتر لوبرانی لەقسەیەکی تریدا وتبووی "با وەك کورد تەنیا گازاندە لەو هاوپەیمانانە نەکەین کەهەر رۆژەی لەسەر پەتێك یاریدەکەن، بەرپرسێتی رێککەوتننامەی جەزائیریان بەسەردا ئەهێنین" لەمەدا راستبوو. شەڕ لەبەرژەوەندی کورددا نەبوو، بەغداش، بێئەوەی ئێران زیاتر لەرێگای سەربازیانەوە لەکوردستانی عێراقدا تێوە بگلێت سەرکەوتنێکی دیپلۆماتیانەی گرنگی بۆ شا رەخساند. بەڵام بەرزانییەکان هەرگیز لەئیسرائیل خۆشنەبوون. بەرزانی تا دوارۆژی ژیانی لەئاوارەییەکەی ئەمەریکایدا، وەڵامی هیچ پرسیارێکی نەدەدایەوە سەبارەت بەوەی پێوەندی لەگەڵ ئیسرائیلدا هەبێت، هەر بەئەنقەستیش باسەکەی دەگۆڕی.

مەسعودی کوڕیشی لەو پرسیارانە زیاتر کرژ دەبوو، لەتشرینی یەکەمی ١٩٩١دا، لەسەردانێکی کوردستانی عێراقمدا، بەمەسعودم وت دەمەوێ بچم بۆ ئیسرائیل بەڵکو چاوم بەیەکێك لەو ئەفسەرانەی مۆساد بکەوێت کەلەکێشەی کورددا کاریاندەکرد. کەچی لێهاتوترین‌و پارێزگارترین کوردم لێبووە کەسێکی دی‌و، پێی راگەیاندم کە هەرگیز ئەو لەوباسە نادوێت‌و، بێزارییەکی زۆریشی لەبارەیانەوە دەربڕی. ڕوونیشیکردەوە کە هەر پێوەندییەکی ئیسرائیل ئەو سەرگەردانییەی بەسەر باوکی‌و، بنەماڵەکەی‌و، عەشیرەتەکەی‌و، پارتەکەی‌و، هەموو کوردی عێراقدا هێنا. ئەو پێوەندییە چاکانەی پێشتر لەگەڵ هێزە دەرەکییەکاندا هەمانبوو بشبووینە جێگەی باوەڕیان، بەهۆی ئەوانەوە هەموویمان لەدەستدا [35]. جا بۆچوونەکەیان راستبێت یان

---

[35] بەهەرحاڵ لەگفتوگۆیەکی ساڵی ١٩٩٢یدا لەگەڵ کامەران قەرەداغی رۆژنامەنووسی "الحیاة"دا ئاماژەی بەوە دابوو کەرەتکر. ەوەی کارکردن لەگەڵ ئیسرائیلدا، هەر لەسەر بنا ٪ ی دەرزەکەی رابردوو نییە. چونکە دەیزانی کەئەندامە عەرەبەکانی کۆنگرەی نیشتمانی عێراق ئەوەندە حەز بەو جۆرە پەیوەندیانە ناکەن.

ئا، بەدەم ڕۆژگارەوە کوردەکان گەیشتبوونە ئەو بڕوایەی کەئەگەر بەرژانی ئەو پێوەندییەی لەگەڵ ئیسرائیلدا ئەبەستایە ئەوا لەگەڵ واشنتۆن و شادا وا ساویلکە نەدەبوون.

واش ڕای گشتی ئیسرائیل، بە درێژایی ساڵانی ئایندە، بەڕاستی پشتگیری کێشەی کوردی دەکرد. لەبەهاری ١٩٩١دا کاتێك کورد لەدژی سەدام حسێن ڕاپەڕی و،ئەمجا کە ڕاپەڕینەکەیان تێکشکاو بەرەو ئێران و تورکیا هەڵاتن، کورتە ئیسرائیلییەکان لەبەردەم بارەگای حکومەتدا خۆپیشاندانیانکردو داوایان لەئیسحاق شامیری سەرەك وەزیرانی ئیسرائیل کرد یارمەتی کوردی عێراق بدات. هەندێ یارمەتی مرۆڤانەیان نارد، بەڵام بۆچوونە ڕاستییەکانی سیاسەت بەسەرئەوانی تردا زاڵبوو. "ولیام سافایر"ی نەوسەری نیویۆ ـ تایمز، کە بەلایەنگری تەواوی ئیسرائیل ناسرابوو، بەرامبەر بە بێبایەخد ـەکەی بەکورد سەرز ـ ـتی ئیسرائیلی کرد، کە لەخۆپەرستیانبوورمو ترساون لەوەی ئەوەك ـ ـەربەخۆیی کورد بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دامەزراندنی دەوڵەتی فەلەستین ئاسان بکات، بۆیـ گوێیان پێنەدان.

هەر نەلسەرێك کاری هەواڵگری کردبێت دەزانێت، بڕوابوونی تەواو ئەو بۆچوونانەی کە زیادیان پێوە دەنرێت و تۆمەتی ناڕەوایانە، بەشێکی ناخۆش و جارسکەری ئەو نرخەیە کەلەهەر کارێکی نهێنی دونیای سێیەمدا دەبێت بدرێت. جا کەمێزە دەرمکییەکان لەگەڵ گەلێکی هەژارو ژێردەستی وەك کوردا کاریکەن، ئەوا نرخەکە زۆر گران دەوەستێتەوە. وەك چەند ساڵێك دوای ناپاکێتییەکەی لەکورد کرا ولیام کولبی بەڕێوەبەری ئەوسای "سی.ئای.ئەی" پێی ڕاگەیاندم "تا زیاتر لەم کارانەوە نزیك بی، مەترسی سۆز زاڵبوون زیاتر دەبێت بەتایبەتی بۆئەوانەی ڕاستەوخۆ لە کارەکەدان"[٣٦]. کۆڵبی کەدەستێکی باڵای لەکارەکانی ئاسیادا هەبوو، باش دەیزانی لەچی دەدوێت. بەڵام بۆ ئیسرائیلییەکان ناخۆشییەکە زیاتربوو. هەر وەك لوبرانی دەیوت، لەمانگی ئازاری ١٩٧٥ەوە "خەڵکە ساویلکەکانی ناوچەکە، کوردو ئێرانی و ئەوانی تریش، بڕوای تەواویان بەوەهێنابوو کە جوولەکە بۆپارە هەمووشتێك دەکەن". بەلای ئەوەوە "ئەمەش بەرەوی بیری پێشوەو، نیشاندانی وێنەی جوولەکەی کت ـی - پرۆتۆکۆلاتەکانی دانایانی زایۆنییەکان-ە" واتە ئەو بڵاوکراوە کۆنە دژەسامییەی کەپۆلیسی نهێنی قەیسەری لەڕوسیا، لەسەرەتای ئێستای ئەم چەرخەی ئێستادا دایان نابوو.

---

[٣٦] پێوەندی "سی.ئای.ئەی"و کوردی عێراق بەدرێژایی ساڵانێکی زۆر بۆ ـپێوەندییەکانی ئەمەریکاو ئێران شوێنی مەترسی بوو. هەر لەگەڵ کەوتنی شادا، "ڕای کەیف"ی سەرۆکی بنکەی پێشووی "سی ئای.ئەی" لەتاران بانگکرایەوە تا ژێر بەرژێر لەگەڵ حکومەتە نوێکەی ئێراندا، کە زۆر لەپێوەندی نێوان کوردی ئێران و ئیسرائیل دەترسا، گفتوگۆ بکات. کەیف وتی ئەوەندەی سی ئای ئەی ئاگاداربێت هیچ شتێکی وا لەئارادا نییە

## پەراوێزەكانی بەشی دەوتەم

## سوالكەرە كوێرەكە

چاوپێكەوتنێكی كامەران قەرەداخی نووسەری كاروباری دەرەوە لەرۆژنامەی ((الحیاە)) ی لەندەنی. لەندەن تشرینی دووەمی ١٩٩١.

*"پیرتر دیاربوو"، چاوپێكەوتنی "ناڤوت". تەلئەبیب ١٨ی تشرینی یەكەمی ١٩٩١.

*بیست هەزار دۆلار ((چاوپێكەوتنی ناڤوت)) تەلئەبیب ١٨ی تشرینی یەكەمی ١٩٩١.

*"رۆژنامەنووسێكی بیانی كە بەسەردان هاتبوو"، چاوپێكەوتنی "ئەلیكس نیفتی"ی ئەسوشیەیتدپریس. نیكوسیا. ٢١ی تشرینی یەكەمی ١٩٩١.

*"ئامۆژگاری پاراستنی كردووە كەی ویستبێتی"، گفتوگۆیەك بەتەلەفۆن لەگەڵ "ئەماتزیا بارام". ١٥ی تشرینی یەكەم ١٩٩١.

*"ئەفسەرێكی ئیسرائیلی ... خۆی ئاشكرا كرد"، رۆژنامەی "النور"ی ئەحمەد تاڵەبانی كەلەو رۆژنانەی لەبەرزانی جیابیوونەوە لەبەغدا دەردەچوو، لە ٢٩ی كانونی دووەمی ١٩٦٩دا بە دووروودرێژی ئەمەو پێوەندییەكانی تری بەرزانی ئیسرائیلی خستەڕوو.

*"كورە شارەزای ناوچەكەیە..."، چاوپێكەوتنێكی لیڤاكۆڤ. تەلئەبیب. ٢٠ی تشرینی یەكەمی ١٩٩١.

*"هەر یەكەیان نیشانگرەوەیەكی كارامەیە"، چاوپێكەوتنێكی ساگای. لە "رامات گام" ئیسرائیل. ١٨ی تشرینی یەكەمی ١٩٩١.

*"هەر بۆ شەڕكردن دروستبوون"، چاوپێكەوتنی ساگای. ١٨ی تشرینی یەكەمی ١٩٩١.

*"چەندین كەس سەركەوتنی ئەو شەڕەیان بۆ خۆیان رادەكێشا"، لەنامەیەكی سیامەند عوسماندا بۆ نووسەر. ٢٧ی كانونی دووەمی ١٩٩٣.

*"بۆچوونەكانی بەرزانی لەبارەی شەڕەكەی هەندرێنەوە"، چاوپێكەوتنەكەی ساگای. ١٨ تشرینی یەكەمی ١٩٩١.

*"قەوارەی زیانەكانی ..." بڕوانە:

Rene Mauries. Le Kurdistan ou la mort. Paris, 1967.

*"گفتوگۆکەی ژەنەراڵ ئەهارون یاریف لەگەڵ ساگای"، چاوپێکەوتنی ساگای تشرینی یەکەمی ١٩٩١.

*"هەڵاتنی فرۆکەوان...." بڕوانە. Raviv and Yossi Melman, Evry Spy a Prince, pp. 141-143.

*"ڤایلبونی شا"، بڕوانە کتێبەکەی علەم کەپێشتر ناوی هاتووە.
The Shah and I, The Confidential Diary of Iran s Reyal Court: 1969 - 1977, London 1991 and New York 1992 pp. 41,83, and 84.

*"پیلانی هێرشبردنە سەر کەرکوك"، چاوپێکەوتنەکانی، لیڤاکرۆو سامی عەبدولڕەحمان. ڕەواندوز. ٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٩١.

*"ئێمە بۆ وڵاتە یەکگرتووەکان گرفتێکین"، چاوپێکەوتنی ئاڤور- تەلئەبیب. ١٨ی تشرینی یەکەمی ١٩٩١.

*"هەموو ئەو لێپرسراوە..."، چاوپێکەوتنی عیسمەت ڤانیلی. لوزان. ٣١ی تشرینی یەکەمی ١٩٩١.

*"نێوە دیگول و نیکسونتان ڕووخاند"، بڕوانە:
Matti Golan, Shimon Peres, London p. 150 بەرزانی لەم سەردانانەیدا بەتایبەتی بەنوێکردنەوەی دۆستایەتییە دێرینەکەی لەگەڵ ئەو جولەکە کوڕە کوچکردوەی، کەلە کشانەوەکەی ئێرانی ساڵی ١٩٤٧یدا بەرەو یەکێتی شورەوی ئانی بۆ چەکدارەکانی کڕیبوو، زۆر خۆشحاڵدەبوو.

*"کەمێ مۆساد چاکەی .... ئیسرائیل دەگێڕایەوە"، بڕوانە: The Last Option, p.144 کە کەمێ لەگۆڕانکارییە سەرەکییە سیاسییەکەدا ئامارەیەکی بچووك بەڕۆڵی ئیسرائیل دەکات. "بەردەوام کیسنجەر لەهەوڵەکانی ئێران و ئیسرائیل بۆ هاندان و بەهێزکردنی ڕاپەڕینی کورد ئاگادار دەکراو، قایل کرا کە بێتە پاڵ ئێمەو پشتگیری کورد بکات و بەرەنگای بۆچوونی سیاسەتمەدارانی وەزارەتی دەرەوە بێتەوە کە موریس دراپەر سەرۆکایەتی دەکردو لەو بڕوایەدابوون کە ئەمەریکا لەم کێشەیەدا هیچ سوودێکی نابینێت." بەڵام کیسنجەر بڕیارەکەی لەدڕیانبوو.

*"قسەیەکی نهێنی واهەبوو" ولیام سەفیری لەکتێبەکەیدا کەپێشتر ئاماژەی بۆ کراوە: William Safire. Safiers Washington, New York 1980 لاپەرە ٨٣دا، کە پێشتر لە ٥ی شوباتی ١٩٧٦ دا لە ستوونێکدا بڵاوکرابۆوە، دەڵێت: "کوردەکان هەر بۆ خۆیان حەز دەکەن هێرشێك بکەن بۆ ئەوەی دەریخەن هەم لەبڕیارەکانیاندا سەربەستن و هەم گوشاریش لەسەر

ئیسرائیل کەم بکەنەوە" بەڵام کیسنجەر بەمە قایل نەبوو، لە "١٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٣ دا فرمانی بە ولیام کولبی سەرۆکی هەواڵگران دا کە کوردەکان لەوە ئاگاداربکاتەوە کە
-ئێمە دووپاتی ناکەینەوە، کاری سەربازیی و هێرشبردن، کە حکومەتێکی دی پێشنیاریکردووە، (راپۆرتەکەی پایک دەڵێ مەبەست ئیسرائیلە) بە هیچ جۆرێك لەبەرژەوەندی ئێوە نییە.

*"زۆر گرنگی بەو پێشنیارە نەدا"، چاوپێکەوتنێکی دکتۆر مەحمود عوسمان. سلێمانی. ٨ی تشرینی یەکەمی ١٩٩١.

*"لەیادداشتەکانی خۆیدا"، بروانە کیسنجەر:
White House Years, New York 1975 p.1265

*" ئەگەر کوردەکان ... بەتەواوی لەناویان بەرن"، چاوپێکـ ـکی کیسنجەر. مارتا ڤاینیارد. ٢٣ی ئابی ١٩٩٢.

*"من بۆچوونێکی وام لا گەڵاڵە ببوو کە ئیسرائیلییەکان"، هەمان سەرچاوە.

*"من حەزناکەم بەوە لەکەدار کردنێ"، ئەسەدولعەلەم.
The Shah and I, p. 327.

*"دەرێشکەوت بیکەلێن"، ساگی. ١٨ی تشرینی یەکەمی ١٩٩١.

*"ساگی ... دەستێکی کەوتە ئەم لاو دەستێکی کەوتە ئەولا" هەمان سەرچاوە .

*"لەریزی پێشمەرگەدا ... ناپاکێتی لەئارادایە"، گفتوگۆیەکی تەلەفۆنی لەگەڵ کامەران قەرەداخیدا. ٢٨ی کانونی دووەمی ١٩٩٤.

*"لەپرێکدا دوولیواو نیوی تۆپهاوێژ ...و کشانەوەکەیان بەگۆڕینی هێزەکان لە قەڵەمدا"، بروانە The Last Option ی کەمحی، لاپەڕە ١٩٥.

*"فرمانیان لەدەستگای مۆسادەوە پێگەیشت کە یەکسەر خۆیان بپێچنەوە؟"، چاوپێکەوتنی -نوری لوبریانی- وەزارەتی بەرگری لە تەلئەبیب. ١٨ی تشرینی یەکەمی ١٩٩١.

*"سەری لەدڕندایەتیی و دڵرەقی شا سوڕمابوو"، هەمان سەرچاوە

*"گەورە لێپرسراوێکی ئێرانی" بروانە: کەمحی .The Last Option p.195

*"گەورە لێپرسراوانی کورد دانیان بەوەدا نا"، لە گفتوگۆیەکی ٢٨ی کانونی دووەمی ١٩٩٤ی تەلەفۆنیدا کامەران قەرەداخی وتی، دوکتۆر مەحمود عوسمان، کە ئەوسا نزیکترین راوێژکاری ژەنەراڵ بەرزانی بوو، دڵنی بەوەدا ناوە کە سەرکردایەتییەکەی لەپێکگەیشتنەکەی هەردوو وەزیری دەرەوەی عێراق و ئێران بەئاگابووە، هەڵەکەی ئێمە لەوەدابوو کە ئەدەمات بەبیرماندا ئەو پێکگەیشتنانەی چەند مانگێکیان خایاند، گەیشتبێتە سەر یۆخی بەدیهێنانی رێککەوتنێکی چەسپاو.

*"کەس نکولی لەوە دەکرد" ، بڕوانە کەس: The Last Option, p.195 .

*"بەلام مێژوو نووسێکی ئیسرائیلی"، گفتوگۆیەکی تەلەفۆنی – نوفرا بینگیو- لە سەنتەری دایان، زانکۆی تەلئەبیب. ئیسرائیل. ١٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٩١.

*"بەرزانی هەر بەئەنقەستیش باسەکەی دەگۆڕی، چاوپێکەوتنێکی موریس دراپەر لەواشنتۆن دی سی. ١٨ی کانونی یەکەمی ١٩٩١.

*"ولیام سافایەری لە ستونێکی International Herald Tribune ی ٢ی نیسانی ١٩٩١. هەمان بیناپەخی لەلایەن "مارلین فتز واتر" قسەکەری کۆشکی سپی، ٧/٦ی نیسان و "جوزیف فلچر"، کە لە ١٠ی نیسانی ١٩٩١ی هەمان رۆژنامەدا بلاوکرابۆوە.

*"تا زیاتر لەم کارانە نزیك بێ"، چاوپێکەوتنی ولیام کوئبی لە واشنتۆن دی سی ٢٠ی کانونی یەکەمی ١٩٩١.

*"کاری هەوالگری"، لەگفتوگۆیەکی تەلەفۆنی کامەران قەرەداخی ٢٨ی کانونی دووەمی ١٩٩٣دا، وتی فریدریك کیونی راوێژکاری سەربازی ئەمەریکاییەکان بۆ گێڕانەوەی کوردە ئاوارەکان بۆ شوێنەکانی خۆیان، چاوپێکەوتنێکی ١٣ی کانونی یەکەمی ١٩٩١، رایگەیاند کە لەنزیك شاری دیانای کوردەکانەوە ڕووبەڕووی سێ کەس بۆتەوە کە بەزمانی عیبری دەدوان، بەلام بۆی ڕوون نەبۆوە کە داخۆ لەوێدا چیانەکرد.

*"خەلکە ساویلکەکان ناوچەکە"، چاوپێکەوتنی –لیوبرانی– ١٨ی تشرینی یەکەمی ١٩٩١.

( ٨ )

# عەلی کیمیاوی [٣٧]

# "بۆ سەرکەوتنی شەیتان ئەوەندە بەسە کەخێرخوازەکان هیچی لەدژ نەکەن"

ئەدموند بورك

لەهاوینی ١٩٩٤دا "سیمون ڤیزنتاڵ" بەهەمان ئەو گەشی و ڕووخۆشییەی یەکەم پێکگەیشتنی چارەکە سەدەیەك کەپێشترمان گوێنلوا ڵەمبوو. ساڵی ١٩٦٨کە بۆ یەکەمین جار لەنووسینگەکەی ڤییەننای خۆی سەردانمانکرد، لەوکاتە من لەوارشۆ هێشتا پەیامنێری ڕۆژنامەی "نیویورك تایمز"ی ئەمەریکایی بووم، ئەویش لەڕاونانی ئەو نازیانە کۆڵی نەدەداو بێزاریش نەدەبوو، کەگوایە بۆ ڕزگارکردنی ئەورووپا لەجوولەکە "دوا چارەسەرەکەی کێشەی جوولەکە"ی هێتلەریان جێبەجێکردبوو. من لەبارودۆخی ئەورووپای خۆرهەڵاتەوە دووربووم، پێویستیم بەیارمەتی ئەو هەبوو، تا لەکارە داینەمیکییە دژیە سامییەکانی ناو ئەو وڵاتە بگەیشتمایە کەهێتلەر بەرنامەیەك جوولەکە قڕانی تیادا کردبوو ڕەنگە کەس وای تیادا نەمابێت. ئەوساڵە هەڵمەتی دژە سەهیۆنیزمی بەرزەفتر تیادا دەبینرا، کە لەململانێی گەرمی ناو بیروکراتییەکانی پارتی کۆمۆنیستی پۆلۆنیاوە هاتبوو. ڤیزنتاڵ زۆر بەهێمنی داواکارییەکەمی جێبەجێکرد.

لەمجارەیان هاتبوومەوە بۆ ڤییەننا تا هۆکاری ئەوسزا سامناکەم تێبگەیەنێت کە سەدام حسێن لەکوردی عێراقی کردبوو، چونکە زۆر لەو سزایانەی "شەرداخ" و "میشاخ" و "ئەییدینگۆ" بەسوێتربوو، کەبەپێی "سەردەمی کۆن"، "ئەبوخودنەسر" فڕێیدابوونە

[٣٧] وەك لەکۆتایی هەڵمەتەکانەدا "کیمیایی" بەسەر ((عەلی حەسەن مەجید)) دا بڕا (وەرگێڕ)

مەنجەنیقێکەوە، (ڕەنگە مەنجەنیقەکە چانە ڤیرێکی سەرکانە نەوتە نوێکانی ئەمڕۆی کەرکوکی کوردستان بووبێت). جا ئەگەر کەسەکانی ناو تەورات ڕزگارکرابێتن، ئەک وەکو کوردە عێراقییەکان بەرچەکی کیمیاوییان دابن و گوندەکانیشیان تەختکرابن و، ڕاگوێزرابن و بەدەیان هەزاریشیان لەگۆترە گوللەبارانکران و کۆمەڵکوژکران و، بەچەندین شێوەی تریش لەناوبران، بەڕادەیەك تاوانی "هونەرنواندن"[38] لەشێوەی کوشتنەکەیاندا خرایە پاڵ سەدام حسێن.

بەمیولبووم ڤیزنتال ئەو هۆیانەم تێبگەیەنێت کە دیکتاتۆرە هاوچەرخەکان، جا ئەڵمانیایی بن یان خۆرهەڵاتی ناوەڕاستی، چۆنچۆنی ئەم تاوانە ترسناکانە وا بەوردی دادەڕێژن و هونەری تیادا دەنوێنن و پشت بەشێوازی کۆمەڵکوژی دەبەستن ئەی دەبێت هۆی گوێپێنەدان و ڕێنەگرتنی دونیای دەرێشەوە لە ڕوودانی ئەو کارەساتە ناهەموار پێبێت. ئەمدەزانی ڤیزنتال هیچ شتێکی وا لەبارەی کوردەوە دەزانێت و لەکارەساتەکەشیار ...ئایە. بەڵام دەمزانی خاڵێکی لاوازی بەرامبەر ڕۆژنامەنووسان هەیە بۆیە ک. بارەی شتی گرنگەوە پرسیارم لێدەکرد هیچ دوودڵییەکم نەدەکرد، خۆشم وانیشاندەدا کەبەلامەوە گرنگنەبن. زۆرشت هەبوو لێی تێنەدەگەیشتم، بۆیە لەچارەسەرکردنەکەیدا خۆم بەبێ ویژدان نەدەزانی. پێموابوو یەکێك کەلەمێژووی دامەزراندنی دەزگایەکی کۆمەڵکوژی ئەم سەدەیەدا پسپۆڕبێت، دەبێت چەند وەڵامێکی بۆ بەسەرهاتەکەی کوردیش هەبێت، هەرچەندە لەگەڵ گەورەیی و کاریگەرێتی "کووورە مرۆڤ سووتێن"کەی نازییەکاندا، کەجوولەکەکانیان تیادا سووتاند بەراورد ناکرێت.

من لەکردنەوەی ئەم باسەدا تاڕادەیەك وریابووم، چونکە ئەو دەیان ساڵەی لە ئەفەریکاو ئاسیاو خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا بەهەواڵی جەنگ و پێشێلکردنەکانی ماڤ مرۆڤەوە خەریکبووم، وا ڤاڵیانکردبووم کە دەبێت بەرامبەر بەو تۆمەتە گەورانەی دەخرێنەپاڵ هەرلایەك، کەخراپترینیان و تەنانەت قەڵاچۆکردنە گەورەکانیشیان کە هەندێکیان دەگەیشتنە جینۆساید، یان کەلایەنی کەم کوورەی مرۆڤ سووتاندنی نوێ، وریایانە ڕەفتاربکەم. ئەم بەراوردە بەمجۆرە ئاسانە، جیاوازییە

---

[38] لەعێراقدا لەسێدارەدان و گوللەبارانکردنی بێ دادگایی بەجۆرێکی وا پەرەی سەندبوو ببووە هونەر نواندن. لەو شێوانەی بەکاردەهێنران: کیمیابارانکردنی خەڵکی مەدەنی، بەکۆمەڵ گوللەبارانکردن، زیندەبەچاڵکردن، یان هەر بەزیندوێتی شتی قورسیان بەلاقیانەوە دەبەست و تووریان دەدانە ناو ڕووبارەکانەوە. بە تالیۆم- "کەمبۆ مشك کوشتن بەکاردەهێنرێت" یان ژەهری تر دەرمانخوارد کردنیان. بریندارکردنی دڵ و دەستبەسەرەکانی دی بۆئەوەی تا مردن خوێنیان لێبڕوات، خاڤڵکوژی، کوشتن بەکارەساتی ئۆتۆمۆبێل یان بەردانەوەیان لەکۆپتەرەوە. ئەمە بێجگە لەوەی کەلە مەلومەرجێکی نادیاردا دەگیرێن بەشێوەیەکی نەزانراو بەدەم ئازارو ئەشکەنجەدانەوە دەکوژران. (سەرچاوە: سەرەونگومکردن و کوشتن لەسەر سیاسەت قەیرانەکانی ماڤ مرۆڤ لەنەوەتەکاندا/ ئامیلکەیەکی ئەمنستی ئەنتەر ئاسیۆنالی ١٩٩٤)

سەرەکی و بنبڕەکانی نێوان کوورەو هەموو کۆمەڵکوژییەکانی دی پشتگوێنەخات. جوولەکەکانی ئەورووپا دژایەتییەکی ولیان نەکردبوو، تەنانەت هیچ کاتێك چەکیان بەڕووی دوژمنەکانیاندا بەرز نەکردبۆوە. بێگومان هیچ بەرپرسیارییەکیان لەهیچ شتێکدا نەبووە بۆیە ناکرێت لەدووریشەوە بەچەك دەستدانەکەی کورد بەراورد بکرێت، یان بزووتنەوەی نەتەوەیی ئەرمەنیی دژ بەعوسمانییەکان، کەلەکاتی جەنگی جیهانی یەکەمدا گڕی لە پلیتەی یەکەمین قڕکردنی مرۆڤی سەدەی بیستەم بەردا، بەراورد بکرێن. کوردیش لەڕشتنی خوێنی ئەو ملیۆن ئەرمەنییەدا بێتاوان نییە. ئەوەی مێژووی کوردی لەکەدار کرد رۆڵی سەرەکیانبوو لەو قەڵاچۆکردنانەدا، جا تاکە تاك بەشداریانکردبێت، یان کۆمەڵە خەڵکی هەشیرەتەکانیان، یان وەك ئەندام لە "سوارەی حەمیدییەی عوسمانییەکان"دا بووبن (کەبەهەمان شێوەی سوارەی قەوقازە ڕووسییەکانی ڕوسیای قەیسەری دامەزرابوون). ئەوەش هەر زیانی زۆری بەکورد گەیاند. واش لێکۆڵینەوەکانی لیژنەی کاروباری دەرەوەی ئەنجومەنی پیرانی ئەمەریکاو، رێکخراوی لێبوردنی نێو دەوڵەتان "ئەمنستی ئەنتەر ناشیۆناڵ" و دەستگای چاودێری ماڤ مرۆڤو چەند دەستگایەکی ترو کورد خۆشی، دەریانخست کە عێراقی سەدام حسێن بە جینۆساید تاوانبارە، ئەویش بەپێی ناوەڕۆکی بەڵگەنامەکەی ١٩٤٨ی نەتەوە یەکگرتووەکان بە "هەوڵی قڕکردنی تەواو یان بەشێك لەو کەسانەی لەسەر نەتەوە، یان ڕەگەز، یان بنەچە، یان ئاین، دەدرێن" پێناسەکراوە.

لەئەنجامدا بۆم دەرکەوت کە گومان و ترسەکە لەجێگای خۆیاندا نەبوون و، ڤیزنتاڵ پرسیارەکانی بەلاوە سەیرنەبوو، چونکە ئوتابیانی کورد پێشم کەوتبوون و چەند ساڵێك پێشتر، تا تێبگەن ئەو کارەساتانەی بەسەر کورددا هاتووە چ جێگایەکی لەناو زنجیرە کارەساتەکانی سەدەی بیستەمی ئاهەمواردا دەبێت، پرسیارەکانیان لێکردبوو.

مێژوونووسی ئەو جوولەکە قڕکردنەی نازییەکان، پێی وابوو کە میکانیکییەتی کوورەی مرۆڤ سووتاندنەکەی هێتلەر نموونەیەکی هەمانشتی دادگا پشکنەرەکانی ئیسپانیا بێت. بناغەی لێکۆڵینەوەکەی ڤیزنتاڵ لەوەوە هاتبوو کەتاکە جیاوازی نێوان ئامێری "تورکیمادا"کەبەبادانی پەنجە تووتەوە بەندە تا دەیشکێنێت وەختا کوورەکانی گرتووخانەی "ئوشڤیتز"، هەر کاری تەکنۆلۆژیا بووبێت. دەشڵێت، خۆ ئەگەر دادگا پشکنەرە ئیسپانییەکانی سەدەی پانزە، ئەو شێوازە پیشەسازییە پێشکەوتوانەیان لەبەر دەستدا بوایە ئەوا بستێ یەك جوولەکەیان بەقەرز نەدەدا.

پێدەچێت چەند فاکتەرێکی تر کاری خۆیان لەعێراقدا کردبێت و هێتلەر تەنیا کەس نەبووبێت بەو قەڵاچۆیانەی جینەجێییکردن، لەدادگای پشکنینی ئیسپانیاوە شتی بەبیردا هاتبێت. "هنری

مۆرگنتاو"ی بالوێزی ئەمەریکای کاتی کۆمەڵکوژییەکەی ساڵی ١٩١٥ی ئەرمەنییەکان لەئیمپراتۆریەتی عوسمانیبوو، باسدەکات، ((بەدری بێگی)) بەڕێوەبەری پۆلیسی ئەستانە پێی ڕاگەیاندبوو، کەحکومەتی تورکیا "زۆر بەووردی و بە پەرۆشەوە، لەڕاپۆرتەکانی دادگای پشکنینی ئیسپانیاو چەند دەقێکی تری سەبارەت بەجۆری ئازاردانە کۆنەکان کۆڵییەوەو، بڕیاریشی دائەو شێوازانە بەکاربهێنێت کەلێیان دەرهێنابوو". بەلای ڤیزنتالەوە، بازنەکە یەماتنی هێتلەر تەواوبوو، کەبنچی دژایەتیکردنەکەی سامییەکانی بۆ کاتۆلیکییە ڕۆمانییەکان و دادگا پشکنینەکانی ئیسپانیا دەگێڕایەوەو، ڕۆژێکیش چییە بەدڵبوونییەکەی تورکی ئەدەشاردەوە (یەکلایشە کە بنبڕکردنە هێجگارەکەی ئەلبێنییە جیاخوازەکانی باشووری خۆرئاوای فەرەنسای سەدەی سیانزەش، کە "سیمون دومونتفورن" بەداوای ڕۆما کرد؛ ئاریان تێکردبوو). لەگەڵ هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی دووەمدا، لەئابی ١٩٣٩و لەکاتی داگیرکردنی پۆڵەندادا، هێتلەر فرمانی بە ژەنەراڵەکانیدا "کەبێڕەحمانە هەرچی پیاو و ژن و منداڵی پۆڵەندییەکان هەیە بیانکوژن". ئیتر دەبێ ئەمڕۆ کێ باسی لەناوبردنی ئەمەرنییەکان بکات؟

هێتلەرو سەدام حسێن، لەوەدا کەهەرچییەك دەکەن دەبێت بنووسرێنەوەو، هەردووکیشیان دڵنیابوون کەڕۆژێك لەڕۆژان لەسەر کردەوەکانیان هیچیان لەگەڵدا ناکرێت، وەك یەك وابوون. ڤیزنتال دەڵێت: "نازییەکان تۆمارگەکانیان لای خۆیان دەپاراست، چونکە پێیان وابوو کارەکانیان بۆ دەچێتەسەرو شانازیشیان پێوە دەکرد" دەشیوت: "هیچ ئەڵمانییەك تەنانەت بیریشی لەوە نەدەکردەوە کەبەڕووی هێتلەردا بوەستێتەوە. بواری لێپرسینەوەی کارەکانیشی هەر لەئارادا نەبوو". دوای ئەوەی ئارەزووی دەستگا ئاسایشییە پێشکەوتوو کێبەرکێکانی سەدام حسێنم بۆ باسکرد، کە تۆمارگەی چالاکییە ووردو ترسناکەکانیان پاراستووە. لەم دەستگایانە هەر بەوەشەوە نەوەستاون بەڵگەنامەو سەرچاوەو وێنە تایبەتییەکان بپارێزن، بەڵکو زانیاری نهێنیشیان سەبارەت بەکارە نهێنییەکانیان، لەکۆمپیوتەرو شریتی تۆمارکراوی دەنگ و ڤیدیۆدا پاراستووە. کە وتیشم هەواڵگرەکانی "ستازی" ڕژێمی کۆمۆنیستی ئەڵمانیای باکوور، بەدرێژایی ساڵانی ڕابردوو، یارمەتی تەقەنی گرنگیان بەهەواڵگرانی عێراقی داوە، ڤیزنتال هەر هەناسەیەکی ئاگاداربوونی لەکارەکە هەڵکێشا.

ڕژێمی عێراق ئەوەندە باوەڕی بەخۆبوو کە سەرکردەکانیان هەرگیز بیریان لەوە نەکردبووەوە بەڵگەنامەو دەلیلی تاوانیان بکەوێتە دەست قوربانییەکانیان. لەسەر هەموو شتێکی تریشەوە ئەو بەڵگەنامەو دەلیلانە ڕاستی قسەکەی ڤازینتاڵیان دەگەیاند بەوەی کەڕژێمی عێراق هەوڵی بەدەستهێنانی تەکنۆلۆژیای پێشکەوتوی بووە.

هەرچەندە تێبینییەکانی ڤیزنتال گرنگ و بەسوودیشبوون، بەڵام هەستمکرد شێوە خۆرهەڵاتییە ناوەڕاستییەکەی شێوازی عێراقییەکانی بەسەردا زەتبوبێت. لەو پاش نیوەڕۆ سەرماو سۆڵەیەی شوباتی ١٩٩٢دا هوشیار زێباری لەبارەگای شاری سەلاحەدینی پارتی دیموکراتی کوردستان شتێکی لەبارەی شریتێکی ڤیدیۆوە بۆ باسکردم، سەبارەت بەوەی کەسەدام حسێن بەکوردی کردووە، بەتەواوەتی پەشۆکاندمی. ئەو ڕۆژە گەرمەلوولی بەفر ڕێی لەمیوان دابارینە ئاساییەکەی گرتبوو، زێباری بۆ یەکەمجار جۆرە بەڵگەنامەیەکی نیشاندام کە بەچاکی وردە کارییە ئیقلیمگیرێتییەکەی هەواڵگرانی عێراقم لادەرخات. بەسەرهاتی خێزانەکەی خۆیی بۆ گێڕامەوە[39]. پێش ئەیلولی ساڵی ١٩٨٠ کە سەدام تیایدا ئێرانی داگیرکردو بەهۆیەوە ئاگری شەڕێکی هەشت ساڵەی هەڵگیرساند، هەرسێ براکەی زێباری لەشاری موسڵی ژێر سایەی حکومەتی عێراقدا دەژیان. هیچ کام لەو برایانەی سیاسەتیان نەدەکردو لەچالاکەکانی بزوتنەوەی کوردیش نەبوون، ئەگینا نەیاندەتوانی لەناو شاردا بژیانایە. بەڵام ئەوساکە هوشیار ببوە یەکێک لەیاریدەرە نزیکەکانی مەسعود بەرزانی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان.

ئەوەش بەسبووە بۆئەوەی کەژیانیان لێ تاریک بکات، هەرسێ برا لەهەواڵگری عێراقەوە یەک جۆر نامەیان پێدەگات: "هوشیار دەبێت هیچ چالاکییەکی لەپارتی دیموکراتی کوردستاندا نەمێنێت". هەرسێ براکەش وایان وەڵام دابۆوە کەئەوان هاوڵاتین و ڕێز لەیاسادەگرن و، هیچ پێوەندییەکیشیان بەهوشیارەوە نییەو، ناشتوانن کاری تێبکەن. هەواڵگرانی عێراق ناردی بەدوای یەکێکیاندا و، ناچاریانکرد پەرداخێک لیمۆ، کەدواییی دەرکەوت تێکەڵ بە "تالیۆم" کە "ژەهری مشک"ی پێدەوترێت، بخواتەوەو نەشیان هێشت پزیشکە عێراقییەکان چاری بکەن. بەڵام پزیشکێکی پارتی دیموکراتی کوردستان ڕزگاریکرد. کەچاکبۆوە دیسانەوە ناردیانەوە بەدوایدا. کارێکیانکرد کە برینپێچێک دەرزییەکی کوشندەی لێبدات. ئەمجا دووبراکەی تریشیان بانگکردو دیسانەوە چالاکیەکانی هوشیاری ناو پارتیان لەگەڵدا باسکردنەوە، لە گەڕانەوەیاندا هەردووکیان بە"کارەساتی ئۆتۆمۆبێل کوژران.

---

[39] بەرزانییە نەتەوەییەکان و زێبارییە جاشەکان هەر لەکۆنەوە دوژمنایەتیان هەبووەو هەر واشدەبن. یەکێک لەژنەکانی مەلا مستەفای بەرزانی کچی سەرکردەیەکی زێبارییبوو، ئەویش بەپێی دەستووری عەشایەریانەو بەو میوانیەی برینی ناکۆکییەکەیان سارێژ بکات. ئەم ژنهێنانە کەلەمەوو پووەیەکەوە سەرکەوت و مەسعودو بەرزانی هەرەمێکی بوو بەختیاری لێکەوتەوە. هوشیار زێباری لە ڕێساکە لایدابوو چونکە لەنزیکەوە پشتگیری بەرزانی دەکرد.

ئەمجا هوشیار هاتە سەرباسی ئەو شریتە ڤیدیۆیەی کەپێشمەرگە، لەو یەك مەفتەیەی مانگی ئازاری ١٩٩١یدا کەدەستیان بەسەر کەرکوکدا گرتبوو، لەماڵی کۆنە سەرکردەیەکی هێزە عێراقییەکانی ناو کوردستاندا چنگیان کەوتبوو. لەم شریتەدا گوللەبارانکردنێکی تیادابوو کە بەئاشکراو بەئامادەبوونی ئەندامە گرنگەکانی بەعسی دەستەڵاتدارو لێپرسراوانی حکومەت و، قەڵەباڵغییەکی زۆرو بەدەم هەلهەلەکێشان و هاندانی ئامادەبووانەوە دەکرا. سەرەتا گوللەبارانکەران تەقەیان لەپێنج قوربانی کورد کرد کەبەدارەوە بەسترابوونەوەو بەجەمەدانییەکانی خۆشیان چاویان پێچرابۆوە. گوللەبارانکەران بەتفەنگی کلاشینکۆف "ئا.ك.٤٧"ی شۆرەویانە تەقەیانکرد، تاماوەیەکی زۆری واي مردنیشیان هەر تەقەیان لێدەکردن. ئەمجا ئەفسەرێکی عێراقی بە دەمانچەکەی خۆی گوللە[...]زەیی بەهەر یەکێکیانەوە نا. بەلام ئەوەی تەواو سەرسامی کردبووم، ئەفسەرێکی تریش گوللەی تری بەلاشەکانەوە دەنا. ئەگەرچی شریتەکە لەپڕێکدا کۆتاییهات، بەلام هیچ گومانی تیادا نییە کەچی ئەفسەری عێراقی لەوێدابووە، یەك بەدوای یەك لەگوللە بارانکردنی ئەو پێنج کوردەدا بەشداریانکردبووە.

دووبارەبوونەوەی ئەمجۆرە کوشتنانە، قسەیەکی "فریا ستراك"ی بەبیرەخستمەوە، ئەو ژنە بەریتانیاییە شارەزاو رەخنەگرەی کاروباری ناوچەکە، کەباسی گوللە بارانکردنی نوری سەعید ی سەرۆکی وەزیرانی پێشوتری عێراقی دەگێڕایەوە. کاتێك شۆڕشی ١٩٥٨ کۆتایی بەرژێمە شاهانە پشت بە بەریتانیا قایمەکە هێنا، نوری پاشا ویستبوی بە بەرگی ژنانەوە خۆی دەرباز بکات، بەلام حەشاماتە هەڵچووەکەی بەغدا گرتبوویان و کوشتبوویان. شەوی دواتر دوژمنەکانی چواردە گۆڕیان هەڵدایەوە تا تەرمیان دۆزییەوەو فڕێیاندایە سەر شەقامەکان و زۆریشیان لەشۆفێرەکانیدەکرد کە بە ئۆتۆمۆبێلەکانیان بەسەریا بڕۆن و بڕۆنەوە. ستارك کەدۆستایەتییەکی توندی لەگەڵ نوری سەعیددا هەبوو، سەبارەت بەو "دڕندایەتییەی عێراقییەکان بەدرێژایی مێژوو ناوبانگیان پێدەرکردبوو" وتی "هاتوچۆی دڵابی سەعاتی مەرگ لەزۆر کۆنەوە بەم وڵاتە نامۆ نییە، هەر لەکوشتنی "ئیمامی عەلی"خوای لێ رازی بێت، کەئامۆزاو زاوای "محەممەد – سلاوی خوای لێ بێت"و خەلیفەی چوارەمیشبوو، لە ٦٦١ی زاینیشدا مەزەبی شیعەی دامەزراندو، لەشاری کوفەدا کوژرا، بۆتە بەشێك لەئادگاری. پێدەچێ زۆر لەکۆنەوە ئەوە پیشەیان بووبێت، چونکە ئەو قەلاچۆکردنەی کەس و کاری پێغەمبەریش بەم حاکە نوێ نەبووە".

داخۆ لەپاڵ ئەو سامناکییەی شریتەکەدا، شتێکی ترمابێت من بەتەواوەتی لێی تێنەگەیشتبم؟ باشە گوللەنان بەو لاشە کەوتووانەو پڕکردنیان لەفیشەك بۆ؟. لەوەلامی ئەو پرسیارەمدا وتیان، پۆلیسی نهێنی عێراق خۆشییان لەوە دەبینی کەپارەی فیشەکی

گوللەبارانکردنەکە لەکەسوکاری قوربانییەکان بسەنننەوە، -ئەمە جگە لەنرخی کفن و گواستنەوەشیان- هەموو ئەوانە پێش ئەوەی لاشەکانیان بدەنەوە تا بیاننێژن. پرسیم، داخۆ جگە لەمردن هیچ کارێکی ئەوتۆی تر دەمێنێت بیکەن؟ هوشیار بەپشێوی و سەرلێتێکچوونەکەم پێکەنی. چونکە ئەوەی بەلای منەوە شتێکی دەگمەن و لەڕادەبەدەربوو، بەلای عێراقییەکانەوە ئاساییبووەو لەگەڵ هەڵسوکەوتی ڕژێمی سەدام حسێندا گونجاوە. هەموو دەیانزانی کاتێک لەساڵی ١٩٧٩دا دەستەلاتی گرتەدەست، وێنەی لەناوبردنی سەرکردە گەورەکانی حیزبی بەعسی گرتبوو. بەسەدان سەرکردەی بەعسی بۆ کۆبوونەوە لەهۆڵێکی گەورەدا کۆکرانەوە، تا گوێ لەدانپیانانی پلانگێڕێک بگرن کە هەڵگەڕابۆوەوبووە هەواڵدەرێکی وا کەئامادەبێت ناوی هەموو ئەو تاوانبارانەی لەپیلانی دەستەلاتگرتنە دەستەکەدا بەشداریانکردووە ئاشکرا بکات. ئیتر هەرچەند ناوی کەسێکی بهێنایە، سەدام حسێن بەچاوی پڕ لەفرمێسکەوە فرمانی بردنەدەرەوەی کەسەکەی دەدا، دەبووە چەپڵەو بەشان و باڵی سەرۆک هەڵدان، پاسەوانەکانیش یەکە یەکە تاوانبارەکانیان دەگرت و بەپەلە دەیانبردنە دەرەوە، ئەمجا سەدام حسێن ئەو وەزیرو سەرکردە بەعسیانەی ناچارکرد کە مابوونەوە لەو تیپانەدا بەشداری بکەن کەتاوانبارەکانیان گوولەبارانەکرد.

ئەمە شێوازێکی شێوێنراوە بۆ پتەوکردنی پێوەندی نێرینەکان، لەئاستە جیاجیاکانی حیزب و دەوڵەتدا بەکاردەهێنرا. هەرچی لێپرسراوانی دەوڵەت هەیە، لەنزمترین پۆلیسی دەزگانهێنییەکانی عێراقەوە بیگرە تا دەگاتە گەورەترین لێپرسراو، بۆ دەرخستنی لایەنگیریتی سەدام حسێن و ملکەچکردن بۆی، بەشداری گوللەبارانکردنەکانیانکرد. جگە لەوانەش، ئەو شریتە ڤیدیۆیەی بەلای منەوە سەیربوو، وای بە سەرکردایەتی عێراق دەگەیاند کەوەك پێویست فرمانەکانیان جێبەجێدەکرێت، ولە ئیتر هیچ کەسێك گومانی لەکاریگەرێتی ئەو کەسانە نابێت کە جێبەجێکردنەکەیان بەرەو ڕووکرابۆوە. هەروەها ئەم شریتە تۆمارکراوانەو شریتی ڤیدیۆکانیش باشترین شت بوون بۆ تۆقاندنی ئەوکەسانەی حەزیان بەستەم و کوشتن و تیرۆر نەبوو. دەستەلاتدارانی عێراق ئەو شریتە ڤیدیۆ تایبەتەی گوللەبارانکردنی بەرهەڵستکارانی ساڵی ١٩٧٩ی سەدامیان دەشتەوە، بۆ جەماوەرێکی دیاریکراویان لێدەدایەوە، کە بەووردی هەڵدەبژێردران و، جگە لەکورتە بەرپرسیارەکانی ناو حیزبی بەعس، ئەوانەشیان تیادابوو کەسەر بە بەغدابوون و ناوی "جاش"یان بەسەردا دابڕابوو، یان لەسوپا هەلاتبوون و لەریزی جاشەکاندا بوون. ئەم کارە چەپەڵانە بەتەواوەتی لەگەڵ پەرەسەندنەکەی دەستەلاتدارێتی بەعس و، ڕژێمێکی ستەمکاری وادا دەگونجا، کە سەدام حسێن و عەشیرەتەکەی بەناوی کەمایەتی سنی عەرەبەوە

کەلەشارەکانی سەر هەردوو رووباری دیجلەو فوراتدا جێگیربوون. وەک شاری تکریتی شوێنی لەدایکبوونەکەی خۆی، وڵات بەڕێوەبەرن. جگە لەوەی رژێمە خاوەنەکەی ئێرانیش خولیا زۆرەکەی سەددامی بۆ ئەو شێوازانەی خۆی هەڵبژاردبوون پتەوترکردو، تا دەهات دڵڕەقانەو سەرکێشانەو دڕندانەتر دەبوون، بەڕادەیەک گەیشتە ئەوەی کە گازی ژەهراوی بەکارهێنان و کۆمەڵکوژی. شێوازی ماقوڵێن بۆ یەکلاکردنەوە، ئەویش نەک لەگەڵ دوژمنانی دەرەوەدا، بەڵکو لەگەڵ هاو وڵاتییە کوردەکانی عێراق خۆشیدا.

ناکرێ شێوازی زۆرداری و ستەمکارییەکانی سەددام حسێن، کەبەردەوام لەزیادبووندابوو کوردیان سەرسام کردبێت، چونکە ئەو هیچ کاتێک تۆڵە سەندنەوەی خۆی لێنەشاردوونەتەوەو،دوژمنایەتییەکەشی شەخسی بوو کەبەلایەنی کەمەوە بۆ دوا بیست ساڵی رابردوو دەگەڕایەوە. ئەگەرچی لەدواڕۆژدا پێویستە مێژوونووسان، نیازی بەعس، لەدەستەڵاتگرتنە دەستەوە بەرامبەر بەکورد دیاری بکەن، چونکە ئەوانەی لەگەڵیاندا ناکۆک بوون، پێیان وایە هەر لەسەرەتاوە لێدان و لەناوبردنی سەرجەم پارتە سیاسییەکانی عێراقیان مەبەستبووە، کەچی لایەنگرەکانی رژێم وایان دەردەخست کەدوای دەستەڵاتگرتنەوە دەستی ١٩٦٨، بەڕاستی ویستوێتی دەستەڵاتی سیاسیانەو سامانی ئەوت لەگەڵ کورددا بەشبکات. راستییەکەی لەو رۆژانەدا رێککەوتن لەگەڵ هەموو لایەنە عێراقییەکان –سنی عەرەب و کوردو شیعەی عەرەبی زۆرینەتی- لەوڵاتێکدا کەلە دوای رووخاندنی رژێمی شایانەو ١٠ ساڵی رەبەق بەردەوام پشێوی سیاسیانەی تیادا بووە، دەگونجا. لایەنگرانی رژێمی بەعس لەوبڕوایەدابوون کە حەزکردنی کورد بە هاوپەیمانێتی دەرەوە، بەتایبەتی بەئێران و ئیسرائیلی شەستەکانەوە، وای لێکردن زیاد بە داولکارییەکانیانەوە بنێن، هەرئەوەش دواجار وای لەبەعس کرد، لەبری رێککەوتن لەگەڵیانداو دانانی سیستەمێکی فیدراڵیانە بۆ عێراق، لەناوبردنی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد بەپێویست بزانێت.

بەهەرحاڵ سەددام حسێن هەرگیز لاوازییەتە زۆرەکەی ساڵی ١٩٧٠ی بەعسی لە بیرناچێتەوە، کە بەڕادەیەکی وابوو ناچاربێت خۆی لەگەڵ کورددا دانوستان بکات و بۆ چارەسەرکردنی کێشەکەشیان ئۆتۆنۆمییەکی چاوەڕواننەکراوو فراوانیان بداتێ. بەلام وەک زانراوە عێراق و سەرجەم وڵاتانی خۆرهەلاتی ناوەڕاستیش تێکەیشتن و گونجانی سیاسیانەو پشت بەرای جەماوەر بەستنیان کەمە، بۆیە دەستەلاتدارانی عێراق بەدڵ هەوڵی جێبەجێکردنی رێککەوتننامەکەیان نەدەدا. لەبری ئەوە هەرکە رژێمەکەی هێزی تێگەڕا، سەددام حسێن لەمەرجەکانی پەشیمانبۆوەو، ویستی ناوچە ئۆتۆنۆمییەکە بێنێتەوەیەک و بەشێکی زۆری ئەو

شوێنانەی لێدابڕێت کەبەڕاستی کورد بەهی خۆیی دادەنێت. جگە لەوەش شێوازی سزادانی، کوشتنی لایەلایی سەرکردەکانیان و، کاولکردنی گوندیان و، ڕاگوێزانیان بۆ خوارووی وڵات هەڵبژارد کە ئەوەشیان وەک نەریتێک لەعوسمانییەکانەوە بۆمابۆوە.

هەر بۆ نموونە، چەند مانگێک دوای ڕێککەوتننامەکە، ڕژێم بەمەبەستی کوشتن تەقەی لەئیدریسی مەلا مستەفا بەرزانی کردو شوفێرەکەی بەرکەوت. دوای ماوەیەکیش قەفەزێک پرتەقاڵی زۆر نایابی بۆ بەرزانی نارد، کە لەناوچەی "شەتولعەرەب"دا لەبن سێبەری دارخورمادا ڕوێنرابوون، بەڵام بەرزانی ئەوەندە بەئاگابوو کە پێشخواردنی، دانەیەکی لێبدات بە بزنێک، ژەهری ناو پرتەقاڵەکە دەست بەجێ بزنەی کوشت.

لە ۲۹ی ئەیلولی ۱۹۷۱یشدا، دیسانەوە بەپلانێکی زۆر سەیر، کە دواتر بەکێشەی تەقینەوەی مەلاکان" ناوی دەرکرد، هەوڵێکی تری کوشتنی بەرزانی درا. ڕژێم تا بزانێت بیروڕای تەواوەتی بەرزانی چۆنە، داوای لەکۆمەڵە پیاوێکی ئایینی کرد کەنیازی سەردانی بەرزانیان هەبوو، بەبیانووی "هەرچییەک دەڵێت تۆمار بکرێت" چەند کەسێکیان قایلکردن کەئامێری پچووکی قسەتۆمارکردن لەژێر جلەکانیانەوە دابنێن، ئەویش بێئەوەی ئەوان لەمینکردنی ئەو ئامێرانە بەئاگابن. وەک هەواڵگرە عێراقییەکانیش بۆی چووبوون، مەلا مستەفا چونکە ڕێزی زۆری بۆ پیاوانی ئاینی هەبوو نەیهێشت پاسەوانەکانی بیانپشکنن. هەر کە کۆبوونەوەکە دەستیپێکرد، بەکرێنگیراوە عێراقییەکان کەوەک شوفێری ئۆتۆمۆبیلەکانیان لەگەڵیاندا چووبوون، بەهۆی چەند سویچێکی ناو ئۆتۆمۆبیلەکانەوە مینەکانی ناو لەشی مەلاکانیان تەقاندەوە. پیاوە ئاینییەکان چوونەوە بۆلای خوای خۆیان و، تا چەند ڕۆژێکیش پارچە گۆشتیان بە بنمیچ و دیواری ژوورەکەوە مابوو. بەڵام بەرزانی کە بەڕێکەوت هیچی لێنەهات و ڕزگاری ببوو، تۆقیبوو، لەکاتی تەقینەوەکەدا چایچییەکە لەبەردەمیدا چای دادەنا و کەوتبووە نێوان ئەوو تەقێنراوەکانەوە کوژرا. لەو بگرەو بەردەیەدا پاسەوانەکانی مەلا مستەفا وایاندەزانی سەرۆکەکەیان کوژراوە بۆیە کەوتنە کوشتنی هەموو ئەوکەسانەی لەنێردراوەکەدابوون و لەتەقینەوەکە دەرباز ببوون، هەر بۆنموونە بەشوێنی ئەو هەموو گوللانەی بەدەرگای ئاودەستەکەوە بوو دیاربوو یەکێک لەو میوانانەیان لەناودا کوشتبێت کەخۆی تێدا حەشاردابوو.

بەدرێژایی ساڵانی ئاینده، بەغدا سنوورە ئیدارییەکانی وڵاتی دەستکاریدەکردو، کوردی لەو ناوچە ستراتیجیانەی دەوری کانە نەوتەکانی کەرکوک و خانەقین، یان نزیک سنووری ئێران و شاری کەرکوک خۆیەوە دەردەکردو، بۆ گۆڕینی هاوسەنگی دانیشتوانی ناوچەکە عەرەبی لەسەر زەوی و زارە بەپیتەکانیاندا جێگیردەکرد. دوای هەرەسی شۆڕشەکەی بەرزانی لەساڵی ۱۹۷۵،

دەست بەیەکەمین کاولکردنی گوندە کوردییەکان کرا، کە ٤٢٤٠ی تا ئەمڕۆ لێتەختکراوە. دوای هەرەسەکەش سەدام حسێن سێ کوڕی بەرزانی "لوقمان،عوبێدوڵا،سابیر"ی کوشت، هەر کە پەناهەندەکانیش لەئێرانەوە گەڕانەوە، دەستەڵاتدارانی عێراق لەیانهەزاریان بۆ بیابانی باشووری وڵات لێناوارەکردن. لەپێش ساڵی ۱۹۷۸دا ۲۰۰۰گوندی کوردیان زیاتر وێرانکردبوو ئەوساڵە هەوتەمین ساڵی جەنگی نێوان سەدام حسێنو ئێران بوو، سەدام بڕیاریدا ڕووی سوپاکەی بۆلای کورد وەرچەرخێنێتو بۆ تۆڵە سەندنەوە شاڵاوێکی توندو تیژیان بکاتەسەر. کوردیش تا بەهێجگاری کار لەکار نەترازا هەستیان بەڕاستی ڕووداوەکە نەکرد. ساڵی ۱۹۷۸دا کەمێ جارێکی تر چاوم بە مەسعود بەرزانی کەوتەوە، پێیوت:"ئەگەر کار وابڕوات ئەوا کورد لەکوردستاندا نامێنێت، چونکە سەدام حسێن پلانەکەی بۆئەوەیە ک وەک گەل لەناومان بەرێت، جا ئیتر یان ئەو یان ئێمە، چونکە لەوەزیاتر هیچ شتێکی ترمان بۆ نەماوەتەوە".

ساڵی ۱۹۸۰ کەشەڕەکەی عێراق و ئێران دەستیپێکرد. زۆربەی کوردی عێراق کارەساتە کوتوپڕەکەی پێنج ساڵ پێشتریان بەتەواوەتی هەرس نەکردبوو. تەمەنی یەک وەچەی تەواویان لەزنجیرە شەڕێکدا بەسەربردو کەچی هێشتا لەمەترسیو کاریگەرێتی ئەو چەکە کوشندانەی بەغدا نەگەیشتبوون، کەهەر لەفڕۆکەی جەنگی "هوکر هانتەر"ەوە بیگرە، کە توانای مناوەراتی لەڕادەبەدەرەو، بەناپاڵمیشەوە تا دەگاتە کۆپتەرە سەربازییەکان هەیانبووە. ئەم جۆرە چەکانە ڕادەی ئەو خۆپارێزییەی هێجگار کەمکردبۆوە کەچیاکان بۆ کوردیان دابیندەکرد. مەترسی گەورەی کورد لەوەدابوو، لەشێوازی ئەو مەترسیانە نەدەگەیشت کەبەرەو ڕوویدەبۆوە. بۆیە کورد بەگشتیو، لایەنگرانی کوڕانی بەرزانی بەتایبەتی، هەڵگیرسانی شەڕی عێراق ئێرانیان بەهەلی تۆڵە سەندنەوە لەعێراق دادەنا، خۆیان ئاسایی بەئاگاییو وریاییان لەبیرچۆوە. ئەو پەندەی هەڵچوونی کوردو خۆبەدەست قەدەرەوەدانیان دەگەیەنێت ئەوەیە: "یەک ڕۆژ ژیانی هەڵۆیانە، لەژیانی تاهەتایی مریشک ئاسا باشترە". بەم پێیە لاوە بەرزانییەکان، بێئەوەی بیر لەو سەرکوتکردنو داپڵۆسینە بکەنەوە، کە کاتێک ئێران لەشەڕەکەدا بدۆڕێتو سەدام حسێنیش لەدەستەڵاتدا بمێنێتەوە، تووشی کورد دێت، جارێکی تر چەکیان لەدژی بەغدا هەڵگرتەوە. ڕاستییەکەی هیچ سەرکردەیەکی کورد لەوانەی چاوم پێیانکەوتبێتو بۆماوەی چەند سەعاتێکی زۆر قسەم لەگەڵدا کردبن، بەجۆرێکی وا بیریان لەکۆتاییهاتنی شەڕی نێوان ئێرانو عێراق نەکردبۆوە کە بەپێچەوانەی ئارەزووی خۆیان بشکێتەوە، جا با ئەوە لاوازکردنی هەرسووڵاشیانبێت. تاقیکردنەوە تاڵەکەی خۆیانیان لەگەڵ شای لێڵبازدا لەبیرچووبۆوەو، هاوپەیمانێتیان لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێراندا دەکرد کە ئایەتوڵا ڕوحوڵا خومەینی ڕابەرایەتی

دەکردو، ستەمو دەستدرێژیکردنەکەی ساڵێك پێشتری سەرکوردی خۆشیان دەنگی دابۆوە. لەماوەی دوای شۆڕشی شوباتی ١٩٧٩دا حکومەتە نوێیەکەی ئێران داواکارییەکانی کوردی بۆ ئۆتۆنۆمی ڕەتکردەوەو زۆر بەتوندی لێیدان.

لەهیچ کاتێکی شەڕی ئێران عێراقدا، سنووری کورد بایەخێکی سەرەکی بۆ جەنگەکە نەبووە، کەچی کەشەڕ لەباشووری عێراقدا گەرمبوو، پێشمەرگەکان خۆیان بەوە دەخەڵەتاند کە لەماوەیەکی کەمدا بەدرێژایی سنوورەکانی تورکیاو ئێران پانتاییەکی بەرینیان ئازادکردووە. کوردستانیش بەسەبەتەی خۆراکی عێراق دادەنراو، زۆربەی ئەو ڕووبارانەی دەڕژانە فوڕاتەوەو چەند ڕووبارێکی تریشی تیادابوو کەعێراقی کردبووە یەکێك لەو وڵاتە عەرەبییە کەمانەی بەشی خۆی خواردن‌و ئاوی هەبێت. هاریکاریکردنی کوردو ئێران ژمارەیەکی زۆری لەسەربازە عێراقییەکان گیرۆدەکردبوو، کەبەرەی شەڕی باشوور زۆر پێویستی پێیانبوو، هەڕەشەیەکیش بوو بۆسەر کانە نەوتەکانی کەرکوك‌و هەردوو بەربەستی "دەربەندیخان"و "دوکان" کە ئاوو ووزەی کارەبایان بە بەغدا دەدا.

ئەم ڕەفتارەی کوردیش سەرتاپا بۆچوونەکانی ڕژێمی عێراقی گۆڕی‌و وای لێکرد کە بەچاوێکی تر سەیری کورد بکات، ئاکامەکەشی زۆر خراپ بەسەر کورددا شکایەوە، بەلای سەدام حسێنەوە هەرچی پێشمەرگە هەیە "گێرەشێوێن" بوون. لەفەرهەنگی بەعسیانیشدا ئەم ناوە بەسەریاندا دابڕا،بێنەوەی کورد بەخۆی بزانێت لەهەموو مافێکی هاو وڵاتێتی عێراق بێبەریکرا، واتە بەبەشێك لەگەلی عێراق دانەدەنران. پێشمەرگەو کوردە مەدەنییەکانی بە یەك چاو سەیر دەکرد، لەو شێوازە هەرە دواکەوتووەی کە نکوڵی لەبوونی دوژمنەکەی بکات‌و حسابی مرۆڤیان بۆبکات. ڕژێم هەموو خۆگرتنێکی تایبەت بە شەڕی نوێی لەشەڕی کورددا ڕەتکردەوە. کاتێکیش سوپای عێراق کەوتە لێدانی یاخیبوونەکەی کورد تا دایمرکێنێتەوە، وەك پاشان دەرکەوت لەنیسانی ١٩٨٧ەوە دەستیپێکردو بەدرێژایی ١٩٨٨یش بەردەوامبوو، شانازی بەبەکارهێنانی چەکی کیمیاوییەوە دەکرد، واشی باسدەکرد کە "جەنگێکە هەموو دونیا ڕێزی لێدەگرێت" ئەو دونیایەی کە "هەموو ئەو ناپاکانەی خۆیان بە دوژمنە چاوبرسییەکانی دەرەوە دەفرۆشن ڕەتدەکاتەوە".

وەك دواتر بۆم دەرکەوت، ئەم زمانە پیسەو شوومە لەمێژووی ناوچەکەدا پێشینەی هەبووە. لێکچوونێکی سەیر لەنێوان سەرنجی بەغدا بۆ کورد، کە بەنا مرۆڤ‌و خۆ فرۆش‌و چوونەپاڵ ئێرانی پیلانگێڕی دادەنا‌و، هەڵوێستی سەرکردایەتی تورك لە ئەرمەن، کەلەساڵی ١٩١٥داو لەجەنگی جیهانی یەکەمدا بەتاوانی هاوکاریکردنی ڕووسەوە لەناوی دەبردن. ئەنوەر پاشای

وەزیری جەنگی تورکیا بەمۆرگەنتاوی وتبوو "دەبێ تێبگەن، کاتێك ئێمە لەدەربەنیل شەڕی مان و نەمانمانەدەکردو، بەهەزاران قوربانیمان لەپێناودا دەدا، نەدەکرا رێگە بەوجۆرە کەسانە بدەین لەپشتەوە لێمانبدەن". دواتر هەواڵگرانی بەریتانیا، دەقی بروسکەیەکی شفرەنووسیان بڵاوکردەوە، کەدەیانوت لەکاتی گرتنی سوریادا بەردەستی هێزەکانی بەریتانیا کەوتووە، لەکاتی جەنگی جیهانی یەکەمدا لە ١٥ی ئەیلولی ١٩١٥دا تەلعەت پاشای وەزیری ناوخۆ دەریکردبوو، دەقەکەی بریتی بوو لەوەی کەحکومەت "بڕیاری قڕکردنی تەواوی هەموو ئەرمەنییەکانی تورکیای داوە" پێشی لەسەر ئەوە دادەگرت کە"دەبێت بنبڕبکرێن و گوێ بەشێوازی دڕندەیەتی جۆری بنبڕکردنەکەش نەدرێت ... پێویستە گوێ بەتەمەن و توخم و ویژدان و هیچ دوودڵییەکیش لەجێبەجێکردنەکەیدا نەدرێت".

عەلی حەسەن مەجیدی ئامۆزای سەدام حسێن و بالاترین سەرکردەی هێزەکانی لەکوردستاندا، بەهەمان شێوە بیری دەکردەوە. هەرئەوەندەی لە٣ی ئازاری ١٩٨٧دا بووە سکرتێری گشتی نووسینگەی رێکخستنی باکووری پارتی بەعس، ئیتر کاریگەرێتی و دڵڕەقێتی لەبەجێهێنانی کارەکەیدا بەجۆرێك دیاریدا کەبۆ کورد خۆشی شتێکی کوتوپڕبوو. چونکە بەدرێژایی ململانێی دووروودرێژیان لەگەڵ بەغدادا، ئەخرابوونە بەر رەحمەتی تاکە کەسێکەوە کەبگروبکوژ هەر خۆی بێت. سەدام و ئەوانەی پێشتریشی، لەترسی ئەوەی هەر بەرپرسێك جۆرە دەسەڵاتێکی وای بدرێتێ رەنگە ببێتە کێبەرکێیان و هەوڵی دەستەڵاتگرتنەدەست بدات، دەستەڵاتی لەو جۆرەیان بەهیچ لێپرسراوێك نەدابوو. بەڵام مەجید بەو دەستەڵاتەیەوە بووە کەسی دووەم و دوای ئامۆزاکەی دەهات، هەمو دەستەڵاتێکی مەدەنیانەو سەربازیانەی لەئاسایشی باکوری عێراقدا بەدەستبوو. ئیتر کوردەکان ئەو هیوایەشیان نەما کەلەپێناو مانەوەی خۆیاندا سوود لە ناکۆکییەکانی ناو سیستەمە گشتییەکە ببینن، یان پشت بەو کێبەرکێیانە ببەستن کە ئاساییە لەناو حکومەتێکی دیکتاتۆری ودا، لەنێوان دەزگاکانی، ئاسایش و هەواڵگرە جۆراو جۆرەکان و، پارتی دەستەڵاتدارو هێزە چەکدارەکان و، جاشەکاندا هەبن. مەجید، تا ٤ی نیسانی ١٩٨٩ بەپەرۆشەوە دەستەڵاتە رەهاکەی خۆی لەباکووری عێراقدا بەکارهەمێنا. رۆشنبیرێکی کوردی عێراق دڵگەرمانە باسی ئەو ماوەیەی دەکردو دەیوت:"هەردوو ساڵی ١٩٨٧و ١٩٨٨، لەدالگیرکردنەکەی ئەسکەندەری گەورەی ساڵی ٣٣١ی پێش زایینییەوە، کە لەرێی چوون بۆ هندستانیدا کردی، ناهەموارترین دوو ساڵ بووە لەمێژووی کوردستاندا". تێگەیشتنی هۆی ئەوەش، تەنیا بەگوێگرتن لەو شریتە تۆمارکراوانە دەردەکەون کەبەردەستی پێشمەرگە کەوتوون و تیایدا مەجید بەدەنگە تیژو زمانە پیسەکەی و شێوە

ناوچەییەکی وا بەدوێت کە یەکسەر دەناسرێتەوە، پڕن لەمەڕەشەی ناهەموارو ویستی خۆشی بۆ لەناوبردنی کلتوری تەواوی گەلێك و شێوازی ژیانیان بەپێی بەرنامە یەکلا دەکاتەوە.

مەجید شێوازێکی نوێی بۆ بنەما کۆنەکانی لەناوبردنی پارتیزانی زیادکرد، ئەویش بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی بوو بۆ کوشتن و تۆقاندنی گوندنشینەکانی باکووری عێراق، ئیتر کورد ناوی عەلی کیمیاویان بەسەردا دابڕی. ئەم تەکتیکانەش خێراتر بەرنامەی چۆڵکردنی گوندە کوردییەکانی بەدیهێنا، ئەو کەمە پێشمەرگەیەی ماشبوونەوە، لەوە کەوتن خواردن و هەواڵیان لەگوندەکانەوە پێبگات. ریشەکێشکردنی گوندنشینەکان لەشوێنەکانی خۆیانەوەو راگوێزانیان بۆ "شارەکانی سەرکەوتن" کە بەدرێژایی ڕێگا سەرەکییەکان و، نزیك شارە گەورەکان دروستکرابوون، تا بەئاسانی پۆلیس و ئاسایش بتوانن بیانخەنە ژێر دەستەڵاتی خۆیانەوە، بەرلەهاتنە کوردستانی مەجید دروستکرابوون. هەموو ئەوەی مەجید کردی، پەلەکردن بوو لەو کارەدا، کاولکردنی ئەو دێهات و گوندە پ٠چووکانەشبوو کە لە درێژەمانەوە بناغەی کۆمەڵگای کوردیان پێکدەهێنا. دواتروو هەر لەهەمان ساڵدا، مەجید بە دەیان هەزار کوردی گوندنشینی گرت و کوشتنی. بەپێی شریتێکی تۆمارکراوی ساڵی ١٩٨٨، مەجید بیانووی کاولکردنی ئەو گوندە کوردیانەی لەناوچە "حەرامکراوە"کەدابوون، کەپانتاییەکەی، نیوەی پانتایی هەموو ناوچەی نیو ئینگلاند دەبوو، دەڵێت: "ئەگەر وانەکەین چالاکی یاخییەکانمان تا یەك ملیۆن ساڵی تریش بۆ راناگیرێت".

مەجید سەبارەت بەچۆڵکردنی بەپیتترین زەوی کشتوکاڵی عێراق و گوێپێنەدانی بەو چۆڵکردنەو زەرەرو زیانەی لێیەکەوتەوە، دەڵێت: "من گەنمی ئەوانم ناوێت، بیست ساڵە گەنم لەدەرەوە دێنین، با پێنج ساڵی تریش بەزیادەوە بیهێنین". ناخ شییەکەی کوردیش لەوەدابوو داهاتی نەوت، کەبەشی زۆر لەبیرە نەوتەکانی کوردستانی عێراق هەڵدەهێنجرێت، پارەیەکی مۆڵی بۆ سەدام حسێن دابینەکرد، ئەو گەنمەی پێیەهێنا کەئەمەریکای چاوبرسی کرینەکەیی بۆ ئاسانەکرد. زۆربەی گەنمەکە ئەمەریکایی بوو بەڕێوەبەرایەتییەکەی ریگن و بووش بنیەرەدە بۆ عێراقیان دەنارد، عێراقیش بەلای لۆبی بەرهەمهێنەرانی گەنمی ئەمەریکاوە باشترین بازاڕبوو. بەهۆی پشتگیریکردنی نرخی گەنمەکەوە لەلایەن حکومەتەوە، لەو زەمانەت و پشتگیریی بازرگانیکردنی شتومەك CCC و، ناردنی بۆ عێراق کەلەساڵی ١٩٨٩دا دوو ئەوەندەی جارانی لێهات و، عێراق لەسایەی بەڕێوەبەرایەتی ریگن و بۆشدا، بایی ٨و٢ بلیۆن دۆلاری ئەمەریکایی گەنمی کڕی.

عەلی کیمیاوی لەشریتێکی تۆمارکراوی تریدا، کە قسە بۆ ئەندامە پێشکەوتووەکانی بەعس دەکات، بەرگری لەبەکارهێنانی چەندین جارەی گازی ژەهراوی دژ بەکورد دەکات و دەڵێت: "کێ بەرهەڵستی ئەوکارە دەکات؟ کۆمەڵگای نێودەوڵەتی؟ دەی با کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی و هەموو ئەوانەی بایەخ بە قسەکانیشی دەدەن هەر بۆخۆیان بڵێن". لەکۆبوونەوەیەکی تری فکریدا، لەسەرەتای ١٩٨٩دا کەبۆ یاریدەدەرەکانی خۆی و ئەوانەی خوار خۆی دەدوا، جارێکی تریش بەرگری لەوشتانە دەکرد کە ساڵی ١٩٨٨بەرامبەر بەکورد کوردبوونی بە کۆمەڵکوژیی کوردیشەوە، جا پیاو بووبایە یان ژن یان منداڵ، تا بەوەش پێشەکی ڕێ لەهەر رەخنەیەك یان بەرهەڵستییەك بگرێت، وتی :"بۆ دەبوا خۆشگوزەرانم بکردنایە؟... نەخێر هەردەبوا بە بلدۆزەر لەچاڵم بنانایە".. وەك مشتومڕی چارەسەری دوارۆژی کوردەکانی ...یرکەوتنییتەوە، وتی: "چیم لەو هەمووە بکردایە؟ بەسەر پارێزگا جۆربەجۆرەکاندا دابەشمکردن و، ناچاریشبووم کە بلدۆزەر بۆ ئەملاو ئەولا بنێرم".

ئەو قسانە هەر خۆهەڵکێشانێکی پووچ نەبوون. دەیان هەزار کورد، کە ژمارەیەکی زۆریان ژن و منداڵبوون، بەفرمانی راستەوخۆی مەجید کوژران. دواتر هەندێك لەوانەی لەو کورد قڕانە رزگاریان ببوو گێڕایانەوە، کەچۆن بە بلدۆزەر چاڵی قووڵ قووڵیان بۆ هەڵکەندوون و بۆیان کردوونەتە گۆڕی بەکۆمەڵ. لەبەهاری ١٩٩١یشدا کە کورد لەگەڵ بەغدادا کەوتنە زنجیرە دان و ستانێکی بێ ئەنجام، مەجید لەنوێنەرایەتییەکەی عێراقدابوو. هەرچەندە مەسعود بەرزانی و هەموو دان و ستانکەرە کوردەکانی دیش کە چاویان پێی کەوت، دانیان بەخۆیاندا گرت و دەمارگرژ نەبوون، کەچی مەجید زۆر پەشۆکابوو. لەدانیشتنێکیاندا کوردەکان پێیان وت، بەپێی ئەو سەرژمێرییەی ئەوان، لە زنجیرە شاڵاوی تۆڵە سەندنەوەی "بگرەو بکوژی" ساڵی ١٩٨٨دا، کە لەبنەڕەتدا دژ بە خەڵکی مەدەنی کران و ناوی "ئەنفال"یان لێنرا، ١٨٢هەزار کورد سەرەو نوگمکراوەو زۆربەشیان بەمردوو دانراون. مەجید ڕادەپەڕێ و دەقیژێنێ: "ئەم ژمارەی ١٨٢ هەزارە زۆرتان پێوەناوە لەکوێتان هێناوە؟ ژمارەی تەواویان لە١٠٠ هەزار کەس زیاتر نییە"[٤٠].

جا تا پەردە لەسەر ئەو تۆمارگە هەرە نهێنیانەی بەغدا لادەبرێت، بۆئەوەی ژمارەی راست و

---

[٤٠] عەدنان موفتی بۆی گێڕامەوە کەلەماوەی ٤٢ رۆژەکەی دانوستانەکەدا جارێك خۆی بەشداریکردووە، وتی: "کەباسی وێرانکارییە بەکۆمەڵەکەی گوندەکان و بەکارهێنانی چەکی کیمیاویم هێنایە پێشەوە، کەبەفرمانی خۆی عەلی کیمیاوی کرابوون، زۆر گرژو تووڕەبوو وتی: -ئەگەر باسی کوردستان دەکەیت پێویستە لەسەرتاوە دەستپێبکەیت، نەك لەکاتی دەستەڵات وەرگرتنەکەی منەوە". ئەمەی بەجۆرێك وت وەك مێژووی دوورودرێژی پێوەندییەکانی کوردو عێراق کارەکەیان پێکردبێت

دروستی قوربانییەکانی ئەم هەڵمەتانە دەرکەوێت، ئەوا باسکارەکانی ئەم بوارە قسەکەی مەجیدیان بەلاوە پەسەندترە. شۆڕش ڕەسوڵ کەباسکارێکی وردی کوردە، دوای چەندین چاوپێکەوتنی زۆرو قووڵ لەناو کوردستاندا، دوای لێکۆڵینەوەیەکی چڕوپڕی هەموو ئەو بەڵگەنامە عێراقیانەی بەردەستکەوتوون، لەساڵی ١٩٩٤دا ژمارەی لەناوچوانی کاتی دەستەڵاتەکەی مەجیدی بە ٦٠ هەزار تا ١١٠هەزار خەملاندووە. ڕێکخراوی لێبوردنی نێو نەتەوەیی "ئەمنستی ئەنتەرناشناڵ" وای داناوە، کە لەکوردستان و هەموو عێراقدا، جگە لەو ماوەیەی مەجید دەستەڵاتی لەدەستدابووە، "لەهەشتاکاندا بەسەدان هەزار کەس، بەبێ دادگاییکردن گوللەبارانکراون و بوونەتە قوچی قوربانی". ڕاپۆرتێکی نەتەوە یەکگرتووەکانیش سەرنجی بۆ ئەوە ڕاکێشاوە کە "دڕندایەتی سەددام حسێن دژ بەکورد بەڕادەیەکی وا کوشندە بووەو هێند کۆمەڵە خەڵکی گرتۆتەوە، کەلەدوای جەنگی جیهانی دووەمەوە کەم هاوتابووە".

ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ حکومەتانی وڵاتانی خۆرئاوا، بەرلە گرتنی کوێتی ساڵی ١٩٩٠ کە هەڕەشەی لەو هاوسەنگییە نەوتییەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دەکرد، دەڵێن ئاگایان لەو پێشێلکردنانەی ماڵ مرۆڤ نەبووە کەسەددام حسێن کردوونی. تا داگیرکردنەکەی کوێتیش دەزگا جۆراوجۆرەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان هیچ بەیاننامەیەکیان دەرنەکرد، تیایدا ڕەخنە لەو پێشێلکردنانەی ماڵ مرۆڤ بگرێت، یان گوشار بخاتەسەر بەغدا تا ئەو کارە ناهەموارانەی رابگرێت. لکاندنە کوتوپڕەکەی کوێت بەعێراقەوە، کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی، کەپێی لەسەرمانەوەی دەستەڵاتی بەسەر نەوتی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا دادەگرت، وایلێکرد لەڕێی کۆمەڵە بنەمایەکی شکۆدارەوە، ڕووبەڕوو و بەتوندی بێزاری لەو پێشێلکردنانەی ماڵ مرۆڤ بگرێت کە بەغدا پیادەی دەکرد. بەڵام دڵنیایان بەوەدا نەدەدا کەچاوپۆشینەکەی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی وایان لەسەددام حسێن کرد ئەو هەموو تاوانە بەرامبەر بەهاوڵاتیانی عێراق بەگشتی و کورد بەتایبەتی بکات و، هانیشیدا ترسی لە ئاکامی کوێت خستنەسەر عێراقەکەی نەبێت و، پێشی وابێت بۆی دەچێتەسەر.

هەر کە کوێتیش ئازادکرا، زۆر بەخێرایی چاو لەو پێشێلکردنی ماڵ مرۆڤەی بەغدا پۆشراو، ئەم مەسەلەیە نەخرایە ناو "دایکی بڕیارەکانەوە" کە نەتەوە یەکگرتووەکان لەنیسانی ١٩٩١دا مەرجی ئاگربەستەکەیان پێدیاریکرد. بەڕێوەبەرایەتی بووشیش، لەسەر تاوانی جەنگ و قڕکردنە بەکۆمەڵەکەی، هیچ بەتەنگ دادگاییکردنی سەددام حسێنەوە نەبوو، هەرچەندە ئەو ڕێکخراوانەی بەڕاستی بەرگری لەماڵ مرۆڤ دەکەن، ١٠ دانە ساڵی ڕەبەق خەریکی کۆکردنەوەی زانیاری و

بەڵگەی کاولکردنی گوندەکانی کوردو، لەسێدارەدانی هەرەمەکیانەو، سەرجەم زیانە ڕۆییەکانی تری ڕژێمی بەعس بوون.

سەدام حسێن کە چەکی کیمیاوی دژ بەمەدەنییە کوردەکان بەکارهێنا، چەند فرسەتێکی لەپێوەرە دڕندانەییەکەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستیش تێپەڕاند. چونکە سەدام بۆ یەکەمین جار، لەشەڕە بەرفراوانەکەی ساڵی ١٩٨٣دا، یەکێك لەگرنگترین چەکی سەربازیانەی قەدەغەکراوی سەرتاسەری دونیای، بۆ ڕێگرتن لەشاڵاوی شەپۆلی ئێرانییەکان لەبەرەیەکدا بەکارهێنا کەسوپاکەیی تیادا بڵاوکردبوەوە. هەروەها بەبیرهێنانەوە، عێراق یەکێك بوو لەو زیاد لە ١٠٠ وڵاتانەی کەپەیماننامەی جنێڤی تایبەت بەقەدەغەکردنی چەکی کیمیاویان مۆرکردبوو، کەئەوەش لەئاکامی ئەو بەکارهێنانەی کاولکارییەکی زۆری لەجەنگی جیهانی یەکەمدا بەرپاکرد هاتە ئاراوە.

بەڵام بەلای سەدام حسێنەوە خۆبەستنەوە بەپەیماننامەیەکی ولەوە هیچ مانایەکی نەدەگەیاند، بەتایبەتی کەئەو بەرەنگاری دوژمنێکی ناوچەکە ببۆوەوە.[1] ئەوکاتە نەتەوە یەکگرتووەکان ناڕەزایی خۆی بەرامبەر بەعێراق نیشانداو تاوانباریکرد – کەچی سێ ساڵ دواتر عێراق و ئێرانی هەردووك بە بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی تاوانبارکرد– لەوەش زیاتر هیچی دی نەکرد. پێدەچوو ڕژێمی عێراق وابیرکاتەوە، کەلەبەشی ناوەڕاست و باشووری بەرەی جەنگدا، بەکارهێنانی هەموو جۆرە چەکێکی بەردەستی بۆ ڕەوابێت.

نەبوونی هیچ شتێکی ڕاستەوخۆلەکوردستاندا، سەدامی لەبەکارنەهێنانی چەکی کیمیاوی دژ بەکورد ڕانەگرت. بەهاتنی ساڵی ١٩٨٨ ، کە بەکارهێنانی ئەو جۆرە چەکەی لەدژی کوردە مەدەنییەکان تیایدا چڕترکرایەوە، ئاشکرا دیاربوو شەڕەکە بەهێجگارەکی بەلای عێراقدا کەوتبۆوەو، کوردستانیش هیچ بایەخێکی ئەوتۆی نەبوو، کەچی سەدام حسێن بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی دژ بە کوردەکان ڕێگە پێدا، ئەویش نەك هەر بۆ تەنیا جارێك، بگرە جار بەدوای جار بەکاردەهێنرا، هیچ بەرهەڵستییەکی ڕاستەوخۆش بۆ ڕاگرتنی سەدام حسێن نەبوو. یەکەم هێرشی کیمیاوی لەنیسانی ١٩٨٧دا کرا. بەدرێژایی ساڵ و نیوێك، عێراق بێئەوەی هیچ

---

[1] کینێت تیمەرمان، لە "نیویورك ڕیپەبلیك"ی ٢٠ کانونی دووەمی ١٩٩٦دا نوسیبووی، کە بەپێی سەرچاوەکانی پنتاگۆن و بەڵگەنامە دەستبەسەرداگیراوەکانی عێراق، سەدام حسێن فرمانی بە هێزەکانی پێ- ەی کردبوو، ئەو چەکە کیمیاوییەی پێشتر بەکارهێنرابوو، لەجەنگی دووڕگەی ١٩٩١دا لەدژی هاوپەیمانانیش، کەئەمەریکا سەرکردایەتیان دەکات، بەکاربهێنن بەڵام سەرکردە سەربازییەکانی نەیانکرد.

ترسێکی لەئاکامی کارەکەی هەبێت، لایەنی کەم ٦٠ گوندی گازبارانکرد، هیچ ناڕەزایییەکی توندو ئاشکراش لەتاکە پایتەختێکی وڵاتە گەورەکانەوە نەکرا.

کە لەمانگی ئابی ١٩٨٨دا، ٦٠ هەزار کوردی عێراق لەتاو کیمیابارانکردنەکەی عێراق، پەشۆکاوانە بەرەو سنووری تورکیا هەڵاتبوون و پەڕیبوونەوە ناو تورکیا، حکومەتە خۆرئاواییەکان ناچاربوون کارێك بکەن. بەڵام ئەوساش ئەو حکومەتانەی بەرژەوەندی بازاڕی خۆیانیان لەعێراقدا بەلاوە گرنگبوو، بەرگریان لەسەدام حسێن و فێڵیشیان لەناوەڕۆکی رێککەوتننامەکەی جنێڤ دەکرد، کە گوایە لەدەقی رێککەوتننامەکەدا شتێکی وای تیادا نییە رێی بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی لەو وڵاتانە بگرێت کەمۆریان کردووە، واتە کورد بۆی نییە داوای تاوانبارکردنی بەغدا بکات. ئەم کاردانەوە نێو دەوڵەتییەش لەگەڵ هەڵوێستی خۆرئاوای پشتگیریکەری عێراق، لەبەرەنگاربوونەوەی ئەو هەڕەشەیەدا کەشۆڕشی ئێران لەبەردەوامێتی ئەوت و ئارامی سیاسیانەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستی دەکرد، دەگونجا، وڵاتە عەرەبییەکان و خۆرئاواییەکان، کە عێراقیان بە قەڵایەك لەبەرامبەر ئوسوڵییە ئێرانییەکاندا دادەنا، ئەوە بیانوویەکبوو بۆ چاوپۆشین لە تاوانە چەپەڵەکانی سەدام حسێنی ماوەی شەڕەکە. هەر لەبەر ئەوەشبوو کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی ناڕەزایی توندیان سەبارەت بەو هەموو پێشێلکردنانەی مافی مرۆڤ نەدەکرد کە لەعێراقدا دەکران، بە بەکارهێنانی چەکی کیمیاویشەوە دژ بەهێرشەکانی ئێران.

ئەو دیپلۆماتانەی بایەخیان بەکاروباری عێراق دەدا، لەمێژبوو گەیشتبوونە باوەڕێك، کە ئەگەر سەدام حسێن لەشەڕەکەدا سەربکەوێت ئەوا لەسەر هاوپەیمانێتی کورد لەگەڵ ئێراندا سزایەکی قورسی کورد، بەمەدەنی و چەکداریانەوە دەدرێت. "ولیام ئیگلتون" کە یەکێکە لەو کەمە پسپۆڕانەی ئەوسای وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکاو، زانیارییەکی باشی لەبارەی کوردەوە هەیە، لەساڵی ١٩٨٦دا کەسەدام حسێن بەدڕندانەترین شێواز ژیانی کۆمەڵایەتی کوردی لەعێراقدا لەناودەبرد، زاراوەی "جینۆسایدی کلتور"ی بۆ دواڕۆژی ڕەشی کورد بەکارهێناوە، چونکە سەدام حسێن گاز بەکارهێنانی دژ بەئێرانییەکان بۆچووبووە سەر، بۆیە زیاتر ڕێی تێدەچوو کەلەسزادانی کورددا لەهەلومەرجی گونجاودا "گاز" بەکاربهێنێت. بەم پێیە دەبوا ئەوەی دواتر سەدام کردی کەس بەلایەوە سەیر نەبوایە. کوردەکان هەر کەسێك بیویستایە گوێیان لێبگرێت پێیان دەوت، کە کومپانیاکانی، بەریتانیا، هۆڵەندە، فەرەنسا، ئەڵمانیا، ئیتالیا، یابان، سویسرا هەر هەموویان تەکنەلۆجیاو ماددەی کیمیاوی پێویست و کارمەندی تەکنیکیان

بەعێراقـداوە، تـا ئـەو کۆمپانیایانـەی بەڕوالـەت بـۆ بەرهـەمهێنانی ئاڤـاتکۆژی کشـتوکاڵ بەکاریەهێنران، بگۆڕێن بۆ کۆمپانیایەك کە چەکی کیمیاوی پێ بەرهەم بێت.

جگە لەو نەخۆشیانەو تۆڵانانەی چەکی کیمیاوی بەسەر کوردیا دەهێنا، کاریگەرو هەرزانیش بوو. لە دەیان ساڵەی ڕابردوودا لەشەڕی پچووك‌و گەورەدا، چونکە کورد شەڕێکی ڕێکوپێکی دەکردو هەمیشە زیانی چاکیشی بەسەربازە عەرەبەکان دەگەیاند، ناوێکی سامناکی دەرکردبوو. بەڵام پێشمەرگەکان خۆیـان لەبەردەم بەکارهێنانی چەکی کیمیـاوی، دژ بەمەدەنییەکانیان بۆ نەگیرا. چەند ڕۆژێك دوای گازبارانکردنەکەی ئابی ۱۹۸۸ مەسعود بەرزانی فرمانێکی جەرگبڕی وای دەرکرد، کە ئاسەوارەکەی وەك ئاسەواری ئەو فرمانەی ۱۲ ساڵ پێشتری باوکی وابوو، کە بۆ چەك دانان دەریکرد. بانگەوازێکی بۆ پێشمەرگە دەرکرد کەئەگەر چەك فڕێدان‌و خۆدان بەدەست هێـزە عێراقییەکانـەوە، ژیـانی مەدەنییـەکانی پێـدەپارێزێ، ئـەوا بابیکـەن، لەبانگەوازەکەیـدا دەڵێت:"هـەموو شـتێك کۆتاییپێهات، شـۆڕش تـەواو" کەئـەوەش خۆبەدەستەوەدانی دەگەیانـد، هـەروەها دەشـڵێت: "ئێمـە بەدەسـتی بەتاڵـەوە شـەڕی کیمیاویمـان پێناکرێـت. بەکورتییەکـەی، ناتوانین لەسەر شەڕ بەردەوامبین"[42]. بەمجۆرە گاز سەلماندی کەو بۆ دامرکاندنەوەی بزووتنەوە کورد، بێئـەوەی هێـزە عێراقییـەکان تووشـی مەترسـی و زیـانی گـەورەبێن، شێوازێکی هـەرزان‌و کاریگەرە، بەتایبەتی کەشەڕی ئێران خەیکبوو کۆتایی پێدەهات، هیچ سەربازێکیش حەزی بەوە نەدەکرد لەدوا قوربانییەکانی ئەو شەڕەبێت (C.I.A کوژراوە عێراقییەکانی شەڕەکەی بە ۱۵۰تا ۲٤۰ هەزار کەس خەمڵاندبوو، بەڵام کوژراوە ئێرانییەکانی بە ٤٥۰ تا ۷۲۰ هـەزار کـەس دانابوو. جا ئەگەرچی وەك دەردەکـەوێت زیـانی عێراقییـەکان کـەمترە لـەزیانی ئێرانییـەکان، بـەڵام گـەر ڕەچـاوی دانیشـتوانی عێـراق بکـەین، کەلەسـێیەکی دانیشـتوانی ئێـران کـەمترە، ئـەوا بۆمـان دەردەکەوێت کەزیانی عێراق لەزیانی ئێران زیاترە).

سەدام حسێن حسابی ئەوەشی کردبوو (ڕاستیشبوو)، کە وڵاتە بیانییەکان بۆ دەستکەوتنی بەڵێنی ئاوەدانکردنەوەی عێراق، کەدوای عەرەبی سعودی گەورەترین ئیحتیاتی نەوتی لەدونیادا هەیە، لیك بەدەمیانـدا دەماتـەخوارەوە، ئـەوەش کـارێکی وای دەکـرد کـەمتر پەرۆشـی کوردیـان هـەبێت. ڕاستییەکەشـی حکومـەتی تورکیـا، لـەئابی ۱۹۸۸دا بەڵگەیـەکی زۆری سـەبارەت

---

[42] کاریەدەستانی پارتی دیموکراتی کوردستان ئەوسا وایان خەملاندبوو، کە ٤۲۰۰ کورد لەئەنجامی هەوڵدانیان بۆ گەیشتنە سنووری تورکیا کوژراون، ۲٤۰۰یان بەزۆری ژن‌و منداڵی لای "کانی ماسی"وەن. من خۆم قسەم لەگەڵ کوردە[illegible]ا کرد، دەیانوت، سوپای عێراق ناوچەیەکی بەرینی نزیك سنووری تورکیایان گەمارۆداوە، بۆیە تەنیا دانیشتوانی باکووری ئەوناوچە گەمارۆدراوە دەربازبوون

بەگازبارانکردنی کورد لەناو خەستەخانەکانیدا دەستکەوت کە کوردە پەناهەندەکانیان تیادا چارەسەردەکرا. بەڵام حکومەتی ئەنقەرە لەترسی ورووژاندنی بەغدا نەیخستنەڕوو، چونکە دەیزانی بەرژەوەندی لەدەرخستنی ئەو زانیارییانەدا نییە. تورکیا چەندین ملیار دۆلاری عێراق قەرزدارەو لاوازیشە، بۆیە نەیدەوێرا ڕقی سەدام حسێن هەڵبستێنێت، لەو چەکە زۆرەش دەترسا کەهەیبوو، بەتایبەتی مووشەکی دوورهاوێژی زەوی- زەوی.[42] لەئاست زۆربوونی ئەو بەڵگانەی کە عێراق چەکی کیمیاوی دژ بە کورد بەکارهێناوە، (جامعەی عەرەبی) "پشتگیری تەواوی عێراقی دەکرد، کەئەوەش لە یەک کاتدا ئاحەزی ئەندامەکانی بەرامبەر کەمایەتییە نا عەرەبییەکان و، ترسیشیان لە سەدام حسێن دەردەخست.

هەر بەتەنیا وڵاتە یەکگرتووەکان قرکردنەکەی ئابی بەتوندی تاوانبارکردو، "جورج شولتز"ی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا، بەکارهێنانی ئەم جۆرە چەکەی لەدژی خەڵکی مەدەنی بە "کارێکی ناهەموارو بێ بوونی هیچ بیانوویەک" باسکرد. بەپێی برووسکەی سەربازییە عێراقییەکان، بەڕێوەبەرایەتی ریگن ڕێک باسی ئەو قوربانیانەی دەکرد کە بەدەست دیاردە ئاساییە زانراوەکانی چەکی کیمیاوییەوە دەتلانەوە، وەک برینی پێست و هەوکردنی بەئازارو گێژبوون و قسە هەڵبڕکانن.[44]بەڵام بەڕێوەبەرایەتییەکەی ریگن دژی پرۆژەیەک وەستا کە چەند ئەندامێکی ئەنجوومەنی پیران، لەسەر ئەم " شەڕی جینۆسااید"ە، بۆ سزادانی عێراق پێشنیاریانکردبوو، ئەویش بە برینی ئەو سەدان ملیۆن دۆلارەی وەک قەرزێکی ئاسایی بە بەغدا دەدراو لەگەڵ زۆر زەماناتی مادیشدا، کەدیارە ئەمەش وایدەکرد چەند دەوڵەتانێکی تری ناوچەکە سوودی

---

[42] سێ پزیشکی ئەمەریکایی سەرکەوتوو لەپشکنینی پەناهێندەکانی دیاربەکرو ماردیندا، ڕایانگەیاند کە "ئەلۆشی پێست و سنگی تایبەتیان" بۆ دەرکەوتووە (دی وۆڵستریت جورناڵ ٢٠ی ئەیلولی ١٩٨٨)، بەڵام دەستەڵاتدارانی تورکیا، تا ئەمێلن نوێنەرانی "ئەمنستی ئەنتەرناشناڵ - ڕێکخراوی لێبوردنی گشتی" و سێ ئەمەریکایی بگەنە لای پزیشکەکان (سێ پزیشکەکە نوێنەری ماڵ مرۆڤ بوون)و کاربەدەستانی خاجی سووری تورکیا، کە ئەوانیش بەپەتابەرانی ترەوە خەریکبوون دەیانویست بیانپێنەوە، چیان لەدەست هات کردیان. ئیسان دەستەڵاتدارانی تورکیا هەوڵیان دا کە نەمێلن ڕۆژنامەنووسە تورکەکانیش قسە لەگەڵ پزیشکەکاندا بکەن و، زانیاری ساختەیان سەبارەت بە شوێن و ڕێگای پەناهێندەکان دەداو، ئەشیان دەهێشت ڕاپۆرتی پزیشکانە لەسەر ئەو پشکنینانەی سەرسنوورییان بدەن. "ئەمنستی ئەنتەرناشناڵ - ڕێکخراوی لێبوردنی گشتیی بەیاننامەیەکی سەبارەت بەو ڕەفتارەیان دەرکرد.

[44] شیلا توستریان، کەئەوکاتە قسەکەری باڵوێزخانەی وڵاتە یەکگرتووەکان بوو لەئەنقەرە، لەچاوپێکەوتنێکی تەلەفزیۆنی کانونی یەکەمی ١٩٩٢دا، لە واشنتۆن مەڵوێستە بەمێزو توندەکەی وڵاتە یەکگرتوەکانی پێوتم. ئەویش ڕێک پشتی بەو وتووێژانە بەستبوو کە "میشیل توستریان"ی مێردی - کەئەوسا کاربەدەستی سیاسی باڵوێزخانەکە بوو - لەنزیک سنوور لەگەڵ ڕۆژنامەنووسە بیانییەکاندا کردبووی

بازرگانێتی دوای شەڕەکەی لێوەریگرن. بەڵام کە پرۆژەکە لەناو بەردانی کۆنگرێسدا هاررا، بەڕێوەبەرایەتییەکە هەناسەی سەرفرازی هەڵکێشا.

زۆرجاریش لەخۆم دەپرسی، بلێی رۆژنامە خۆرئاواییەکانیش لەو پیلانەی حکومەتە خۆرئاواییەکان و عەرەبییەکان سەبارەت بە کیمیا بارانکردنەکەی کورد چنیبوویان و، دەکرێت ناوی پلانی بێدەنگی لێبنرێت بەرپرسیار نەبن" زۆریش بەوە دڵتەنگبووم کە رۆژنامە خۆرئاواییەکان لەوتاستەدا نەبوون کاردانەوەیەکی زیاترو بەهێزتر سەبارەت بە بەسەرهاتەکەی کورد بووروژێنن. دوای چەند هەفتەیەك لەهێرشە کیمیاوییەکەی ١٩٨٧، لێپرسراوە کوردەکان، من و برادەرەکانمیان لەڕووداوەکە ئاگادارکردو، ئێمەش لەکاتی خۆیدا وەك پێویست بڵاومانکردەوە. دێتەوەیادم کە چۆن گازاندەیەکی زۆرم لەسەرنو سەری رۆژنامەیەکی عەرەبی کرد، کەباوەڕی بەشتەکە هەبوو دانیشی بەگرنگییەکەیدا هێنا کەچی نەیویست باسی بکات. لەوەڵامدا وتی خاوەنی رۆژنامەکە قایلنابێت ئەم هەواڵانە بڵاوبکرێنەوە. ئەوە ئەو کۆتانەیە کە لەئەستۆی پیشەیەکی ناموونەییدا دەبێت.

کوردەکانیش نەیانتوانی وەك پێویست کێشەکەیان لەمیدیای خۆرئاوادا بووروژێنن. لەکاتێکدا سەدام حسێن، دەمێك ڤیزەی بەرۆژنامەنووسە بیانییەکان نەدەداو دەمێکی تریش رێی بەوانە نەدەدا کە دەچوونە ناو عێراقەوە بگەنە کوردستانی عێراق، بەداخەوە کوردەکانیش ئەوەندە چاپووك نەبوون و هیچپیشیان نەکرد. مەسعود بەرزانی و جەلال تاڵەبانیش، هەوڵی بێهودەیان بۆ تاوانبارکردنی دابارینی ئەو چەکە گەورانەی لەیەکێتی شورەوی و وڵاتە خۆرئاواییەکانەوە بۆ عێراق دەهاتن و، ئەو کۆمپانیا ئەورووپاییانەی "نافاتکوژی کشتوکاڵ"یان بەرهەم دەهێنا،دا. ئەو کۆمپانیایانەی "بۆدووشت بەکاردەهێنران"، رێگای بە بەغدا دالەکە؛ گازی "خەردەل" و "پەپیرایت"و، گازی تری دەمار کرژی، کە بە چڕوپڕی دژ بەکورد بەکاردەهێنران، بەرهەمبهێنێت. بەڵام سەرەك نووسەری رۆژنامە خۆرئاواییەکان، ئامادەنەبوون هیچ شتێك بڵاوبکەنەوە، تا پەیامنێرەکانیان نەچنە کوردستان و راستی رووداوەکە نەسەلمێنن. رۆژنامە نووسە بیانییەکان توانای هیچیان نەبوو، کوردەکانیش دە ساڵێك پێشتر بە رێگەی قاچاخ چاپوکانە رۆژنامەنوسیان دەگەیاندە کوردستان، بەڵام دواتر دەستە پاچ...ن و نەیاندەتوانی لەسنورەکانی؛ تورکیاو، ئێران و، سوریاوە ناودیویان بکەن.

هەر خواش بۆخۆی دەزانێت، من و کەسانی تریش لەم رووەوە چ...دمان قسە لەگەڵ لێپرسراوە کوردەکاندا کردووە، کەئەوکاتە گرفتێکی زۆرو سەختیان بەرەوڕوو ببووە. هەر بۆ نموونە لەساڵی ١٩٨٧دا لە پێشنیاری سەفەرێك زیاتر، کە لەوپەڕی باکووری خۆرهەڵاتی

سووریاوه بەناو تورکیادا بچم و ئەمجا لەوێشەوە بۆ ناو عێراق، هیچ شتێکی جدی تریان بۆ نەکردم. لەشام کە پیاوەکانی بەرزانی بۆ پەڕینەوەی ڕووبارو شوێنە مینڕێژکراوەکان و مەترسی کەوتنەناو تەقەی ڕەشاشەوە، کەمەمووشی بەشەو بکرێن، نەخشەیەکی تەواویان بۆدانام. کاتێک نابەدڵیم نیشاندا. وتیان سەرزەنشتت ناکەین چونکە لەدوا هەوڵی خۆماندا سێ پیاومان لێکوژرا.

کەزانیم ناتوانم خۆم بچمە ناو کوردستانەوە، پێشنیاری کڕینی چەند کامێرایەکی پچووکی سینەماییانەی هەرزانم (یا بەکاریش هاتبن) بۆ پێشمەرگەکانکرد، تا وێنەی ڕووداوەکانی ناو کوردستانی پێبگرن و، فیلمەکانی بەدونیای دەرەوەدا بڵاوبکەنەوە. پێشنیارێکی وا، بۆ بزووتنەوەیەکی ڕزگاری خوازی نیشتمانی هێجگار هەژاری وەك کوردکە تفی قووتدەداو نیرەیی بەو سامانە زۆرەی ڕێکخراوی ڕزگاری فەلەستینی دەبرد، چارەسەرێکی نموونەیی و خەیاڵپلاوانەبوو، کە لەکەسێکی نیازپاکی بێئاگای خۆرئاواییەوە دەرچووبێت، بۆیە بەقسەیان نەکردم. لەئازاری ١٩٨٨دا، ئێرانییەکان بەکۆپتەر ڕۆژنامەنووسە بیانییەکانیان بۆ بینینی هەزاران کوردی مەدەنی برد، کەلەشاری هەڵەبجەی عێراقی ژێر دەستەڵاتی تەواوی ئێراندا بەگازی ژەهراوی کوژرابوون، وێنەی یەکەم دیمەنی گرنگی قوربانییەکان گیراو، میدیا خۆرئاواییەکان بڵاویانکردەوە. (دوای ڕاپەڕینەکەی کوردی ١٩٩١، چەندین شریتی ڤیدیۆ لەدەزگا هەواڵگرییەکانی- ئیستخبارات- عێراقدا کەوتنە بەردەست، وێنەی لاشەی بەگاز کوژراوان و زۆر شتی تریشیان تیادابوو. ئەم شریتانە بەتەواوەتی بڵاونەکرانەوە، ڕەنگە لەبەر ئەوەبووبێت کە هەندێ کورد -جاشەکان- دەستیان لەوکارانەدا هەبووبێت و نەیانویستبێت بزانرێت).

لەچەرخی "گوندی گەردونی"دا کەئێستا تیایداین، ڕەنگە وێنە سامناکەکانی قوربانانی "هەڵەبجە"وا لەو کەسانەش بکات کە چاوپۆشییەکی زۆریان بۆ عێراق هەیەو، بێزاری توندیش دەربڕن. ئیتر دوای قەلاچۆکردنەکەی هەڵەبجە، نەدەکرا دونیا گوێی خۆی لە بەسەرهاتی کورد کەڕبکات. بەڵام هەر بەتەنیا ئەو دیمەنە سامناکانە، سەدام حسێنیان لەبەردەوامبوونی لەلاچۆکردنی کورددا ڕانەدەگرت و، وڵاتانی خۆرئاواشی قایلنەدەکرد کە هەڵوێستێك یان شتێکی وا بکات لەتاوانبارکردنە سەرزارەکییەکەی تێپەڕێنێت. ئەو کەمە کوردانەی دەرکیان بەئەوارەی کارەساتە جەرگبڕەکەی "هەڵەبجە" کردبوو، هیوایەکی ساویلکانەی وایان هەبوو کەئەو بێزارییە جیهانیانە ببێتە هۆی پارێزگاریکردنی ئەو کوردانەی لەعێراقدا مابوونەوە، ئەوانە کاردانەوەکەی دەرەوەیان لەقەوارەکەی خۆی زۆر گەورەتر کرد. بەڵام سەدام هەر پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە

هەڵەبجە ئیشی ئێرانبووە. دوای نزیکەی پێنج مانگێك عێراق دواهێرشی کیمیاوی، لەدوای ئاگربەستە ڕەسمیانەکەی ۲۰ی ئابی ۱۹۸۸ی نێوان بەغداو تاران، دژ بەکورد کرد. ئەم پەلاماردانانە لە۲٥ی ئابەوە تا ۹ی ئەیلولی ئەو ساڵەی خایاندو بەرادەیەکی وابوون هەنگی ناو تورکیاشی کوشت و، پێدەچوو سەدام حسێن گاڵتە بەهەستی کۆمەڵگەی نێو دەوڵەتی بکات، کە بەدەستپێشخەری دیپلۆماتانە هەوڵی تەواویان بۆ کۆتاییهێنانی جەنگەکە لەبەرژەوەندی عێراق بوو بەنهێنیش چەکیان بۆ دەنارد.

کاتێکیش بۆ یەکەمجار چەند قوربانییەکی گازەکە دەربازبوون و، دوای پەرینەوەیان بۆ ناو تورکیا، بەسەرهاتی خۆیان گێڕایەوە، کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیش. کە ڕووبەڕووی شایەتییەکانی ئەو کوردانەبوونەوە شەرمەزاربوون و، ناچار لە کانونی دووەمی ۱۹۸۹داو لەپاریس، کۆنگرەیەکیان سەبارەت بەچەکی کیمیاوی سازکرد، لەنوێ پێویستی ڕێزگرتنی پەیماننامەی جنێڤیان بۆ دوابڕۆژ بەبیرهێنایەوە. لەئەنجامی پێداگرتنی سەدام حسێن خۆیدا، فەرەنسا بەو ناوەوە کە کۆنگرەکەی تیادا دەگیرا، هەر بەتەنیا وڵاتە سەربەخۆکانی بۆ بانگهێشتکرد. ئەوەش کورد لەبەشداریتی کۆنگرەکە، کەلە تشرینی دووەمی ۱۹۸۸دا بەسترلو پەرچدانەوەی قسەکانی "تەها محێدین مەعروف"ی جێگری سەرۆك بێبەش بوون، دلنی بەوەدا نابوو کە وڵاتەکەی گازی ژەهراوی لەهەڵەبجەدا بەکارهێناوە، بەڵام بەکارهێنانەکەی دوای ئاگربەستی ئابی ۱۹۸۸ی ڕەتکردبۆوە. بەدرێژایی دانیشتنەکانی کۆنگرەکەی پاریس، کەلەبارەگای "ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانی پەروەردەو زانست و ڕۆشنبیری، یۆنسکۆ"ی بەری چەپی ڕووباری سین بەسترا، لێپرسراوانی فەرەنسا هەمووشتێکیان بۆ هێشتنەوەی خۆنیشاندەرە کوردەکان لەشوێنێکی دووری ئەوبەری سین کردبوو.

لەئەیلولی ۱۹۸۸دا بەپەلە خۆم گەیاندە تورکیا تا سەبارەت بەو دەیان هەزار کوردە تۆقیوو گێژانە لەکیمیاباران دەربازبوون راپۆرتی ڕۆژنامەنووسی بنووسم. زۆربەی قوربانییە ڕاستییەکان، یان ئەو هێزە عێراقییەی ڕێگاکەی داخستبوو گرتبوونی، یان لە ئەنجامی گازبارانەکەدا بەجۆرێکیان لێهاتبوو نەگەنە شوێنی سەلامەت، بەڵام هەرچۆنێکبوو هەندێکیان گەیشتبوونە ناو تورکیا. وێنەیەکی زۆر دانسقەی ڕزگاربوویەکی کیمیابارانەکەم دەستکەوت، بەڵام کەسەرۆکی بەشی کاروباری نێودەوڵەتی ڕۆژنامەکەم قایلنەبوو ۲۰۰ دۆلاری نرخەکەی بدات هیوابڕاو بووم، پێموایە هەر بەو تەلەفۆنکردنەی لەکۆشکێکی ناوەڕاستی کوردستانی تورکیاوە بۆ قایلکردنی کردم، ئەوەندەی نرخی وێنەکەم خەرجکردبوو. ئەو پێی وابوو کەشایەتی دەربازبووەکانی زۆرو چڕن و بۆ پەرچدانەوەی عێراق و قسە پووچەڵەکانی بەسن. چونکە بۆ

سەرۆکی بەشێك کە لەواشنتۆن دانیشتبێت ئەوەندە بەسە، ئەگەرچی ئەو بەلای منەوە پیاوێك بوو گەرماوگەرمی بەسەرهاتەکانی بەلاوە مەبەستبوو، حەزیشی بەو شێوازە دڕندەیی و بەپێچو پەنایانەی لەخۆرهەلاتی ناوەڕاستدا باویانە، نەبوو. بەلام ڕاستییەکەی دەبێ سەرزەنشتی خۆم بکرێت، چونکە گەر زیرەکانەتر کارمبکردبا دەبوا یەکسەرو بێئەوەی پێشەکی نیزن وەربگرم وێنەکەم بکڕیایەو بۆم بناردنایە بۆ واشنتۆن، ئەوسا وێنەکە خۆی کاری لەسەرۆك بەش دەکردو، کەبێ هیچ گومان و دوودڵییەك پێویستایە یان نا لەڕۆژنامەکەدا هەر بلاودەکرایەوە.

کاتێك حکومەتی عێراق، وەك لێی چاوەڕواندەکرا.نکولی لەکیمیابارانکردنی کوردەکان کردو، بایەخی بەو داوا نێودەولەتییە نەدا، کە لیژنەیەکی زانستی بێلایەن بۆ لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی دابمەزرێنرێت، تووڕەییەکی زۆر جێی هیوا بڕاوییەکەمی گرتەوە. بەغدا ڕێگادان بەو پسپۆڕو شارەزا بیانییانەی لێکۆڵینەوەکان دەکەن بە پێشێلکردنی سەروەری خۆی دەزانی، بۆیە بەمناوەرەیەکی دیپلۆماتیانە بەڕووی ڕەخنەگرەکانی وەستایەوەو هاواری لێهەستا کە ئەگەر تەنیا بەلگەیەکی گازباران کردنەکەیان پێیە باناشکرای بکەن. سەدام حسێن خەریکبوو ئەمەشی بەتەواوەتی بۆ بچێتەسەر. نزیکەی ٢٠٠ ڕۆژنامەنووسێکی بیانی بۆ سەردانی کوردستانی عێراق بانگکران و بەچاودێریکردنی بەرپرسانی عێراق چەند گەشتێکیان بۆ سازکرا، وەك چاوەڕوانیشدەکرا هیچ بەلگەیەکیان بەردەست نەکەوت کە بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی بگەیەنێت. ڕژێمی عێراق وای نیشاندەدا کە تۆلێنی خەلکی لەقەلاچۆکردنەکەی "هەلەبجە" (کەعێراق هەمیشە ئێرانی پێ تاوانبار دەکرد) بەڕادەیەکی وابوو، کاتێك هێزی ئاسایشی عێراق گازی فرمێسکڕێژی بۆ بلاوەپێکردنی حەشامەتێك بەکارهێناوە، بەگازی ژەهراوییان تێگەیشتوون و بەرەو تورکیا هەلاتوون. بەلام واش سەردانەکەیان حکومەتی تووشی سەرنێشە کرد، ئەویش کاتێك کۆمەلێك لەپەیامنێرە بیانییەکان ڕێکەوتی یەکەیەکی سەربازیانەی عێراقیانکرد هەر هەموویان لەتەوقی سەریانەوە تا نوکی پێیان بەرگی تایبەتی شەڕی کیمیاویان پۆشیبوو. بەلام چەند ساڵێکی خایاند تا بەلگەیەکی زانستیانەی وا بەردەستبکەوێت کەهیچ گومانێك بۆ بەکارهێنانی گازی ژەهراوی، وەك گازی خەردەل و دەمار کرژی نەهێلێتەوە.[45] ئەو

---

[45] نموونەی گڵ و هەندێ بابەتی تریش، ساڵی ١٩٩٢لە دێی "بڕنێ" کە گوندێکە لە ١٩٨٨دا گازبارانکراوە، کۆکرایەوەو تیای شیکردنەوەی لەتاقیگەکانی "پۆرتون داون"ی چەکە کیمیاوییەکانی هێزی چەکداری بەریتانیادا، پەرماوەی گازی خەردەل و چەند گازێکی دەمارکرژی تواوەی تیادا دەرکەوت. لەتشرینی دووەمی ١٩٨٨دا خاتو "گواینی ڕوبێرتس" کەرۆژنامەنووسێکی سەربەخۆیەو پسپۆڕێکی ناسراوی کاروباری کوردە لەگەل چاوساغێکی کورد، بەنهێنی لەسنووری تورکیاوە چووبوونە عێراق تا نموونەی خۆل کۆبکەنەوە. بەلام شیتەلکردنەکەی "پۆرتون داون" لەوکاتەدا زۆر وورد و یەکلاییکەرەوە نەبووە.

ڕێکەوتەی بۆ پەیامنێرەکان هەڵکەوت، کە ڕێیاندابوون یەکە سەربازییە عێراقییەکە ببینن، بەڕاستی هەلێکی زۆر لەوە دەگمەنتربوو کەئەو ڕۆژە لێی چاوەڕوانەکرا. چونکە ئەو چەند باڵوێزخانە خۆرئاواییانەی لەبەغدابوون، هیچ کاتێك بەڵگەیەکی وا گرنگیان بەدەست نەهێنابوو. ئەویش نەك لەبەرئەوەی بەڕاستی هەوڵیان بۆ نەدابوو، وەك چۆن کوردەکان بیری لێدەکەنەوە. لێپرسراوانی عێراق زۆرنای سەرکەوتنی کارە سەربازیەکانیان لێدەدا. هەربۆنموونە ناوی "ئەنفال"یان لە پۆستەخانەیەك و ناوچەیەکی گازی سروشتی نابوو، بێگومان بێنەوەی بەدووروودرێژی کارە ناهەموارەکەی خۆیان ئاشکرا بکەن، یان ڕێی دیپلۆماتە بیانییەکان بدەن سەردانی باکوور بکەن تا بەچاوی خۆیان هەموو شتێك ببینن. ... وەشیان بەناوی پارێزگاریکردنی سەلامەتی دیپلۆماتەکان خۆیانەوە دەکرد. گوایە چونکە بەهۆی ... ڕنی هێزەکانی ئێران یان پێشمەرگەوە کوردستان مەترسی لێدەکرێت. بەمجۆرەو تەنانەت لەهەلومەرجی باشتریشدا، بەعسییەکان نەیاندەهێشت عێراقییەکان بەگشتی و کوردەکانیش بەتایبەتی هیچ پێوەندییەکیان بە بیانییەکانەوە هەبێت. لەو هەلومەرجەدا "سی.ئای.ئەی" سەرچاوەی هەواڵی کەمبوو، بگرە دەستەپاچەشبوو، لەکاتێکدا دەزگا هەواڵگرییەکانی تری خۆرئاوا لەو باشترنەبوون. دیپلۆماتەکان نەدەبوو بەتەنیا سەردانی گوندە کوردییەکان بکەن. کاتێکیش وەزارەتی دەرەوەی عێراق ناچاربوایە ڕێ بەچەند سەردانێکی دەگمەن بدات، ئەوا دەبووا بەسەرپەرشتی "ئیستخبارات"ە سامناکەکەی بوایە "ئەپریل گلاسپی" باڵوێزی ئەمەریکاو "هایوود رانکن" کە فەرمانبەرێکی باڵوێخانەکەیەو، زمانی عەرەبی بەچاکی دەزانێت، لەئابی ١٩٨٨داو لەکاتی دواشاڵاوی کیمیابارانەکەی ئەنفالدا، تا لەهەوردلوەکان بگەن چیان لەدەستهات بۆ سەردانی کوردستان کردیان. دوای ساڵێك گلاسپی لەواشنتۆن بۆیگێڕامەوە کەچۆن دواجار بەزۆرو، بەبیانووی سەردانی چەند ئەمەریکاییەك، کە لەگەڵ کۆمپانیایەکی ئەندازیاری تورکی و یۆگۆسلاڤی هاوبەشدا کاریانکردووە، تا بەربەستە گەورەکەی "بەخمە" دروستبکەن. ئەو بەربەستە ٢٨٤پێ بەرزەو بۆ بەرهەمهێنانی کارەباو دابینکردنی ئاوی ئاودێری کشتوکاڵ تایبەتە، هۆیەکیشە بۆ بن ئاوخستنی گوندی "بەرزان"ی شوێنی لەدایکبوونی بەرزانییەکان و گوندو زەوی و زارەکانی دەوروبەری و، دابڕینی تەواوی ناوچەی "بادینان"ی بەرزانییەکان لەناوچەی ناوەندو خۆرهەڵاتی کوردستانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان. جا گلاسپی بۆ ناچارکردنی بەغدا، بێزارانە هەڕەشەی وای دەکرد کە ئەگەر ڕێگای سەفەرەکەی کوردستانی نەدەن ئەوا ئەوانیش لەواشنتۆن ڕێ بەکاربەدەستانی باڵوێزخانەی عێراق نادەن کە بەسەربەستی بەناو وڵاتە یەکگرتووەکاندا بێن و بچن. گلاسپی دەیزانی قسەکەی وا دەگەیەنێت کەئیتر

بەکرێگیراوانی هەواڵگرانی عێراق تۆقاندنی عێراقییە نیشتەجێکانی ناو ئەمریکایان پێناکرێت و ناشتوانن چیتر هەڵسوکەوتی خراپیان لەگەڵدا بکەن.

بەتەمنیا گەیشتنە کوردستان ئەوەی نەدەگەیاند کەمێتر هەر زانیارییەکی بتەوێت دەستتدەکەوێت، تەنانەت ئەگەر دیپلۆماتیش بیت وەکەسانی سەربەرژێمی عێراقیش ببینێت. بەلای بەغداوە "رانکن" یەکێکبوو لەوانەی حەز بەچارەی نەمان ناکات، چونکە سەری لە سەرۆک عەشیرەتێکی کورد دابووکە لایەنگری تەواوی حکومەتیش بووە. حز کوردێکی وەك ئەو سەرۆك عەشیرەتە نەبێت هەر کوردێکی تر قسە لەگەڵ دیپلۆماتێکدا بکات وا وەیلا بەحاڵی. گلاسپی لە سەردانێکیا خۆی لەهەواڵگرە عێراقییەکان وونەکات و زۆر بەخێرایی ئۆتۆمۆبیلەکەی دەئاژوێت، زۆرنابات ئاشکرا دەبێت تا ئەمڕۆشی لەسەربێت ئەو ترسەی لەبیرناچێتەوە کەلەناوینەی ئۆتۆمۆبیلەکەیەوە، هەواڵگرە عێراقییەکانی دیبوو کەئەو کوردەیان دەگرمێنابوو کەئەم پرسیاری شوێنی کڕینی هەنگوینی خۆماڵی لێکردبوو، حار جارەش لەئۆتۆمۆبیلەکەوە ئەو سەرنجە وردانەی لەکتێبەکەی "ئەی.ئێم،هامیلتۆن" ی ئەندازیاری نیوزیلەندایدا هەیە، کەباس لەدروستکردنی یەکەمین ڕێگای سەربازیانەی ئیستراتیجی کوردستانی سەردەمی ئینتدابی بەریتانیای عێراقی سالانی بیست و سییەکان دەکات و، ئەو وێرانکارییەی گوندە کوردییەکان ڕەچاودەکات.دەکرێت تەنانەت چاودێرە شارەزاکانیش گێلبکەن. عەبدولڕەحمان قاسملۆ، کە سەرکردەیەکی کوردی ئێران بوو، لەعێراقدا بەئازادی دەسووڕایەوە، مالێ پێوەندیکردنیشی بە باڵوێزخانە بیانییەکانەوە هەبوو، دوای چەندین چاوپێکەوتنی کوردە عێراقییەکان، بەتەواوی بڕوای بەوە هێنابوو کەئەو گازانەی لەمابی ١٩٨٨دا بەکارهێنران ژەهراوی نەبوون و، لەو گازانەبوون کەلەکاتی پێویستدا حەشاماتێکی بلاوەپێدەکرێت. حکومەتی عێراق تەواو دەستی بەسەر بارەکەدا گرتبوو، بەڕادەیەك قاسملۆ لەحوزەیرانی ١٩٨٩دا چووەناو قوولایی کوردستانەوە تا ئەو ڕاپۆرتە یەکلابکاتەوە کەلەرۆژنامەی "تایمز"ی بەریتانیایدا بلاوکرایەوە، دەلێت سوپای عێراق "ڕانیە"ی تەختکردووە. دەرکەوت ڕاپۆرتەکە ڕاست نییە و دەست بۆ "ڕانیە" نەبراوە، بەلام شاری "قەلادزە"ی نزیکی، کە ٧٠ هەزار کەسی تیادا نیشتەجێبوو، تەختکرابوو.

گلاسپی دەلێت، لەو چەند سەردانەی کوردستانیدا ئەو کوردانەی چاوی پێیانکەوتبوو، کە بەپەلەش قسەی لەگەڵیاندا دەکرد، ئەو هەوڵو تەقەلا بێهوودانەی خۆیان بۆ باسکردبوو،، کە بۆ وێران نەکردنی گوندەکانیان لەگەڵ کاربەدەستە عێراقییەکاندا دابوویان. لەهاوینی ١٩٨٩دا، ژنە باڵوێزەکەی ئەمەریکا "گلاسپی" ڕێگای شاری ئامێدی کە بەشاخێکەوەیە بڕی، کارێکی

واشیکردبوو کە ئێوارەی پێنج شەممەی بکات، چونکە دەیزانی دەستەڵاتدارە عێراقییەکان پرکێشی شکاندنی ئیسلامییانەی ڕۆژی هەینی ناکەن تاناچاریبکەن بۆ بەغدا بگەڕێنەوە. هەرچەندە هیچکام لەوانەی دیبوونی شتێکیان لا نەدرکاندبوو، کەچی لێپرسراوێکی عێراقی لەکاتی نانخواردنی ئێوارەدا وتبووی: "دووساڵ لەمەوبەر ملوانکەیەك ڕووناکی گونەدە نزیکەکانت لێرەوە دەبینی دەبریسکانەوە". بەڵام گلاسپی تەنیا ئەو ڕووناکییەی بەدی دەکرد کەلەکۆشکێکی سەدام حسێنی شارۆچکەی سەرسەنگەوە شەوقی دەدایەوە. ئەو تۆزە ڕوونکردنەوەیەی لێپرسراوە عێراقییەکە بۆ ئەو بەسبوو.

گلاسپی وتی:" سەیرەکە لەوەدابوو، هەموو ئەو کوردانەی چاوم پێیانکەوت، بەهیچ جۆرێك بەلای کۆمەڵکوژی یان کیمیابارانکردنەکەدا نەدەچوون". بڕوانەدەکرا کە لەوە بێئاگابووبن. بڵێی ئەوانەی قسەی لەگەڵداکردبوون بەڕادەیەکی وا ترسابێتن نەوێرن ئەو باسەی لەگەڵدا بکەن؟ یان لە "جاش"ەکانی سەربە ڕژێم بووبن؟ یان شارنشین، یان لەو کەسانە بووبێتن کەلە کوختەکانی "شاری سەرکەوتن"دا دەژیان، واتە کیمیاباران و گرتن و بڕینەکەی دێهاتە کوردییەکان نەیگرتوونەتەوە؟ چونکە بڕیارە سەرپێییەکەی بەعس ئەو کوردانەی کەبەزۆریان بەخوایشت لەو جێگایانەدا نیشتەجێکرابوون، لەو کاولکاری و کۆکوژییەی کاتی ئەنفال بەرامبەر ئامۆزاکانیان کرا بەدووربوون. خاتوو گلاسپی گێڕایەوە کە لەسەرەتای ئەیلولی ١٩٨٨دا کاتێك ئەنفال کۆتایهات، حکومەتی عێراق وەك پیشەیەتی لێبووردنێکی گشتی دەرکردبوو، ئەمیش کەبەناوچەی خۆرئاوای شاری سلێمانیدا گوزەریکردووە، ژمارەیەکی هێجگار زۆر ژن و منداڵی تۆقیوی لەمبەرو ئەوبەری شەقامەکەدا دیبوو کە بەدیار کەلوپەلە بێکەڵکەکانییانەوە وەستابوون. "بەئاشکراش دیاربوو کە پیاویان لەگەڵدا نییە، هەستمکرد دەستەڵاتدارێتی عێراق بەئەنقەست ئەم دیمەنەم نیشاندەدا"، چونکە سەدام حسێن لەوانە نییە شتی وا بۆ ڕێکەوت جێبهێڵێت. هەر بەئەنقەستیش هیچ شتێکیان سەبارەت بەچارەنووسی پیاوەکانی ئەم خێزانانە نەدرکاند، هیچیشیان سەبارەت بە چارەنووسی گیراوەکان لاباس نەدەکردن، بۆیە پەرۆشی ئەو خێزانانە دەربارەی کەس و کاریان هەر بەتاریکی مایەوە. ئەوەشیان لەو بنەما نازییەتەوە هەڵهێنجابوو کە بەناوی "شەو و تەم" ناسراوە، بەمەبەستی تەم و مژ خستنەسەر چارەنووسی گیراوەکانە. لەبەڵگەنامەیەکی عێراقی دەستبەسەرداگیراودا کەلە ٢٠ی ئەیلولی ١٩٩٠دا دەرچووە، واتە دوای زیاتر لەدووساڵ بەسەر کۆتاییهاتنی ئەنفالدا، وای ڕادەگەیاند کەڕستەی "هیچ زانیارییەکمان لەبارەی چارەنووسیانەوە نییە" بخرێتە جێی ڕستەی "لەکاتی هەڵمەتی ئەنفالی سەرکەوتوودا گیراون و، هێشتا لامان دیلن".

بەوپێیە، دەکرێ بوترێت ئەوساکە، سەبارەت بەڕووداوەکانی عێراق زانیارییەکی زۆرو لەهەمان کاتیشدا دەگمەن هەبووە. هیچ کوردێکی عێراق ئەگەر ڕێزی خۆی بگرێت، ناشێ ئەمڕۆ باوەڕ بە حکومەتە خۆرئاواییەکان بەگشتیو وڵاتە یەکگرتووەکان بەتایبەتی بکات، بەوەی کەلەڕووداوەکان بێئاگا بووبێتن، تەنانەت گەر هەر ئەو زانیاریانەشیان بووبێت کە کورد دابویینێ. جەلال تاڵەبانی، لەسەردانی حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٨ی واشنتۆنیدا، سوێندیخوارد کە ئەوەندەی زانیاری لەسەر بەکارهێنانی گازی ژەهراوی دژ بەکوردو بەکۆمەڵ وێرانکردنی دێهاتەکانیانو هۆی سەرنەکەوتنی داتوستانەکانی پێشتریانی ئەمریکا، بە سێ لێپرسراوی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا دابوو، کە بێجگە لە بەڕێوەبەرایەتییە بێڕەوشتەکەی ئەمریکا، هەموو حکومەتێکی تر والێبکات کە پەردە لەڕووی کارە ناهەموارەکانی بەغدا ڕامالێتو تاوانباریشی بکات. لەو ماوەیەدا باڵوێزخانەی ئەمریکا لەبەغدا، ئەو ڕاپۆرتو بروسکانەی بۆ وەزارەتی دەرەوەی دەنارد (کە لەم دواییەدا ئاشکرا کران) بەزمانێکی ئەوەندە ساکارو ئاسایی نوسیبوونی، کەوای دەربخەن بێجگە لە زانیارییە بڵاوکەرەوەکانی حکومەتو چەند زانیارییەکی ڕەقو تەقی تر هیچی دەست نەکەوتووە. لەبروسکەی ١٩نیسانی ١٩٨٨یدا، ژمارەی ئەو کوردانەی بەزۆر بۆ "شارانی سەرکەوتن" ڕاگوێزرابوون بەیەك ملیۆنو نیو خەمڵاندووەو، ژمارەی ئەو گوندانەی خەڵکەکانیان لێوە ڕاگوێزراوە بە ٧٠٠ تا ١٠٠٠ دێ داناوە. ئەو وێنانەی مانگە دەستکردە ئەمریکاییەکان، کاتی گوژمەرکردنیان بەسەر عێراقدا گرتبوویانن قەوارەی ئەو وێرانکارییەیان دەرئەخست (لەکاتی جەنگی ڕزگارکردنی کوێتی ساڵی ١٩٩١یشدا، کە سەرکردایەتی سەربازی ئەمریکا نەخشەی عێراقیان بڵاودەکردەوە، زیاتر یەکلابۆوە، چونکە نەخشەکێشەکان ئاماژەیان بۆ کاولکاریی گوندە کوردەکان کردبوو، ووشەی "وێرانکراو"یان لەسەر هەموو ئەو دێیانە نوسیبوو کە دەستی ڕقی سەددام حسێنیان گەیشتبوێ). لەنزیك سنووری ئوردونو عەرەبی سعودییەوە "ژمارەیەکی دیاری نەکراو،بەڵام بەپێی قسەی کوردەکان کوردێکی هێجگار زۆریان تووڕدابووە ناو خێوەتگای تایبەت بەدیل"ەوە. ئەو کاریەدەستە کوردانەی لەو ماوەیەدا لەسووریاو فەرەنسا بەون، هیچیان لەبارەی چارەنووسی گوێزراوەکانەوە نەئەزانی. بروسکەیەکی ڕۆژی ١٥ی ئابی ١٩٨٨ی باڵوێزخانەی ئەمریکا لەبەغدا، واتە هەر دەڕۆژێك بەر لەدوا شاڵاوی کیمیابارانکردنی کورد دەڵێت: "ئێرانو کورد، لەبەکارهێنانی چەکی کیمیاوی ئەرکە سەربازییەکاندا عێراقییەکان تاوانبارەکەن". تا ئەوکاتە ئەنفال زۆربەی وێرانکاریی و زیانەکانی ئەنجامدابوو، بەڵام چۆن زیانێك!! من سەرم لەزۆر ناوچەی شەڕی تر داوەو، ئەوەندەی بیەم بێت یان بەهۆی بەبیرخۆمیان بێنمەوە، ڕادەی کاولکارییەکەی کوردستانی عێراق لەبیرەوەرییەکانمدا

وێنەی نییە. زۆر بەڕوونیو وا دەزانم ئەمڕۆیە، لەمانگی تشرینی یەکەمی ١٩٩١دا، بەدزنی جافەتی کوردستانی عێراقدا ئۆتۆمۆبێلێکم دەبردو، بەڕێگایەکی قیرتاودا گەزەرمکردو. کوڕێشم بۆ کوردە چاوساغە لەخۆ بێزارەکەم هەڵخستبوو، کەبەجۆرێکی وا بیریدەکردەوە هەر وەك وێنەکەشیان بگرێت، بیەوەرییەکانی ئەو ناوچەیەی دەگێڕایەوە، کەخۆی تیایدا پێشمەرگەبووە، چۆنچۆنی جارێکیان لەسەر ئەم گردە بەگازی ژەهراوی بۆردومانکراوە، چۆن دیسان لەو شەڕەشدا زەندەقیان چووەو کشاونەتەوە، بەڕێی حەیوانە کێویدا بەچیاکاندا هەڵزناون. تا بگەنە گردی سێیەم گوایە لەوانی دی چەپەکترە، پەنجەشی بۆ درێژدەکرد. لەو بەهارەدا کوردستانی عێراق، لەشارە گەورەکانی وەك هەولێرو، دهۆك‌و سلێمانی بەدەر ناوچەیەکی کاکی بەکاکی بوو، سەدان خێوەتی ئەو پەناهەندانە نەبێت کەلەبەهاری رابردووەوە گوندو ماڵ‌و حاڵی خۆیانیان جێهێشتووەو تاکو ئێستاش ژیانێکی نائارام بەسەردەبەن‌و یەکبینەش بۆ هەڵاتنێکی تری ڕووەو سنوور لەسەرپێن، هیچ شتێکی تری لێنەبوو.

بەدرێژایی ساڵانێك، بەشە ئەندازیارییەکەی سوپای عێراق، بە بلدۆزەرو تەقەمەنی خانووە بەردینەکانیان کاولکردووەو بۆرییە ئاوەکانیان لێککردۆتەوەو، بیرەکانیان بە چیمەنتۆ پڕکردۆتەوەو، ڕەزو بێستانەکانیشیان هەموو بڕیوەتەوەو، چی ئێستگەی ناوەندیی ووزەی کارەباش هەبووە تەختیانکردووە، تا بەدرێژایی‌و پانایی کوردستان هەرچی شتە نەمێنێت. جا ئیتر نەك بەچاوساغێك بەڵکو بەفەوجە چاوساغێکی کوردیش، چەنێك بیرتیژبن‌و بیرەوەری گرنگیشیان هەبێت، دەتوانن بەدرێژایی‌و پانتایی کوردستان، کەخۆی لەبنەڕەتدا کۆمەڵگایەکی جوتیارانەبووە، بەدەشتایی‌و ڕووبارییەوە، بەگردو چیا کاکی بەکاکییەکانییەوە، بژێننەوە؟ چۆن دارۆپەردووی گوندێك لەدارۆپەردووی ئەیان دێی دی جویێدەکرێتەوە؟ ئەی باشە چۆن قەڵایەکی بەردینی زەبەلاحی بەتەرزی شێوەی ئاسایانە، لەگەڵ قەڵایەکی تری وەك خۆیداو لەسەرهەمان ڕێگاو لەدووری چەند کیلۆمەترێکەوە، جویێدەکرێتەوە؟

بەدبەختی حکومەتی عێراق لەوەدابوو، هەرخۆی وەڵامی ئەم پرسیارانەی دایەوە. لە ڕاپەڕینی ئازاری ١٩٩١دا، کورد لە بارەگاکانی حیزبی بەعس‌و سەرجەم دەستگا هەواڵگرییە کێبەرکێکانیا، دەستیان بەسەر هەژدە تەن بەڵگەنامەی عێراقدا گرت، بەڵگەی هێجگار زۆرو پڕمەغزای وا کەنیازەکانی ڕژێم‌و، پلانەکانی‌و، هەموو کارەکانی تیادابوون. سەیربوو پێدەچوو هەندێکیان هەر دەستیان بەرنەکەوتبێت، زۆری چرچ‌و لۆچ‌و بەپێ شێلراوو قوڕاویشیان تیادابوو، یان پارچەیەکی بەدەستی ئەو کوردانە سووتێنرابوو کە لەکاتی ڕاپەڕینەکەدا بەقینەوە هەڵیان کوتابووە سەر خانووەکانی "ئەمن" و "ئیستخبارات" و گرتبوویانن. بەچاکەی لیژنەی

پێوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجوومەنی پیرانی ئەمەریکاو، ڕێکخراوی "چاودێری مافی مرۆڤ - هیومان رایتس ووچ" و هێزی ئاسمانی وڵاتە یەکگرتووەکان، هەموو ئەو بەڵگەنامانە بۆ وڵاتە یەکگرتووەکان گوێزرانەوە تا لە"ئەرشیفی نەتەوەیی ئەمەریکا"دا وەك بەڵگەنامەی ڕەسمی تایبەت بە کۆنگرێس بپارێزرێن و، وەربگێڕدرێن و شیبکرێنەوەو بەراورد بکرێن. ئەوەی لەم بەڵگەنامانەدا سەرنجڕاکێشبوو، هەموو ئەوکارانەی "ڕێکخراوی لێبووردنی گشتی- ئەمنستی ئەنتەر ناشناڵ )) یان تێدا بوو کەچەند ساڵێکبوو باسی دەکردن و ناو حکومەتە بیانییەکان هیچیان ئامادە نەبوون گوێشی لێبگرن، ئەو چاپێکەوتنە بەریتانیانەشیان لەخۆگرتبوو کە کوردو، ڕۆژنامەنووسان و، ئەندامانی ڕێکخراوی ((چاودێری مافی مرۆڤ - هیومان رایتس ووچ))و "و کەسانی تریش لەکوردستاندا کردبوویان. بۆیەکەم جارە لەمێژوودا تۆمارگەی ڕەوشی مافی مرۆڤی ژێر سایەی ڕژێمێك بخرێتە ڕوو کە هێشتا ڕژێمەکە خۆی لەدەستەڵاتدابێت. بەغدا بە نەفەنی و پەشۆکاوانە نکوڵی لەوە دەکرد کە ئەو بەڵگەنامانە هی خۆی بن و، پەیتا پەیتا رایدەگەیاند کەئەوانە هەڵبەستراون و لەسەر پەڕە ڕەسمییە دزراوەکان چاپکراون. ئەمجۆرە نکولیکردن و وەڵام دانەوانەی عێراق، بەرامبەر بەوشتانەی سەبارەت بە پێشێلکردنی مافی مرۆڤ لە بەردەستدان بێهوودەبوون و ئەمجارەیان کەس باوەڕی پێنەدەکرد. چونکە ئەوبڕە بەڵگەنامە زۆرەی کەلەچوار ملیۆن لاپەڕە زیاتربوون، وێنەیەکی تەواوی میکانیزمی کارە بیرۆکراتییەکانی دەزگا داپڵۆسێنەرە لەڕادەبەدەرەکەی حکومەتی عێراقی بەجۆرێکی وا دەردەخست کەهەموو نکولیکردنەکانی پووچەڵ بکاتەوە.

تیپی پسپۆڕانی پێشێلکردنی مافی مرۆڤ کەئەم بەڵگەنامانەیان دەکۆڵییەوە، بڕوای تەواویان پەیدا کردبوو کە دەستیان بە کێشەیەکی کۆمەڵکوژی ڕاستەقینە گەیشتووە (نەك کاری دڕندانە، یان تاوانی جەنگ، یان تاوانی دژ بەمرۆڤایەتی). بەڵام بەپێی ووردەکارییەکان یاسای نێودەوڵەتی، تا حکومەتێکی دی بەڕەسمی شکات لە سەدام حسێن نەکات، ناکرێت ئەو بەتاوانی کۆمەڵکوژی- جینۆساید- بەدادگای نێودەوڵەتی لە "لاهای" بدرێت و دادگایی بکرێت. بێگومان ئەووڵاتە یەکگرتووەکان و نەهیچ وڵاتێکی خۆرئاوایی تریش، داوایەکی وایان نەکرد کە بەندێکی وا بخرێتە ناو بڕیارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە داوای پێکهێنانی ئەمجۆرە دادگایە بکرێت، جگە لەوە لایەنگرانی سەدام حسێنی ناو عێراق و سەرجەم دونیای عەرەبیش ئەوە بەکارێکی گومان لێکراو دادەنێن و، بە "دەنوەری سەرکەوتوو"ش بەرجەستە دەبێت. بەڵام مێژووی ناوچەکە پێشتر شتێکی لەو جۆرەی تیادا کراوە، کەداوەریکردنی لێپرسراوانی قڕکردنی ئەرمەنییەکان بوو. لە ١٩١٩دا، دادگایەکی سەربازیانەی عوسمانییەکان، دوای

ژێرکەوتنی تورکیای جەنگی یەکەمی جیهانی، دادگایی ئەو بەپرسە سەرەکیانەی کرد کە بەئەرمەن قڕان و تاوانی تری جەنگ تاوانبارکرابوون. هەرچەندە ئەو دادگاییکردنە بەفشاری بەریتانیا کرا، بەلام ئەوەی "ئەریخست کەئەکریَ دادگای ووڵاتێکی دۆڕاوی جەنگ، سەرکردە سەربازییەکانی خۆی لەسەرئەو تاوانانە دادگایی بکات کە لەکاتی جەنگەکەدا دژ بەیاسای گەلەکانی دی کردوویانە". چەند مانگێك دواتر، دۆستەکانیان کە لەکاتی شەڕدا خۆیان بۆ بەدەستهێنانی پلەو پایە دەکوتا، کێشەی دادوەریان پشتگوێخست و، دوای چەند دادگاییکردنێك بڕیاری لێبوردنی گشتی بۆ تاوانبارەکان دەکرا.

ئەو بەڵگەنامانە شتێك نەبوو ڕژێمی عێراق بتوانێت نکوڵی لێبکات. زۆر کەڕەت بەڵگەنامەی وا دەکەوتنە بەردەستی لێکۆڵەرەوەکان. کەمزۆر بەوانەی باردکا سەرکردەییە هێجگار لێکدوورەکان دەچوون. هەندێ جار چەند بەڵگەنامەیەك لەگەڵ دەستپێکردنی ناهەموارترین و دڕندانەترین کاریاندا دەرکراوە. بەکارهێنانی گازی ژەهراوی کەبۆ یەکەمین جار لەنیسانی ١٩٨٧دا دژ بە پێشمەرگەو خەڵکی مەدەنی کرا، نموونەیەکی زەقی ئەوانەن، بەتایبەتی بەکارهێنانی ئەو چەکە، کە تێشکدانەوەی ڕووداوەکانی مەیدانی جەنگی ئەگەیاند. ڕژێمی عێراق لە قەیرانەکەی دڵنیابوو. خۆ ئەگەر کەلله ڕەقی ئایەتوڵا خومەینی نەبوایە، کەبەرلگرتنی جەنگ قایلنەبوو شەڕەکەشی لەکوردستاندا گەرمکرد، ڕەنگە "عەلی کیمیاوی" ئەو دەستەڵاتە ڕەهایەی نەدرایەتێ. چونکە وا لەسەدام حسێن ئەزانرابوو، کە لەهەلومەرجێکی کەم مەترسی تری عێراقدا، دەستەڵاتێکی ڕەهای وا بەهیچ کەسێك بدا، جا ئیتر با ئەو کەسە یەکێك لەئامۆزا تکریتییەکانی خۆشی بێت.

دوای ڕاپەڕینی زۆر جەلال تاڵەبانی کە لەسەردەمی ژەنەڕاڵ مەلا مستەفا بەرزانیدا جاشبوو، چارەنووسی خۆی بەمێژوانەوە بەستەوەو لەسەرخۆڵەمێشە دامرکاوەکەی هەرەسی پڕ سوێی ئازاری ١٩٧٥ی مەلا مستەفادا یەکێتی نیشتمانی کوردستان PUKی دامەزراندو کەوتە شەڕی خوێناوی لەگەڵ کوڕەکانی بەرزانیداو بەسەدان لەهەردوولا کوژرا، بۆیە بۆ ڕێککەوتنەوە لەگەڵ PDKیدا کاتی زۆرتری پێویستبوو. سەردەمی شەڕی عێراق ئێران یەکێتی نیشتمانی کوردستان تا ٦ سالیش قایل نەدەبوو لەدژی بەغدا هاریکارێتی سەربازیانە لەگەڵ پارتی دیمۆکراتی کوردستاندا بکات (راستییەکەی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە ١٩٨٤دا دانوستانی لەگەڵ بەغدادا کرد).

سەرەتا هەڵوێستی تاڵەبانی ووریایی پێوەدیاربوو کەبەشی زۆری بۆ لەقکردنی شوێنی پارتی دیموکراتی کوردستانی کێبەرکێی بوو. تاڵەبانی هەمیشە وای ڕادەگەیاند کە نوێنەری کۆمەڵە

شارییە رۆشنبیرترەکەیەو، خەباتیشی بۆ جێگرتنەوەی سەرکردایەتییە عەشائیرییەکەی بەرزانییە، تاهەموو کوردی عێراق بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوەو، جارێکی دی هاوپەیمانێتی لەگەڵ ئێراندا نەکرێتەوە.

هەوڵە بێئاکامەکانی تاڵەبانی لەگەڵ رژێمدا بۆ بەدیهێنانی ئۆتۆنۆمییەکی فراوانتربوو. بەرهەڵستیکردنی تورکیا لە هەر رێککەوتنێکی سیاسیانەی وڵاتێکی دراوسێی لەگەڵ کورددا، کەوای دەگەیاند هەر ئەو بەتەنیا دەمێنێتەوە لەگەڵ کوردی خۆیدا رێکنەکەوێت، بۆیە بەپەلە وەزیری دەرەوەی بەڕاسپاردەیەکی بێ گرێ و گۆڵەوە ناردە بەغدا، راسپاردەکە بریتیبوو لە: دەبێ حکومەتی بەغدا گفتوگۆ نوێیەکەی تایبەت بە ئۆتۆنۆمی لەگەڵ کورددا رابگرێت، ئەگەرنا تورکیا بۆرییە نەوتەکەی کەبەناو خاکەکەیدا دەڕوات، دادەخات. لەو رۆژگارەدا ئەو بۆریانە تاکە سەرچاوەی پارەی بیانی بوو بۆ عێراق (لەهەمان کاتدا سێ یەکی نەوتی تورکیاو ساڵانەش ٣٠٠ ملیۆن دۆلاری وەک کرێی رەتبوون بە وڵاتەکەیدا، بۆ ئەنقەرە دابیندەکرد).

دەرکەوت وورياییەکەی تاڵەبانی بۆ دانوستانکردن لەگەڵ سەدام حسێندا لەجێی خۆیدابوو. چونکە سەرۆکی عێراق سزایەکی توندی پارتی دیموکراتی کوردستانی لەسەر ئەوەدا کەلەتەمووزی ساڵی ١٩٨٣دا، بۆ گرتنی شارۆچکەی حاجی هۆمەرانی سەر سنوور یارمەتی ئێرانی دا. پێنج تا هەشت هەزار نێرینەی بەرزانی گرت (هەندێکیان خوار ١٠ ساڵان و، زۆربەشییان ١٥ ساڵییان تەواوکردبوو)، ٤٢ خزمی نزیکی مەسعود بەرزانیشیان لەناودابوو. مانگێک دوای ئەم رەشبگیرییە، سەدام حسێن رایگەیاند کە: "بەتوندی سزای ئەوانە دراو، رەوانەی دۆزەخکران". ئەمە سەبارەت بەچارەنووسی دەیان هەزار کوردی "وونبوو"، بە بەیاننامەیەکی رەسمی دادەنرێت تۆڵەسەندنەوەی سەدام لەبەرزانییەکان شتێکی نوێ نەبوو.

ئەمجارەیان قوربانییە بەرزانییەکان جەنگاوەرە عەشایەرییە ئەفسانەییەکان نەبوون. ئەو ژن و منداڵە بەرزانییە دەستەپاچانەش کەمابوونەوە، خزێنرانە ئەو چەند "موجەمەع"انەی سەر رێگا سەرەکییەکان، وەک شارۆچکەی قوشتەپەی سەر رێگا خێراکەی نێوان هەردوو شاری کەرکوک و هەولێر. هەندێک کورد پێیان وابوو گرتنی ئەو هەموو بەرزانییە بێ چەک و دوور لەسیاسەتە وا بەئاسانی، نیشانەی نەمانی تواناو ئازایەتی جارانیان بێت. بەڵام سوکایەتیپێکردنی لەوەش ناهەموارتر، بەشێک لەو ژنانە، بۆ بژێوی خۆیان و منداڵەکانیان کەوتبوونە لەش فرۆشتن. لەکۆمەڵگایەکی مسوڵمانانەدا کەبەڕوا بەشەرەف و بێنابرووێتی شوێنێکی سەرەکی خۆی هەیە، ئەم چارەنووسەی ژنە بەرزانییەکانی تێکەوتبوو، بەتایبەتی کەلەساڵی ١٩٨٣وە منداڵی زۆڵیان خستەوە، بەشێک لەناهەموارترین تۆڵەی سەدام حسێن بوو کە لەبەرزانییەکانی کردەوە. ئەو

بەرزانیانەی بەزیندوویەتی مابوونەوە، لەشەرماندا جەمەدانییە سوورو سپییەکانی خۆیانیان لەسەریان نەدەبەست و گۆڕییان بەو جامەدانە ڕەش و سپیانەی کەعەشایەرەکانی دی بەسەریانەوە دەبەست. ئەوە شتێك بوو کەبەلای هەموو کوردەوە بێتولانایی دەگەیاند.

بەڵام خراپتر بەرێوەبوو، ڕژێم ڕەوایی زۆرداریەکەیی کوردە ئاساییەکانی ناچاردەکرد لەتاوانەکانیدا بەشداربن. کوردێکی هەڵاتووی سوپا کەلەساڵی ۱۹۹۱ بینیم، باسی ئەو ناخۆشیی و هەستی بەگوناهبارێتییەی بۆ دەگێڕامەوە کە سێ ساڵبوو پێوەی دەتلایەوە کەبەسەرهاتەکەی خۆیی، تەنانەت بۆ بیانییەکی وەك منیش گێڕایەوە پشوویەکی سەرفرازی پیادادەهات. لەساڵی ۱۹۸۸دا لە یەکەیەکی سەربازیدا خزمەتیکردووە، بەچەکی کیمیاوی لەهەرا کوردەکانی خۆپیدا وە لەبەردەمی منەدا ئەوەی یەکلاەکردەوە کە هیچ چارێکی تری نەبووەوە یەکبینەش دەیوت، گەر ئەوساکە فرمانەکانی جێبەجێ نەکردبا ئەو "یەکسەر بەتکوانی یاخیبوون گوللەبارانیان دەکردەو، یەکێکی تریشیان دەمێناو کارە ناڕەواکەشیان هەر پێدەکرد"-

خۆ ئەگەر "جاشەکان"یش بەو ڕادەیە هەستیان بەگوناهبارێتیکردبێت، ئەوا بەدەگمەن دەریانبڕیوە. چەند عەشیرەتێك کە زیباری و سوورچی و برادۆستییان تیادابوو بەتووندی و بۆماوەی زۆر ناویان لەجاشایەتیدا هاتووەو لەدێر زەمانەوە دەستەڵاتدارلن، جا عوسمانی بووبێتن، یان فارس، یان مۆدێرنەکانی دوای ئەوان، وەك بەریتانیایی، یان عەرەب، کوردە لایەنگرەکانی خۆیانیان بۆ لێدانی کوردە شۆڕشگێڕەکان بەکارهێناوە "بەڵام ئەو شتانە عەلی کیمیاویان لەهێرشکردنە سەرکورد ڕانەگرت کە لە وتەیەکی تۆمارکراویدا بڵێت، ئەگەر واشیدابنێین کە هەندێك کەسی باش لەناو کورددا هەبن، ئەوا ئێمە هیچ کوردێکی باشمان نەدیوە "ڕاستییەکەی ئێمە تا ئێستا تاکە یەك کوردی باشمان نەدیوە"). سەدام حسێن سەرەتا جاشەکانی بەپارەیەکی مۆڵ هەڵدەسووڕان، هەرکوردێکیش لەترسی بەرەی شەڕی ئێران لەخزمەتی سەربازی هەڵاتبا ئەوا دەبوا بۆچوونە ڕیزی جاشەکان بەرتیلی بدایە. هێزمەعێرانییەکان جاشەکانیان بۆ ئەوەبوو، کەلە هەڵسوکەوتی پێشمەرگە بەئاگابن و، دەیکردنە ئاڵقان و خۆراکی تۆپەکانیان، بەوەش خەڵاتیدەکردن کە لەکاتی گوند وێرانکردندا هەرچییەکیان دەستکەوت بۆ خۆیان بێت. بێگومان جاشگرتنەکە لەلایەکی تریشەوە سوودی بە بەغدا دەگەیاند، چونکە خەڵکی لە پێشمەرگە دادەبڕی و ئەوەندەیان جەنگاوەری نوێ لەدەور گردنەدەبۆوە. هەربەو پێیە دانوستانە دوورو درێژەکەی بەغدا لەگەڵ تاڵەبانیدا کردی خزمەتی بەرژەوەندییەکانی بەغدادی کرد، چونکە یەکێتی نیشتمانی کوردستان کەلەناوچە ستراتیژییەکانی سنووری ئێراندا بەهێزبوو بێلایەن وەستان.

که دانوستانەکە هەرەسی هێنا، تاڵەبانی لەگەڵ ئێراندا هاوپەیمانێتی بەستەوە، ئەویش یەکسەر بەناوی شەڕپەڕینەوەوە، فشاری خستە سەر کەمەست لەشەڕکردنی پارتی دیموکراتی کوردستان هەڵبگرێت. ئێران لەپێناو سووککردنی فشاری سوپای عێراق لە بەرەی باشووری عێراقدا، پەرۆشی کردنەوەی بەرەیەکی کوردی هەبوو. لەتشرینی یەکەمی ١٩٨٦دا پێشمەرگەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان و سەربازانی ئێران، هێرشیان کردە سەر دەزگا نەوتییەکانی کەرکوک، بەوەش ئەو ناوچە ستراتیجییەیان خستە مەترسییەوە، بەغدا ئەوکارەی بە بەزلاندنی هێڵی سوور دانا. لەکانونی دووەمی ١٩٨٧دا، ئێران لە خوارووی عێراقدا هێرشێکی نوێی بۆسەر "دەریاچەی ماسی" کرد، تیایدا پشتی بە شەپۆلە سامناکەکەی شاڵاوبەران بەستبوو. هەرچەندە ئەوە دواهێرشی لەوبابەتە بوو (بەڵام ئەوساکە کەس نەیدەزانی وایە). ئەوکاتە کوردستان بەڕادەیەک پڕ لەسەربازی هەڵاتووبوو کەخۆیان لەئەشکەوت و دۆڵەکاندا حەشاردابوو، "عەلی کیمیاوی" لەوە راپەستبوو، دەیوت: "بە ئۆتۆمۆبیلی زرێپۆش نەبێت کەس ناتوانێت لە کەرکوکەوە بچێت بۆ هەولێر". راستییەکەشی لەمانگی مارتی ئەوساڵەدا پێشمەرگەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان و چەکدارانی ئێران هەر میلێک لەڕەواندزەوە دووربوون، کەشارێکی گەورەی کوردی عێراقە پێشمەرگەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەدۆڵی جافەتی خۆرهەڵاتی سلێمانییەوە تەوێلە هاتبوونە پێشەوە.

هەرکە سەدام حسێن، لە٢٨ی شوباتی ١٩٨٧دا مەرسومی ژمارە ١٦٠ی مۆرکرد، کە دەسەڵاتێکی رەهای بە عەلی کیمیاوی‌دا، ئیتر ئامۆزاکەشی ئەوپەڕی دەسەڵاتەکەی خۆی بەکارهێنا. یەکسەر دووبڕیاری سەرەکی و هەمیشەیی بۆ خستنەگەڕی مەرسومەکە دەرکرد. یەکەمیانی لە٢ی حوزەیراندا بەژمارە ٢٨/٣٦٥٠ دەرکرد، گەمارۆیەکی تەواوی لەسەر هێنانی شتومەک و هاتوچۆکردنی خەڵکی لەناوچە حەرامکراوەکان- ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگە- دانا و لەهەموو عێراقی دابڕین. بەپێی ئەم بڕیارەش پێویستبوو گوندەکانیان وێرانبکرێن و دانیشتوانەکانیشیان بۆ "شارەکانی سەرکەوتن" رابگوێزرانایە، کەلەسەر شەقامە سەرەکییەکان و نزیک شارەکان بوون، دەشبوا هێزە چەکدارەکان، هەموو مرۆڤ و ئاژەڵێکی ناوچە حەرامکراوەکانیان بکوشتایە، بڕیارەکە دەڵێت "ئەم ناوچانە بەتەواوەتی حەرامکراون". بەڵام بڕیاری دووەمیان، لە٢٠ی حوزەیراندا و بەژمارە ٤٠٠٨دەرکرد، فرمانی بەسەرکردە سەربازییەکان دەدا کە: "دەبێت شەو رۆژ بەتۆپ و کۆپتەرو فڕۆکەی جەنگی بۆردومانێکی کوێرانەی ناوچەکە بکرێت، تا زۆرترین ژمارەی تیادا بکوژرێت"، لەو ناوچە حەرامکراوانەی ئازادانە تەقەی تیادا دەکرا نزیکەی ١٠٠٠ گوندێکی تیادابوو. بڕیارەکە پێویستی ئەوەشی

ڕاگەیاند کە "دەبێت ئەو کوردانەی لەناوچەکەدا دەگیرێن، دەزگا ئەمنییەکان لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا بکەن و لەژێر ئازاردا چی زانیارییەک بزانن لێیان دەربکێشرێت و، ئەوانەشیان کەتەمەنیان لەنێوان ١٥ تا ٧٠ ساڵە گوللەبارانبکرێن".

هەروەها ڕێ بەسەرۆک جاشەکان، کە "ڕاوێژکار"یان بەسەردا بڕیون، بدرێت چییان لە ناوچە قەدەغەکراوەکاندا دەستگیردەبێت، بەمەڕو ماڵات و ژن و چەکەوە، تەنیا چەکە مامناوەندی و قورسەکان نەبێت، هەمووی بەرن بۆ خۆیان.

مەجید سەرقاپی گەنجینەی مەرسومەکانی، بەبڕیاری سەندنەوەی ناسنامەی عێراقی لە هەر کوردێک کەبەشداری لەئامارکردنەکەی تشرینی یەکەمی ١٩٨٧دا نەکردبێت، ئایەوە، جالەبەرئەوەی ئەو ئامارە تەنیا بۆ شارنشین و "موجەمەعات"ە میرییەکان سازکرابوو، هەموو ئەو گوندنشینانەی نەگرتبۆوە کە لەناوچە حەرامکراوەکاندا مابوونەوە،بۆیە بڕیار درا "کاری پێویست"یان بەرامبەر بکرێت، واتە بەپێی زمانحاڵی ڕژێم بەمێنجگارەکی تەفروتونا بکرێن، چونکە "ئەماتبوونەوە ڕیزی نیشتمانی". (هەردوو کەمایەتییە پچووکەکەی: فەلە ئاشوورییەکان و، یەزیدییەکان، نەیانئەزانی گەر لەم ئامارکردنەدا قایلنەبن بەعەرەب دابنرێن، ئەوا بەلای ڕژێمەوە بەئەبوو دادەنرێن و، ئەو بیرۆکراتیانەشیان زۆر لەسەر دەکەوێت. هەرچەندە یەزیدییەکان زۆر لەمەی پاڕانەوەو لالانەوە، بەلام بەکوردیان دانەنان چونکە بەدیهێنانی ئامانجێک لەو ئامارکردنەدا هەبوو. بەم پێیە ژێر بەژێر ئەوان لە "لێبوردنی گشتی تەواو"ەکەی بەغدا بێبەریکران، کە لەئەیلولی ١٩٨٨دا بۆ "هەموو کورد"ی دەرکردو، ئەویش فێڵێک بوو بۆ خەڵەتاندنی کوردە ساویلکەکان تا لەتورکیاوە بۆ عێراق بگەڕێنەوە. خەڵکانی سەر بەم دوو کەمایەتییە کەوتنە داوە بیرۆکراتییەکانەوەو، هەریەکەیشتنە سنوورییان و بەسەدان ئاشووری و یەزیدی گیران و کەلەپچەکران و بەرەو شوێنێکی نادیارکرانەوەو، تا ئەمڕۆشی لەسەرێت چارەنووسیان دیارنییە).

دوای تێپەڕبوونی شەش هەفتە بەسەر کارەکەیدا، مەجید نازناوی "عەلی کیمیاوی" پێبڕا کە پڕ بەپێستی خۆی بوو. لە ١٥ی نیسانی ١٩٨٧دا، فڕۆکەی جەنگی هەردوو بارەگای سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستانی کیمیابارانکرد، هەرچەندە هێجگار دووریشبوون لە یەکترییەوە. ڕۆژی دواتریش، فڕۆکەو کۆپتەر، لەهێرشێکدا کە بەیەکەم هێرشی ئەو ٦٠ شاڵاوە کیمیاوییەی هەژدە مانگ بەردەوام دەکرانەسەر شوێنە مەدەنییەکان دەژمێردرێت، گازی ژەهراویان بەسەر هەردوو گوندی "شێخ وەسان" و "بالیسان"ی باکووری شاری سلێمانیدا ڕشت. ئەو کوردانە یەکەمین کەسانێکبوون کە بەر پەڵە هەوری گازی

ژەهراوی هەمەجۆر ڕەنگ و بۆن بکەون، کەهەندێکیان بۆنی، سیر، یان سێوی بۆگەن، یان گوڵ، یان نەعنا، یان شەمامە، یان خەیار، یان عەتریان لێدەهات. قوربانییەکان هاواری ئەوەیاندەکرد کە ئازارێکی زۆریان هەیەو گوێ، یان دەمیکیشیان ئاوساوە، هەندێکیشیان خوێنیان لەمیزیاندا دەبینی. زۆریشیان تا ماوەیەکی کەم چاویان نەدەبینا، یان لێڵو پێڵبوو، یان زەرداوێک بەچاوو لووتیاندا دەهاتە خوارەوە، هەندێکی تریش پێستی لەشیان هەڵدەکرد یان ڕەش دادەگەڕا. بەشێکی قوربانییەکان دوای لەرزلێهاتن یان ڕەتدان یان پێکەهێنێکی هیستریانە، یەکسەر دەمردن. ئەو دیاردانەو مردنە کتوپڕییەکە لەگازی خەردەلەوە نەبوو کە عێراقییەکان بەزۆری بەکاریان دەهێنا، بەڵکو هی گازی "سارین"بوو، کەئەویش گازێکی ژەهراوییە کاتی خۆی نازییەکان دۆزیانەوە، بەڵام لەشەڕدا بەکاریان نەهێنابوو.

یەکەم کیمیابارانکردنی ئەو دوو دێ کوردە، لەتەنیا سەعاتێکدا، زیاتر لە ١٢٠ کەسی کوشت و نزیکە ٢٠٠ ژن و پیاوو منداڵیش نەمردبوون و بۆچارەسەر بۆ ڕانیەو، دواتر بۆ هەولێر گوێزرانەوەو ناچاریشکران کە بڵێن ئێرانییەکان گازبارانیانکردوون. بەڵام کارەساتەکەیان هەر بەوە نەبڕایەوە، هەواڵگرە عێراقییەکان بەزەبری چەک زامدارەکانیان لەخەستەخانەی هەولێر، کەسووتاویی و کوێرییەکانیان تیادا چارەدەکردن، دەرهێناو بۆ یەکێک لەگرتووخانەکانی خۆیانیان گواستنەوەو لەوێ بەبێ خواردن یان چارەسەر هێڵرانەوەو پیاوەکانیان لەژن و منداڵان جیاکردنەوە، بەو هۆیەوە ٦٤ تا ١٤٢ کەس بەهۆی تیمارنەکردنی زامەکانیانەوە مردن، "موخابەرات"ی عێراقی نزیکەی ٧٠ پیاوێکیانی بەپاس، وەک بەرزانییەکان بۆ شوێنێکی نادیار بردن، تا ئێستاش چارەنووسیان نەزانراوە، لەکاتێکدا ژن و منداڵەکانیان لەدەشتاییەکی نزیک هەولێرەوە تووڕدایە سەر ڕێگاو، بۆ چارەنووسی خۆیانیان جێهێشتن. فەرمانبەرێکی مەیتخانەی شارەوانی هەولێر، کە فرمانی کۆکردنەوەی لاشەی کوژراوەکانی پێکرابوو، گێڕایەوە کەئەفسەرێکی هەواڵگرە عێراقییەکان پێی وتبوو: "ئەوانە یاخییەکانن، هەرهەموویان لە یاخییەکانن. کیمیا بارانمانکردن".

ئەم ڕاستگۆییە، بەهۆی قەدەغەکردنی ڕەسمییانە باس نەکردنی چەکی کیمیاوییەوە ئاسایی نەبوو. بەڵام هەڵەی زۆر ڕوویدا، بەڵگەنامەی دەگمەنی عێراق بەردەستکەوت کەبێ پەردە باسی کیمیاباران، یان "زەخیرەی تایبەت"ی تیادابوو کەئەوە ناوی ڕەسمی گازی ژەهراوی بوو. لەوتەیەکی تۆمارکراودا عەلی کیمیاوی باسی یەکەمین شاڵاوەکانی کیمیابارانی مانگی نیسانی ١٩٨٧ی کورد دەکات. گاڵتە بەپێشنیارێکی جەلال تاڵەبانی دەکات، کەلەڕێی دوو ئەفسەری عێراقی پلەدلری دیلەوە کردبووی و، پێی وتبوون کە پێشنیارەکەی بەسەدام حسێن خۆی بڵێن.

لەو پێشنیارەیدا تاڵەبانی رایگەیاندبوو ئەگەر عێراق واز لە کاولکردنی دێهاتە کوردییەکان بهێنێت، ئەوا ئەمیش دەست لەهاوپەیمانێتییەکەی ئێران هەڵدەگرێت. عەلی کیمیاوی لەشریتە تۆمارکراوەکەیدا دەڵێت: "تاڵەبانی داوای کردنەوەی کەناڵێکی تایبەتی لێکردم".. "منیش هەر ئەو ئێوارەیە چوومە سلێمانی و، بەزەخیرەی تایبەت تۆپبارانمکردن". لەشریتێکی تۆمارکراوی تردا، لەکۆبوونەوەیەکی جاشەکاندا، زۆر بەناشیرینی دەڵێت: "ناتوانم گوندەکانتان بهێڵمەوە، خۆ ئەگەر کیمیا بارانیان بکەم ئەوا خێزانەکانتان دەمرن. بۆیە دەبێت هەرئێستا چۆڵی بکەن، چونکە ناکرێ رۆژی کیمیابارانکردنەکەیتان پێبڵێم".

لەنێوان ۲۱ی نیسان و ۲۰ی حوزەیرانی ۱۹۸۷دا، مەجید زیاد لە ۷۰۰ گوندی کوردی وێرانکرد، کەزۆربەیان لەسایەی مەیدانو لەسەر رێگا سەرەکییەکاند' بوون. هێرشی سەر ناوچە حەرامکراوەکان کەلەژێر دەسـتەڵاتی پێشـمەرگەدا بـوون بـەردەوام بـوو، هەرگـەر لەبـەر هەلومەرجێکی ناهەموارو فشاری سەربازیانەی ناوچەکانی تربوەستایە. عەلی کیمیاوی چەکە کیمیاوییەکانی بەسەر کوردە مەدەنییەکاندا تاقیکردبۆوە، شێوازە تایبەتییەکانی خۆشی، کەهەر لەسەرەونگومکردنی پیاوانی کوردەوەو، راگوێزانی بەکۆمەڵ و، جیاکردنەوەی ژن لەپیاوو، بێبەشکردنی کورد لەخۆراک و بایەخ نەدان بەتەندروستیانەوە بیگرە، تا دەگاتە گوللەبارانکردن و گۆڕی بەکۆمەڵ، بەجێهێنابوو. لەکۆبوونەوەیەکی ئەندامە پێشکەوتووەکانی بەعسی ئەو ساڵەدا، عەلی کیمیاوی "پلانێکی بە بەرنامەی سەربازیانە"ی بۆ قەتیسدانی پێشمەرگە لەناوچەیەکی بچوکدا دانا، تا کیمیابارانیان بکات وتی:" هەر بەرۆژێك کیمیاباران دەستیان لێ هەڵناگرم، بەڵکو پانزە رۆژ لەسەریەك دایاندەگرمەوە".

بەمجۆرە هەموو شێوازێکی سەرکوتکردنی سەربازیانەو بیرۆکراتیانە دۆزرایەوەو، لە دوا هێرشی سەر کوردیشدا تاقیکرایەوە، لەشوباتی ۱۹۸۸دا دەستیان پێکردو ناوی "ئەنفال"یان لێنا، ئەویش هەوڵێکی رژێمی عێراقیبوو کە کۆن بەعیلمانییەکی توندڕەو ناسرابوو، تا لەکاتی جەنگی ئێرانیدا لەئایینی ئیسلام بۆ خۆشەویستکردنی خۆی بەکاربهێنێت. "الانفال" هەشتەم سورەتی قورئانی پیرۆزەو، بەسەرهاتی ئەو ۳۱۹ موسڵمانانە دەگێڕێتەوە، کەلەساڵی ٦٢٤ زاینیدالە شەڕی بەدردا بەسەر سێ هێندەی خۆیاندا زاڵبوون. ووشەی "الانفال" دەستکەوت یان زەوتکردن دەگەیەنێت. بۆیە ناوەکە لەگەڵ کارە سەربازییەکانی عەلی کیمیاویدا، کەئامانجەکەی لەناوبردنی کوردو زەوتکردنی شتەکانیانبوو دەگونجا. بە یەکەی جاشەکان راگەیەنرابوو کە کوردەکان هەرچییەکیان هەبێت با تاڵانی بکەن، جا بزن بێت، یان مەڕ، یان

ووڵاخ، یان پارە، یان چەك (تەنیا چەكی ئاورنجی و قورس نەبێت) تەنانەت ژنیشیانتان پێنەچەلاڵ بێت.[٤٦]

ئەنفال پلانی بۆ دانرابوو، جێبەجێكردنی یەكەم قۆناغی، لەكاتێكدابوو كەرژێم ترسی چارەنووسی خۆی هەبوو، پێیان وابوو ئێران لەزستاندا هێرشێكی نوێیان بۆ دەكات. هەروەها وەك پێشتر بۆمان دەركەوت، لەڕێككەوتنەوەی كوردەكان و، دەستهەڵگرتنی دووبەرەكییە هەرە كۆن و قرخنەكەیان ڕاڕابوو. راستییەكەشی تاران لە تشرینی دووەمی ١٩٨٧دا پێكی هێنانەوەو، كارێكی كردپارتی دیموكراتی كوردستان و یەكێتی نیشتمانی كوردستان ڕێككەوتنێك مۆربكەن و ریزەكانی خۆیان یەكبخەن و، هەردوولایان كەوتنە هەوڵی پێكهێنانی بەرەیەكی كوردستانی عێراق، كەسەرەتا سێ حیزبی بچوكتریشیان لەگەڵدابوو. بەڵام هەر لەو كاتەدا سوپای ئێرانی تێكشكا. لەزستانی ١٩٨٨دا، هێزە ئێرانییەكان، خۆی لەبەر تەكت ـە ترسناكەكەی عێراقدا كەلە(جەنگی شارەكاندا) بەرجەستەببوو، خۆیان بۆ نەگیراو پاشەكشەیانكرد، چونكە عێراقییەكان هەرەمەكیانە تاران و شارەكانی تری ئێرانی بەمووشەكی زەوی – زەوی تەرزی "سكۆد"ی شوورەوی بۆردومانەدەكرد. لەگەڵ ناوەندی نیسانی ئەو ساڵەدا، هێزەكانی ئێران لەبەندەری فاوی عێراقی سەر شەتولعەرەب، كەبەندەرێكی بازرگانێتی نەوت بوو، گرتنەكەی كاتی خۆی گەورەترین سەركەوتنی سەربازیانەی ئێرانبوو لەناو خاكی عێراقدا، كشایەوە، تێكشكاندنی ئێران لەجەنگەكەدا یەكلایی ببوو.

ئەنفال كە بەمانەی چۆڵكردنی دێهاتە كوردنشینەكان، لە چەكدارو بێچەك وەك یەك، كرا، لە ٢٣ی شوباتی ١٩٨٨دا بە هێرشێكی سەربازیانەی گەورەی سەر بارەگای یەكێتی نیشتمانی

---

[٤٦] بادانەوەی عێراق بۆ ئیسلامو پاڵپێوەدانی شتێكی نوێبوو. ئەو بیانییانەی پێش جەنگەكەی ئێرانی سەری عێراقیان دابوو لەییریانە كەبیروبارەڕو خەباتی بەعس دەچووەوە سەرچەند شتێكی علمانی بەنرخ. بەشێك لەسیاسەت شیكەرەوەكان لەو باوەڕەدابوون "میشێل عەفلەق"، كە بیانێكی خەڵكی سووریاو حیزبی بەعسی لەپەنهاكاندا دامەزراندبوو، پەتابەرێكە لەبەغداو ڕێزێكی زۆری لێدەگیرێت.
ئایدۆلۆژیای بەعسی لەسەر بیروڕایەك دامەزراندبوو كەپێویستە ڕێگا بەكەمایەتییە نامووسوڵمانەكان بدرێت لەكاروباری خۆرهەڵاتدا ڕۆڵیان هەبێت. بەڵام كەشەڕ لەگەڵ ئێرانی شۆڕشدا درێژەی كێشا، سەدام حسێن كە لەنرخە ئایدیۆلۆژییەكان بەگومانبوو، زۆر بەلایەوە ئاسانبوو خۆی بەوەچەی پێغەمبەر دابنێت. كارێكیشیكرد كە رێنەی هەمەجۆری، بەجیبەو بەرگی حەجكردنەوە لەمەكە بگیرێت. خوای گەورە لەسورەتی ئەنفالدا دەفەرموێت:
"اذ یوحي ربك الى الملائكة انی معكم فثبتوا الذین امنوا، سالقي في القلوب الذین كفروا الرعب فاضربوا فوق الاعناق واضربوا منهم كل بنان. ذلك بانهم شاقوا الله ورسوله، ومن یشاقق الله ورسوله فان الله شدید العقاب، ذلكم فذوقوه وان للكافرین عذاب النار).

کوردستان لەدۆڵی جافەتی خۆرهەڵاتی شاری سلێمانی، نزیك سنووری ئێران دەستیپێکرد. بەر لەیەکەمین کارەکانی ئەنفالی ١٩ی ئازار، سەرجەم ئاگاداری هەڵمەتەکە لەسەر زەوی، لەبڵاوبوونەوە چڕوپڕەکەی ژمارەیەکی زۆر لەسەربازو زرێپۆش و فڕۆکەو کاولکردنی گوندو، بەکارهێنانی گازی ژەهراویی و، راگەیاندنی لێبووردنی گشتی بۆ قایلکردنی کوردە ساویلکەکان تا خۆیان بەدەستەوە بدەن و سەرەو نگومبکرێن وەك دەریشەدەکەوێت بیانکوژن، بەدیارکەوت.
لەماوەی سەرجەم ئەنفالەکاندا (لەهەشت مانگدا هەشت ئەنفال بەجێهێنرا)، رەفتاری نوێی وایان بۆکارە جوانەکانی تریان زیادکرد کە خێزانیش بگرێتەوە، کاتێ پشکنین لەبگرەو بکوژەکانیاندا، وەك تۆڵە ژن و منداڵانیان دەگرتن و فەوتیاندەکردن. کوردیان بۆ گۆڕەپانە سەربازییە چواردەورگیراوەکان گواستەوە، پیاویان لەژن و منداڵ جوێکردەوە. پیاوانیان بەتوێی ئەرپیێ و فانیلەوە، بەبرسیێتی دەهێشتەوە یەکبینەش لێیان دەدان، ئەمجا کۆتیاندەکردن و ئەوەندەی ئەدەبرد وونەکران و بە کاروانە ئۆتۆمۆبێلی پیس بەرەو گۆڕەپانی مەرگ دەکرانەوە کەبەسەدان میل لەشوێنی ئەرکە سەربازییەکانەوە دووربوون. ژن و منداڵانیش هەمان چارەنووس چاوەڕوانیدەکردن، بەڵام هێمنانەتر. ئەو چەند کەسە کەمەی دەربازببوون هەمان بەسەرهاتیان دەگێڕایەوە. بە کاروانە زیلی قەپاتکراو، بەبرسیێتی و تووینێتی بۆ بیابانەکانی باشووری وڵاتیان بردوون. سەر لەبەیانی زوو یان لەگەڵ زەردەپەڕدا دەگەیشتنە ئەو شوێنانەی پێشتربۆیان دیاریکرابوو، هەموویانیان بەزۆر لە زیلەکان دادەگرت و، کۆڵەکانیان بۆ بەکارهێنانەوەیەکی دی لەدەستدەکردنەوەو بەگوریس دەبەسترانەوە، لەسەر ڕۆخی چاڵە نزمەکان رادەگیران و، بەرلەوەی سەربازەکان گوللەبارانیان بکەن و بلدۆزەریش گڵیان بەسەردا بکات، دەدرانە بەر لایتی ئۆتۆمۆبیل و ماشینی دی، ئەمجا بە ڕەشاش گوللەڕێژن دەکران.
ناهەموارترین شت کە عێراقییەکان بەکوردیانکرد لەئەنفالە رەسمییەکاندا نەبوو، بۆ بەدبەختی کورد نەبوو، بەرامبەر بەشاری هەڵەبجەی ژێرسایەی عێراق و نزیك سنووری ئێران و بەربەستی ئاوی دەربەندیخانی ستراتیژی کرا، کە لەپەنابەرلندا جەمەی دەمات. لەناوەندی مانگی ئازاردا، پێشمەرگەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان یارمەتی "پاسدارانی شۆڕشی ئیسلامی "یان دا بۆچوونە ناو شارەکەو، ترسێکی زۆریان خستە دڵی دانیشتوانەکەیەوە کەزۆربەیان لایەنگری حکومەتی عێراقبوون. رادیۆی تارانیش شانازی بەسەرکەوتنەکەوە دەکردو، وای باسدەکرد کەلەتۆڵەی کیمیا بارانکردنەکەی ئەمدواییەی کوردەکاندا کرابێت. لە١٥ی ئازاردا رادیۆی تاران رایگەیاند کەپاسدارانی شۆڕش و پەنجا هەزار کەسی دانیشتوانی شارەکە ئاهەنگی سەرکەوتن سازدەکەن. هەر لەهەمان رۆژدا عێراق فرمانی بەمووچەخۆرەکانی

خۆیدا لەهەڵەبجە دەرچن، ئەوەش ترسی زیاتری بۆ ئەو خەڵکە پەیداکرد کەتیایدا مابوونەوە. راسپاردەی ١٥ی ئازاری ئیستخباراتی عێراق کە دواتر دەستیان بەسەردا گیرا، وابوو کە "با ئەرکە سەربازییەکان توندترو دڵرەقانەترین".

هەر ئەو بەیانییە، چەندین پۆلە فڕۆکەی جەنگی عێراق پەیتا پەیتا بۆردومانی کردو ناپاڵم و فۆسفۆڕی سپی بەشارەکەدا کێشا. خەڵکەکە بۆ خۆپاراستن و خۆ حەشاردان، بەرەو ناو "مەلجەئە" گەورەو کۆنەکان هوونەوە. دوای نیوەڕۆی هەمان ڕۆژ فڕۆکە عێراقییەکان، جارێکی تر هاتنەوەو شارەکەیان بەچەکی کیمیاوی بۆردومانکردەوە. خۆڕاگەکرانی ناو مەلجەئەکان بێهوودە خەریکبوون بەپەڕۆی تەڕ کون و درزو کەلەبەری مەلجەئەکان بگرن و پەڕۆی تەڕ بەدەم و چاوەوە بگرن و، بۆ سووتاندنی گازەکانیش ئاگر بکەنەوە، بەڵام دادی نەدەدان و گەلێکیان لەناو مەلجەکاندا لێمرد. دواتر کارمەندانی فریاگوزاری ٤٠٠ لاشەیان لەتەنیا مەلجەئێکدا دییەوە، بەڵام کە زانیان لاشەکان داڕزاون و لەکاتی گواستنەوەیاندا پارچەیان لێدەبێتەوەو دەستێك لەوێ و لاقێك لەولا دەکەوێت، کارەکەیان فەرامۆشکرد. ئەوانەی لەو مەرگەساتە رزگاریانبوو، کاتێك لە مەلجەئەکان هاتنەدەرەوە دیمەنێکی هاوچەرخانەی تری کارەساتەکەی شاری "پۆمپێی" ڕۆمانیان بەرچاوکەوت. بەهەزاران لەبرا کوردەکانیان بەمردوویی رەقببوون، هەندێکیان مەرگ لەبەردەم ئەو خانوانەدا دەستی لێگیرکردبوون کەدەیانویست خۆیانی تیادا حەشاربدەن، بەشێکیشیان بەرلەوەی خۆبگەیەننە شوێنێکی بێوەی بەسەر سەوکانی ئۆتۆمۆبیلەکانیاندا کەوتبوون؛ هەندێکی تریش بەشێوەی زۆر سەیرو سەمەرە بەسەر شەقامەکانەوە رەقببوون، چەند کەسێکی تریشیان لەکاتی گیانەڵادابوون و، بەدەوری خۆیاندا رەتیان دەداو پێدەکەنین و تووشی هستریا هاتبوون، کە ئەوەش دیاردەی گازی سارین بوو.

شۆڕش رەسوڵ، کەباسکارێکی وردەی کوردە، بەلایەنی کەمەوە قوربانییەکانی کارەساتی هەڵەبجەی بە ٣٨٠٠ کەس دەنارە، لەکاتێکدا هەیە بە ٧٠٠٠ قوربانی لە قەڵەمداوە. بەهەزارانیشیان بەرەو ئێران رێگای کێوەکانیان گرتبووەبەر، لەوێش تیمە پزیشکییە چاپوکەکان کەپێشتر ئاگادارکرابوون بە "ئەترۆپین"ەوە، کە بۆ نەهێشتنی کاریگەریتی گازی "سارین" بەکاردێ، چاوەڕوانیان بوون. چەند رۆژێك دواتر، ئێرانییەکان بەکۆپتەرە جەنگییەکانیانەوە هاوەڵی کۆمەڵە رۆژنامەنووسێکی بیانیانکرد، تا هەواڵی قەڵاچۆکردنەکە رابگەیەنن. سەرەتا بەغدا نکوڵی لەبەکارهێنانی چەکی کیمیاویکردو، ویستی لەوەدا سەرزەنشتی ئێرانییەکان بکات. بەڵام ئەو بەڵگەنامانەی دواتر گیران بەهیچ جۆرێك ئەو قسەیەیان نەدەسەلماند. بگرە یەکێك لەو بەڵگەنامە دەگمەنانەی کەلە ١١ نیسانی ١٩٨٨دا لەئیستخباراتەوە دەرچووە، هەموو

ئەو ڕێنساییانە پێشێلدەکات کەباسکردنی گازی ژەهراوی قەدەغە کردبوو، لەشریتێکی ڤیدیۆدا کەلەشاری سلێمانی دەفرۆشرا، چەند دیمەنێکی کیمیابارانکردنەکەی عێراقی شاری هەڵەبجەی تیادابوو. سەرەڕای ئەو بەڵگەیەی کەهیچ گومانێکی نەدەهێشتەوەکەچی هێشتا کۆلیژی جەنگی سوپای وڵاتە یەکگرتووەکان لەکارلایلی ولایەتی پنسلڤانیا، ئەوکاتە پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کەلە ١٦ی ئازاری ١٩٨٨دا هەردوو وڵاتی شەڕکەر لەهەڵەبجەدا گازیان بەکارهێنابێت.

بۆ سەرکردایەتی پێشمەرگە هەڵەبجە زەبرێکی سامناکبوو، بەرەی کوردستانی عێراقی لەباربرد کە ئەوکاتە تازە خەریکبوو لەدایك دەبوو، نەتەوەییە کوردەکانیشی لەناو هەموو کورددا لاوازکرد، چونکە ئەوە یەکەم جاریان نەبوو کەهاوپەیمانێتی ئێرانیان کارەساتیان بەسەر بهێنێت. دوای کارەساتەکەی هەڵەبجە بەماوەیەکی کەم سەرد .ی شامم کردو چاوم بە سەرکردەکانی کورد کەوت. کەش و هەوایەکی پەست و ناخۆشی هەبوو چاوپێکەوتنەکە بەدانپیانانی ناهەموارترین هەڵەیان و شیکردنەوەی بارە سیاسییەکەی کەپێدەچێت ئێران شەڕەکەی لەگەڵ عێراقدا بدۆڕێنێت، دەستپێیکرد، دکتۆر مەحمود عوسمانی سەرکردەیەکی گەورەی کوردە سۆشیالیستەکان و پاریدەدەرێکی سەرەکی ژەنەڕاڵ بەرزانی، پێیوتم: "خەڵکەکە دەترسن و لێشمان تووڕەن، هەقیشیانە". ئەمجا پێدەچوو ئەویش و سەرجەم سەرکردەکانی کورد بەناچاری، ملیان بۆ تۆڵە سەنگەرەکەی ڕژێمی عێراق دابێت، چونکە بەشێوەیەکی گشتی و تەوەژاویانە لە شەڕی پارتیزانی ناوشاری دژ بەڕژێم دەدوان. عوسمان درێژەی بە قسەکەیدا و وتی:" وادیارە بەرەوڕووی هەلومەرجێکی وەك هەرەسەکەی ١٩٧٥بووبینەتەوە". وتیشی لەدوای قەلاچۆکردنەکەی هەڵەبجەوە هەر لێپرسراوێکی ئێرانی لەتاران دیوە، پێی وتبووە کە هاوپەیمانێتیکردنی ئێران بۆ کورد "شەڕکردنمانە تا بە هێجگارەکی قڕ دەکرێین" بێگومان قسەکەمیان پێناخۆشبوو. لەهەموو سەرکردە کوردەکاندا تەنیا ئەو بەڕوونی دەرکی بەوە کردبوو کەئەگەر سەدام حسێن لە شەڕەکەیدا سەربکەوێت ئەوا "دەکەوینە بارێکی زۆر ناهەموارەوە، چونکە دەستی بۆ لێدانمان بەتاڵدەبێت و ئێمەش بە مەگەز دادەنێت".

سەرکردەکانی کورد پێیان لەسەرئەوە دادەگرت، کەلەهاوپەیمانێتی ئەمجارەی ئێرانیاندا هیچ دوودڵییەکیان نەبووە، چونکە نەدەبوو بەتەمای هیچ یارمەتییەکی وڵاتانی خۆرئاوا، یان بەرەی کۆمۆنیستی، یان وڵاتە عەرەبییەکان بوونایە. سەرکردەیەکی پێشمەرگە سەردانێکی ئەورووپای کردبوو، دەیوت:"هەرچەندە سەرنجدان لەدیمەن وێنەکانی کوشتارەکەی هەڵەبجە، بەسەرهاتی جوولەکەی ٤٥ ساڵ لەمەوبەر بەیاد دێنێتەوە" کەچی واش "کەسێك یارمەتی نەداین"، پێدەچوو ئەو پەندە باوەی خۆرلاهەتی ناوەڕاستی بیرکەوتبێتەوە کەدەڵێت:" دوژمنی دوژمنم دۆستمە"،

ڕاستییەکەشی کورد هەر ئەوە بیرکردنەوەی بووە. ستراتیژە نوێیەکەیان لەوەدا چڕبۆوە، کەهیچ کارێکی سەربازیانەی هاوبەش لەگەڵ ئێراندا نەکەن تاپەیماننامەیەکی سیاسیانەی ڕوون و ئاشکرایان لەگەڵیاندا نەبێت.

بەڵام هەموو قسەکانیان بۆشبوون، زیاتر لە خەونی دەکرد، واشپێدەچوو کە سەرکردایەتی کورد خۆی ئەوەی باش زانیبێت. چونکە هەر کەیەکەم کیمیاباران کران جەلال تاڵەبانی لەنیازەکەیان گەیشت و داوای ئاگربەستی لێکردن، بەڵام عەلی کیمیاوی گوێی بەداواکەی ئەداو درێژەی بەشەڕەکەدا. ڕاستییەکەی عێراقییەکان چەند جارێك هێرشی کیمیاویان بۆ کردبوون، تەنانەت دوای ئەیلولی ١٩٨٨یش کەبەڕەسمی ئەنفالەکانیان کۆتایی پێهێنابوو. لەبەهاری ئەو ساڵەداو دوای کوشتارەکەی هەڵەبجە کە سەردانی شامم کرد، ئەمدەزانی بۆچی پێشمەرگە لەپێناو سەلامەتی خۆیدا ئەکشاوەتەوە ناو ئێران. بەڵام ئەوسا ڕەسوڵ پێیوتم: "کورد هەمووی دەیزانی چەند ناوچەیەك کیمیاباران کراوە، بەڵام ئێمە ترسی ئەوەمان هەبوو گەر شەڕەکە ڕابگرین گەلەکەمان زۆرلەوە خراپتری بەسەربێت، بۆیە ئەرکی پێشمەرگە لەهێرشکردنە سەر هێزە عێراقییەکانەوە بووە پارێزگاریکردنی گەلەکەمان".

بێگومان پاشان دەرکەوت ئەو خواستانە لەجێی خۆیاندا نەبوون و لەڕاستییەوە دووربوون. بەگرتنەوەی "فاو" ئیتر ڕۆژ بەڕۆژ ئێرانییەکان لاوازتردەبوون. عێراقیش هێزی سەربازیانەی لەناوەندو باشورییەوە بۆ کوردستان دەبردەوە تا بەشداری ئەنفالیان پێبکات. لەقۆناغێکدا وای لێهات ٤٦ تیپی سەربازی بەشداریان دەکرد، لەکاتێکدا تیپە سەربازییەکانی ساڵانی حەفتا، کەبەڕووی بەرزانیدا وەستابوونەوە لە هەشت تیپ تێپەڕی نەدەکرد. لەتەموزیشدا کەئایەتوڵا خومەینی بە "نۆشینی پیاڵە ژەهرەکە" قایلبوو، بڕیاری ئەو ئاگربەستەی نەتەوە یەکگرتووەکانیدا کە ساڵێك بوو دابوی، ئێران خۆی ئەرەتان و ئەو بەڵێنەشی ئەبردەسەر کەبەیەکێتی نیشتمانی کوردستانی دابوو، گوایە بەر لەئاگادارکردنەوەیان ڕێککەوتنی یەکلایەنانە ناکات.

کارەساتەکەی هەڵەبجە ئاکامی ترسناکی تری بۆ کوردی هەموو خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و ئەو شوێنانە هەبوو کەتیایدا بڵاوببوونەوە. لە کاتێکدا کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی ڕووداتی کارەساتەکەی پێڕانەگیراو، نەشیویست بەرپرسیارانی کارەکە بدرێنە دادگا، ئیتر کورد هەستیکرد نابێت لە خۆیان بەدەرپشت بەکەسی دی ببەستن و، ئەو پەندەی باوو باپیرانیشیان بیرکەوتەوە، کەدەڵێت: "کورد بێجگە لەچیاکانی هیچ دۆستێکی تری نییە" و ئیتر، گشت بەڵێننامەو، هاوپەیمانێتی و، پشت بەدەرەوە بەستن و، تیوری بەمەرج کارکردنی ناو ڕژێمیان

تووڕدلیە سەرانگۆزلکی مێژووەوە. تووڕەیی و داوای توندڕەوانەی پشت بەخەباتی چەکداریانە لەناوو؛ جوتیارو، ئەندازیارو، پارێزەرو، شۆفێری لۆری و، پزیشک و، مامۆستایانی قوتابخانەدا تەشەنەیکرد.

کورد ئاگای لەوەنەبوو کەبایەخ پێدانی ئێستای فەلەستینیەکان و قایلبوونی دونیا پێیان، لەوکاتەوەیە کە دەستبەرداری چەک و تووندڕەوێتی بوون و، گۆڕیویانە بەخۆکە بەردی ڕاپەڕین و ئامادەییان بەچارەسەری سیاسیانە. ڕۆشنبیرانی کوردیش تێبینی ئەوەیان نەکردبوو کەفەلەستینییەکان بەدرێژایی تەمەنی دوا دوو وەچەیان، ڕێک لەوکاتانەدا گرنگترین وەرچەرخانی سیاسیانەیان بەدیەهێنابوو. بەلای ئەوانەوە، ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی لەفەستینی بایەخی هەر لەوەدابوو کەمەشقی بە گاریلاکانی پارتی کارێکارانی کوردستان کردبوو، کە ئەوەیان لەگەڵ گەلێك لەڕێکخراوە رادیکالییەکانی تریشدا کردبوو، بێگوێدانە بایەخی سیاسیانەی هەریەکێکیان. هەموو زانیاری و دانایییەکی سیاسیانەی کورد، کە بەدرێژایی سالانی ئەم سەدەیە هێجگار زۆریان لەسەر کەوتبوو، وەك پارەی کاغەزی سەرەدەمی هەلئاوسان گومانی لێدەکرا. کارەساتەکەی هەلەبجە بەلای کوردەوە هاندەرێکی بێوێنەی وابوو، کە- تا گۆم قوول بێت مەلەی خۆشترە-.

ئەگەر دوو دلییەکیشم لەوەدا بووبێت، ئەوا لەو شەوە درێژەی کانونی یەکەمی ۱۹۹۱ی شاری قامیشلی سوریای نزیك سنووری تورکیاوە، کەزۆریش لەسنووری عێراقەوە دوورنییە، لەگەل چەند ڕۆشنبیرێکی کورددا، کەبرادەرێکی کوردی عێراقم میواندارێتی کردبووین، بەسەربرد، ئەو دوودلییەشم نەما. هەرچەندە ئەو پزیشك و ئەندازیارانە هێجگار ڕەوشت بەرزبوون، بەلام وەلامی هەموو پرسیارو ڕەخنەیەکی منیان سەبارەت بەکارە نارەواکانی پارتی کرێکارانی کوردستان، بەتەنیا وشەیەك دەدایەوە: هەلەبجە. بەتەواوەتیش بۆیان یەکلاییکردەوە کەزۆرچاك دەیانزانی، پارتی کرێکارانی کوردستان تاکە لایەنە ڕاستەوخۆ سوود لەسووربوونی تۆلە سەندنەوەی کورد وەربگرێت.

ڕەنگە ئەوە بەپووکەش سەیربێت. چونکە "عەبدوڵڵا ئۆچلان"ی سەرۆکی پارتی کرێکارانی کوردستان کە کوردێکی تورکیایە، ئەوەندەی لەڕیشەکێشکردنی کلتووری چەشتووە کە کوردی نازانێت و بەزمانی تورکیش دەدوا نەك بەکوردی.[47] ئۆچلان پێی خۆشبوو "ئاپۆ" واتە "مام"ی

[47] "هارڤی موریس"ی ڕۆژنامەنووسی "دی ئیندیپێندەنت"ی لەندەنی دەیگێڕێتەوە، کە لە سەردانێکی شاری قامیشلیدا، دوای چەند مانگێکیش بەچاوی خۆی وێنەی ئۆچلانی لەتەنیشت وێنەی "حافز ئەسەد"ی سەرۆکی سوریاوە بینیوە.

پێبوترێت، خۆی بەتیۆرییەکی ئایدۆلۆژی دادەنا. بەڵام من لە١٦ی ئازاری ١٩٩١دا، لەخانوویەکی بێترسی دیمەشقدا، دوای چوار دانە سەعات کۆبوونەوە لەگەڵیدا، لەو بنەما ئایدۆلۆژیانە تێگەیشتم کە پارتی کرێکارانی کوردستان خەباتی بۆ سەربەخۆیی کوردستانی تورکیا پێدەکرد. خۆی بە مارکسیزم ناساند، بەڵام بێگومان کۆمۆنیست نییە. خۆی وتەنی کۆمۆنیستی ((کلاسیکیانە))یان کۆمۆنیستی تەرزی شۆڕەوی نییە. دژی شێوازی کارکردنی موسوڵمانانە بوو، بەڵام دانی بەوەدا دەنا کەئاین بایەخێکی زۆری بۆ کۆنە گوندنشینەکان هەیە. (لەبواری پراکتیزەکردندا، پارتی کرێکارانی کوردستان لە بەگەڕخستنی لایەنگرەکانیدا کارامەبوو. لەگەڵ شارنشین و رۆشنبیراندا باسی مارکسیزمی دێنایە کایەوە، لەگەڵ دێهاتنشینەکان و کۆنەپەرستەکانیشدا باسی بیرو باوەڕی ئیسلامی دەهێنایە ئاراوە). بۆ کورە جوتیارێکی بێپوول و پارەیوا کەبەچاوی سووک سەیربکرێت، ئەم جۆرە بیرکردنەوە یەکلایەنییەو حەز بەتوندڕەوییە، کەهەردووکیان شێرپەنجەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستن، بەدرێژایی ئەو ساڵانەی لەوناوچانەدا بەسەرمبردن، زۆر لەجوولەکە توندڕەوە ئیسرائیلییەکان و، مێرانی جەنگی لوبنانی ناو دیانەکان و، موسوڵمانە ئوسوڵییەکانی ئێران، توشیبوون. ئەگەرچی وڵاتە یەککرتووەکانی ئەمەریکاو تورکیاو سەرجەم وڵاتانی ئەورووپای خۆرئاوا، ئاپۆ بەتیرۆرست دادەنێن، کەچی بەتاقی تەنیا یۆنان ئەو هەڵوێستەی نەبوو.

یۆنان پشتگیری هەموو شتێك دەکات کە کۆنە دوژمنەکەیی پێ لاوازبکرێت. دیپلۆماتێکی یۆنانی لەدیمەشق کەئاپۆی چاك دەناسی وتی: "راستە ئاپۆ بیروباوەڕێکی یەکلایەنی هەیە بەڵام لە تورك کوشتندا هێجگار کارامەیە".

لەکاتی چاوپێکەوتندا، ئاپۆ بلوزێکی ئینگلیزیانەی رەنگ کاکی لەبەرەکردبو، قسەکانیشی بەچەند وتەیەکی پەلەی؛ مارکس و، ئەنگلز و، فریدریك نیتچەو، مێژوونووسی بەریتانیایی ئەرنۆلد تۆینبی و، فەیلەسوفی فەرەنساوی هنری برگسۆن و، زانای کۆمەڵناسی ئیمیل دورکهایم دەڕازاندەوە. دەیوت هەموو کتێبەکانی ئەوانەی ئەوانەی کاتێك خوێندووە کەلەزانکۆی ئەنقەرە، لەسەر حسابی حکومەتی تورکیا زانیاری سیاسیانەی وەرگرتووە. راستییەکەی منداڵێك کە لەکێڵگەیەکی هەژاری نزیك شاری ئورفەوە لەدایکبووبێت و، ئەوەی بۆ رەخسابێت کە ئوچلان لەژیانیدا بەدیهێناوە، بە خاڵێکی گەشی رژێمی تورکیا دادەنرێت کە ئاپۆ دەیویست بیڕوخێنێت. ئەوانەی لەزانکۆوە دەیناسن دەڵێن:ئەو تا پاچە رادیکالییەکان لەسەر ململانێی توندو هەڵچوونە سیاسییەکانی کۆتایی حەفتاکان، کە بزووتنەوەی قوتابیانی تورکیای تێکەوتبوو، لێی بێزار نەبوون، پێوەندی بە بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردەوە نەکردبوو.

دوودڵیتی ئاپۆ بۆچوونە ناو بزووتنەوەی کورد، بەرهەمی نیو سەدەی سیاسەتی تواندنەوە بوو کەکۆماری تورکیا، یەکبینە نکوڵی لەبوونی زمان، یان کلتوور، یان پێناسەی کورد دەکرد. ئۆجەلان ئەنجامەکانی ئەوەی باسکرد، وتی: "تورك وایان لێکردین کە لەئاژەڵ کەمتر بین"، راستییەکەی، تا کوشتارەکەی سەدام حسێن نەکرابوو، زۆربەی کورد بەو داپڵۆسینە لەڕادەبەدەرانەی تورکیا دژ بە شۆڕشەکانی کورد کردبووی و، بنەمای راستەوخۆی سیاسەتی تواندنەوەیانی دانابوو، تورکیایان بە دڕندەترین دوژمنی خۆیان دەزانی. ئاپۆ پێیوتم: "کەدەڵێم کوردم دەبێت ئامادەی سەختترین کۆسپی ئەم دونیایەبم، بەچاوی خۆشم یەك بەیەکی دەرگاکان ببینم کە بە دوای یەکدیدا بەڕوومدا دادەخرێن".

پێدەچێ ئەم گرفتانەی کۆن بن و ئێستا دوای ئاپۆ کەوتن-- ن هێشتا پاشماوەی کۆنی تیادا مابێتەوە- چونکە زۆر بەدڵ پێیوتم: "من بەهێزترین پیاوی کوردستانم" و بەبێ هیچ سێ و دوو کردنێکیش، دەیوت: " گەلی کورد بەپێغەمبەرم دادەنێت". لای ئەوەشی لێیەدا کە پارتەکەی ئەو گرنگترین پارتی سیاسیانەی کوردەو، تەنیا پارتێکیشە کە کورد باوەڕی پێهێنابێت، چونکە سەربەخۆیی تەواو دەبێت لەتورکیای ئاوێت و، خۆی بە قەرزاری هیچ هێزێکی دەرەکیش نازانێت. بەلای ئاپۆوە، خراپترین هەڵەی پارتە کوردییە پێشبڕکێکەرەکانی پارتەکەی ئەو، جا لەتورکیادا بن، یان لەعێراق، یان لە ئێران، یان پەرتوبڵاوەکانی دونیا، پشتبەستنیانە بە هێزە دەرەکییەکان.

بەڵام دۆستایەتییە نزیکەکەی ئاپۆو "جەمیل ئەسەد"ی برای "حافز ئەسەد"ی سەرۆکی سوریاش شاراوە نەبوو، بۆیە کەلەبارەی جۆری پشتگیریکردنەکەی سوریاوە پرسیارم لێکرد شەرمەزاربوو- سەیرەکە لەوەدابوو کە یارمەتی لەسەدام حسێنیش وەرنەگرت ویستی بەتووڕەبوونێکی زۆر خۆی لەپرسیارەکە بدزێتەوە. ئەمجا بەبێمەبەست لەدەمارێکی تریەداو، پرسیاری ئەوەم لێکرد کە داخۆ ژنی هێناوەو، ئەگەر واشە ژنەکەی چ رۆڵێك لەپارتەکەیدا دەبینێت؟ پرسیارەکەم وانەبوو، چونکە ئاپۆ بەلایەنگری یەکسانی نێوان ژن و پیاو ناسرابوو، چەندین ئافرەتیش لەناو پارتەکەیدا هەبوون. پرسیارەکەم هەر بۆئەوە بوو کەباسە ئایدۆلۆژییەکەی بە باسێکی دی بگۆڕم، کەچی لەبری ئەوە، پرسیارەکە وای لێکرد هێرشێکی توندو دوورودرێژی بێسەروبەری وابکاتە سەر ژنەکەی، کەواپێدەچوو لەچینی ناوەند بێت، کەمن تاڕادەیەکی زۆر هەر لەهیچی تێنەگەم. وای تاوانبارەکرد کە بۆ دەستەڵاتدارانی تورك ناپاکی لەم دەکات و، دەستی لەچەند کارێکی دڕندانەی وەشداهەبووە، کەخراپ بەسەر پارتی کرێکارانی کوردستاندا شکابێتەوەو کێشەی بۆ پەیداکردبێت.

بەلای منەوە هەموو ئەو ووردکردنەوانە مانایەکیان نەبوو. چونکە هیچ شتێکم لەوانە نەدەزانی کە ئەو باسیدەکردن، لای من وادەرکەوت کە قسەکانی بوونی گرنێیەکی چەوساندنەوە لەرەفتاریدا بگەیەنێت، من جۆرە شتێکی وام ووروژاندبوو کە ئەو حەزیدەکرد لەبیر خۆی بەرێتەوە، هاوسەرەکەی هەر رۆڵێکی لەژیانی ئەمەو پارتەکەدا هەبووبێت، بەئاشکرا دیاربوو کە لای ئاپۆ سەرابوونەوە. کەقسەکانی تەواو کرد، بۆچەند ساتێك مەترسیم لێنیشت. کەچی لەپرێکدا باسەکەی گۆڕیو، وائەی رەفتار دەکرد هەروەك هیچ رووی نەدابێت. تووڕەیی و پەشۆکانەکەی، سەرنجیان بۆ شتێك بردم کە بەدرێژایی دانیشتنەکە دەمویست دیاری بکەم: ئەم پیاوە تێکسەراوە، بەم دووچاوە ڕەشانەو موو ڕەشیی و سمێڵە پڕەیەوە ستالینی بەبیردەهێنامەوە، کە ئەو زۆر ووردبو شانۆگەریانە، بایەخی بەو شتانە دەدا کەپێوەندیان بەکەس پەرستییەوە هەبوو.

ئاپۆ زۆری باوەڕ بەڕێکسختنی ئایدۆلۆژی و دەرزپێدانی سیاسییانە هەبوو. لەو بنکەیەی پارتەکەی دەشتی "بقاع"یاندا کە بۆ مەشقکردنی سەربازیانە دایانمەزراندبوو، وانەی ئایدۆلۆژی لەبەرنامەی مەشقکردنەکەیاندا شوێنی گرنگی گرتبوو. بەقێزەوە سەیری ئەو خۆبەختکەرە نوێنیانەی پارتەکەیی دەکرد کە لە؛ تورکیا، عێراق، ئێران، سوریا، یان پەرتوبڵاوەکانی ئەورووپاوە دەهاتنە ناو پارتەکەیەوەو بەمەمارەبۆی دادەنان. هەربۆیە مێشکی ئەو جوتیارە لاور قوتابییە زانکۆیانەی لەتورکیاوە دەهاتن و، ئەو کیژە رۆشنبیرانەش کە لەناوچەو وڵاتە دوورەکانی وەك ئوسترالیاو بەلچیکاوە دەهاتنە ڕیزەوە، زاخاو دەدرانەوە. هەرچەندە ئاپۆ لەکاتی قسەکردنەکەیدا وای نەوت، بەڵام زۆر بەڕوونی ئەوەی ئاشکراکردەوە کە خۆئامادەکردنە سیاسی و ئایدۆلۆژییەکان کەچەند مانگێکی پێوە خەریکدەبن، بەلایەوە زۆر لەمەشقکردنی بناغەی تەکتیکی شەڕی پارتیزان و فێرکردن و، خۆگرتن لەبەردەم کۆسپی ژیان و، بایەخدان بەتوانای وەرزشیانەیان باشترە، هەرچەندە بایەخی بەمانەش دەدا. پێدەچوو ئەم پێ داگرتنەی لە بارەی ئایدۆلۆژیاوە جێگای بایەخدانی بووبێت، چونکە زۆر بەئاشیرینی پێی وتم: "سالێك دوای مەشقدانیان، گەر گەریلاکانمان لەشەڕدا زیانی سەدی حەفتایان هەبێت بەلامانەوە باشە"، ئەگەرچی هەرگیز خۆی ناخاتە ئەو مەترسییەوە. با ئاپۆ خۆی وەك پیاوێکی پتەوو خۆگریش نیشانبدات بەڵام لەو کەسانە نییە کەلەشەڕدا سەرکردایەتی جەنگاوەرەکانیان دەکەن. ئەو هەر ماوەیەکی کەم لەدوای سێیەم کودەتا سەربازییەکەی ئەو چەند دەساڵەی دوایی تورکیاوە، وڵاتەکەی بەجێهێشتووەو تا ئەمڕۆشی لەسەربێت نەچۆتەوە.

بەڵام سووربوونی ئەو گاریلا لاوانەی تا کۆتایی بۆ بەگژداچوونەوەی تورکیا دوای کەوتوون، ئەو پزیشک و ئەندازیارانەی لەشاری قامیشلی چاوم پێیانکەوت و لە پیشەکانی خۆیاندا کارامەو لێهاتوون، والێکردووە کە ئاپۆ یان بەدڵابچێت. لەکاتێکدا بەرپرسانی تورك دەیانوت شەڕەکەیان دژی تیرۆرستە، پارتی کرێکارانی کوردستانیش شێوازی دڕندانەو سەرکێشانەی گرتبووەبەر. کارەکانی بەتەنیا هێزەکانی سوپاو دەرەك و یەکە تایبەتییەکانی "کۆنترا" و "پاسەوانانی گوند" یان "جاش"ەکانی تورکیایان نەگرتبۆوە. بەڵکو مەدەنییەکانیشی بەردەکەوت. لەوەتەی پارتی کرێکارانی کوردستان، لەساڵی ١٩٨٤ەوە، لەپێناوی سەربەخۆیی کوردستاندا دەجەنگێ، پیاوەکانی کۆیان لە ژن و مندالّ کوشتن و سووتاندنی قوتابخانەو کوشتنی ئەو مامۆستایانەی مندالّانی کوردیان فێری زمانی تورکی دەکرد نەکردبۆوە. ئەپۆ، بێئەوەی لەمەولەکەیدا سەرکەوتنی باشی بەدەست هێنابێت، دەیویست ئەو کارە دڕندانانەی بەرامبەر مەدەنییەکان دەکران، بەسەر ناپاکاندا بهێنێت، بەوەی کەدەیوت گوایە ئەو ناپاکانەی هاتوونەتە ریزەکانمانەوە کردویانە. هەرچەندە ئەو کوردانەی لەشاری قامیشلی چاوم پێیاندەکەوت و (کوردی شوێنانی تری دونیا)ش بڕوایان بەو پاکانانە نەدەکرد، بەڵام گوێشیان بەزیانە رۆییەکان نەدەدا.

لەوەش دەچوو ئەوەندە گوێ بەتوندوتیژییەکانی هێزی سەربازی تورکیاش نەدەن ساڵ لەدوای ساڵ شەڕی پەکەکە لەدژی تورکیا سەختتردەبوو، تادەشهات هێزەکانی تورك تۆڵە تۆڵەی خراپترین لەکورد دەسەندەوە. لە یەکەم ١٠ ساڵی ئەم جەنگەدا زیاتر لە ١٦ هەزار کورد کوژراو[٤٨]، زیاتر لەهەزار گوندیش تەختکرا یان بەزۆر پێیان چۆڵکراو بەسەدان هەزار کوردی دێهاتەکانیش ناچارکران پروولە،دیاربەکر، ئەدەنە، ئەنقەرە، ئەستەنبوڵ، یان ئیزمیری خۆرئاوای تورکیا بکەن. ئاپۆ پێیوتم: "لەدوای قەڵاچۆکردنەکەی هەڵەبجەوە، لەجاران بەهێزتربووین و، ریزەکانیشمان زۆریان پەرەسەندووە".

لەشوباتی ١٩٩٣دا، دووساڵ دوای چاوپێکەوتنەکەی ئاپۆ، لەرۆژێکی ووشکەسەرمادا چوار دانە سەعات بەرێگایەکی شاخاوی تەسکدا رۆیشتین، کەسووکە بەفرێك دایپۆشیبوو، تا بگەینە سەربازگەیەکی پارتی کرێکارانی کوردستان، کەلەبەری عێراقی سنووری ئێرانیدابوو، لاوانی کورد بۆشەڕکردنی تورکیا مەشقیان تیادا دەکرد. بەتایبەتی لەدووساڵی رابردوودا گۆڕانکارییەکی زۆر ڕوویدابوو. هێزەکانی وڵاتانی هاوپەیمانان بەسەرکردایەتی ئەمەریکا کوێتیان رزگارکردبوو. بەکۆتاییهاتنی ئەو شەڕەش کوردەکانی عێراق راپەڕیبوون و، پاشماوەی

---

[٤٨] سەرچاوەی کوردی تورکیا، تا کۆتایی ساڵی ٩٦ کوژراوەکان بەبیست و سێ هەزار کەس دەخەمڵێنن.

سوپاکەی سەدام حسێنیش دایمرکاندبووەوە، ناچاریکردبوون بەرەو کێوەکان هەڵبێن. دواتر سووریان لەو پارێزگارییەکرد کەهێزەکانی هاوپەیمانان لەئاسمانەوە بۆی دابینکردبوون و یەکەمین هەڵبژاردنی ئازادانەی خۆیان، لەمانگی ئایاری ١٩٩٢دا بۆ دانانی ئەنجوومەنێکی هەرێمایەتی بەجێهێنا. بەڵام ئەو بۆشاییەی بەسەرهاتەکانی ساڵی پار هێنابوویانە ئاراوە زیانی لێدان و سوودی بەپارتی کرێکارانی کوردستان بەخشی. ئاپۆ باکووری عێراقی کردە شوێن پێی گاریلاکانی و لەسنوورەوە هێرشیان دەبردە سەرهێزەکانی تورکیا. ئەمەش لەبەهاری ئەو ساڵەدا، ململانێیەکی لاوەکی لەنێوان ئاپۆو پێشمەرگە عێراقییەکاندا بەرپاکردو بووەهۆی کوشتنی سەدان کەس- کەزۆربەیان لە "پەکەکە" بوون-.

کوردە عێراقییەکان هەوڵی بێهوودەیان بۆ خۆلادان لەو شەڕەدا. چونکە کاروباری ناوچەیەکی وێرانیان دەبردە بەڕێوە کەگەمارۆی ئابووری دراو، کەلەسەر هەموو عێراق دانرابوو، جگە لەوەش گەمارۆیەکی ئابوری بەڕێوەبەرایەتی "سەدام حسێن"یشیان لەسەربوو، کە لەتشرینی یەکەمی ١٩٩١ەوە بەسەر باکووری عێراقیدا سەپاندبوو. بۆیە کوردە عێراقییەکان نەیاندەویست کرژی بکەوێتە پێوەندییەکانی نێوان خۆیان و تورکیا، کەلەکارەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان تەواو پەستببوو. بەڵام لەبەرامبەر ئەوەشدا سەرکردەکانیان حەزیان بەشەڕی برا کوردەکانیان نەدەکرد، بۆیە بەناچارەوە هەوڵیان لەگەڵ پارتی کرێکاراندا دەدا کە کوردستانی عێراق لەدژی تورکیا بەکارنەهێنن. بەڵام لەخۆبایی ئۆچەلان بەڕادەییەک بوو گوێ بەقسەکانی ئەوان نەدا. وای دادەنا کە کوردستان یەکەو بەش ناکرێت و، دانی بەو سنوورەی نێوان وڵاتانی ناوچەکەشدا نەدەنا، هەستییەکرد مافی خۆیەتی هەرچییەکی بوێت بیکات. راستییەکەی ئاپۆ لەڕێی خۆبەخشینی ئەو نیو ملیۆن کوردەی بەوڵاتە ئەورووپاییەکاندا بڵاوببوونەوە، ئەوەندەی پارەهەبوو کەئەوە بەجێبهێنێت، باوەڕی تەواویشی بەوەهەبوو کەلەناو کوردەکانی عێراقدا لایەنە جەماوەری هەیە، کەبەرزانی و تاڵەبانی پرکێشی شەڕکردنی پارتی کرێکاران ناکەن. بەڵام کوردی بەسزمانی عێراق لەهێرش بردنەسەر پارتی کرێکاران و بنکەکانی بەولاوە چارێکی تریان نەبوو، چونکە تاکە دەروازەیەکی ئاراسی دونیای دەرەوەیان بوو، داهاتی گومرگیشیان لەو دەرتە وەردەگرت کەبەشێوەیەکی نایاسایی بۆ ئەنقەرە دەچوو، بەوەش بەڕێوەبەرایەتییە لاوازەکەی خۆیانیان پێبەڕێوە دەبرد،بۆیە لەڕووەوە بەتەواوەتی پشتیان بەتورکیا بەستبوو.

سەرەتا تورکیا بۆهاندانی کوردی عێراق تا تێن بەنە خۆیان و رادەیەک بۆ چالاکییەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان دابنێن،کەوتە بۆردومانکردنی گوندەکانی سنوور. چاودێرە سوپاییە بیانییەکان ئەوەیان تێبینی دەکرد کەفڕۆکە جەنگییەکانی تورکیا بەڕادەیەکی وابەرز دەفڕین و

هێندە بەپەلەش گوزەریانەدەکرد، کەهێزەکەرانەکانیان دڵنیا دەبن لەوەی کەبزوتنەوەکانیان هێزەکەی پارتی کرێکاران یان هێزەکەی کوردی عێراقیان پێکدەهێنێت. بەهەرحاڵ نامەکەی تورکیا ئاشکرابوو، بەتایبەتی کەزۆر لەمێژە تورکەکان ئەوشێوازە بەکاردەهێنن. (ئەوکە جەنگییەکانی تورکیا، لەساڵی ١٩٨٦دا هێزەکانی بەرزانیان لەباکووری خۆرئاوای عێراقدا بۆ ئۆڵە سەنعەتەوە لەچالاکییەکانی پەکەکە بۆتەوەمانکرد، لەتاوەراستی ئابی ئەو ساڵەدا "تورگوت ئۆزال"ی سەرۆک وەزیرانی تورکیا، زۆر بەڕوونی رایگەیاند:" با ئەمە ئاگادار کردنەوەیەکی ئەوانە بێت کەمافەی پاخییەکان دەدەن). کەچی واش تا تورکەکان سنوورییان دانەخست چالاکی پەکەکە هەربەردەوامبوو. دوای ئەوە بەچەند رۆژێکی کەم کوردەکانی عێراق هەڵوێستیان بەرامبەر بەپەکەکە گۆڕی و، سوپای تورکیاش بۆ لێدانی پەکەکە، سەربازێکی زۆری بردەناو باکووری عێراقەوە تا گەمارۆی گەڵیاکانی پەکەکە بدات، بەوەش ئەو قسانە بۆ ئاپۆ چوونەسەر کەپێشمەرگەکانی بەکوردنووشەبەری ئەنقەرە ئاوانبارەدەکرد. ئەم یەکەم پەلامارەی تورکیا، کەبەدرێژایی ساڵانی داهاتوو زنجیرە پەلاماردانێکی دی بەدوادادەهات، واشنتۆنی شەرمەزارکرد، چونکە بەهۆی هاوکاریکردنی هاوپەیمانێکی پەیمانی ئاتۆیەوە "واتە ئەنقەرە" هیچی بەرامبەر بەڕووداوەکە نەکرد، ئەوەش بەرئەنجامێکی چەواشەیی و ئارامییەکی بەپارێزگاریکردنەکەی خۆرئاوای ساڵێکە پێشتری سەر باکووری عێراق دەبەخشی، کەبۆ پارێزگاریکردنی کورد لەصەدام حسێن دانرابوو.

زۆر سەیرە پارتی کرێکارانی کوردستان پێی وابوو پشتگیریکردنەکەی خەڵکی کوردستانی عێراق بەرامبەیەکی وایە، کەسەرکردەکانی پێشمەرگە، لەترسی ئەوەی نەکو بەوەتاوانبار بکرێن کەبۆ لێدانی برا کوردەکانی خۆیان هاوکاری لەگەڵ تورکیادا دەکەن، پرکێشی شەڕ لەگەڵ کردنیان پێناکرێت. پێدەچێ ئاپۆ یان قەوارەی قەیرانی پێشمەرگە عێراقییەکانی نەزانیبێت یان وای بیرکردبێتەوە کەخۆی لەهەلومەرجێکی وادایە، بێئەوەی کەس بتوانێت بەرەنگاری بکات، سوود لەو بەزمە وەربگرێت کە دروستیکردووە. خۆ ئەگەر بەرزانی و تاڵەبانی رێی پارتی کرێکارانی کوردستانیان دا کوردستانی عێراق بکاتە شوێنێکی ئەمین و هەرئەوەیش بکاتە پێگەی دەرچوونی بۆ پەلاماردانی تورکیا، ئەوا قسەکەی لەبارەی "کوردستان یەکە" دەچێتەسەرو خۆشی زیاتر دەچەسپێت. ئاپۆ پشتی بەپێوەندییە تایبەتییەکەی لەگەڵ یەکێتی نیشتمانیدا ئەستووربوو، کە گوایە لەو رێیەوە دەتوانێت کوردی عێراق پەرتبکاتە پێدەچێت لەوەی لەبیرکردبێت کەپارتی دیموکراتی کوردستان و پێدەچێت ئەوەی لەبیر کردبێت کەپارتی دیموکراتی کوردستان زۆربەی ناوچە سنوورییەکانی تورکیای بەدەستەوەیە. بۆیە

کەپارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان، لە تشرینی یەکەمی ١٩٩٢دا، بەهاوکاری و پێکەوە هێرشێکی سەربازیانەی خوێناویان کردە سەر پەکەکەو، بەهاریکاری لەشکرە لەسنوور دووریان خستەوە؛ ئاپۆ هەر بەراستی سەرسامبوو. هەرلەوەش بوونی سەربازگەیەکی مەشقپێکردنی پارتی کرێکارانی کوردستانی بەسەرکردایەتی براکەی ئاپۆ لەم ناوچەیەی کەزۆر لەسنووری تورکیاوە دوورە ئاشکراکرد. تورکیاش بۆئەوەی بیری پەکەکەی بخاتەوە کەدەبێت لە سنوورەوە دووربێت، جاروبار فڕۆکەی بۆ بۆردومانکردنی ئەم سەربازگەیەش دەنارد.

بەنیازی لەنزیکەوە تێگەیشتنی بارودۆخی پەکەکەی دوای شەڕەکەی پایزی رابردووی لەگەڵ کوردە عێراقییەکاندا، کەبووەهۆی دوورخستنەوەیان بۆئەو ناوچە دوورەی بە سەدان میل لەسنووری تورکیاوە دوورە، بەو زستانە کەوتەڕێ. بەدرێژایی شەو بەڕێگەیەکی زۆر باریی و، هەر کەدونیا ڕووناکبۆوە ڕێگام گرتەبەر، تا گەر پارتی کرێکاران دەستیان نا بەڕووەمەوەو چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا نەکردم بۆ ئێوارەکەی بگەمەوە جێگەی خۆم، چونکە پێشمەرگە پاسەوانەکان لەبازاڕی ئاچاخەکە چاوەڕوانیان دەکردم. ئەم گەشتە ئاسان نەبوو، بەتایبەتی نیوەی یەکەمی ڕێگاکە چاڵ و چۆڵ و پێچاوپێچ بوو، دوای دووسەعات سەرکەوتنی چیا، من و مونەیەد یونسی وەرگێڕەو کوردە عێراقییەکەی هاوڕێمان گەیشتینە گوندی "زەلی"، کەگوندێکی بچووکەو بە سنووری ئێرانەوە نووساوەو یەکەم خاڵی پشکنینی پارتی کرێکارانی لێیە.

گەنجێکی کوردی سوریا بەرپرسی سەردانەکەمی، وەک شێوازی ئەو خزمەتکارە جیهانییانەی لەماڵە دەوڵەمەندەکانی سەرەتای ئەم سەدەیەی سەر "شەقامی پێنجەم"[49]دا کاردەکەن، لێوەرگرتم. بەزۆری خۆم ئەوەم پێنووسی کەپێشتر چاوپێکەوتنم لەگەڵ ئاپۆدا کردووە. سەعاتێک رابوردوەهیچ، ئەوەندەم چاوەڕوانیکرد کەوتمە دڵەڕاوکێ و جنێودان. شۆڕشگێڕانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست خۆیان لەشارژنی بەریتانیا زیاتر بە پرۆتۆکۆلەوە دەبەستنەوە، بەتایبەتی کەمن سەردانەکەمم بەپارتی کرێکاران رانەگەیاندبوو، چونکە ڕێگەیەکی وام بۆ پێوەندیکردنیان دەستنەکەوتبوو.

پێدەچوو عوسمانی برای ئاپۆ لەم سەردانەم و بەتەمەنییەکەمی بەلاوە کوتوپڕ بووبێت، بۆیە گوێی بەبانگنەهێشتنەکەم نەداو لەسەر خوانی نیوەڕۆ پێشوازیکردم، ویستی بەوە قایلم بکات کە دواکەوتنم لەهاتنەژوورەوەو مانەوەم لەوبەر سەرمایەدا، خەتای ئەوەیە کە بۆ ناسینەوەم، بەزەحمەت بەبێتەل پێوەندی بەسووریاوە دەکرێت کەبراکەیی لێیە. بەڵام گومانم لەوەهەبوو

---

[49] شەقامێکی بەناوبانگی شاری نیویۆرکە (وەرگێڕ).

کەبۆئەو پێوەندیکردنە خۆی ماندووکردبێت یان ئاپۆ بشمناسێتەوە. لەسەرەتاوە هەستمکرد عوسمان ترسی کەمتری لێدەکرێت وەك لەبرا گەورەکەی. پێشم وایە سەردانی ڕۆژنامەنووسێکی ئەمریکایی لەم سەرماو بەستەڵەکی زستانەدا بۆ ئەوان سوودبەخشتربێت و، بەوەش کەڕەنگە هەواڵی ڕووداوەکانی دونیاشی لابێت، بێزارییان کەمتربکاتەوە.

کاتی گوێگرتنەکەم لەعوسمانی برای، هەستمکرد هەڵوێستی پارتی کرێکارانی پەرەی سەندبێت، چونکە پێدەچوورەستی لەداوا هەرەسەرەکییەکانی هەڵگرتبێت. عوسمان دڵنی بەوەدا نا کەپارتەکەیان، بەھۆی "چەند حساباتێکی چەوتی ئاپۆوە" هەندێ نوشوستی تووش هاتووە. باسەکەی سەر نانخواردنەکەمان وا دۆگماویانە بوو کەمن بیرم لێدەکردەوە لەکەش و هەوایەکی زۆر لەخۆبوردوانەی هەموو ئەو کوردانەشەوە بوو کەنانیان لەگەڵماندا دەخوارد، عوسمان قسەکانی بۆچەند بیروڕایەکی نیوەو ناچڵی مارکسیانە دەبردەوە، کەڕەنگە لەوکۆمەڵە وتارەی ستالینی وەرگرتبێت کەلەژوورە گچکەکەی چاوەڕوانیم تێدادەکرد بەرچاوەکەوت. دووکیژی تێکسەڕاوی کوردستانی تورکیا، بە بەرگی سەربازیانەوە سەرو دەمانچەو نارنجۆك و فیشەکدانیان لەکەمەریان بەستبوو، کاتی نانخواردنەکە، بێنەوەی زەردەیەکیان بێتێ یان قسەیەك بکەن خزمەتیان دەکردین. بێجگە لەکوردی تورکیا، کوردی سوریا، لبنان، عێراق، ئەورووپا و تەنانەت ئوستراڵیاش لەسەربازگەکەدا مەشقیان دەکرد.

لەکاتێکدا عوسمان خۆی هەموورشتێکی خۆشگوزەرانێتی لەو خانووەدا بۆ دابینکرابوو کەدەسال پێشتر، بنکەیەکی سەرکردایەتی نهێنی جەلال تاڵەبانی بوو، کەچی ئەو ١٣٠٠ کەسەی بەرەزامەندی خۆیان هاتبوونە ڕیزەوەو زیاتر لەنیوەشیان ئافرەتبوون، دەبوا لەناو خێوەتدا بووناپەو بەو سەرماو سۆڵەیەش پێلاوی وەرزشیان لەپێدابوایە. پێدەچوو ئەوەشیان بۆئەوە بووبێت کەلەسەر ژیانی سەخت رایانبهێنن، چونکە پەکەکە هەژار نەبوو، سەربازگەکەش لەسەر سنووری ئێراندابوو، هەرچەندە زۆر لەمێژە کورد پێڵاوی خوری وایان دروستدەکرد کەبۆ ناوچە شاخاوییەکانیان و زستانە سەختەکەیان بلوایە. ئەو لاوە کوردانە بەبێ هیچ، قەلاچۆکردنەکەی هەڵەبجەیان کردبووە بنێشتەخۆشەی ژێر دانیان و هەر دەیانوت و دەیان وتەوە، لەویش کاتێك هۆی بوون بە پەکەکەی خۆیانیان باسبکردایە. ئەو ژن و پیاوە نوێیانەی هاتبوونە ژێر سایەی ئالای پەکەکەوە، ببوونە گیانەوەری ئاپۆیانەی مێشك بە ئایدۆلۆژیا ئاخنراو.

مولەیەدی وەرگێڕم کە کوردێکی عێراقی دونیا دیدەو، بەهێمن و لێبووردوو ناسرابوو، کاتێك چاوەڕوانی عوسمانمان دەکرد، لەبیرتەسکی سیان لەئەندامانی پەکەکە، بەتایبەتی لەڕێز نەگرتنەکەیان بەڕادەیەك پەستبوو، لەگەڵیاندا کەوتبووە دەمەتەقێیەکی بێ ئەنجامەوە. ئەو

سیانە لەو ڕێککەوتنە تووڕەی کردبوون کە چەند مانگێک پێشتر لەگەڵ پێشمەرگەدا کردبوویان و، لەخۆیەدەستەوەدانێک دەچوو. ئەو سیانە بێزیان لەو ڕێککەوتنەش دەهاتەوە کە کوردەکانی عێراق لەپێناو پارێزگاری لەو ئۆتۆنۆمییە شلۆقەدا کردبوویان. دەشیان وت ئێستاش یەکەکە پیاوی خۆی بۆناو تورکیا دەنێرێت و دەست لەهێزەکانیان دەوەشێنن، بۆ دزەکردنی گاریلاکانیشیان لەسنووری تورکیاوە بەرتیل بەپێشمەرگە دەدەن تا لەسنووری ئێرانەوە ئاودیوبن و، لەوێشەوە جارێکی دی بەرەو باکوور بینەوەو بەرلەچوونە ناو خاکی عێراق، دیسان سنووری تورکیا ببڕنەوە. (پاشان بۆم دەرکەوت کە یەکەکە، پێشمەرگەی ئەو بازگانەی بەپارە کڕیبوو کەبۆ ئەوە دانرابوون نەهێڵن لایەنگرانی ئاپۆ گوندی "زەلێ" بەجێبهێڵن، بۆیە گەڕانەوەی سەر سنووری هاوبەشی عێراق تورکیایان مسۆگەرکردبۆوە، جارێکی دی کردبوویانەوە بە بەرەدبازو هەر لەوێشەوە هێرشی دژ بەتورکیایان دەستپێکردەوە). هەرچەندە ئەوسیانە هێندەیان وت، پارتی کرێکاران هێزێکی گەورە دەنوێنێت جارسیانکردین، من تا لەدەشتێکی چۆڵ و چەپەکی ئەوچلەی زستانەدا کە نزیکەی ۸۰۰۰پێ بڵندە، کوردێکی ژیرو مێشک کراوەی وەک مونەیەدم نەبینی زمانی کەوتە تەتەڵەو تووشی دەمارگرژی بوو، باوەڕم نەدەکرد.

دوای نیوەڕۆژە، من و مونەیەد، تا لەو ناو شاخانەدا تاریکیمان بەسەردا نەیەت، بەپەلە گەڕاینەوە بۆ ئەو شوێنەی لێوەی هاتبووین. گەڕانەوەکەمان زۆر ناخۆشبوو، چونکە تیشکی خۆر بەفرەکەی تواندبۆوە، ئاچمان بەناوی ئەو جۆگەلانەی کەبەیانی زوو پیایاندا هاتین هێشتا بەستبوویان، ئەمڕۆ قوڕاوی ببوون، بەهۆی نەرمبوونەوەی زەوییەکەو شلبوونەوەی بەفری لاشانی ڕێگاو بانەکەوە مەترسی هەرەسی بەفریشمان لێنیشتبوو، بۆیە زۆر وریایانە هەنگاومان دەنا، لەشوێنێکدا بەتەنیشت گوندێکی چۆڵکراودا ڕەتبووین، کۆمەڵێک ئاڵای سەوزو زەردو ڕەشی شڕوپڕ با دەیشەکاندنەوە، دیاربوو گۆڕستانی ئەو پێشمەرگە عێراقیانە بوو، کەبەدرێژایی ئەو چەند دەسالانەی دوایی بۆ کوردستان جەنگابوون. توند شەکاندنەوەی ئاڵاکان لەبەر بای زستاندا ئارەزووە تایبەتییەکەی کوردی بەبیرهێنامەوە، کەهەندێ جار زیاتر گرنگی بەمردووەکانیان دەدەن و وەک بەزیندوو، ئەمەدەزانی ئەوە هەستێکی تەواو خۆرهەڵاتانەیەو بەچارەنووسی خۆیانەوە بەندە، یان جەسارەتە بێگومانەکەی هەریەک لەو گلاوانەیە کە لەخۆ بەقوربانکەرە لەدوا نەهاتووەکەی کوردستانن.

هەر ساڵێک پێش ئەوە، ڕۆژێکی ناخۆش و گێژاوم لەگەڵ کوڕێکی لاوزی شەرمنی ١٦ ساڵان، کە لەپۆلەتدا هەربە سیانزە چواردەساڵان دەچوو، ئەگەرچی تازەش سمێڵی بۆزکردبوو، تەیمور عەبدوڵڵای ناربوو. کاتێک بەفر کڕێوەی دەکرد لەسلێمانییەوە بەرەو باشوور بەڕێکەوتین، یەک

سەعات زیاتر لەدووی گەڕام تا لە شارێکی چەپەڵی "شارەکانی سەرکەوتن" کەسەدام حسێن دروستیکردبوون، لە دەوروبەری شاری کەلاری نزیك بەسنووری ئێران دیمەوە. ئەوسا وادەزانرا کە تەیمور تاکە کەس بووبێت لەدەست گوللە بارانکەرو پیاوکوژەکانی ئەنفال ڕزگاری بووبێت (دواتر دەرکەوت کەچەند کەسێکی تریش دەربازبوون). لەکاتێکدا پیاوانی سەدام حسێن وبکوژەکانی سەربەستانە بە "کوردستانی ئازاد"دا دەسووڕانەوە، یەکلاییبوو کەژیانی لە مەترسیدایە. بەڵام تەیمور بێئەوەی کەس پارێزگاریبکات، لەناوچەیەکدا دەژیا کەمەر میلێك لەو هێزانەوە دووربوو کە دڕندەیی تۆڵە سەندنەوەکانیان لەهەموو خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا دەنگی دابۆوە.

پێشتر پێشمەرگە چەند جارێك تەیموری بردۆتە شاری سلێمانی تا تەلەفزیۆنە بیانییەکان چاوپێکەوتنی لەگەڵدا بکەن، لەو چاوپێکەوتنانەدا جلو بەرگی تایبەت بە پێشمەرگەو پشتوێنو سەرو جامەدانیو شەروڵی فراوانی لەبەرکردووەو، تفەنگێکیشی بەدەستەوەبووە. سەرەتا وادەزانی تولنای گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەی بەو ڕەوانیو هێمنییە سەیرەی، بەخۆ زۆر ڕاهێنانەوە یان بەو پیاوەتییەوە بەندبێت کەلەناو کورددا باوە. لەماوەی چاوپێکەوتنەکەدا یەکبینە دەستی بەو سۆپا گازییە پچووکە گەرمدەکردەوە کەژوورە ساردەکەی پێ گەرم نەدەکرایەوە، ئەو ژوورەی تەیمور تیایدا لەسەر سەرینێك دانیشتبوو، بەئارامی و بڕوا بەخۆبوونەوەو، بەدەم یاریکردن بەپیاڵەی چاکەیەوە، وەك وانەیەکی کیمیای باش ڕەوانکراو بڵێتەوە، دەنگی لێهەڵدەبڕیبوو. وتی سەرلەبەیانی ئەو ڕۆژەی نیسانی ١٩٨٨، وەك هەموو جارێکی تر ئەو سەربازانەی لە ناوچەکەدا شەڕیان لەگەڵ پێشمەرگەدا دەکرد، هەڵیان کوتایە سەر گوندەکەیان، بەڵام لەبری ئەوەی ماڵەکان بۆ شتومەك کەسانێك بپشکنن کەکاتی سەربازییانە، تا ناچاریان بکەن ببن بەجاش، تەیمور وتی: "درۆیان لەگەڵدا کردین". خۆیو باوکیو سێ خوشکی لەخۆی پچوکتریان لەگەڵ ئەو ٦٠٠ جوتیارەدا دانا کەبۆ سەربازگەی قورەتوویان گواستنەوەو هێندەی تریان گرتبوو سەربازگەکە جمەی دەهات. هەر هەموویان ١٠ دانە ڕۆژ لەهۆڵی گەورە گەورەی بنمیچ بەرزدا گلدرانەوەنەتەوە، تەنیا نانو ئاویشیان داونەتێ. وتی: "هەر لەسەرەتاوە دەترساین بمانکوژن. چونکە دەمانزانی ئەگەر یەکێك لە گوندەی خۆی دوور بخرێتەوە، ئەوا بێگومان ئازار دەدرێت".

ئەمجا بەرەو بۆ بنکەیەکی سەربازیانەی ناوچەی "تۆپزاوا"ی دەرەوەی کەرکوکیان گواستنەوە. لەوێ، پیاوە لەش ساغەکانیان لەژنو منداڵانی خوار هەژدەساڵان جوێکردەوەو هەرچییان لەبەردابووە، بێجگە لەدەرپێو فانیلە، بەزۆر پێیان داکەندوون، ئەمجا کەوتنە سەرو

گوێلاکیانو دەستیشیان کۆتکردنو، بەکاروان بەرەو شوێنو چارەنووسی نادیاریان
کردبوونەتەوە. بەمجۆرە باوکی تەیموورو کۆمەڵە پیاوێکیان سەرەونگومکرد. ١٠ رۆژ دواتر
نۆرەی تەیموور خۆشی هات، بەزۆر ئەوو دایکیو سێ خوشکەکەیو بەسەدان خێزانی تریان
سواری نزیکەی ٣٠ لۆرییەک کردو، بەدرێژایی ئەو رۆژەو بەبێوەستان بەرەو باشووریان بردن.
بەدرێژایی رێگاکەش خواردنو ئاویان نەدراونێو، دەبوا هەر لەناو لۆرییەکانیشدا خۆیان خاڵی
بکردایەتەوە، هەر ئەوانیش نەبوون کەبەو جۆرەیان بەسەر هێنرا. لەخۆرئاوابووندا لۆرییەکان
راوەستان، بەر لەوەی سەعاتە رێیەکی تریش ببڕن، ئاوی خواردنەوەیان دابونێ. کاتێکیش
لۆرییەکان بەمەیجگاری راگیران دونیا بە تەواوەتی تاریکبوو. بەڵام کە دەوریانگرتن تا
هەڵنەیەنو، بەر لەداگرتنیان، تەیموور بەهۆی لایتی لۆرییەکانەوە چاوی بەناوچەکەدا گێڕابوو.

هەر لۆرییەو لەلای چاڵێکی گەورەوە راگیرا، چاڵەکان قووڵ نەبوون. سەربازەکان کوردەکانیان
بەپاڵ بۆسەر رۆخی چاڵەکان برد. خامۆشییەکی تەواو باڵی کێشا،تەنانەت ئەوانەشیان کەلەناو
لۆرییەکاندا دەگریان چرکەیان لێبڕا. تەیموور دەستی دایکیو خوشکەکانی گرتو دانیشت،
نەیوت لەو کاتە بێجگە لەمەرگ بیری لەهیچ شتێکی تر نەکردبێتەوە. بەدەم تێپەڕینی کاتەکەوە
"نەمدەتوانی بیر لەهیچ شتێکی تر بکەمەوە". دوای ئەو ماوەیەی بەلای تەیموورەوە هەر نیو
سەعاتێک بووە، سەربازەکان گوللەبارانیان کردوون، "تاماوەیەکی باش تەقەیان لەهەر شتێك
دەکرد کەجووڵەی تێدابوایە". تەیموور گوللەیەك لەشانی دەدا لەبنهەنگڵییەوە دەردەچێت،
هەرچۆنێکبووە بەچاڵەکەدا هەڵدەزنێت. بەڵام ئەفسەرێك بەسەر سەربازێکدا دەنەڕێنێتو،
دیسانەوە تەیموور بۆناو چاڵەکە تێدەکەنەوەو دەستڕێژی لێدەکەنەوە، گوللەیەکی دی زریکە
لەخوارپشتی هەڵدەستێنێت. هەر کە سەربازەکان چوبوون بلدۆزەر بۆ داپۆشینەوەی چاڵەکە
بهێنن، تەیموور راستدەبێتەوەو لەدووری هەروا شەش پێیەکەوە لەناو لاشە خوێن لێچۆڕاوەکاندا
چاوی بەکیژۆڵەیەکی نەپێکراوی کەمێك لەخۆی گەورەتر دەکەوێت.

"وەرە لەگەڵم" تەیموور هاواری لێدەکات، "نایەم لەسەربازەکان دەترسم" کیژە وای وەڵام
دەداتەوە. بەڵام غەریزەی مانەوە لای تەیموور بەهێزبوو. چاوەڕێدەکات تا ئەو زیلەی لایتی
لێدەدان و بۆ زیندو دەگەڕا تێپەڕ دەبێت، ئەمجا خۆی بۆ دەری چاڵەکە بەکێشدەکاتو
لەکەلەبەرێکدا کە بلدۆزەرەکان لەنزیك چاڵەکەوە دروستیانکردبوو، خۆی حەشاردەدا. هەر کە
لۆرییەك بزربێتایە تەیمووریش چاڵەکەی دەگواستەوەو بەهەمان شێوەی پێشوو خۆی تیادا
حەشار دەدایەوە. کاتێك دەگاتە چوارەم چاڵ، ئەمۆش خۆی دەچێت. کەبەئاگادێتەوە
سەربازەکان لەپڕکردنەوەی هەموو چاڵەکان بیبوونەوە، بەڵام هێشتا لەو نزیکانە مابوونەوە. ئەمجا

تەیمور دووڕیانێک دەبینێت، ئەو ڕێیەی بەنوێی زانیوە دەگرێت، دوودانە سەعات ڕێدەکات تا سەگوەڕێک دەبیستێ، پیاوێکی بیابانشین بەچرایەکەوە لەخێوەتێک دێتەدەرو، دەیباتە ناو خێوەتەکەی.

تەیمور لە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەی بەردەوامدەبێت و دەڵێت:"خوێنم لێدەچۆڕا، عەرەبیشم نەدەزانی و، ئەویش کوردی نەدەزانی". بەدەست ڕاوەشاندن تێیدەگەیەنێت کەبرسییەتی، بیابان نشینەکە خواردنی دەداتێ و، برینەکانی بۆ دەسڕێتەوەو عازیزییەکی عەرەبانەی خاوێنیشی لەبەردەکات. دوای سێ ڕۆژ بەئۆتۆمۆبێل دەیباتە شاری سەماوە. داڵدەدانی تەیمور، لەعێراقی سەدامدا ژیانی بیابان نشینەکەو خێزانەکەشی دەکەوێتە مەترسییەوە. ئەو خێزانە هەر بەوەوە نەوەستان، چەند کەسێکیان تا لەسەماوەدا هیچ گومانێکیان لێنەکرێت، بۆ دەرمان و جل و بەرگی تەیمور سەدان میلیان بەئۆتۆمۆبێل دەبڕی و لەبەغدا بۆیان دەکڕی، بەدرێژایی دوو دانە ساڵ و نیو تەیمور، لەترسی گرتن بەهیچ جۆرێك لەو ماڵە نەهاتە دەرەوە. بەڕادەیەکی واش فێری عەرەبی دەبێت کەخەریکبێت کوردییەکەی لەبیر بچێتەوە، کاتەکەشی بەیاریکردن لەگەڵ منداڵانی ئەو خێزانەدا بەسەر دەبرد، کەنەیانهێشت کەس بزانێ تیایدا دەژی.

کوڕێکی ئەم خێزانە لەزاخۆ، کەشارێکی کوردەو لای سنووری باکووری خۆرئاوای تورکیایە، سەرباز دەبێت، دۆستایەتییەکی بەهێز لەگەڵ سەربازێکی کوردی ناو سوپای عێراقدا پەیدا دەکات، بەڕادەیەکی وا دەبێتە شوێن بڕوای داوای لێدەکات نامەیەك بۆ مامی تەیمور بەرێت. باوکی سەربازە کوردەکە نامەکە دەگەیەنێت. جارێکی تریش خەڵکی ئاسایی کوردو عەرەب، لەپێناو ڕزگارکردنی کەسانێکدا کەهەر ناشیان ناسن، ژیانی خۆیان خستە مەترسییەوە. سەرەتا مامی تەیمور باوەڕی نەکردووە، چونکە پێی وابووەکە براکەی و هەموو ئەندامانی خێزانەکەشی کوژراون. بەڵام بەهەرحاڵ، بە بیانووی کڕینی تراکتۆرێکی بەکارهێنراوەوە، چۆتە شاری سەماوە. ئەو جارەیان تەیموری نەدۆزییەوە. بەڵام لەجاری دووەمدا و کوڕە عەرەبەکە لەگەڵ برادەرە کوردە سەربازەکەی و دووەمامی تەیموردا، بەئۆتۆمۆبێل گەیشتنە سەماوەو، چوبونە ماڵەکەی تەیموریان لابووە، لەنێوە شەوێکی مانگی ئەیلولی ١٩٩٠دا، واتە ماوەیەکی کەم لە دوای داگیرکردنەکەی کوێت، تەیموریان هێنایەوە بۆ کەلار. ئەوساکەو تا ئێستاش لەهەموو شارو شارۆچکەیەکدا، بیست و چوار سەعاتە لەمپەر دانراوە، خەڵکی دەپشکنرێت و، ناسنامە سەیر دەکرێت.

تەیمور وتی:" بەبینینی مامەکانم زۆر خۆشحاڵبووم. بەڵام هێندە لەهەواڵدەران دەترسایین نەمدەوێرا بچمە قوتابخانە". لەو دوا چەند مانگەی تەمەنی ڕژێمی بەعسدا، پۆلیس و هەواڵگرانی

عێراق لەهەموو شوێنێکدا بەتوندی چاودێری خەڵکەکەیاندەکرد. کاتێک خێزانەکە دەستیانکردبووە هەواڵگرانی سەدام عەودالی تەیموورن، تەیمور دەکەنە شوالی بزن و دەیبێنن بۆ چیا نزیکەکان تا حەشاریبدەن، وتیشی، چۆتە بەغدا تا لەچێشتخانەیەکدا شاگردی بکات. دیتر تەیمور تامانگی شوباتی دواتر، دوای رزگارکردنی کوێت، دەگەڕێتەوە بۆ ماڵی مامی. ئەگەرچی تەیموور مامی و سێ پیاوی تریش چەکیان هەڵگرتبوو، بەڵام مامی دەیوت: "سەنگەری پێشەوەی سوپای عێراقمان دەوەندە لێوەنزیکەو، پیاوانی سەدامیش لەهەموو شوێنێکدا هەن، بۆیە هێشتا هەر ترسمان لێیەتی". پەیوەندیکردنیش بەو خێزانەی سەماوەی زۆر چەپۆکی بەعس کارێکی سامناکە، چوونە قوتابخانەش، کە تەیمور زۆری حەز پێدەکات، مەترسی بۆ ژیانی تیادایە. لەپڕێکا تەیمور سەیری وێنەیەکی رەش و سپی باوکی و یەکێک لەمامە کوژراوەکانی کرد، وتی: "من زۆر دڵگرانم، بەڵام هەرگیز ئەو پرسیارەش لەخۆم ناکەم، کەبۆچی دەبێت هەر من ئەو بەختەوەرەبم کەلەمەرگ رزگاری بێت؟ من زۆر ئازار دەچێژم و پێویستم بەپزیشک هەیە". ئەمجا ئۆتۆماتیکیانە، کراسەکەیی هەڵدایەوەو شوێن گوللەکانی لەشی نیشاندام.

کەلەچاوپێکەوتنەکەی تەیمور بوومەوە، زۆر پەشۆکابووم و لەکەمتەرخەمییەکەی سەرکردایەتی کورد سەبارەت بەچارەنووسی تەیمور تووڕەیی دایگرتم، پێدەچوو هەربۆ چاوپێکەوتنە تەلەڤیزیۆنییەکان بایەخی پێبدەن، ئەویش بۆ پروپاگەندەیەکی ڕووت. لەوەشدەچوو بێزارییەکەم خەڵکی تریشی بگرتایەتەوە، چونکە وەرگێڕەکەم بەبێ بیرکردنەوە وتی: "ئەگەر بەدەست من بوایە ئەوا تەیمورم دەکردە کوڵم و دوور دوورم دەخستەوە". بەڵام من یەخەی بەرزانی و تاڵەبانی و هەموو بەرپرسەکانی ترم دەگرت کە چاوم پێیان بکەوتایە، زۆرم لێدەکردن کە تەیمور دووربخەنەوە، چونکە ترکە کەسە لەئەنفالەکان دەربازی بووبێت و لەدۆزەخی سەدام حسێن دەربیکەن و بینێرن لەدەرەوەی وڵات چارەسەریبکەن و بخوێنێت. راستییەکەی من وەک رۆژنامەنووسێک و بیانییەک مافی ئەوەم نەبوو خۆم لەکاروباری کورد هەڵقورتێنم، بەڵام لەوکاتە سارێلکانە وادەزانی سەدام حسێن و رژێمەکەی بەتاوانی کۆمەڵکوژی دادگایی دەکرێن، بۆیە لەوکاتەشدا سەلامەتی تەیمور هێجگار گرنگ دەبێت.

وابزانم ئەو کاتە تەواو شووڵم لێهەڵکێشابوو. کە تاڵەبانی گوێی لەقسەکانم گرت، دەستی گرتم و بردمییە لاوەو لەسەرخۆ پێی وتم: "سەدان هەزاری وەک تەیمور لەکوردستاندا هەن". سەرزارەکیانە پێدەچوو قسەکەی تاڵەبانی هەڵەبێت. ئەمجۆرە بیرکردنەوەیە هەرچەندە ژیرێتیشی تیادابێت ئەوا نووکە تیژەکانی مێژوو، کە "ڕووداو"یان لێناونراون کوڵدەبن و هەموو بەرپرسیارێتییە دیارو زەقەکان ووندەکەن. ئەمەش بەسەر سەدام حسێن و بەرزانی تاڵەبانی و

هەموو ئەو کەسانەشدا دەشکێتەوە کە لەدوو دەسانی رابرووددا ململانێی چەوت و، بێ لێکدانەوە، خوێنیان بۆ دەسەڵات ڕشتووە. بەهەرحاڵ دادگاییکردنی سەدام و دامودەزگاکەی لەسەر ئەو تاوانانەی کردوویانە، بەلای کوردەوە بایەخی خۆی هەرماوە هێشتا شایەتی تەیمور گرنگی خۆی هەیە[**]بەڵام تاڵەبانی لەڕێی ئەو تێبینییەوە دەیویست بەڕێگا تایبەتییەکەی خۆی وام تێبگەیەنێت، کە کوردی عێراق هەر هەموویان تاوانەکانی سەدام حسێنیان چەشتووەو پێویستیان بە ئامۆژگاری بیانی نییە، با نیازیشیان پاك بێت تا لەو شتانەی بگەن کە تەنانەت بەلای ئەوانەوە بەڵگە نەویستن؟. (ڕاستییەکەی چەند ساڵێك دواتر بۆم دەرکەوت کەمام جەلال و "هێرۆ"ی هاوسەری کارەکەیان بەوە براندبووە کە، تەیموریان بردە ماڵی خۆیان و وەك یەکێکی خێزانەکە هەڵس و کەوتیان لەگەڵدا دەکرد. کەسوپای سەدام چووە ناو هەولێرەوە، تەیمور زۆری دی مەترسیان لەسەربوو لەساڵی ١٩٩٦دا دوور خرانەوە، پێشدا بۆ سەر سنووری تورکیاو دواتر بۆ دوورگەی گوام و سەرئەنجام لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا گیرسابووە، ئێستا لەنزیك واشنتۆن دەژی)- ئەو بەشەی ناوکەوانەکە نووسەر لەحوزەیرانی ٢٠٠٠دا زیادیکرد- وەرگێڕ.

دواتر زۆرم بیر لەو وانەیە کردەوە. دووساڵ دوای ئەوەو لەهاویندا سەردانێکی تری کوردستانی عێراقم کرد، کاتی گەڕاندنەوەم بۆ تورکیا، سەری بەرزانم دا تا وێرانکارییەکەی ببینم. چونکە لە سەردەمی دەسەڵاتی عوسمانییەکان و، ئەمجا بەریتانیاییەکان و، حوکمی شایانەی عێراق و، دواتریش هەر هەموو ڕژێمە کۆمارییەکان، جار لەدوای جار بەرزانیان وێرانکردووەو، لەئاکامی مل نەدانە بەردەوامەکەیدا بە دەسەڵاتدارانی ناوەند، بەکۆمەڵ

---

[40] وەك دەریشکەوت جەلال تاڵەبانی و ڕێکخراوی چاودێری ماف مرۆڤ "هیومان رایتس ووچ" دەستپێشکەریانکردو تەیموریان ڕزگارکرد. لەپێشدا لەناو کوردستاندا و دوایی لە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، کە لەگەڵ لێشاوی کوردە عێراقییەکانی دوای چوونە هەولێری سوپای عێراقی ساڵی ١٩٩٦، گەیشتە ئەو وڵاتەو ئێستا لەناوچەی واشنتۆندا دەژی. ئەگەرچی هەندێ نیشی ئاسایی لێرەو لەوێ دەکات بەڵام هیچیان بەو رادەیە نەبوون کە بەشی "تامین صحی"ەکەی بکەن، بۆ چارەسەرکردنی ئەو "کابە"یەی جاروبار دەیگرێت و ئازارە هەمیشەییەکەی پشتی. خەریشی باش نییەو تا ئازاری ٢٠٠٠ ئاواتی چوونەوە قوتابخانەو تەواوکردنی خوێندنەکەی نەهاتبووەدی. لەو ڕۆژانەی دواییدا بەنووسەری ڕاگەیاند کە:" هاتنەکەی ئەمەریکام هەڵەیەکی گەورەبوو، تا ئێستا ناتوانم بەئینگلیزی بخوێنمەوەو بنووسم، کە ئەوەش گرفتە لەڕێی دۆزینەوەی کارێکی باشدا، پێدەچێ وام بۆ نووسرابێت کەلەژیانمدا کامەران نەبم. ئەوەندەشم کاری چەوت لێرە دیوە کەسیش نییە بەدڵ یارمەتیم بدات، ئێستا حەز دەکەم بگەڕێمەوە بۆ کوردستان ئەگەرچی مەترسیشی هەبێت" (سەرنج: نووسەر ئەم پەراوێزەی لە شوباتی ٢٠٠٠دا زیادکردووە "وەرگێڕ")

سزادراون. بەڵام کەسەدام لەسزادانی کورد بۆوە، بەرزانیش، وەك هەزاران گوندی تری کاولکراو بەردی بەسەر بەردییەوە نەما. یارمەتییە خێرخوازانییەکەی ئەڵمانیا، سەد خانوویەکی لەم گوندەدا پێدروستکرایەوە، ئەویش وەك سەرەتایەك بۆ ئاوەدانکردنەوەی ئەو گوندو دێیانەی کۆمەڵگەی کوردو کلتورەکەییان بەرجەستە دەکرد.

کاتێك لەگەڵ دوو دۆستی ئەمەریکاییمدا، کە بۆ یەکەمجار سەردانی کوردستانیان دەکرد، بەناو وێرانەی گوندەکاندا دەگەڕاین، بە عەبدولسەلام بەرزانی گەیشتین، کە لەژێر درەختێکدا خۆی لەگەرمای زیاد لە ۱۱۵ پلەی فەرهانهایتی دەپاراست. ئەم پیاوە بەناوی باپیری کرابۆوە، کەپیاوێکی ناودار بوو، لەسەرەتای جەنگی جیهانی یەکەمدا، عوسمانییەکان بەهۆی پێوەندی نهێنییەوە لەگەڵ ڕووسەکاندا لەسێدارەیان دا. عەبدولسەلام ساڵی ۱۹۲۹ لە بەرزان لەدایکبووە، پاشان بۆتە مامۆستای عەرەبی و ئینگلیزی، بەر لەگەڕانەوەی ساڵی ۱۹۹۱ی بۆ بەرزان ماوەیەکی زۆر لەئێران پەنابەر بووە. شوێنەواری کەنیسەی دیان و کڵێسەی جوولەکەو مزگەوتەکەی بەرزانی نیشاندایـن کەبەرلەوەی بەناڕنجۆك بیانتەقێننەوەو وێرانی بکەن شان بەشانی یەکتر لەوێدا هەبوون، ئەو دیان و جوولەکانەشی چاك بەبیردێت کە زۆر لەمێژە کۆچیان کردووە، عەبدولسەلام دەیوت: "وادەزانم ئەمڕۆیەکە ئیسحاق و کۆمەڵەکەی زەوییەکەی خۆیانیان بەگاجووت دەکێڵا" سەرنجیشی بۆئەوە ڕادەکێشاین کە لەکوردستاندا، جیا لەهەموو شوێنێکی تری ئەم دونیایە جوولەکە ماڵ هەبوو زەوی هەبێت و کاری تیادا بکات.

عەبدولسەلام لەسەر قسەکانی ڕۆیشت و دەیوت: "هەمووەمان پەرۆشی گەڕاندنەوەی تیرەمانبوو" پێشی ڕاگەیاندین هەموو منداڵەکەی کە- هەرهەموویان خوێندەوارن- بە هەموو دونیادا بڵاوبوونەتەوە، هەر لەتارانەوە بیگرە تا دەگاتە شاری ئۆرلاندۆی ولایەتی فلۆریدای ئەمەریکا. لێم پرسی: "بەڵام خۆت گەڕاویتەتەوە، وانییە؟" وەڵامی دامەوە: "بەڵام هێشتا دڵنیا نین و، ترسی دڕندەکەمان هەیە". بەوجۆرە باسی سەدام حسێن و بارە نائارامەکەی کوردستانی دەکرد، کەلەئەنجامی کۆتایی پێهێنانێکی پەسەندی شەڕەکەی عێراق، لەلایەن بوشەوە هاتبوو، ڕاستییەکەی عەبدولسەلام دانی بەوەدانا کە بەدرێژایی ژیانی نەیزانیوە ئارامی چییە.

سەرەتای سییەکان، بەهۆی مەلامستەفای بەرزانی و شێخ ئەحمەدی زۆر بەڕێزو براگەورەی، کەمەندێ هەڵسوکەوتی سەیری هەبوو[51] بەرزان ناوبانگی دەرکردو یەکەم شۆڕشی

---

[51] عەبدولسەلام بەرزانی ئەوەی بەبیرهاتەوە کە جارێکیان یەکێك لەموریدەکان بەشێخ ئەحمەدی وتبوو، خەڵکی ڕەخنەی ئەوەی لێدەگرن کە بۆچی ڕۆژانە نوێژ ناکات و بەرۆژووش نابێت، ئەویش لەوەڵامدا وتبووی "هەر ئەوەندە دەڵێن؟" کە لەعەبدولسەلام پرسی، داخۆ شێخ ئەحمەد مەزەبێکی پێکنەهێناوە، وریایانە وەڵامی

بەخۆیەوەبینی. چونکە بەو پلانەی بەریتانیا قایلنەبوون کە دەیویست ئەو تیرە دیانانەی لەچیا بەرزەکانی "هەکاری" دیوی سنووری تورکیادا دەژیان، لەبەرزان و دەوروبەرەکەیدا نیشتەجێبکات. دیانەکانی چیای هەکاری، لەجەنگی جیهانی یەکەمدا شانبەشانی هێزەکانی ڕووسیا بەگژ تورکیادا دەچوونەوەو ئەوانیش خێرا لەشوێنەکانی خۆیانیان دەرکردن، بۆیە پەنایان بۆناوچەیەکی نزیک دەریاچەی "ئورمێ"ی ئێران برد.

بەریتانیاش بەپێی سیاسەتە ئیمپریالیستییەکەی خۆی، کە کەمایەتییەکانی بۆ دابین کردنی ئاسایش و یاسا بەکاردەهێنا، ئەو جەنگاوەرە شاخاوییانەی بەناوی "لیڤی ئاشووری" پڕچەککرد. ئەوانیش لەزۆربەی شاڵاوە سەربازییەکانی سوپا نوێیەکەی عێراقی ژێر سەرکردایەتی بەریتانیادا هاوکاریانکردو، هێرشیان بۆسەر کورد ـە سەرشکێنەکانیش کرد.

بەریتانیاییەکان کەبەهۆی گۆڕانی بەرژەوەندییە گرنگەکانی ئیمپراتۆریەتەکەیانەوە، دەستبەرداری ئەو چەکدارانەبوون، زۆر خراپ بەسەریاندا شکایەوە. چونکە هەرکەبەریتانیا دوا بڕیاری "کۆمەڵەی نەتەوەکان"ی، سالی ١٩٢٦ی، کە کەرکوکی بە نەوت دەوڵەمەندی عێراقی، بۆخستنە ژێر رکێفی خۆیەوە مسۆگەر کرد، هەرچەندە تورک و کورد هاواریان لێهەستاو پێی قایلنەبوون، ئیتر بۆ دامرکاندنەوەی بزووتنەوەی نەتەوەیی عەرەب، سالی ١٩٣٦ ئینتیدابەکەیی بەنیمچە دانپیانانێک گۆڕی و عێراقی بە دەوڵەتێکی سەربەخۆ ناساند. گواستنەوەی دەسەڵات بۆ عێراقییەکان هیچ پشتگیرییەکی بۆ ئەو چەکدارە دیانانە نەهێشتەوە کە نەعەرەب نەکوردی ئەو وڵاتە خۆشیان نەدەویستن. کوردیش هەستیکرد کە خەون و خواستی بەدیهێنانی ئۆتۆنۆمی یان وڵاتێکی سەربەخۆی نەما. بۆیە گواستنەوەی دەسەڵات و نیشتەجێکردنی چەکدارە دیانەکان لە ناوچە کوردییەکاندا، یەکەم شۆڕشی بەسەرکردایەتی هەردووبرا بەرزانییەکە بەرپاکرد.

لەو سەردەمەی گیانی لێبوردن تیایدا زۆر لەئێستا باشتربوو، دەسەڵاتداران هەردووبراکەو دەست و پێوەندەکانیان بۆ باشووری عێراق دوورخستەوەو، ئەمجا ڕێدان کە لەسلێمانیدا جێگیربن بەڵام چاودێریبکرێن. جالەبەرئەوەی شێخ ئەحمەد سەرکردەیەکی ئایینی و دونیایی بەرزانییەکان بوو، بۆیە مەلا مستەفا لەسلێمانی هەڵات و بۆیەکەمین کەرەت لەساڵی ١٩٤٣دا و، جارێکی تریش لە ١٩٤٥دا ئاڵای شۆڕشی هەڵکرد. بەریتانیایە ماند ـەکانی جەنگی جیهانی

---

دامەوە: "دەبێت ڕاستییەک لەو قسەیەدا هەبێت" ئەمجا ئایەتێکی خوێندەوە،(صلوا ـنکم تـ ـ ـ ) چل ئێمە خۆ بە (تنکرون)ەکە، واتە "پیر لەخوالکردنەوە"کەوە دەبەستینەوە نەک لە "صلاة"ەکە هەندێک دەڵێن دەبێت ڕۆژی پێنج جار نوێژ بکەیت و، لەهەندێ ڕۆژیشدا سێ کەرەت، بەڵام ئەگەر "ئەو" واتە خوات لەمێشکدابێت ئەوا لەکاتی نوســــتندا، ڕۆیشــــتندا، کـــــاردا، هەرچـــــییەک بکـــــەین لەوندایـــــە.

دووەم ئەم هەواڵەیان لانا خۆشبوو، هەڵمەتێکی هێنانەوە سەر رێیان دژ بەکورد کردو، عەبدولسەلام کە ئەوکاتە هەرزەبوو لەگەڵ مامەکانیدا لە شاخەکانەوە بەرەو ئێران بوونەوەو، بەرزانییەکان بوونە پاڵپشتێکی سەرەکی بۆ کۆمارە تەمەنکورتەکەی مەهاباد، کە پلەی ژەنەراڵی بە مەلا مستەفا دا، یەکێتی شۆرەویش پشتگیری کۆمارەکەی دەکرد.

لەساڵی ۱۹٤۷دا ژەنەراڵ بەرزانی، لەبری بەرەو عێراق بکشێتەوە تا بەتاوانی یاخیبوون دادگایی بکرێت، یان لەناو ئێراندا بەتاراوگەیی قایلبێت، کشانەوە نەفسانەییەکەیی بەرەو یەکێتی شۆرەوی جێبەجێکرد. باوکی عەبدولسەلام لەگەڵ مەلا مستەفادا رۆیشت، بەلام عەبدولسەلام و زۆربەی بەرزانی و خێزانەکانیان، بەگەڵ شێخ ئەحمەد گەوتن و بەسنووردا گەڕانەوە بۆ عێراق و خۆیان بەدەست میرییەوەدا. سەرەتا بەرزانییەکان لەکوردستاندا گیران، ئەمجا گواستیانەوە بۆشاری "کەربەلا"ی باشووری عێراق، کەبەلای موسوڵمانە شیعەکانەوە پیرۆزە، لەوێشەوە بۆ بەندەری بەسرەو، دواتریش بۆ بەغدا. لەساڵی ۱۹۵۸دا دەستەلاتدارە شۆڕشگێڕەکان کۆتاییان بەڕژێمی شاهانە هێنا، شێخ ئەحمەدیان ئازادکردو ئەویش هەوڵی بۆ گێڕانەوەی ژەنەراڵ بەرزانی و یاوەرەکانی لەتاراوگەی یەکێتی شۆرەویدا. عەبدولسەلام گەڕایەوە بۆ بەرزان، بەلام باوکی بەشداری شۆڕشی ساڵی ۱۹٦۱ی بەرزانی کردەوەو لە ۱۹۷۵یشدا هەلات بۆ ئێران و، ئەمجا هاتەوە عێراق و بۆ باشووریان دوورخستەوە.

عەبدولسەلام بەدرێژایی ژیانی تەنیا ۱۱ ساڵی لەبەرزاندا ژیاوە، ئەگەرچی هەستیدەکرد ڕوخساوێکی زۆری بە دەستێوەردانی بیانییەکانەوە لەکاروباری کورددا چەشتبێت؛ بەلام سەرکردایەتی کوردیشی بەرامبەر هەڵەکانیان و ئەوەی بەسەر گەلەکەیدا هات بە بەرپرسیار دادەنا. بەسەرەو نگومکردنی ئەو هەشت هەزار بەرزانییەی ساڵی ۱۹۸۳ زۆر نیگەرانبوو، دەشیوت، رەخنەگرتن لەسەرکردەکان باشترە وەك لەوەی کورنوشیان بۆ ببرێت، هەموو ئەوقسانەشی رەتدەکردەوە کە گوایە، ئەو هاوپەیمانێتییەی کورد لەگەڵ هێزە دەرەکییەکاندا کردبوونی کارەساتەکەی بەسەرهێناون. دەشیوت:"ئێمە لەبری ئەوەی گازاندە لەخەڵکی بکەین، دەبێت سەرزەنشتی خۆمان بکەین. کەهاوکاری دوژمنەکانی سەدام حسێن بکەین دەبێ چاوەڕوانی چی لەو بکەین. لەکاتێکدا گەلەکەمان لەژێر سایەی ئەودابوو، گرنگیمان بە بەرژەوەندی تایبەتی خۆمان دەدا، بێگومان گەر ئەو لەتاراندا دەستی لە من گیر نەبێت، بەلام خۆ دەتوانێت ئازارو ئەشکەنجەی ئەوانە بدات کە لەبن دەستیان بۆ ئەگبەتی ناوی بەرزانیشیان پێوەبوو".

فاتمە حەمەساڵح خۆی بەیەکێك لەبەرزانییە بەختەوەرەکان دەزانێ، چونکە یەکێك لەو خانووە ساکارانەی بەرکەوتبوو کە بەیارمەتییە خێرخوازانەکەی ئەڵمانیا دروستکرابوون. فاتمە بەرلەوەی بۆ عێراق بگەڕێنەوە، کە کەس و کارەکەی بۆ مەهاباد دوورخرانەوە، ساوابوو، بەڵام کە کورد هەرەسەکەی ساڵی ١٩٧٥ی بەسەردا هات، ئەو دوا سات بڕیاریدا ئەڕوات بۆ ئێران، وتی: "ئێستەرمان نەبوو، سنووری ئێرانیشمان زۆر لێوە دووربوو، بەزەحمەت بەپێ دەیگەیشتینێ". دەستەلاتدارانی عێراق لەگەڵ هەموو خێزانەکەیدا بۆ باشووری وڵاتیان راگوێزا، دەیوت: "خێزانە کوردەکانیان لەوێ بەجۆرێك دابەشکرد، تا پێوەندیمان بەیەکەوە نەبێت هەر خێزانەو لەگوندێکیان دانایین". پاش پێنج ساڵ رێیاندا کەخۆی و خێزانەکەی بگەڕێنەوە بۆ کوردستان و ناردیاننە شارۆچکەی قوشتەپە.

کەسەدام حسێن لەسەر بەیانی ئەو رۆژەی تەموزی ١٩٨٢، بێئەوەی پێشەکی ئاگاداریان بکاتەوە بەرزانییەکانی گرت، مێردەکەی لای دوکتۆر دەبێت و ناگیرێت، چونکە هەر کەشالاوەکە دەستپێدەکات خۆی حەشاردەدا. بەڵام کوڕە پانزە ساڵانەکەی لەو رۆژەوە ونەو تا ئێستا بێ سەروشوێنە. فاتمە وتی: "پێیان راگەیاندین کەپیاوەکان بچن بۆ کۆبوونەوەو، دوای سێ رۆژی دی دەگەڕێنەوە. بەڵام هەموو دەمانزانی فێڵە. ئەو ژنانەی ویستیان پیاوەکانیان دەربازبکەن بەناوی ئاژاوەنانەوە تەقەیان لێکردن و کوشتیانن. پۆلیسیان بۆ هێنایین و کەوتنە گیانمان، ئاوو کارەباشیان لێبڕین. دوودانە مانگی ڕەبەق یەکبینە هەڵیان دەکوتایە سەرمان تا دڵنیابن لەوەی هیچ پیاوێك دەرباز نەبووەو، پێشیان دەوتین دەبێ هەر لێرەدا بمرن". لە ١٩٩١دا بەپەلە گەڕابۆوە بۆ بەرزان و، دوو دانە ساڵی رێك، بەسەرمای سەختی زستانیش لەچادردا مابۆوە. کە گەڕابۆوە، "هەموو ڕەزو بێستانەکان وێرانکرابوون، گاجووتیشمان نەبوو زەویمان پێ بکێڵایەو کشتوکاڵمان بکردایە". بەهۆی بڕگرکردن و هەڵکەندنی درکوداڵ و خاوێنکردنی زەوییەوە، تا دارسێو، هەنجیر، هەنار، فستق، سەوزەی تیادا بڕوێنێ، دەستەکانی قاژقاژ ببوون. قسەکانی بەمجۆرە کۆتایی پێهێنا: "کۆن بەرزانییەکان لەهەموو کوردەکانی دی زیاتریان چەشت، بەڵام لەم رۆژگارەدا کورد هەمووی ئازارێکی زۆری چەشت".

# پەراوێزەکانی بەشی هەشتەم

## عەلی کیمیاوی

*" سیمون ڤیزنتال"، چاوپێکەوتنی ڤیزنتال. ٣ی ئەیلولی ١٩٩٤. ڤیەنا.

*"قەڵاچۆکردنی ئەرمەنییەکان"، بەپێی بۆچوونی Lord Bryce نزیکەی یەك ملیۆن و ٢٩٦ هەزار ئەرمەنی لەقەڵاچۆکردنەکەدا کوژراوە، بڕوانە:

Howard M. Sacher, The Emergence of the Middle East, 1914 – 1924, New York, pp. 106-107

و کوردە نەتەوەییەکان لەو بڕوایەدان کە نزیکەی ٧٠٠٠٠٠ کوردی تورکیا بەدەستی سەربازە عوسمانییەکان، یان بەهۆی برسێتی و دوورخستنەوە مردبن. بۆ بەڵگەی زیاتری ڕۆڵی کورد لە قەڵاچۆکردنەکەدا، بڕوانە: باڵوێزەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان

J.B. Jackson and leslie A Davis Henry Morgenthau, Ambassador Morgen لە thau s Story, Garden City, New York, 1918 pp. 263,213,276,383,386

*"هەوڵی قڕکردنی تەواو یان بەشێك..." ڕاپۆرتێکی ڕێکخراوی چاودێری ماڵ مرۆڤی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست "هیومان ڕایتس ووچ"ە کە لەشوباتی ١٩٩٤دا لەنیویۆرك، بەناوی Bureaucravy of Repression: The Iraqi Government in Its Owrlds هەرچەندە "تاکە پلانێکی تەواو بۆ بنبڕکردنی کورد" تا ئێستا بەدی نەکراوە، بەڵام هێندە بەڵگەی بەهێز هەیە کە هەوڵی جینۆسایدەکەی حکومەتی عێراق پێبسەلمێنرێ. ئاشکراشە کە پەیماننامەی نەتەوە یەکگرتووەکانی تایبەت بەقەدەغەکردن و سزادانی جینۆساید، کەلە کانونی یەکەمی ١٩٤٨دا مۆرکراوەو لە ١٩٥١دا کاری پێکراو لە ١٩٥٩شدا عێراق مۆریکرد.

*"زۆر بەوریدی ... لەڕاپۆرتەکانی دادگای پشکنینی ئیسپانیا." بڕوانە

Henry Morgenthau, Ambassador Morgenthau s, Story, p.266.

گومان سەبارەت بەڕاستی ئەم بۆچوونەی مۆرگنتاو چەند بۆچوونێکی تریشی پەیدابوو، بڕوانە Heath W. Lowry, The Story Behind Ambassador Morgenthau s, Stor, Instanbul, 1990. کە تیایدا وهاتووە: یادداشتەکان هەمووی پڕوپاگەندەی ئەمەریکابوون،

دوای ئەوەی لە ۱۹۱۷دا ولآتە یەکگرتووەکان جەنگی لە دژی عوسمانییەکان راگەیاند، بەدواکردن و پەیڤزی وەزارەتی لەرموە کردنی. دەشڵێت یاریدەدەرەکانی سور گانتاو ع لەئەستەنبوڵ و ع کاتی رێکخستنی یادداشتەکانی دوای گەڕانەوەی بۆ ولآتە یەکگرتووەکان هەموویان هەر ئەرمەنی بوون و بۆیە بەدامەزراندنی پێوەندییان بە دادگای پشکنینەکەوە، هەموو هۆیەکی رەشکردنەوەی ناوی عوسمانییەکان هەبووە. بەڵام پرسیار سەبارەت بەڕاستی Lowry خۆشی هەیە کە حکومەتی تورکیا بە. گرتنی شوێنێکی تایبەت بۆی لەپرینستون کەوەکو راوێژکارێکی بەکرێنگیراو رێنمایی ئەنقەرە بکات.

*"بێزەحمانە هەرچی پیاو و ... بیانکوژن" لەنامەیەکی هایك ف. سەلاسیان، کە International Herald Tribune ۲۰ی تشرینی یەکەمی ۱۹۹۲دایە.

*"زانیاری نهێنیشیان ... لەکۆمپیوتەر ... پاراستووە"، چاوپێکەوتنێکی "ئازاد عەونی". هەولێر ۲۲ی ئازاری ۱۹۹۱. ئازاد کوردێکە کاتی هێرشە ئاسمانییەکانی ئەمریکای کانونی دووەمی ۱۹۹۱، دوای ئەوەی بۆردومانەکە ژوورەکانی بەندیخانەی خستبووەڕوو و سەنتەرێکی کۆمپیوتەری لەیەکێك لە بیناکانی ناوەوەی وێرانکردبوو، لەوێ هەڵاتبوو.

*""ستازی" بڕوانە: Disappearances and Political Killings: Human Rights Crisis of the 1990s: Atlannual for Action, Amnesty International, London 1994 p.18.

*"بەسەرهاتی خێزانەکەی خۆی"، چاوپێکەوتنێکی ووشیار زنباری. سەلاحەدین. ۱۲ی شوباتی ۱۹۹۲.

*"هەواڵگرانی عێراق" ژەهری مشك گەمەیەکی چەپەڵی سیخوڕە عێراقییەکان بوو کەزۆر کەیفیان پێی دەهات: لەچاوپێکەوتنێکی دکتۆر مەحمود عوسمان و عەدنان موفتی پاریسدا کە لە ۱ی شوباتی ۱۹۹۱ گێڕایانەوە سەرگوزشتەی بالآکەیان گێڕایەوە: لە ۲٤ی تشرینی دووەمی ۱۹۸۷دا مەحمود عوسمانی جێگری سەرۆکی حیزبی سۆشیالیست و عەدنان موفتی یاریدە دەری و برادەرێکی تریان، ئافرەتێکی قەشەنگی کورد کەهاوسەری یەکێك لە پاسدارە سەرەکییەکانی تاڵەبانی بوو مێردەکەی گیراوە، "تالیۆم"ی بۆ لە ماستاو کردبوون و ئەوانیش خواردبوویانەوە، بەڵام رزگار دەبن. دیارە دوکتۆر مەحمود عوسمان و برادەرەکانی ئاگاداری ئ . ئەبوون کەئەو ئافرەتە لەگەڵ هەواڵگرانی عێراقیدا رێککەوتووە، بەرامبەر بەردانی مێردەکەی نیسشیان بۆ بکات. سێ کوردی تریان بەدەم ئازارێکی زۆرو ڕشانەوەوە گیانیان دەدەن. (دڵەکزێ و بڵقکردنی قاچ و دواتریش سەر ڕووتانەوە، دیاردەکانی تالیومن). کۆنە پزیشکێتییەکەی دوکتۆر مەحمود فریایان کەوتبوو، کارەساتەکەی دیاری دەکات، خۆی هەر لەناو عێراقدا دەمێنێتەوەو

بەڵام ئازلیانە سێ کوردەکەی دی بەگوێدرێژ بەسنووردا بۆ ئێران دەگوێزرێنەوەو،پاشان بەنۆتۆمۆبیلی فریاگوزاری بەرەو تاران بۆچارەسەر دەبرێن. ئافەرین بۆ ڕێکخراوی لێبووردنی گشتی نێو دەوڵەتی کەبەزووی "ئەنتیدوتی پرۆسیلی بلو"ی لەئەڵمانیاوە گەیاندنێ بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکەیان، دواییش UNHCR ئاردنیانی بۆ لەندەن سازکرد، کەلەوێش ڕێکخراوی لێبووردنی نێو دەوڵەتی دواچارەسەریانی بەدیهێنا.

پێشمەرگەکان ئەنتیدوتەکەیان گەیاندە دوکتۆر عوسمان لەناو عێراقدا.

عێراقییەکانیش بەڵێنەکەیان بردەسەرو مێردە گیراوەکەیان بۆ بەردا، ئەویش بەو مەرجەی کە هەردووکیان کاریان بۆبکەن. لەڕاپەڕینی ۱۹۹۱دا ژن و مێردەکە لەسلێمانی گیران و دادگاییکران و حوکمی لەسێدارەدانیان دان، بەجیا هەردووکیان لەسێدارە دران.

*"دڕندایەتی عێراقییەکان" بڕوانە: Freya Stork, Dust in the Lion s Talcott Seelye Paw, :London 1962 pp. 141-142 هەروەها سەرنج بۆ نموونەیەکی تر ڕادەکێشێ، کە دەڵێت:"عێراقییەکان ئارەزوویان لەدڵڕەقی و دڕندایەتییەکی وا هەیە کە لەگەڵ دڕزوودەلەسەی حکومەتەکەیاندا ناگونجێت" ئەوەش بەقسەی : The Arabists: The Romance of an American Elite, New York 1992 p. 252

*"ئەمە شێوازێکی شێوێنراوە بۆ پتەوکردنی پێوەندی نێرینەکان" کاربەدەستێکی ئەمنی عێراقی کە بۆ سعودییە هەڵاتبوو دەڵێ: لەچەند بۆنەیەکی ساڵانی ۹۸۵و ۹۸٦ دا خۆی و چەند کاربەدەستێکی سەرەکی تری ئەمن بۆ ئاهەنگێکی سەر -ئەرثار- لەعێراق بانگکرابوون. دوای ئانخواردن و ویسکی و بیرە خواردنەوە چەکیان دابووە هەموویان، چەند جارێک فەرمانی دەستڕێژیکردنی ئەو دیلە چاو بەستراوانەیان پێدرابوو کە پێشتر چاڵیان بۆ هەڵکەنرابوو، قوربانییەکانیان دەکەوتنە ناوچاڵەکانەوەو ئەمجا بە بلدۆزەر دادەپۆشران. چاوپێکەوتنی ئەحمەد چەلەبی "کۆنگرەی نیشتمانی عێراقی" لە لەندەن ۱۰ ئابی ۱۹۹٦.

*"٤۲٤۰ گوندی کورد تا ئەمڕۆ تەختکراوە" گفتوگۆیەکی تەلەفۆنی لەگەڵ شۆڕش ڕەسوڵ لەندەن. ۱۹ی تشرینی دووەمی ۱۹۹٤. لە ۱۹٦۱دا هێزی ئاسمانی عێراقی لایەنی کەم ۱۲۷۰ گوندی کاولکردووە، بڕوانە: Kaplan, The Arabists, p. 215.

*" ئەگەر کلر وابڕوات"، چاوپێکەوتنێکی مەسعود بەرزانی لەشام. ۳ی کانوونی یەکەمی ۱۹۸۷.

*"جەنگێکە هەموو دونیا ڕێزی لێدەگرێت"، بڕوانە: Ginoside in Iraq: The Anfal Compaingn Against the Kurds, Middle East Wath New York p. 111.

*"لەدەرەنیل" بڕوانە: Henry Morgenthau Ambassodor Morgenthau 's, Story, p 196 .

-"ئەگەر وانەکەین"، بڕوانە: Ginoside in Iraq, p. 347

*"من گە نمی نەوانم ناوێت" هەمان سەرچاوە لاپەڕە ٣٤٦ .

*"کێ بەرهەڵستی ئەو کارە دەکات ؟" هەمان سەرچاوە لاپەڕە ٣٤٩ .

*" بۆ دەبوا خۆشگوزەرانم بکردنایە؟" هەمان سەرچاوە لاپەڕە ٣٥٢ .

*"ئەم ژمارەی ١٨٢ هەزارەی ڕووتان پێوەناوە"، چاوپێکەوتنێکی عەدنان موفتی پاریس ٢٨ی تشرینی یەکەمی ١٩٩١ .

" بەشەست هەزار تا ١١٠ هەزار کەسم خەملاندووە"، گفتوگۆیەکی تەلەفۆنی لەگەڵ شۆڕش ڕەسوڵدا ١٩ی تشرینی دووەمی ١٩٩٤ .

*"بەسەدان هەزار کەس"، بڕوانە: Disappearances and Political Killings: Human Rights Crisis of the 1990 s:Atlannual for Action, Amnesty International London 1994 p. 17

دیسان لەبارەی بەزەحمەت دۆزینەوەی ژمارەی ڕاستەقینەی ئەوانەوە دەدوێت کە بەبێ دادگاییکردن لەسێدارە دراون یان گوللەبارانکراون . بەڵام پێویستە بەژمارەی سەرەو نگومکراوان بخەملێنرێن، جا کوژرابن یان لەسێدارە درابن یان دەستبژێر کرابن، ئەگەر هەمووی کۆبکرێتەوە ئەوا دەردەکەوێت کەلە هەشتاکاندا بەسەدان هەزار کەس حوکمی کوشتنیان بەسەردا دراوە .

*"ڕادەیەکی وانگوشنلە"، بڕوانە: National Geogrophic Vol. 182 No2 August 1992 p. 42

*"لایەنی کەم ٦٠ گوندی گازبارانکرد" Ginoside in Iraq: p. 359

*"شەڕی جینۆسایند" چاوپێکەوتنێکی ولیام نیگلتون لە واشنتۆن دی سی. کانونی یەکەمی ١٩٨٦ .

*" پیاوەکانی بەرزانی لەشام"چاوپێکەوتنێکی غازی زێباری . ٦ی مایسی ١٩٨٧ شام .

*"جیگری سەرۆک، تەها محیدین مەعروف"بڕوانە: Interntioal Herald Tribune, November 8-9, 1988

*"بەرماوەی گازی ..."بڕوانە: Ginoside in Iraq: p.xxix

*"گلاسپی بۆی گێڕامەوە" چاوپێکەوتنی ئەپریل گلاسپی لە واشنتۆن دی سی. ٢٢ی کانونی یەکەمی ١٩٩٤ .

*"هیچ زانیاریەکمان... نییە" بڕوانە: Bureaucravy of Repression: The Iraqi Government in Its Owrds, Humen Rights Watch/ Middle East, New York 1994

*"لەسەردانی حوزەیرانی ١٩٨٨یدا"چاوپێکەوتنی جەلال تاڵەبانی . پاریس ٢١ی ئەیلولی ١٩٨٨.

*"بەغدا بەنتەنتی و پەشۆکاوانە" بڕوانە: Bureauc ravy of Repression : TheIraqi Government in Its Owrds, HumenRights Watch/ Middle Eest, Ney York, 1994p. 23 کەبە دووروودرێژی لەتۆمەتی شێواندن دەدوێت، نووسەرەکان ئاماژە بۆ ئەوەدەکەن کە لەکاتێکدا هیچ "تاکە پلاتیکی سەرەکی تەواو" بەدینەکراوە، بەڵگەکان لەژمارەیەکی زۆری فایلەکاندا، بابەپەرش و بلاویش بن، بەلام ڕاستییەکی گونجاو هەر دەردەخەن کە گونجاوییەکەیان بەشەکانی گەمەیەکی گەورەی ئاڵۆز دەنوێنن .

*"وردەکارییەکانی یاسای نێو دەوڵەتی"گفتوگۆیەك بەتەلەفۆن لەگەڵ شۆڕش ڕەسولدا . لەندەن. ١٧ی تشرینی دووەمی ١٩٩٤ .

*"دەربەست کەدەکرێت دادگای ..."بڕوانە: Istvan Deak, Misjudgemont at Nuremburg, The New York Review of Books,

*"ئەگەر واشی دابنێین کەهەندێ کەسی باش لەناو کوردا هەبن"، بڕوانە: Ginoside in Iraq:p. 353

*"کەس ناتوانێت لەکەرکوکەوە بچێت بۆ هەولێر"، سەرچاوەی پێشوو ل ٢٤

*"ئەوانە یاخییەکانن"سەرچاوەی پێشوو لاپەرە ٦٨ .

*" دوونەفەری پلەداری عێراقی دیلەوە"، گفتوگۆیەکی بەتەلەفۆن لەگەڵ شۆڕش ڕەسول . لەندەن . ١٩ی تشرینی دووەمی ١٩٩٤ .

*"تاڵەبانی داوای کردنەوەی کەناڵێکی تایبەتی لێکردم " بڕوانە: Gionoside in IraqLp.349

*"بەلایەنی کەمەوە قوربانییەکانی هەڵەبجەی بە ٢٨٠٠کەس داناوە" گفتوگۆیەك بەتەلەفۆن لەگەڵ شۆڕش ڕەسولدا . لەندەن ١٩ی تشرینی دووەمی ١٩٩٤ .

*"سەرەرای ئەو بەڵگەیەی کەهیچ گومانێکی نەدەهێشتەوە"، ئەم جۆرە باسە لەکتێبەکەی: Stephen C. Pelletere: The Iran-Iraq Warchaosin: in a Vacum, New York, 1992 تۆمەتەکەی کارلایل، کە ئێران گازبارانی هەڵەبجەی کردووە، لەو ڕاستییەوە هاتبوو کەهەندێك لەلاشەی کوژراوەکان لێویان شین هەڵگەڕابوو، کە ئەوە هەر لەگازی سایانیدەوە پەیدا دەبێت کە بڕوا وابوو عێراق ئەو جۆرە گازەی ئەو حاڵەتەی لێنەکەوتنەوە نەبێت، بەلام کەلە ٢٣ی مایسی ١٩٩٣دا Middle East Watch چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ دوکتۆر هاوارد هۆدا کرد کە لەئامۆژگای پزیشکی گشتی لەهارڤارد پرۆفیسۆرە، پرۆفیسۆر هاوارد هۆ ڕوونیکردەوە کەلێو

شینبوونەوە لە: Actyle holines terase in hibitors پشەوە ، کەکار لە "ئەعساب" دەکات و کۆئەندامی هەناسەدانیش ئیفلیج دەکات . (بڕوانە:Ginoside in Iraq :p.26) .
ڕاستیەکەی پاشان توێژینەوە دەریخست کە گازبارانەکەی هەڵەبجەی تێکەڵەیەکی گازی خەردەل و بابەتەکانی دژی ئەعساب و سارین و تابون و x7 کە بۆ یەکەمینجار سەدام بەکاریهێناوە . ١٠ساڵێك دوای هێرشەکە، بەڵگەی ڕەوایی بەوکەسانەی بەرکەوتبوون ونەمردبوون دەرکەوت، کەبەدەست گەلێك دەردی "بۆماوە" وەو پەتای پێست و تەنگەنەفەسی و حالاتی شێرپەنجەی خراپ و لەبارچوونی منداڵ و منداڵی شێواو لەدایکبووی وەك پەرتبوونی زمان و قلیشی لێو ونەخۆشی دڵ و کەموکورتی سییەکانەوە، تووشی گەلێك ناڕەحەتی و زەلیلی ببوون. لەبەرنامەیەکی بەبەڵگەی تەلەفزیۆنی -گواین روبەرتس-دا، کە شوباتی ١٩٩٦ لەکەناڵی چوارەوە نیشاندرا،-کریستین گوسدن- پسپۆڕی "بۆماوە"ی زانکۆی لیڤەر پوڵ ئاکامی باسەکانی خۆی لەناو هەڵەبجەدا، بۆیدەرکەوت کە گازی ژەهراوی ووروژم بۆ DNAدەبات کەکلیلی ژیانەوە کارێك دەکات کە خانەکان بەشێواوی بەشبین .
*خەڵکەکە دەترسن"، چاوپێکەوتنێکی دوکتۆر مەحمود عوسمان . شام ٢٢ی نیسانی ١٩٨٨ .
*"کورد هەمووی دەیزانی" گفتوگۆیەك بەتەلەفۆن لەگەڵ ڕەسوڵدا . لەندەن . ١٩ی تشرینی دووەمی ١٩٩٤ .
*"ز بەڕێز براگەورەی کەهەندێ هەڵس و کەوتی سەیری هەبوو" چاوپێکەوتن لەگەڵ عەبدولسەلام بەرزانی . بەرزان/ عێراق . ٢٣ی حوزەیرانی ١٩٩٢ .
*"یەکێ لەبەرزانییە بەختەوەرەکان"، چاوپێکەوتنی فاتمە حەمە سالح . بەرزان/ عێراق . ٢٣ی حوزەیرانی ١٩٩٢ .

## (٩)

# بوومەلەرزە کۆمەڵایەتییەکەی تورکیا

## "ڕەنگە ئەنقەرە دەریاکەی پیسوشکبکرێت، بەڵام ماسییەکانی پێناگیرێت"

یەشار کەمال

هیچ وڵاتێك وەك تورکیا دوا دەساڵی سەدەی بیستەم خۆی ناخزێنێتە کونجێکەوە، تەنیا مەگەر کوێرانە ملکەچی ئەو بنەما سولوانە بێت کەلەسەری دامەزراوە. گاڵتە جاڕییەکەش لەوەدایە کەئەو کوردانەی پێش حەفتا ساڵ یەکەم قوربانی کۆماری تورکیابوون، ئێستا پێشەوایەتی ڕووخێنەرانی ئەو ڕژێمە خزاوە دەکەن کە کەمال ئەتاتورك دایمەزراند، لەبەرامبەریشدا وڵاتی تورکیا ئامادەنییە دان بە ئاساییترین خواستو داواکانی کورد، لەڕووی کلتووریو ئابوریو سیاسییەوە بنێت، لەگەرچی تورکێکی زۆر بە باشترین دەرفەتی ئەم سەدان ساڵەی دادەنێن کە بۆ وڵاتەکەیان هەڵکەوتبێت، چونکە خەونی دیموکراتییەتێکی عیلمانیو خۆ نەبەستنەوە بە ئاوەندەوە، پەرەدان بەسامانو ڕۆڵی تورکیا لەترسناکترین ناوچەی دونیادا بەباچوو، حکومەتە یەکبەدوای یەکەکانیش ڕالەیەکیان بۆ ئەو شەڕە ناوخۆییە دانەنا، کە لەساڵی ١٩٨٤ەوە لەکوردستانی تورکیادا بەرپابووەو، تابێتیش گرانتر لەسەریان دەوەستێتەوە.

لەڕووی تیۆرییەوە، هیچ کاتێك باری تورکیا لەمڕۆ باشتر نەبووە. بەتەواوبوونی جەنگی ساردو لێکهەڵوەشاندنەوەی یەکێتی شۆرەوی، کە ٢٠٠ ساڵە بۆ یەکەمین جار تورکیا لەبەرڕوو وەستانەوەی ڕووسیای هاوسێی لەخۆی بەهێزتری ڕزگاریبوو. بەڵام بەهیچ جۆرێکیش ولنەکەرتەوە کە تورکیاو دۆستە دەرەکییەکانی دڵیان پێی خۆشبوو، چونکە خەونی بەدیهێنانی سامانو شکۆمەندی کۆماری تورکیای ئاسیای ناوەڕاست، کە تازە لەژێر چەپۆکی مۆسکۆ دەرچووبوو، پووچ دەرچوو. کۆماری تورکیا کە خۆی بە دیارەدە دیموکراسییە عیلمانییەکانو، ڕۆڵی لەپەیمانی ناتۆو، ئەندامێتی چەند دەزگایەکی ئەورووپاییەوە دەربەخستو، تا ملکەچێتی خۆشی بۆ چەمکە تازەگەرییەکانی ئەتاتورك کەبە "کەمالیزم" ناسراوە، بسەلمێنێت،

شارستانییەتییەکەیی خۆرئاوای یەکلاکردبوەوە. بەڵام ڕۆژگار زیاتر "کەمالیزم"ی بەیەکدانەوەی ئایدیۆلۆژیایەکی کۆنی بیانیی، کە لەشۆڕشەکانی فەڕەنساو ڕوسیا، یان لەدەوڵەتییەککرتووەکەی مۆسۆلۆنی، کەلەسالأنی دوای ۱۹۲۳ی دامەزراندنی کۆماری تورکیادا کاریگەرییەکی زۆری کردبووە سەر ئەتاتورك، دادەنا، وەك لەوەی چەمکێکی تازەگەرێیت.

ناڕەزایی خەڵك بەخۆمەڵواسینی لێپرسراوان بەدروشمی دەزگاکانەوە، کەڕۆژانە پووچەڵیان ئاشکراتردەبوو، وایکرد لەهەڵبژاردنەکاندا خۆدووربگرن. تورکیا بەهەموو کەموکورتییەکانی دیموکراتییەکەیەوە، کەلەماوەی نێوان هەردوو کودەتایەکی سەربازیانەدا هەڵبژاردنێکی ئازادو خاوێن‌و فرەلایەنە دەکرا، ئەگەر لەگەڵ هەریەك لە ئێران‌و عێراق‌و سوریادا بەراوردبکرێت، کەبەشێکی گەورەی دانیشتوانەکانیان کوردە، جیاوازییەکی سەرەکی هەیە. لەهەڵبژاردنەکەی کانونی یەکەمی ۱۹۹٥دا، سەدی ٤٦ دەنگی ئەو کەسانەی لەتورکیادا مافی دەنگدانیان هەبوو بەفیڕۆ رۆیشت. چونکە بەشێکی زۆریان هەر دەنگیان نەدا (ئەگەرچی بەپێی یاسا دەبوا دەنگ بدەن) هەندێکیشیان پەڕەی سپییان خستە سندووقی دەنگدانەکانەوە، یان دەنگیان بۆ ئیسلامییەکان یان ئەو پارتە پچووکانەدا کەلەبەر کەمی دەنگەکانیان نەچوونە پەڕلەمانەوە، چونکە مەرجێکی چوونە پەڕلەمان سەدی ۱۰دەنگی دەنگدەرانی هەموو وڵاتە. ڕۆژنامەی "حوڕییەت" کە لەتورکیادا زۆر بڵاوە، بەدڵگرانییەوە سەبارەت بە ئەنجامی ئەو هەڵبژاردنە نووسیبووی، بۆیەکەمین جارە گەلی تورك لەدژی ئایدۆلۆژیای ئەتاتورك‌و دەزگاکانی کۆمار بووەستێتەوە. هیوابڕاوی بەرامبەر ئەنجامی هەڵبژاردنەکە بەربڵاوەیەکبوو، یەکێك لەرۆژنامەنووسەکانی سەر بەڕژێم والیبکات، بڵێت:"حکومەتی هەڵبژێردراو، تورکیا بەڕێوەنابات، بەڵکو دەوڵەت، کەهێزێکی شاراوە بەڕێوەی دەبات، لەپێناو ڕزگارکردنی خۆی‌و -سیستەمە ئایدۆلۆژیا ڕەسمییە-کەیدا کەمێك دەستەڵاتی بەو حکومەتە دەوە کە هەر بەناو حکومەتە نەك بەناوەڕۆك".

سەرەتای تشرینی دووەمی ۱۹۹٦ کارەساتێکی ئۆتۆمۆبیل لەسەر ڕێگایەکی سەرەکی لەدووری ۱۰۰ میل لەباشووری خۆرئاوای ئەستەنبووڵەوە، ڕوویدا، بەڕواڵەت کارەساتێکی ئاسایبوو، بەڵام بەڵگەی ڕاستی قسەکانی ڕۆژنامەنووسەکەبوو، بەجۆرێکی واش بڵاوبوونەوەی گەندەڵی دەزگا دەستەڵاتدارەکانی تورکیای سەلماند، کە نیشتمانپەروەرترین تورك نکوڵی بۆ لێنەدەکرا. لەو کارەساتەدا کۆنە خانمە شاجوانی تورکیاو، دۆستەکی‌و پارێزەرێکی، کەلەدونیای تاوانبدا بوو (لەسەر هەڵاتنی لە بەندیخانەیەکی سویسرا، دوای ئەوەی تاوانی بازرگانیکردنی موخەدەراتی بەسەردا سەلمێنرابوو، ئەنتەرپول لەشوێنی دەگەڕا)و، گەورە لێپرسراوێکی ئاسایش کەلە قەلاچۆکردنە بەدناوەکەی پارتیزانی کوردستانی تورکیادا دەستی

هەبوو، کوژران. بێجگە لە "سادات بۆچاك"ی پەرلەمانتارو دەرەبەگی کورد، کەلەشکری تایبەتی
بۆ پارێزەدانی میری دامەزراندبوو، میریش سەرپێچی یاسای بۆ دەکردو مانگانە تێکڕا یەك
ملیۆن دۆلاری بۆ تەرخاندەکرد، کەسی دی لەکارەساتەکەدا دەرنەچوو. دوکتۆرەکەی بۆچاك
دەیوت، تووشی لەبیرچوونەوەیەکی کەمخایەن بووە، کەلەبەختانی بوو، چونکە هەموو شتەکانی
کارەساتەکەی بەبیر نەدەهاتەوە. کەچی هەر دوای چەند رۆژێك "محەممەد ئاگر"ەی وەزیری
ناوخۆ، کەدۆستێکی سەیری ئەو چوار کەسەبوو، ناچارکرا وازلەکارەکەی بهێنێت. میدیای تورك
بەدرێژایی سێ مانگی ئاینده ڕسواییەکانی ئاشکرا دەکرد. پەردە لەڕووی ئەو ئاسانکاریانەی بۆ
"عەبدوڵڵا چاتلی" دەکران لادرا کە؛ چەك پێدان و، چەکی بێدەنگ و، پاسپۆرتی دیپلۆماتیانەو،
مۆڵەتی رەسمی هەڵگرتنی چەك، نیو دەرزەنێك پێناسەی ڕەسمیانەی بەناوی خوازراو
دەگرتەوە. یەکێك لەو شتە گرنگانەی ئاشکرابوو، چاتلی بەدرێژایی ١٠ دانە سالی ڕەبەق پیاوی
بۆ میری کوشتبوو، ئەمە سەرەڕای رۆڵی بێشەرمانەی سالی ١٩٧٨ی کە ڕێی بۆ هەلاتنی
محەممەد عەلی ئەکسای، بەشکاندنی ئەو بەندیخانەیەی تیایدا بەندبوو خۆشکرد، دواتر هەوڵی
کوشتنی پاپا یوحەنا پۆڵسی دووەمیشی دا. دەرکەوت کۆی هەموو ئەو ڕسواییە جۆراو جۆرانە
لەوەدا خۆی دەنواند کە ئاوانی ڕێکخراو کەوتبووە ناو هێزەکانی سوپاو ئاسایش و حکومەت و
پەرلەمانەوە. هەموویشیان هەر یەکەو بەجۆرێك، چاویان لە بازرگانێتی موخەدەرات و تیرۆرو
خاڵکوژی و لەناوبردنی خەڵکی، کەپیاوکوژە جیهانییەکانی سەر بەئاسایش بەپارە دەیانکردو،
لەباشووری خۆرهەڵاتی تورکیادا لەکوشتنی ٤٠٠٠ کورد بەرپرسیارن، کەئەوانەش بەبێئاگاداری
دادگاو بێئەوەی هیچ لێکۆڵینەوەیەکیان لەگەڵدا کرابێت مەیسەردراوە، گەندەڵییەکی بێ
شوماریش لەپێناو بەرژەوەندی ئەو کەمایەتییەی لەناو دەوڵەتدا دەوڵەتبوون و، هەموویشیان
پێکەوە گرۆکی ناسراوبە "پارتی جەنگ"یان پێکهێنابوو، چاوپرسێتییەکەی خۆیان بە نیشتمان
پەروەرێتییە توندڕەوو خۆ بەکەمالیزم بەستنەوە دادەپۆشی و، ڕێگەی چارەسەرکردنی
سیاسیانەی کێشەی کوردیان نەدەدا. گەورەترین ڕسوایی کۆماری تورکیا مەسعود یەڵمازی
سەرۆك وەزیرانی تورکیای ناچارکرد کەبەشێکی کەمی راپۆرتە رەسمییەکەی بۆ "دایکی هەر
هەموو شەرمەزارییەکان" تەرخان بکات و بیخاتە ڕوو، هەرچەندە لەناونەهێنانی سوپادا زۆر
وریابوو، رۆڵی خۆی زیاتر بۆناو ڕاڵندنی "ئانسۆچیلەر"ی دوژمنە سەرەکییەکەیبوو. لەسەرو
ئەوانەشەوە ئەوەی کەمالییەکانی زیاتر پەستکردبوو بەرزبوونەوەی پارتی "رەفاه"ە
ئیسلامییەکەبوو، کە لەهەڵبژاردنەکەی سالی ١٩٩٦دا بەگەورەترین پارت سەری دەرکردبوو، سەدی
٢١دەنگی سەرجەم دەنگدەرانی وەدەستهێنا کە سێ ئەوەندەی دەنگەکانی هەڵبژاردنی سالی

١٩٨٧ی بوو. ڕەفاه ساڵی ١٩٩٤ بەهەڵبژاردن دەستی بەسەر شارەوانی شارە گەورەکانی وەك ئەنقەرە، ئەستەنبوڵ، ئەزمیردا گرت.

کوردێکی زۆریش تۆڵەسەندنەوە لەپارتە عیلمانییەکان، کە لەسزادانە ناڕەواکەی کورددا بەرپرسیاربوون، باوەڕیشیان بەو بەڵێنانەی ڕەفاه کردبوو کەگوایە کۆتایی بەشەڕە ناهەموارەکە دەهێنێت و، ڕێگاش بەکورد دەدات لەقوتابخانەدا بەزمانی خۆیان بخوێنن و لەڕادیۆو تەلەفیزیۆندا بەکاریبهێنن، دەنگیان بۆ ڕەفاه دابوو. دەستەڵاتدارانی تورکیا لەترسی دەنگهێنانێکی زۆری ڕەفاه، مانگێك بەر لەهەڵبژاردنەکە ڕێیان بە پارتی گەلی دیموکراتی "هادیپ"دا (هادیپ ناوێکی دروستکراوە لەچەند پیتی یەکەمی چەند وشەیەك کە "پارتی"و "دیموکراتی"و "خەڵك"ە پێکهاتووە)، کەدواپارتی کوردی ڕێنەدراوی تورکیابوو ناوی پاڵێوراوەکانی خۆی ڕابگەیەنێت، ئەویش بەو هیوایەی کەدەنگەکانی ڕەفاه کەمبکاتەوە. ئەگەرچی ١٠ ساڵ بەسەر شەڕەکەدا ڕەتببوو. بەڵام هەڵمەتی هەڵبژاردنەکە لەکوردستانی تورکیادا زۆر گەرمبوو. بۆیەکەمین جار ئافرەتی کورد ولزیان لەتەنیا سەیرکردن هێناو چالاکانە خۆیان کوتایە ناو هەڵمەتی هەڵبژاردنەکەوەو، زۆر بەچڕی بەشداریان لەو میهرەجانە سیاسیانەدا کرد کە لەدیاربەکرو سەرجەم شارە کوردەکانی تردا، بۆ پێداگرتن لەسەر ڕاگرتنی شەڕەکە سازدەکران[52].

شتێکی تری تازەش سەری هەڵدابوو، بەرژەوەندی بازرگانێتی کەبەشێکی گرنگی تورکیای نوێیە خەریکبوو خۆی لەکۆتی بیرۆکراتییەتی کەمالیزم ڕزگاربکات و داوای ڕژێمێکی هێورتری وای لەتورکیادا دەکرد، کە ئەوەندە ئازابێت ڕادەیەك بۆ شەڕی بەردەوامی کورد دابنێت، ئەوە یەکەمین جار بوو لەتورکیادا ناڕەزایی لەدژی شەڕی کورد بەرزبێتەوە. لێکۆڵینەوەیەك کەساڵی

---

[52] هەرچەندە هادیپ لەدواساتدا ڕێی ڕاگەیاندنی لیستی پاڵێوراوەکانی درا، بەڵام ڕەفاه سەدی ٢٧ی شارە کوردییەکانی هێنا، کەئەوە دووەم سەرکەوتنی ڕەفاهە لەسەرتاپای وڵاتدا، لەوێدا یەکەم یان دووەمی بەدەستهێنا، چونکە لەناوچەرگەی کوردستاندا هادیپ سەدی ٤٥ی دەنگەکانی هەکاری و، سەدی ٢٧ی دەنگەکانی دیاربەکر، کە لەدەنگدەران ڕابوو دەنگدان بۆ هادیپ پشتگیریکردنی کوردایەتی دەگەیەنێت. بەڵام ئەشارەکانی خۆرئاوای تورکیا خراپ دۆڕا، هۆی ئەوەی لەئاستی هەموو وڵاتدا سەدی ١٧ ! دەنگەکانی هێنابوو. دواکەوتنی ناو نووسینی زۆربەی ئەو کوردانەی لەشوێنی خۆیاندا نەمابوون بەهۆی دواکەوتنی ڕاگەیاندنی لیستەکەوە، هەستکردن بەوەی کەدەنگیان بەفیڕۆ دەچێت چونکە زەحمەتبوو سەدی ١٠ی دەنگی هەموو وڵات بهێنێ، مەترسی لەوەی هادیپ پشتگیری پێ کەکەم چەند هاوپەیمانێکی تورکە چەپڕەوەکانی بکات. بۆیە لەئەنجامدا زۆری کوردەکان، بەتایبەتی لەخۆرهەڵات و باشووری خۆرهەڵاتدا کەلەنوێنەرایەتییەکی ڕاستەقینەی ناو پەرلەمان بێبەشکراین.

١٩٩٥ لەلایەن گرنگترین کۆمەڵەی خاوەن کارەکانی تورکیاوە کرابوو، وای نیشاندەداکە کورد، بەپێچەوانەی ئەوەی دەوڵەت و پارتی کرێکارانی کوردستان دەیڵێن، سەربەخۆییان لەتورکیا ناوێت، بەڵکو مافی سیاسییانەو بەدیهێنانی یەکسانیان بەتورکەو، گەشەکردنی بەشارە کوردنشینەکان، کەزۆر لەمێژە پشتگوێخراون و پەرەیان پێنەدراوە، دەوێت. ئەگەرچی هۆی بەجەرگێتی خاوەن کارە تورکەکان (یان راستتر بڵێین بۆچی بەدرێژایی ساڵانی رابردوو پڕکێشی ئەو هەڵوێستەیان نەبووە؟) تا ئێستا ئاشکرا نییە. بەڵام هەوڵدانیان بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان بگرەو بەردەیەکی سیاسیانەی لەبارەی کێشەی کوردەوە خولقاند.

دیاربوو ئەو سەرکەوتنانەی تورکیا لەساڵانی رابردوودا، لەبوارەکانی بانک و، پیشەسازیدا، هەر لەچنینەوە بیگرە تا دەگاتە ئۆتۆمۆبیل و سەلاجەو هەموو پیشەسازییەکانی دی بەدەستی هێنابوو، بەهۆی دەستەپاچەیی حکومەت لەدۆزینەوەی رێگا چارەیەکی ئەو شەڕە درێژخایەنەدا، لەمەترسیدابوون. هەڵوێستی خاوەن کارەکانیش یەك نەبوو، هەر کەئەنجامی هەڵبژاردنی پەرلەمان راگەیەنرا، لەترسی ئەوەی ئەوەك رەفاە دەستەڵات بگرێتەدەست، هەوڵی خۆیان خستە پاڵ دەزگا سەربازییەکەوەو، هەردوولایان گوشاری توندیان خستە سەر پارتی "نیشتمانی دایك" کە مەسعود یەلماز سەرۆکایەتی دەکردو، پارتی "رێگای راست" کە تانسوچیلەر سەرۆکایەتی دەکردو (هەردووکیشیان کێبەرکێی یەکتربوون، بەڵام لەدژایەتی پارتی رەفاهدا رێکبوون)، تا حکومەتێکی فرەلایەن پێکەوە دابمەزرێنن. دوای دوومانگ بگرەو بەردەو هێنان و بردن، حکومەتێکی لاواز هاتەکایەوە، تورکێکی زۆر پێیان وانەبوو ئەو حکومەتە زۆر بخایەنێت یان پێنج ساڵی ماوەی پەرلەمانە نوێکە، لەسایەی ئەو رێککەوتنەی کەسەرکردەی هەردوو پارتەکە بەنۆرە سەرۆکایەتی وەزیرانبکەن، پێکەوە بەسەربەرن و رێگەچارەیەکیش بۆ کێشەی کورد یان هەموو ئەو شتانەی بەرەوڕووی تورکیا بوونەتەوە بدۆزنەوە.

هەر لەبەرئەوەش تورك و کوردێکی زۆر گومانی قوڵیان بەرامبەر ئەو بە راستییەتە هەبوو کە حکومەتە پێکەوەییەکەیان راگەیاندبوو، گوایە دەیەوێت گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی لەسیاسەتی خۆیدا بەرامبەر بە کورد بکات. دوای تێپەڕبوونی ماوەیەکی کەم بەسەر سەرۆکایەتییەکەی مەسعود یەلمازدا- کەیەکەمجار ئەو سەرۆك وەزیران بوو- لەئازاری ١٩٩٦دا گرنگی بەنەورۆزی جەژنی سەری ساڵی کورد دا، کە کەمالیزمەکان لەو ساڵانەی دواییدا بۆ ئامانجی تایبەتی خۆیان کردبوویانە جەژنێکی تورکانە، پەیمانی "نزیکبوونەوەیەکی نوێ"ی دیاری نەکراوی دا، کە کۆتایی بە ٩ ساڵی شەڕو باری نائاسایی کوردستانی تورکیا دەهێنێت. لەکۆبوونەوەیەکی گشتی پەرلەمانیشدا رایگەیاند کە "گەیشتوینەتە ئەو باوەڕەی ئەم کێشەیە بەشێوازی ئاشتیانە نەك

سەربازیانە، چارەکرێت". یەلماز یەکەم سەرۆك وەزیرانی تورکیا نەبوو کەلەکاتی دەستەڵات وەرگرتنەکەیدا بەڵێنی وا بدات. خۆ ئەو بەڵێنەشی کەسەبارەت بە بەکارهێنانی زمانی کوردیو نەهێشتنی باری نائاسایی سەر کوردستانی تورکیا دای وای نەدەگەیاند کە بۆ چارەسەری ململانێکە دانوستانیان لەگەڵدا بکات.

بەهەرحاڵ لەحوزەیرانی ئاییندەدا، کەنەجمەدین ئەربەکانی سەرۆکی پارتی ڕەفاه تۆڵەی خۆی لەوانەی کەنەیانهێشت دەستەڵاتبگرێتەدەست سەندەوە، حکومەتە پێکەوەییەکە ڕووخا. ئەوەی پەلەی لەڕووخاندنی حکومەتەکەداکرد، پارتەکەی ئەربەکان، "چیلەر" (کە یەکەم ئافرەتە سەرۆکایەتی وەزیرانی تورکیا بکات)یان بەوە تاوانبارکرد کە لەهەڵبژاردنەکەی ۱۹۹۵دا ٦,٥ ملیۆن دۆلار بەرتیلی وەرگرتووە.

کەچی ئەوکارە، لەسایەی بێڕەوشتی سیاسیانەی تورکیاوە، نەبوو بە کۆسپ لەوەدا کە دوای ماوەیەکی کەم چیلەرو ئەربەکان ڕێکبکەونو حکومەتێکی نوێی پێکەوەیی دابمەزرێنن، کە بەپێی ئەو ڕێککەوتنە، لەوەتەی ئەتاتورك کۆماری تورکیای لەساڵی ۱۹۲۳دا ڕاگەیاندووە، یەکەمینجارە سیاسەتمەدارێکی ئیسلامی سەرۆکایەتی حکومەتی ئەو دەوڵەتە عیلمانییە بکات. چیلەر لەپڕ وازی لەوەهێنا کە بەئاشکراو بێپەردە، وەك بەربەستێك لەبەردەم ئیسلامی سیاسیدا ڕابوەستێت، کەچالاکانە لەواشنتۆنو سەرجەم پایتەختەکانی تری وڵاتە خۆرئاواییەکاندا بڵاویدەکردەوە. ئەربەکانیش تا ترسو گومانی دەزگا سەربازییەکە بڕەوێنێتەوە، هەر لەسەرەتاوە ئەو توندڕەوییەی لەئاستی، کورد، دەوڵەتە عیلمانییەکەی تورکیا، کێشە سیاسییە سەرەکییەکانی دیدا پێی ناسرابوو، کەمکردەوە.

هەرچەندە ئەم وریاییەی لەشوێنی خۆیدابوو بەڵام سوودی نەبوو. ڕێك ساڵێك دواتر سوپا بەزۆر دەستەڵاتی لە ئەربەکان سەندەوە، دواییش لەکانونی یەکەم دا لەسەر توانجگرتن لەکەمالیزم، پارتی ڕەفاه قەدەغەکراو، یەلماز بۆوە بەسەرۆك وەزیرانی حکومەتێکی فرەلایەنی لاواز. بەڵام ئەویش کەوتە ژێر گوشارێکی زۆرو ڕوو لەزیاتری هێزەچەکدارەکانو، جا چونکە یەلمازیش دەیویست ڕێ لەپەرەدانە ئیسلامییە سیاسیانەکە بگرێت، بەچاوی سووك سەیرەکرا. لەمانگی حوزەیرانی ۱۹۹۸دا، کە حکومەتە فرەلایەنەکەی لەبێهێزیدا بوو بەبێ هیچ بەرهەڵستییەك ناچارکرا بە هەڵبژاردنێکی پێشوەخت، لەساڵی ۱۹۹۹دا، واتە ساڵێك پێش کاتەکەی خۆی.

لەسیاسەتدا هێما ڕۆڵی گرنگی خۆی هەیە، بەڵام زۆرجار ناتە .ئەوەی باشو سوودبەخشیش لەباردەبات. شۆڕشی فەڕەنسا کە بەلای ئەتاتورکەوە زۆر پیرۆزبوو، تورکیای

بەلای یەعقوبییەتدا[٥٢] داشکاندو، وایلێکرد بەلای بیروڕای دەوڵەتی عیلمانی ئارەندی توندڕەوی وادا بکەوێتەوە توانای یەکخستنی کۆمەڵە گەلێکی جیاوازی هەبێت و، لەسەر حسابی کلتورو، زمان و، ئاین و، تایبەتمەندێتی هەر یەکەیان، لەقەوارەی دەتەوەییەکدا بیانتوێنێتەوە. چونکە بەلای ئەتاتورکەوە یەعقوبییەت تاکە هاوکێشەیەکی پێویستبوو بۆ تورکیای دوای یەکەم جەنگی جیهان و مۆرکردنی پەیمانی سیڤەر، کەبە گوشاری، یۆنان، ئیتالیا، ئەرمەن، تەنانەت کوردیش دەیانویست پاشماوەی وڵاتی ئەنادۆڵ پەرت پەرتبکەن، تورکیاش پشت لەئیمپراتۆریەتە عوسمانییە بەدڕاکەی ئەردەمەبکات. لەکاتێکیشدا کەپەیمانی سیڤەرو، پێشتریش ئەو دیاناتەی سەدەی نۆزدەیەم دەنێردران و خۆیان لەکاروباری وڵاتی عوسمانی بەرادەیەك هەڵدەقورتاند کەترسێکی زۆریان لەڕیزی تورکدا پەیداکردووە، ئەمڕۆش زۆربەیان ئەو پارێزگاریکردنەی ئەمەریکای کورد بەوە تاوانبارەدەکەن و بەو پیلانە کۆنەی دادەنێن کەمەبەستی داتاشینی تورکیا بێت.

ڕژێمی تورکیا بەئاشکرا وەك دەمارە خوێنبەرەکانی ڕەقبووبن، بەدرێژایی ساڵانی دوایی وێنەو پەیکەرەکانی ئەتاتورك، کە بەزۆر لەسەرتاپای تورکیادا چەقێنرابوون، هێمای دوودڵی هەر گۆڕانکاری و چاکسازییەکی پێویستی بنەماسیاسییەکانیان، لەپێناو مسۆگەرکردنی مانەوەی دەوڵەتەکەی ئەتاتورکدا دەگەیاند. جا چونکە تورکیا دیلی سیاسەتێکی داخراوی ماوەیەکی دوورودرێژ بوو، نەیدەویست کۆمپانیا حکومەتییەکان تایبەتمەند بکات کەبەردەوام لەبری سوود زیانیاندەکرد،یان ناناوەندییەتییەك بخاتەرژێمە سیاسییەکەی و دەزگا بەڕێوەبەرایەتییەکانییەوە، هەرچەندە گەندەڵی و بێکارامەییش ببونە خۆرەو تێیاندابوو، کەچی بەرامبەر بەکورد توندو تیژی بەکاردەهێنا.

دوای نزیکەی نیو سەدە ئلدان، کوردستانی تورکیا لە ساڵی ١٩٨٤ەوە، زنجیرە چالاکییەکی چەکدارانەی پچووکی بەخۆوە بینی، کەئەندامانی پارتی کرێکارانی کوردستان بە سەرۆکایەتی عەبدوڵلا ئۆجلان، لەبنکەکانی سوریایانەوە، بەرلەوەی بۆ عێراق و ئێران بگوێزرێنەوە، دەهاتن و دەیانکرد. سەرەتا لە سەر سنوورەکانی تورکیاو، بەڵام زۆری نەبرد، هەموو ناوچە کوردییەکانی خۆرهەڵات و خۆرهەڵاتی باشووری گرتەوە. گەریلاکانی پارتی کرێکارانی کوردستان دڕندانە کەوتنە تیرۆرو لەکوردستانی تورکیادا کۆیان لەتۆقاندن و کوشتنی خاوەن زەوی و مامۆستاو پیاوانی تری سەر بە ڕژێم نەدەکرد، ئەمە بێجگە لە کوردی ئاسایی و ژمارەیەکی زۆر لەژن و منداڵانی "جاشەکان". وەك هەموو ئەو لایەنانەی کەیزەی جەنگ دەبن و پارەی بەڕێوەبردنی

---

[٥٢] یەعقوبییەت، کۆمەڵێکی سیاسیانەی توندڕەوی ڕۆژانی شۆڕشی فەڕەنسابوون و، بەتیرۆر ناویان دەرکردبوو

جەنگەکەیان نییە، پارتی کرێکارانیش بۆ دابینکردنی پارەی جەنگەکەیان، لەئەورووپای خۆرئاوادا کەوتە قاچاخچێتییەکی بەرفراوانی هێرۆین[54] لەساڵی ١٩٨٧ەوە، سەرەتا باری نائاسایی لە ١٠ شاردا، دواتریش لە ١٣ شاری نزیک یەکتری خۆرهەڵات و باشووری خۆرهەڵات ڕاگەیەنرا؛ کەماوەی نێوان ساڵانی ١٩٢٥ و ١٩٥٠ و لە ١٩٦٠ەوە بۆ ١٩٦٣ و، ئەمجا لە ١٩٧٠ەوە بۆ ١٩٧٤ هەمان ناوچە لەباری نائاساییدابوون (ئەگەرچی لەساڵی ١٩٩٨ دا سوپا وای ڕاگەیاند کەچەکدارەکانی کەلاخستبێت، بەڵام بارە نائاساییەکە لە ٦ شاردا هەر بەردەوامبوو). لەساڵی ١٩٩٠دا خاوەن دەسەڵاتێکی ڕەها بۆ کوردستانی تورکیا لەشاری دیاربەکر دانرا، دەسەڵاتی دەستبەسەرداگرتنی هەموو ئەو بڵاوکراوانەی درایە کەئەنک هەرلە چاپخانەکانی کوردستاندا دەردەچوون، بەڵکو لەسەراپای تورکیادا، مافی گواستنەوەی فەرمانبەرە حکومەتییەکان و ڕاگوێزانی دانیشتوانی گوندە کوردییەکانیشی پێدرا کەچۆن خۆی ویستی بیکات. ڕۆژنامە سەرەکییەکانی تورکیا و بێگومان شۆڤێنییەکانیش، چەند شتێکی کەمی لێدەرچێت، هەرئەو شتانەیان بڵاودەکردەوە کەلەدەسەڵاتداری گشتییەوە دەردەچوون، بۆئەوەش پێویستییان بەگوشارێکی زۆر نەبووە تا چاودێرییەکی خودی لەسەر هەواڵەکانی کوردستانی تورکیا دابنێن، بەتایبەتی کە لەدەستبەسەرداگرتنی چاپخانەکانیاندا هەبوو (دیسانەوە چەند شتێکی زۆر دەگمەنی لێدەرچێت، ڕۆژنامە خۆرئاواییەکانیش لەرۆژنامە تورکیاییەکان باشتر نەبوون). سەرەڕای چەند گۆڕانکارییەکی کەم کەلەساڵی ١٩٩٢دا بەگوشاری وڵاتە خۆرئاواییەکان کران تا ئارایشتی سیستەمە دڵڕەقە دادوەرییەکەی تورکیا بکات؛ کەچی گۆڕانکارییەکان لەو ناوچانەدا کاریان پێنەکرا کەباری نائاساییان هەبوو. ڕاپۆرتی بەرگریکەرانی مافی مرۆڤ لەکوردستانی تورکیا و، ڕێکخراوی لێبوردنی گشتیی "ئەمنستی ئەنتەرناشیناڵ" و چاودێری مافی مرۆڤی

---

[54] هەر لەکۆنەوە کوردستان بەهەشتی قاچاخچیان بووە، یوکسیکۆڤا لە تورکیا و زاخۆ لەعێراق هەردووکیان بە باشترین مەڵبەندی قاچاخچیان ناسرابوون. پێش شۆڕشی ١٩٧٩ی ئێران، بۆ ڕووخاندنی شا چەک لەباکووری عێراقەوە دەگەیەنرایە دەست ئەو کەسانەی دەیانویست شا بڕووخێنن. بەپێی کاربەدەستانی پۆلیسی خۆرئاوا، لەساڵەکانی ١٩٨٠دا و بەتایبەتی ئەوەتەکاندا، هێرۆین لەئێران و وڵاتە بەرهەمهێنەرەکانی تری ئاسیاوە، لەلایەن چەند دەڵاڵێکی دیاریکراوەوە بە بەرتیل بەتورکیادا دەگەیەنرایە بازرگانەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان لەئەوڵەندا. بازرگانێتییەکەی پارتی کرێکارانی کوردستان لەدونیادا یەکەم دیاردەنەبوو. هەر بۆنموونە بەریتانیا لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمدا، لە ئاکامی ئەوەی "جەنگی ئەفیون"ی پێدەوترا "چین" کە لەو ڕووەوە زۆر گیرۆدە ناچارکرد بەڕووی دەرەوەدا "بکرێتەوە". بەسەر چینیاندا سەپاند کەزۆربەی ئەو ئەفیونەی لەهند دا دەچێنرا، لەرێی بازرگانانی موخەدەراتەوە بکڕێت. لەکاتی شەڕی هندی چینی نێوان ١٩٤٥ و ١٩٥٤دا، فەرەنسا بەشی زۆری نرخەکەی بۆ پشتگیریکردنی شەڕەکە دەدا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاش لەکاتی شەڕی ڤێتنامی نێوان ١٩٦٣ و ١٩٧٤دا هەمان تۆمەتی درابووە پاڵ.

خۆرهەڵاتی ناوەڕاست "هیومەن رایتس ووچ"و، ئەو راپۆرتەی کەلە وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکاوە سەبارەت بە باری ماڤی مرۆڤی سەراپای دونیا دەردەچوو، پۆلیسی تورک‌و میلیشیاکانی سەربە دەوڵەتیان بەوە تاوانبارەدەکرد، کەبێ کۆ هیچ کردنێك ئازارو ئەشکەنجەی کوردی ئەو ناوچانە دەدەن‌و دەشیان کوژن. بە هەزاران کەسیشیان بەناوی گومان لێکردنەوە لێداون بە"دادگای ئاسایشی دەوڵەت" کە بەدڵڕەق‌و جێگرەوەی "دادگاکانی سەربەخۆیی" ئەتاتورکی ساڵی ١٩٢٥ ناسرابوو، کە دوای زاڵبوونی بەسەر شۆڕشەکەی شێخ سەعید، بۆ سزادانی کورد دایمەزراندبوو.

لەسەرەتای ساڵانی نەوەتەوە، ساڵ لەدوای ساڵ قوربانیانی شەڕی کوردستانی تورکیا چەندین قات زیادی کرد، تا لەناوەڕاستی ١٩٩٦دا کۆی قوربانییەکان لەبیست هەزار کەس نزیك بیوونەوە، زۆربەشیان خەڵکی بێچەك‌و بێوەی بوون. تا ساڵی ١٩٩٤ بەهۆی کوشتنی چەند مامۆستایەکەوە کەپارتی کرێکارانی کوردستان لەسەر بڵاوکردنەوەی کولتورە ڤیزەوونەکەی تورك بەناو کورددا کوشتبوونی،. یان میری نەیتوانیبوو ژمارەیەکی وایان بۆ ناوچەکە لێدابینبکات، چونکە لەترسی گیانی خۆیان ئامادەنەبوون لەکوردستاندا مامۆستایەتی بکەن، نزیکەی چوار هەزار قوتابخانەیەك داخران. لەکۆتایی ئەو ساڵەدا، کە شەڕەکەو رەفتاری هێزەکانی میری بەبێئارامییەکی وایان لەناو خەڵکەکەدا بڵاوکردەوە، زیاتر لە٢٦٠٠دێ‌و گوندی پچووك[٥٥] چۆڵکران‌و، نزیکەی دوو ملیۆن کورد بەسەر شارە نزیك‌و دوورەکاندا دابارین، چونکە

---

[٥٥] ژمارەی تەواو بەهێنییەکی سوپا دادەنرێت‌و، ئاشکرا ناکرێت. کوردە چالاکەکانی ماڤی مرۆڤ، سیاسەتمەدارانی کوردو، ئاکادیمییە تورکەکان‌و، سەرچاوە خۆرئاواییەکان بەدیپلۆماتەکانیشیانەوە، خەمڵاندنی جۆراوجۆرو لێکەوە دووریان هەیە. "ناهید مینتسی" وەزیری ناوخۆ، لە ٢٧ی حوزەیرانی ١٩٩٥دا بەپەرلەمانی راگەیاند، کەنزیکە ٢٢٠٠ گوند بەتەواوەتی یان بەشێکی کاولکراوە، ١٩٠٠٠ کەس بەسەربازی‌و مەدەنییەوە کوژراون‌و ٢٠٠٠ کەسێکیش لەبارێکی نائاشکرادا کوژراون. بەڵام ئاماری ڕەسمی کەلەتەموزی ١٩٩٥دا ئاشکراکراو، لەسەرەتای شەڕی کوردستانەوە تا کۆتایی ١٩٩٤ دەگرێتەوە، دانی بە راگوێزانی ٢٦٦٠ گوندی کوردا ناوە. لەمانگی شوباتی ١٩٩٦یشدا خەمڵاندنێکی وام دەستکەوت کە لە ٢٧٠٠ تا ٢٣٠٠ گوند راگوێزرابێت. هۆی ئەو جیاوازیانەش بۆ جیاوازی سەرنجدانی کۆمەڵی کوردەواری دەگەڕێتەوە، کەلەژمارەیەکی زۆر گوندۆکە راپێکهاتوون کەبەبەشێك لەگوندی گەورەتر دادەنرێن. *(نووسەر لە ٢٠٠٠/٦/١٧) دا لەم زانیاریانەی خوارەوەی بۆلەم پەراوێزە زیادکرد- وەرگێڕ). ساڵی٢٠٠٠ سەرژمێرێکی روون‌و رەوانتر ئاشکرابوو. ئەگەرچی ئامارەکە زیاتر لە هەڵکشاندایەو هێشتا دوورە لەوەی یەکلابێتەوە. ساڵی ١٩٩٨ کۆمیتەیەکی پەرلەمانی تورکیا دەریخست کە، ژمارەی گوندە وێرانکراوەکان یان بەزۆر چۆڵکراوەکان ٣٦٦٥ گوندە. بەڵام هەندێك لەچالاکەکانی ماڤ مرۆڤ لەو باوەڕەدابوون کە ژمارەی تەواو خۆی لە ٤٠٠٠ گوند دەدا. ژمارەی گشتی کوژراوەکانیش وەك لەتاوانبارکردنەکەی دادگاییەکەی ئۆچەلانی دورگەی ئامرلی حوزەیرانی ١٩٩٩دا خرایە روو، بە ٣٤٤١٦ کەس*

شتێکی وا بۆ نیشتەجێکردنیان نەکرابوو. ئەو دەرکراوانە بوونە گەنجینەی خەڵکانێك بۆ بوونە گەنجینەیەك بۆ پەرەدان بەپارتی کرێکارانی کوردستان، چڕبوونەوەیان لەشارەکانی باشوورو خۆرئاوادا توندوتیژی هێنایەکایەوە. بوونی ئەو پەنابەرانە کرژی لەگەڵ تورکەکانیشدا پەیداکردو، کوردیش ئازەزایی بەرامبەر بەو جیاوازیکردن و دەمار کرژییە هەبوو کەلەکاتی گەڕان بۆ خانوو، یان کار، یان تەنانەت دابینکردنی قوتابخانەی منداڵەکانیان لەگەڵیاندا دەکرا. دەستەڵاتدارانی تورکیش ناوەناوە پرۆژەی نیشتەجێکردنی کوردیان، لەشێوەی ئەو سەربازگایانەی سەددام حسێن بەدرێژایی ڕێگا سەرەکییەکانی کوردستانی عێراق دروستیکردبوون و ناوی "شارانی سەرکەوتنی" لێنابوو ، کوردیان تیادا دیلکردبوو، ڕادەگەیاند. بەڵام بەهۆی بێپارەییەوە ئەو پرۆژەیە نەهاتە دی چە  تورکیا وەك عێراق لەسەر دووەمین گەنجینەی نەوتی هەموو دونیا هەڵنەتروشکابوو.

لەساڵی ١٩٩٤ەوە شەڕەکەی کوردستانی تورکیا، وەك "عەلی شەوقی ئیریك"ی وەزیری دەوڵەتی پێشووی تورکیا ڕایگەیاند، ساڵانە ٢و٨ بلیۆن دۆلار، واتە سەدی ٢٠ی بودجەی گشتی، یان دوو ئەوەندەی بێدەرامەتە ساڵانەییەکەی تورکیای دەخوارد. هێزەکانی تورکیا فڕۆکەو کۆپتەری جەنگی و، زرێپۆش و تۆپێکی هێندە زۆریان لەو شەڕەدا بەکاردەهێنا،

---

لەقەڵەم درا- لەمانە ٢٣٦٢٨ی چەکداری PKK مو، ٥٥٥٥ کەسی هێزەکانی میری پارێز (بە پاسەوانانی گوندیشەوە) و ٥٣٠٣ مەدەنی کە (نزیکەی هەموویان قوربانیانی کورد) بوون. ڕۆژنامەی (تورکش دەیلی نیوز) بێنەوەی باس لەناکۆکی ژمارەکان لەگەڵ ئەوانەی پێشوتردا بکات، لە ٥ی حوزەیرانی ٢٠٠٠دا ئاماژەی بۆ جۆرە ژمارەیەکی تری کوژراوانکرد، ٢٣١١٢ چەکداری PKK مو ٥٠١٢ی سەربەهێزەکانی ئاسایش، ٤٤٣٥ کەسی مەدەنی و ٤٣٠٢ کاربەدەستی مەدەنی. واتە ٣٦٨٦١ کوژراو. عوسمان بەی دیمری. جێگری سەرۆکی ماف مرۆڤی تورکیا، لەچاوپێکەوتنێکی نووسەردا لە ١ی حوزەیرانی ٢٠٠٠دا لەپاریس، هەر ئەو باوەڕەدابوو کەژمارەی ڕاستی کوژراوەکان خۆلە ٤٢٠٠٠ کەس دەدەن. ئەم خەمڵاندنەشی لەسەر بنەمای پێوەندی ڕەسمی بەوانەی بەشداری شەڕەکەبوون و لەو نووسینانەش کە لەرۆژنامەکاندا بڵاوکراونەتەوە، کردبووە. دوای ئەوەی میری بەرەنگاری موسوڵمانانی حیزبوڵا بووە، وەك عوسمان ڕوونیکردەوە، هێزەکانی میری تەنیا لە باشووری خۆرهەڵاتدا بێ هیچ شارینەوەیەك ٤٠٠٠ کەسیان کوشتووە، ئەمە جگە لەوانەی کەبەبێ دادگاییکردن کوژراو. و لەناوبراون لەکاتی لێکۆڵینەوەیاندا سەرەونگومکراون. کۆمیتەیەکی پەرلەمانیش لە خەمڵاندووە. بیسان بەی بیمیر ژمارەی ئەو کوردانەی کەدەرکراون یان راگوێزراون بە ٣ ملیۆن کەس خەمڵاندووە تە ٠٠٠٠٠ مەقەلەبالغی تەنیا لەدەوروبەری دیاربەکردا پەنابەربوون، لەوانی تریشیان خۆیان گەیاندۆتە گەڕەکە وێرانەکانی - ئەرمو لەدەنەو لەستەنبوڵ و لەزمیر شارەکانی تری خۆرئاوای تورکیا. شەڕ کارە توندو تیژیەکانی بوونەتە گەورەترین هەنگە بۆ ١٧٥٤٧ کوژراو کەتائیستا هۆی کوشتنیان نەزانراوە (لەوانە ١٠٨٤٢) یان هەربەتەنیا لە باشووری خۆرهەڵاتی وڵاتدا بووە، ئەمەش بەپێی خەمڵاندنی ساڵی ١٩٨٨ی بەڕێوەبەرایەتی گشتی دائیرەی سەربازیانەی تورك.

کەلەدانیشتنە تایبەتییەکانی خۆیاندا بەخەرجی جەنگی وڵاتە یەکگرتووەکانی شەڕی ڤێتنامیان بەراورد دەکرد، لەکاتێکدا ئەمان بەگوێرەی خەمڵاندنە رەسمییەکانی خۆیان، ژمارەی گەریلاکان بەلیحتیاتەکانیشیانەوە لە ٦٠٠٠ کەس زیاتر نەبوون،و، لەچەکی سووکیش بەولاوە هیچی تریان شك نەدەبرد. خەرجی شەڕەکە لەوەتەی هەڵگیرساوە تا ئەمڕۆ، بەپێی ئەو خەمڵاندنانەی لەبەردەستدابوون بە ٤٠ ملیار دۆلار دادەنرا، بەڵام لەساڵی ١٩٩٣وەو بەهۆی زۆربوونی هێزی ئاسایشەوە، کەژمارەیان لەناوچەکەدا گەیشتبووە ٣٠٠٠٠٠ کەسێك، تەواو زیادیکردبوو، بەڵام هێزی سوپا لەناوچەی "ترالکیا"و بەدرێژایی کەناری دەریای نیجە زۆر کەمکرانەوە. تورکیا چاوی لەسەدام حسێن کردو "پاسەوانانی گوند" یان "جاش"ی بۆ بەگژداچوونەوەی پارتی کرێکارانی کوردستان دامەزراند. لەساڵی ١٩٩٥دا ژمارەی جاشەکان گەیشتە ٦٠٠٠٠ کەس، کەمەریەکەیان مانگانە ٢٠٠ دۆلاری وەردەگرت ئەوەش لە کوردستانێکی هەژارو دواکەوتوودا مووچەیەکی شایانەیە، کەوتنە تۆقاندنی کوردەکانی دراوسێیان،و، بێئەوەی لەئەنجامی کارەکانیان بترسن، قینی کۆنیان پێدەڕشتن،و سووك،و باریکیش بەسەر پارتی کرێکارانیاندا دەهێنا. ئەچوونە ڕیزی "پاسەوانانی گوند" (کە کوردی ئاسایی زۆری قین لێیان دەبووە، چونکە بەهەترسی جەنگی ناوخۆی کوردیان دەزانی)بە بەڵگەی پشتگیریکردنی پارتی کرێکارانی کوردستان دادەنراو، ئەوەش بیانوویەکی باشبوو بۆ ڕووخاندنی گوندو/ یان راگواستنی دانیشتوانەکەی. لەساڵانی ١٩٩٣و ١٩٩٤دا، ٣٢٠٠ کورد دیارنەماو وەك ناوی "کوشتنێکی نادیار"ی لێنرابوو، سەرەونگومکران، بەرگریکەرانی ماڵ مرۆڤ، چ لەناو تورکیاو چ لەدەرەوەشی، بێ هیچ دوودڵییەك "تیپی مەرگ"یان بەرپرسیارکرد، کە دەوڵەت پارێزگاری لێدەکردن. سیاسەتمەدارانو چالاکەکانی پارتە سیاسییەکان،و، بەرگریکەرانی ماڵ مرۆڤ، رۆژنامەنووسان،و، مامۆستایان،و، هەرهەموو ئەو کوردانەی بەفکرەوە خەریکبوون، ئینسانی سەرەکی،و تیپی مەرگانە بوون. هەموو تاوانەکانیشی بەنادیار مایەوە، هیچ لێکۆڵینەوەیەکی جینائییانەیان لەبارەوە نەکراو، هیچ تاوانبارێکیشیان نەگرت،و نەدایە دادگا تا سزا بدرێت. دەستەڵاتدارانی تورك هەمان تا ئەو پارێزەرانەی بەرگریان لەتاوانبارە سیاسییە کوردەکان دەکرد بتۆقێنێت، هەمان تۆمەتیان دەدانە پاڵ، وەك تۆمەتی هاندانی "پڕوپاگەندەی جیاخوازی"، کەمەر کەسێك ئەو تۆمەتەی هەبوایە ماوەیەکی زۆر بەند دەکرا.

تورکیاش، وەك چەندبارەبوونەوەیەکی گەمژانەی بێکەڵکی ئیسرائیل،و وڵاتە عەرەبییەکان کە بەرامبەر بە چەپەکان دەیانکرد، هانی رێکخراوی ئیسلامی "حیزبوڵڵا" (ئەمانە هیچ پێوەندییەکیان بە "حیزبوڵا"ی ئێرانییەوە نییە)ی توندڕەوی ناوخۆی دەدا،و پشتگیریدەکرد، تا

جگە لە کوردی ئاسایی هەرکەسێك گومانی سەربەپارتی کرێکارانی لێبکرایە، لەلاوە بیکوژن (ساڵی ١٩٩٤ پارێزەرانی ئاسایش ولیان بەچاك زانی رادەیەك بۆ حیزبوڵا دابنێن، بۆیە سەدان ئەندامی باڵادەستیان لێگرتن و، سووڵەو بارێك تۆمەتی جیابوونەوەیەکی رانەگەیەنراوی هێزەکانیان خستنەپاڵ. بەڵام هەر بۆ نموونە، هیچ روونکردنەوەیەکی واشیان سەبارەت بەوشتانە دەرنەکرد، کە لەبنکەی حیزبوڵا، کەهەر ٦٠ یاردە لەمەڵبەندی پۆلیسی موتمانەپێکراوەوە دووربوو، سەدان قوربانیان دیلدەکردو تا گیانیان دەردەچوو ئازارو ئەشکەنجەیان ئەدان و، کەسیش گوێی نەدەدایە). ئەگەرچی سوپای تورك خۆی بە "پاسەوانی کۆماری عیلمانی و پارێزەریشی دادەنا"، کەچی دەزگا سەربازییەکە پشتگیری ئەم لایەنە ئیسلامیانەی ئەکردو، لەسەردەمی حکومەتەکەی دوای کودەتای ١٩٨٠؛ سیاسەتی میری پشتگیری خوێندنی بابەتە ئاینییەکانی لەقوتابخانەو دروستکردنی سەدان مزگەوتی نوێ نیشاندا. لە ناوەڕاستی نەوەتەکانیشەوە، راپۆرتی ساڵانەی رێکخراوی لێبوردنی نێو دەوڵەتی "ئەمنستی ئەنتەرناشناڵ"و، وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکاو، رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ "هیومان رایتس ووچ"و، هەموو رێکخراوەکانی ترو ئەو تورکانەش کە پارێزگاری مافی مرۆڤیان ئەکرد، زانیاری زۆرو بەڵگەنامەو بڕوانامەیان سەبارەت بەو پێشێلکردنانەی مافی مرۆڤ کە لەتورکیادا پیادە ئەکران، ئەخستەڕوو، کەبەئازارو ئەشکەنجەو لاقەکردن لەپاش و پێشەوەو، شێوە لێدانە کۆنەکەی بنی پێ کە "فەلاقە"ی پێدەوترا، دیلکردنی بێ حیساب، تا دەگاتە ئەو جۆرە سزا دڕندانانەی بەبیری کەسدا نایەت، وەك لەساڵی ١٩٨٩دا ڕوویداو سەربازە تورکەکان سەرۆك عەشیرەتێکیان بەخواردنی تەرسی وڵاغ لە گەوڕێکدا ناچارکرد.

جالەبەرئەوەی یاسای سزادانی تورکیا لەناوچە نائاساییەکاندا پیادە نەدەکرا – دادگاکانی ئیستنافیش کەمتەرخەمیان لەو کەمە کێشانەدا دەکرد کەبەرەوڕوویان کرابوونەوە- ئیتر قوربانییە داپڵۆسێنراوەکان، لەلیژنەی مافی مرۆڤی سەربەئەنجومەنی ئەوروپای بەولاوە هیچ شوێنێکی دییان نەبوو تا کێشەکانی خۆیانیان بەرنە بەردەم. جالەبەرئەوەی تورکیا خۆی لەو ئەنجومەنەدابوو، دەبوا پابەندی بڕیارەکانی لیژنەکەی مافی مرۆڤ بوایە. بەڵام لیژنەکە قایلنەدەبوو لەزۆربەی کێشەکان بکۆڵێتەوە، تەنیا چەند کێشەیەکی کێشەیەکی کەمی هێشتەوەو، بڕیاردانیشیان هەندێ جار چەند ساڵێکی ئەخایاند. بەتایبەتی ئەگەر تورکیا بەبڕیاری لیژنەکە قایل نەبوایە. (هەر بۆ نموونە تەرسی ئاژەڵ دەرخواردانەکە پێنج ساڵی وبست تابڕیاری لەبارەوە دراو، ئەوەی تاوانەکەشی بەرامبەرکرابوو تەنیا ٢٠٠٠٠٠ فرنکی فەرەنسایی درایە). کوردەکانی تورکیا خۆیان بە کوردی عێراق بەراورد دەکرد، بەوکارەسات و تۆڵەیەی سەدام حسێن لەبرا عێراقییەکانیانی سەندبۆوە. خۆئەگەر ژمارەی ئەو کەسانەی لەئەنجامی "ناپاڵم"ی

تورکیادا، لەقوربانیانی چەکی کیمیاوی عێراقی هەڵمەتی ئاسراو بەئەنفال مێجگار کەمتر بوبێت، بەلام خۆ تورکیاو عێراق بەکۆمەڵ و بەزۆر کوردی گوندەکانیان راگوێزاو، مافی مرۆڤیشیان بەکۆمەڵ پێشێلکردووە، وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا ناچاربوو دان بەهاوشێوەییەکی زۆری کردارەکانی هەردوو وڵاتدا بنێت کەدژ بە کورد دەیانکرد. لەوەڵامی پرسیارێکدا کەلە "جون کورنبلوم"ی جێگری یاریدەدەری وەزیری دەرەوە، سەبارەت بەجیاوازی ماڵە کوردێك لە تورکیاو ئەو وێرانکارییە هاوشێوانەی لە کوردستانی عێراقدا دەکرێت، کرا، وتی:"ئەگەر لە گوندێکدا بێت، ئەوا هیچ جیاوازییەکیان نییە".

لەپاییزی ١٩٩٤دا پێشێلکردنی مافی مرۆڤ لەناوچەی "تونجیلی" بەرادەیەکی ئەوتۆبوو، کە "ئیزمێت کۆیلو ئۆگلو"ی وەزیری دەوڵەتی تورکیا بۆ مافی مرۆڤ، ناچاربێت دان بەزیادەڕۆییەکانی هێزی ئاسایشی تورکیای ناوچەکەدا بنێت و قسەکانی ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤی ئەو چەند ساڵە یەکلابکاتەوە. وەزیر وتی:"پارتی کرێکاران لەناوچەکانی تردا تیرۆر دەکات، بەلام ئەوەی لەتونجیلیدا دەکرێت لەئاستی تیرۆری دەوڵەتدایە، چونکە لەوێ دەوڵەت جوتیارەکان رادەگوێزێت و گوندەکانیان دەسووتێنێت. لەباشووری خۆرهەلاتی وڵاتدا، دوو ملیۆن جوتیار سەرگەردانکراون و پێویستە خۆراك و شوێنی ژیانیان بۆ دابینبکرێت". بێگومان دەربەدەرەکان هیچ یارمەتییەکی وایان بۆ دابین نەکرا. لەگەڵ ئەوەشدا کە "کۆیلۆ ئۆگلۆ" بەرامبەر بە سەرجەم ڕووداوەکانی کوردستانی تورکیاو کارە تیرۆریستییەکان، پارتی کرێکارانی بەرپرسیارکردبوو، بەلام گرنگی قسەکانی لەوەدابوو کە شتێکی نوێی لەمێژووی تورکیادا هێنایە کایەوە. چونکە هیچ بەرپرسێکی تری بالادەستی پێش و پاش قسەکانی "کویلو ئۆگلۆ" دانی بەقسەکانی ئەودا نەنا. راستییەکەی دلنانی ئەو وەزارەتە کەهیچ کاتێك پارەی پێویستی لەبەردەستدا نەبووە، ساڵی ١٩٩٢ بۆ کەمکردنەوەی رەخنەکانی ئەورووپاو ئەمەریکا دامەزرێنرا، کەتادەهات لەسەرتۆمارە پیسەکەی تورکیای بواری پێشێلکردنی مافی مرۆڤ زیادی دەکردو حکومەتی تورکیاش هیچ باکی پێی نەبوو.

تونجیلی کەدانیشتوانەکەی کوردی عەلەوین و بە "زازا"ییانە دەدوێن، شارێکی کوردانەی ئاسایی نەبوو. لەناوچەیەکی شاخاویی پڕ لەشیوو دۆڵی قووڵقووڵدابوو، تەنانەت کوردەکانیش بەشوێنێکی چەپەکیان دادەنا. تونجیلی -یان "دەرسیم" کەبەرلە تورککردنی ناوە کوردییەکان، ناوی وابوو-، تا ساڵانی ١٩٣٧و ١٩٣٨ نەکەوتە ژێر دەسەلاتی دەوڵەتی تورکیاوە، تەریکی ناوچەکەش خەڵکەکەی واڵیکردبوو گوێ بە دەسەلاتی ناوەند نەدەن و، باجی پێویست نەدەن، نەتاتورکیش هەرئەوەی کردەبیانوو تا بەسەر دوا بنکەی بەرهەڵستکارەکانیا زاڵببێت. هەرچەندە

زەحمەتە ڕووداوەکانی ئەوکاتە بزانرێت، چونکە ئەرشیفەکانی کۆماری تورکیا بەموۆرکراوی مابوونەوەو نەشمێننەوە، زۆر کەمیشی یەکلاییکراوەتەوە، بەلام هەر ئەوەندەی ناوی "دەرسیم"لای کورد بهاتبایە، ئیتر ئەو پڕوپاگەندە سامناکە نەسەلمێنراوەیان دەوتەوە کەتاییەتبوو بەوەی هێزەکانی تورکیا، گازی ژەهراوی لەدژیان بەکارهێنابێ.

سەبارەت بەوکارە سەربازیانەی ئەنقەرە ناوچەی "دەرسیم"ی پێگرت و خستییە ژێر دەستەلاتی خۆیەوە کەس قسەی لەسەری نییە، چونکە هێند دڕندانەو نامەردانەبووە کەنزیکەی نیو سەدە بزووتنەوەی کوردی لەجووڵەخست. حەوت ساڵ پێشتر، عیسمەت ئینۆنۆی دەستەڕاستی ئەتاتورک و جێگرەوەی راستەوخۆی سەرکۆمارێتییەکەی، هیچ گومانێکی لەبارەی راستی نیازەکانی دەوڵەتی تورکیا نەهێشتەوە هەرچەندە ئینۆنۆ خۆی کوردبوو، کەچی کوردی وائاگادارکردەوە کە: "لەم وڵاتەدا نەتەوەی تورکی لێدەرچێت کەسی دی بۆی نییە داوای مافی نەتەوەیی ڕەگەزی بکات". ئەوبۆچوونە ئاساییەش بووە بناغەی هەموو ئامادەکارییەکانی کۆماری تورکیاو، ئینۆنۆش بۆخۆی سەرکردایەتی هەڵمەتە سەربازییەکەی سەر "دەرسیم"ی کرد.

"سەبیحە گوکچین"، کەئەتاتورک کردبوویە کچی خۆی و پێیگەیاندبوو، یەکەمین فڕۆکەوانی ئافرەت بوو، پەنجا ساڵ دوای بۆردومانکردنی شۆڕشگێڕەکانی "دەرسیم"، هیچ لەکارەکەی پەشیمان نەبوو هەستیشی نەدەکرد کە ویژدانی ئازاری بدات. سەبارەت بەکارەکەی دەیوت:"بۆ پاراستن و مانەوەی کۆمارە ساواکە دەبوا ئەوە بکرایە"، بەرگری لەخۆشی بەوە دەکرد کەئەدەبوو هیچ مشتومڕێك لەسەر بیروڕای کۆماری عیلمانی نوێی دژ بەیاخییەکانی کورد بکرایە کەهێزە تاریکە ئیسلامییەکان کاریان تێکردبوو، دەشیوت:"ئەتاتورک کەئەو ئەرکەی پێسپاردم و منیش بەچاکی جێبەجێمکرد". پیاو ژن و منداڵیان لەناو ئەشکەوتانەدا گەمارۆدەدا کە کوردەکان بۆ خۆدەربازکردن چووبوونە ناویانەوەو، بەزیندوێتی تیایاندا دەسووتێنران، بە ئەنقەستیش ئاگریان لەدارستانەکان بەردەدا تا هەرکەسێك خۆی لەناویاندا حەشاردابێت بسووتێت (سەیرەکە لەوەدایە لەساڵی ١٩٩٤یشدا، هەمان شێوازیان لەو ناوچەیەدا بەکارهێنایەوە کەبەدارستانێکی سروشتی دادەنرا). کوردەکانی دەرسیم تا فیشەکیان پێما شەڕیانکرد، بەلام هێزەکانی تورکیا، بۆ جێبەجێکردنی داوای ئەو سەردەمەی ڕۆژنامە تورکییەکان، کەوەك چۆن "کاتۆ" – سەرکردەی بەناوبانگی ڕۆمانیا– داوای وێرانکردنی "قرتاجە"ی کرد، ئەوانیش داوای وێرانکردنی ناوچەکەیان دەکرد "دەبێت دەرسیم کاولبکرێت"، سەرجەم گوندە کوردییەکانیان کاولکردو بەهەزاران کەسیشیان لەوانە راگوێزا کە لەمەرگ دەربازیانببوو

لەبەر زۆر لەو وڵاتە ئەوروپاییانەی، باوەڕیان بەوە کردبوو کەبزۆچوونی کەمالیزم ڕووەو نوێکردنەوەیە[٥٦]. لەساڵی ١٩٤٦دا هەندێك لەبارە ناناساییەکە لابرا، ڕێیان بە راگوێزراوانی دەرسیم دا کە بگەڕێنەوە. دوای دوو ساڵ ڕۆژنامە نووسێکی تورك کە سەردانی ناوچەکەی کردبوو، نووسیبووی:"ئەگەر سەبارەت بەدەوڵەت قسەت لەگەڵ خەڵکەکانی بکردایە ئەوا پێیان وابوو مەبەست باجگرو پۆلیسە"، چونکە ناوچەکانیان "قوتابخانەو پزیشکی تیادا نەبوو، ئێمە هیچ شتێکمان بۆ نەکردوون بەڵکوو هەرچییەکمان ویستبێت لێمان سەندوون. ئێمە بۆمان نییە بەمجۆرە لەگەڵیاندا بەردەوامبین".

دوای نیو سەدە، کاریگەرێتی پڕکێشکردنەکەی "کویلو ئوگلو"، زۆری نەخایاند راگوێزانی کوردە گوندنشینەکان هەر بەردەوامبوو، ئەگەرچی لەساڵی ١٩٩٥ەوە، راگوێزان‌و کوشتنی نادیارو ئەو دلوایانەی بەدادگای ئاسایشی دەوڵەت دەدران، کەمتربوونەوە، ڕەنگە لەبەر کەمی قوربانییەکان بووبێت. ساڵی ١٩٩٤ سوپای تورك نەیهێشت وەزیر سەردانی گوندەکانی ناوچەی "تونجلی"، کەدانیشتوانەکانیان راگوێزرابوون، بکات‌و نەشیهێشت چیلەری سەرۆك وەزیران، کەبەتوندوتیژ ناسرابوو، بۆ خۆی چاوی بە کوردەکان بکەوێت‌و لەڕووداوەکانی ناوچەکە بکۆڵێتەوە. کاتێك گوندنشینەکانی کورد شەکوای حاڵیان، سەبارەت بەو زۆردارییانەی لێیانکرابوو بردەلای، پێیان راگەیاندبوو کە کۆپتەرەکانی سوپای تورکیا بۆردومانی ماڵەکانیانی کردووەو بەسەر خاوەنەکانیاندا ڕوخاندونی، چیلەر نکوڵی لەوە کردو بەتەوسەوە پێیوتبوون ڕەنگە ئەو کۆپتەرانە ئەفغانی، یان ئەرمەنی، یان ڕوسیایی بووبن، بەڵام بێگومان ناکرێ کۆپتەری تورکیا بوبن. دوای هەوڵ‌و تەقەلای ساڵانێکی زۆر بۆ قایلکردنی لێپرسراوانی تورکیا، تا چیدی ماف مرۆڤ لەووڵاتەکەیاندا پێشێل نەکەن، دیپلۆماتێکی ئەمەریکایی زۆر بەئاگای ئەو فایلە، دەستەوستانانە وتی:" تورکیا پیسترین دوژمنی خۆیەتی".

وەنەبێ هەر چیلەر بەووردی نکوڵی لەڕووداوەکان کردبێت، هاوپەیمانانی "ناتۆ"ی تورکیاش، سەیرکەری ڕووداوو پەرەسەندنەکەی بوون‌و، هیچ دەستپێشخەرییەکیشیان بۆ وەستانی ململانێکە نەکردو، پڕوپاگەندەو لاف لێدانە گاڵتەجاڕییەکانی تورکیاش لەوێدا بوەستێت،

---

[56] چەند بەشێکی ئەورووپا لەگەڵ ئەوەدا نەبوون، "باسیلی نیکیتین" کە دیپلۆماتێکی ڕوسیای قەیسەری‌و نووسەرێکی بەناوبانگی کێشەی کوردە. لەنامەیەکیدا بۆ ڕۆژنامەی The Times ی لەندەنی لەسەر مانشێتێکی ١٦ تەموزی ١٩٢٧ ی ڕۆژنامەکە، کە تیایدا ڕوایی بەشەڕەکەی دەرسیمی کەمالیزمەکان درابوو، گوایە: "سوپای تورکیا سەرکوتی بەرهەڵستکارانی خوێندن دەکات"، نیکیتین نووسیبووی:" ئەوبۆچوونە هەڵەیە کە گوایە کورد خوێندنیان ناوێت. ئەوان بەرهەنگاری بەتورککردنیان بوونەتەوە".

کەگوایە سەنگەرگری پێشەوەی وڵاتە هاوپەیمانەکانەو، وڵاتانی ناتۆ پشتی پێ دەبەستن و، قەڵایەکی سەختی ناوچەکەشە. خۆ ئەگەر جاروبارێك ئەڵمانیا، بۆماوەی کورت کورت چەکی پێنەفرۆشتایە، وەك لەساڵی ١٩٩٣دا رایگەیاند کە هێزەکانی تورکیا چەکە بەخشراوەکانی ئەڵمانیا لەشەڕی کورددا بەکاردەهێنێت، بەڵام سیاسەتی وڵاتانی ناتۆ هەر چاوپۆشیکەری ڕووداوەکانبوو. سەبارەت بە عێراق، وڵاتە خۆرئاواییەکان نەیاندەتوانی، یان نەیاندەویست گوشار بخەنە سەر دیکتاتۆرێکی بەدناو کە خراپەکاری بەرامبەر بە کورد نەکات و نەیان چەوسێنێتەوە، ئەویش بەهۆی کێبەرکێکەی نێوانیان لەسەر بازاڕی عێراق و، پێداگرتنی پاراستنی بەرژەوەندی "جیو-ستراتیژی"یان و، هێشتنەوەی ئێرانیش لەقاوغەکەی خۆیدا.
سەبارەت بەباری تورکیا، وڵاتانی ناتۆ بەهۆی هاوپەیمانێتی نێوانیان و، پێداگرتنیان لەسەر بەرژەوەندییە "جیو ستراتیژی"یەکەیان، جگە لە کێبەرکێکەی نێوانیان لەسەر بازاڕی تورکیا، هیچ هەنگاوێکیان نەدەنا کەوا لە حکومەتە بەدیموکراسی هەڵبژێردراوەکە بکەن کوردەکانی تورکیا بپارێزێت.

لەحوزەیرانی ١٩٩٢دا، بەهاوەڵی دوو رۆژنامەنووسی لاوی ئینگلیزی سەردانی باشووری خۆرهەڵاتی تورکیام کرد، کە بۆ یەکەمجار سەرکوتکردنە بەپەلەکەی تورکیایان بینی کە ناوچەکەی گرتبۆوە. لەشاری دیاربەکرەوە بە ئۆتۆمۆبێل، بەخۆرهەڵاتدا بەرەو بنکەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان بووینەوە لەو زنجیرە گردو چیایانەی تا خۆرهەڵات درێژبوونەوە، بەشارەکانی "لیچە"و "باتمان"، (کە لەتورکیادا بەشاری نەوت دادەنرێت و بە "تیرۆرکردنی نادیار"یش بەناوبانگە)و "سیلڤان" و "سیرەت" و "شیرناك" و "ئۆلۆدیری" (کە ساڵی ١٩٩١ کوردێکی زۆری عێراق پەنایان بۆ برد)، رەتبووین. ئەمجا بەدرێژایی سنووری هاوبەشی لەگەڵ عێراق و سوریادا بەرەو خۆرئاوا بووینەوەو، ڕوومان لە شارەکانی "سیلۆپی"و"جزیرە"و "میدیات" و "ئیدل" و "نسیبین" کردو، پاشان بەرەو باکوور بۆ ماردین و لەوێشەوە گەڕاینەوە بۆ دیاربەکر. چەند دۆستێکی کوردم لەئەنقەرە وەرگێڕێکی لاویان بۆ پەیداکردم، کەپاشان بۆم دەرکەوت ئینگلیزییەکەی وانییە، بەڵام لایەنگرێتی پارتی کرێکاران و بۆچوونە مارکسییەکانی بێئەندازەبوو. هەرچەندە تێگەیشتنی سەرنجەکانی زۆرجار زەحمەتبوو، بەڵام ئەو بۆچوونەی لاچەسپاندم کە لاوانی کورد بە برِوایەکی کوێرانەوە خۆیان بەقوربانی شەڕەکان دەکەن. ساویلکەیەتییەکەی وای لێکردم هەندێ جار بەتەوسەوە سەرنجی سادیانەی لێبدەم، ئەویش منی بەپیاوێکی ئیمپریالیزمی وا تاوانبار دەکرد دەستم لێشۆرابێت، هەرچەندە لەهەرەسهێنانی یەکێتی شۆرەوییەوە وشەی "ئیمپریالیزم" لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا باوی نەمابوو. بەڵام دەمەتەقێکەمان دووڵی کەمکردەوە، چونکە زۆر لەوەدەترسام هەر کەلەگەڵ ئاسایشی تورکیادا

تووشی گرفتێك ببین، کەنزۆرجار بێجیاوازی جگە لەدیپلۆماتو، نوێنەرانی ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤو، ئەو کەمە سیاسەتمەدارە کوردانەی پەرکێشیان بکردایە بەناوچە نائاساییەکاندا بسووڕێنەوە، لەگەڵ ڕۆژنامەنووسانی تورکو بیانیشدا ڕوویاندەدا، شێتێکی لێبەسەربێت. ئێمە وەك ڕۆژنامەنووسی بیانی لەوپەڕەکەی مەترسی وەدەرنانی تورکیا، یان لێدانمان هەبوو، بەڵام ئەو وەك وەرگێڕێك، ژیانی خۆی خستبووە مەترسییەوە، چونکە هاریکاری لەگەڵ ئەو بیانییە خۆهەڵقرتێنەرانەدا دەکرد کەدەیانویست حکومەتی تورکیا شەرمەزاربکەن. هەرچەندە زۆربەی ڕێگاکەمان خراپبوو، خاڵێکی زۆری پشکنینی لەسەربوو، بەڵام بەختمان هەبوو، بەکەیفی خۆمان هاتوچۆمان دەکرد.

وەرگێڕەکەمان توانایەکی چاکی بۆ خۆ خۆشەویستکردن لای ئەو کوردانە هەموو کە ڕێکەوتمان دەکردن، قایلیەکردن لەو لاڕێیانەی هاتوچۆی زۆر کەمیان بەسەرەوەیە چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا سازیدەین، چونکە پێمان وابوو لەو شوێنانەدا چاودێری ناکرێین، واتە لەسەر چاوپێکەوتنکردنەکەمیان تووشی هیچ نایەن. لەنزیك شارۆچکەی "ئیرو"، کە پارتی کرێکاران لە١٥ی ئابی ١٩٨٤دا، یەکەم چالاکی سەربازیانەی خۆی دژبە بنکەیەکی جەندرمەی تورکیا کرد، جوتیارێك گازاندەی لەدەست پارتیزانەکانو هێزی ئاسایش وەك یەك دەکرد، بەتایبەتی ئەوانەیان کە "تیپی تایبەت"یان پێدەوترا و بە جلو بەرگی مەدەنیانەو گوارەی گوێیانەوە، بەناو خەڵکەکەدا دەسووڕانەوەو، هەر هەموو خەڵکەکەش لێیان دەترسانو بەدڵڕەقترینو دڕندەترین کەسیان دەدەنان.

ئەوشتەی بەلای ئێمەوە لەگازاندەی جووتیارەکە بەبایەختربوو، سەرنجدانو خۆگێلکردنی بوو لەو پرسیارەی کە سەبارەت بەچۆنێتی گەیشتنە شارۆچکە نزیکەکە لێمانکردو خۆی ولنیشاندەدا وەك لەپرسیارەکەمان نەگەیشتبێت. چەند جارێك پرسیارەکەمان لێ دووبارە کردەوە، پاشان هەستمانکرد کە کوردێکی کەم ئەو ناوانەی تورکەکان لەساڵانی ڕابردوودا بەسەر شارە کوردییەکانیاندا دابڕیوە بەکاردەهێنن (دواتر زانیم کەتورك ناوی هەموو ناوچەو شارو شارۆچکە عەرەبیو ئەرمەنییەکانیشیان گۆڕیوە، بەڵام ناوی ڕێگای خێراو وێستگەی ناوی لەسەر نەخشە وەك خۆیان هێڵرابوونەوە، چونکە لایەنی پراکتیك بەسەر لایەنی ئایدۆلۆژیای ئەم دەوڵەتەیاندا زاڵبوو). بەم شێوازانەو بەڕاکێشانی کارەبار تەلەفۆن، تورك لەگۆڕینی ئادگاری کوردستاندا سەرکەوتنی بەدەستهێنابوو، بەڵام نەیتوانی ئەو کوردانە بگۆڕێت کەهەموو بایەخێکیان بۆئەوەبوو ناوچەکانیان لەکارە حکومەتییەکاندا بەشی خۆی بەربکەوێت، بەتایبەتی کە لەوە گەیشتبوون ئەگەر حکومەت بییەوێت دەتوانێ چیان بۆ بکات. بەڵام ئەو کوردە

ئاساییانەی ئێمە قسەمان لەگەڵدا کردن، دەرکیان بەوە نەکردبوو تورکیا بۆ دەمکوتکردنێکی وا خۆی ئاوەتەوە کەزۆر لەوەی پێشتریان خراپتربێت‌و، سەرکوتکردنی ئەمجارەیان هێجگارەکی بێت.

مرۆڤ تا بزانێت چ قەڵاچۆکردنێک‌و بەکۆمەڵ راگوێزانێک لەنێوان سەفەوییەکان‌و عوسمانییەکاندا ڕوویاندەوە، تێنەبگات لەوەی چی لەدژی کورد دەرنسرا، دەبێت بۆ سەدەی شانزەیەم بگەڕێتەوە. دوای سالانێک "ئەحمەد تورک" ئەو سەرکوتکردنەی تورکی هەڵسەنگاند، وتی:"ئەو باوباپیرانەمان کە دوای شۆڕشی شێخ سەعید رزگار ببوون، لە دڵرەقی‌و دڕندایەتی دەوڵەت وورپایان دەکردینەوە. بەڵام دەوڵەت هیچ رۆژێک لەمجارە دڵرەقترو دڕندەتر نەبووە". ئەحمەد تورک وەچەی خێزانێکی عەشیرەتێکی کوردی بەناوبانگەو ئێستا ئەندامێکی هەڵکەوتووی پەرلەمانە باوکی لە شۆڕشی ١٩٢٥دا بەشداریکردووەو بەرێکەوت لەو سەرکوتکردنەی کە دوای شۆڕش دژ بەبەشداره دەربازبووەکان دەکرا رزگاری بووە. ئەحمەد لەسەر قسەکانی بەردەوامبوو وتی:"پێشان، هەرئەو کەسانە سزا دەدران کە ڕاستەوخۆ پێوەندیان بە شۆڕشەوە بوایە، یان لە چەند سەرەک عەشیرەتێکیان دەدا کە بیانویستایە سەرۆکایەتییەکەیان لەکەڵک بخەن، بەڵام ئەمجارەیان خەڵکە ئاساییەکەی کە لەململانێی کوردستان نەگلابوون لەسەر نەچوونە پاڵ دەوڵەت سەرکوتدەکران. پێشان مەبەست دامرکاندنەوەی شۆڕشبوو، بەڵام ئێستا تەفرو توناکردنی هێجگارەکی گەلێک‌و پێناسەی نەتەوەیی‌و کەسایەتییە جیاکەیەتی".

جا ئەگەر پارتی کرێکارانی‌کوردستان ئەو مەبەستەی بووبێت ئەوەیان خواەیزانێت. پەکەکە لەئەنجامی ئەو سەرکەوتنانەی بەدەستی هێنابوو، بەڕادەیەک لەخۆی بایی ببوو کەلەسالی ١٩٩٠دا خۆپیشاندان‌و مانگرتنی گشتی بەلایەنگرانی رێکبخات‌و، بە ئاشکرا پڕوپاگەندەی توندڕەوانە بلاوبکاتەوە، کەهەمووی دەبوونە رێخۆشکردن بۆ تۆڵەکردنەوەیەکی دڕندانەی هێزە چەکدارەکانی تورکیا. لەشاری "شیرناک"دا، کەبە مەڵبەندێکی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد دادەنرێت، چەند هەفتەیەک پێش هێرشێکی سەرەکی هێزەکانی سوپای سەر شار، کەبووەهۆی چۆڵکردنی، لەلاکۆلانێکدا هەندێ لاوی کوردمان بینی بەترس‌و لەرزەوە پێیان راگەیاندین کە میلیشیاکانی دەوڵەت چۆن کوێرانە تەقەیان لەهەموو خانووەکان کردووە خانووی دەوڵەتی لێدەرچێت (ئەوەش لاف‌و گەزافەکانی حکومەتی تورکیای پوچەڵکردەوە، گوایە پارتی کرێکارانی کوردستان هێرشی کردۆتە سەر شارەکەو زیانێکی زۆریشی لێداوە). لەوەدا بەختەوەربووین کە گەیشتینە ئەو شارەی میری رێی چوونەناو شارەکەی بەبیانی، بەتایبەتی رۆژنامە نووسەکانیان نەدەدا، رێکەوتی ئاهەنگێکی سەیریشمان بۆ لایەنگرتنی میری تیاداکرد، کە بێگومان لەبەردەمی پەیکەری ئەتاتورکیشدا سازدەکرا، ژن‌و پیاو و منداڵ بەشداریان تیایدا

هەبوو. لەو ئاهەنگەی پاسەوانانی گوندەکانی ناوچەکەو خێزانەکانیانو، خەڵکی دیشی تیادابوو، هاوبەشیکەران ملدانو لایەنگرێتی خۆیان بۆ کۆمار رادەگەیاند. بە گەیشتنمان ئیتر هەربەدوای "والی"یەوە بووەو لێی نەبوومەوە تا بەکرژییەوە ناچار پێشوازیو چاوپێکەوتنی لەگەڵدا کردین. ئۆتۆمۆبیلەکەیو یاوەرە چەکدارەکانی نارد لەدووومان تا بمانبەنە نووسینگەکەی. هەر کەچووینە ژوورەوە، والی لەپشت مێزەکەیەوە دانیشتو گوێی بۆ پرسیارەکانمان شلکرد، ئەمجا بەرلەوەی کوتوپڕ فرمانی لەشار دەرچوونمان پێڕابگەیەنێت، تا ١٠ دەقیقەیەك کەوتە قسەی هەڵەجو بەڵەج. چونکە لەسەرخۆی نەبوو ئێمەش بواری مشتومڕکردنیمان نەبوو، بۆیە بەهێمنی لەشار دەرچووین.

دوای چەند رۆژێك، لەنێوەڕۆدا بە ئۆتۆمۆبێل گەیشتینە گۆڕەپانەکەی بەرامبەر شارەوانی "نوسەیبین"، ئەو شارەی تورکیا کەلەگەڵ "قامیشلی" سوریای جمکیدا تەنیا سنوور جوێیان دەکاتەوە. دوای سەفەرێکی دوورودرێژی رۆژێکی گەرم، بۆ ساردی خواردنەوە چووینە چایخانەیەکی لای گۆڕەپانەکە. کاتێك ئۆتۆمۆبیلەکەمان دادەنا گوێمان لەدەنگە دەنگی ناو چایخانەکەبوو، کەچی هەر کەئێمە چووینە ژوورەوە دانیشتوانی ناو چایخانەکە، قسەکانی خۆیان بڕی، لەناو کۆمەڵە پیاوێکی مڕو مۆچدا دانیشتین. دیاربوو زۆربەیان دەمانچەیان پێبوو، هەندێکیشیان لەناو کیفی بنهەنگڵیان نابوو. هەرچییەکمان کرد بۆئەوەی قسەیان لەگەڵدا بکەین بەباچوو، پێدەچوو بەقسە کردن لەگەڵ رۆژنامەنووسە بیانییەکاندا رانەهاتبنو نەشیانەوێت نەریتی خۆیان تێکدەن.

لەگۆڕەپانەکە پەڕینەوەو چووینە ناو شارەوانییەوەو، دادوەری ناوچەکە بەگەرمی پێشوازی کردین. "نوسەیبین" ئاوبانگی بەو هەموو کوشتنە دەرکردبوو کەلای کەس ئاشکرا نەبوو، بەڵام هەندێ جار هی وای دەگرتەوە کە هۆی کوشتنەکەی بەئاشکرا هاواری دەکرد، وەك سیاسییە چالاکەکانی کورد، یان هەواڵنێرو دابەشکەرانی ئەو رۆژنامانەی لایەنگری کوردبوونو لەئەستەنبوڵ دەردەچوون، هەندێ جاریش خەڵکی ئاسایی واشی دەگرتەوە کەلەدوورونزیك هیچ پێوەندییەکی بە سیاسەتەوە نەبێت، تا چەند رۆژێکیش لاشەکانیان لەسەر شەقامەکان دەمێنشتەوە، بۆئەوەی کەس هێزی دەوڵەت لەبیر نەکات. دادوەرەکە لاوێکی سی ساڵان بوو، لێمان پرسی، بۆچی وەك دەردەکەوێت هیچ کەسێك لەوانە ناگیرێن کە سیاسییەکان دەکوژن؟و بۆچی هەتا ئێستا لێکۆڵینەوە لەو تاوانانە نەکراوە کەبەرەو ڕووی هێزەکانی ئاسایش دەکرێنەوە؟ وەك رێکخراوی لێبوردنی نێو دەوڵەتیش دەڵێت، ئازارو ئەشکەنجەدان لەسەر ئاستێکی فراوانو بەپرۆگرام دەکرێن. دادوەرەکە زۆر رەوشتبەرزانەو هێمنانە وەڵامی دایەوەو

وتی، هۆکەی زۆر ئاسانەو، بەندە بە کۆنە یاساکەی تورکیاوە کە سزای پێدەدرێت چونکە ئەو یاسا نوێیەی لەم دواییەدا دانرلو پڕوپاگەندەیەکی زۆریشی بۆکرا، لەناوچە نائاساییەکەدا پێڕەوناکرێت. یاسای نائاساییەکەش دادگاییکردنی فەرمانبەرانی دەوڵەت بە دادوەری گشتی دیاریەکر دەسپێرێت، ئەویش دەستەڵاتەکەی خۆی بەرەوڕووی سەرکردەیەکی سەربازی ناوچەکە دەکاتەوە کەلەوبارەیەوە هیچ شتێک ناکات. لێمان پرسی، ئەی دووبارەکردنەوەی تاوانبارکردنی؛ پۆلیس، جەندرمە، سوپا، تیپی تایبەت ئەوە ناگەیەنێت کە بەپرۆگرام‌و لەئاستێکی بەربلاودا مافی مرۆڤ پێشێلدەکرێت‌و ناوی تورکیاش دەزڕێنێت؟ ئەویش هەردوو دەستی بەرزکردەوەو پاشان لێکی جوێکردنەوە، وەك بیەوێت بڵی کەئەو تەنیا یاسا جێبەجێدەکات، لەسایەی شەڕێکی واشدا هیچ کەسێکی سەربە ـی لەجێبەجێکردنی یاسا بەولاوە شتێکی تری پێناکرێت.

بەهەرحاڵ کەگوێم لەدادوەرەکە دەگرت، باسی خۆرناواییەکم بەبیرهاتەوە کە ۲۰ ساڵ لەوەبەر سەردانی تورکیای کردبوو، کاربەدەستە مەدەنییە حکومەتییەکانی تورکیای واباسکردووە، کەیەکن‌و فرمانی بەمەدەنییەتکردنی "کوردستانێکی هێجگار دڕ"یان پێسپێردراوە. مامۆستا فێرکردنی کوردە دڕەکانیان لەئەستۆ گرتووەو، سەربازەکانیش پاراستنی ئاسایش‌و یاساو، دادوەرانیش ئەرکە یاساییە توندەکانی تورکیایان پیادەدەکرد. ئەوان شەوانە بەدەم ئارەق خواردنەوەیەکی زۆرەوە لەو دوپشکە ژەهراویانە دەگەڕان کەلەناو پێخەفەکانیاندا خۆیان حەشاردابوو. هەربەدەم گوێگرتنی دادوەرەکەوە، یاسای ۱۸۵۰م بیرکەوتەوە، کەماوەی شەش مانگ قایمکارێتی "حەسانە" یاسایانەی تەواوی بەهەر یەکێك لەوانە دابوو کەلەدامرکاندنەوەی شۆڕشەکەی ۱۹۳۰ی ئارارانتدا بەشداریانکردبوو. کەشارەوانیمان جێهێشت، هەر بۆ خۆش دوێنی سەرێکی قایمقامیمان دا، ئەویش جەختی لەوە دەکرد کە نوسەیبین سێ مانگێکە ئارامەو هەموو شتێك باشدەڕوات.

بۆ بیرە خواردنەوە گەڕاینەوە چایخانەکە، چەکدارەکان کە ئەوسا قرتەپیان لەگەڵدا کردبووین، ئەگەرچی هەر گرژبوون بەڵام ئێستا دەیانویست قسەمان لەگەڵدا بکەن. پێدەچوو لەبەجێهێشتنی چایخانەکەمانەوە ئەوان هەر خەریکی ئارەق خواردنەوە بووبێتن، پێیان وتین باشتروایە پێش تاریکبوون لەشار دەرچین. بەڵام ئێمە بەگوێمان نەکردن، چونکە دڵنیابووین بەڕووناکی ناگەینە شاری ماردینی نزیکترین شار لێرەوە کە ئوتێلی تیادابێت. نیازمان نەبوو بەشەو سەفەربکەین‌و خۆمان بخەینە مەترسییەوە. چونکە ماندوو شەکەتبووین‌و لەسەر شەوەمانەوەی نوسەیبینیش سووربووین، نانی ئێوارەمان لەچێشتخانەیەکی ئاسایی خواردو ژوورێکیشمان لەئوتێلێکی ئاساییدا گرت.

کەمێك دوای سەعات ١٠ی شەو، گوێمان لەتەقینەوەیەکی گەورەو بەدوایدا تەقەی تفەنگی ئۆتۆماتیك بوو. تا بزانم تەقەکان لەکوێوەدێن بە پێپلیکانەکاندا چوومە خوارەوە، بەڵام چەند کەسێکی نیمچە ڕووتی چەك بەدەست کەلایان خستەو بەپەلە بەرەو سەر شەقامەکە رایانکرد، منیش بەرەو شوێنی تەقەکان بوومەوە، وێستگەی شەمەندەفەرێکبو کەدەڵمانەکان سەرەتای ئەم سەدەیە بۆ هێڵی نێوان بەرلین و- بەغدا

دروستیانکردبوو تا ئەمڕۆش تەواو نەببوو، لەگەڵ ئەو لافەی حکومەت بۆ بەرکەمالێتی ئاشتی خۆرهەلاتی دڕندە لێیدەدا پێکڕا هەڵتەکێنرابوون. لەگەڕاندنەوەماندا بۆ شاری دیاربەکر زانیمـان بڕلەرێکـی خۆسەویشـتی وەرگێڕەکـەمان، کەپـەیامنێری یـەکێك لـە ڕۆژنامـەکانی ئەستەنبوڵبووەو پێش چەند سەعاتێك، کاتێك بۆسەر نیشەکەی چووە، لە ناوەڕاستی شاردا کوژراوە.

پـاش چوارسـاڵ، کـە جـارێکی دی سـەری دیاربـەکرم دایـەوە، نیشـانەی توندبوونی سەرکوتکردنی دێهاتەکان و (ئارامی شارەکان)بە هەموو شوێنێکەوە دیاربوو. شێوازی ڕاگوێزانی گوندنشینەکان بەڕادەیەکی وا پەرەی سەندبوو کەدانیشتوانی دیاربەکری پایتەختی ناڕەسمی کوردستانی تورکیا بێئەندازە زیادیکردبوو، لەساڵی ١٩٩٠ەوە کە دانیشتوانەکەی ٣٨٠ هەزار کەسـبووە گەیشـتبووە یـەك ملیـۆن نیـو. زۆربـەی ئەوانـەی لـە گوندەکانـەوە ڕاگوێزرابـوون بێکـارەبوون و ئیشـێکی هەمیشـەییان نـەبوو، بـەهۆی نـەبوونی هیچ خزمـەت و یارمـەدانێکی حکومەتـەوە، بۆمەیسـەرکردنی ژیانیـان چاویان لـەو یارمەتییـە بڕیبـوو کـەبرا کوردەکانیـان دەیانـدانێ. پارێزەرێك کـە لەکێشـەی پێشـێلکردنی مـاف مرۆڤـی دەکۆڵییـەوەو، دەزگاکـانی دەوڵەتیش یەکبینە گێچەڵیان پێدەکرد، ووریایانە لەگەڵ خۆیدا بەو گەڕەکە هەژارانەی دەوری شارە کۆنەکەی سەر ڕووباری دیجلە، کە بەردەوام لەپەرە سەندنابوو، دەیگێڕام. سەرەتا لای "٤٥٠ خانووەکـە"ی لەبینایـەکی چـوار نهـۆمی پێکهـاتبوو، لەبنەڕەتـدا بـۆ گوندنشـینە لێقـەوماوەکانی بوومەلەرزەکـەی سـاڵی ١٩٧٦ لـەنزیك شـارەکەوە دروسـتکرابوو، وەسـتاین. دانیشـتوانی ئـەم خانووانـە لەچـاو خـەڵکی دیـدا بەختـەوەربوون، چـونکە لەگوندەکانیانـەوە ڕاگوێزراون و خانوویەکی وایان دەستکەوتووە تیایدا بژین، هەرچەندە زۆربەیان بێکارەن و ڕۆژ لەسـەر ڕێگایـەکی خـۆڵ و لیتـەدا بەسـەردەبەن و بێهیوایانـە، وەك هـەموو گوندنشـینێك کـە لەزەوییەکـەی ڕیشەکێشـکرابێت، بـەبێ مەبەسـت بـەملاولای خۆیانـدا دەیـانڕوانی. منداڵـە چڵمنەکانیش لـەنزیك ئەو کۆڵـە دارانەی خەڵکەکە بـۆ سووتاندن خڕیـانکردبۆوەو لەسـەریەك کەڵەکەیانکردبوون، گەمەیانـدەکرد. تا نموونـەی ژیانی گونـدیش تـەواوبێت، چەند گوێدرێـژو

بزنێك، كەخاوەنەكانیان بەر لەدەركردنیان لەگوندو راگوێزانیان دەربازیان كردبوون و بەگەڵ خۆیانیان خستبوو، بەرچاوەكەوت. چاوساغەكەم بۆ ترش و خوێنكردنی زیاتری مەسەلەكە پێیراگەیاندم، كوردی قوربانیانی راگوێزانەكەی حكومەتی تورك شوێنی كوردی قوربانیانی داپڵۆسینەكەی دەستی حكومەتی عێراقیان گرتۆتەوە.

جالەبەرئەوەی حكومەتی توركیا، ئەو كوردانەی لەكیمیابارانی ئابی ١٩٨٨ی هێزەكانی سەدام حسێن رزگاربیبوون و پەنایان بۆ توركیا هێنابوو، تا ١٩٩١ كەبۆ عێراق گەڕانەوە، "٤٥٠ خانووە" یان نابوون.

لەگەڕاندنەوەماندا، بەدرێژایی كۆمەڵە گردێك كە خانوو و كوختی بێكەڵكیان، لە گەڕەكانێكی بێ ئاو و كارەبادا لەسەر دروستكرابوو، رێگەی بەپێچ و پەنای لاوەكیمان، بۆ گەیشتنە ناوەندی شارەكە گرتەبەر. لەپڕا خۆمان لە بەردەم گەڕەكێكی نوێدا دیبەوە، خانووی وا گەورەی تیادا دروستكرابوو كە لەهیچ شتێكی كەم نەبێت، ئەمە جگە لەشەقامی قیر و شوێنی تایبەتی وەستانی ئۆتۆمۆبیل، بەڵام هەمووشیان چۆڵبوون. لە سەردانەكەی پێشوومدا ئەمجۆرە خانوانە نەبوون، بۆیە سەرسامی خۆم بەرامبەر ئەم پرۆژە نایابە نیشاندا، كەلەو شێوە خانووە گەورانەم لەناوەندی شارو دەورو بەرەكەیدا زۆر بینیبوو. پرسیم لەكوردستاندا كێ ئەمجۆرە خانووە گەورانە دەكرێت؟ برادەرەكەم وەڵامی دامەوە، هەمووی بۆ خێزانی ئەو، جەندرمەو، سەربازو، هەواڵگرو، كەسانەن كە لەئاسایشدا كاردەكەن و هێنراونەتە كوردستان تاهاوبەشی شەڕەكە بكەن. برادەرێكی ئەندازیار دەفتەرێكی پچووكی دەرهێناو چەند ژمارەیەكی لەسەر نووسی و چەند حساباتێكی كردو ئەمجا وتی: "بەنیوەی ئەو پارانەی میری ئەم چوار هەزار یەكەیەدا كە بەمجۆرە لەشاری دیاربەكردا دروستی كردوون، دووهەزارو دووسەد گوندی كورد، لەوانەی خەڵكەكانی راگوێزراون، پێچاكدەكراو واشیلێدەكرایەوە كە كەڵكی ژیانیان هەبوایەو، هەر خێزانێكی راگوێزراویش، گایەك و مانگایەك و دووسەر مەڕو دووسەر بزنی بدرایەتێ. ئەو راگوێزراوانەی چاوم پێیانكەوت، پەرۆشی خۆیانیان بۆ گەڕانەوەی گوندەكانیان رادەگەیاند، بەڵام دەیانزانی هێزەكانی ئاسایش رێگای گەڕانەوەیان نادەن. واش بەهۆی نزیكیانەوە لەگوندەكانیان، هەستیان بەسەبوورییەكدەكرد كەهەر شەڕەكە كۆتاییهات یان دەسەڵاتدارانی تورك نەرم بوون بۆی بگەڕێنەوە. پێیان وابوو ئەوەندەیان گوشار لەسەر ییە وەك لەسەر ئەو كوردانەیە كەبۆ تواندنەوەیان لەناو كۆمەڵگای توركیداو لەبیربردنەوەی زمان و داب و نەریتیان، بەرەو خۆرئاواو خوارووی توركیا كرابوونەوە.

ئەو پارێزەرەی چاوساغێتی منی دەكرد، ئەوەندەی هەڕەشە لێكرابوو، رۆژانە سەعات شەشی ئێوارە دەچووەوەماڵەوە. بەڵام بۆ خەڵكی ئاسایی، بەهۆی هێزی ئاسایشەوە، مەترسی و كرژی

ژیان لەشارەکەدا لەجاران باشتربوو. بەیانی و نیوەڕۆو ئێوارەو شەو، بۆ سەیرکردنی ئەو خانووبەرانەی کە بە بەردی ڕەش دروستکرابوون، بەشەقام و کۆلانەکانی دیاریەکردا دەسووڕامەوە، دانشتوانی شارەکەش هەمووکات بەکاریخۆیانەوە خەریکبوون و بێترس ژیان و ڕابواردنی خۆیان دەکرد. پێشتر شەقامەکان زۆر لەپێش خۆرئاوادا هاموشۆکەریان بەسەرەوە نەدەما، بەلام ئێستا چەندەرەو پۆلیس کەم بوونەتەوە. بلێی دەولەت ژێرخانی پارتی کرێکارانی کوردستانی لێکهەلوەشاندبێت، یان ناچاریکردبێت کەخەباتی نهێنی بکات؟ بەدرێژایی ئەو پاشنیوەڕۆیە لەدووی مۆزەخانەی "زیا گوکالب" دەگەڕام و دوای هەوڵێکی زۆر لەشەقامێکی لاوەکیدا، کەزۆر لەبازاڕە سەرەکییەکەوە دوورنەبوو، دۆزیمەوە. "گوک ئالپ" لە سالی ١٨٨٦دا لەم مالەدا لەخێزانێکی کورد لەدایکبووە، باوکی فەرمانبەرێکی بچووکی شارەوانی شارەکەبووە. "گوکالپ" هەر بۆخۆی خۆی فێرکردو پێگەیاند، بەرلەوەی ببێتە یەکێك لەدیارترین تیۆرزانی بزووتنەوەی نەتەوەیی تورك، شاعیرێکی بەسۆزو زانایەکی کۆمەلناسی لێهاتووبوو.

"ئیمایل دورکهایم"ی زانای کۆمەلناسی فەرەنسایی و گەلێك خاوەنبیرانی تری فەرەنسایی و ئەلمانیایی کاریان لە "گوکالپ" کردبوو، بەلام تا سالانی بەر لەجەنگی جیهانی یەکەم و ژێر سایەی "تورکیای نوێ" ناوبانگی دەرنەکرد. لەکتێبی "بنەما سەرەتاییەکانی نەتەوەی تورك" یدا، کەلەسالی ١٩٢٠دا بلاویکردەوە، "گوکالپ" بیانووی پێویستی بۆ دامەزراندنی دەولەتی ناوەندی علمانی و بەهێزی بۆ ئەتاتورك دابینکردبوو، کەبەهیچ جۆرێك لەگەل کەمایەتییەکاندا لێبوردنی نەبێت و سووربێت لەسەر بەتورككردنیان. نووسیبووی کە "نەتەوە کۆمەلێکی ڕەگەزی، ئیتنی، جوگرافی، بەڕێوەبەری، یان سیاسی نییە، بەلکو لە کۆمەلە کەسێك پێکدێت کە یەك زمان، یەك ئایین، ڕەوشت و ئارەزوو کۆیانبکاتەوە، یان بەشێوەیەکی تر بلێین، جۆری پەروەردە کردنیان یەك بێت". گوکالپ لەسالی ١٩٢٤دا، بەرلەوەی ئەتاتورك بۆچوونەکانی جێبەجێبکات و، ئەو ئاکامە سامناکانەی بۆ کورد هەبێت، مرد.

کوگالپیش، وەك زۆر لەو کوردانەی خزمەتی کۆماری تورکیایانکرد، لەکوتی خۆی هەلگەڕابۆوەو خۆی بەکورد نەدەزانی. ئەم نکولیکردن لەبنەچەی خۆیە هەربە تەواوەتی لەگەل بۆچوونی عوسمانییەکاندا نەدەگونجا، کەپێویست نەبوو فەلەو جوولەکەو موسلمانی ئیمپراتۆرە پەلهاوێژەکەیان نکولی لەزمانی دایك و بنەچەیان، یان تایبەتمەندێتی ڕۆشنبیریان بکەن. گوکالپ ئەوەی یەکلادەکردەوە کە "تەنانەت ئەگەر بۆمدەرکەوێت و بشزانم باپیرانم لەناوچە کوردییەکانەوە یان عەرەبییەکانەوە هاتین، هیچ دوو دلی لەتورکێتی خۆم ناکەم، چونکە لە لێکۆلینەوە کۆمەلناسییەکانمەوە فێربووم کەنەتەوە تەنیا بە پەروەردەوە بەندە".

بەدرێژایی چەند ساڵێك، لەچوار ڕیانە سەرەکییەکاندا چاوم بۆ ئەو تابلۆیە دەگێڕا کە ڕێگای گەیشتنە مۆزەخانەکەی بۆ دیاریدەکردم. بەهیوابووم لەسەردانی مۆزەخانەکەوە لەو چەند کوردەی بەناوی تورکچێتی گشتییەوە نکوڵیان لەبنەچە کوردییەکەی خۆیان دەکرد تێبگەم. هەر گوکاڵپ و ئینۆنۆ وایان نەکردووە، بەڵکو چەندین حاڵەتی لەوجۆرە هەبووە. دوای تەنیا یەك وەچە ژەنەڕاڵێکی کوردی دی "جەمال گورسیل"، کە سەرکردایەتی یەکێك لەوسێ کودەتا سەربازییەی کرد کە تورکیا بەخۆیەوە بینی، لەساڵی ١٩٦٠دا بووە سەرۆك کۆمار. گورسیل هیچ ڕاڕاییەکی لەبەئاگاهێنانەوەی نەتەوەییە کوردەکاندا نەکردو، پێی ڕاگەیاندن کە "سوپا لەبۆردومانکردنی شارو شارەوانییەکاندا دوودڵی ناکات و، لێشاوێکی سامناکی خوێن هەڵدەستێت".

کەمۆزەخانەکەی "گوکاڵپ" م دییەوە وڕشکبووم، چونکە خانووەکە هێجگار ئاسایی بوو، بەدەوری باخچەیەکی پچکۆلەی پشتگوێخراوی بەتاڵ و حەتاڵدا، کەلەچەند مریشکێك بەولاوە هیچ شتێکی تری تیادانەبوو، دروستکرابوو. کاتێك بەناو خانووە تازە بۆیەکراوەکەدا دەسووڕامەوە، بەرپرسی مۆزەخانەکە بەخاور خلیچکییەکەوە پێیوتم: "خەریکی چاککردنەوەین". پەیکەرێکی ئەتاتورك، وەك هەموو شوێنە حکومەتییەکانی دی تورکیا، خانووەکەی پێڕازێنرابۆوە، کاتێك بەژوورە جیاجیاکانی مۆزەخانەکەدا دەسووڕامەوە، هیچ شتێکم نەبینی، شوێن پێشانگاکانی هەموو بەتاڵکرابوون. هەرچەندە ئەو کاتە هەستم بە بێهیواییەکی زۆرکرد، بەڵام ئێستا دڵنیانیم لەوەی کەئەو وەڵامەی بۆی وێڵبووم دەستگیرم بووبێت.

لەبەرئەوەی وڵاتە یەککگرتووەکان گرنگترین ئەندامی ناتۆبوو، بۆیە ڕۆڵێکی سەرەکی و گرنگی لەتورکیادا هەبوو. هەرچەندە شەڕی سارد کۆتایی پێهات، بەڵام تورکیا لەخانەی سێیەم وڵاتی لیستی یارمەتی وەرگرانی ئەمەریکادا نەهاتە خوارەوە، ئەگەرچی یارمەتییەکانی تورکیا زۆر لەوانەی ئیسرائیل و میسر کەمتربوون. لەساڵی ١٩٩٤دا کە کوردستانی تورکیا بەدرێژایی ئەوساڵە ناهەموارترین شاڵاوی کرایەسەر، بەڵام تورکیا لەهەموو دونیادا گەورەترین کڕیاری چەك بوو، بەتایبەتی چەکی ئەمەریکایی. جبەخانە سەرزبازییەکەی، کە سەدی هەشتای چەکەکانی ئەمەریکایی بوون، تانکی "ئیم ٦٠" و فڕۆکەی جەنگی تەرزی "ئێف ١٦" و، کۆپتەری سەربازیانەی تەرزی "کوبرا" و "بلاك هوك" کەناوی "ڤێلزان"یان لێنابوو، بێگومان هەر هەمووشی دژ بەکورد بەکارەهێنران. ماوەیەکی کەمی لێنەرچێت بۆمبی هێشوویی دژبەمرۆڤیان بە تورکیا نەدا. کەڕێکخراوەکانی ماڧ مرۆڤیش پەردەیان لەسەر بەکارهێنانی فڕۆکەی "ئێف ١٦"، بۆ بۆردومانکردنی گوندە کوردییەکان، لادا، کەقوربانییەکی زۆری مەدەنی هەبوو، واشنتۆن

بۆماوەیەکی کەم ڕوو زەردی بۆمایەوە. بەڵام پەنتاگۆن کەلەبەرێکی یاسایی بۆ ڕێگرتن لەبەڕێوەبەرایەتییەکەی کلنتۆن دۆزییەوە، تا نەهێڵێت بەپێی یاسای ئەمەریکایی و لەحاڵەتی چەک بەخراپ بەکارهێنانی وادا، ناردنی چەک بۆ تورکیا رابگرێت. چونکە پێشەنگی سیاسیانەو ستراتیژیانەی ئەمەریکا لەپێش هەموو شتێکی ترەوەیە. ئەوەتا ئەمڕۆشی لەسەربێت، بەهەزاران سەربازی ئەمەریکایی دەزگا هەواڵگریی و ئامێرە ڕوانگەییەکانی پەیمانی ناتۆ بەڕێوەدەبەن، کە بەهەموو شوێنێکی تورکیادا بڵاوبونەتەوەو، لەکاتی شەڕی ساردا بۆ ئاسایشی هاوپەیمانان گرنگبوون، بە تایبەتی کە شۆڕشی ئیسلامی ئێران لەساڵی ١٩٧٩دا، دەزگا هاوشێوە ئەمەریکاییە گرنگەکانی سەر دەریای قەزوینی داخست.

وڵاتە یەکگرتووەکان کەلەپەنجاکانەوە هێزی سەربازیان لەتورکیادا هەیە، ڕۆژێک چییە بۆ تێگەیشتنی کێشەی کورد سوودی لەو بوونەی خۆی نەدەبینی. سەربازو ئەفسەرە ئەمەریکاییەکانیش فرمانی توندیان پێدرابوو کەبەهیچ جۆرێک لەگەڵ هاوەڵە تورکەکانیاندا لەسیاسەت نەدوێن، چونکە بەوە ئاسرابوون کە حەز ناکەن هیچ رەخنەیەک لەسیاسەتی وڵاتەکەیان بگیرێت. لای خۆشم هەروڵکەوتەوە، لە ناوەڕاستی هەشتاکانەوە، کە هەواڵی ناوچەی کوردستانی تورکیام لەو ئەفسەرە ئەمەریکاییانەی لەدەزگا ئاسایشییەکانی ناوچەکەدا کاریان دەکرد، دەپرسی، هەموو جارێك دەحەپەسام، چونکە لەڕووداوەکانی دەوری خۆیان بێئاگابوون. رەنگە ئەوەی کەمزۆر کاری تێکردبێتم، هەستکردنەبووبێت بەوەی کەئەمانیش کەمژانە هەمان ڕەوشتی بەرپرسیارە دیپلۆماتی یان سەربازییەکانی ساڵانی حەفتای باڵوێزخانەی ئەمەریکا لەتاران دووپاتدەکەنەوە، کەئەنجامەکەی زیانێکی زۆربوو لەبەرژەوەندی نەتەوەیی ئەمەریکا. لەبەرخاتری شا، هیچ پێوەندییەکیان بە بەرهەڵستکارە ئێرانییەکانەوە نەدەکرد، یان نەیاندەویست لەپێکهاتەکەشی بگەن.

بەدرێژایی ساڵانی داهاتوو، بەڕێوەبەرایەتییە یەك لەدوای یەکەکانی ئەمەریکا، هەر بۆ ڕەوادان بە سەرکوتکردنەکانی کوردی تورکیا، گۆڕانکاری لەو بیانوانەدا دەکرد کەبۆچاولێپۆشین دەیهێنانەوە. لەپەنجاکاندا بەپەیمانی بەغدا (دوای ڕووخاندنی ڕژێمی شایانەی عێراق، لەساڵی ١٩٥٨دا گۆڕرا، بۆ پەیمانی "سەنتۆ") خۆرئاواییەکان دژایەتی وڵاتانی پەیمانیان بەرامبەر بەکورد، کە بەرماوەی پەیمانی "سەعد ئاباد"ی ساڵی ١٩٣٧ بوو پێداپۆشی. بزووتنەوە نەتەوەییەکان بەگشتی و، بزووتنەوەی کەمایەتییەکان بە تایبەتی، شوێن گومانی وڵاتانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستی سەربە خۆرئاوای، بەرلەمی پەردەی ئاسنین و ئیمپراتۆریەتی شۆرەویشبوون. لەگەڵ کزێتی جەنگی ساردو سەرهەڵدانی ئێرانی خومەینیدا، تورکیا وەك

جەندرمەی عیلمانی هێنرایە پێشەوە، تا رادەیەك بۆ وڵاتە موسوڵمانە سەرکێشەکانی دەرلوسێنی دابنێت و، بەرژەوەندییەکانی خۆرئاواش لەناوچەکەدا بپارێزێت. کۆتاییە بەپشێوییەکەی جەنگی دورگەی ساڵی ١٩٩١، لەلایەکەوە ئەمەریکای دیلی سیاسەتی ئەنقەرە کردو، لەلایەکی تریشەوە پابەندی بەرژەوەندییە ناکۆکەکانی خۆیی کرد. واشنتۆن بۆ بەکارهێنانی بنکەی ئاسمانی "ئەنجەرلیك"ی نزیك شاری ئەدەنە، بۆ خولی ئاسمانی تایبەت بە پارێزگاریکردنی کوردەکانی عێراق، تا ئاوبانگی خۆی بەهۆی کۆتاییە گەمژانەکەی جەنگی ساڵی ١٩٩١ بپارێزێت، پێویستی بەبڕیاری پێچەوپەنای تورکیابوو، بەرامبەر بەوەش وڵاتە یەکگرتووەکان چاوی لەسەرکوتکردنەکەی کوردی تورکیا دەپۆشی.

ئەم چاودێریکردنە ئاسمانییەی کەبە "پرۆڤاید کۆمفۆرت" واتە "دابینکردنی هێمنی" ناودەبرا، هەندێ جاریش ناوی "پویزد هامر" واتە "چەکوشی ئامادە"ی پێدەوترا، بە دڵی لایەنە سیاسییەکانی تورك نەبوو، چونکە بە پێچەوانەی هەموو زیرەکییەکەوە، بە هەوڵێکی ئەوتۆی ئەمەریکایان دەزانی کەپارتی کرێکارانی کوردستان باکووری عێراق بکاتە پێگە بۆکارە سەربازییەکانی خۆی دژ بە تورکیا (تەنیا رێکخراوی ژمنەراڵە باڵا دەستەکانی تورکیا راستییەکەیان بەڕادەیەکی وا درك پێکردبوو، کە پرۆڤاید کەمفورت بەچاکتر بزانن لەوەی چەندین ملیۆن کوردی عێراق بڕژێنە ناو خاکی تورکیاوە، ئەوەشی بەسەر حکومەتە یەك لەدوای یەکەکاندا سەپاندو، واشی لێکردن رێککەوتنەکە نوێ بکەنەوە). بەدرێژایی چەند ١٠ ساڵێکی رابردوو، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا سیاسەتی رەسمی تورکیا، کە نکوڵی لەبوونی پێناسەی جیاوازی کورد دەکردو بە "تورکی شاخاوی" دادەنان و، پارتی کرێکارانی کوردستانیشی بە رێکخراوێکی تیرۆریستی هیچ و پووچ دادەنا، پیادەکرا. لەگەڵ ئەمەشدا واشنتۆن و سەرجەم پایتەختە خۆرئاواییەکانی تریش، بەرامبەر بەسوود وەرگرتنەکەی پارتی کرێکارانی کوردستان لەو سەرکوتکردنانەی تورکیاو بەکارهێنانی بۆ گەیشتن بەئامانجە نەتەوەییەکانی خۆیان، کە بەو هۆیەوە لەناو کورددا دەسەڵاتی زیاتری پەیدا دەکرد، زۆر ڕاڕابوون.

هەرچەندە کوردێکی زۆر بەرهەڵستی سیاسەتی پارتی کرێکاران و پێشێلکردنەکانی مافی مرۆڤیاندەکردو، ترسیان لەئاکامە خراپەکانیشی هەبوو، دەشیانزانی ئەم سیاسەتە شێوازی سەرکوتکردنەکەی میری بەچیمەگەیەنێت، بەڵام دەرکیشیان بەگرنگی ئۆچلان و ئەو دەستکەوتانە دەکرد کە بەدەستی هێناوە. بەتاڵی تەنیا توانی پێناسەی کورد، کە زۆر پشتگوێخرابوو زیندووبکاتەوە. کەچی وڵاتە یەکگرتووەکان، لەگەڵ ئەوەیهەموو ئەرکەسانەی پلەی یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی ئەمەریکایان بۆ کاروباری مافی مرۆڤ پێسپێردرا، سەردانی تورکیایان کردو،

رەخنەیان لەپێشێلکردنەکانی مافی مرۆڤی دەوڵەت و پارتیزانەکانیش گرت، قایل نەدەبوو هیچ کارێکی دیپلۆماتیانە بکات. واشنتۆن وای بەباش دەزانی کە بەردەوام پەرداخەکەی تورکیا بە نیوەپڕی ببینێت، لەکاتێکدا تورکێکی زۆر لەباشترین حاڵەتدا دەیانزانی نیوە بەتاڵەو لێشی دەچێت. وڵاتە یەکگرتووەکان هانی ناردنی نێردراوانی بۆ تورکیا دەدا، تا کارێکی وای لەگەڵدا بکەن کاتێك لێکۆڵینەوە لەگەڵ گومان لێکراواندا دەکەن کەمتر دڵڕەق بن و، بۆ دانانان بەتاوانیشدا ئازارو ئەشکەنجەی کەس نەدەن. هەرچەند بەڵگەیەکی زۆر هەبوو سەبارەت بەبەردەوامی ئازارو ئەشکەنجەدان، بەڵام لێپرسراوانی ئەمەریکا بەهیوا بوون بە مەشقپێکردنی پۆلیسی تورك و، تەکنیکی دادوەریانەو، دانانی وەزارەتی- بێهێزو هیچ لەباردا نەبووی- مافی مرۆڤ، کاری تری لەوبابەتانە ڕتووشی ڕێنەی تورکیا بکات و، ڕادەیەکیش بۆ پێشێلکردنەکانی مافی مرۆڤ دابنێن، کەتورك هەبوو ئەوەی بەفێڵ دەزانی هەندێکی تریشیان بە خۆهەڵقورتاندن لەکاروباری وڵاتیان دادەنا. هەرچەندە وڵاتە یەکگرتووەکان پێی لەوە دادەگرت، کەئەو چاکسازیانە نەك هەر تەنیا بۆ کورد باشە بەڵکو سوودی بۆ هەموو تورکیش هەیە، بەڵام ترسی شۆڤێنیێتی تورك وای لێکرد هیچ دەستپێشخەرییەك بۆ چارەسەرکردنێکی سیاسیانەی ئەو شەڕە ناوخۆ وێرانکەرە نەکات، کەخراپ بەسەر بەرژەوەندییەکانی تورکدا دەشکێتەوە.

ئەو ناکۆکیانە گرفتی زۆری خستبووە پێوەندی نێوان وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو تورکیاوە. ئەنقەرە بەهۆی گیروگرفتی لەگەڵ پارتی کرێکارانی کوردستاندا، سیاسەتی بەرامبەر بەکورد ناکۆکبوو. ئەگەرچی کوردەکانی عێراق، لەساڵی ١٩٩٤ەوە ململانێ و شەڕی ناوخۆیان دەستپێکردەوە، بەڵام لە سیاسەتی ئەمەریکای ڕووخاندنی سەدام حسێندا (یان هەر هیچ نەبێت خۆی وا دەرخات کەدەیەوێت بیڕوخێنێت)، بە بەشێکی سەرەکی و گرنگ مانەوە. سیاسەتی تورکیاش هێند کۆك نەبوو. ئەنقەرە بێزاری خۆی لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی هەرێم و دامەزراندنی حکومەتێك کەناوچەکانیان پێ بەڕێوەبەرن نەشاردەوەو، بەکرۆکی دامەزراندنی دەوڵەتێکی دادەناو، ترسی ئەوەی هەبوو نموونەیەکی واشبێت کە کوردەکانی خۆشی چاوی لێبکەن، بۆیە چەندین کەرەت ڕایگەیاند کەبەهیچ جۆرێك ڕێ بەوە نادات. بەڵام ئەوەش وای لەتورکیا نەکرد کەساڵانە بایی ١٢ ملیۆن دۆلار، خواردەمەنی پێویست بۆ کوردەکانی عێراق نەنێرێت و، ڕێی هەریەك لەپارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان بگرێت کە لەئەنقەرەدا دەزگایەکی پێوەندی بکاتەوە. ئەگەرچی گەمارۆ ئابورییەکەی بەسەر عێراقدا سەپێنرابوو، ڕێگای هیچ ئاڵوگۆڕکردنێکی نەدەدا، بەڵام تورکیا چاوی لە ڕۆیشتنی نەوتی قاچاخی عێراق دەپۆشی

کە بەخاکەکەیدا بڕوات، ئەوەش هەم گەشەی بەخۆیداو هەم کوردەکانی عێراقیش موورچەی فەرمانبەرو خەرجییەکانی دی خۆیانیان پێ دابیندەکرد.

بێگومان بەنیازو ئامانجەکانی تورکیا، ئەم کارەی زیاتر بەوە دەچوو هەڵسوکەوت لەگەڵ نیمچە دەوڵەتێکدا بکات. بەڵام لەهەمانکاتیشدا لەنقەرە، بەو هیوایەی سەدام حسێن دەست بەسەر کوردستانی عێراقدا بگرێتەوە، واتە پارتی کرێکارانی کوردستان نەتوانێت ئەو ناوچەیە بکاتە بنکەیەك بۆ دژایەتی تورکیا، دەیویست پێوەندی دیپلۆماتی و ئابووری لەگەڵ بەغدادا دەستپێبکاتەوە. تورکیا گوێی خۆی لەوە خەواندبوو کەپێشان سەدام حسێن یارمەتی پارتی کرێکارانی دەداو پشێوی دەخستە تورکیاوە، لەبایەخی کارەکەشی کەمدەکردەوە. بەبیانووی لێکهەڵوەشاندنی پارتی کرێکارانی کوردستانەوە، بەچەندبارە بوونەوەی داگیرکردنەکانی تورکیای باکووری عێراق، تورکیا ناکۆکییەکانی نێوان هەردوو میلیشیای دووپارتە سەرەکییەکە. کەلە بنەڕەتدا هەبوون قووڵتر کردەوەو، زیاتر کرژیشی خستە نێوانیانەوە.

واشنتۆن لەسایەی سیاسەتی ((گرتنەوە دووفاقییە))کەی بەڕێوەبەرایەتی کلنتون بەرامبەر هەردوو رژێمی عێراق و ئێران هەیبوو، ئەو حاڵەی بەدڵ نەبوو، چونکە لەدوای ساڵی ١٩٩٤ەوە رۆڵی ئێران لە عێراقدا پەرەی سەند. وەك دابەشبوونێکی نێودەوڵەتیانەش، وڵاتە ئەوروپاییەکان بێپەروە ڕەخنەیان لەداگیرکردنەکە یەك بەدوای یەکەکانی تورکیای باکووری عێراق دەگرت، واشنتۆنیش هیچ گازاندەیەکی ئاشکرای لە تورکیا نەدەکردو وەڵامی ئەو رەخنانەی لێشی دەگێڕا بەوە دەدایەوە کە کاری ئەو دیوپەرەدەی پێچاکترە (ببووە بنێشتە خۆشەی ژێر دانی ئەمەریکا). چەند گەورە لێپرسراوێکی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا، جاروبار بەشەرمەوە رەخنەی وایان لە تورکیا دەگرت، کەبەتەنیا سەرکوتکردن شەڕی پارتی کرێکاران نابڕێتەوە.

بەوجۆرە واشنتۆن و ئەنقەرە کەوتنە ناو گێژاوی خواستی بەرژەوەندی خۆیان و پرۆژە ناوچەییە ئاڵۆزەکانەوە، کەڕووکەشەکەی پێنەدەچوو هیچ پێوەندییەکی بەکوردەوە هەبێت، بەڵام بێگومان یەقدانەوەی راستەوخۆی بۆیان دەبێت. ئەگەر تورکیا هاوپەیمانێکی ئەوروپایی ئارام و بەهێزو توانای ئەمەریکا بوایە، ئەوا ئەم پرۆژانە بەجێبوون. بەڵام واشنتۆن بەچاکی گوێی بەو کاریگەرێتییە خراپانە نەداوە، کە لەوانەیە ئەم سیاسەتە چەند لایەنانەدا بەسەر تورکیادا، کە هێزێکی هەرێمایەتی کاریگەری ناوچەکە نییەو وڵاتێکە بەزۆری، ئەگەر نەڵێین هەموو، لەگەڵ هەر هەشت وڵاتانی لەگەر چاو لەشەڕی کوردیشی بپۆشین، بشکێتەوە. واش بەڕێوەبەرایەتییەکەی کلنتۆن کۆی لەوە نەدەکرد کە تورکیا بە ناوەندی سیاسەتی "گرتنەوە دووفاقییە" کەی ئێران و عێراق دابنێت. واشنتۆن گومانی لەڕۆڵی تورکیابوو لە رێکخستنی کۆبوونەوەکانی وەزارەتی دەرەوەی، تورکیاو، ئێران و، سوریا، کەدەوڵەتانێکن وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەمیشە

پێویست لێك دوور ناكۆك بن، كەبەدووبارەكردنەوەی "پەیمانی سەعد ئاباد" دەچوو، ئەم دەوڵەتانە هەموو جارێك دژایەتی خۆیان بەرامبەر هەموو شتێكی كورد نیشاندەدا. (بەڵام ئەو هاوكاریكردنە دیپلۆماتیانەی كە بەشێوەیەكی رەسمی ئاشكرا دەكران، هیچ كات ئێران و، سووریاو، عێراقیان والێنەدەكرد كە زۆر بەرزێر، لەدژی توركیا دالدەی پارتی كرێكارانی كوردستان نەدەن).

بەمجۆرە، ئەو دەوڵەتانە كوردیان وەك هەڵگرو شێوازی نامەیەكی بەبیرهێنانەوە بەكاردەهێناو، "دەشیان توانی نكولی" لەهەموو تێوەگلانێك بكەن كە بەململانێی كوردو توركەوە بەندبێت. ئەنقەرە بەئاسانی كەوتە داوەكەوە، چونكە بەچاوی نزم ڕوانینە ئەم دەوڵەتانەی پێشان ولایاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بوون، وایان لێكرد كە پێوەندی دوولۆڵی خۆی لەگەڵ سووریاو عێراقدا بەتەنیا بەلایەنی ئاسایشییەوە ببەستێتەوە، وەك لایەنی ئاسایشی لەلایەنەكانی دی پێوەندییە دیپلۆماتییەكانی توركیاو وڵاتانی بیانی تر جیابن. بێگومان ئەنجامی ئەمجۆرە سیاسەتەش كارەساتبوو. بەڵام زۆربەی لێپرسراوانی تورك بیانووی كەمتواناییان بۆ دەستپێشخەری دیپلۆماتیانەی شیاو، بەو بێزارییەیان دەردەبڕی كەلە "ناوچەیەكی سەخت و هاوسێی ناهەمواردا" دەژین.

ئەنجامەكەی زۆرگران كەوت، بەتایبەتی لەسەر پرۆژەی باشووری خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵ كە بەپێی یەكەمین سێ پیتی ناوە توركییەكەیبە "گاپ- GAP " ناسراوە. لەهەشتاكاندا، توركیا، بێئەوەی پرس بەهیچ كام لەو دوو دەوڵەتی سوود لەئاوی هەردوو ڕووباری دیجلەو فورات وەربگرن بكات (مەبەست سووریاو عێراقە- وەرگێڕ)، كەوتە جێبەجێكردنی ئەو پرۆژە گرانبەها پڕخواستەی، كەبەئامانجی بەكارهێنانی ئاوی ئەو دوو ڕووبارە، بۆ ئاوەدانی ناوچەی باشووری خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵ و پەرەپێدانی دەكرا. لەبەرنەبوونی دەقێكی ڕوون و ئاشكرا، بۆ چارەسەری ناكۆكی دابەشكردنی ئاو لەیاسای نێو دەوڵەتیدا، توركیا پێی وابوو، چونكە سەرچاوەی هەردوو ڕووبارەكە لەوێ هەڵدەقوڵێت ئیتر بێئەوەی بەرژەوەندی و رای هیچ كام لە دراوسێكانی وەربگرێت، یان وەڵامی داوا یەك بەدوایەكەكانیان، لەبارەی رێككەوتنی دابەشكردنی ئاوەوە بداتەوە، یا هەردووكیشیان بەردەوامیێتی و جۆری ئاوی ئەو دوو ڕووبارەشیان بە تەواوەتی وەك سەرچاوەیەكی سەرەكی ئاوی خواردنەوە دانابێت، ئەم مافی بەكارهێنانی ئاوی هەردووكیانی هەیە. ئەنقەرە راستی گازاندەكانی سووریاو عێراقی بەوە رەتدەكردەوە كە، هاوسێكانی بۆ یەكەمین جارە، لەسایەی ئەو ئاوبەندە نوێیانەی لەسەرهەردوو ڕووبارەكە دروستكراون بە رێكوپێكی بەشە ئاوی خاوێنی خۆیانیان دەگاتێ. هەرچەندە هەرسێ وڵات كەپێوەندیان بەدوو

ڕووبارەکەوە هەبوو دانوستانی پچڕپچڕیان بۆ بەشکردنی ئاوی دیجلەو فورات دەکرد، بەڵام نەگەیشتنە هیچ ڕێککەوتنێکی دیاریکراو. بۆیە خەزێنەی پارەی نێو دەوڵەتی و، بانکی نێودەوڵەتی و گەلێك لەپارە بەگەڕخەرانی نێودەوڵەتی، لەترسی کەوتنە ناو کێشەیەکی ناوچەیی زۆر ئاسکدا، یارمەتی پرۆژەی "گاپ" یان نەدەدا، چونکە تورکیا پێشەکی کێشەکەی لەگەڵ عێراق و سووریادا نەبڕاندبۆوە. خۆرئاواییەکانیش هەرئەم پەلپانەیان هەبوو[٥٧]، بەتایبەتی کەپسپۆڕانی نێودەوڵەتی پێیان وابوو، سووریا تەنیا سەدی ٤٠و، عێراقیش هەر سەدی ٢٠ی بەشە ئاوەکانی خۆیان بەردەکەوێت. لەمانگی شوباتی ١٩٩٦دا، لەکاتێکدا سیاسییەکانی تورکیا بە پێکهێنانی حکومەتێکی نوێوە خەریکبوون، دەزگا سەربازییەکەی تورکیا، بێئەوەی ڕای سیاسییەکان وەربگرێت، ڕێککەوتنێکی هاریکاری سەربازیانەی لەبواری مەشقکردندا، لەگەڵ ئیسرائیلدا مۆرکرد. خۆ ئەگەر ئەم کارە بەلای تورکیاوە تۆڵە سەندنەوە بووبێت لەسووریا، کەیارمەتی پارتی کرێکارانی کوردستانی دەدا، ئەوا بەلای ئیسرائیلەوە ژیانەوەی "سیاسەتی دەوروبەر"ە کۆنەکەی دەگەیاند کەئەمجارەیان، تورکیای بەکاردەهێنا بۆ گوشار خستنە سەر سووریای کۆنە دوژمنی و، ئێرانی کۆنە هاوپەیمانی. ئەم هاوپەیمانێتییەی کەفڕینی فڕۆکەکانی هێزی ئاسمانی ئیسرائیلی بەسەر تورکیادا و، پێشخستنی فڕۆکە جەنگییە تورکییەکان و موناوەراتی دەریایی پێکەوەیی دەگرتەوە؛ سووریای تووشی دوودڵی کرد، بۆیە هانی ئێرانی دا یارمەتی زیاتری پارتی کرێکارانی کوردستان بدات.

کە کێشەی کورد بووەهۆی ئاڵۆزکردنی ململانێی سیاسیانەی ناوچەکە بەڕێوەبەرایەتی کلنتۆن، لەبەر هۆکارە ناوخۆییەکان؛ لەجاران زیاتر پشتی بەتورکیا بەست. دوای ڕێککەوتننامەی "دایتون"ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٩٥ کە کۆتایی بەشەڕی ٤٣ مانگەی بۆسنیا هێنا، واشنتۆن بۆ چارەسەرکردنی کێشەیەکی گەورە، کە پێدەچوو کار لەهەڵبژاردنەوەی دووەمجارەی کلنتۆنی ساڵی ١٩٩٦ بکات، داوای یارمەتی لەئەنقەرە کرد. واشنتۆن مانەوەی ساڵێك زیاتری هێزەکانی لەبۆسنیدا، یان مەشقپێکردنی سوپایەکی لاوازی موسڵمان، کەزۆری دەویست تا بەرەنگاری "سرب" و "کروات" بوەستێتەوە، هەرچەندە لە ئاستی ئەو لێدوانە سیاسیانەی لەوڵاتە یەککرتووەکاندا دەکران، لەبڕێزی پێشەوەو بەسەرەکی دادەنرا، بەڵام

---

[٥٧] وابڵاوکرابۆوە کە گوایە "گاپ" بواری کارێکی زۆر بۆ کوردەکان دێنێتە کایەوە، بەڵام ڕاستییەکەی ڕوون و ئاشکرادیاربوو کە وانییە. تەنانەت گاپ وەك پلانەکەی بۆی داڕێژراوە بەتەواوەتی کۆتایی بێت، گومانێکی زۆر لەوەدا هەیە کە کوردە نەخوێندەوارو نارۆشنبیرو ناکارامەکانی باشووری خۆرهەڵاتی تورکیا، کەناوچەیەکی هێجگار پەرێشانە بەدەست بێکاری و دواکەوتووتییەوە بخرێنەکارەوە. چونکە زەوی و زاری ناوچەکە موڵکی خەڵکی ناوچەکەیە

مەترسییەکی سیاسییانەی گەورەی دەنواند. بۆیە واشنتۆن بڕیاریدا، ئەگەرچی تورکیا لەناوچەی بەلقاندا پێشینەیەکی ئیمپریالیانەی سەردەمی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی هەبووە، بەلام لە هەمان کاتدا، بەپێی جوگرافیا ئەوەندەی نیوەی دوورە کەمەترسی راستەقینەی بەرەو روونەبێتەوە، بەدەوڵەتێکی موسڵمانی مامناوەندی لایەنگری خۆرئاواش دادەنرێت و، ئەندامی پەیمانی ناتۆشە، لەبەرهەموو ئەوانە واشنتۆن داوای مەشق پێکردنی سوپاکەی بۆسنیی لێکرد.

تورکیا بەم رۆڵە گرنگەی زۆر شادمانبوو، تا دواڕۆژیش داوای نرخەکەی بکات. بەلام کەس هەر هیچ نەبێت باسی ئەوەی نەکرد، کەچۆن تورکیایەک بەسرینەوەی پێناسەی کەمایەتییەکی کوردییەوە تێوەگلاوە، داوای یارمەتیدانی موسڵمانە گەمارۆدراوەکانی بۆسنیی لێدەکرێت، ئەوانەی کەبەرووی دەوڵەکانی دامەزراندنی "کرواتیا" و "سوربیا" ی "گەورە" دا وەستابوونەوە (لەناتورکی پشتی لەدونیای موسڵمانان کردو؛ کۆمەڵگە کەمایەتییە تورکەکانی لەناو ولایەتەکانی پێشووی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا بێکەس هێشتەوە، کەچی تورکیا لەساڵەکانی هەشتادا لاق ئەوەی لێدەدا کە هیچ بەراوردکردنێك لەنێوان چەوساندنەوەی کوردەکانی خۆیدا و، بەرگریکردن لەکەمایەتییە تورکەکانی ناو، بولگاریاو، یۆنانو، قوبروسدا نییە). گاڵتەجاڕیی بەرنامەی مەشقپێکردنی بۆسنیاییەکان لەوەدابوو، کە ئەگەر دوایی هاوپەیمانانی ناتۆ سەبارەت بەکورد، یان هەر سیاسەتێکی تری تورکیا، گوشاری بخەنە سەر ئەوا داوای نرخەکەی بکات. بەو پێیە تورکیا بۆ یەکەمین جار خۆی کردە بەشێك لەململانێ سیاسییەکەی ناوخۆی ئەمەریکا، کە مەترسییەکی زۆری بۆ داڕشتنی سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکا دەبێت، دیپلۆماتە ئەمەریکاییەکان بەهۆی ئەزموونی ساڵانی دووروودرێژی رابردوویانەوە لەگەڵ لۆبی یۆنانیو ئیسرائیلییە بەهێزەکەی ناو ولاتە یەکگرتووەکاندا، چاك لەوە گەیشتبوون.

پێوەندییەکانی ئەمەریکاو تورکیا، لەچەند ساڵێکی کەمدا زۆر ئاڵۆزو تێکئالا!! بە درێژایی ساڵەکانی سەردەمی ریگان"، "روبێرت شیتراوس هۆپی" کەلەدایکبووی ڤیەننا و، مامۆستای زانستە سیاسییەکانی زانکۆی پەنسلڤانیابوو، کرایە باڵوێزی ئەمەریکا لە ئەنقەرە. پێش ۱۰ ساڵ، ولاتە لەناوەڕاستی هەشتاکاندا کە چاوم پێی کەوت، تەمەنی سەرو هەشتابوو، بەپرسیارکردنم سەبارەت بەهۆی گوێ خەواندنی ئەمەریکا لەو پێشێلکردنە رووڵەزیادییەی مافی مرۆڤ کەلەتورکیادا دەکرێت، بەتایبەتی لە کوردستاندا، تەنگم پێهەڵچنی. لەوکاتەوە رێکخراوە خۆرئاواییەکانی مافی مرۆڤ، گومانیان لەسیاسەتی ولاتە خۆرئاواییەکان، کەچەکێکی زۆریان بەتورکیا دەداو، پێدەچوو لەشەڕە ناوخۆکەی کوردستاندا بەکاربهێنرێن، پەیداکردبوو(ئەم رێکخراوانە لەساڵی ۱۹۹٦دا هەوڵێکی بێهوودەیان دا کەوەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا بە

جێبەجێکردنی بەندی ۲۰۵ی یاسای یارمەتیدانی دەرەوەیان ئایلبکەن، کە تەنیا لە بارێکی تایبەتی نائاساییدا نەبوایە نەدەبوا چەك بەو وڵاتانە بدرێت کە پێشێلکەری مافی مرۆڤن. سەیرەکەش لەوەدابوو، وڵاتە یەکگرتووەکان هەمیشە ئەو بارە نائاساییەی دەکردە بیانووی چەکدان بەو وڵاتانە). هەرچەندە "روبیرت شیتراوس هۆپی" لە مەبەستەکەم دەگەیشت، بەڵام کاری سەرەکی ئەو دەبوا لەو دوا قۆناغە زۆر کرژییەی جەنگی ساردد، یەکبینە تورکەکان لەڕووی "ئیمپراتۆرییەتە شەڕ"ەکەی ڕوسیادا بەئامادەیی رابگرێت. بەرلەو فرتوفێڵە پیرانەیەی کە لەکاتی قسەکردندا خەون لەخۆیان دەخەن، بەچەند شتێکی بێ سەروبەری وەك، دەبێت وڵاتە ئەوروپاییەکان ئەرکی بەرگریکردنی مافی مرۆڤی ناو تورکیا لەئەستۆ بگرن، وەڵامی دایەوەو، ئەمجا لە گەرمەی قسەدا خەوت و یاریدەدەرەکانیشی لەسەر نووکی پێ هاتنە ژوورەوەو، منیان لەئۆفیسەکە بردە دەرەوە تا خەبەری نەبێتەوە. ئەوکاتە تورکیا سووربوو لەسەر پشتگوێخستنی کێشەی کوردو، ناوی "تورکە چیاییەکان"ی لێنابوون، لەساڵی ۱۹۸۷دا گۆڤاری "یەنگی گوندیم" (واتە- رۆژنامەی نوێ) کە گۆڤارێکی چەپی تورکیایە، زۆر ئازایانە، یەك ژمارەی بەتەواوەتی بۆ لێدوان لەبارەی کێشەی، کوردستان گرنگترین گرفتی وڵاتە، تەرخانکرد، واشی یەکلا دەکردەوە کەچارەسەری سیاسیانە نەبێت هیچ چارێکی تری نییە. جگە لە "کەندال نەزان"ی بەڕێوەبەری ئەنستوتی کورد لەپاریس، کەبۆ تووڕەکردنی دەستەڵاتدارانی تورکیا تەنیا ئاوهێنانی بەسبوو، کۆمەڵێك کەسایەتیی خانەنشینی مەدەنی و سەربازی، کەپێشتر لەباشووری خۆرهەڵاتی تورکیادا کاریانکردبو لەو ژمارەیەدا بەشداریانکرد بێگومان دەست بەسەر ژمارەکە گیرا، بەڵام دوای شەش رۆژ بەسەر دابەشبوونیدا،کە بەشلگرتنی دەستەڵاتی تورکیا دانرا.

ساڵێك دواتر، لەلەنقەرە سەردانی "کایا تۆپەری" قسەکەری "ئۆزاڵ"ی سەرۆکی تورکیام، لەنوسینگەکەی خۆیدا کرد. چەند ساڵێکبوو دەمناسی. هەرچەندە داواکەم درەنگبوو، بەڵام "تۆپەری" پیاوانە کاتێکی بۆ بینینی دانوەری گشتیی دیاربەکر، کە پیاوێکی کەللە رەقبوو، بۆ دیاریکردم، بەبێزارییەکی ئاشکراوە پێشوازیکردم و هیچ راستییەکیشی لەوەڵامی پرسیارەکاندا نەدرکاند. ناسیاوییەکەی "تۆپەری"م بەڕادەیەکی وابوو کەلەو کەللە رەقییەتییەی تورك بەرامبەر بەکورد هەیەتی وریای بکەمەوە، چونکە خزمەتی بەرژەوەندی تورکیا ناکات و، منداڵانەش تورکیای پێ وێران دەبێت، هەرچییەکیشم لەوخراپکاریانەی ئاسایش بینیبوو، هەمووم بۆ گێڕایەوە. بۆشم ڕوونکردەوە، کەپێموایە تورکیا شتی زۆر چاکتر ترسناکتری هەیە بیکات وەك لەگرتنی ئەو کوردانەی کەشریتی مۆسیقاو گۆرانی کوردی دەفرۆشن، تەنیا مەگەر حکومەتی تورکیا خۆی نیازی یارمەتیدانی پارتی کرێکارانی کوردستانی هەبێت، کە بێگومان ئەوەش لەگەڵ بەرژەوەندییەکانیدا ناگونجێت. کەزانیم قسەکانمی پێناخۆشە، ئیتر بەپێویستم نەزانی

ئەو شتە مێژگار نائەموارانەی بۆ بگێڕمەوە کە بەچاوی خۆم لە هێزەکانی ئاسایشی تورکیام بینیبوو. ئەوەشم پێوت، کە ئەگەر ئەو زانیاریانەی لە چاوپێکەوتنی گوندنشینەکاندا کۆمکردبوونەتەوە راستبن، ئەوا بێزارکردنی کوردە مەدەنییەکان و سووتاندنی گوندەکان، کورد لەدژی تورکیا دەبزوێنێت. زۆربەی هەرە زۆری ئەو کەسانەی چاوپێکەوتنم لەگەڵیاندا کردووە، داوای ئەو سەربەخۆییە ناکەن کە پارتی کرێکارانی کوردستان پێی لەسەر دادەگرێ، بەپێچەوانەی "ئاپۆ"شەوە مارکسیزمیان بەدڵ نەبوو. ئەوان، تەنیا داوای ئەوەیان دەکرد کە بەهاو وڵاتی پلە یەک دابنرێن و لەگەڵ تورکدا بە یەک چاو سەیربکرێن و، رێز لەکولتوورە تایبەتییەکەیان بگیرێت و، حکومەت گەشە بە ناوچەکەیان بدات کە لەمێژە پشتگوێخراوە و پارەی تیادا بخاتەگەڕ. ئەگەرچی بەدرێژایی ساڵانی رابردوو لەچەندین .زووتنەوەی یاخیبووانەی دونیای سێیەمم کۆڵیوەتەوە، بەڵام لەهۆی ئەوە نەگەیشتووم کەچۆن ئەندامێکی ناتۆی وەک تورکیا، کەحسابی دەوڵەتێکی خۆرئاوایی بۆ بکرێت، هەموو ئەوانە لەگەڵ ئەو قووچ بخوێنێتەوە. گومان لەوەشدا نییە کە تورك ئەوەندە ژیرە تێبگات، سەرکوتکردن تەنیا یاخییەکان بەهێز دەکات و خەڵکێکی زۆر دەهاوێتە ڕیزەکانیانەوە ئەوەندەم ڕەخنە لەسیاسەتی تورکیا گرت، هەستمکرد توپێری ئەگەرچی کۆنە برادەریشمە، بەڵام لەوە زیاترم لێ قەبووڵ ناکات و، لەوانەیە دەستم پێوەنێت. کە بێدەنگبووم، بەچرپە وتی: "ئاگادارم، ئاگادارم، بەڵام هەمووی ئیشی سوپایە، هەر ئۆزالیش دەزانێت چۆن لەگەڵیاندا هەڵسوڕێت".

توپێری دەیویست تێمبگەیەنێت کە ئۆزال سیاسەتمەدارێکی تورکی بێهێڵاوە، لە دوای ئەتاتورکەوە بەتواناترین کەسێکە گۆڕینی ئەو بۆچوون و بیروڕا ووشکەی لەباردابێت و، ئەو پیاوەیە کەسێیەمین کودەتای ماوەی ئەو سێ ساڵەی دوایی، ساڵی ١٩٨٠، ژەنەڕاڵەکانی سوپا دامەزراندنی حکومەتێکی بەناو مەدەنی پێبسپێرن و، دەستەڵاتی تەواویش لەدەستبگرێت، هەرچەندە لەساڵی ١٩٨٣دا بەشێوەیەکی دیموکراسیانەش هەڵبژێردرا. ئەگەرچی قسەکان رایان نەتەکاندم، بەڵام کاریگەربوون چونکە گەر سوپا نەبوایە ئەتاتورك رژێمی عوسمانی پێ لەناو نەدەبراو، لەساڵی ١٩٢٣ شدا کۆمارەکەیی پێ دانەدەمەزرێنرا. خۆ ئەگەر دەوڵەتانی دی بەپشتی بەڕێوەبەرایەتییەکەیان، یان چینی ناوەند، یان سیستەمی دەرەبەگایەتی دامەزرێنراین، بەڵام کۆماری تورکیا، کەبەهۆی ئەو دیانانەی چاویان لەخاکەکەی بڕیبوو مەترسی پەرتبوونی هەبوو، بەتایبەتی یۆنانییەکان کەدەیانویست بەشێکی خۆرئاوای لێدابڕن و ئەرمەنییەکانیش، بۆ دەستگرتن بەسەر کۆنە خاکەکەیانداو تۆڵە سەندنەوەی ئەو کوشتارەی عوسمانییەکان لەشەڕی یەکەمی جیهانیدا لێیانکردن، بەشێکی تری خۆرهەڵاتی لێدابڕن، لە بنەڕەتدا دەوڵەتێکی

لاوازبوو سوپای تورك هێنایە كایەوە. لەسەرە لایەنگرەكانی ئەتاتورك، بەنامانجی دوورخستنەوەی ناوچەی ئەنادۆڵ و دوورخستنەوەی لەپەگوڕینشە ئیسلامییەكەی و نوێكردنەوەی، جا خەڵكەكەی قایلبن یان نا، تا بەیەكجارەكی و هەتا هەتایە بەرەو خۆرئاوایان بەرن، لەسەرتاپای توركیادا پارێزگاری پاسایان دەكرد.

شۆڕشەكانی، ١٩٢٥ی كورد بەسەرۆكایەتی شێخ سەعیدی پیران، كەبۆنێكی ئاینخوازانەی پێوەبوو، شۆڕشی ١٩٣٠، كە كوردو ئەرمەنی كۆنە قوربانیان بەشداریان تیاداكرد، ستەمكاری ڕژێمەكەیان خستەڕوو. شۆڕشەكەی دواییان، كە "ڕەزا پەهلەوی" شای ئەوسای ئێران، ڕێی بەهێزەكانی توركیادا، بۆ گەمارۆدانی یاخییەكانی ناو چیا سەختەكەی ئارارات بچنە ناو خاكی ئێرانەوە، بەكارەسات شكایەوە (دوای چل و پێنج ساڵ، محەممەد ڕەزاشای پەهلەوی كوڕی ڕەزا شا، كەلەساڵی ١٩٧٥دا پشتی لەمەلا مستەفا بەرزانی كرد، هەمان ناپاكێتی باوكی دووپاتكردەوە). ئەم دوو شۆڕشەو پەلاماردانەكەی دەرسیم، وایان لەبەرپرسانی توركیا كردكەلەباشووری خۆرهەڵاتی وولاتدا مەترسی نوێبوونەوەی بزووتنەوەی نەتەوەیی كوردیان هەبێت هەربۆیە ئەم ناوچەیە تا ساڵی ١٩٥٠ بەناوچەیەكی نائاسایی دادەنراو، تا ١٩٦٥یش نەیاندەهێشت بیانییە خۆهەڵقورتێنەرەكان بچنە ناوییەوە.

هێزە چەكدارەكانی توركیا، لەپێش و، كاتی جەنگی سارددو، بەتایبەتی دواتریدا، پەڕەی كوردیان بۆ كاتی پێویست دانابوو، كاتێك كە كرژی لەگەڵ هەشت وڵاتە كەللە ڕەقەكانی دراوسێیاندا نەمێنێ، ئەوا بیانوویەكی باشبوو بۆ خۆسەپاندن بەسەر ژیانی گشتی وڵاتدا. ئەی كورد لەتەنیا شۆڕشێكدا نەبێت بەشداری لەهەر ١٨ شۆڕشەكەی نێوان هەردوو جەنگی جیهانیدا نەكردبوو؟ هەرچەندە دەزگا سەربازییەكە بەدەم تێپەڕبوونی ڕۆژگارەوە گومانی لەخۆگری چاوەڕوانكردنەكەی هەبوو، بەڵام ململانێكەی لەگەڵ پارتی كرێكاراندا، بەڕادەیەكی زۆر خەریكی كردو، واشیلێكرد كە لەناوجەرگەی كاری سیاسیانەی توركیادا بێت. "ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی"ش كەبە ڕووكەش سەرۆك كۆمار سەركردایەتی دەكات، كە لەنێوان ١٩٨٩ - ١٩٩٢دا ئۆزال بوو، بەڵام بەلای دەزگا سەربازییەكەوە، بۆ خۆلەسیاسەتی حكومەت هەڵقورتاندن و كارتێكردنی، نایابترین شتبوو. لەچوارچێوەی ئەم ئەنجومەنەدا، كە سەرۆك وەزیران و وەزیرانی بەرگری و دەرەوەو ناوخۆی تیادایە، سەرۆكی ئەركانی سوپای توركیاو، سەركردە سەربازییەكانی زەمینی و ئاسمانی و زەریایی و دەرەك، لەوانەیە ئۆزالی لێ لابەیت زۆر لەئەندامەمەدەنییەكانی دی زاڵتربوون. وای لێهات "ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی" لەهەموو دەزگاكانی تری وڵات بەدەسەڵاتتربوو، بەپێی دەستووریش سەرۆك ئەركانی سوپا، لەوەزیری بەرگری و سەرجەم ئەندامانی تری حكومەت گرنگتربوو.

ئەگەرچی هەر سوپا ئۆزالی گەیاندبووە بالاترین دەسەڵات، بەڵام پێوەندی پێیانەوە زۆر ئاڵۆزو، بگرە هەندێ جار شەرمەزاریشی بەسەر تورکدا دەهێنا، وەك چۆن جارێك لەنمایشێکدا بەشۆرتێکەوە دەرکەوت. راستییەکەی ئەو رەوشتە سەرسوڕێنەرو چاوەڕوان نەکراوانەی هێزی دابووە بازووی کەنەك هەربەتەنیا بەرامبەر سوپا بوەستێتەوە، بەڵکو بەرەنگاری هەموو ئەو کەمالیزمانەش بێتەوە کەوەك پاسی کچێتی بکەن، ئامادەن لەرێگەی پەرستنی بیروباوەڕەکەی ئەتاتورکەوە، بواری کۆمەڵگەی تورکیا نەدەن تا لەئاستی دونیادا بکرێتەوە. بڕیارە پێشەنگییەکانی ئۆزال، لەبەدەنگەوەچوونی کوردە عێراقییە هەڵاتووەکانو، لەساڵی ۱۹۹۱ەوە رێگە بە کوردی قسەکردن دانو، بەتایبەتیش هەڵسو کەوتکردنی هەمان بەماری لەگەڵ سەرکردەکانی کوردی عێراقدا، دەریانخست کەتوانای هەیە دامێنان بخاتە ناو سیاسەتی تورکیاوە، تەنانەت ئەگەر نرخەکەی وروژاندنی ژەنەراڵەکانیش بێت. دیپلۆماتێکی خۆرئاوایی کە هزمەتێکی زۆری لەو بوارەدا هەیە، دەڵێت: "ئۆزال چۆن بیری لەگرفتە سەرەکییەکانی تری تورکیا دەکردەوە هەر بەو شێوەیەش بیری لە کورد دەکردەوە، کە ئەوەش کۆمەڵگای تورکیا تەنانەت توانای بیرلێکردنەوەشی نەبوو چجای هەرسکردنی.

بەپێچەوانەی زۆربەی سیاسەتمەدارە تورکەکانەوە، ئۆزال بەو رادەیە ترسی لە دەزگا سەربازییەکە نەبوو کەنەتوانێت هیچ بکات. "محەممەد عەلی بیراند" رۆژنامەنووسو هونەرمەندی تەلەفزیۆنی تورکیا، لەساڵی ۱۹۸۸دا وەك یەکەم رۆژنامەنووسی لایەنگری میری، بەچاوپێکەوتنێکی ئوچلان قەیرانێکی گەورەی لەوڵاتدا نایەوە چاکەی چاوپێکەوتنەکەشی بۆ ئۆزال دەگێڕایەوە "رێگا بەکەسانی وەك من دەدا لە سایەیدا کار بۆ لێکۆڵینەوەی وورد لەبارەی کێشەی کوردەوە بکەم". لەبەرامبەریشدا "سولەیمان دیمیریل"ی کۆنە کێبەرکێکەری ئۆزال کەلەسەرۆکایەتی وەزیراندا و دواتریش لەسەرۆکایەتی کۆماردا جێگەی گرتەوە، هەرگیز ئەوەی لەیاد نەدەکرد کە لەچەند دە ساڵێکی رابردوودا سوپا دوو کەڕەت نەیهێشتووە دەسەڵات بگرێتە دەست، خەڵکی تورکیا بەزۆری لەوباوەڕەدا بوون کە دیمیریل بەڕادەیەکی وا لەکودەتایەکی تری سەربازیانە دەترسێت، کە رۆژنامە نووسێك بڵێت، دیمیریل پێی وایە کە "ئەگەر گوو بە دەرپێکەشیا بکات سوپا بۆنی دەکات"، سوپاش سوودی چاکیان لەو ترسەی دەبینی.

بەڵام ئۆزال لەبەرامبەر سەربازەکاندا بەو جۆرە رەفتاری نەدەکرد، رۆژگار ئەو توندییەی نەهێشت کەلایەنگرەکانی دەیانویست. ئۆزال دوای کوشتنی نزیکەی ۱۰۰ کەسێکی مەدەنی لەپێکادانێکی خوێناوی یەك لایەنیدا، کە لەئاهەنگەکانی جەژنی نەورۆزدا، لەئازاری ۱۹۹۲دا

لەگەڵ هێزەکانی ئاسایشدا ڕوویدا، بەڕێوەبەرێتی ناوچە نائاساییەکەی کوردی بەتەواوەتی بەسوپا سپارد. لەتایی هەمان ساڵیشدا هێزەکانی ئاسایش، لەئەنجامی زانیارییەکی درۆدا کە گوایە چەکدارێ پارتی کرێکارانی کوردستان لەشاری "شیرناك"ی نزیك سنووری عێراق هەن، هێرشیان بۆ شارەکەبردو زیانێکی زۆریان لەشارەکەداو ۲۰۰۰۰ کەسێکیش لەترسی ژیانی خۆیان هەڵاتن.

بەرەوڕووکردنەوەی ناوچە نائاساییەکە بەسوپا ئەو ئەنجامانەم بەدینەهێنا کە مەبەستبوون. لەسەرەتای ۱۹۹۲دا، کوشتن و وێرانکاری لەکوردستاندا گەیشتە ئەوپەڕی و، هیچ کەسێك، بەکەمالیزمە توند ڕەوەکانیشەوە، نکولیان لەوە نەدەکرد کە کێشەی کورد گرنگترین گیروگرفتە لەتورکیاداو لاوازیشی دەکات. ئەمجا لەپڕێکاو، لەدوای ساڵی ۱۹۸٤ەوە تروسکە هیوایەك بەدیارکەوت. لەسەر پێداگرتنی زۆری جەلال تاڵەبانی، ئۆچەلان لە ۱۷ی ئازاری ئەو ساڵەدا رایگەیاند کە لە ۲۱ی ئازارەوە یەك لایەنە بۆماوەی مانگێك تەقەی رادەگرێت. ئەگەرچی پێشتر ئۆچەلان لەساڵی ۱۹۹۰دا داوای ئاگربەستی لەتورکیا کردبوو، بەلام ئەمجارەیان خۆی دەستپێشخەری کردووەو، بەڵێنیشی داوە کەچەکدارەکانی بۆ بەرگری لەخۆکردن نەبێ تەقە نەکەن. چوار ڕۆژ پێش ئاگربەستەکە، جەلال تاڵەبانی لەچاوپێکەوتنی ڕۆژنامەیەکی تورکیدا رایگەیاند کە، ئۆچەلان ئامادەیە واز لە چەکداری و تیرۆر بهێنێت و، دانوستان لەسەر چارەسەرێکی سیاسیانە بکات کە سەربەخۆیی کوردستانی تیادا نەبێت. تاڵەبانی درێژەی بەقسەکانی دا، کەئەگەر تورکیا ئۆچەلان بەدانوستانکەرێکی باش نەزانێت،ئەوا ئۆچەلان دانوستانەکە بەرەوڕووی ئەندامە کوردەکانی ناو پەرلەمانی تورکیا بکاتەوەو، لەبری ئەو لەگەڵ حکومەتی ئەنقەرەدا دابنیشن.

لەو ماوەیەدا دیپلۆماتێکی زۆری خۆرئاواییەکان لەتورکیادا، پێیان وابوو پارتی کرێکارانی کوردستان، لەڕووی سیاسی و سەربازیشەوە لەپەرەسەندندایە. ئەوکاتە پارتی کرێکاران هێندە شای بەخۆبوو، بەلەخۆبایوونێکی زۆرەوە گەشتیارە بیانییەکانی ئاگادارئەکردەوە، کەبۆ سەردانی باشووری خۆرهەڵاتی تورکیا دەبێت ڤیزە لە ئۆفیسەکانی ئەورووپای ئەو وەربگرن. خەڵکی بێچەك و هێزەکانی ئاسایشی تورکیاش پرکێشیان نەدەکرد شەوانە بەشەقامی شارو شارۆچکە کوردییەکان و بەگوندەکاندا بسووڕێنەوە. بەلام تورکە توندڕەوەکان، تا چەند مانگێکیش هەر قسەیان لەوەدەکرد کەملمڵانێ لەناو پارتی کرێکاراندا بۆتە مۆرانەو بنکۆڵیەکات و ئۆچەلانیش خەریکە دەستەڵاتی زۆر بەسەریاندا ناڕوات و، ئاگربەستەکەشیان بەبەڵگەی بەزینیان لەڕووی هێزەکانی تورکیادا دەزانی و، سووریش بوون کەهیچ دەستکەوتێکی سیاسیانەی نەدرێتێ. بەلام کەمایەتییەکی ماقوڵ، ئاگربەستەکەی ئۆچەلانیان بەدەرفەتێکی باشی قسە لەسەرکردن و

دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەکی کێشەی کورد دادەنا. ئەگەرچی ساڵی پێشوو ئۆزال پاشەکشەیەکی لەبەردەم سوپادا کردبوو، بەڵام لەم بارەی ئێستادا دەبوا پێوەندییەکەی بنبڕنەبوایە. لەناو هەموو سیاسەتمەدارە تورکەکاندا ئۆزال تاکە کەسێك بوو توانایەکی سیاسانەی وای هەبێت شتەکان بەچاکی ببینێتو، ئارەزووی ئەزموونێکی نوێی بۆ کارێکی وابەبێت کە لەتورکیادا وێنەی نەبووبێت. ئەمە جگە لە دۆزینەوەی شێوازێك کە بەجۆرێك کۆتایی بەشەڕەکە بهێنێت، هەموو لایەنەکان پەسەندی بکەن.

ئۆزال لە لوبنانەوە زانیاری لەو ڕۆژنامەنووسە تورکانەی پێوەندییان بەئۆچەلانەوە هەبوو گەیشتێ کە نزیك بوونەوەی ئاگربەستیان دەگەیاند. ئۆزال گومانی لەئاگربەست هەبوو، چونکە باوەڕی وابوو کە سووریای پارێزەری سەرەکی ئۆچەلان ترسی لەدەستچوونی پارتی کرێکارانی هەبێت کەوەك ئامێرێکی گوشاری ململانێی سەر ئاوی فورات، لەگەڵ تورکیادا بەکاری دەهێنا. بەڵام هەر لەچەند ڕۆژێکدا ئۆزال ئامادەبوو بەڕووی ئەودا بوەستێتەوەو، بگرە ڕۆژنامەنووسی تورك "جەنگیز چاندار" کەتازە لە سەردانێکی تایبەتی ئوچەلان گەڕابۆوەو پێشتریش لە ۱۹۹۱دا چاوپێکەوتنی لەگەڵ کوردەکانی عێراقدا بۆ سازکردبوو، لەپرۆژەی چارەسەری کێشەی کورد ئاگادارکرد. دوای دانیشتنێکی شەوانەی چوار سەعاتی لەئەنقەرە، ئۆزال چانداری ئاگادارکرد، ئەم دەرکردنی لێبووردنێکی گشتی بۆ چەکدارو ئەندامانی پارتی کرێکاران، کەبەچەند هەنگاوێکدا بڕوات، بەچاك دەزانێت. سەرەتا لێبووردنێکی گشتی بۆ سەرجەم ئەندامانی پارتی کرێکارانی کوردستانو ئەو چەکدارانە دەربکرێت کە تاوانێکی دیاریکراویان لەسەر نییەو ڕێشیان بدرێت بچنەوە ناو کۆمەڵ. دوو ساڵ دواتریش لێبووردنێکی دی بۆ بەرپرسانی پارتەکەو بگرە سەرکردەکانیشیان دەربکرێت، بەمەرجێك ئوچەلان خۆی دوای پێنج ساڵ ئەوەی لەگەڵدا بکرێت.

ئەوەی ئەنگی بەئۆزال هەڵچنیبوو، چۆنێتی پشتگیریکردنی پەرلەمانو حکومەتبوو کە توندڕەوەکان دەستیان بەسەردا گرتبوو، تا ئەو ساتەش پێیان لەسەر ئەوە دادەگرت کەدەوڵەت "هەرگیز دانوستان" لەگەڵ تیرۆرستاندا ناکات. سەرۆکی تورکیا گرنی دڵی خۆی بۆ چاندار کردەوە کە وتی "زۆر لەسوپا دوودڵ نیم چونکە ئەوان لە ڕیزی پێشەوەی بەرەنگاربوونەوەی چەکدارەکانی پارتی کرێکاراندانو، دەزانن جەنگ چییەگەیەنێت، بەڵام لەسیاسەتمەدارە مەدەنییەکان تەواو دوودڵم". ئۆزال بڕوای تەواوی بەتایلکردنی ژەنەڕاڵ "دوگان گوریش"ی سەرۆك ئەرکانی سوپای تورك، کەبەتوند ئاسرابوو، هەبوو، ئازی بەوەشەوە دەکرد کەئەم وەك سەرۆك کۆمار دەتوانێت "گوریش" بۆ ساڵێکی تریش لەجێگاکەی خۆیدا بهێڵێتەوە. بەڵام

گەشبینییەکەی ئۆزال هەموو کوردی پێڤایل نەکرا، چونکە هەندێکیان گومانیان لەوو لە هەر مەدەنییەکی تریش دەکرد، کەهێندە بەتوانابن کار لەهەڵوێستی هێزە چەکدارەکانی تورك بکەن، یان بەلای خۆیاندا رایبکێشن. "ئەحمەد تورك" کەسەر بە گرنگترین عەشیرەتی کوردەو بەکۆنترین پەرلەمانتاری کوردی ناو پەرلەمانی تورکیاش دادەنرێت، ئەوەی یەکلادەکردەوە، کەئۆزال هەر لەو ماوەیەدا پێی وتووە "تا کاریگاتە سەر گەورە ژەنەراڵەکانی سوپاو، بۆ چارەسەرێکی ئاشتیانە"ی کێشەی کورد هانیان بدات، سوورە لەسەر بەردەوامبوونی هەوڵەکانی. تورك ئەرکاتە گەیشتە ئەو ئەنجامەی، کەئۆزال لەبەدەستهێنانی ئامانجەکەیدا دڵنیا نەبوو، چونکە قسەکەی خۆی "کەهەوڵی پێوەندییەکی باش لەگەڵ هێزە چەکدارەکاندا دەدات، وایدەگەیانىد کە دەستەڵاتی راستەقینەی وڵات بەڕێوەبردنی نییە".

کاتێك ئۆزال مشتومڕی لەسەر ئەوشتانە دەکرد کەلەئارادابوون، پێی لەسەرئەوە دادەگرت کە دەوڵەت نابێت بۆ رێککەوتن لەگەڵ پارتی کرێکاراندا پەلەبکات، ئەگینا خۆی دەخاتە ڕیزی ئەوەوە. پێویستە دەوڵەت "دەست ولێ لەوەبهێنێت کەڕۆڵێکی مامناوەندی" لەبەرامبەر ئۆچەلاندا هەبێت و، دەبێت دەستپێشخەرییەکەشی لێبستێنێتەوە. ئەوکاتە ڕەمەزان، کەمانگی ڕۆژووی موسوڵمانانە، لەتەواو بووندا بوو، ئۆزال وای پێباش بوو تا دوای پشووی جەژنی ڕەمەزان، کە هەفتەیەکی ڕێك دەخایەنێت، هیچ نەکات. رێککەوت جەژنی نەورۆزیش لەوماوەیەدا بوو، جەژنەکە، بەهۆی فرمانەکانی ئۆچەلان بۆ ئەندامانی پارتەکەی و، ئۆزال بۆ هێزی چەکدار، بەهێمنی و بەبێ خوێنڕشتن گوزەریکرد.

چاندار کەبەفڕۆکە لەو سەفەرە دووردرێژەی زۆریەی کۆماره شوورەوییەکانی پێشووی ئاسیای ناوەڕاستی گرتبۆوە، گەڕایەوە بۆ ئەنقەرە، جارێکی تر لە ١٥ نیسانی ١٩٩٣دا لەگەڵ ئۆزالدا کۆبۆوەو پێی راگەیاند کە ئۆچەلان ئامادەیە ڕۆژێك دوای کۆتاییهاتنی ماوەی ئاگربەستەکە، بەبێ هیچ مەرجێك درێژی بکاتەوە، ئۆزال هەواڵەکەی پێخۆشبوو، بەلام وتی:"بەلام دەترسم ئەو بێنەقلانە هەموو شتێك تێکدەن".

چاندار لێی پرسی مەبەستت لەو "بێ ئەقلانە" کێیە؟ ئۆزال بەمنجەمنجێکەوە وتی "حکومەت". باوەڕی نەدەکرد ئەندامانی حکومەت لەئامادەکردنی هیچ چارەسەرێکی کێشەی کورددا بەشداری بکەن، بۆیە وای راگەیاند کە گوێیان نەداتیّ و بە رەزامەندی دادگای دەستووری لێبوردنێکی سەرۆکایەتیانە دەربکات. ئۆزال وتی:"هەرئەوەندەی بێمەوە بۆ ئەنقەرە، دەبێت بەپەلە شتێك بکەم، چونکە ئەگەر ئەم دەرفەتە لەدەستبدەین ئەوا بارودۆخەکە هێجگار ئاڵۆزدەبێت".

سەرۆکی تورکیا ڕەزامەندێتی خۆی بۆ کۆبوونەوەیەکی تری چاندار، کە دوای دوو ڕۆژی دی لەئەستەنبوڵ بکرێت، نیشاندا. بەڵام لە١٧ی نیسانی ئەو ساڵەدا بەنەخۆشی دڵ گیانی لەدەستدا. لەئێوارەی ١٦ی نیساندا دواکۆبوونەوەی لەگەڵ دیمیرێلدا کرد، کەمانگێک دواتر جێگەی گرتەوە. سیاسەتمەدارانی تورک بەڕادەیەك بەجێگرتنەوەی ئۆزالەوە خەریکبوون، گوێیان بەئاگربەست، یان داوا سووککراوەکانی ئۆچەلان نەدا. بەهەرحاڵ ئەوکاتەوە ئارەزووەکەی ئۆچەلان بۆ دانوستانکردنی ئەنقەرە هیچ ئالیکردنەوەیەکی ڕاستەقینەی لەگەڵدا نەکرا. تورکەکان وایان بەباشدەزانی کەهەرچی شتێك بەمەسەلەی کوردەوە بەندبێت بەهیچ جۆرێك دانوستانی لەسەر نەکرێت، جا دانوستانەکە لەبەهێزییەوە بێت یان لەبێ هێزییەوە، چەندیشیان بۆ بکرێت خۆیانی لێ بەدوور بگرن. بەڵام چەند ڕۆژنامەنووسێکی تورکی لایەنگرانی دەزگا میرییەکان کە هەردوولای شەڕیان پێکدەگەیاند، لەبوونی پێوەندییەکی نهێنی نێوان هەوڵگرانی تورکیاو ئۆچەلان بەگومانبوون.

تا ئەمڕۆشی لەسەربێت ئەو هۆیانەی ئۆچەلانیان والێکرد کە بۆ ئاگربەست بەدەنگ پێشنیارەکەی تاڵەبانییەوە بچێت، ڕوون نەبوونەتەوە. ڕەنگە هەستی بەزۆر لەسەرکەوتنی خەباتی چەکدارانە کردبێت کەبەردەوام لەبەرزبوونەوەیەکی خراپدابوو، چونکە لەمانگی ئازاری ١٩٩٣دا بەچانداری وتبوو، دەیەوێت ئاگربەستێکی یەکلایەنانە ڕابگەیەنێت، تا کۆتایی بە "گوند وێرانکردن و ڕاگوێزانی خەڵکە"کەی بێت. ئەوەش وادەگەیەنێت کەئازاری ئەوشتانە بۆ پارتی کرێکاران پشتشکێنبوو، ئەگەرچی ئازارە دەروونییە چەسپیوەکانی ئۆچەلان زۆر قووڵتربوو، یەکبینە بۆ ژێری بزووتنەوە ڕزگاریخوازە نەتەوەییەکان دەگەڕایەوە کە پەرێشانکردنی دوژمنە بەهێزترەکەیە، دەیوت: "زۆرچاك لەوە دەگەم کە ئێمە بەسەر سوپای تروکدا زاڵ نابین بەڵام دەتوانین کارێکی وابکەین زۆری لەسەر بکەوێت". ئەمجا بیری لەوەدەکردەوە کە خۆی ببێتە یاریکەرێکی سەرەکی لەژیانی سیاسییانەی تورکیادا، ئەویش بێئەوەی لەو وەرچەرخانە سامناکەی بەوەی دەگەیەنێت بدوێ.

دوای مانگێك، ئەحمەد تورك پاش چاوپێکەوتنی ئۆچەلان، لەلوبنان گەڕایەوە، گەیشتبووە ئەو بڕوایەی کە ئۆچەلان خەریکە دەرك بەوە بکات کە "ئیمپریالیزم پڵنگێکی لە کاغەز دروستکراو نییە"[58] بەڵام سەرۆکی پارتی کرێکارانی کوردستان هێشتا زۆری مابوو ببێتە پیاوێکی سیاسی کامڵ. ئەو ڕۆژەوە داواکارییە ئاشکراکانی ئۆچەلان مافی چارەی خۆنووسینیان تیادا نەما. کاتێك لەناوەڕاستی مانگی نیساندا درێژەی بە ئاگربەستەکەدا، ئۆچەلان

---

[58] وتەیەکی ماوتسی تۆنگی سەرۆکی سینە. (وەرگێڕ)

داواکارییەکانی خۆی هێنایە سەر "مسۆگەرکردنی ئازادییە کولتوورییەکان، مافی بەکارهێنانی زمانی کوردی لەدەزگا راگەیاندنەکاندا، نەهێشتنی پاسەوانانی گوندەکان و، لابردنی باری نائاسایی و، دانانی بەمافی سیاسیانەی رێکخراوە کوردییەکاندا"، کە تورکە هێمنەکانیش هەر ئەوەیان داوادەکرد.

بەبڕوای راستەقینەی ئۆجەلان سەبارەت بەئۆزال هەرچۆنێك بووبێت، مردنەکەی زۆر کاریتێکرد. چونکە لەساڵی ١٩٩١دا رایگەیاند کە "ئۆزال تەنیا کەسە چارەسەری کێشەکەمانی پێبکرێت". کەئەویش مرد ئۆجەلان بێئەوەی گوێ بەزۆر قەڵەوییەکەی و نەخۆشییە هەمیشەییەکەی دڵی بدات، پەرلەمانتارە کوردانەی کەبەداوای سەرۆکی تورکیا هاتبوون لەلوبنان سەردانی بکەن، وتبوو، ئەو هیچ گومانێکی لە دەرمانخواردکردنی ئۆزال نییە، ئەویش هەربۆئەوەی نەهێڵن لەتورکیادا ئاشتی بەرپابێت. ئەو قسەیە لەگەڵ جۆری بیرکردنەوە بەگومانەکەی ئۆجەلاندا تەواو دەگونجێت.

چونکە هیچ شتێکی وا لەتورکیاوە دەرنەچوو کەبایەخ بەدەستپێشخەرییەکانی ئۆجەلان بدات، ئاگربەستە یەکلایەنییەکەی کورد هەرەسی هێنا. لە٢٤ی ئایاردا، چەکدارانی پارتی-کرێکاران پاسێکیان لەنزیك شاری "بنگول"ەوە راگرت و ٣٢ سەربازی بێچەك کەبەمۆڵەت دەڕۆیشتنەوە، لەگەڵ چوارکەسی مەدەنیان تیادا کوشت. لەمانگی دواتریشدا ئۆجەلان بەڕەسمی هەرەسهێنانی ئاگربەستەکەی راگەیاندو، پارتی کرێکاران لەئەورووپادا، زنجیرەیەك کاری دژ بە بەرژەوەندییەکانی تورکیا کردو، لەباشووری تورکیاشدا دەستیان لەناوچە پیشەسازی و گەشتوگوزارییەکان وەشاند، کەدەستکەوتی ساڵانەیان بۆ تورکیا چوار بلیۆن دۆلار بوو. لەکاتێکدا شەڕەکە لەناو تورکیادا زۆر لەجاران گەرمتربوو، بەتایبەتی کەمێزە چەکدارەکان بنکەکانی شاری لیچەو کولپی نزیك دیاربەکریان کردبووە نیشان و لێیاندەدا، پارتی کرێکاران لە فەرەنساو ئەڵمانیادا قەدەغەکراو ئۆفیسەکانیشی داخرا، ناچار ئەندامەکانی بەنهێنی نیشەکانی خۆیانیان مەیسەر دەدا.

کوردو تورکێکی زۆر بێ هیچ بەڵگەیەك، پێیان وابوو ئۆزال بەر لەمردنەکەی، بۆ کۆتاییهێنانی شەڕ لەکوردستاندا، خەریکی گەڵاڵەکردن و داڕشتنی هاوکێشەیەکی سیاسیانەبووە. بەڵام بەدبەختی هەمووان، ئەمڕۆ لەتورکیادا کەسێك نییە، لەدەسەڵاتدابێت یان لەدەرەوەی دەسەڵات، توانای ئەوەی هەبێت یان چاوەڕوانی ئەوەی لێبکرێت هەنگاوێك بۆ راگرتنی شەڕەکە بنێت. زۆر لەو تورکانەی لەنزیکەوە ئۆزالیان ناسیوە، جەختیان لەسەرئەوە دەکرد کەئەگەر ئۆزال بمایە لەوجۆرە نەبوو کە کورد بەئاسانی بەسەریدا زاڵبێت. هەربۆ نموونە "پەراند" کەزۆر چاك ئۆزالی دەناسی، دەڵێت: "ئەگەر ئۆزال بمایەو چارەسەری ئەوبارودۆخەی لەئەستۆبگرتایە، ئەوا

بەجۆرێك چاری ململانێکەی دەکرد کە زۆرکەمتری لەو دۆلیانە بەکورد دەدا، کە خۆیان پێیان ولیە دەبێت دەستگیریان بێت".

منیش لەدوا چاوپێکەوتنی ٦ی کانونی دووەمی ١٩٩٣ێی ئۆزالەدا، هەر رێك ئەو بۆچوونەم لا گەلآلەبوو. چونکە پرۆژەی چارەسەرکردنەکەی کێشەی کوردی، هیچ چارێکی سیاسیانە یان کلتوریانەی لەخۆنەگرتبوو، بەڵکو تێکەڵەیەکبوو بۆ هەوڵدانی توانەوەی کوردو، چەند ئامانجێکی ئابوریانەی دیاریکرلو. جەختی لەسەر ئەوەش دەکرد کەچارەسەرکردنی ئەم کێشەیە کاتو ئارامی دەوێتو، دەیوت: "سەدی نەوەتی کورد لەخۆرهەڵاتو باشووری خۆرهەڵاتدا دەژیان، بەڵام ئێستا لەسەدا ٦٠ بۆ ٦٥یان لەوناوچانەدا دەژین کەدەکەونە خۆرهەڵاتی ئەنقەرەوەو، دوای ٢٠ ساڵێکی تر هەر لەسەدا ١٥ بۆ ٢٠یانی تیادا دەمێنێتەوە". دیاربوو بەوجۆرە سەرنجی چۆنێتی چارەسەرکردنی کێشەی کوردی دەدا، یان هەر هیچ نەبێت دەیویست وای لەمن بگەیەنێت. هەرچەندە سەرژمێرە رەسمییەکانی تورکیا پێویستیان بەووریایی ئەولو هەیە، بەڵام تا ئێستا هیچ شێوازێکی ولم بۆ سەلماندنی راستی ئەو ژمارانەی ئۆزال دایمێ، بەردەست نەکەوتووە. لەبناغەوە ئۆزال وای نیشاندەدا کە، کورد لەوە زیاترە لەسەر زەوییەکی پچووکی بەراوو بەپیتی کشتوکاڵی خۆرهەڵاتو باشووری خۆرهەڵاتدا بژین.

ئۆزال وەك پسپۆرێکی کاروبارە ئابورییەکانی بانکی نێودەوڵەتی، هەوڵی پێشخستنی باری ئابووری ناوچەکەی دەدا. لەناوەراستی هەشتاکاندا ووزەی کارەباو تەلەفۆنی بەپچووکترین گوندی کورد گەیاند، ئەوەشی بەبنەمای پەرەدان بەناوچەکە دانا، کە پێویستییەکی سەرەکی پارە بەگەرخستن بوو لەو شوێنانەدلو، حکومەت هەرلای خۆیەوە دەستی بەپرۆژە خوازیارە زۆر گرنگەکەی "گاپ" کرد کەبەهۆیەوە ٣٢ بلیۆن دۆلار چووەسەر میزانییەکەی‌و گرفتێکی زۆریشی لەگەڵ عێراقو سوریادا بەرپاکرد، کە ئەوانیش پشتگیریکەری PKK بوون. ئەمانەش هەمووی بەونیازەبوو کە لەڕووی ئابوورییەوە پەرە بەناوچەکە بداتو، لەتورکیاشدا کۆتایی بەکێشەی کورد بهێنێت. بەڵام شەر نەیهێشت ئەو هیوایە بێتەدی.

ئۆزال هەرچەندە راستەوخۆ پێی نەوتم، بەڵام زانیم کورد بییەوێت یان نا، بە دوورخستنەوەیان بەرەو خۆرئاوای تورکیا، دەیویست بیانکاتە تورك، چونکە بەحسابی خۆی تەنیا سێ یەکی ١٢ تا ١٥ ملیۆن کوردەکەی تورکیا، لەو ناوچەیەی بەپێی مێژوو کوردستانی پێدەوترێت ماون، پێشدەچێت ئابێت ژمارەیان کەمتربێتەوە، بەوەش زۆربەیان بەئاسانی زمانو کولتورو پێناسەیانو، بەتایبەتی هەستە نەتەوەییە ناهەموارەکەشیان لەبیر دەکەن. ئۆزال وتی، ئەو کوردە عێراقیانەی ساڵی ١٩٨٨ لە دەست کیمیا بارانەکەی سەدام حسێن بەرەو تورکیا

هەڵاتبوون، زۆربەیان پێخۆشبوو کە پێی وتبوون ئەنکی کوردەو تورکی نازانێت. بەڵام هەر کاتورکی سەرسام لە وتەکەی ئۆزالەوە دەرکیانکرد، ئۆزال یەکەمین سەرۆک کۆماری هەڵکەوتووی تورکیایە کوردی دەزانێت، بەخۆیانهاتنەوە.

ئۆزال کاری سەرەکی، واتە ئەو گۆڕانکارییەی بەسەر شێوازی ڕۆشتنی کوردی باشووری خۆرهەڵاتی تورکیادا هاتبوو، پشتگوێخست. پێشتر کوردی سەرجەم گوندەکانی ناوچەی ئەنادۆڵ بەئارەزووی خۆیان و بەهۆی باری ئابوورییانەوە گوندەکانی خۆیانیان جێدەهێشت و، لەپێناو ژیاندا ڕووەو شارەکان دەبوونەوە. بەڵام ئێستا هێزە چەکدارەکان بەئەنقەست و بەزۆر خەڵکی گوندە کوردییەکان ڕادەگوێزن و بەتەواوەتی گوندەکانیان پێچۆڵدەکەن. ئۆزال ڕاوەدوونانکردنی کوردەکانی شەڕەکەشی خستبووە لاوە، لەبری ئەوە سەبارەت بەو پڕۆژانەی خۆی دەدوا، کە گوایە لە کەرتەکانی خۆرئاوای وڵاتدا کار بۆ کورد پەیدا دەکات. سەبارەت بەپێکهێنانی هاریکاری ئابووری بەوڵاتانی سەر دەریای ڕەشیشەوە باسی خەونەکانی خۆی دەکرد. ئەگەرچی قسەکانی هیچی بەسەر هیچەوە نەبوو، بەڵام هیچ لێیان جاڕس نەدەبوو. جا مادام قسە بۆ ڕۆژنامەنووسێکی ئەمریکایی دەکات، هەرچەندە حاڵی تورکیاش شڕبێت، بۆچی حاڵە شڕەکەی تورکیا بە باشترین شێوە نەخاتە ڕوو؟

دوای شەش مانگ زانیم کە ئۆزال مانگێک دوای چاوپێکەوتنەکەی من نامەیەکی شەش لاپەڕەیی توندی بۆ سلێمان دیمیرێلی سەرۆک وەزیرانی ناردووە، هۆی پەرەسەندنی پارتی کرێکارانی ناو کوردە بێیوالکانی وایاسکردووە کە دەڵێت: "ئەمڕۆ کۆماری تورکیا بەرەو ڕووی هەڕەشەیەکی سامناکی وابۆتەوە، کەلەمێژوودا شتی وای بەخۆیەوە نەدیوەو ڕەنگە ببێتە هۆی بومەلەرزەیەکی کۆمەڵایەتی و بەشێکی لێدابڕێنەو هەر هەمووشمان بەژێر دارو پەردووەکەی کەوین". بەڵام لەناوەڕۆکی نامەکەیدا چارەسەرێکی سەیری بۆ ئەوکێشەیە دیاریکردبوو. ئەویش کەبەئاشکرا لەڕاگوێزانی ٢٠٠٠٠٠ کوردی ئەو ناوچانە بکۆڵرێتەوە کەهێزەچەکدارەکان مەترسی لێیان هەیە، بەڕاستیش خەریکی جێبەجێکردنی بوون. گەر ئۆزال دەرکی بەئاکامەکانی ئەم کارانە کردبێت یان نا، ئەوا ڕاگوێزانی ئەو ژمارە زۆرەی کورد بەپێچەوانەی ئاواتەکانی ئەوەوە دەکەوتەوە، ئەندامانی پارتی کرێکاران و لایەنگرەکانی، نەک هەر لە کوردستاندا دەبوون، بەهەموو شارە گەورەکانی تورکیادا پەرش و بڵاودەبوونەوە.

ڕەنگە لەباشترین حاڵەتدا ڕاگوێزانی کورد چارەسەرێکی کاتی گرفتە سەربازییەکە بووبێت، بەڵام هەرگیز ئەو ئەنجامانەی نەدەپێکا کە ئۆزال باسیدەکردن، بەتایبەتی شێوەی بیکرینەوەکەی، کەهیچ حسابێکی بۆ ڕاستی شتەکانی سەر زەوی نەدەکرد. چونکە سەرهەڵگرتنە بەکارخۆکەی پێشووی کورد، زۆر ئاسانتر کوردی پێدەتوێیەوە.

ئەو کوردانە کەزۆربەیان ناچاربوون لەپیشە بنیابەخەکاندا کاربکەن، بۆ بەرزکردنەوەی باری کۆمەڵایەتی خۆیان، منداڵەکانیان دەناردە قوتابخانە تورکییەکان. بەڵام شەڕەکە کوردە سەر لێشێواوەکانی ڕشتەتاو شارەتورکو دەوروبەرە پۆخڵەکانیانەوەو، دەرگەی گوندناسای کوردانەی داخراوو داپڕاوی وایان پێکهێنا کەهیچ کۆمەڵگەییەکیان تێکەڵاو نەبێت، تا بیانتوێننەوە. خاوەنکارە تورکەکانیش ئیشیان بە کورد نەدەدا، جارجارەش ناشتنی سەرپازە تورکە کوژراوەکان پێکدا هەڵچڕانی توندی لەگەڵ کوردە ڕاگوێزراوەکاندا بەرپا دەکرد.

نیازەکانی ئۆزال هەرچییەک بووبن و چەندێکیش توانای جێبەجێکردنیانی بووبێت، کاریان نەکردبووە سەر کەمکردنەوەی وێرانکاریی هێزە چەکدارەکان. بەڵام هەرکە مرد، دیمیرێلی جێگرەوەی ولای لەهەموو بەرپرسیارییەتێکی شەڕەکەی کوردستان هێناو، بەرەوڕووی هێزە چەکدارەکانی کردەوە. دیمیرێل ماوەیەکی زۆر پێش جێگرتنەوەی ئۆزال لەسەرکۆمارێتی تورکیادا، دانپێنانی بە"بوونی کورد" و ئەو بەڵێنانەی لەبیرخۆی بردبۆوە کەدیوارەکانی دواتری پۆلیسە بەدناوەکەی تورک بە جۆرێک لێبکات کە "وەک بناغەیەکی لەشووشە دروستکراو ڕوونبێت"، ئەو دوو ڕستەیەی دیمیرێل چەند هەفتەیەک بەر لەهەڵبژاردنەکەی پەرلەمانی تشرینی دووەمی ١٩٩١ وتنی، هیوایەکی زۆری بەکوردو باڵوێزخانە خۆرئاواییەکانی ناو تورکیا، سەبارەت بەچارەسەرکردنی کێشەی کورد دا. بەڵام زۆری نەبرد دیمیرێل ئەو هیوایانەی بڕی. لەسەرەتای سێیەم ولایەتی سەرۆکایەتی حکومەتیدا دەریخست کە ئامێرێکە سوپا چۆنی بوێت وای لێدەکات و، بەڵێنیدا بەر لەچاوپێداخشاندنەوەی ئەو سیاسەتەی بۆ کورد ڕەچاودەکرێت، پاشماوەی چەکدارانی پارتی کرێکارانی کوردستان ریشەکێش بکات. ئیتر لەوکاتەوە دیمیرێل هیچ هەڵوێستێکی جیاواز لەهەڵوێستی دەزگا سەربازییەکە نەبوو. بوونی بەسەرۆک کۆمار، هەڵوێستەکەیی پێنەگۆڕی. سەرەتا "تانسوچیلەر" کەبۆ خۆی دیاریکرد، لەسەرۆکایەتی وەزیراندا جێگەی گرتەوە، ڕایگەیاند کە خەریکی لێکۆڵینەوەی "نموونەی باسک"ە، مەبەست لەو ناوەیە کەتورک بۆ نموونەی "لامەرکەزی" سیاسیانەی ئیسپانیا بەکاری دەهێنێت. بەو مەبەستە، تانسۆچیلەر چاوی بە "فلیپی گونزالس"ی سەرۆک وەزیرانی ئیسپانیا کەوت و، نموونەی ئیسپانیایی بەدوورو درێژی لەگەڵدا باسکردو، سەبارەت بەڕێدان بە بەکارهێنانی زمانی کوردی لەپەخشی رادیۆو تەلەفزیۆندا دوا. بەڵام تاکە کۆبوونەوەیەک لەگەڵ دیمیرێل و سەرۆکایەتی ئەرکانی تورکیادا، ڕایان پێگۆڕی و بووە هەڵۆیەکی سەرگەرمی وا کەسووربێت لەسەر ئەوەی تا لەناوبردنی تیرۆر چاکسازییەکان نەکرێن. جا لەبەرئەوەی هیچ بنەمایەکی سیاسیانەی تایبەتی خۆیی نەبوو، هەستی کرد هاوپەیمانێتیکردنی لەگەڵ سوپادا، ناوبانگی

سیاسیانەی لەناو رای گشتیدا بە رادەیەکی چاك بەرزەکاتەوە، هەر ئەوەش وای لەم ژنە ئابووری ئاسەی دەرچووی وڵاتە یەکگرتووەکان کرد، هەرچەندە لەبەڕێوەبردنی ئابووری تورکیادا هێجگار ژێرکەوتو، ئەنجامەکەشی کارەساتبوو، پلەو پایەکەی خۆی بپارێزێت. لەسەرەدەمی ئەودا خەرجی سوپا دووئەوەندەی جارانی لێهات و، لەساڵی ١٩٩٤دا لەسەدا ١٢٤ هەڵاوسان ڕوویدا، کەتا ئەوسا لەتورکیادا شتی وا ڕووی نەدابوو، ئەمە لەکاتێکدا بارودۆخی ئابووریانەی وڵات پێچەوانە ببۆوەو، بەرهەمی نەتەوەیی بەلەسەدا شەش کەمی کردبوو.

ڕێچکەی ژیانی چیلەر مەودای ئابووری سیاسەتمەدارە تورکەکانی بەرجەستە دەکرد. چونکە بۆ تووڕدانی ئەو شتانەی بەلایەوە بنەما سەرەکییەکانیان دەگەیاند، هیچ ماندوێتییەکی نەدەویست. بگرە ئەو مۆڵە بەردەوامانەی بۆ قایلکردنی سوپا دیدان، وایان لێکرد تەنانەت خراپە بەرامبەر ڕەوایی حکومەتە مەدەنییەکەش بکات و، هێندە گەمژانە ڕێگای بۆ خۆتێهەڵقورتاندنی سوپا خۆشدەکرد، کەهێزە چەکدارە توندڕەوەکە ئەنجامی شەڕە خوێناوییەکەی کوردستان بەسەر ئەواندا بهێنێت، بیشیکەنە بیانووی کودەتایەکی نوێ. چیلەر ڕۆڵی "گەمژەی بەسوود"ی بۆ سوپا دەبینی، ئەگەرچی ڕاگوێزانی گوندەکان و، فڕاندنی خەڵکی و لەلاوە کوشتنی نادیار، لەماوەی دووساڵی یەکەمی دەسەڵاتیدا بەشێوەیەکی خراپ پەرەی سەند، کەچی هیچ بێزارییەکی بەرامبەر بەهیچ جۆرە سەرکوتکردنێك نیشان نەدەدا. ژمارەیەکی زۆر لەو ڕۆژنامەنووسانەی دەنگوباسی کوردستانیان دەگەیاند، سەرەونگومکران، یان لەبارێکی نادیاردا دەرانە دادگای ئاسایشی دەوڵەتی کەمالیستە توندڕەوەکان و، بەتۆمەتی پڕوپاگەندەی جیاخوازانەو خراپتریش[٥٩]، سەدانیان لێ تاوانبارکردن. دەرکەرانی ڕۆژنامەو ئەو ڕۆشنبیرانەش کەپرکێشی ڕەخنەلێگرتنی سیاسی تورکیا بەرامبەر بەکورد بکردایە، هەمان چارەنووسیان دەبوو. یەکێك لەدادگاکان زیاد لە ٢٠٠ ساڵ بەندیتی بەتەنگەی "ئیسماعیل بێشکچی" زانای کۆمەڵناسی بەناوبانگی تورکدا، دا- کەیەکەمجار لەساڵی ١٩٧١دا لەسەر بەرگریکردن لەماڵ کورد بەندکرا- چونکە سووربوو لەسەرئەوەی هەڵوێستی پشتگیریکردنی کورد بگرێت. هەروەها

---

[٥٩] لیژنەی پارێزگاریکردنی ڕۆژنامەنووسان، کەبارەگاکەی لەنیویورکە، لەڕاپۆرتی ساڵانەی ١٩٩٥یدا رایگەیاند کەزۆرترین بەندکراوی ڕۆژنامەنووس لەتورکیادان و ژمارەیان ٥٢ کەسە، زۆربەیان لەسەر گەیاندنی هەواڵەکانی کوردستان، بەو شێوەیەی کەدەستەڵاتدارانی تورکیا پێیان خۆش نەبووە، گیراون "کاتی مارتونی" سەرۆکی لیژنەکە، کاتێك داوای لەتورکیا کرد کاربە "یاسای دژایەتی تیرۆر"ی ساڵی ١٩٩١ی رابگرێت. دەڵێت: "تورکیا لەبەندکردنی ڕۆژنامەنووساندا، هەزار پەلی بەپشتی ڕژێمە زۆردارەکانی وەك ئەو ڕژێمانەی چین و سووریادا داوە". لەڕاپۆرتی ساڵی ١٩٩٧ی لیژنەکەشدا، لەپێشێلکردنی ئازادی ڕۆژنامەنووسیندا، تورکیای بەسەرقافڵەی هەموو دونیا داناوە.

لەبەردەمی دادگای ئاسایشی دەوڵەتدا، دادگایی بەناوبانگترین نووسەری تورکەو پاڵێوراوی هەمیشەیی خەڵاتی نۆبل، "یەشار کەمال" یشکرا، کەلەبنەچەدا کوردەو بەزمانی تورکی دەنووسێت و تەمەنیشی ٧١ ساڵە، لەسەرنووسینێکی لەگۆڤاری "دێرشپیگەل"ی ئەڵمانیاییدا، کەناڕەزایی خۆی سەبارەت بەو رەفتارانەی بەردەوام بەرامبەر بەکورد دەکران نووسیبووی و، تیایدا وتبووی، سەرکوتکردنە بە بەرنامەکەی کورد "لەدامەزراندنی کۆماری تورکیاوە، بەئامانجی لەناوبردنی زمان و کولتووری کوردبووە"، کەوتە بەر شاڵاوی کەمالیزمە توندڕەوەکان و لەمانگی ئازاری ١٩٩٦دا، دوای ئەوەی دادگا بەتۆمەتی "گەل هاندان بۆ رك لەستووری و قین هەڵگرتن و، پڕوپاگەندەی جیاخوازێتی" تاوانباریکرد، ٢٢ مانگ بەندێتی درا بەتەنگەیدا، بەمەرجێك جێبەجێکردنەکەی رابگیرێت. لەوەڵامدا وتی "هیچ دیموکراتییەتێك و یاسایەك نییە".

هەر هەوڵدانێك بۆ هەڵخستنی جل و بەرگە شۆڕدراوەکانی تورك لەمەندەراندا، وەك شایەتیدان لەبەردەمی کۆمیتەکانی کۆنگرێسی ئەمریکا، یان رێکخراوی "کارنیجی" لەپێناو ئاشتیدا، یان پەرلەمانی ئەوروپا، یان ئەنجومەنی یەکێتی ئەوروپای خۆرئاوا، خاوەنەکەی دەدرایە دادگاو هەندێ جاریش دەدرا بە دادگای ئاسایشی دەوڵەت. لەناوەڕاستی ساڵی ١٩٩٤دا، چیلەر پارتی دیموکراتی کوردی هەڵوەشاندەوە، چەندین پەرلەمانتارێکی سەربەو پارتە بەرەو ئەوروپا هەڵاتن و داوای پەنابەرێتی سیاسیانکرد، شەش پەرلەمانتاریشیان مانەوە، جا یان نەیانتوانی هەڵێن یان خۆگربوون، بۆ ماوەیەکی زۆریش بەندکران. بەوجۆرە پەردە بەڕووی ئەو ئەزموونە بەهاتووهووتەدا دادرایەوە، کە لەماوەی ٧٠ ساڵی تورکیادا بۆیەکەمین جاربوو، ئازادانە پەرلەمانتارانی کورد هەڵبژێردرێن. پێدەچوو حکومەت و پەرلەمانی تورکیا هێشتا لەو یەکەمین زەبرەی "پاسیوناریەیا"[90]ی "لەیلا زانا"ی کیژە کورد، کەسوێند خواردنەکەی پەرلەمانی بەهەردوو زمانی کوردی و تورکی خوارد، بەری نەدابن. ڤایەکارێتی پەرلەمانیان لەویش و لەسێ پەرلەمانتاری کوردی تر سەندەوە، هەریەکەیان بەتۆمەتی گەورەترین ناپاکێتی دانە دادگاو یەکی ١٥ ساڵیان دا بەتەنگەیاندا.

خۆئەگەر چیلەر هەر مەترسییەکیشی لەئەنجامە خراپەکانی داخستنی دەرازەنەی دەربڕینی هەڵوێستە سیاسییەکانی کورد لەکەناڵە ڕەواکانەوە هەبووبێت، ئەوا هەرگیز دەری نەدەبڕی. لەوڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا سەرۆك وەزیرانە هەمیشە قەشەنگەکەی بەردەم کامێراو

---

(٩٠) "پاسیونار" ئازناوێکە بەژنە سەرکردەیەکی پارتی کۆمۆنیستی ئیسپانیایی "دولوریس ئیباروری" درا، کەلەجەنگی ناوخۆی ساڵانی ١٩٣٦ - ١٩٣٩ ئیسپانیادا، دروشمی "گوزەر ناکەن"ی بەڕووی چەکدارانی فرانکۆدا بەرزکردەوە، بۆتە هێمایەك بۆهەر ئافرەتێك کە سەرکردایەتیکردنی لێبووەشێتەوە.

خۆشەویستی تەلەفزیۆن، بەتایبەتی کەبەشێوە زمانی ئەمەریکایی ئینگلیزی زۆرچاک دەزانی، ئەمەجگە لـەوەی وەك نـافرەتێکی کـەژاڵی جـوان حـوکمی وڵاتێکـی موسـڵمانی دەکـرد. کـەس سـەبارەت بـەدڵنایی سیاسـەتەکەی لێیـان نەدەپرسـییەوە[٦١] بـەهۆی کارامـەیی لەبـەڕێوەبردنی کارەکەیدا، لەسەرەتای ساڵی ١٩٩٢وە، هێزە چەکدارەکانی تورکیا، دەستی بەسەر ناوچەیەکی بەرینی ژێر دەستەڵاتی پارتی کرێکارانی کوردستاندا گرتەوە، بێئەوەی شۆڕشەکەی بەتەواوەتی ڕیشەکێش کردبێت.

لەڕۆژێکی گەردەلوولی مانگی شوباتی ١٩٩٦دا، لەشاری ئەستەنبوڵ کەپەناهەندە کوردەکانی بەرادەیەك تیادا کۆبۆتەوە، بۆتە گەورەترین شاری کورد لەدونیادا، خێزانی ئێریك بانگیانکردمەماڵی خۆیان. ماڵەکەیان لەوپەڕی شەقامێکی قوڕولیتاوی ناوچەی "کەناریا"ی هەژاری دەوری ئەستەنبوڵ بوو، کەهـەر بیسـت دەقیقەیـەك لەفڕۆکەخانـەی شـارەکەوە دوورەو ٦٥٠٠٠ کەسـی ڕاگوێزراوی نوێی گوندەکانیشی تێپەڕاندبوو، کەلەسیٚ بەش دووبەشیان کوردبوون. ئەم خێزانە گەورەیە چواربرا پێکەوە بوون و سەرجەم ئەندامانیشی ٣٠ کەس زیاترو هەمەجۆر تەمەنیشی گرتبۆوە، کە خێزانەکە بەرەسمی لای حکومەتی تورك ناونووس نەکرابوو. ئەوانیش وەك زۆربەی ئـەو کوردانـەی لەخۆرهـەڵات و باشـووری خۆرهـەڵاتی تورکیـاوە ناچـارکرابوون گونـدەکانیان چۆڵبکەن، گرفتی زۆریان لەگەڵ دەستەڵاتدا هەبوو. لەو چوار برایە دووانیان، هەرلەسەرەتەوەی گوندە چیاییەکەی خۆیانی نزیك شاری شیرناکی نزیك سنووری تورکیا لەگەڵ سوریاو عێراقدا، کـە بەبنکەیـەکی پـارتی کرێکـاران دادەنـرا، گومانیـان لێکرابـوو کەیارمەتی چەکدارانی پـارتی کرێکارانی کوردستانیان داوە، گیرابوون و لەلایەن ئاسایشەوە ئازارێکی زۆر درابوون.

عەبدولڕەحمانی ٤١ ساڵانی برا گەورەیان وتی، لـەو ڕۆژەی مانگی ئابەوە کەپارتی کرێکاران یەکـەمین چالاکی سـەربازیانەی لەشـاری ئەرواندا دژ بـەهێزە سـەربازییەکانی تورکیا کرد، کە ٦٠ میـل لەگوندەکـەی ئێمـەوە دوورە، گرفتـی نێـوان مـن و حکومـەت دەسـتیپێکرد. جەختیشـی لەوەدەکرد کەهیچ پێوەندییەکی بەو چالاکییەوە نەبووە، کەچی بیٚ هیچ هۆیەك تورکەکان گومانی ئـەوەیان لێکردبـوو کەسـەر بـەپارتی کرێکارانبێـت و، ١٩٢ ڕۆژی ڕەبـەق ئـازارو ئەشـکەنجەیەکی دڕندانـەیان داو، وەك خـۆی دەیـوت، هەرلەبەرئـەوەی ئەبۆتـە پاسـەوانی گونـد حـەوت سـاڵیان

---

(٦١) لەکانونی یەکەمی ١٩٩٢دا هەوڵی ئەوەم بوو کە وابکەم سەرنووسەری ڕۆژنامەی "د نیویورکەر" وتارێك سەبارەت بەتورکیاو گیروگرفتەکانی بنووسێت. سەرەتا پێئەچوو بەدڵیبێت، بەڵام لە پڕێکا پێی ڕاگەیاندم کەدەیەوێت تەنیا لەسەر سەرۆك وەزیرانەکەی تورکیا بنووسێت و لەچاپکەکانیشی بەولاوە خۆی لەقەرەی هیچ شتێکی دی نەدا. بێپەردە ڕوونیکردەوە، چونکە لە سەردانەکەی واشنتۆنیدا، کەلەتەلەفیزیۆندا بینیبوێتی ئیتر شەیدای جوانییەکەی بووە

حوکمدراوە. بەڵام هەر لەخۆیەوە دڵنی بەوەدا نا کەیەکێك لەکوڕەکانی ئەندامی پارتی کرێکارانە. گرتنی عەبدولڕەحمان بەبووەهۆی گرتنی "خالید"ی برا پچووکیشیان، کەلەدووری شارەکانی کوردستانەوە سەربازبووە. خالیدی ٣٥ ساڵانیش بەدرێـژیی مانگێکی لەو پێنج مانگەی لەسەربازگەدا گیرابوو، ئازارو ئەشکەنجە درا، دواتریش بە "ئەیان جار"ی دی، هێند گیراوە کە لەژماردنیاندا هەڵەی دەکرد، چونکە هەواڵگرانی تورکیا چەندێك هەوڵیان لەگەڵدابوو بیکەنە هەواڵگری خۆیان نەیکردبوو.

پۆلیس بەردەوام هەڵیان دەکوتایە سەر گوندەکەیان و، چەند خانوویەکی دیاریکراویان، بەزۆری بەگەڕو وڵاخەکانیشیانەوە دەسووتاند. دواکات خێزانەکە لەپەیامەکەی حکومەت گەیشتن و، بەرەبەرە گوندەکەیان چۆڵکردو ڕووەو "کەناریا" بوونەوە، کە پێشتر زاوایەکیانی بۆچوو بوو. ژن و منداڵانیان بەپاس و پیاوانیشیان بەلۆری بەلاش ڕۆیشتبوون چونکە ئەمەیان هەرزانترو کەمتریش دەپشکنران. وەك زۆربەی کوردە پەرشوبڵاوەکانی دی، هیچ کەسێکیان لای شارەوانی "کەناریا" ناونووس نەکرابوون، واتە هەژدە ساڵان و گەورەترەکانیشیان مافی دەنگدانیان نەبووە. بەڵام لەو دووبرایەی زۆربەی کات قسەیان لەگەڵدا دەکردم، بەگەرمی پشتگیرییان لە "هادیپ" دەکرد، چونکە "ئەو پارتە بەرگری لەپێناسەی کورد دەکات، ئەگەرچی شایانی ئەوەین وڵاتی سەربەخۆی خۆمانمان هەبێت بەڵام هەرگیز نەمانبووە"، وەك عەبدولڕەحمان دەیوت. تا شتەماوبەشەکانی نێوان هەموو کورد بگێڕنەوە، بەوانەشیانەوە کەلەگەڵ پارتی کرێکارانی کوردستاندا نین؛ عەبدولڕەحمان وتی: "دەبێ بەلایەنی کەمەوە کورد ئەومافانەی بدرێتێ کەخەڵکی دی هەیانە، بەشێکی ڕەواش پارە لەناوچەکانیاندا بەکەربخرێت".

عەبدولڕەحمان یان هەرکەسێکی تری خێزانەکە، بەپێی یاسا، بەبێ دیکومێنتی پێویست کاریان نەدەدرایە. بۆیە ناچار هەرکارێکی ڕەشیان بۆ هەڵبکەوتایە دەیانکرد. کرێکارێتی خانوو دروستکردن و ئەو جۆرە کارانەیان دەکرد کەنرخێکی کەمیان لێی دەستدەکەوت و، خاوەن کاریش پرسیاری ئەوشتانەی، داوای هیچ دیکۆمێنتێکیشیان لێنەدەکردن. جا چونکە خانووە یەك ئەۆمییەکەی تیایدا دەژیان بەپێی یاسا نەدەبووە هی خۆیان، بۆیە بەرتیلیان بەم یان ئەو لێپرسراو دەدا تا پۆلیسیان لێدووربخەنەوەو نەهێڵن هەڵکوتنە سەریان. خانووەکەیان بەیارمەتیدانی ئەو بەڵێندەرە دروستکرد کە دوان لەبراکان ئیشیان لادەکردو، یارمەتیدانەکەشی لەبری ڕۆژانەکانیان بوو. ژنێکی تورکی دۆستیشی منداڵەکانی بەناوی خۆیەوە نووسی و ناردنییە قوتابخانە.

لەچاکترین شوێنی ژووری دانیشتنە فەرش لێڕاخراوەکەیاندا، تەلەفزیۆنێک دانرابوو، بەکارەبا دزراوەکەی شەقامەکەش نیشیان پێدەکرد، هەموو ئێوارانێک سەرجەم ئەندامانی خێزانەکەی "ئیرك" لەدەوری خڕدەبوونەوەو سەیری بەرنامەکانی کەناڵی ئاسمانی "MED.TV " پارتی کرێکارانی کوردستانیان دەکرد. دەوەندەی ئەم ئێزگەیە، لە ساڵی ١٩٩٤ەوە بەرنامەکانی لەهەندەرانەوە لەڕێی مانگە دەستکردەکانەوە پەخشدەکات، ژمارەیەکی زۆر بینەرانی بۆخۆی راکێشاوە، ئەگەرچی دەستەڵاتدارانی تورکیا هەوڵێکی زۆریان بۆداخستنی دا، (بەڵام بەهۆی ئەو یاسا ئاڵۆزانەی ئێزگەکەی ناپۆی لەپێنج وڵاتی ئەورووپایی خۆرئاوادا پێدامەزرێنرابوو، تورکیا تا هاوینی ساڵی ١٩٩٦ لەدینامیکییەتی کارە تێک ئاڵاوەکەی نەگەیشت و ئەو حکومەتانەشی پێ قایل نەکرا کە پەخشەکەی رابگ ن. ئەوکاتەش کەوەستێنرا، کارگێڕانی ئێزگەکە کارامەییەکی وایان لە بەڕێوەبردنەکەیدا نواند، دوای ماوەیەکی کەم بەسەر داخستنەکەیدا خستیانەوەگەڕ). چوار براکە ٢٠٠ دۆلاریان بۆکڕینی ئامێرێک پێکەوەنا، تا کەناڵەکەی پێوەربگرن و بەرنامە پڕوپاگەندەیی و کولتورییەکانی کەبە؛ کرمانجی و، سۆرانی و، زازایی و، عەرەبی و، تورکی بڵاودەکرانەوە، ببینن. کارێکی واشیان کردبوو، گەر پۆلیسیش خۆی بەماڵەکەدا بکردایە، ئاریل و ئامێری وەرگرتنەکەی بەدی نەدەکرد.

لەوەڵامی پرسیاری، ئایا سەیرکردنی بەرنامەی تەلەفزیۆن بەزمانی کوردی تاکە داواکاریانە؟ هەموو بەیەك دەنگ وتیان هەمیشە خەون بەوەوە دەبینین بۆ گوندەکەیان بگەڕێنەوە. خالید، کە لەبراکاندا هەر لەو قوتابخانەی ناوەندی خوێندبوو، بەرهەڵستکاریکردنی رژێمی بەچاك دەزانی و، وتی:"زیاد لەسەد برادەرم لەدەستچووە، بیستیان هەر لەقوتابخانەی ناوەندیدا برادەربووین. بەڵێ شتەکە ئەوە دەهێنێت کەبۆی بچیتە ڕیزەکانی بەرهەڵستکارانەوە". هیچ دوودڵییەکیش لەدەنگیا دەرنەدەکەوت، کەقسەکەی خۆی دەوتەوە "بەڵێ ئەوە دەهێنێت".

"قەدری گۆرسێل" کەلاوێکی تورکەو پەیامنێری ئاژانسی "فرانس پرێس"ە، دوای بەسەربردنی ٢٦ رۆژ لەگەڵ جەنگاوەرانی پارتی کرێکارانی کوردستاندا، پێی وابوو کوردەکان بڕوایەکی تەواویان بەڕەوایی کێشەکەیان هەیە. گۆرسێل ئەزموونەکەی خۆی و چۆنێتی گرتنەکەی ٢١ی ئازاری ١٩٩٥ی بۆ گێڕامەوە، ئەویش دوای راگەیاندنی هەوڵی داگیرکردنی باکووری عێراق، کەسوپای تورك بەناوی "کاری پۆڵایین"ەوە کردی و ٢٧٠٠٠ سەربازی تورکیش تیایدا بەشداریانکردبوو، لە گەڕانەوەیدا بەئۆتۆمۆبیل، کۆمەڵێك لەجەنگاوەرانی پارتی کرێکارانی کوردستان بە کلاشینکۆفەوە، لەلای بازگایەکی کاتی سەر ڕێگا خێرا نێو دەوڵەتییەکەی نزیك شاری نسیبین گرتوویانە.

گۆرسێل و وێنەگرەکەی ئاژانسی ڕۆیتەری برادەری، تەنیا گازاندەیان لەخۆیاندەکرد و کەسی دی، چونکە هەڵپەی گەڕانەوەیان بۆ ئەنقەرە وای لێکردبوون کەبەشەو ڕێگە بگرنەبەر، ئەگەرچی مەترسی هاتوچۆی شەویشیان زانیوە. هەرچەندە چەکدارانی پارتی کرێکاران بەچاکی ڕەفتاریان لەگەڵدا کردبوون، بەڵام لەترسی ئاشکرابوونیان هەر بەشەو هاتوچۆیانکردووە. پاش ڕزگاربوونیان لەبۆسەیەکی سوپای تورکەو، بەهاوەن بۆردومانکردنیان و، بینینی کۆپتەر بەسەر سەریانەوە، هەردوو ڕۆژنامەنووسەکە لە هێزەکانی تورک زیاتر ترسابوون وەک لە پارتی کرێکارانی کوردستان. ئافرەتە نەخوێندەوارەکانیان. چەند ئافرەتێکی سووریایی و عێراقیان لێدەرچێت، تەنیا کوردییان دەزانی، بەڵام پیاوەکانیان تورکییان دەزانی و لەگەڵ ڕۆژنامەنووسەکاندا بەتورکی قسەیان دەکرد. هەر دووڕۆژنامەنووسەکە نوێی پیشەکەیان پێوەدیاربووە، جەنگاوەرە کوردەکان کەبەبێتەل پێوەندییان بە سەرکردایەتییانەوە کردووە، بۆ گاڵتە ناوی "دوو گوڵە سوورە"کەیان لێنابوون.

سەرکردەکانی کورد کەلەجەنگاوەرەکانیان ڕۆشنبیرترو، هەوت هەشت ساڵێکیش لەبواری سەربازیدا مابوونەوە، باسی مارکسیزمیان دەکرد، بەڵام گەریلاکان کەئاستێکی خوێندنی ئەوتۆیان نەبوو، هەر باسی نەتەوەی کوردیان دەکرد. هەمووش جەختیان لەبوونی دەوڵەتێکی کوردیانەی سەربەخۆیەکی وادەکرد کەگشت کوردی دونیا بگرێتەوە، پشتیشیان بەوە ئەستووربوو کەئەو زیانانەی جەنگەکە لەتورکیای دەدا ناچاری دانوستانی دەکات، یەکبینە باسی نوشوستییەکەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ڤیتنامیان دەکردو، بەهیوابوون لەکوردستانیشدا ئەوە ڕوویدات. لەقسەکانەوە دەرکەوت، کەمیان هەیە لەساڵ یان دووساڵ کەمتریان لەشەڕی تورکیادا بەسەربردبێت، ئەوەش تا ڕادەیەک خۆگرتنیان لەبەردەم هەموو ئەوشتانەدا دەگەیەنێت کە تورکیا دەیویست پێیانی لەتاوبەرێت. هیچ زیانێکی خۆشیان لەشەڕەکەدا نەدەشاردەوە. هەردوو ڕۆژنامەنووس کاتی هاموشۆکردنە بەردەوامەکەیان، لەبەیی ئەو زیانانەی بۆدەرکەوت کەساڵی پێشتر لە ٢٥ گوندی کورد درابوو، جا بەکاولکردن یان بەڕاگوێزانی دانیشتوانەکانیان بووبێت، ئەوەش وایدەگەیاند کەهێزەکانی تورکیا گۆمە دیموگرافییەکەی شۆڕشگێڕە کوردەکان مەلەیان تێدا دەکرد، ووشککردبێت، واتە سەرچاوەی پشتگیری خەڵکیان بۆ نەهێشتوونەتەوە.

ڕاستییەکەی خواردن خولیایەکی سەرەکی چەکدارە ڕەنگ زەردە داگەڕاوەکانبوو، بەپەڵەی زەردو سپی نینۆکیشیاندا کەم خوێنیان دەردەکەوت. زۆر کەڕەت بەشێوەیەکی گشتی خۆیان لە ڕووبەڕووبوونەوەی پاسەوانانی گوند دەپاراست، بەڵام ناوەناوەشالاویان بۆئەو ڕانە مەڕانە دەبرد کەجاش پاسی دەکردن. لەهێرشێکیاندا بۆچەند سەر مەڕێک هەشت پاسەوانیان لێکوشتن.

زۆربەی کات چەکدارەکانی پارتی کرێکاران، لەبرنج و، کێلەو، چا بەولاوە، کە بەبڕی زۆر لەئەشکەوتەکاندا دەیانشاردەوە، هیچی تریان شک نەدەبرد. جارێکیان چوونە ئەشکەوتێک کەپێشتر بنکەی سەرەکی خواردنیان بوو، پڕبوو لەقوتوی ماسی سەردین و، هێلکە و، تووناو، ساردی و، ڕۆن زەیتی بەتاڵ. یەکێک لەگەریلاکان بەسۆزێکی زۆرەوە بەمەی یادی ڕۆژانی رابردووی دەکردەوە، کەخواردنیان بەسەوزەو پەنیری تەڕو زەیتوونیشەوە، بەڕێکوپێکی پێدەگەیشت، دەیوت: "لەدەوڵەمەند دەوڵەمەندتربووین". دووڕۆژنامە نووسەکە هیچ تووڕەییەکی بەکۆمەڵی لێنەدەبینین تەنیا لەوکاتانەدا نەبێت کە شەکریان نەدەما. ئەمانە هەموو ئەخۆشییەک و دیاردەیەکی لاوازبوونیان، بەبیرکردنی ماڵ و منداڵیشیانەوە بەهیچ نەدەزانی و، هەرکەسێکیش شتێکی لەو جۆرەی لێ دەربکەوتایە گاڵتەیان پێدەکرد.

کە کوردەکان گۆرسلیان بەردا، ئەو هەر لەسەر راکەی خۆی مایەوە، بەوەی کە بڕوایەکی پتەویان هەیەو دەرفەتێکی زۆریشیان لەکیس خۆیان داوە. زۆربەی ئەندامانی ئەو یەکەیە، کەلە ٦٠ کەسێک پێکهاتبوون کوڕانی گەنج بوون و قۆناغی ناوەندیشیان تەواوکردبوو، لەدیاربەکرو شارەکانی تریشدا گەلێک بەدوای کاردا گەڕابوون و، کاتێک لەکار دۆزینەوە هیوابڕاوبوون، بۆ بەگژداچوونەوەی ئەو ڕژێمەی وای بەسەر هێنابوون و بەبێکاری هێشتبوونییەوە، چووبوونە ریزی پارتی کرێکارانی کوردستانەوە. گۆرسێل پێی وتم: "هێند بەتوانا، یان هەرناوێکی تری وەک بڕواقایمیان لێدەمێنێ، پێموایە کەسی دی وەک ئەوان لەو بارو دۆخە سەختەو بۆ ماوەیەکی وا زۆر ژیانی بۆ بەسەر نابرێت، وابزانم لەئاستی سەربازیشیاندا زۆر بەهێزن و جیوە ئاسا جێ بەخۆیان ناگرن، چونکە بەجۆرێکی جیاوازو تایبەتیش لەڕاستییەکان دەڕوانن، کۆڵنادەن". قسەکانی تەولو لەگەڵ ئەو قسانەی ئوچەلان لەشام، سەبارەت بە بنەمای مەشقە سەربازییەکەیان بە خۆمی وت، یەکیان دەگرتەوە، بەوەی کە دەبێت حساب بۆ بەهێزکردنی بیروهۆش بکرێت نەک بۆ ماسولکە.

کەلەمەنقەرە لەپەرلەماندا لە ژوورەکەی کامەران نیناندا. هەمان بۆچوونیشم لەو بیست هەپەسام. ئەم پەرلەمانتارە کوردە ناودارەی بەلایەنگری ڕژێم ناسرابوو، وتی، حکومەتە یەک بەدوای یەکەکان بەرپرسیاری ئەو قەیرانە توندەن کەبەرەوڕووی ڕژێمی کەمالیزم بۆتەوە، چونکە لەخۆرهەڵات و باشووری خۆرهەڵاتی ولاتدا رێگاوبانی راڵەکێشاوەو پەرەی بەناوچەکە نەداوەو، زانست و کاری بۆلاوانی کورد دابین نەکردووە، بۆیە لاوەکانیش "بوونەتە سووتەمەنی ئەو شەڕەی تیرۆریستەکانی پارتی کرێکاران دەیکەن" ئەمجا پرسی: "پارتی کرێکاران کێیە؟ بریتییە لەو کۆمەڵە لاوەی قۆناغی دوا ناوەندییان تەواوکردووەو لەزانکۆکاندا وەرنەگیراون، یان بێکارەن، زانیویشیانە ناهێڵن بۆ گوندەکانیان بچنەوەو کشتوکاڵ بکەن". ئەو لاوە کوردانەی

ڕووبەڕووی دوایڕۆژێکی تاریکو پەستی بوونەتەوەو دەرکیشیان کردووە کەشارەکانی باشوورو خۆرئاوای تورکیا بە کرێکارو ڕاگوێزراوە کوردەکان لیپبوو، بۆیە بەڕای ئەو، سووتەمەنی شەڕەکەن. ئاڕاستەیەکی زۆر شیکردنەوەیەکی ووردیکرد، بەڵام بڕوام نەدەکرد ئەو هێرشە توندە بکاتەسەر سیاسەتی تورکیا کە بەرامبەر بەکورد گرتوێتی.

١٠ ساڵ زیاتربوو کە "ئینان"م دەناسی و، بەردەوام بیّ ئامەم نەکردووە، بۆ من وەك "مام تۆم"[٦٢]ی کورد وابوو. پێشان پێم وابوو، دەزانم چۆن بیردەکاتەوە. بەڵام پێدەچێ وانەبووبێت، یان ئەویش لەگەڵ ڕۆژگاردا گۆڕابێت. ئینان کەتاسەر ئێسك کۆماری بوو، یاسای لەزانکۆی جنێڤ خوێندووەو، کاری دیپلۆماتیانەو وەزیری لەچەندین وەزارەتدا کردووەو، بۆ سەرۆکایەتی وڵاتیش پاڵێوراوەو، زۆر لەمێژە ئەندامی پەرلەمان و ئەنجومەنی پیرانیشە. ئەگەرا بۆ تێگەیشتنی ئایدۆلۆژیای کەمالیزم، کە زۆر بەپەروونی ڕاڤەی دەکرد، پشتی پێببەستریت. بەدرێژایی ساڵانێك بەردەوام لەبارەی زۆر شتەوە، بەتایبەتی پرۆژەی ((گاپ)) کەلەکاتی وەزیری ووزەو سەرچاوە سروشتییەکاندا کاریتێکردبوو، چاوپێکەوتنم لەگەڵدا کردووە.

زەحمەتە پیاوێکی تری وەك ئینان هەبێت کەئەوەندە دەمەتەقێت لابووروژێنێت. ڕەچەڵەکە کوردییەکەی لایەنێکی زۆر ناسکی بنەماڵەی ئەو خێزانە بەناوبانگەی شێخانی تەریقەتی نەقشبەندییە، دایکە ئەمەرنییەکەی لەقەڵاچۆکردنی ساڵی ١٩١٥ ڕزگاری بووە. ئینان ساڵی ١٩٢٩ لەئارگۆنی گاگەلی شەمەندەفەرێکدا لەدایکبووە کەسوکارەکەیی لەخانووەکەی ناوچەی بەتلیسی خۆرهەڵاتی تورکیاوە، بۆ تاراوگە ناوخۆییەکەی خۆرئاوای وڵات گوازتۆتەوە. چونکە کەمالیزمەکان لەدوای هەموو شۆڕشێکی کورد، پیاوە ئاینی و سەرۆك عەشایەرو کەسایەتییە ناودارەکانی کوردیان ڕادەگوێزا، ئەویش بێئەوەی گوێ بە بەشداربوون یان نەبوونیان لە شۆڕشەکەدا بدات (ئیسکان عەزیز ئوگلو کەلەشاری دیاربەکردا بە ئەندامێکی چالاکی پەرلەمان دەرچووبوو، ئاوەکەی یەکەمی- ئیسکان، واتە نیشتەجێ- کەلە ساڵی ١٩٣٩دا، لە کاتێکدا خێزانەکەیان لەشاری سەلوانی خۆرهەڵاتی تورکیاوە، لەنێوان ساڵانی "١٩٢٥و ١٩٤٧"دا ڕاگوێزرابوون، لەدایك ببوو). ئەو ڕاگواستنەشیان بەو مەبەستەبوو کورد لە هەموو سەرکردایەتییەکی بەتوانای وا بێبەشبکرێت کە ڕێکیانبخاتەوە. پێدەچوو دوورخراوەکان بە بەراورد لەگەڵ ئەو سەدان ڕۆشنبیرە کوردانەی کەمالیزمەکان بە پشتگیریکەرانی شۆڕشی ئاراراتی ١٩٣٠ تاوانباریکردبوون، باش دەرچووبن. ئەوانەیان خستە ناو گوێنییەوەو

---

[٦٢] "کوختی مام تۆم" ڕۆمانێکی بەناوبانگی "هاریێت بیچەر ستو"ی ژنە نووسەری ئەمەریکاییەو، دژ بەڕەگەزپەرستی نووسیویەتی- (وەرگێڕ).

دەمەکانیان بەچاکی بەستو توورپیان دانە ناو گۆمی "ڤان"ەوە. ئەگەرچی تاراوگەیی ناوەوە زۆر ستەمە بەڵام زۆر لەوە باشتربوو کە ئەتاتورک دەیویست بەرامبەر بەسەرجەم کوردی بکات، هەرهەموو کوردی تورکیا بۆ وڵاتانی دراوسێی راگوێزێکات، ئەویشیان بەهۆی کەم دەرامەتییەوە بۆ نەبرایەسەر[٦٢].

لەدوای ساڵی ١٩٥٠، باری ژیانی ئینانیش وەك زۆربەی خێزانە رەسەنەکانی تری کورد گەشەیکرد، هەرچەندە کەسوکارەکانیان هەر لەنەهامەتیدا دەژیان. گەلێك لەو کوردانە وەك تورکێکی زۆر، ئەو گەشەکردنەیان بەو بەڵگەیە دادەنا کەکۆمار بە یەك چاو سەیری هاوڵاتیان دەکات. بۆیە ئینان (و کوردی تریش) لەهەموو کەس زیاتر دڵسۆزی کۆماری تورکیابوو، نەك نوێنەری بەرژەوەندییەکانی کوردی ناوچەی بەتلیس بێت، جا ئیتر با لەپەرلەمانیشدا بۆ دەیان ساڵ نوێنەرایەتی ئەوانی کردبێت. ئینان خۆی لەسەرو ئەو ناخۆشیانەوە دادەنا کەلەئەنجامی ناکۆکییەکانی ئەو ملکەچێتییەی بۆ رژێمو، لەهەمان کاتیشدا ئەمەکی بۆ بنەچەکەی دەیانهێنایە کایەوە، هەرچەندە لەمڕووەوە پرسیارم لێبکردایە خۆی لەوەڵامەکەی دەدزییەوە. بەڵام ئەمجارەیان راستەوخۆ لێمپرسی، کە ئەو خۆی بەکورد دادەنێت یان بە تورك، لەوەڵامدا وتی:"من هەرگیز ئەو پرسیارە لەخۆم ناکەم، بەڵام لەبەرئەوەی "سەیید"م، واتە وەچەی پێغەمبەرم، کەواتە پێموایە دەبێت عەرەبیم".

هەرچەندە ئینان وریایانە لەوەڵامی پرسیارەکە رایکرد، بەڵام سەرنجو تێبینییەکانی لەبارەی پارتی کرێکارانەوە دەریانخست کە ئێستا زۆر لەجارانی وردترەو پڕکێشکردنیشی زیاترە. ئینان لەسەرنجەکانیدا بایەخی بەوە ئەدەدا کەپارتی کرێکاران گرفتی لەڕێی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانیدا، بەتایبەتی لەناوچەی "هیزان"دا کەئەو پاڵێوراوی پەرلەمانی بوو، هێندە بەهێزە کە سەردانی کەسوکارەکەشی پێنەکرێت، یان سەرپەرشتی پروپاگەندەی هەڵبژاردن بۆ خۆی بکات (بەڵام تەریقەتی نەقشبەندی لەناوچەکەدا هێند بەهێزبوو، هەرچۆنێك بوایە دەربەچوو). ئینان رکی لەرژێم هەستابوو، چونکە دەوڵەت بۆ ساڵی چوارەم میزانییەی پرۆژەی

---

(٥٨) "هێنری دربس"ی کۆمیسەری باڵای بەریتانیا لەبەغدا، لەتشرینی دووەمی ١٩٢٦دا سەردانی ئەنقەرەی کرد، "تۆفیق روشدی بیگ"ی وەزیری دەرەوەی تورکیا پێیڕاگەیاندبوو کە، حکومەت گەیشتۆتە ئەوبڕوایەی هەرگیز کوردی پێناتوێندرێتەوە، بۆیە پێویستە دەریبکرێن. تورکیای نوێ لەسەر لاشەی کوشتارێکی زۆر دامەزراوە بۆیە دەبێت زۆرو ستەمی هەبێت. تورکیا خۆی لەئەرمەنو یۆنانییەکان رزگارکردووە، هەنگاوی داهاتووشی دەبێت کورد بگرێتەوە. روشدی بیگ بەو بنەمایەی کە "هیچ بۆ هۆشو بەخۆهێنانەوەیان نییە" دەرکردنی کوردی بەکارێکی رەوا دەدەنا، وتبووشی، تورکیا پێویستی بەزەوییو زارە بەپیتەکەیانە. متمانەشی پێیان نییە لەسەر سنوورەکان دایانبنێت. خۆ کە دووریشخرانەوە ئەوا ئیتر مەحاڵە تورکیا رێ بە گەڕانەوەیان بدات

"گاپ"، کە زۆری بە دڵی ئەمبوو، ڕاگرتبوو. ئابووری تورکیا شەڕو پەرەپێدانی لەیەک کاتدا پێهەڵنەدەسووڕێنرا. کاتێک باری ئابووری لەمە باشتربوو، جێبەجێکردنی پرۆژەکە هێند زۆری نەویست کەموکورتییەکی گەورەی دەخستە موازەنەوە. بۆیە کەمکردنەوەی پارەبەگەڕخستنی پرۆژەکە، لەکاتی زیادبوونی خەرجی شەڕی کوردستاندا هەر دەبوا بکرایە. ڕاستییەکەی بەشی یەکەمی بۆری ئاودێریکردن، کەهەر بەتەنیا بۆ کورد نەبوو، بەڵکو بۆ عەرەبەکانی دەشتایی حەڕانی نووساو بە سنووری سووریاشەوە بوو، بەهۆی بێ پارەییەوە دوا میلی بۆری کۆنکرێتی بۆ دابین نەکرا. ئینان چاوی لەگەمژەیی فەرمانبەرە حکومەتییەکانی ئەنقەرە نەدەپۆشی. جارێکیان لەکۆمەڵێک کارگێڕی پرۆژەیەکی پەرەپێدانی سەیری پرسیبوو، داخۆ سەردانی ئەورووپای خۆرئاوایان کردبێت؟ تەنیا یەک دوویەک دەستیان بڵند نەکردبوو. ئەمجا بەبێزارییەوە وتی: "بەڵام کەلێمپرسین کامیان ناوچەکانی باشووری باشووری خۆرهەڵاتی وڵاتیان دیوە، تەنیا دەستێک بەرزکرایەوە". لەسەری ڕۆیشت و، وتی: "دەرکەوت هیچ لەبارەی وڵاتەکەی خۆیان و ئەو ناوچانەشەوە نازانن کە پرۆژەکانیان تیادا دەکرێن، بۆیە هیچ سەیرنییە کە هەموو پرۆژەکانی پەرەپێدان سەرکەوتوو نەبن". لەوەشی بۆ گێڕامەوە کە چۆن ئەندازیارێکی ئیتالیایی، دوای ئەوەی لەخۆرهەڵاتی تورکیا سەیری ئەو شوێنە دەکات کە بۆ دامەزراندنی کارگەیەک دیاریکراوە (ئەمە زۆر لەپێش شەڕەکەی کوردستاندا ڕوویدابوو)، ئەندازیارە ئیتالیاییەکە زۆر ڕەوشت بەرزانە لە برادەرە تورکەکانی خۆی پرسیبوو، داخۆ ئەوانیش بۆ بینینی شوێنەکە چوونەتە ئەو ناوچەیە؟ چونکە نەخشەو لێکۆڵینەوەکانیان هەرچی حساب بێت بۆ سەختی ئاوو هەواو زۆر شتی تری ناوچەیی و سروشتی تیادا نەکرابوو. ئینان لەم ڕووەوە وتی: "کەسیان ئامادەنەبوو سەرێک لەناوچەکە بدات و لەسروشتەکەی بگات".

ئینان پێی وابوو خراپەکارییەکی وا بەرامبەر بەکورد کراوە کەمتر لەوانەی بەرامبەر بەخەڵکی دی کراوە زیاترە، ئەمە هەڵوێستێکی نوێی ئینان بوو. هەرچەندە بەرپرسیارێتی گەلێک لەگیروگرفتەکانی تورکیای لەچاوی کوردان دەزانی، چونکە هەمیشە دەستیان لەدەستی دوژمنانی تورکیا دەنا، بەڵام پێدەچوو لەهەموو دڵەوە شانازیان پێوەبکات. خۆی بەو ڕۆڵە سەرەکییەی کوردەوە بادەدا کەبۆ دامەزراندنی کۆماری تورکیا یارمەتی ئەتاتورکیان داوە- ئەگەرچی دەوڵەت بەڕەسمی هەرگیز ئاماژەی بۆ شتی وا نەدەکرد-، دەیوت: "کورد کۆماری دامەزراندو بەسەرکردایەتی ئەتاتورک شەڕیان لەگەڵ فەرەنسایی و، ئیتالیایی و یۆنانی و، ئەرمەنی و... کرد. خۆ ئەگەر بۆ وتارەکەی ساڵی ۱۹۳۳ ئەتاتورک بگەڕێیتەوە، کەبەبۆنەی یادی ۱۰ ساڵەی دامەزراندنی کۆمارەوە داویەتی، ئەوا بۆتدەردەکەوێت کە زۆربەی ئەو سەرکردانەی

ناوی هێناون کوردبوون". پێدەچوو ئەرزی راستگۆیی لیدرابێت و، زمانی کرابێتەوە بەنارەزووی خۆی قسەبکات، جەختی لەسەر ئەوە دەکرد کە لە ٥٥٠ پەرلەمانتار "٢٥٠ تا ٣٠٠"یان بە رەچەڵەك کوردن، تەنانەت ئەگەر وەك نوێنەری شاری ئەستەنبولیش هەڵبژێردرابن".
ئەو و کەسانی تری وەك ئەو، زۆر کەرەت قسەی ولیان سەبارەت بەئەنجامی تواندنەوەو گۆڕینی سەرجەم هاولاتیان دەهێنایەوە، کەبێ گوێدانە رەچەڵەکیان دەبوون بەخەڵکێکی کۆمار پەروەری باش.

ئەو ئینانەی کۆن دەمناسی، کە توانای سستکردن و لەبیرخۆبردنەوەی هەستە کوردانەکەیی هەبوو، کەچی دوای ئەم هەموو ساڵە زۆرە کەچاوم پێی کەوتەوە گۆڕانەکەیم پێ سەیرو شتێکی کوتوپڕبوو. پێشتر ئەو ژمارە قەبانەو تەنانەت نیوەی ئەوانەشم لێ نەسستبوو. پێدەچوو بییەوێت بڵێت، کورد کارامەییەکی سیاسیانەی تایبەتی وایان هەیە، دەرچوونیان لەهەڵبژاردنەکاندا بەند نییە بەژمارەی تەواوی تورکیایانەوە. ئەو دەرفەتەم قۆستەوەو سەبارەت بەبۆچوونی هەندێك کەپێیان وایە ناوەڕاستی سەدەی ئاینده ژمارەی کوردی تورکیا لەژمارەی تورك زیاتر دەبێت، لەرای خۆی بگەم، لێمپرسی، لەوەلامدا وتی، بەهۆی ئەو زاوزێ زۆرەی کەلەناو کورددا هەیە شتێکی مەحاڵ نییە. ئەم وەلامەشی پێشێلکردنێکی گەورەی یەکێك لەو حەرامکراوە گرنگانەبوو کە کەمالیزمەکان رێیان پێنەدەداو، نەشیان دەهێشت هیچ سەرژمێرێك سەبارەت بە رەگەز ئاشکرا بکرێت.

## پەراوێزەکانی بەشی نۆهەم

## بوومەلەرزە کۆمەڵایەتییەکەی تورکیا

*" هێزێکی شاراوە" شەڕەیکە هێزە چەکدارەکانی سوپاو ئاسایش دەگەیەنێت . لەنووسینێکی
*یاوز گوکمان"ی رۆژنامەی "حورییەت"ی ٢٣ی کانوونی یەکەمی ١٩٩٥ .

*خەرجی شەڕێکە" ، بڕوانە ڕۆژنامەی Turkish Daily Newsی ٢١ی کانوونی دووەمو ٢٥ی ئازارو ١٦ای حوزەیرانی ١٩٩٤ . لەچەند چاوپێکەوتنێکی خۆمدا کە لەگەڵ هەندێ دیپلۆماتی خۆرئاواییدا، لەشوباتی ١٩٩٦دا کردبوومەو پێیان ڕاگەیاندم کەخەرجی ڕاستی تورکیا لەوانەیە لە ١٠بلیۆن دۆلاری پێپەڕێنێت .

*"..... کەسێك"، خەملاندنی مەسعود یەلمازە کاتێك کە لەڕیزی بەرهەڵستکاراندا بوو. بڕوانە : ڕۆژنامەی حورییەت. ١٦ای ئابی ١٩٩٥ .

*"٢٢٠٠ کورد دیار نەما"؛ بڕوانە رۆژنامەی "میلییەت"ی کانوونی یەکەمی ١٩٩٤ . ژمارەی ئەو جۆرە کوشتنەی بە ٢٢٤٠ کەس دەقەڵەمداوە، کەزۆربەی لەشارەکوردنشینەکاندا بووە .

*"ئەگەر لە گوندێکدابی"، بەرنامەی "٦٠ دەقیقە"ی CNNی ئەمریکایی. ١٤ای کانوونی دووەمی ١٩٩٦ .

*"گازی تیرۆر"، بڕوانە رۆژنامەی "جمهوریەت"ی ١١ای تشرینی یەکەمی ٩٩٤ .

*"دەرسیم...بەکارهێنانی گازی ژەهراوی"، ئەفسەرێکی مێژوونووسی سوپای تورکیا، لەساڵانی حەفتادا، کتێبێکی وورد ڕێکخراوی بەمەبەستی ئەوەی لە یەك بەشدا بێت، لەسەر شۆڕشەکانی کوردی نێوان هەردوو جەنگی جیهانی، دەرکرد، زۆربەیزوویی لەبازاڕدا گرد کرایەوە، ژمارەی قوربانییەکانی بە ڕێکوپێکی تیادا نەبوو، بەلام بالا دەستێکی فەرەنسایی دەڵێت، ٤٠٠٠٠کوردی دەرسیمی کوژراون، کە دوورنییە زۆری پێوەنرابێت، بەهەرحاڵ ئەکرێ بۆ کتێبەکەی: Lueien Rambout: Les Kurdes et Le droit, Paris 1947 p. 39

*"ئەتەوەی تورکی لێدەرچێت"، بڕوانە ڕۆژنامەی – میلییەت–ی ٣١ی تەمووزی ١٩٣٠ . وەزیری داد باشتر دڵنی پیادا نا کە ووتی: "ئەوانەی لەباوو باپیرەوە تورك نین یەك مافیان هەیە ئەویش ئەو مافەیە کە خزمەتکارو کۆیلە بن" .

*"دەبوایە ئەوەبکرایە"، چاوپێکەوتنێکی خدر گوێتاش. ئەنقەرە. ٨ی شوباتی ١٩٩٦ .

*"وێرانکردنی، بۆ چەند مەلتەیەك ڕۆژنامەکانی تورکیا هانی بەزۆر دەست بەسەرداگرتنی دەرسیمی ئەدا کەدەنگی کاولکردنیان ئەدا، بڕوانە: کتێبەکەی Arshak Safrastion بەناوی Kurds and Kurdistan, London 1948, p.86 . سافر ستیان پێش جەنگی جیهانی یەکەم جێگری کۆنسوڵی بەریتانیا بوو لە بەتلیس، هەرچەندە بەبنەچە ئەرمەنی بوو سەرەڕای کوشتاری ئەرمەنییەکانی ١٩١٥، کەچی هەر بەدۆستی کورد مابۆوە .

*"ئەگەر قسەت لەگەڵ خەڵکەکانی بکردایە" لەنووسینێکی ڕۆژنامەنووسی تورك -عوسمان مەتی-، کەلەنیسانی ١٩٤٨دا لەرۆژنامەی "سون پوستا" دا بڵاوکراوەتەوە، کەندال ئەزانیش لە : Gerard Chiliad, A People ithout a Country, London 1980 p.72 ئاماژەی بۆ کردووە .

*"باو باپیران"، چاوپێکەوتنێکی ئەحمەد تورك . ئەنقەرە . ٨ی شوباتی ١٩٩٦

*"بۆچوونەکانی گوکئالپ" بۆ یەکەم جار لە: The Turkism, Anikara, 1920 Kucuk Mecmua No.28, Diyarbakir, ەوە وەرگیراوەو دووەم جار لە: Principles of Pan Turkism in Turkey A study in Irredentism, by لە 1923دا بڵاوکراوەتەوە، Jacob M. London up 1981 ئاماژەی بۆ کراوە .؟

*"پێوەندییەکانی ئۆزال لەگەڵ سوپادا"، سالی ١٩٩١ ئۆزا بەتووڕەییەوە بە سوپاکەی ووت: "ئێوە هەر بۆ کودەتاکردن و دروستکردنی ئەپارتمان بۆ ئەفسەران زۆر باشن، ئیتر هیچی دی" بڕوانە: Les Cahiers de Orient, 1993 Paris p.15

*"ئۆزال بەو جۆرە بیری لە کوردەکان دەکردەوە"، چاوپێکەوتنی دیپلۆماتیکی خۆرئاوا، بەو مەرجە بەگفتوگۆ کردنەکە قایل بوو کەناوی نەهێنرێت . ئەنقەرە. ٧ی شوباتی ١٩٩٦ .

*"ڕێگا بەکەسانی وەك من دەدا"، چاوپێکەوتنی محەمەد عەلی بیراند . ئەستەنبول. ٥ی شوباتی ١٩٩٦ .

*"ئاهەنگەکانی جەژنی نەورۆز" . بەپێی: Helsinki Watch vol. 4 No. 9ی حوزەیرانی ١٩٩٢، هێزەکانی سوپاو پۆلیسی تورکیا ڕاستەوخۆ لەهەموو ڕووداوەکانی نەورۆز بەرپرسیارن.

*"حیزبە بچوکەکەی – حیزبی گەلی دیموکراتیو کۆمەلایەتی"کەلە حکومەتە ئیئتلافەکەدا بەشداربوو، سەرزەنشتی "بەچڕی بەکارهێنانی هێزەکانی ئاسایشی "کردووە، دەڵێت کوژراو بریندارانی حکومەت ئەژمارا .

*"ئۆزال وچاندار"چاوپێکەوتنێکی جەنگیز چاندلر . ئەستەنبول. ١٨ی شوباتی ١٩٩٦ .

*"هەولی پێوەندییەکی باش...دەدا"، چاوپێکەوتنێکی ئەحمەد تورك. ئەنقەرە ٨ی شوباتی ١٩٩٦ .

**"گەرنۆزال بمایەو چارەسەری..."چاوپێکەوتنێکی بیراند. ئەستەنبول. ٥ی شوباتی ١٩٩٦.

**"نامەیەکی ئۆزال" بڕوانە: " The Independent, London, November 13, 1993

**"تورکیا لەبەندکردنی رۆژنامە نوسدا...هەزار پەڵی بەپشتی " ، بڕوانە: نیویۆرک تایمس. ١٥ی ئازاری ١٩٩٦.

**"خێزانی ئەرێك بانگیانکردمە ماڵی خۆیان" ، چاوپێکەوتنێکی خێزانی ئەرێك ئەستەنبول. ٧ی شوباتی ١٩٩٦.

*"گورسیل ئەزموونەکەی خۆی.." چاوپێکەوتنێکی قەدری گورسیل. ئەستەنبول. ٥ی شوباتی ١٩٩٦.

*"هەموو نەخۆشییەکی و دیاردەیەکی"، ئەو کوردە عێراقیانەی کە لەدژی PKK شەڕیان دەکرد لەساڵی ١٩٩٢دا رایگەیاندبوو کە PKK بریندارەکانی خۆیان دەکوشت نەك بەدیلبکرێن. چاوپێکەوتنی نووسەر لەهەولێر، ١٤ی کانونی دووەمی ١٩٩٣.

*"سووتەمەنی شەڕەکەن" چاوپێکەوتنێکی کامەران لەنان. ئەنقەرە ٨ی شوباتی ١٩٩٦.

*"حکومەت گەیشتۆتە ئەو بڕوایەی"، بڕوانە: بەڵگەنامەی FO 371/1157 ئۆفیسی تۆمارگە گشتییەکانی بەریتانیا/ کیو/ بەریتانیا.

(١٠)

# بەرچایی سەگ

ئەو مشتومڕانەی لەگەڵ ئینان و سەرکردەکانی تری تورکیادا کردمن، زۆربەی مانگەکانی ساڵی ١٩٩٦، بگرە هەر هەموو ساڵەکە سەرقاڵیانکردم. بەتایبەتی دوا هەفتەکانی هاوینی ئەوساڵە، گەلێك لەبەرامبەرانی کوردی عێراق، لەکوردستانی عێراق و واشنتۆن و لەندەنەوە تەلەفۆنیان بۆکردم و لە نزیکبوونەوەی کارەساتێك ئاگاداریان دەکردم. هەشت ساڵ پێشتر هەندێك لەوانە پێیان راگەیاندبووم، کەسەدام حسێن خۆی ئاسایی، دەیەوێت بەبۆنەی ئاگربەستی شەڕی ئێرانییەوە، ئاهەنگ بەکیمیابارانکردنی ناوچەی بادینان سازکات. بەڵام تەلەفۆنەکەی ئەمجارەیان لەداخی ئەو دوژمنایەتی و کۆنەقینە کەڵەکەبووەی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستانی مەسعود بەرزانی و یەکێتی نیشتمانی کوردستانی جەلال تاڵەبانی بوو، کە پێدەچوو بەلەناوبردنی ئەو تۆزە هیوایە بشکێتەوە کە لەو دەرفەتە چاکەی سەدەی بیستەمدا بۆ بەدیهێنانی ئۆتۆنۆمییەکی تایبەت بۆ کورد ڕەخسابوو. بەڵام هیچیان پێشبینی ئەوەیان نەدەکرد کەئەو هێرشکردنە سەر یەکترییەی هەردوو میری شەڕەکەی کوردستان، چەنێك کار لەنەهێشتنی سەرمایەی ئەو هەست و سۆزەی هەندەران دەکات کەلەخۆیدا ڕوولەکزی بوو. لەچەند مانگی ئایندەدا، شەڕی گرتن و بەردان کەلەپێشدا پارتی دیموکراتی کوردستان و ئەمجا یەکێتی نیشتمانی کوردستان بۆ دەست بەسەرداگرتنی ئەو ناوچانەی کە ململانێیان لەسەری هەبوو، خەڵکە سادەکەی پەشۆکاند، کاتێکیش بەچاوی خۆیان دەیانبینی ئەوانەی کۆن بەلایانەوە پاڵەوانی نەتەوەییبوون، ئێستا خۆیانکردۆتە ئینۆکی پشیلەی هێزە ناوچەییەکان، جا عێراق بوایە یان ئێران، بۆ پشتگیری هەرلایەکیشیان بوایە بەکاریان دەهێنان، ئارەقی شەرمەزارییان دەڕشت.

لەکۆتایی مانگی ئابی ئەو ساڵەدا،سەدام حسێن لەباشترین یەکەی سە ، عێراق، لە هێزەکانی پاسدارانی کۆمار، بەدەیان هەزار سەربازو، سەدان زرێپۆش و تۆپی، لەباشووری هێڵی ٣٦، کەسنووری ناوچەی "دژەفڕین"ی باشووری عێراقبوو، و فڕۆکە جەنگییە ئەمەریکایی و،

بەریتانیاییو، فەرەنساییەکان پارێزگاریاندەکرد، خەرکردبوو.من بۆ خۆم ڕووداوەکەم بەلاوە سەیرنەبوو. چونکە لەشوباتی ڕابردوودا سەرم لەکوردستانیعێراق دابوو، لەوێ پڕوپاگەندەی زۆرم سەبارەت بەوەی کەچەند مانگێکە دانوستان لەنێوان بەرزانیو سەدام حسێندا هەیە بیستبوو. ئەی لەزستانی ڕابردوودا بەرزانی بەدەیان دەبابەو زرێپۆشی لەبەغدا نەکڕیبوو؟ پێدەچوو بێووڕەیی وای لەو براددرانە کردبێت کە تەلەفۆنەکەیان بۆدەکردم هێشتا کەمە هیوایەکیان، بە بەڕێوەبەرایەتییەکەی سەرۆک کلنتۆن مابێتو، بەتەمابووبن فڕۆکە جەنگییەکان نەمێڵن ئەوەخراپتر ڕووبدات، مەبەستیان ئەوکارە هاوبەشییەی سوپای عێراقو چەکدارەکانی بەرزانی بوو کە لەبەرە بەیانی ٣١ی ئابی ١٩٩٦دا پێکەوە جێبەجێیانکردو، پشێوی بۆ پاشماوەی بزووتنەوە نەتەوەییەکەی کوردی عێراقو ئەنجامەکانی گەردەلوولی بیابان هێنایە کایەوە.

سالّی ١٩٩٨، لەدورگەی "ڤاینیاردی مارتا"وە بەپشتگیری ڕۆژنامەی "واشنتۆن پۆست"، بۆ ناردنی هەوالّی سەرگەردانی ئەو کوردە عێراقیانەی لە کیمیابارانەکەی عێراق ڕزگاریان ببوو، بەمەڵەدوان خۆم گەیاندە سنووری نێوان تورکیاو عێراق. بەلام بێگومان لەسالّی ١٩٩٦دا سەرنووسەری ڕۆژنامەکە هیچ پەرۆشییەکی نەبوو، ئەوەندەشم لەگەڵدا کرد جارسبوو، چەند کەرەتێکیش ووردترین زانیاری نوێو بەڵگەی وامدایە کە نزیکبوونەوەی کارێکی سەربازیانەی عێراقیان دەگەیاند، بایەخی بەهەوالّی کوردی عێراق نەدەدا. پێدەچوو ئەوکاتە بەڕێوەبەرایەتی کلنتۆنیش بایەخی بەو مەترسییە گەورەیەی سەرشاری هەولێری پایتەختی ناڕەسمی کوردستانی عێراق نەدابێت، کەهەر چەند دە میلێک لەلۆردووەکەی عێراقەوە دووربوو. یەکبینەش بەوە دلنیایی دووپاتەکردەوە کەچاودێری باروودۆخەکە دەکاتو، پێشتریش چاودێری هەڕەشەی زۆری لەم بابەتەی عێراقیان کردووەو هیچیش ڕووی نەداوە، ئێستاش هەروا چاودێری هەڵسوکەوتەکەی دەکەن[٦٤]. پێدەچوو واشنتۆن بەتەواوەتی لەوە دلنیابووبێت کە سەدام حسێنیکی ناو قەفەز، لەکاتێکدا سەبارەت بە ڕێککەوتنی "نەوت بەرامبەر بەخۆراک"[٦٥] دانوستانی ڕاستی لەئارادابووە، تا لەچەند هەفتەیەکدا ڕێگا بە عێراق بدات، هەر

---

([٦٤]) نزیکەی هەفتەیەک دوای تەلینەوەکەی هەولێر، تەنیا دیپلۆماتێک کە لەدەمەقەرەدا بووبێتو جاروبار سەری لەکوردستانی عێراق دابێت "فرانک بیکەر"ی بەریتانیایی بوو (کەبوو بەدانوستانکەرێکی سەرەکی لە دانوستانە ڕووکەشییەکاندا)

([٦٥]) مەبەست بڕیاری ٩٨٦ی ئەنجوومەنی ئاسایشی تایبەت بەسووککردنی سزا نێو دەوڵەتییەکانە.

شەش مانگ جارێك بایی دوو بلیۆن دۆلار نەوت بفرۆشێت و بەنرخەکەی خۆراك و دەرمان بکڕێت، کەئەویش لەئەنجامی دانوستانێکی ئاڵۆزو گرانەوە هاتبوو، خۆی ناخاتە ئەو گێژاوەوە.
واشنتۆن هەر نیازێکی هەبووبێت، لای خەڵکی ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست وادەرکەوتبوو کە حکومەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بڕیاری دابوو کە لەکاتی پڕوپاگەندەی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتیداو لەپێناو هەڵبژاردنەوەی کلنتۆندا سەرەڕۆیی بۆ هیچ شتێك نەکات. بەڵام بەڕێوەبەرایەتی ئەمەریکا پێی وابوو کە لەم ڕووەوە هیچ ناکرێت، چونکە دەستی زۆر لە؛ ئێران، سوریا، تورکیا، شۆڕشگێڕە کوردەکانی تورکیا، سەدام حسێن و هەردوولایەنە دژبەیەکەکەی کوردی عێراقیش لەگەمەکەدا هەبوو، بۆیە بۆ واشنتۆن هێندە ئاسان نەبوو کە کۆنترۆڵی ئەو بارە بکات و زۆریشی لەسەر نەکەوێت. خۆهەڵقورتاندن بۆ ڕاگرتنی هێزەکانی سەدام حسێن سوودی وڵاتە یەکگرتووەکانی تیادا نەدەبوو، بەتایبەتی کەدەبوایە پشتگیری ئەو لایەنە کوردەی بکردایە کە لەدژی لایەنەکەی سەربەعێراق کەوتبووە خانەی ئێرانەوە. زۆربەی کاتی ساڵی ڕابردوو، وڵاتە یەکگرتووەکان بۆ پێکهێنانەوەی بەرزانی و تاڵەبانی زنجیرە کۆبوونەوەیەکی لەکوردستانی عێراق و ئیرلەندەدا سازکرد، بەڵام ئەنجامی بۆ نەپێکرا، چونکە دوژمنایەتییە خوێناوییەکەی نێوانیان زۆر کۆنەو بۆ ساڵانی شەست دەگەڕێتەوە. بۆیە هەردوولا ووریاکردنەوەکانی واشنتۆنیان پشتگوێخست، بەوەی کەیارمەتییەکانی ئەمەریکا بەیەکگرتووی کوردەوە بەندە. (پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان ڕاستبکەن یان نا، پێیان وابوو کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەوڵی ئاشتکردنەوەکەیانی بەڕاستی نەگرتووە، بەتایبەتی کە چەند ملیۆن دۆلارێکی بۆ ئەو هێزە بێلایەنە دابین نەکرد کەهەردوولا بۆ جوێکردنەوەیان لەسەری پێکهاتبوون).
لەم بارەدا لەهاوینی ١٩٩٦دا شەڕ دەستی پێکردەوەو، لەمیاندا نزیکەی ٤٠٠٠ کورد، کە زۆربەیان مەدەنی بوون، کوژران، لەدوومانگی دواتریشیاندا و لەبەشی دووەمی شەڕەکەدا سەری هەزارانی دی تیاچوو. پشتگیریکردنەکەی ڕای گشتی جیهانیان کەوتە کزی و، حکومەتە خۆرئاواییەکانیش چیدی پێشوازی سەرکردە کوردەکانی عێراقیان نەکرد (ساڵی ١٩٩٥ دیپلۆماتێکی ئەمەریکایی، کەلەبەر بێباری کورد بێزاری لێدەباری، پێیوتم: "گەر پێشتر نەمزانیبێت بۆچی کورد دەوڵەتێکی تایبەت بەخۆیی نییە، ئەوا ئێستا بەتەواوەتی تێیگەیشتم").
ئەمە جگە لەوەی کەگرنگی و ئەوارەی بەرژەوەندییە ستراتیژییەکانی ئەمەریکاش لەکوردستانی عێراقدا لاوازبوون. ململانێکەی نێوان هەردوو سەرکردەی کورد کاریکردە سەر چالاکییەکانی بەرهەڵستکارانی کۆنگرەی نیشتمانی عێراق، کە لەکوردستاندا جێگیربیبوون و CIA یش

بەرووخاندنی ڕژێمی سەدام حسێن و دامەزراندنی رژێمێکی دیموکراسیانە لەعێراقدا، پشتگیری دەکردن.

هەرچەندە وڵاتە یەکگرتووەکان دەستی لەکوردو گیروگرفتەکانیان شتبوو، بەڵام بەرژەوەندییە ناکۆکەکانی ناوچەکە، ناچاریانکرد لایەنی کەمی بوونی پێویستی خۆی لە باکووری عێراقدا بپارێزێت، بەتایبەتی کەتورکیا ببووە سەرچاوەی دڵەڕاوکێی واشنتۆن). لەنیسانی ١٩٩١ەوە، دەبوا گرنگی بەپارێزگاریکردنی کوردی عێراق بدرایە، تەنانەت لەسەرکردەکانی خۆشیان، تا نەهێڵن ئەو چەند ملیۆن کوردەی لە سەدام حسێن تۆقیبوون بەسەر سنووری تورکیا کەونەوە. خۆ پێداگرتنە زۆرەکەی تورکت ئۆزالیش نابێت لەبیربکرێت، کەسەرۆك بۆشی بۆ والزهێنان لەو کەمتەرخەمی و دڵەڕاوکێیە هاندەدا تا کوردە دەربەدەرەکانی عێراقی ناو چیاکان رزگاربکات. وڵاتە یەکگرتووەکان، دواتر بڕیاری پڕکردنەوەی بۆشاییەکەی باکووری عێراق و، هێنانەوەی کوردی بۆسەر ماڵ و حاڵی خۆیان دا، تا ببنە بنکەیەکی پێشەوەی بەرهەڵستکارە عێراقییەکانی دژ بەسەدام حسێن. سەرەتا بەڕێوەبەرایەتییە رلرلکەی بووش هاندەری سەرەکی دابینکردنی بوودجەی "بەرهەڵستکارانی دیموکراتی یەکگرتووی عێراق" نەبوو، کەدواتر ناوی "کۆنگرەی نیشتمانی عێراق"ی لێنرا، بەڵکو کۆتایی ساڵی ١٩٩١ کۆنگرێسی ئەمریکا، کەسووربوو لەسەر لابردنی سەدام حسێن، ئەوەی کرد. بەڵام ئەم پشتگیرییەش دەبوا بەردەوام حسابی دەوروورژاندنی تورکی بۆبکرایە، کە زاڵ نەبوونی بەسەر ئەو شۆڕشە کوردییەی ناو تورکیا، گومانی لەهەمووشتێك دەکرد کە بە یارمەتیدانی کوردی عێراقەوە بەندبوایە.

تورکیاو بێگومان ئێران و سووریاو عێراقیش، بەردەوام ترسیان لەوڵاتە یەکگرتووەکان هەبوو کەزۆربەمژێر بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی لەباکووری عێراقدا هانی کوردی عێراق بدات. بەشێوەیەکی تر بیڵێین، (تورکیا خواو خورماشی) دەویست، رەتکردنەوەی هەرشتێك کەبۆنی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی لەباکووری عێراقدا لێبهاتایە، لەو لاشەوە لەوڵاتە خۆرئاواییەکان بەگشتی و ئەمەریکا بەتایبەتی دەکرد، کە سنووری لای عێراقییەوە لەو گرفتە چارەڕوانتەکراوانەی سەدام حسێن دەیهێنانە کایەوە بۆ بپارێزن. بۆیە سیاسەتی خۆرئاوا، لەڕووی ئابوورییەوە دەستیان لەبینی کوردستانی عێراق نابوو، کەبەوە تورکیایان هێورکردبۆوە بەڵام لەهەمان کاتدا قەیرانێکی ئابووری توندو بێکارییەکی زۆرو ئازارو ئەشکەنجەیەکی ناهەموارییان لەباکووری عێراق هێنابووە ئاراوە، واتە کرژییەکەی کەلەبنەڕەتدا لەنێوان بەرزانی و تاڵەبانیدا هەبوو توندتر دەکرد. لەسایەی قەیرانی ئابوورییەکی مردووشدا هەڵگرتنی چەك ئاسانترین رێگەیە بۆ نان پەیداکردنە.

سیاسەتی ئەمەریکا بەرامبەر باکووری عێراق و ئەو بۆشاییە هێزەی تیایدابوو بەڕادەیەکی ولکەمبۆوە، کە تەنیا ئەو شتە ناکۆکە تێکئالاوانە: هاوسەنگکردنی هەردوولایەنە کوردییە ناکۆکەو، پشت نەکردنە تورکیاو، لەناو لایەنە بەرهەڵستکارەکانی سەدام حسێنیشدا قورسایی بخاتەسەر کۆنگرەی نیشتمانی عێراق، هەڵسوڕێنێت. بەڵام ئەوەشی بەدەست ڕەفتاری ئێران و، هەندێ جاریش سووریاوە، گیرۆدە ببوو. ئەو دوودڵییەی واشنتۆن لەبەڕێوەبەرایەتییەکەی بووشەوە بۆیمابۆوە، کەسالی ۱۹۹۱ لەپێاو پێش کەوتنی سەدام حسێن، سوپچی ئەرکە سەربازییە گەورەکەی داخست و رایگرت. هەر ئەو دوودڵییەش وای لە وڵاتە یەکگرتووەکان کرد، کە لەگەرمەی بزووتنەوەیەکی سەربازیانەی ئازادا، کە CIA پلانەکەیی وا داڕێژابوو لەئازاری ۱۹۹۵دا کوردی عێراق بەخۆیکەون و لەپێناو بەرپاکردنی راپەڕینێکی وای سوپا کە سەدام حسێنی پێپووخێنرێت بزووتنەوەیەکی سەربازیانە بکەن و هەر لەو کاتەشدا فڕۆکە جەنگییەکانی ئەمەریکا ئاسمانی ناوچەکە بپارێزن، کەچی بەڕێوەبەرایەتی وڵاتە یەکگرتووەکان بەڵێنەکەیی نەبردەسەر. بەرزانی کەلەبنەڕەتدا ململانێیەکی توندی لەگەڵ تالەبانیدا هەبوو، لەشتێك بە گومانبوو، بۆیە لەدواساتدا کشایەوە، بەوەش پارتی دیموکراتی کوردستان و کۆنگرەی نیشتمانی عێراق بەتەواوەتی لێکدابڕان و ناکۆکی زیاتریش کەوتە نێوان هەردوو سەرکردەی کوردەوە. بۆیە سەیرنییە کە وڵاتە یەکگرتووەکان تەنیا بەو ئاگربەستە لەرزۆکەی هاوینی رابردووی ئیرلەندا، کەبەهەوڵی چەند دیپلۆماتێکی ئەمەریکایی هەردوولایەنە کوردییەکەیان بەیەکتر گەیاندبوو، قایلبێت (هۆی نەچەسپاندنی ئاگربەستەکە، لەلایەکەوە نەبوونی نیازپاکی دوو سەرکردە کوردەکەو، لەلایەکی تریشەوە دابیننەکردنی ئەو دوو ملیۆن دۆلارەبوو کە هێزێکی لەکوردە بێلایەنەکان و ئەندامانی بەرهەڵستکارانی عێراقی پێدابمەزرێنن، ئاگربەستەکە جێبەجێبکات. هەندێك پێیان وابوو دابیننەکردنی ئەو پارەیە لە کەمکردنەوەی خەرجی شەڕی نێوان سەرۆك کلنتۆن و کۆنگرێسی سەربەپارتی کۆمارییەوەیە، کەئەك هەر پارەی لەچەند پرۆژەیەکی گرنگ بڕی، بەڵکو لەسەرەتای ۱۹۹٦دا، بۆماوەیەکی کەم بەڕێوەبەرایەتی حکومەتە فیدرالییەکانیشی ئیفلیجکرد. بەڵام هەندێکی تر بەلایانەوە وابوو کەواشنتۆن ویستبێتی کورد بەپەیداکردنی نیوەی پارەکە ناچاربکات ئەمجا بڕیاری دانی نیوەکەی تری بدات).

پێمچوولەڕووی تیۆرییەوە چارەسەرەکە مێجگار ئاسان بێت پێویست ناکات لە چۆنێتی یەکلاییکردنەوەی ململانێی کورد ڕابمێنێ. ئەویش هەر بەوەی تالەبانی دەست لە هەولێر هەڵبگرێت و ڕێی حکومەت و پەرلەمانی هەرێم بدات دەست بە چالاکییەکانیان بکەنەوە. لەولاشەوە، بەرزانی لەو داهاتە مۆڵەی لەبازرگانیتی نەوتە قاچاخەکەی عێراق کەبەکوردستاندا

دەروات و لەتورکیادا دەفرۆشرێت، بەدەستی دەکەوێت، دەست بەدانەوەی بەشەکەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بکات، لەوساش تالەبانی چونکە جوگرافیای ناوچەکە والێکەوتبووە کەتاکە دەروازەی سەر تورکیا بەدەست بەرزانییەوە بێت، تەواو پشتی بەئێران بەستبوو تا دەمەات زیاتریش پەرەی دەسەند، یان هەر نەدەما یان بەرەبەرە کەم دەبۆوە، پارەکەش وەك جاران لێدەماتەوە.

واشنتۆن کەوتبووە دوای سیاسەتی خۆلێلادانەوە، کە دەرەنگبێت یان زوو بۆگەنی دەکردو هەرەسی دەهێنا. بەڕێوەبەرایەتی کلنتۆن، تا بەئاشکرا، نەکەوتە جوڵە بۆئەوەی فریای ئەو بارە ئاڵەموارەی نێوان دوو پارتە کوردییەکە بکەوێت، ئەویش کە لەناوەڕاستی سالی ١٩٩٦دا پیسترین شەڕ لەنێوانیاندا رویدا، دڵنی بەوەدا نەدەمنا کە پارەکەی لەدەستچووبێت. لە ٢٧ تابەدا "روبرت نیو پیلیترو"ی یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا بۆ کاروباری خۆرهەڵاتی نزیك بەتەلەفۆن قسەی لەگەڵ هەردوو سەرکردەکەدا کردو، بەپێی پرۆژەیەکی ئەمەریکا بڕیاری ئاشتبوونەوەیەکی نوێی لێوەرگرتن و رێککەوتن کەبۆ ئەو مەبەستە یەکەم کۆبوونەوەیان لەکۆتایی ئەوسانگەدا لە لەندەن بکەن. بەڵام زۆر درەنگبوو بۆ ئەو پرۆژەیە، چونکە رۆژی دوای کۆبوونەوەکە شەڕ هەڵگیرسایەوە، پرۆژەی پارێزگاریکردنی کورد کەلەخۆیدا لەرزۆك بوو، خەریکبوو هەرەسی دەهێنا. بەڕێوەبەرایەتی ئەمەریکا هێشتا نەیدەزانی ئەو دوو سەرکردە کروە، تا چ رادەیەك باوەڕیان بەیەکتر نییەو چەنیشیان قین لەیەکترەو، دوژمنایەتییەکەشیان لەئاستێکی وادایە گەڕانەوەی بۆنییە.

ئابلوقە ئابوورییە چەسپێنراوەکەی بەغداو خۆرئاوای سەر ناوچە کوردییەکە، جگە لەو چوونە ئاوەوانەی کەجاروبار ئێران و تورکیاو عێراق دەیانکرد، جا چوونە قوڕاییەوە یان تەماسکەیەکیان گرتبێت، چەمکی ئەو "ناوچەی ئارام"میان شێواند کە ساڵی ١٩٩١ هاوپەیمانان بۆ باوەڕپێهێنانی ئەو کوردانە دابینیانکرد، کە لەناو چیاکاندا قەتیسمابوون، تا لەگەڵی شەیتان بێنە خوارەوەو بچنەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆیان، کەبەوەش گوشاری وەرگرتنیان لەسەر تورکیا کەم دەبۆوە. لەم بارودۆخەدا کە کوردی عێراق بە نیازبوو ژێر بەژێر سوودی دامەزراندنی دەوڵەتێکی لێ بەدەستبهێنێ، بەپێی ئەو بارە دەگمەنەی تیایدا دەژیان ئەو قسانە دەکران، بەرزانی و تالەبانی دەیانزانی ناتوانن بەمجۆرە بمێننەوە، بۆیە دیسان کەوتنەوە ناو داوە کۆنەکەو، بەتەواوەتی چوونەوەپاڵ دەوڵەتە کێبەرکێکان، لەحوزەیرانی ١٩٩٦دا بەرزانی لەگەڵ سەدام حسێنداو تالەبانی لەگەڵ دەستەڵاتدارە ئێرانییەکاندا کەوتنە گفتوگۆ.

لەکۆتایی مانگی تەممووزدا، وەک پارتی دیموکراتی کوردستان رایگەیاند، سوپای ئێران بۆماوەی سێ رۆژو بە ٢٠٠٠ پاسدارەوە هاتنەناو قووڵایی کوردستانی عێراقەوە. ئامانجی دیاری ئەم هاتنەناوەوەیان بنکەی سەرکردایەتی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانی نزیک شاری کۆیەبوو، کە ٨٠ میل لەسنووری ئێرانەوە دوورە. ئەم حیزبە چەندین کەرەت دەستی لێوەشێنرابوو زۆریش لەسنووری ئێران دوورکەوتبۆوەو، ئەوکاتە هەرچی مەترسییێت بۆ ئێرانی نەبووە، بۆیە وا کەلێرلن ئامانجە راستییەکەی لێدانی حیزبەکە نەبووە. بەڕای بەرزانی، ئامانجی راستی هێرشەکەی ئێران بۆ ئەوەبوو کە چەکی قورس بەتاڵەبانی بدات، بەتایبەتی کەچەند مانگێکبوو یەکێتی بە ئاشکرا نزیکبوونەوەی راپەڕینێکی خەڵکی بەسەرۆکایەتی خۆی دژ بەپارتی دیموکراتی کوردستان راگەیاند. هاتنە ناوەوەکەی ئێران ئەوەشی دەگەیاند کە ئێران چەنێك لە هاموشۆکردنی ناو باکووری عێراقدا، کەببووە شوێنی چالاکی هێزەکانی تورکیا دژ بە گەریلاکانی پارتی کرێکارانی کوردستان، چەنێك ئازادن. لەهەمووی ئەوانەش گرنگتر لووتڕەنینەکەی ئێران دەریخست کەئەو قسە قەڵەوانەی بەڕێوەبەرایەتییەکەی ئەمەریکا سەبارەت بەسیاسەتی گرتنەوەی دووفاقی دەیکردن، بەکەلاخستن و بەدەرەزلکردنی عێراق و ئێران لەدونیادا، چەنێك فشەڵبوو بۆشی نەچووەسەر. بۆیە بەرزانی داوای لە واشنتۆنکرد کە، بەپێی رێککەوتنەکەی دانوستانی ئیرلەندا، دەستدرێژیکەر دیاری بکات. بەڵام واشنتۆن خۆی لەم داوایە کەڕکرد.

بەمجۆرە شانۆکە، "کەسەر لەبنەڕەتدا لەناو گرەوی نابەجێدا جمەی دەهات" بۆ یەکێك لەسەیرترین بڕیار لەمێژووی کورددا ئامادە دەکرا. تاڵەبانی کە لەپتەوی پشتگیریکردنەکەی ئێرانی دڵنیابوو، بەلەخۆبایبوون و لەخۆڕابینینێکی زۆرەوە، هەڵە کۆنەکانی دووپاتکردەوەو، گوێی بۆ ئامۆژگاری کەس رانەگرت، زۆری بە پشتگیریکردنەکەی ئێرانەوە نا. خۆ ئەو قسەیەشی کە، بەرزانی جارێکی دی هەولێر نابینێتەوەو مەگەر لەهاوینە هەواری سەلاحەدینەوە بەدووربین پیایدا بڕوانێت، سووکایەتیپێکردنێکی خودی بەرامبەرەکەی بوو.

لە ١٧ ئابی ١٩٩٦دا، کەتاڵەبانی هێرشێکی گەورەی لە ناوچە سنوورییەکانی ئێرانەوە دژ بە بەرامبەرەکەی کرد، بەووردی کاتەکەی هەڵبژاردبوو تا لەگەڵ یادی پەنجا ساڵەی دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستان و پەنجا ساڵەی لەدایکبوونی بەرزانی خۆیدا یەکبگرنەوە. پارتی دیموکراتی کوردستان لای خۆیەوە، رۆژانە ئێرانی بەوە تاوانباردەکرد کە بەتۆپ و کۆپتەرە سەربازییەکانی پشتگیری یەکێتی نیشتمانی کوردستان دەکات و، رێی داون بەخاکەکەیدا گوزەربکەن و، داوایشی لەوڵاتە یەکگرتووەکان کرد کە تاڵەبانی و ئێران تاوانباربکات. لای کورد شاراوەنەبوو کەپێشتر ئێران، لەململانێی بەرزانی و یەکێتی نیشتمانیدا هەمان یارمەتیشی بە

بەرزانی دلوەو، پارتی دیموکراتی کوردستان بەرنەولم هاوپەیمانی خۆشەویستی بۆ ئێران بووە، لەدوا هەفتەی مانگی ئابدلو، لەکاتێکدا پیلیترو لە لەندەن خۆی ئامادەی چاوپێکەوتنی نوێنەرایەتی هەردوولایان ئامادەکردبوو، رۆژنامەیەکی پارتی دیموکراتی کوردستان دیسانەوە داوای لە، وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکاو، ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی و، CIA و سەرجەم بەرپرسەکانی ئەمەریکا لەواشنتۆن کردەوە، کە "ووریاکردنەوەیەکی ئاشکرا" بۆ ئێران دەربکەن تا "خۆی هەڵنەقورتێنێت" لەکاروباری کوردەوە. رۆژنامەکە داواشی لە بەڕێوەبەرایەتی ئەمەریکا کردبوو کە عێراقیش لەسەر خۆتێهەڵقورتاندنێکی کوردستانی عێراق "ووریابکاتەوە"، کەئەمیان سەرنجڕاکێشبوو، بەتایبەتی کەتاڵەبانی ماوەیەکی زۆربوو سەبارەت کەبەنزیکبوونەوەی بەرزانی و سەدام حسێن ئاگاداری بڵاودەکردەوە. رۆژنامەکەی پارتی هیچ گومانێکی بۆچوونێتی ڕووداوەکە نەمێشتەوە، چونکە ئەوەی یەکلایەکردەوە کە خڕبوونەوەی سوپای عێراق بەبیانووی خۆتێهەڵقورتاندنی ئێرانەوە، "بۆ لووتژەنی کاروباری باکووری وڵات و گێڕانەوەی دەسەڵاتێتی". رۆژنامەکە وڵاتە یەکگرتووەکان و دەوڵەتانی هاوسێی عێراقی لەوە ئاگادار دەکردەوە، گەر شتێك لەو ڕووەوە نەکەن ئەوا عێراق، کە لیکی بەرپرسیارێتی بۆ هاوسەنگێتی دەسەڵاتی ئێران و دەستبەسەرداگرتنەوەی باکوور دەڕژێت، ئاکە هەڵبژاردەیە لەبەردەستدا. گەر ئەوەش ڕوویدا ئەوا پارتی دیموکراتی کوردستان بەڕووی عێراقییەکاندا ناوەستێتەوە. بەرزانی خۆشی بەتەلەفۆن ریستی پیلیترو ڤایلبکات کە شەڕەکە "کێشەیەکی کورد نییە" گوێی پێنەدرێت، بەڵکو "دەستدرێژیکردنێکی ڕاستەوخۆی ئێرانە"و، پێشی ڕاگەیاند کە "ئەم هەموو فشارە لەتوانای مندا نییە"، لەسەر قسەکانی رۆیشت و "ئەگەر شتێك نەکەن ئەوا ڕەنگە داوای یارمەتی لەعێراق بکەم".

بەڵام وڵاتە یەکگرتووەکان لە ناکۆکییەکەدا خۆی بە بێلایەن هێشتەوە. بەدەم کەوتنی بنکە یەك لەدوای یەکەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانی سەر ڕێگا ستراتیژییەکەی هەملتون کە بەناوچە شاخارییەکانی باکووری عێراقدا درێژبوەوە، ئەویش بەیارمەتی تۆپی ئێرانییەکانبوو، کەپشتگیری یەکێتی نیشتمانی کوردستانی دەکرد، بەرزانی گەیشتە ئەو بڕوایەی، کە ئەگەر پەیمانێکی وا، کە یەکێك لەنزیکترین یاریدەدەرەکانی بە "پەیمان لەگەڵ شەیتان"دا ناوی دەبرد، نەبەستێت، ئەوا هێزەکانی لە لەناوچووندان. بەرزانی کوشتنی سێ برایی و ۸۰۰۰ کەسی عەشیرەتەکەیی و دەیان هەزار کوردی عێراقی دەست سەدام حسێنی بەلاوە ناو، داوای یارمەتی لێکرد تا یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەهەولێر وەدەرنێت. بەو پێیە رۆژنامەکەی پارتی دیموکراتی کوردستان چاوبەستی لەخەڵککرد، چونکە پارتی نەك هەر بەرەنگاری عێراقییەکان

نەبۆوە، بەڵکو لە ٢٢ی ئابدا، وەك دواتر عێراقییەکان خۆیان دەیانوت بەرزانی تووشی تەنگییەکی زۆر کردبوو، بەڵام دوای پشتگیریکردنی لەسوپای عێراقکرد.

هەر هیچ نەبێت تاریق عەزیزی جێگری سەرۆك وەزیرانی عێراق بەسوکایەتی پێکردنێکەوە پەربەی لەسەر ئەو نامەیەی ئەوکاتەی بەرزانی لادا کەبۆ سەدام حسێنی ناردبوو تیایدا بە "فخامتکم"ناوی بردبوو، دوای ئێکردبوو کە "بەرامبەر بەهەڕەشەی ئەرەوە پارمەتیمان بدەن" کەلەئێرانەوە لێمانەدەکرێت. بەڵام بەرزانی و نزیکەکانی تاچەند ئاگامی ئەو بڕیارە چارەنووس سازەیان لێکدابۆوە، یان بەڕاستی کەی درابوو، ئەوە بەلای زۆربەی کوردی عێراقەوەمەگەر خوا بۆخۆی بزانێت. بەڵام دیاربوو کە پارتی دیموکراتی کوردستان بە ئاشکرا فێڵی لەپیلیترو کردو بەگەمژەشی نیشاندا؛ چونکە بەکۆبوونەوەی ٣٠ ئابی لەندەن قایلبوو، بۆ کۆبوونەوەی رۆژی دواتریش، واتە ئەو رۆژەی کەبڕیاربوو ئیشەکەی هەولێری تیادا بکرێت، لەگەڵیدا رێککەوت. گەر واز لەئاگادارکردنەوەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانیش بهێنین، خۆ ئەمەریکا لەڕاستی ئەو رووداوانە دڵنیابوو کە لەسەر زەوی دەکران، بەتایبەتی کەفڕۆکەی ئەمەریکایی و مانگە دەستکردەکان رۆژانە چاودێری خڕبوونەوە سەربازییەکەی عێراقیان دەکردو،ئەیریال و سەتەلایتە شورەکانی هەواڵگرانی ئەمەریکاش وێنەو دیکۆمێنتیان دەگرت.

ئەگەر هەوڵی تێگەیشتنی بڕیارەکەی پارتی دیموکراتی کوردستان بدەین، ئەوا رەنگە ئاسانبێت گەر بڵێین رقەکەی بەرزانی لەتاڵەبانی لەترسەکەی سەدام حسێنی زیاتربوو، یان هەموو رووداوەکە جێبەجێکردنی ئەو پەندەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستبوو کە دەڵێت "دوژمنی دوژمنم دۆستمە". بەڵام بڕیارەکەی بەرزانی زۆر لەوە گرنگتربوو، چونکە هاریکاریکردنی پیسترین دوژمنی سەدەی بیستەمی کورد پەڵەیەکی پڕ لە شەرمەزاریی ترسناکبوو. ئەوی راستی بێت؛ بەسەرهاتی مێژوویی گرنگ هەیە کەناکرێت پشتگوێبخرێت یان لەبیربچێتەوە. بەرزانی هەرگیز ناپاکێتییەکەی کیسنجەری ١٩٧٥ی لەبیرناچێتەوەو، ناخۆشی ئەو ساڵانەی ئاوارەکردنی باوکی و سەرجەم ئەندامانی خێزانەکەشی لەیاد ناکات، کە لەچاوی وڵاتە یەکگرتووەکانی دەناسێت. بێگومان ئەو پێکداچوونانەش گەیشتبوو کەساڵی ١٩٩١ کوردیان لە لەناوچوون رزگارکرد. بۆیە باوەڕی بە دڵسۆزیی و ئەمەکی واشنتۆن نەدەکرد، هەرچەندە بەڵێن و پەیمانی زۆریشی لەزۆر لێپرسراوی ئەمەریکاوە پێگەیشتبوو، کە ولیاسدەکرێت هەندێکیان تەنانەت نووسراویش بوون هەرلە "برێنت سکۆ کرۆفت" و "جێیمس بێکەر"ی بەڕێوەبەرایەتی جۆرج بووشەوە بیگرە تا دەگاتە "ئال گۆر"ی جێگری سەرۆك و، "ئەنتونی لەیك"ی راوێژکاری کلنتۆنی کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی.

بەڵام سەیرەکە لەوەدابوو کە سکۆکرۆفتی خانە نیشینی ئێستا، ئەوکاتەی لەبەردەم ڕۆژنامەدا دانی بەوەدانا و وتی "ئێمە کەمەستمان بەوەکرد بەدیهێنانی ئامانجە چەورو ئەرمەکە، واتە ڕووخاندنی سەددام حسێن چاری گیروگرفتەکانمان ناکات، یان وەك پێویست بەرژەوەندییەکانیشمانی نەدەهێنایە دی، بۆیە باماندایەوە سەر تاکە هەڵبژاردە ناهەموارو پشێوی خەرو .... کە لەئارادابوو، چونکە ئەگەر لەشەڕەکەدا بەردەوامبووینایەو سەددام حسێنمان بخستایە ڕەنگە بارەکە زۆر لەئێستا خراپتر بکەوتایەتەوە، ئەو بۆشاییەی بەو هۆیەوە لەدەورگەی فارس پەیدادەبوو، کەلەوانەبوو ئێران پڕیبکردایەتەوە"، هێزەکانی ئەمەریکای ناچاردەکرد بۆ ماوەیەکی دیاری نەکراودەست بەسەر عێراقدا بگرێت. ئەوقسانەی سکۆکرۆفت گومانە کوردییەکانی لەبارەی سیاسەتی ئەمەریکاوە بەهێزکرد.

بەرزانی سووربوو لەسەرئەوەی، هەرچەندێکی لەسەر بکەوێت جارێکی دی ڕێگای ئاوارگە نەگرێتەوە. تا ئەمڕۆشی لەسەربێت، ئەو قسانەی لەهەڵاتنەکەی جەژنی یەکشەممەی ئیستەری ١٩٩١دا بۆ براکوردەکانی دەرکردو داوای لێدەکردن نەترسن و هەڵنەیەن "بۆ ئاوارگە ئاوەها ئەرمەنیان لێنەهێت و نەبنە پەنابەر" لەگوێمدا دەزرنگێنەوە. جا ئەم پێدالکوتانەو هەرچەندێکیشی لەسەر بکەوێت، دەبێت لەعێراقدا بمێنێتەوە، یارمەتی تێکەیشتنی خۆگرتن و مانەوەی لەدانوستانەکەی سەددام حسێندا دەدا، ئەگەرچی چاکیشی دەزانی هیچی لێهەڵناکرێنرێت، کەچی تا کانونی دووەمی ١٩٩٢ مایەوە. ئەمجۆرە بەکردنەوەیەی هەرگیز وەك سەرکردەیەکی نەتەوە لێی کەم ناکات، بگرە بەهێزیشی دەکات. لەکانونی دووەمی ساڵی ١٩٩١دا کەلەچیاکانی کوردستاندا چاومپێیکەوت، بەر لەوەی باسی چۆنێتی شێوەی داپلۆسینەکانی وڵاتانی دراوسێ بکات، کەبەلایەنی کەمەوە تا یەك سەدەی تریش ڕێ بە هێنانەدی ئەو ئامانجەنادەن، پێیوتم، کورد مافی دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی هەیە.

لەتەموزی ١٩٩٢دا بەرزانی سەردانی واشنتۆنی کردو، بۆماوەیەکی کەم هەڵوێستی خۆی سەبارەت بەسیاسەتەکانی ئەمەریکا خستەلاوە، بەڵێنی پشتگیریکردنی بڕیارەکانی ئەمەریکای دا، بەوەی کە کۆنگرەی نیشتمانی عێراقی بۆ ڕووخاندنی سەددام حسێن بەکاربهێنرێت. بەڵام زۆری نەبرد نارەزایی خۆی سەبارەت بەهەڵوێستی توندی ئەمەریکا لەلیژنەی سزادانەکانی سەر بەنەتەوە یەکگرتووەکان و، سووربوونی واشنتۆن لەسەر یارمەتی نەدانی کورد، کە لەژێر سزا نێو دەوڵەتییەکانی سەر عێراق لەلایەك و، گەمارۆ ئابوورییەکەی سەددام حسێنیش لەلایەکی ترەوە دەیناڵاند، دەربڕی. ئەمرانە ئابوورییەکانی کوردستانی عێراقیش ناکۆکییەکانی نێوان بەرزانی و تاڵەبانی قووڵترکردەوە. مەسعود پێی وابوو هەر خەتای ئەوە نییە کە سەددام حسێن دەستەڵاتی

لەدەستدا ماوەتەوە، خۆ ئەگەر ئەوو ئالەبانی لەناکۆکییەکەی نێوانیان بەرپرسیارین، کەبۆتە هۆی لاوازکردنی بەرهەڵستکارانی عێراق بەگشتی، بەڵام لەدانیشتنە تایبەتییەکانیدا ئەو پرسیارەی دەکرد، کە بڵێی واشنتۆن بەڕاستی لەم ناکۆکیانەیانی پێناخۆشبێت یان بەدڵی بێت؟ لەگەڵ رۆژگاردا و بەدەم پەرەسەندنی بزووتنەوە ئیسلامییە ئوسوڵییەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستەوە، کەبوونە مەترسییەکی راستەقینە بۆ وڵاتی عەرەبی سعودییەو هاوپەیمانە سەرەکییەکانی تری وڵاتە یەکگرتووەکان لە کەنداو، دڵگەرمییەکەی ئەمریکا -دڵگەرمی وڵاتانی کەنداویش-ی، بۆ لابردنی سەدام حسێن کزکرد، رەنگە ئەمریکاییەکان وانەبووبن وەك نیشانیان دەدا. جا لەم بارەدا، داخۆ واشنتۆن یارییە کۆنەکەی کیسنجەر، واتە بەکارهێنانی کورد بۆ لاوازکردنی رژێمی بەغدا نەك رووخاندنی، ناکاتەوە؟ بەرزانی تاکە کورد نەبوو گومان لەڕاستی ئەو ئامانجانەی واشنتۆن بکات، کە لەڕێی سیاسەتی "گرتنەوە دوروفاقی" یەکەیەوە هەوڵی بۆ دەدا. بەهەرحاڵ، بەڕای دیپلۆماتێکی گەورەی ئەمریکایی، سەدام حسێن گرفتی ئایندەی کوردی عێراق نابێت، بەڵکو ئەو ژەنەڕاڵە سنە عەرەبە "پیاوچاکە" دەبێت کە جێگەی سەدام حسێن دەگرێتەوە. ئەگەر کۆمەڵگای نێودەوڵەتی بڕیاری هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ دەستەڵاتدارە نوێکەی عێراقدا بدات و بە "تۆماس جیفرسون"[٦٦] ی عێراقی دابنێت چیدەبێت؟ ئەی ئەگەر ئەو ژەنەڕاڵە بڕیاری دەستبەسەرا گرتنەوەی هەموو خاکی عێراقیدا چی ڕوودەدات؟ لەسەر قسەکەی دەڕوات و دەڵێت "بێگومان ئەوساش کۆنگرێس و بەڕێوەبەرایەتی ئەمریکا ناچار دەبن بڕیاری قورس بدەن".

خۆ ئەگەر ئەمریکاییەکان و هاوپەیمانانی خۆرئاواییان و، کوردیش، هەموولایەنە بەرهەڵستکارە عێراقییەکان سەریان بە هەموو ئەو لێکدانانەوەو بەرەو کوێچوونی باری عێراقەوە ئێشابێت، ئەوا سەدام حسێن بە خەیاڵیشیا نەهاتووە. گومانی تیادانییە دواخستنی ئیش بەڕێککەوتنەکەی- نەوت بەرامبەر بەخۆراك- کە وەك دواتر دەرکەوت هەر تا کانونی یەکەم بوو، بەتەنیا عێراقییە ئاساییەکان زیانیان لێکرد، ئەگینا ئەکاری لەسەرۆکی عێراق کردو، نە لەکەس و کارەکەیی و، ئەلەپاسدارە ئازدارەکانی کۆماری، یان ئەو دەزگا ئاساییشییە جۆر بەجۆرانەی رژێمەکەیان راگرتبوو. کاتێکیش سەدام بڕیاری دا خۆ لەململانێی کورد هەڵقورتێنێت، یەك دوو سەعاتێك پێش بەرەبەیانی ٣١ی ئابی ١٩٩٦، زۆر بەوردی و سووربوونێکی ئاشکراوە کردی. سەدام حسێن بە ئەنقەست هێزێکی گەورەی راماڵەری بەکارهێنا، کە لە ٣٠٠ تۆپ و ٣٥٠ دەبابەو، سێ تا

---

[٦٦] "توماس جیفرسون" یەکێکە لە دانەرانی راگەیاندنی سەربەخۆیی ئەمریکاو، سێیەم سەرۆکیشێتی. -وەرگێڕ-

چل هەزار سەرباز پێکهاتبوو کە زۆربەیان پاسدارانی کۆماری بوون و، هێرشەکەی سەر هەولێری قومارێکی بەسوودبوو. هەرچەندە ئەم شارە دەکەوتە ناوچەی "دژەفڕینی" باکووری پانە هێڵەوە، کەچی فڕۆکەکانی هاوپەیمانان هیچیان نەکرد. لەڕۆژانی دواییدا، ولیام پەری وەزیری بەرگری ئەمەریکا، ئەوەی کردبیانوو کە "ڕووداوەکە شەڕێکی ناوخۆی کوردە"، لەکاتێکدا سەرۆک کلنتۆن، هیچ ئەکردنەکەی بەرامبەر عێراقی وادانا کەتواناى وڵاتە یەکگرتووەکان بۆ کۆنترۆڵکردنی ڕووداوەکانی ئەو وڵاتە "تا ڕادەیەک"ە. بەڕێوەبەرایەتی ئەمەریکا دڵخۆشی خۆی بەوە دەدایەوە کە لەئاکامی هەڵوێستەکەیدا هەر هیچ نەبێت خەڵاتێکی چاوەڕوان نەکراوی بەدەستهێنا، ئەویش کەمکردنەوەی ڕۆڵی ئێرانە لەباکووری عێراقدا، کەزۆری لێبێزاربوو. بەڵام زۆری پێنەچوو دەرکەوت ئەوەشی کاتییە.

پاش نیوەڕۆی ڕۆژی یەکەمی ئەرکە سەربازییەکەی هەولێر، سەدام حسێن بە شەڕێکی کەم سەرجەمی یەکەمین ئاکامەکانی بەدیهێناو، دووبارە ئاڵای عێراق لەسەر بینای پەرلەمانی کوردو، بارەگای حکومەتی خۆبەڕێوەبردن و، ئیزگەو تەلەفزیۆن لەژێر سایەی تۆپ و دەبابەیەکی زۆری عێراقەوە، هەڵکرایەوە. لەژێر ئاگربارانی تۆپ و دەبابە عێراقییەکاندا، چەکدارانی پارتی دیموکراتی کوردستان هێرشیان کردە سەر هێزەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، کەلەچەکی سووک بەولاوە هیچی تریان پێنەبوو، بۆیە بەرەنگارییەکی کەمیانکردو، ئیتر هێزەکانی سەدام حسێن و دەزگا ئاسایشییەکانی کەوتنە خۆ بۆ بەدیهێنانی ئامانجە سەرەکییەکانیان، کە گرتنی ئەو بەرهەڵستکارە عێراقیانەی CIA پشتگیریدەکردن و، تێکەڵەیەک بوون لەشیعەی عەرەب و، ئاشووری و، تورکمان و، کۆمەڵانی دی کەلەهەولێرو ناو عەینکاوەی دیانەکانی نزیکی بوون. هەرچەندە CIA لەکاتی گونجاودا پیاوەکانی خۆی دەربازکرد، بەڵام کەلێک ئامێری ئەلکترۆنی پێشکەوتوو، فایلی ئەو زانیاریانەی دەربارەی بەرهەڵستکارە عێراقییەکان کۆیکردبۆوە لەدوا بەجێما.

لەو کوردانەی لەنووسینگە ئەمەریکاییە جۆر بەجۆرەکانی هەولێردا کاریان دەکرد بەجێهێڵران، ئەگەرچی پێشتر بەڵێنی دەربازکردنیان پێدابوون و، بەڕەسمی پێیان ڕاگەیەنرابوو کە لەکاتی پێویستدا، پیلانێکی ئەمەریکایی بۆ دەربازکردنیان هەیە، بەڵام دواتر دەرکەوت لەقسەیەکی بێ بنەما بەولاوە هیچ دی نەبوو. بەسەدان ئەندامی کۆنگرەی نیشتمانی عێراقییەوە کەچاوەڕێی هیچ لێخۆشبوونێکی سەدام حسێن نەبوون، کەزۆربەیان لەسوپا هەڵاتبوون و چووبوونە ڕیزی بەرهەڵستکارە عێراقییەکانەوە لە شەڕەکەدا کوژران، یان یەکسەر گوللەبارانکران، یان گیران، کەلەمیان تا کوشتن ئازارو ئەشکەنجەدانی دەگرتەوە. هەوالگرە

عێراقییەکان، کەمەندێکیان بەرگی کوردیان لەبەرکردبوو، بەهۆی ئەو زانیارییە وردانەی لایانبوو نێچیرەکانی خۆیان چاک ڕاوەدەکرد، بە بەرنامە لەماڵ و شوێنی ئیشەکانیاندا دەریاندەهێنان و دەیانگرتن و ئەوانەشیان کە بەهەوڵی خۆیان دەربازدەبوون، بەترس و لەرزەوە خۆیان دەشاردەوە، چونکە باشیان دەزانی کەهەواڵگرە عێراقییەکان بەدوایانەوەن هەرکاتێکیش بیانگرن ئەوا دەیانکوژن. هیچ بەرپرسێکی پارتی دیموکراتی کوردستانیش، هەر لەمەسعود بەرزانی خۆیەوە بیگرە تا دەگاتە پچوکترینیان، لەو ناپاکیتییەی بەرامبەر بە هاوپەیمانانی کۆنگرەی نیشتمانیان کردیان، یەک تۆز چییە هەستیان بە تەریقی و شەرمەزاریتی نەدەکرد و خۆیان لە کارەساتەکەی کۆنگرەی نیشتمانی عێراقی نەداوە. ئەوەی ((پیری))ش سەبارەت بە "شەڕی ناوخۆ"ی کورد وتی ڕاست نەبوو، چونکە وەک ٢٠٠ سەرکردەیەکی کۆنگرەی نیشتمانی کە کەلەمەولێر هەڵاتبوون لەئوتێلێکی سەلاحەدین خڕبووبونەوە پێیانڕاگەیاندم. سەرنەکەوتنی پلانەکەی CIA بەوجۆرە- کەچەند پسپۆڕێک ئەو ناپاکیانەی ئەو دەزگایە بەرامبەر بەکرێگیراوە ناوچەییەکان دەیکرد لەگەڵ سایگۆنی ساڵی ١٩٧٥و، "کەنداوی بەرازان"[١٧٣]ی ساڵی ١٩٦١یان بەراورد دەکرد -سەرجەم بەرهەڵستکارانی سەدام حسێنی وایلێکرد کە بڕوا بەهیچ هەوڵێکی دواڕۆژ بۆ ڕووخاندنی یان بۆ خۆتێوەگلان لەهەرکارێکی تری خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بەو مەبەستە، نەمێنێت.

ئەو زیانانەی سەدام حسێن دڵنی هەربەوەوە نەوەستا، بگرە پشتگوێخستنەکەی ئەمەریکای ڕووداوەکەش دەریخست کە، پارێزگاریکردنی سێ ملیۆن و نیو کورد لەپانتاییەکی ١٧٠٠٠ میل چوارگۆشەییدا لەلایەن وڵاتانی خۆرئاواوە، خەیاڵ پڵاوە. خۆ ئەگەر فڕۆکەکانی هاوپەیمانان لەناوەڕاستی ١٩٩١ەوە بەسەر ناوچەی دژەفڕینی سەروو پانە هێڵی ٣٦ەوە بووبن، بەڵام وڵاتە یەکگرتووەکان هەردوای سێ مانگ هەرچی هێزی پیادەی خۆی هەبوو کێشایەوە. لەدوای شەڕی ڤێتنام و شەڕی ساردەوە، تاکە زلهێزەکەی دونیا بەخۆیدا ڕانەهەپەڕەوو کە سیاسەتێکی بەبازووی دەرەوەی وای هەبێت، گەر ناچاربوو هێزی چەکدار، کە خەرجێکی زۆری دەویست، بۆ شەڕ بەکاربهێنێت. هەر بۆیە واشنتۆن تا ڕاستی سیاسەتەکەی باکووری عێراقی بسەلمێنێت، هەڕەشەیکرد کە لەئاسمانەوە بۆردومانی بەرژەوەندییە گرنگەکانی سەدام حسێن، واتە ئەو دەزگا ئەوتینیانەی بکات کەدوای هەوڵێکی زۆر چاککرابوونەوە. ئەوی ڕاستیبێت ئەمەریکا هەر

---

[67] ناوی ئەو داباریندە سەرنەکەوتووەیە کەبەرهەڵستکارانی ڕ.ژێمی کاسترۆ لە "کەنداوی بەرازانی باشووری خۆرئاوای کوبا، بەیارمەتی CIA لەنیسانی ١٩٦١دا کردیان.

بەوەندە پەرچی هێرشەکەی سەر هەولێری عێراقی دایەوە، کە بەمووشەکی کرووزی تایبەت، سیستمی بەرگریکردنە ئاسمانییەکەی سەدام بۆردومانبکات.

هەموو بەسەرهاتەکانی پایزی ۱۹۹٦یش ئەو کەلەبەرانەی "پرۆڤاید کومفۆرت"، واتە ئارامی خستنەوە کۆنەکەی ساڵی ۱۹۹۱یان نیشاندەدا، کەوای لیهات بە تەوسەوە "پرۆڤاید ئەلیوژن – OPERATION PROVIDE RLUSIONS" واتە خەیاڵپڵاوریان ناولێنا. ئەو بەڵێنە رەسمییەی هاوپەیمانانیش بەکوردیان دا، کە گوایە هێزی پیادە بۆ پارێزگاریکردنیان بەکاردەهێنن، بەراستی هیچ هەنگاوێك بۆ سنووری "ناوچەی ئارام" نەنرا، کە سێگۆشەیەکی بچووکی باکووری خۆرئاوای عێراقی نزیك سنووری تورکیایەو، تەنانەت شاری دهۆکی لای باشووریش ناگرێتەوە. لەوانەش گرنگتر، بەرهەڵستکارە عێراقییەکان لەو بڕوایەدا بوون کە وڵاتە یەکگرتووەکان و هاوپەیمانانی، لەساڵی ۱۹۹۵ دا بەگوشارێکی زۆری تورکیا، ناچارمان بۆ پارێزگاریکردنی خێوەتە ئاسمانییەکەی خۆرئاواییەکانی سەر باکووری عێراق بۆ کەمترین ئاست دادگرن و هێرش ئامێزیش نەبێت. بەگەڕانەوەی دەبابە عێراقییەکان بۆ باکووری پانەمێلی ۳٦، هەموو فرتوفێڵ و دیاردەکان هەرەسیان هێناو، هەموو کوردێك هەستی بەوەکرد کەسەدام حسێن بۆ دووبارەکردنەوەی ئەوکارەی پێشتری کۆ لەهیچ ناکات.

"جۆن دۆیچ"ی بەڕێوەبەری CIA رایگەیاند، ئەگەرچی سەربازە عێراقییەکان لە هەولێر کشاونەتەوە، "بەڵام ئاشکرایە هەواڵگران و ئەندامانی سەرجەم دەزگاکانی تری ئاسایشی عێراق لەناوچەکەدا ماونەتەوە"و ئەو کوردانەش کەلەباشووری پانەمێلی ۳٦دا دەژین، جا لەسلێمانی بن یان لەکەلار و کفری و ئەولاترییەوە، کەڕۆژێك چییە فرۆکەکانی هاوپەیمانان نەیپاراستوون، مەترسی زۆرتریان لەسەرە، دەستی خستەسەر برینەکە. پێشتر کەیاسی کوردی باشووری ژێر دەسەڵاتی سەدام حسێن دەهاتەپێشەوە، دیپلۆماتە خۆرئاواییەکان بەرزامەندییەوە دەیانوت، دەکرێت بەبڕیاری ٦۸۸ی نێودەوڵەتی، کەلە "پەیماننامەی سیڤەر"ی بەدبەختەوە یەکەمین بەڵگەنامەی نێودەوڵەتییە ناوی کوردی هێنابێت، لەکاتی پێویستدا پارێزگاری بکرێن.

وڵاتە یەکگرتووەکان لەدوای چوونی سوپای عێراق بۆناو هەولێر، بۆ ماوەدای دوور بەچەند ئەنجامێکی رەشبینانە گەیشتن. هەرچەندە پیلاندارێژەرە ستراتیژییەکانی عێراق، چاوەڕوانی تۆڵەیەکی بەپەلەی ئەمەریکایان دەکرد کە لەپاسدارانی کۆماری بسێنرێت، کەتا خۆی بە لایەنگری یەکێك لەدوو لایەنە ناکۆکە کوردییەکە نیشان نەدات و ڕەنگە دوای کشانەوەی هەولێریش بیکات، کەچی هیچی نەکرد. جا چونکە بەڕێوەبەرایەتی ئەمەریکا لێدانی هێزەکانی سەدام حسێنی لەناو کوردستاندا بەبێسوود دەزانی و، لەو باوەڕە ئەسڵەمێنراوانەشەوە کە گوایە

گێڕانەوەی دەسەڵات لەباکووری وڵاتدا، کە رەنگە راستگۆیەتی وڵاتە هاوپەیمانەکانی خۆرئاوا لەقبکات، ئامانجی سەرەکی سەدام نییە، بەڵکو ئامانجە سەرەکییەکەی دەست بەسەرداگرتنی بیرەنەوتەکانی سەروبیەر کوێتە، بۆیە تۆڵەکەی بۆ باشووری عێراق گواستەوە. قسەکەرانی بەڕێوەبەرایەتی ئەمەریکا سەبارەت بەپارێزگاریکردنی عێراق هەوڵی کەمکردنەوەی بەرپرسیارێتی وڵاتە یەکگرتووەکانیان دەدا، رەفتارە بێئەقڵێتییەکانی ئاڵەبانی و بەرزانیان تاوانبار دەکردو، پەنجەشیان بۆ ئەوە رادەکێشا کەنیتر لە ڕووی رەوشتیشەوەبێت، بەهۆی هەڵەی سەرکردە کوردەکانەوە دەکرێت دەست لەپارێزگاریکردنی کوردە ئاساییەکانیش هەڵبگرێت.

"نیکۆلاس بێرنس"ی قسەکەری وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا، هەموو ئەوشتانەی رەتکردەوە کە وابگەیەنن وڵاتە یەکگرتووەکان، بەهۆی کەمتەرخەمیکردن و نەدانی پارەی ئەو هێزەی لێکیانی جوێنەکردنەوەو، پشتگوێخستنی رووداوەکانی کوردستان، ئەمڕانە کوردییەکەی وورووژاندبێت. بێرنز لەسەر قسەکانی رۆیشت: "ئەگەر بەرپرسیارێتی شەڕەکە هەبێت ئەوا لەئەستۆی دوولایەنە کوردەکەدایە کەشەڕەکەیان هەڵگیرساندەوە نەک وڵاتە یەکگرتووەکان". دەشیوت "بەدرێژایی پێنج ساڵ چی دەرفەت هەبوو بۆمان رەخساندن، پارێزگاری سیاسیانەمان کردن و، یارمەتی ئابووری و مرۆڤایەتیمان بۆ دابینکردن، لەباکووری عێراقدا ناوچەیەکی ئارامیمان بۆ دامەزراندن تا بەچاکی خۆیان تیادا بەڕێوەبەرن، بەڵام سەرکردەکانی کورد سوودیان لەو دەرفەتە مێژوویییە گەورەیە نەبینی کەبۆ گەلەکەیان رەخسابوو".

رووداوە مەیدانییەکانی دواتریش راستەوخۆ قسەی ئەوکەسانەی بەدرۆ دەخستەوە کەدەیانوت، باکووری عێراق بەلای بەڕێوەبەرایەتی ئەمەریکاوە شتێکی ئەوتۆنییەو، بگرە بەهێزتریشیکردن، چونکە هەر چەند سەعاتێك پێش یەکەمین شاڵاوی تۆڵەسەندنەوەی ئەمەریکا، کەلەسێی ئەیلولدا بەمووشەکی کرووز کردییەسەر دەزگا بەرگرییە ئاسمانییەکانی عێراقی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی بەغدا، "پنتاگۆن" فرمانی بۆ ئەفسەرو سەربازەکانی "بنکەی هاوئاهەنگێتی سەربازی MCC" زاخۆی ئەودیو ڕووباری خاپووری سەر سنووری تورکیا دەرکرد، تا چۆڵییکەن. ئەوکاتە کە گەیشتمە بنکەکە لەچەند پاسدارێکی کوردی پەشۆکاو بەولاوە کەسی تری تیادا نەمابوو. ئەم بنکەیە لە مێژبوو کارەگرنگەکەی ساڵی١٩٩١ نەمابوو، کەبەسەرکردایەتی کۆلۆنێل "ریچارد ناب"ی یەکەمین ئەفسەری ئەمەریکایی دانرابوو. نابە یەکبینە دانوستانەکەی لەگەڵ سوپا بەزیوەکەی ئەوسای عێراقدا کردبووی، بەخۆشحاڵییەکەوە بە "رەفتار لەگەڵ هێتلەر کردن"دا باسدەکرد. لەوکاتەوەو هەر لەسەرەتاشەوە تورکەکان، وەك نرخێك بۆ بەکارهێنانی بنکەی ئەنجەرلیك، کە فڕۆکەکانی هاوپەیمانان بۆ چاودێریکردن بەسەر

باكووری عێراقدا لێوەی دەفڕین، بەزۆر لەفسەرێکی خۆیان ئاخنییە ناو ئەو تیمە هاوئاهەنگییەی کە ئەفسەرانی، وڵاتە یەکگرتووەکان و، بەریتانیاو، هۆڵەندا، فەرەنسای تیادابوو، دوایش کرایە یاریدەدەری کوماندار، چونکە تورک لەئاست هەموو بیانییەکدا نەخۆشی گومانکردنی هەبوو، لەو بڕوایەشدابوو کە چاودێریکەرە نێودەوڵەتییەکان لەباکووری عێراقدا یارمەتی چەکدارانی پارتی کرێکارانی کوردستان دەدەن، بێگومان هەر ئەوەش ئیشی بنکەکەی ئیفلیجکرد. کە لەنیسانی ۱۹۹٤دا، بەهەڵەی فڕۆکەوانێکی وڵاتە یەکگرتووەکان، دوو کۆپتەری ئەمەریکایی کەوتنە خوارەوە، کەچەند بەرپرسێکی کوردو ئەفسەرانی MCCیان دەگواستەوە، بنکەکە بەهێچکاری لەکار کەوت، کوردێکی زۆر ئەوەیان زۆر پێناخۆشبوو، چونکە دڵنیابوون کە هەرچۆنێک بوایە بوونی ئەفسەرانی بیانی لەکوردستانی عێراقدا دووبەرەکییەکەی نێوان تاڵەبانی و بەرزانی ڕادەگرت. پێشتر بەڕێوەبەرایەتی ئەمەریکا چەند داوایەکی تورکیای، لەبارەی گواستنەوەی بنکەکەوە بۆ شاری سلۆپی لەوبەری سنوور ڕەتکردەوە. هەرچەند هەفتەیەکیش بەر لەکارەساتەکەی هەولێر، ئەنقەرە تا کۆتایی ئەو ساڵە درێژەی بە ئەرکی فڕۆکە خۆڕاوایییەکان دا. بەڵام حکومەتی تورکیا، کاریگەرێتییە شەڕ ئامێزەکەی ئەم فڕۆکانەی نەهێشت، چونکە ڕێی نەدەدا بنکەی ئەنجەرلیک بۆ زەبری تۆڵە دژیە عێراق بەکاربهێنرێت، بەوەش ئاشکرایکرد کەلایەنگری عێراقە هەندێک لەکوردەکان گەیاندبوویانە ڕادەیەکی وا کەتورکیا نەهێڵێت فڕۆکەکانی هاوپەیمانان بۆمب و مووشەک هەڵگرن و، تەنانەت ڕێی هەڵگرتنی تەقەمەنیشیان بدەن.

داخستنی MCC یەکەم نیشانەی ڕاست و ڕەوانی وڵاتە یەکگرتووەکان بوو بۆ ئەوەی کەلێتر کوردستانی عێراق بەناوچەیەکی هێندە ئارام دانەنێت، دواتریش "پرنس" ناوی "خوێنڕێژانی دەزگا هەواڵگرە"کانی سەدام حسێنی لێنان (پارتی دیموکراتی کوردستان سەری سوڕمابوو بۆ یەکەمجار دانی بەوەدا نا کەدونیای دەرەوە باوەڕیان بەقسەکانی نەکردووە کەیەکبینە دووپاتی دەکردنەوە، کە گوایە هاوکاریکردنەکەی ڕژێمی عێراقی لەسنووری هەولێر دەرنەچووەو کۆتاییشی پێهاتووە).

"ئۆفیسی فریاگوزاری قوربانییانی کارەساتەکانی دەرەوە OFDA"ی سەر بە وەزارەتی دەرەوە، کە لەساڵی ۱۹۹۱ەوە بایی ۷۹٥ ملیۆن دۆلار خۆراک و یارمەتی مرۆڤایەتییان بۆ کورد دابینکردبوو، لەکوردستانی عێراقدا داخست، لەچەند هەفتەیەکدا بەسەدان پاسەوان و فەرمانبەرانی بنکەی MCCو، فەرمانبەرانی نووسینگەی فریاگوزاری OFDA و، نزیکەی ۲۰۰۰ کەسی خێزانەکانیشیان بۆ تورکیا، لەوێشەوە بۆ دوورگەی "گوام"ی ئۆقیانووسی ئارام

گواستەوە، تا سەرئەنجام بەهێمنی بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانیان بگوێزنەوە، کە ئەوەش تا دوای هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی ئەمەریکای مانگی تشرینی دووەم جێبەجێ نەکرا، (لەناوەڕاستی تشرینی یەکەمدا ۷۰۰ ئەندامی کۆنگرەی نیشتمانی بەخۆیان و خێزانەکانیانەوە راگوێزران. من خۆم پێش پێنج هەفتە کەمێشتا ئەوان لە سەلاحەدین لەبارەگاکانی بەرزانی بوون مەترسیم لەکارەساتە چاوەڕوانەکراوەکەیان لێبەرزبۆوە. دوا بەدوای چاوپێکەوتنم لەگەڵ ئەو خەڵکە تۆقیوانەدا کەبووەهۆی پارمەتی دەربازبوونیان بۆ گەیشتنە شاری زاخۆی سەرسنوور).

ئەم بڕیارانەی ئەمەریکا وایان لەو چەند رێکخراوە ناحکومییە خۆرئاواییانەی تریشکرد کەبۆفریاگوزاری کورد مابوونەوە، چاولەوانی دی بکەن و، ئەوانیش لە کۆتایی تشرینی دووەمدا، پێنج هەزار کوردی تر، کەلەبواری فریاگوزاریدا کاریان دەکرد، بەخۆیان و خێزانەکانیانەوە بۆ دورگەی "گوام" گواستەوە، بۆئەوەی دواتر بیانگەیەننە وڵاتە یەکگرتووەکان، بەوەش ئەمەریکاییەکان لەڕووی ویژدانیانەوە ئاسوودەبوون، بەڵام کوردستانی عێراقی لەکارامەترین ژن و پیاوی خۆی بێبەشکرد. ئەم رێکخراوە ناحکومەتیانە بەشێکی سەرەکی سیاسەتی ئەمەریکابوون. جا لەبەرئەوەی عێراق بەردەوام ڤیزەی بەو کەسانە نەدەدا کەلەو رێکخراوانەدا نیشیاندەکرد، بۆیە ئەمانیش چاک لەوە بەئاگابوون گەر بەردەستی عێراقییەکان بکەون ئەوا ماوەی زۆر لەبەندیخانەدا دەمێننەوە. ۱۰ رۆژ پاش بەزمەکەی هەولێر، بەغدا گوشاری سەر کوردەکانی کەمکردەوە. بەرلە ئاگادارکردنەوەیەکی پێشوەختی پارتی دیموکراتی کوردستان، کەدەستەڵاتدارانی عێراق بەهۆی ئاشکراکردنی ئەو پێوەندییەی لەگەڵیاندا هەیبوو پارتی تەواو بێتاقەتکرد، سەدام حسێن کەپێنج ساڵ بوو گەمارۆی لەسەر کوردستان دانابوو، مووچەی فەرمانبەرە کوردەکانی بڕی و، سووتەمەنی و خواردنی لە کوردستان قەدەغەکردو، بەهەمەجۆرە رێگایە ویستی چۆکیان پێدابدات، گەمارۆکەی هەڵگرت. لەگەڵ لابردنیدا، بەغدا بەڕێوەبەری ئەمنی نوێی بۆ هەرسێ شارە کوردییەکە دانا، بەڵام دواتر دەرکەوت ئەو دامەزراندنانە هەر لەبنەڕەتەوە درۆبوون. سەرەتا ئابلوقەکە، هەرچەندە زیانێکی زۆری لەئابووری باکووردا، بەڵام هەستی نەتەوایەتی کوردی خرۆشاند، خۆ ئەگەر لابردنە کوتوپڕەکەی وایکەیاندبێت کە خەڵکی لەهاتووچۆی نێوان کوردستان و شوێنەکانی تری ژێر دەستەڵاتی میریدا ئازاد دەبن، ئەوەشی تیادابوو کە ئەندامە بەدڕەزاکانی هەواڵگرانیش دەچنەوە ناو کوردستان، کوردێکی زۆر لەوەترسیان پەیداکرد، بەتایبەتی کە لێبوردنە گشتییەکەی عێراق، بەئاشکرا ئەو کەسانەی نەدەگرتەوە کە لەڕێکخراوە فریاگوزاری و مرۆڤایەتییەکاندا کاریانکردبوو. بڕیارەکانی عێراق تەنانەت ئەو کوردانەشی ساردکردەوە کە بەکڕینی هەمەجۆر سووتەمەنی بەتایبەتی نەوت بۆ ماڵ گەرمکردنەوە، کەبەسەدی یەکی نرخی بازاڕە ڕەشەکەی جارانیبوو زۆر خۆشحاڵبوون.

تەنانەت لەبارەگای بەرزانی لە سەلاحەدین، هەندێ لەکۆنە برادەرەکانم بەنهێنی پێیان ڕاگەیاندم کەترسی هاتنی ئەمنی عێراقییان بۆناوچە کوردییەکان لێنیشتووە، بەپەشۆکاوییەوە لێیان دەپرسیم، داخۆ ئەمریکاو هاوپەیمانان، بۆ ساڵی ١٩٩٧ درێژە بە دژەپێنەکە دەدەنەوە. ڕاستییەکەی هەرچەندە بەهۆی گوشاری زۆری تورکیای سەر وڵاتە یەکگرتووەکان و هاوپەیمانانەوە ناوەکەی بە "پرۆڤاید کۆمفۆرت" نەمایەوە، فەرەنساش زۆر بەسووربوونەوە فڕۆکەی خۆی کێشایەوە. ئەم ڕووداوانە ڕاستی ترسەکانی کوردی عێراقیان یەکلاکردەوە.

کوردی ئاسایی بەتەواوەتی لەوەگەیشتبوون کەڕێککەوتنەکەی سەدام حسێن و بەرزانی، هاوپەیمانێتییەکەی بوشی هەڵوەشاندبۆوە، ئەو هاوپەیمانێتییەی کەلەساڵی ١٩٩٠دا زۆر بەزەحمەت هاتبووەکایەوە، فەرەنساو ڕوسیا کەدوو بەشداری بوون و هەریەکەیان بەملیۆن دۆلار قەرزی دە ساڵەیان لەلای عێراق هەبوو، بەو هیوایەی دواڕۆژ ڕێککەوتنی بازرگانی چەوری نەوتی لەگەڵدا بکەن، لەئەنجومەنی ئاسایشدا خۆیان لەوڵاتە یەکگرتووەکان دوورخستەوە. فەرەنساییەکان بەتوندی پرۆژەکەی ئەمریکاو بەریتانیایان بۆ فراوانکردنی ناوچەی دژەفڕینی باشووری پانەهێڵی ٣٢و٣٣ ڕەتکردەوەو پشتگیری دانوستانێکی ڕاستەوخۆی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و سەدام حسێنیشیان دەکرد کە واشنتۆن بەبیستنی ئەوقسانە قارسدەبوو. هاوپەیمانە سەرەکییەکانی ئەمریکای دونیای عەرەبیش (کوێتی لێدەرچێت کەهێشتا بەدەست داگیرکردنەکەی عێراقەوە دەتلایەوە) ئەوەندەیان کەیف بە تۆڵەسەندنەوەی مووشەکی کرووز ئەدەهات کەلەو شوێنانەی دووره هەولێریشی بدایە. دەنگ لەم لاولاوە بڵند دەبۆوە کەسەدام حسێن بەرەی هەوڵی گرتنەوەی باکووری عێراقی داوە هیچ یاسایەکی جیهانی پێشێل نەکردووە. وڵاتی سعودییەی عەرەبی کەلەماوەی ساڵێک کەمتردا دووکەڕەت شالاو بۆ سەر سەربازە ئەمریکاییەکانی ناوی کرابوو تەنیا وڵاتێکی عەرەبی نەبوو کەترسی لەوەبێت پێوەندییە توندوتۆڵەکەی بەواشنتۆنەوە ببێتە چەکی دەست موسڵمانە بەرهەڵستکارەکانی خۆرئاوا. سعودییە ڕێی بە واشنتۆن نەدەدا کەهیچ بنکەیەکی بۆ لێدانی عێراق بەکاربهێنێت.

لەئەنقەرە نەجمەدین ئەربەکانی سەرۆک وەزیران بەشەرمەزارییەکی زۆرەوە بەتایبەتی کەتازەبۆ چارەسەری چەند گرفتێک دوو وەزیری بۆ بەغدا ناردبوو، ماوەی سێ هەفتە کڕبوو. تانسۆچیلەری وەزیری دەرەوەو ژەنەڕاڵە باڵادەستەکان سوودیان لەم کڕییەی بینی پلانێکیان ڕاگەیاند کە "قەڵەمڕەوێکی ئاسایش"یانە، لەشێوەی قەڵەمڕەوەکەی ئیسرائیلدا کەهەربۆخۆی لەباشووری لوبناندا داینا، لەباکووری عێراقدا دابنێن و، بەبیانووی مەترسیان لەپەکەکە وە سوود لەو ئاژاوەییەی باکووری عێراق وەربگرن کەهەر ڕوو لە زیادبوو. بەڵام نیشەکەیان زۆر ڕوون

ئەبوو، دیپلۆماتەکان پێیان وابوو گەر حکومەتی عێراق گەڕایەوەو بەچاکی دەستی بەسەر سنوورەکەی خۆی لەگەڵ تورکیادا گرتەوە، ئەوا سەدام حسێن ئەو کارە دەکاتە بەڵگەیەک بۆ تۆڵە سەندنەوە لەتورکیا لەسەرئەوەی کەساڵی ١٩٩١ ڕێی بەواشنتۆن دابوو لە بنکەکانییەوە لەبەغدا بدات.

بەهەرحاڵ پیلانی قەڵەمڕەوە ئاسایشییەکە بێدەنگی لێکراو خرایەلاوە، بەڵام لەپێنج ساڵی رابردوودا تورکیا چەند جارێک هێرشی بێسوودی بۆ باکووری عێراق کردووە، جا هێرشەکانی گەورەبووبێتن یان گچکە بەڵام بەزۆری هیچ سەرکەوتنێکی لە ڕیشەکێشکردنی پەکەکەی ناوچەکەدا نەمێناو لە سیاسەتەکەیدا کشانەوەو چەواشەیی زیاتری لێدەرکەوت، بۆیە دوایەزانی مانگی ئەیلول چیلەر پێشنیارێکی کرد کە لاری لە گەڕانەوەی سوپای عێراق بۆسەر سنوور نییەو واشی راگەیاند کەسەدام حسێنیش لەوە ئاگادارکراوە. کاتێک وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا پەلپی لەوەگرت، چیلەر بەشێوەیەک کە کەس بڕوای پێنەکات، پێی لەسەر ئەوە داگرت کە واشنتۆن و ئەنقەرە هیچ ناکۆکییەکی سیاسیانەیان لەنێواندا نییە.

لەناو کوردستاندا شتێکی سەیر هاتبووە ئاراوە. زۆر بەئاسانی بەناوچە کوردییەکاندا هاموشۆمدەکرد. لەوەی ئەیلولدا چەند کۆنە دۆستێکی پارتی دیموکراتی کوردستان کارتێکی ولیان بۆ جێبەجێکردم کە بەسنوورەکەیاندا رەتببم و لەبنکەکەی قەڵاچوالانی ناو چیاکانی نێوان سلێمانی و ئێراندا سەر لەتاڵەبانی بدەم. لێپرسراوێکی گەورەی پارتی دیموکراتی کوردستان داوای لێبووردنی لێکردم، چونکە دەبوا بەڕێگایەکی دوورتردا بڕۆم، لەبەرئەوەی راستە ڕێگاکە بەهۆی ئەو هێرشەی سەرلەبەیانی زوویانەوە، تا ڕێ لەهەولێرو قەڵاکانی تاڵەبانی بگرن کەبۆ گرتنەوەی هەولێر دەیدا، داخراوە. من و "هیوپوپ"ی "دی ئەندیپێندت"ی لەندەنی گەیشتینە ناوچەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، پێیان راگەیاندین کەچەندین ئۆتۆمۆبێلی فریاگوزاری پڕ لە بریندار لەپێشمەرگەکانەوە بەرەو باشوور ڕووەو سلێمانی بوونەتەوە. لەو بنکە شاخاوییەی تاڵەبانی بۆی گەڕابۆوە خۆی و هێزی هاوسەری، کە ئەمیان بە ڕێکەوتنێکی سەیر لەبۆردومانی ماڵەکەی نزیک هەولێریان دەربازی ببوو، پێشوازیان کردین و هەروەک دوو کەسی خێزانەکەمین و ماوەیەکی زۆرێنت لێیان دابڕابین.

کەلەبارەی دەستپێکردنەوەی شەڕەوە پرسیارمان لەتاڵەبانی کرد، زۆری وت بەڵام کەمی لەبارەی ڕووداوەکانەوە بوون. تاڵەبانی رەخنەی لەئەمەریکاییەکان هەبوو چونکە ئاگادارکردنەوەکانی ئەمیان پشتگوێ خستبوو کە هێزەکانی سەدام حسێنیش هێرشیان بۆسەر هەولێر کردبوو ڕایان نەگرتبوو، وتی "هەلێکی زێڕینیان بۆ لێدانی ٤ تیپی پاسدارە کۆمارییەکان لەدەست خۆیان دا، خۆ ئەگەر ئەوەیان بکردایە ئەوا سەدام حسێن کۆتایی هاتبوو". گازاندەی

لەو ڤیتۆیەی فەرەنساش هەبوو کەدژ بەلەئاسمانەوە لێدانەکەی هاوپەیمانان بەکاری هێنا،
سوێندیشی خوار کەیارمەتی "لەخودی شەیتان" وەربگرێت. بەڵام جووڵاندنی چرووتەکەی
لەهەوادا وتی: "من هەرگیز هەوڵی خۆکوشتن نادەم"، سووربوو لەسەر ئەو بڕیارەشی کە بۆ
بەردەوامبوون لەشەڕی "بەڕێز بەرزانیدا نەک وەکو کوردێک بەڵکو وەک ناپاکێک" دابووی. ئەمجا
تاڵەبانی بەوهیوایەی لەڕێی مانگە دەستکردەکانەوە تەلەفۆن لەگەڵ "پیلیترۆ" یان ڕۆبەرت دۆیچ"
(سەرۆکی پێوەندییەکانی دەرەوەی باکووری کەنداو، کەدانوستانەکەی ئێرلەندەی بۆ گەیشتن بەو
ڕێککەوتنەی کەلەسەرەمەرگدابوو کرد) دەرگاکەی بەکراوەیی هێشتبۆوە. ئێمە گوێمان لەم سەری
گفتوگۆکەبوو، دیاربوو پێیان وت کە هەردووکیان لەکۆبوونەوەدان یان لەو ناوە نین، بۆیە قایلبوو
قسە لەگەڵ یەکێکی خوارتر لەوان بکات. گفتوگۆکەی بە "چۆنی؟" یان هەر شێوە سڵاوێکی لەو
بابەتە دەستی پێکرد. لەوەڵامدا وتی "من باش نیم" بێگومان وای دەزانی ئێمە هێند لێوەی
دوورین گوێمان لێی نەبێت.

لەو قسەیەی هەڵسەنگاندنێکی زۆر وردی باروودۆخەکەبوو کە نزیکبوونەوەی هەرەسی
یەکێتی نیشتمانی کوردستانی دەگەیاند. هەر سێ ڕۆژ دواتر پارتی دیموکراتی کوردستان لە
خۆرهەڵاتی هەولێرەوە کەسکی لە ٥ میل داو، بەرزاییە سەختەکانی هەیبەسوڵتانی خۆرهەڵاتی
کۆیسەنجەق" یان بێ هیچ بەرەنگارییەکی ئەوتۆی یەکێتی نیشتمانی کوردستان و بێ
بەشداریکردنی هێزەکانی عێراق، گرت، ئەگەرچی تاڵەبانی وای تاوانبارەکردن کەئەمجارەشیان
سەدام حسێن بەهەموو شتێک، هەر لەتۆپی قورسەوە بیگرە تا بەنزینپۆش و گازی ژەهراویش
دەگات، یارمەتی پارتی دیموکراتی کوردستانی داوە. تۆمەتی چەکی کیمیاوی ئەوەندەی دی
هێزەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستانی خاوکردەوەو وورەی پێنەهێشتن، بۆیە ڕۆژی
یەکشەممە بەدرێژایی ڕێگاکە هیچ بەرەنگارییەکی وامان نەدەبینی و، پێدەچوو یەکێتی
نیشتمانی کوردستان لەهەموو لایەکەوە بەرەو شوێنە سەختەکانی سلێمانیان کشابێتنەوە.

ڕۆژی دواتر من و "کۆرت شۆرلە"ی ڕۆیتەر لەسەر دووڕیانێکی گەورەبووین کەهەر چەند
میلێک لەخۆرهەڵاتییەوە پێشمەرگەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان چاوەڕوانی فرمانبوون تا
بزانن چی بکەن. هێشتا چێشتەنگاوبوو بەڵام گەرماکەی لەوەدانەبوو. لەپڕ گوێمان
لێبووکوڕێکی گەنج لە پشتی پیکابێکەوە هاواری کرد: کێ دوو شوێنی خۆرایی بۆ سلێمانی
دەوێت؟ دوو پێشمەرگە خۆیان هەڵدایە ناو پیکابەکەوە. بەمجۆرە هێزەکانی پارتی دیموکراتی
کوردستان بەرەو بەنداوی دوکان کەبەناو ئامانجێکی نەتەوایەتیبوو چونکە یەکێتی نیشتمانی

کوردستان لەوێستگەی کارەباکەیەوە، لەداخی هەولێر لەدەستچوونەکەی کارەبای لەهەولێر بڕیبوو.

هێزە بێ سەرو بەرەکەی پارتی دیموکراتی کوردستان، کەلە ٥٠٠٠ کەس و لەهەموو تەمەنێك پێکهاتبوو بەهەمەجۆر ئۆتۆمۆبێلی سوخرە؛ لوری، پاس، تایبەت دەڕۆیشتن. شۆرك پێش چوونە "سەرایڤۆ"کەی تا هەواڵەکانی جەنگی بۆسنە بگەیەنێت، بۆ نزیکەی ساڵێك (١٩٩١-١٩٩٢) لەکوردستاندا کاری کردبوو، وەك سەربازێکی کارامەش دوودڵ بوو لەوەی کەپچوکترین ئامۆژگاریو وریایی سەربازیانە پێشێل نەکەن، خۆشم هەمان دڵەڕاوکێم هەبوو. شۆرك شتێکی وایکرد کەلەگەڵ پێشی کاروانەکەدا بین کەپێشمەرگەکان لەوێوە لەلایەن دوو سەرکردەی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە بەردەوام هاندەدران تا هیچ گیرنەبن و بەرەوپێشەوە بڕۆن. ئەو دوو سەرکردەیەش رۆژ نوری شاوەیس و فازیل میرانی بوون کەکاتی خۆی ئۆتۆمۆبێلی دەستی دوویان لە "ئاشڤیل"[٦٨] دەفرۆشت. یەکبینە بەپێشمەرگەکانیان دەوت "مام جەلال والەپێشتانەوە"و"ئەیسا با ئەم هەلە لەدەست نەدەین و کۆتایی پێبهێنین".

بەلای چاپخانەیەکی چۆڵکراودا ڕەتبووین کەهەرچەند رۆژێك پێشتر کاتێك بۆ چارپێکەوتنی تاڵەبانی دەچووم ئانم تیادا خواردبوو. کوتوپڕ لەخوارووی شەقامەکەوە بەلای خۆرهەڵاتدا لەچەند گردێکی بەرزەوە تەقە دەستی پێکرد. ئەوکاتە هێزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان پارێزگەرانیان بڵاوکردەوەو دۆشکایەکیان هێنا کەلەپیکابێك بەسترابوو. هەر لایەنەو پێشمەرگەیەکیان لێکوژراو، لاشەکانیان خستنە پشتی پیکابێکەوە. کاروانەکە بۆ بەرەوپێشەوە دەڕۆیشت. هەر نیوسەعاتێك دوای ئەوە، کەپێشمەرگەیەکی یەکێتی نیشتمانی لەڕۆخی شەقامەکەوە تاکە تاکە تەقەیدەکرد، تەقەکانی لەشۆرك و من و شۆفێرەکەو وەرگێڕە کوردەکە دەکرد، گوللەکانمان ئەوەندە لێوە نزیکبوو بەسەرماندا ویزەی دەکرد. پێشمەرگەکانی پارتی هەموو بڵاوەیان لێکردو خۆیان کەلاخست. شورك ناچاربوو چاوەڕوانی نەمانی تەقەبکات، بەڵام ئارامی لێبڕاو بەپەلە خۆی هەڵدایەوەناو ئۆتۆمۆبێلەکەو جوولەیەکی واشیکرد کەبەدوای کەوین، بەهەمان شێوەو وریاییەوە شۆفێرەکانی تریش دزەیانکردو بۆ دەربازبوون لەو گێژاوە زۆر بەخێرایی بەرەو دواوە گەڕانەوە. من هەستمکرد زریکە لەناوەندی پشتمەوە هەستا، بۆ ساتێك وامەدزانی پێکراوم، لەدڵەوە زۆر لەخۆم پەستبووم چونکە کەوتبوومە شەڕێکی وا بێسەروبەرەوە.

[٦٨] پایتەختی ولایەتی "تینیسی" ئەمەریکاو شارێکی بچووکی ولایەتی "ئەرکەنساس"یشە.

دەرکەوت زەردەواڵە پێوەیدابوم و ئازارەکەشم لەوەوەیە، ڕاستییەکەشی شەڕەکە ئەوەندەی نەخایاند. موشەک هاوێژی تفەنگی دژەفڕۆکە، کەبەسەر لۆری گەورەوە دابەسترابوون، جاروبار بۆ دەمکوتکردن یان شوێن پێچوڵکردنی پێشمەرگەکانی یەکێتی، تەقەیان بەناو چیاکاندا دەکرد. شۆڕێک هەر بۆڵەیدەهات و دەیوت "تاقە هاوەنێک ئەمانە دەمکوت دەکات" پێدەچوو یەکێک لەوانەی یەکێتیش هەمان بۆچوونی بووبێت. کاتێک لەوشوێنە بەرپەرەڵاییەدا نزیکەی دەرزنە هاوەنێک دای بەسەر شەقامەکەدا و نیو دەرزنێک پێشمەرگەی پارتی دیموکراتی کوردستانی بریندار کرد و بەئارامییەوە چاوەڕوانبوون بۆ دواوەیان بگوێزنەوە. هەرچەندە ئەو ڕۆژە پارتی دیموکراتی کوردستان چەند کەسێکی لێکوژرا بەڵام لەپاشنیوەڕۆکەیدا بیست میلێک چووبوونە پێشەوە دوکانێکیشی گرت و دەرکەوت کە ڕۆژی پێشوو یەکێتی نیشتمانی کوردستان هەرچی پرۆگرامی کۆمپیوتەری کۆنترۆڵکردنی کارەبادەرەکان هەبووە لەگەڵ خۆیاندا بردبوویان.

کەبەرزانی هات و لەگەڵ یاریدەدەرە نزیکەکانیدا لەبن سێبەری درەختێکدا دانیشت خەندەی ڕەزامەندی دەموچاوی گرتبووەوە، بیاریدابوو کەپارتی دیموکراتی کوردستان لێرە لەدەرکان، گیرنابێت و نایەوێت هێرشەکەی دژ بە دوژمنە بێزراوەکەی ڕابگرێت. بەرزانی بڵاویکردەوە کەڕۆژی دواتر هێزەکانی هەڵەبجەی نزیک سنووری ئێرانیان بەرەو سلێمانی دەکەونەڕێ، تا بۆ جیهانی بسەلمێنن کە ئەو تۆمەتەی تاڵەبانی دەیخستە پاڵیان بەدرۆبخەنەوە کە گوایە سوپای عێراق لەشەڕەکەدا بەشداری پارتی دەکات. من لەگەڵ سەرۆکی ئەندازیارانی بەنداوەکەدا، کە پیاوێکی زۆر بەوێڵە، واسان ڕێککەوت ئەو شەوە لەماڵی ئەودا بەسەربەرین. هەر کە گەیشتینە ئەوێ تەماشامانکرد ئەندامانی سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان لەسەر چیمەنە تازە بڕاوەکەی کەبەسەر گۆمی دوکاندا دەڕوانێت کەوتبوونە ڕیسکی فڕکردن. خانەخوێکەمان پێی لێ بە زەویدا داین و وتی دەبێت بەم بۆنەیەوە بۆماسی خواردن و نانی ئێوارە هەر بمێننەوە.

لەدەوروبەری سەعات ٩ی شەودا ئەتەرێکە گەیشت و هەواڵی گەیاند کە سلێمانی لەدەمەدەمی ئێوارەدا گیراوە. هێزەکانی هەڵەبجە سلێمانیان بەبێ تەقە گرتبوو. لەناو چیمەنی ماڵی ئەندازیارەکەدا و لەبن ئەستێرەکاندا نووستین. کاتێک بەیانی سەعات شەش بەئاگاهاتین هێزەکانی پارتی بۆ تەواوکردنی گرتنەکەی سلێمانی کەوتبوونەڕێ، ئێمەش بەرەو سنوور بەڕێ کەوتین، لەدوا چەند میلدا بەئۆتۆمۆبیلەکە بەلای چەند کەسێکی یەکێتی نیشتمانیدا ڕەتبووین کە لەوناوەدا بڵاوبووبوونەوە بەپێ ڕووەو سنوور دەڕۆیشتن، چاوپێشمان بەچەند کەسێکی چینی ناوەنجی کەوت کەبەر لە ٤٨ سەعات ڕووەو چیاکان کەوتبوونەڕێ و ئێستا بۆ سلێمانی دەگەڕانەوە، کەزۆربەیان لەو چاوەڕوانییەی سەر سنوور تەواو پەستببوون چونکە ئێرانییەکان

سنوورەکەیان داخستبوو نەشیان دەکردەوە. ئەمیش لەشێوەی ڕەوەکەی ۱۹۹۱ بەڵام بچووکتر هەمەجۆر ئۆتۆمۆبێل؛ لۆری، تراکتۆر، پاس پەنگی خواردبۆوەو چاوەڕوانی ئەوەبوون ئێران بیپەڕێنێت بگوزەرێت.

لەشاری پێنجوێنی ناو چیاکەو لەپۆخی ڕێگاکەدا چاومان بەسێ لاوی پۆشتەوپەرداخ کەوت دەیانویست بڕیاری کارێك بدەن بۆ خۆیان، هەرسێکیان ئینگلیزیان باش دەزانی، کوڕەکەیان لەگەڵ ڕێکخراوێکی جیهانیدا کاری مرۆڤانەی دەکردو دوو خوشکەکەشی لەزانکۆی سلێمانی مامۆستابوون. دوو ڕۆژ پێشتر کە یەکێتی نیشتمانی کوردستان خەریکی شار چۆڵکردن بووە ئەمان لەسەر سووربوونی خوشکە گەورەکەیان، کە یەکبینە دەیوت ئەمە "غەدری مەسعود"ەو ئۆتۆماتیکیانە "دیسان هاتنەوەی بەعس"ی بەدوادا دێت، تۆقیبوون و هەڵاتبوون، زۆریش لەو ڕووداوانە دەترسان کەدەبێت لەشارەکەیاندا ڕوویدات. ئەی بۆ ناچنە ئێران؟ ساڵی ۱۹۹۱ وامانکرد بەڵام بگرە ئێرانییەکان لەسەدام حسێنیش خراپتربوون.

دوای چارەکە سەدەیەك لەسەرزادانەکەی عێراق و پێنج ساڵ پشێوی ناوخۆ زۆربەی کوردە بێچارەکان بارەکەیان وا هەڵدەسەنگاند. ڕاستییەکەشی خۆگری و بەووەیی کورد بەرامبەر هەموو ئەو کارەساتانەی بەسەریاندا هات بڕوایەکی چەسپاوی وای لێیان دەویست کە گۆڕانی بارەکە بە جۆرێك بخاتەوە بەلای بەرژەوەندی خۆیاندا وەرچەرخێت. لەسەرەتاوە هاوپەیمانە خۆرئاواییەکان ڤیتۆیان لەدژی هەموو پرۆژەیەك دادەنا کەباری ئابووری کوردستانی ببوژێنایەتەوە، ئەویش -ئەگەرچی ئاشکرا نەکرابوو- هەرلەبەرئەوەی ئەوەکو تورکیا تۆمەتێکی وابخاتە پاڵ واشنتۆن و لەندەن و پاریس کە هانی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی بدەن. بێگومان سووریا و ئێران و عێراقیش بەخراپ هێشتنەوەی بارودۆخی ئابووری کوردی عێراق شادبوون. کوردەکان بەڕەسمی ئاگادارکرابوون کە ئەگەر لەگەمارۆی ئابووری بەدەرنرێن ئەوا لەبەرژەوەندی عێراق دەکەوێتەوە چونکە ڕێ بۆ دۆستەکانی عێراق خۆشدەکات داوای هەمان شتی بۆ بکەن.

لیژنەی سزادانی گەمارۆی ئابووری نەتەوە یەکگرتووەکانی سەر عێراق ڕێگای هێنانی پارچەی سپێری بۆ ئەو چەند کارگەیە نەدەدا کە لەباکووری عێراقدا هەن، دیسان ڕێگای هێنانی مەکینەی دروستکردنی پاڵاوتەیەکی پچووکی نەوتیان نەدان تا لەپاڵاوتنی ئەو تۆزەنەوتەی ژێر دەستەڵاتی کورد خۆیدا بەکاری بهێنن. تورکیا نەیهێشت ڕێکخراوێکی مین هەڵگرەوە کەرەسەی تەکنیکی بۆ هەڵگرتنەوەی ئەو چەندین ملیۆن مینەی لەدوای شەڕی ئێران عێراق بەجێمابوون بەرێت، ئەوەکو "پەکەکە" سوودیان لێببینێت. بەڵام پێداگرتن بەم ڕادەیە بۆ ڕێز لەبڕیارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان، پێشێلکردنی زۆری لەسزادانە نێو دەوڵەتییەکەی سەر عێراق ڕانەگرت. بەمجۆرە ئەم بیانووە لنگەوقوچکراوانەی خۆرئاوا ڕێی دا بەکورد گەنم بەعێراق بفرۆشن و، سوود

لە باجی بازرگانیتییە چەورەکەی گازوئیلی نێوان حکومەتی عێراق و تورکیا وەربگرن و، نرخی
ئەو کارەبایەش بەدۆلار بدەن کە لەعێراقی دەکڕن، کەچی ئەمەبوا بایی ٤٠٠٠ دۆلار پارچەی
سپێری پێویست بۆ چاککردنەوەی بەداڵەی تەلەفۆنەکەی دهۆکیان بکڕن.

خۆشحاڵی کورد بەوەی کەلەدەست ڕژێمە ستەمکارەکەی سەدام حسێن ڕزگاریان بوو کارێکی
وایکرد تا چەند ساڵێک لەبیریان بچێت. یەکەم هەڵبژاردنی ئازادانەی مایسی ١٩٩٢ی کوردی
باکووری عێراق خۆشی و شانازییەکی وای پێبەخشیبوون بەڕوویانەوە دیاربوو، هەرئەوەش
هۆکاری خۆگرییانبوو لەبەرامبەر هەموو ئەوئێش و ئازارەیاندا بێ ئەوەی گلەیی لەبەختی
خۆکردنیان پێوەدیاربێت. نەپێش و نەلەکاتی هەڵبژاردنەکەشدا کوردم هێندە دڵخۆش نەبینیوە،
بەڵام لەلایەکی تریشەوە ناکۆکی نێوان بەرزانی و تاڵەبانی قووڵتر دەکردەوە. هەڵبژاردنەکە
لەبەرهۆیەکی سەرەکی هێنرایە ئاراوە، ئەوەبوو کەبەرزانی لەدانوستانە دوورو درێژەکەی
بەغدایدا گەیشتبووە دوا هەنگاو، لەڕێی هەڵبژاردنەوە پێویستی بەڕەوایی هەبوو تا
ڕێککەوتنەکەی کۆتایی پێبهێنێت. لە هەمان کاتیشدا تاڵەبانی بازاڕگەرمی بۆجۆرە
فیدراڵییەتێکی دەکرد کەزۆر ڕوون نەبوو تا بەرزانی والێبکات دواکەی لەو ئۆتۆنۆمییە
تێپەڕێنێت کەساڵی ١٩٧٠ لەنێوان بارزانی و سەدام حسێندا کرابوو هیچ کاتێکیش بەتەواوەتی
جێبەجێ نەکرا. لەدەنگدانەکەدا کە (مەرەکەبێکی تایبەتی لەئەڵمانیاوە بۆ هێنرابوو، بەڵام
دەرکەوت بە پێچەوانەی ڕاگەیاندراوەکەوە دەسڕایەوە) بەرزانی و تاڵەبانی هەر یەکەیان خۆی
ڕاگەیاندو تاوانی دەستێوەردانیان دەدایە پاڵ ئەوی تر پارتە پچووکەکان هیچ کامێکیان لانی
کەمی ڕێژە دیاریکراوەکەیان نەهێنا، کەسەدی ٧ کۆی دەنگەکانبوو، بۆیە دوورخرانەوە.
(ئەگەر کورسییان دەستگیر بوایە، ئەوا وەک هەندێ کورد پێیان وایە ڕەنگە شەڕەکە
هەڵنەگیرسایەو ڕۆڵێکیان لەنێوانیاندا ببوایە).

لەدوو کۆبوونەوەی گەرمەلاوژنەدا کە خەریکبوو شەڕ لەنێوان هەردوو سەرکردەدا
هەڵبگیرسێت، زۆر بەزەحمەتو بەچارەسەرێکی وا کەزۆر ژیرانە نەبوو، سێ ڕۆژ دوای
هەڵبژاردنەکەش خرایەڕوو، مەترسییەکە دوورخرایەوە. گەلێک لەو کوردانەی کە لەبەکارهێنانی
هێز زۆر بێزاربوون، دواتر پێیان وابوو کە ئەو چارەیە نەبوایە شەڕ هەر لەو کاتو شوێنەدا
هەڵدەگیرسا، بەڵام وەلێ ووڕەی خەڵکی هەر بەرزبوو. خۆشی ڕزگاربوونیان لەستەمەکەی بەغدا
ووڕەی خەڵکەکەی بەبەرزی هێشتبۆوە. ناکۆکییە کۆنەکانیان هەرچۆنێک بووبێت و هەریەکەشیان
چۆن بیری لەدواڕۆژی کوردستان کردبێتەوە، پێشمەرگە دڵخۆشەکانی هەردوولا بازگەی

هاوبەشیان داناو، بازگەکانیشیان بەئاڵای زەردی پارتی دیموکراتی کوردستان و کەسکی یەکێتی نیشتمانی کوردستان ڕازاندەوە.

لەو ڕۆژانەدا گوشاری دەرەوە بەگشتی و وڵاتە یەکگرتووەکان بەتایبەتی، کە وەك بنەمایەك هەمیشە لایەنی هەڵبژاردنی دەگرت، پاڕسەنگی هەڵکێشانەوەی شەڕەکەیدا. وڵاتە یەکگرتووەکان زۆر لەوە پەشتدەبوو کاتەی هەڵبژاردنەکەدا بەرپرسی نوێنەری هەبێت، چونکە لەوە دەترسا کەبەلایەنگری کوردە جیاخوازەکان دابنرێت. (کۆلۆنێل "ئاب"ی خانەنشین کەبەبۆنەی هەڵبژاردنەکەوە بۆ سەرخوانێکی تایبەتی ئامادەبوو، چاوەڕوانی ئەوەبوو کە فڕۆکەکانی هاوپەیمانان بەئاسمانی ئەو ناوەدا بفڕن تا بڵێت "ئەوەتا جۆن مێجەرو جاجی بووش دەنگی خۆیاندەدەن") لەئەنجامدا پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەسەر بەشکردنی دەسەڵات ڕێککەوتن و پارتی وازی لەو کورسییە زیادەی خۆی هێنا تا هەریەکەیان ٥٠ کورسی هەبێت. بەرزانی و تاڵەبانی وەك تەکتیکێك هەڵبژاردنی ڕابەریان بەلاوەنا، کەتیایدا سەرۆکی پارتی دەنگی زیاتری هەبوو بەڵام لەقۆناغی یەکەمدا سەدی ٥٠ی دەنگەکانی بەدەست نەهێنابوو. بەهەرحاڵ براوەی گەورە لەم هەڵبژاردنەدا تاڵەبانی بوو کەهەمیشە پڕوپاگەندەکانی دژی هەر ڕێککەوتنێك بوو لەگەڵ سەدامدا و لایەنی فیدراڵی گرت کە هەنگاوێك لەپێش ڕێککەوتنە ئۆتۆنۆمییەکەی ساڵی ١٩٧٠وە بوو.

دوای ئەوەی حکومەت و پەرلەمانی کورد لەتەموزی ١٩٩٢دا بەگەڕکەوتن ئیتر بۆماوەیەك لایەنبازی ئەو بایەخەی نەما، بەڵام لەکانونی دووەمی ١٩٩٣ەوە، هەندێك لە کوردەکان ئەم بەشکردنەی نێوان دوو لایەنەکەیان بەلاوە کۆسپبوو لە بەدیهێنانی دەستکەوتەکاندا، چونکە وەزیرێکی پارتی ئۆتۆماتیکیانە دەبوا جێگرێکی یەکێتی هەبوایەو بەپێچەوانەشەوە. دۆستێکم وتی: "زۆری نەبرد ئەم سیستەمە ناهەموارە لەسەرجەم فەرمانبەرایەتییەکاندا هەموو پلەیەکی گرتەوە، هەر لەفەڕاشەوە بیگرە تا بەڕێوەبەرەکانیان دەگات". پەقەڵانەوەی بارەکە بەهۆی سووکە شەڕی ساڵی ١٩٩٤ی نێوان دوولایەنەکەوە زۆر ڕوو لەخراپەبوو. لەسەردانێکی شوباتی ١٩٩٦مدا بۆ باکووری عێراق، چەند برادەرێك خۆیان بۆ نەدەگیرا کێتووڕەیی خۆیان دەرنەبڕن. مونیەد یونسی دۆستم پێی وتم: "کوردی ئاسایی ژێردەسەڵاتی پارتی دیموکراتی کوردستان ڕقیان لەمەسعود دەبێتەوە، ئەوانەی ژێردەسەڵاتی یەکێتی نیشتمانیش ڕقیان لەتاڵەبانی دەبێتەوە".

ڕێژەی لایەنگریی خەڵکی بۆ پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان بەرادەیەکی وا کەمبۆوە کە کەس بەدەنگی ئەو داوایانەیانەوە نەدەچوو کەلە تەلەفیزیۆنەکانیانەوە بۆ بەخشینی خوێن بەپێشمەرگە زامدارەکانیان بڵاودەکرایەوە، لە کاتێکدا

لەساڵی ١٩٩٢دا بەهەزارانیان بۆ خوێن بەخشینی ئەوکەسانە دەچوون کە بەرتەقینەوەی ئۆتۆمۆبێلێکی مینکراوی عێراقییەکان کەوتبوون. مونەیمەد پێی ڕاگەیاندم، لەگەڵ ئەو گرانییە ناهەموارەو، ئەو باجە زۆرەی هەردوو لایەنەکە دایاننا، جا لەبازگەکاندابوایە یان بەشێوەی تر "هەرکەسێك ٥٠٠ دۆلاری شك بردایە هەوڵیەدەدا لەوڵات دەرچێت، ئەگەر خۆشی نەبوایە کوڕەکەی، تا پارە پەیدا بکات و بۆ خێزانەکەیی بنێرێتەوە". ژیانی خەڵکی شار لەهەموان خراپتربوو، لەپێناو بژێویدا زۆربەیان بۆ گوندە وێرانەکانیان چوونەوە کە بەیارمەتی ئەمەریکاو وڵاتە خۆرئاواییەکانی دی دروستدەکرانەوە. بەسەدان پزیشك و ئەندازیارو پرۆفیسۆرو خاوەن پیشە، کە بۆ ژیان زۆر پێویستبوون و یەکبینە لایەنگری کێشە نەتەوەییەکەیان بوون، گەیشتنە ئەوەی هەرچییەکیان هەیە بیفرۆشن، کە هیچیشیان نەما سەری خۆیان بۆ دەرەوە هەڵگرت.

ئەوەی کە بەتەواوەتی خەڵکەکەی بێزارکردبوو ڕەفتاری چەکدارەکانیان بوو کەبە ئارەزووی خۆیان خەڵکیان لەماڵەکانیان دەردەکرد، کە تەنانەت سەدام حسێنیش لە شارەکاندا دەستی بەسەر خانووی کەسدا نەدەگرت و زیاتر کاری وای لەگەڵ ئەو گوندانەدا دەکرد کە دەستەڵاتی بەسەریاندا نەدەشکا. ڕێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی ڕاپۆرتێکی لەحوزەیرانی ١٩٩٤دا دەرکرد نوسیبووی "زۆر سوکایەتییە کەئەو کوردانەی ماوەیەکی زۆر هێزە عێراقییەکان مافیانی پێشێلدەکرد جارێکی دی بەدەستی سەرکردەکانی خۆیان وایان لەگەڵدا بکرێت".

ڕاپۆرتی شوباتی داهاتووی ڕێکخراوی لێبوردنی نێو دەوڵەتی، پارتی "دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستانی، سەبارەت بەو پێشێلکردنانە "بەتەواوەتی بەرپرسیارکرد" کە، ئازاردان و، ئەشکەنجەو، دیلکردنی بێ حساب و، کوشتنی ئەنقەستی سیاسییە کێبەرکێکانیان و خۆپیشاندەرانی ئاشتیانەو بەدیلگیراوانی یەکتریان دەگرتەوە. ڕێکخراوەکە دەڵێت:"پشتگوێخستنی بنەما سەرەکییەکانی ماڤ مرۆڤ کەبەئاشکرا سەرکردە کوردەکان لەئەستۆی خۆیانگرتبوو، داخی لەهەمووی زیاترە، چونکە هەر ئەو بنەمایانەبوون کەحکومەتی عێراق یەکبینە پشتگوێیخستبوون، ئەوەش کۆتایی ئەهاتنی ئازارو ئەشکەنجەی کوردی عێراقی دەگەیاند". بێگومان ئەم دەستدرێژیانە چالاکەکانی ماڤ مرۆڤی خۆرئاوایان پەستکردبوو. لەلایەکی تریشەوە ڕێکخراوی چاودێری ماڤ مرۆڤی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست "هیومان رایتس ووچ" بۆ ماوەیەك لەگەڵ چەند حکومەتێکدا خەریکبوو تا کارێك بکرێت حکومەتی عێراق لەسەر کورد قڕکردن "جینۆسساید" بەرەو ڕووی دادگای دادوەریانەی نێودەوڵەتی بکرێتەوە. بەهەرحاڵ ئەوەندەی نەبرد ئەو هیوا زۆرەی بە "ساڵ دەست تێوەردان" لەکارەساتەکانی تری دونیادا هەبوو ئەو توندو تیژییەی ئەماو کاڵبۆوە، وتەی "ناوچەی ئارام"

بووە قسەیەکی هیچ و پووچ. ناوچەی پارەمتییە مرۆییەکان" کەمێژە لەرەنساییەکان لەتەموزی ١٩٩٤دا لەرواندا دیانمەزراند درەنگ هاتەدەست و بەفریای رزگارکردنی توتسییەکان نەکەوت و بەپلەی یەکەم تەنیا پیاوکوژەکان سوودیان لێوەرگرت. لەبۆسنیاش ئەو "ناوچە ئارام"ەی نەتەوەیەکگرتووەکان دەیپاراست لەسریبرینیسادا، لەسالی ١٩٩٥دا بەهەزاران موسلمانان بەدەستی سەربازە بۆسنیە سربییەکان کوژران.

لەکوردستاندا پێنەدەچوو بەرزانی و تالەبانی لەو ڕووداوانەی دەوروپشتی خۆیان بەناگابووبن. راستییەکەی هیچیشیان هەولی شاردنەوەی پێشێلکردنەکانیان نەدەدا. بەرزانی لەشوباتی ١٩٩٦دا بەخۆمی وت:"شەڕو پێشێلکردنەکانی مال مرۆڤمان زیانێکی وای بەکێشەی کورد گەیاند لەباسکردن نایەت، من لەبینینی دۆستە بیانییەکانماندا ئەوەندە شەرمەزارم لەپێشوازی کردنەکەی تۆدا دوودڵبووم" من هیچ بەلگەیەکی وام لانەبووە کە گومان لەدڵسۆزییەکەی بەرزانی بکەم، بەلام داننان و خۆ بە بەرپرسیاردانانی ئەو هەڵە نالەبارانەی سالانی رابردوو، بەگرنگی و پڕکێشیکردنەکەیەوە لەقسەی بۆش بەولاوە شتێکی دی نەبوو. زۆر ئاسانبوو بۆهەر یەکێك لەسەرکردەکانی گازندە لەوی تر دونیای دەرەوەبکات، جیهانی دەریشەوە سەرزەنشتی ئەوان بکات. بەلام ئەم توندوتیژییە بێ مانایە پێنەچوو کۆتایی نەیەت. بەڕای رەخنەلێگرانی کوردەوە، لەمێژە دەلێن ناکۆکییە توندو تیژییەکەی نێوانیان بۆماوەتەوە، بەلام کوردو سەرجەم عێراقییەکانیش دیاردەی دەستەلاتە نزیکە ٣٠ سالییەکەی بەعسیان پێوەدیارە. چەوساندنەوە، تۆقاندن، خۆسەپاندن هەموو عێراقییەکانی زلەترەك کردبوو بەلام هیچیانی بەڕادەی کورد نەتۆقاندبوو.

چەندین سال ئەو کۆمەلە کەمەی لەپال بەرزانی و تالەبانی و سەرکردە نەتەوەییەکانی دیدا شەڕیان دەکرد، لەسەختترین ناوچەی دونیادا قەتیسکرابوون. پێشمەرگە لەسالی ١٩٩١دا بۆ یەکەمین جار دەستی بەسەر شارە کوردییەکاندا گرت، کارامەیی و لێهاتووییەکی وایان بۆ بەڕێوەبردنی بەڕێوەبەرایەتییەگشتی و دەزگا داراییە میرییەکان نەبوو، بەتایبەتی کە کارامەیی و لێهاتوییان تەنیا لەشەڕی پارتی زانی و خۆئامادەکردنی ئایدۆلۆژیانەدا هەبوو. سەریان لەنەمانی کولتورە کوردییەکەی هەموو کاتێك پیایاندا هەلدەدا سووڕمابوو. ئەمەش بەلای ئەوانەوە کۆتایی ژیانی کۆمەلگا گوندنشینییەکانی دەگەیاند کەسەدام حسێن بەکارلکردنی گوندو گۆڕینەوەی بەژیانی ناو "شارانی سەرکەوتن" کە لەبری ژیانە کۆمەلایەتییە کۆنەکەیان لەم شارانەدا کارەبا و سەرپەرشتیارێتی پۆلیس و ئامادەکردنی بەعسیانەی قوتابخانەکان لەئارادابوو، لەبنچەوە هەلێکێشابوو ئەو کوردانەی خوێندنیان لەدەرەوە تەواو کردبوو پێوەندیشیان بەبیرە هاوچەرخەکانەوە هەبوو، یان هەر نەگەڕانەوە یان جاروبار سەردانی

کوردستانیان دەکردەوە، یان دەگەڕانەوەو بەناهەموارترین شێوە هەڕەشەی لەسەر پەتێك یاریاندەکرد.

لەسەردانەکەی هەولێری شوباتی ١٩٩٦مدا لەمونەیەدم پرسی، ئەم هەموو چەوتیانە لەکوێوەهاتوون؟. مونەیەد بەبیری هێنامەوە کەچەند ساڵێك پێشتر باسی چاوپێکەوتنێکی خۆمم لەگەڵ نزار حەمدووندا بۆ کردووە، ئەوکاتە لە ڕۆژانی جەنگی ئێران عێراقدا باڵوێزی عێراقبووە لە واشنتۆن‌و توانایەکی زۆری هەبووەو بەرلەوەی ببێتە باڵوێزی بەغدا لەنەتەوە یەکگرتووەکاندا خزمەتێکی چاکی وڵاتەکەیی کردووە. مونەیەد وتی "ئەی پێی نەوتبوویت لەماوەی ساڵێکدا کورد بەچۆکدا دێت‌و لەسەدام دەپاڕێنەوە کە بگەڕێتەوە بۆ باکووری عێراق؟" مونەیەد بەبیری هێنامەوە کە "ئەو چاوپێکەوتنەم لەساڵی ١٩٩٢دا بوو". ئەوکاتە زۆر بەم قسەیە پەستبووم پرسیم: ئەی ئێستا چۆن؟

بەپەشۆکاوی وەڵامی دامەوە "ماوەیەکە خەونێك دەبینم بەوەی کەسەدام دەگەڕێتەوەو چەکدارەکان دەردەکات‌و، ئەمجا بۆخۆشی دەچێتەوە بەغدا تا کوردانی ڕێك‌و پێك شەرەفمەندانە ژیان بەسەرببەن". وەڵامەکەیی قووتدایەوەو ئەمجا وتی:" خراپم تێمەگە،من شانازی دەکەم کە کوردم‌و حکومەتی خۆمم هەبێت، بەڕاستی هیچ کوردێك نییە بیەوێت بچێتەوە باوەشی سەدام، بەڵام قسەکانی من لەوەوەیە کە کورد ئازارێکی زۆری بەدەست ئەم پەنجا بەپەنجایەو حکومەتە چەکدارەکەوە چەشتووەو هیچیشی بەهیچ نەکردووە". ئەم خەونەی مونەیەدم بەگەورە لێپرسراوانی هەردوولایەنەکە گەیاند، بەو نیازەی تووڕە بن یان بەرگرییەکی بەجێیان بۆ سوودی بەڕێوەبەرایەتییەکەیان لێ ببیستم. بەڵام هەر شانیان بادا تەنیا یەکێکیان نەبێت پرسیارێکی کرد: "چاچیمان پێدەکرێت؟".

هێشتا سێ هەفتەی تەواو بەسەر ڕووداوەکەی هەولێردا تێنەپەڕیبوو کە پیلیترو لەئەنقەرە چاوی بەبەرزانی کەوت‌و دەرکەوت ئەمەریکاش هەمان هەڵسەنگاندنی بۆ بارەکە هەیە. لەم کۆبوونەوە بێناکامەدا دیاربوو هەردوولا دەیانویست زەرەر لەنیوەی بگەڕێنەوە، هەریەکەشیان دەیویست لەنیازی دووری ئەوی دییان تێبگات. هەردوولایان کاتیان پێویستبوو. ئەوکاتە دوومانگ کەمتری بۆ هەڵبژاردنی سەرۆکی ئەمەریکا مابوو. بەڕێوەبەرایەتی ئەمەریکا دەیویست وای دەرنەخات کەهەموو شتێکی لەدەستچووبێت چاریشی نەمابێت، بەتایبەتی کەڕەخنەگرانی سیاسەتی بەڕێوەبەرایەتی لەواشنتۆن لەبەردەم کۆنگرێسدا ئەو بارەی باکووری عێراقیان بەتێکەوتنەکەی ساڵی ١٩٦١ی سەرۆك کندی "کەنداوی بەرازان" بەراورد دەکرد. لەم کاتەدا بیرنوسی قسەکەری وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا بەرزانی بەپیاوێکی "زۆر گرنگی باکووری

عێراق" دانا، بەمەش دەیویست بەڕێوەبەرایەتی ئەمەریکا بەوە قایلبکات کە بەڕێوەبردنی کوردستانی عێراق بەدەست تاکە سەرکردەیەکی کارامەو بەتواناوە بێت باشترەو هەموو شت ئاسان دەکات. لەو ڕۆژانەدا دیپلۆماتێکی خۆرئاوایی لەئەنقەرە بەتەوسەوە وتی: "بەرزانی بەیارمەتی سەدام هەموو کوردستانی هەڵلووشی و ئێستاش دەیەوێت ئێمە جارێکی دی دەستی تەوقە لەگەڵکردنەوەی بۆ درێژ بکەینەوە".

بەرزانی پێویستی بەوەبوو کوردی عێراق بەوە دڵنیا بکاتەوە کە ئەمەریکاییەکان نەگەیشتوونەتە ئەو بڕوایەی ئەم بەتەواوەتی خۆی بەسەدام فرۆشتبێت. یاریدەدەرەکانی بەرزانی زانیاری وایان دەردکاند کەئەو ئاما .یە هاریکارییە ´ی توندوتۆڵ لەگەڵ ئەمەریکادا ببەستێت، بەمەرجێك چەکی قورس و جۆرە گرەنتییەکی ؛ای ـاتیٚ کە تا ئێستا هیچ حکومەتێکی خۆرئاوایی بەهیچ کەسێکی نەداوە، ئەگەر تا ئەوا وەك ڕوونیانکردەوە، بەرزانی ئەو دانوستانەی ۱۹۹۲ای لەگەڵ سەدامدا نوێدەکاتەوە. بەرزانی دەیویست هەنگاوی زۆریاش بەرەو پێشەوە بنێت، هەڵبژاردنی نوێی ڕاگەیاند تا شێوەیەکی یاسایی بگەیەنێت و، بەپێی ئامۆژگاریکردنی ڕاوێژکارەکانی ڕەوایی بە تێپەڕاندنی سیاسەتەکەی بدات. بەرزانی بە دەرکردنی لێبوردنێکی گشتی بۆ هەموو ناکۆکەکانی بە جەلال تاڵەبانیشەوە، بۆ ئەوەبوو کە ڕەخنەگرەکانی بەلای خۆیدا رابکێشێت. فوئاد مەعسومی (یەکەم سەرۆك وەزیرانی کوردی ساڵی ۱۹۹۲)کە گرنگترین دیل بوو لای بەرداو، نامەیەکیشی پیادانارد بۆ ئەو سەرکردانەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان کە پەنایان بۆ ئێران بردبوو، تیایدا داوای "ئاشتبوونەوەی لەگەڵدا کردبوون و ماڵ دابوونیٚ بەشداری هەڵبژاردنیش بکەن. پەرلەمان کۆبوونەوەی کرد کە ٦٩ ئەندام لەکۆی ۱۰۵ ئەندام تیایدا ئامادەبوون و، سەرۆك وەزیرانێکی نوێش لە پارتی دیموکراتی کوردستان دانرا.

بەلام داخۆ بەرزانی کەسوێندی خواردبوو کوردستان بکاتە قەلایەکی دیموکراسی و فرەلایەن"، ئەگەر بیویستایە دەیتوانی هاوپەیمانێتییەکەی عێراقی بپڕێت؟ داخۆ ولاتە یەککگرتووەکانیش جارێکی دی MCC، کەمیشانەی نوێبوونەوەی باوەڕ بەبەرزانی بوونی دەگەیاند، دەناردەوە؟ یان بەبیانووی دەربازکردنی ئەفسەرو بەکرێگیراوانی لەترسی ئەوەی ئەوەك ببنە قوربانی سیخوڕەکانی سەدام حسێن، نەیدەکرد؟ داخۆ ولاتە یەککگرتووەکان ئەوەندەیان بەڵگە بەدەستەوە مابوو کەچەترە ئاسمانییەکەی بۆ ساڵی ۱۹۹۷ نوێبکاتەوە؟ داخۆ تورکیا لەم بارەدا هەستی بەوە دەکرد کە ئەم چەتری ئاسمانییە لەبەرژەوەندییەتی و، کەلای خۆیەوە پشتگیری پێویستی مانەوەی هەندێکی نەك هەمووی دەکرد؟ شەش هەفتە دوای ڕووداوەکەی هەولێرو، کاتێك یەکێتی نیشتمانی کوردستانی تاڵەبانی بڕیاریەرو لەناوچەکانی

سنووری ئێرانەوە تا نزیک پایتەختی کوردستان کە هێزە عێراقییەکان دەیانپاراست، پارتی دیموکراتی کوردستانی پاڵوتا.

هەرچەندە ئێران پێشمەرگەکانی یەکێتی نیشتمانی پڕچەک کردو تەقەمەنی زۆریشی دایەو بەتۆپیش پشتگیری کردبوون، بەڵام خێرایی هەڵسانەوەکەی تشرینی یەکەم هەموو ئەوانەی ڕەخنەیان لەتاڵەبانی دەگرت سەرسامکردبوو. زنجیرە هێرشە کوتوپڕەکەی یەکێتی ووڕەی پارتی دیموکراتی کوردستانیان بەتەواوەتی هێنایە خوارەوەو شاری سلێمانی یان بەجێهێشت، بەڵام لەچەند ڕۆژێکدا پارتی دیموکراتی کوردستان لە هەوڵدانێکی بێئەنجامدا بۆ نوێکردنەوەی ئەو لافەی کە گوایە دەستی بەسەر هەموو باکووردا گرتووە، هێرشی بەرامبەریان دەستپێکردەوە، کەچی سەرنەکەوت و بەسەدان پێشمەرگەی لێکوژرا (دەیانوت هێزەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان کە هاتوونەتەوە ئەو ناوچانەی بۆ ماوەیەکی کەم جێیانهێشتبوو تۆڵەیان لەوکەسانە کردبۆوە کە ڕژیانبوون و گرتبوویانن و پارتیش هەمان شتی کردبوو، کەئەوەش ڕادەی بەتوانایی دەزگا ئاسایشییەکانی کوردو تیمە خافڵکوژییەکەیانی دەگەیاندو، کاریگەریتی شێوازە بەدەکانی سەدامیشبوو). لاقلیدانی پادشایەتییەکەی کوردستانی مەسعود بەرزانی بەباچوو، کوردستانی عێراقیش بێ هیچ زەمانەتێک بەدابەشکراوەیی مایەوە، بەشە خۆرئاواییەکەی بندەستی پارتی دیموکراتی کوردستانی زیاتر پشتی بە عێراق بەستبوو، بەشەکەی خۆرهەڵاتیشی ئێران دەستی بەسەریدا دەهێشت. لەدواڕۆژانی تشرینی یەکەمدا پیلیترو گەڕایەوە ئەنقەرە تا سەرپەرشتی دانوستانی ئاگربەستی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان بکات کە ئەندامانی ڕیزی دووی سەرکردایەتییەکانیان دەیانکرد. بەرپرسە ئەمریکاییەکە بەهیوابوو لەڕێی دانوستانەکەوە پارێزگاری دەستەڵاتی وڵاتەکەی بکات. بەڵام بەهۆی ئامادەنەبوونی سەرکردەکانیانەوە دانوستانەکە پووکەش بوو (پیلیترو لەکانونی دووەمی ١٩٩٧دا جارێکی دی بۆ تورکیا گەڕایەوە تا لەگەڵ کوردەکانی عێراقدا زیاتر گفتوگۆبکات، بەڵام ئەویش سەرکەوتوو نەبوو).

لەناوەڕاستی ئەیلولدا کاتێک کەمێک ڕۆژئاواییە کوردییەکانی سنوورم تەواوکرد، بەرلەجێهێشتنی عێراق و گەڕانەوەی تورکیا، نوسینێکم بینی "بەخێربێن بۆ کوردستانی عێراق". لەدڵی خۆمدا وتم داخۆ گەر لەداهاتوودا بڕیارمدا جارێکی دی بگەڕێمەوەبەڕاستی بەخێرهاتنم دەکەن، یان ڕێی گەڕانەوەم دەدەن. بەدرێژایی ساڵانی ڕابردوو بەرزانی و تاڵەبانی زۆریان لێدەکردم کە پڕ بە ئۆتۆمۆبیلێک پێشمەرگە بۆ پارێزگاریکردنم بەکرێ بگرم تا دژ بە بەکرێگیراوە عێراقییەکان کە کوشتنی پەیامنێرێکی خۆرئاوایی ئاواتیانە، لەسەرباسێکی وایش لەئارادابوو کە لەبری کوشتنی هەر خۆرئاواییەک بە ٧٠٠٠ دۆلار خەڵاتدەکرێن. تورکەکانیش پەڕینەوەی ڕۆژنامەنووسە بیانییەکانیان لە سنوورەکانیانەوە بۆ عێراق زەحمەتتر کردبوو. داخۆ ئەگەر عێراق یان ئێران دەست بەسەر کوردستانی عێراقدا بگرنەوە کورد هانی دۆستە

خۆرئاواییەکانی ئەداتەوە سەردانی کوردستان بکەن؟ ئەی جارێکی دی پرکێشی ئەوە دەکەم کەمەوالی شەڕێکی تری نێوان کورد خۆیان رابگەیەنم، کەلەبری ئێران و عێراق یان تورکیا دەیکەن؟ جا بەڕاستی من دەمەوێت لەنوێ هەواڵی شەڕێکی تری وایان ڕابگەیەنم؟ پەیامنێر پێویستە بێلایەن بێت. من کەلەبارەی کوردی عێراقەوە نووسیومە زۆر هەوڵی ئەو بێلایەنییەتییەم داوە، لەکۆتاییشدا، بەچاوپۆشین لەڕاو بۆچوون و هەستی پەیامنێرەکە، شتی یەکەم بەسەرهات و ڕووداوەکانە.

بەڵێ دان بەوەدا دەنێم سەرکێشیەکەی من لەوەوە بوو کە کورد لەو هەلومەرجەی ساڵی ١٩٩١ بۆیان هەڵکەوت کارێکە بکات دەستکەوتێکی دیار بەدیبهێنێت، بەڵام لەبەر زۆر هۆ کەخۆیان لەهەمووی بەرپرسیارنەبوون نەیانکرد. واش لەوەتەی من بۆ یەکەمین جار چوومەناو ئەو بەشەی عێراقی ژێر دەستەڵاتی کوردەوە، کە کەمێك لە ٥ ساڵ زیاترە، چەند دەوڵەتێك کەزۆربەیان پێشتر بەشێکی ئیمپراتۆرییەتە ڕووخاوەکەی شۆرەوی بوون و لێی جیابوونەوەو، هەندێکیشیان تا رادەیەك لەئاسیای ناوەڕاست و قەوقاسەوە نزیکبوون، چوونەناو نەتەوە یەکگرتووەکانەوە، کەچی کورد نەك هەر خەونی هێنانەدی دەوڵەتی سەربەخۆی زەحمەتبوو بگرە خەونی ئۆتۆنۆمییەکی راستەقینەشیان لەدەستچوو. تەنانەت وەك فەلەستینییەکانیش چاودێریان لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا نییە. ئەو سەرکردە کوردانەی لەڕابردوودا بەدلنا دادەنران، یان مردن، یان راستگۆییەکەی خۆیانیان لەدەست دا، ئەوانەی کەماونەشن -لەرۆژگارێکدا واسەدزانی چاکیان دەناسم و زۆریشم خۆشدەوێن- بەرزانی و تاڵەبانی بوون، ئەوانیش پێدەچوو گیرۆدەی خارەزووە بۆماوەکەیان بووبێتن کە فەوتکردنی خۆیانەو بەگوێی لێکدانەوەو شیکردنەوەی ژیرانەی نزیکترین و دڵسۆزترین یاریدەدەری خۆشیان نەدەکرد. وای لێهات هەرچییەکم لەکوردستاندا دەبینی، بەڕادەیەکی زۆر هەستیان بە ترس وبێتوانایی دەکرد. لەم بارودۆخەدا خەریکە تورکیا -کەسەیرەکە لەوەدایە- دەبێتە هیوای بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد، ئەویش نەك بەهۆی چالاکی گەریلاکانی "پەکەکە"وە کە هەرچەندە ئاستی شەڕکردنیان ڕۆچووە، بەڵکو چونکە دەستەڵاتدارانی تورکیا بەوەی کەبەرامبەر کورد دەیانکرد، سەبارەت بەجیایی پێناسەکەیان هەستیان دەبزواندن کەلە مێژبوو سڕیبوو.

ئەو درەنگانێك بەرلەوەی لەشاری زاخۆی سنووری عێراقەوە دەرچم، پزیشکێکی تۆقیووی کورد کەلەگەڵ رێکخراوێکی یارمەتیدەری بیانیدا ئیشی دەکرد، لەدوکانێکی تەلەفۆنی مۆبیل فرۆشی تەنیشت ئوتێل بەغدای شارەکەوە، لێم نزیکبۆوەو کەوتە قسەکردن. زۆر دڵنیابوو لەوەی کەئەگەر بگەڕێتەوە بۆ شاری سلێمانی ئەوا هەواڵگران و پۆلیسی عێراق دەیکوژن. سەبارەت بەوەی کە داخۆ دەتوانم یارمەتی بدەمو بڵێم لەگەڵ مندا کاربەکات تا لەعێراق دەربچێت پرسیاری لێدەکردم؟ ویستم تێی بگەیەنم کەزۆر زەحمەتە ئەو ئەمریکاییانەی ئیش بۆ

ئەوکەسانەی دەبنەپەنابەر دەکەن ڕێز لە هیچ بەڵگەیەکی مۆرکراوی من بگرن. ئەو قسانەم سوودیان نەبوو، ویستم بەڕێزەوە داواکەی بدەمە دواوە، بەتایبەتی کەمێجگار ماندووبووم، ڕەنگە بارەکەشیم بەچاکی لێک نەدابێتەوە. شتێکی وام لەگەڵدا باس نەکرد کە خۆی نەیزانێت. پێی وابوو ئەو بیانییەکی دەستکەوتووەو ڕەنگە بەشێوەی قسەکردنەکەشمدا زانیبێتی من ئەمەریکاییەو ویستبێتی بەختی خۆی لەگەڵ مندا تاقی بکاتەوە. وەک هەر کوردێکی دی وەک گوناهبارێک لەبەردەم خولومندێکی تووڕەدا وەستابوو. ئەم پزیشکە بەپێچەوانەی زۆر کوردی ترەوە کە بەدرێژایی ساڵانی ڕابردوو ئاسیبوونەو جا یان کوژران یان خاڵکوژکران، کوردێک بوو نەیویست بژی.

عەبدولڕەحمان قاسملۆی برادەرم بەبیرهاتەوە کە سەرکردەیەکی کوردی ئێران بوو، ڕۆژی ۱۳ی تەموزی ۱۹۸۹ لەنهۆمی پێنجەمی ئەپارتمانێکی شاری ڤییەنەدا، بەدەستی ئەو پۆلیسە نهێنیانەی ئێران کوژرا کە وەک دانوستانکەر هاتبوونەلای. پیاوێکی واچاپوک لەمەیاندا ژیر نەبوو. گەیشتبووە ئەو باوەڕەی کە تاران لەدوای مردنی ئایەتوڵا ڕووحوڵا بەهێنی بیکردنەوەی ئەم ئاشتی لەگەڵ کوردە ئێرانییەکاندا دەکات. ئەو لەخۆپاراستندا زۆر وورد بوو، کەچی وەک تازە پیاکەوتەیەک، دوای دوورخستنەوەی ئەو پاسەوانانەی تاڵەبانی بۆ ئەو دوو دانوستانەی پێشووی کانونی یەکەمی ۱۹۸۸و کانونی دووەمی ۱۹۸۹ بۆی دانابوو، بەرەو مەرگ هەکێشکرا. هەر دوو ڕۆژ پێشتر لەخانووە پاریسییەکەی خۆمدا، ئاهەنگمان بە بۆنەی وەرگرتنی یەکەم ڤیزەی وڵاتە یەکگرتووەکانەوە بۆی دەگێڕا، کە دوای چەند ساڵێک بەو بیانووەی بە بەکری گیاوێکی ئاژاوەگێڕی مارکسیان دەزانی ڤیزەیان نەدەدایە، ئاپێک ویسکی سکۆچمان تەواوکرد. بەکۆتاییهاتنی جەنگی سارد ئەو بڕیارە پێشوەختانەی بەو هۆیەوە درابوو کۆتاییان پێهێنرا. قاسملۆ یارمەتی باڵوێزخانەی ئەمەریکا لە بەغدا دابوو، سەبارەت بەو پێشێلکردنانەی بەرامبەر بەکورد دەکران، ڕەنگە هەر لەبەر ئەوەشبووبێت کەوەک هەموو کوردەکانی دی ڕەفتاری نەکرابێت.

قاسملۆ تا ڕۆژی خاڵکوژییەکەی سەرسامیکردبووم، چونکە تاکە کوردبوو کە توانایەکی وای هەبێت بەڕێزەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ هەموو ئەو کەسانەی هاوکاریان لەگەڵدا دەکرد بکات. بەهۆی جۆری تێگەیشتنی کاروباری دونیایەوە، برادەرێتی و پێوەندییەکی چاکی لەگەڵ ڕۆژنامەنووس و سیاسەتمەدارە ئەکادیمییەکانی ئەورووپاو دەرەوەشیدا هەبوو، لەوەش دوورییەکی پراگماتی وای دابوویە کە لەبەرزانی و ئوچەلان و تاڵەبانی و پەرلەمانتارە تازە پیاکەوتە کوردەکانی تورکیادا نەبوو. چەند کوردێک ئەوە یەکلا دەکەنەوە کەئەگەر ئەو بمایە ئەوا پرۆگرامێکی سیاسیانەی بۆهەموو کوردی دونیا دادەنا، بەڵام ئەمڕۆ تەنیا شەهیدێکی کوردەو هیچی دی.

ئێستا محەممەد جەعفەری سەحرەرودی، کە ئەفسەرێکی هەواڵگرە ئێرانییەکانە و داڕێژەری پلانی کوشتنەکەی قاسملۆیە و لە کوشتنەکەشیدا بەشداربووە، خەریکە لە کوردستانی عێراقدا بەدیار دەکەوێت. بۆتە دانوستانکەرێکی سەرەکی لەگەڵ تاڵەبانیدا، کە تاڵەبانی بەدرێژایی چەندین ساڵ شانازی بە دۆستایەتی و برادەرێتی قاسملۆوە دەکرد (پاشان بەڕێزانی بەڵگەی وای ئاشکرادەکرد کەوای نیشاندەدا تاڵەبانی بۆ دڵخۆشکردنی سەحرەرودی و گەورەکانی، ئەو خەڵکەی سەر بە قاسملۆی دیلدەکرد کە لەساڵی ١٩٩٤ دا بیانویستایە بۆناو ئێران بچوونایەتەوە. جا ئەگەر ئەوە راستیشبێت ئەوا بۆ کورد شتێکی نوێ نییە، چونکە مەلا مستەفای بەرزانی سی ساڵ پێش ئێستا سەرکردە نەتەوەییە کوردە ئێرانییەکانی بەشا دەدایەوە). هەر کوردێک وشیار بوایە دەیزانی هەڵبژاردنەکەی سەحرەرودی بۆ چاککردنی پێوەندی ئێران و تاڵەبانی بە رێکەوت نییە، بەتایبەتی کە ئێرانییەکان بەدرێژایی مێژوویان ناویان والێزیشتبوو کە بایەخ بە وردەکاری دەدەن.

بڵێی پەرەسەندنی پێوەندی ئێران و یەکێتی نیشتمانی کوردستان وایکردبێت کەلە ساڵی ١٩٩٦دا وێنەی پاڵەوانان و سەرکردەی شۆڕشە نەتەوەییەکانی کوردی سەدەی بیستەم دابگیرێن کە بەدیواری شەقامە سەرەکییەکەی سلێمانییەوە هەڵواسرابوون؟ لە دوا سەردانی ساڵی ١٩٩٣یی ئەم شارەمەوە، وێنەکانی سەر ئەم دیوارە گۆڕابوون و، شێوەیەکی هونەری شۆڕەوی ئاسنایان لەخۆگرتبوو، لەو رێتانە دەچوون کە لەکرێملینداو لەسەردەمی زنۆبندا هەبوون. وێنەی قاسملۆ و مەلا مستەفا بەرزانیان تیادا قڕی بوو. تیامابووم، بڵێی لەو کۆنە قینەی تاڵەبانییەوە هاتبێت کەبەرامبەر بە بەرزانی لەدڵیابوو، یان لە پەرەسەندنی ئایدۆلۆژیائیسلامییەکەی ئێرانەوە بووبێت کەخۆم سەرنجم دابوو. لەو وێنانەی بەم دیوارەوە مابوونەوە، وێنەی قازی محەممەدی سەرۆکی کۆمارە کەم تەمەنەکەی مەهابادبوو کەشای ئێران لەسێدارەی داو، لەگەڵ وێنەی یەکێکی ناوخۆی تردا. مانەوەی وێنەکەی قازی محەممەدم زۆر بەلاوە سەیربوو، بڵێی لەبەر لابردنی شار نەمانی جەنگی ساردبووبێت، یان لەبەرئەوە بووبێت کەخاوەنەکەی شوێنێکی باڵای وای لەبزووتنەوەی نەتەوەیی کورددا گرتووە نەکرێت دەستی لێبدرێت؟ یان سڕینەوەی شوێنی ئەم کەسایەتییە نەتەوەییە کوردە ئاسراوەش هەر پێوەندی بەکاتەوە هەیە؟

ولیام ئیگلتۆن لەکۆتایی کتێبەکەی مێژووی مەهابادیدا گەیشتۆتە ئەو بڕوایەی کە، هەندێک لەو کوردانەی ساڵانی شەست شەڕیان بۆ بەرزانی دەکرد، لەچەند حاڵەتێکیدا بەو پەندە کوردییەوە بەندبوون کەدەڵێت "شەڕ لەبێ‌تانی باشترە". ئەم پەندە کوردییە، تا رادەیەکی باش یارمەتی تێگەیشتنی ئەو زنجیرە رووداوانە بەدات کە ساڵانی نەوەت ولیان لەمن کرد بۆ سلێمانی بچمەوە. لەم جارەیاندا، وڵاتە یەکگرتووەکان جارلەدوایی جار یاریدەدەرێکی وەزیری دەرەوەی خۆی دەنارد یارمەتی کوردەکان بدات نەک کیسنجەر ئاسا تەگەرە بخاتە کاریانەوە،

بلێی ئەمیان پەرەسەندنی پێوەندییەکەیان بێت؟ یان بۆ ئەوەبێت کە ڕادەیەک بۆ ئەو سیاسەتە سەرنەکەوتووەی خۆیان دابنێن کە سەدام حسێنی پێ لانەبرا، یان بۆ دامەزراندنی ئاشتی نێوان عەرەبو ئیسرائیلییەکان بێت، یان بەشێکی ئەو ڕێککەوتنە ڕانەگەیەندراوەبێت کەپشتگیری عەرەبی بۆ گەرەنلوولی بیابان پێ مسۆگەر کرا؟

ئیگلتون لەکتێبەکەیدا دیسانەوە دەڵێت: "بەپێی ئەو زانیاریانەی لەبارەی ڕابردووی کوردەوە دەیانزانین، دەبێت بیری وا لێبکەینەوە کە هەندێ جار کوردی ناو چیا دوورو پانتاییە دابڕاوەکان، ماوەیەکی کەم لەبیر دەکرێن یان پشتگوێ دەخرێن، تا دیسانەوە دەبیستینەوە کە بەسووربوون یان کەللە ڕەقییەوە، یان بە کارتێکردنی چەند کەسایەتییەکی بەسەرهاتەکەی مەهابادی ١٩٤٦و کەسانی تری وەچەی نوێ کەلەوەی مەهاباد بێئاگان، جووڵەیان تێبکەوێتەوە". هیوام زۆربوو کە کوردی لاوو داناتر بەجۆرێک لە جۆرەکان، ڕزگارکردنی چەند شتێکیان لەپاشماوەی ئەو هەڵەی پێدەچوو باشیان بزەاتبێت، لەباردابێت. بەڵام کوردێکی زۆر ترسی ئەوەیان هەبوو کەلەم نزیکانەدا، ماوەیەکی تری چەوساندنەوەو زۆرداری دەوڵەتانی دراوسێیان بۆدێتە ئاراوە، ئەو دراوسێیانەی گەر لەهیچ شتێکدا کۆک نەبووبێتن و بەشداری یەکتریان نەکردبێت ئەوا لەڕقەبەرایەتی کوردو هەستی نەتەوەییاندا کۆکن و هوو بەنێوانیشیاندا ناچێت. ڕەنگە ڕەشبینی زیاد لەپێویست کوردی بەوە گەیاندبێت کەخۆزگا، ئەمڕۆش نەبێت لە داهاتوودا هەرنەست بەرداریان دەبێت.

کەلەرۆژانی تشرینی یەکەمی ١٩٩٦دا لەواشنتۆن لەژووری گەورە کاربەدەستێکی وەزارەتی دەرەوە دانیشتبووم، بیرم لەوەدەکردەوە داخۆ هەستی ئەو خەڵکە باشە چی لەسووربوونی ئەم کاربەدەستە شارەزایە بەدەستدەهێنن کە دەڵێت ئەو چەترە ئاسمانییەی لەپێناو پارێزگاری کورد دانراوە، گەر وڵاتە یەکگرتووەکان بیەوێت بەهەر خۆشی بێت دەمێنێتەوە. ئەم دۆستە دیپلۆماتە بەجۆرێک باسی عێراق و کوردی دەکرد کەهەر ڕێک وەک "لبنانی نەوەتەکان" بێت، بەهەموو ئەو قوربەسەریانەی کەلەشەڕی توندوتیژو چەپەڵی زۆرخایەنی وڵاتانی خۆرهەڵاتدا بەدیاردەکەوێت. بەڵام لەبەرهۆیەک کەخۆشم نەمدەزانی چییە، لەبۆچوونەکەی ئیگلتۆن سەبارەت بەسەرهەڵدانەوەیەکی تری کوردو، لەماوەی تەمەنی پیشەیی خۆمدا، گومانم هەبوو. پێشەکی لەو خۆویستییەی پەیامنێرێکی چەقەڵەکردوودا، داوای لێبوردن دەکەم، چونکە بەدڵ دەمەوێت سەرهەڵدانەوەیەکی تری کورد ببینم تا هەنگاو بەهەنگاو مێژووی خەباتیان بخەمەڕوو.

# پەراوێزەکانی بەشی دەیەم

## بەرچایی سەگ

*"گەر پێشتر نەمزانیبێت بۆچی"، گفتوگۆیەکی ئەحمەد چەلەبی. لەندەن. ٢٧ی ئەیلولی ١٩٩٥.

*"دوو ملیۆن دۆلار"، بەرزانی و تاڵەبانی گەیشتنە ئەوەی کە نیوەی تێچوونەکەی پێکەوەبیدەن و هەر یەك ملیۆن دۆلار بمێنێتەوە کە واشنتۆن دابینی بکات.
وشیار زێباری. لەندەن ٢٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٦.

*"بازرگانێتی نەوتە قاچاخەکەی عێراق"، ساڵی ١٩٩٦ چەندین سەرچاوەی کورد دەستکەوتی رۆژانەیان بە ١٥٠٠٠٠-٢٠٠٠٠٠ دۆلار دەخەملاند، لە ٣٠ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٦دا کاربەدەستێکی باڵادەستی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا لەواشنتۆن دی سی دەیگەیاندە ٢٥٠٠٠٠ دۆلار.

*"گوێی بۆ ئامۆژگاری کەس رانەدەگرت"، چەلەبی لەگفتوگۆیەکی ٢٧ی ئەیلولی ١٩٩٥دا پێی وتم: "بۆ چەند مانگێك تاڵەبانیم لەوە ووریادەکردەوە کە واز لە سوێن ئاژن و سوکایەتی پێکردنی مەسعود بهێنێت، بەڵام بێسوودبوو. پێیشموت، خۆ ئەگەر ئیشەکەش باش نەهات، ئەوا ئێران تا ئەو کاتەی یەکێتی نیشتمانی تا سەر سنوور راودەنرێت هیچ یارمەتییەکت نادات، هەربۆئەوەی بە تەواوەتی پشتیان پێببەستی.

*"رۆژنامەیەکی پارتی دیموکراتی کوردستان و گفتوگۆکەی بەرزانی و پیلیترۆ" چاوپێکەوتنێکی زێباری. لەندەن. ٢١ی ئەیلولی ١٩٩٦.

*"داوای پشتگیریکردنی لەسوپای عێراق کرد". لەو دەبابەو تانکانەی دژ بە هەولێر بەکارهێنران، وەك دواتر دەرکەوت لە١٢ی ئابەوە شاری تکریتی شوێنی لەدایکبوونی سەدام حسێنیان جێهێشتبوو، وای نیشاندەدا کە کارەکەی هەولێر هەر لەو رۆژانەی تەموزەوە کەئێران هاتبووە عێراقەوە تەواو بیری لێکرابۆوەو پلانی بۆ داڕێژرابوو، وتوێژی جدی لەنێوان بەرزانی و بەغدادا لەمانگی پێشووەوە دەستی پێکردبوو. گفتوگۆیەکی بەتەلەفۆن لەگەڵ چەلەبیدا، لەواشنتۆن دی سی. ١٥ی ئابی ١٩٩٦.

*"بەڵێن و پەیمانەکان نووسراویش بوون". ساڵی ١٩٩٢ واشنتۆن هەوڵی‌دا هەردوو سەرکردەی PDK,PUK قایلبکات بچنە کۆنگرەی نیشتمانی عێراقەوە INC و سکورکوف، لەدوای بیرخستنەوەی ناپاکییەکانی کیسنجەر بە بەرزانی وت: "ئێمە پشتتان بەرنادەین"، هەر بۆ ئەو نیازەش بەیەکەوە بە نووسین هەمان پەیمانی دا. چاوپێکەوتنێکی زنیاری. سەلاحەدین. ٥ی شوباتی ١٩٩٦. "ئەلگۆر" کە کاربەدەستێکی زۆر باڵادەستی ئەمەریکایە، بەئاشکرا داوای لابردنی سەدام حسێن دەکات، "لەپێک"
یش پاراستنی کورد و شیعە دووپات دەکاتەوە. شایەتییەکەی پاول وولفویتز، کەلەبەردەم کۆمیتەی پەیوەندییەکانی بەیاننامەی ئەنجومەنی پیران بۆ کاروباری خۆرهەڵاتی نزیک و کۆمیتەی دەرەمی باشووری ئاسیای ١٩ی ئەیلولی ١٩٩٢ دایان.
*"سکوکروفتی خانەنشینی ئێستا"، بڕوانە رۆژنامەی یونزیکی ٢٣ی ئەیلولی ١٩٩٦.
*"٢٠٠ تۆپ ... هتد". شایەتی "جۆن دۆیچ"ی بەڕێوەبەری CIA بەرامبەر کۆمیتەی تایبەتی هەواڵگران ئەنجومەنی پیران، لە ١٩ ی ئەیلولی ١٩٩٦دا.
*"ڕووداوەکە شەڕێکی ناوخۆیی کوردە"، بڕوانە نووسینەکەی Perry کەلە ٩ی ئەیلولی ١٩٩٦دا International Herald Tibune دا بڵاوکرابۆوە.
*"قسەیەکی بێ بنەما"، چاوپێکەوتنێکی مۆنەیەد یونس، لە ٦ی شوباتی ١٩٩٦دا پێی راگەیاندم کە چەند ساڵێکە بوو ئەمەریکاییەکان بەڵێنی ئەوەیان دابوو کە ئەو کوردانەی کاریان بۆ دەکەن لەکاتی پێویستدا دەربازیان بکەن، کەچی بەڵێنەکەیان نەبردەسەر.
*"لەو ناپاکێتییە دەستیان بەشەرمەزاری نەدەکرد". سامی عەبدولڕەحمان رایگەیاند کە، پارتی دیموکراتی کوردستان ئەوانەی لەناوچەکانی ئەواندا بوون و سەربە کۆنگرەی نیشتمانی عێراقی بوون ڕزگاریکردبوون، بەڵام ئەوانە بەرپرس نەبوون کەلەناوچەکانی تاڵەبانیدا بوون، مەبەست هەولێرو عەینکاوەیە. کۆنگرەیەکی رۆژنامەگەری. سەلاحەدین. ١٢ی ئەیلولی ١٩٩٦.
*"دەرگەی بەرازان"، شایەتی پاول وولفویتز لەبەردەم کۆمیتەی کاروباری دەرەوەی خۆرهەڵاتی نزیک و باشووری ئاسیای ئەنجومەنی پیرانی ١٩ی ئەیلولی ١٩٩٦دا دابویان.
*"ئاشکرایە هەواڵگران..." شایەتی دۆیچ، بەرامبەر کۆمیتەی هەواڵگرانی تایبەتی ئەنجومەنی پیران.
**"ئەگەر بەرپرسیارێتی" بڕوانە: International Herald, Sept. 12,1996
*" "MCC شایانی باسە چەند سەرکردەیەکی باڵادەستی KDP ,PUK جیا بە جیا دووپاتیان دەکردەوە کە MCC گەر لێرەو لەوێ رۆڵێکی هەبوایەو دەرزی هەردووک -بەرزانی و

ئالەبانی- دابدایە، دەیتوانی شەڕەکاولکەرەکە رابگرێ. چەند چاوپێکەوتنێك لە کوردستانی عێراق. شوباتی ١٩٩٦.
*"٧٩٥ ملیۆن دۆلار"، سالّی مالی ١٩٩١، لەمە نزیکەی ٥٨٢ ملیۆنی بەکار هێنراو، سال لەدوای سال کەمتر دەکرایەوە، بۆ سالّی دوالتر گەیشتە ٧١ ملیۆن و دوالتریش لەسالّی ١٩٩٦دا هێنرایە سەر ٢٢،٤ ملیۆن. بڕوانە لاپەڕە راستییەکانی (٩٦/٦٠)ی وەکالەی ولاتە یەکگرتووەکان بۆ پەرەپێدانی جیهانی ٥ی ئەیلولی ١٩٩٦.
*"دامەزراندنی درۆ"، چاوپێکەوتنێکی زنهاری، لەندەن. ٩ی ئەیلولی ١٩٩٦.
*"بەشێوەیەك کە کەس بڕوای پێنەکات پێی لەسەر ئەوە دادەگرت". ئەم قسەیەی "ئانسۆچیلەر" لە The New York Times ی ٢١ی ئەیلولی ١٩٩٦ دا دەرهێنراوە.
*"زۆر سوکایەتییە"، راپۆرتی ڕێکخراوی لێبوردنی نێو دەوڵەتی - (پێشێلکردنی مافی مرۆڤ لە کوردستانی عێراقی دوای سالّی ١٩٩١ەوە).
*"لەسەر کورد قڕان- جینۆسایدی" دوای ووردبوونەوە لەو بەڵگەنامانەی کەلە عێراق گیران و بۆ ولاتە یەکگرتووەکان گوێزرانەوە، رێکخراوی "چاودێری مافی مرۆڤ- هیومان رایتس ووچ" بەو هیوایەی بۆ بەدادگاییدانی عێراق لەبەردەم دادگای دادی نێو دەوڵەتی لاهایدا دەستپێشخەری تۆمەتی جینۆساید خستنەسەر عێراق بێت، پێوەندی بە چەندین حکومەتەوە کرد. بڕوانە بیرەوەرییەکانی -کینێث رۆث-ی بەڕێوەبەری جێبەجێکردن لەڕێکخراوەکەی. ٢٠ی ئەیلولی ١٩٩٤.
*"شەپۆ پێشێلکردنەکانی مافی مرۆڤمان"، چاوپێکەوتنی بەرزانی. سەلاحەدین. ١٣ی شوباتی ١٩٩٦.
*"بەرزانی بەیارمەتی سەدام هەموو کوردستانی هەلّلوشی"، بڕوانە The Daily Telegraphی ١٨ی ئەیلولی ١٩٩٦.
*"ئیگلتون... دیسانەوە دەلێت"، بڕوانە William Eagleton, Jr., The Kurdish Republic of 1946 London. Pp. 131-132.

## (١١)

# ئەوکارەی بەنیوە ناچڵی مایەوە

کەمتر لە ١٨ مانگ بەسەر ڕێپێدانەکەی بەڕێوەبەرایەتی کلنتۆندا ڕەتبوو تا سەدام حسێن بەبێ سزا ئیشی خۆی لەکوردستاندا بکات، پێدەچوو لەساڵی ١٩٩٨ دا سەدام شتی نارەوای دی بۆ وڵاتە یەکگرتووەکان بێنێتەکایەوە. پاش ئیشە چەپەڵەکەی هەولێر، کە کەمو کورتی سیاسەتی بەڕێوەبەرایەتییەکەی کلنتۆنی دەرخست، دەرکەوت واشنتۆن نایەوێت کارێکی سەربازیانەی شیاو بۆ ڕاستکردنەوەی بارەکە بکات، تەنیا سەدام هەر کاتێک پێویستایە شتێکی سەیری دەکرد. ئەوەو سەرجەم کارە ناهەموارەکانی تریش لەکۆتایی پێنەهێنانەکەی بووشەوە بوو، دواتریش کەوتی لە ساڵی ١٩٩١دا ٤٨ سەعات پێش کاتی خۆی شەڕەکەی ڕاگرتو سەدام حسێنی هێشتەوە، دانی بەو هەڵەیەی خۆیدا نا. گیروگرفتە ڕاستەوخۆکە سەرەتای ساڵی ١٩٩٨ بەدیارکەوت کەچاودێریکردنە نازالەکەی چەکی کیمیاوی‌و جۆرە چەکە کۆکوژەکانی دی عێراقی خستەڕوو. لەزۆر شوێنی دونیادا دوور نییە لەسەر ئەوجۆرە شتانە جەنگ هەڵبگیرسێت، بەتایبەتی کەبەڵگە ترسناکەکانی ئەو ئازارو ئەشکەنجەیەی لەئاکامی کیمیابارانەکەی هەڵەبجەدا ڕوویدابوو، پاش ١٠ ساڵ سەبارەت بەزیانی سامناکی "بۆماوە-ڕەوانی" بەکۆمەڵ کۆببووەوە.

لەدوابڕۆژانی هاوینیدا سەدام حسێن کەڵەلاوە ڕێگای بە هەڕەشەکانی لەئاسمانەوە لێدانەکەی ئەمەریکاو بەریتانیا دەدا، خۆی لەچارەسەرە مام ناوەندییەکەی زستانی نەتەوەیەکگرتووەکان دەربازکرد، ڕێی بە چاودێرانی پشکنینی چەکدا کاری خۆیان بکەن. بەڵام زۆری نەخایاند جارێکی دی پێی بەزەوییدا دایەوەو پشکنینەکەی ڕاگرتەوە. ئامانجی ئاشکرای بۆئەوەبوو کەنەهێڵێت سەبارەت بەچەکی کۆکوژی هەمیشە دەنوکیان لەسەری بێت، تەنانەت گەر ئەو لێپرسینەوەیە گەمارۆ ئابوورییەکەی نەتەوەیەکگرتووەکانیشی بگرتایەتەوە کەهەر بەتەنیا زیانی بۆ خەڵکی ئاسایی هەبوو، سەروەرێتی تەواوی عێراقیشی دوادەخست. سەدام دوای دەرکردنی کورد لەیەکتری، واشنتۆن لەئەندامە خۆرئاواییەکانی هاوپەیمانانی ساڵی ١٩٩٠-١٩٩١ی ڕوسیای لێکدابڕیبوو، دۆستە عەرەبەکانیشی کەلەو هەڵوێستەی ئەمەریکا سەبارەت بە

هێشتنەوەی سەدام حسێن، یان نەهێنانە ژێرباری دۆستە ئیسرائیلییە کەللەڕەقەکەی تەواو بێزاربیوون.

گوێ پێنەدانی سەدام بە چارەسەری نەتەوە یەکگرتووەکان و، ئەو قەیرانە سێکسییەی کلنتۆنی تێکەوتبوو، مەرجەکەی چەند مانگێك دوای قەیرانەکە بەڕێوەبەرایەتییەکەی کلنتۆن یەکبینە دەمۆڵی بۆ دەکوتا، کەئەگەر سەدام لەدوا رۆژدا ڕێ لەپشکنینکردن بگرێتەوە ئەوا ئەمریکا مافی خۆیەتی، گەر بەتەنیاشبووە سەربازیانە سزای عێراق بدات؛ بەڵام کلنتۆن بەهۆی قەیرانەکەیەوە لەئاست مەرجەکەیدا تەواو شەرمەزاربیبوو. جا چونکە واشنتۆن پشتگیری دونیای بۆکارە سەربازیانەکەی پێکۆنەکرایەوە تا مل بە سەدام بدات، سەبارەت بەلابردنی سەدام گێڕی گۆڕی. بەڕێوەبەرایەتی ئەمریکا لەوەدا گیرا کە زۆری بۆ پشکنەرەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان دەهێنا خۆ لەسەردانی شوێنە بەگومانەکانی عێراق و سەردانە کوتوپڕەکانیان دووربخەنەوە. واشنتۆن ترسی لەوە بوو بەقسە زلەکانی خۆیەوە بێت، کە گوایە زیاتر چارەسەری سەربازیانەی هەیە و بەڵێنبوو گەر هەر بەڵگەیەکی بەرنامەی چەکی قەدەغە بەردەستبکەوێت ئەوا سزای بدات. چین و فەڕەنسا و ڕوسیا کەلەسەرەتای ئەو ساڵەدا بۆ بەرگریکردن لەسەدام یەکیانگرتبوو، کەللەڕەقی و پێداگرتنەکەی سەدام، با بۆ ماوەیەکی کەمیش بووبێت لەئەنجومەنی ئاسایشدا بێدەنگی کردن و، لەئاست ڕاگرتنی واشنتۆنیشدا سەبارەت بەلابردنی گەمارۆکە دەستەپاچەبوون.

کەقەیرانەکەی ساڵی ١٩٩٨ جارێکی دی کەم بڕوایی بەسیاسیەتی گرتنەوە دووفاقییەکەی واشنتۆن، سەبارەت بەدوورگری هەردوو دەوڵەتە بەدفەرمەکەی عێراق و ئێران هێنایە ئاراوە، بڵێی هیچ بەڵگەیەکی پێویست ئاشکرا کرابێت؟ بۆ یەکلاکردنەوەی زیاتری دەستەپاچەییەکەی ئەمریکا ئەوەبوو کەڕووسەکان لەشەستەکاندا هیچ کاتێکیان لەپەیداکردنەوەی پێوەندی ڕاستەوخۆی کوردی باکووری عێراقەوە بەفیڕۆ نەدا. هەڵبژاردنەکەی ساڵی ١٩٩٧ی محەممەد خاتەمی سەرۆکی ئێران و هەوڵی ژیرانەی بۆ نەهێشتنی تەریکبوونی بەووڵاتانی عەرەبەوە، کەماوەیەکی زۆربوو لێیان دابڕابوو و بەکێشکردنی ئەمریکا بۆ دانوستان، گرتنەوە دووفاقییەکەی پەکخست. (ئەو حوکمەی لەساڵی ١٩٩٧دا دادگایەکی ئەڵمانیا دابووی و تیایدا پەنجەی بۆ سەرۆکی پێش خاتەمی ڕاکێشابوو کەبەهاوکاری چەند باڵادەستێکی تری ئێرانی و بەفەرمانی ئەوان، لەچێشتخانەیەکی بەرلیندا چەند سەرکردەیەکی کوردی ئێران خافڵگیرکران و، بووەهۆی ناکۆکییەکی خراپ لەگەڵ ئەورووپای یەکگرتوودا، کەچی لەماوەی ساڵێکدا باڵیۆزە ئەورووپاییە کێشراوەکان گێڕرانەوە بۆ تاران.) پاش بەخۆداچوونەوەیەکی کلنتۆن، خۆی لەساڵی ١٩٩٨دا هەوڵی چاککردنەوەی پێوەندی لەگەڵ ئێراندا دا.

سەرکردە کوردە دژ بەیەکەکانی عێراق، کەماوەیەك پێشتر میواندارێتی ئەو بەرهەڵستکارە عێراقیانەیان کردبوو کەوڵاتە یەکگرتووەکان وەك لایەنێکی گرنگ بەپارە پشتیوانی دەکردن، بەڵام کەلەزستانی ساڵی ١٩٩٨دا بیر لەدارشتنی ئەرکە دیپلۆماتییەکانی ئەمەریکاو خڕکردنەوە سەربازییەکەی ناوچەی کەنداوی دەکرایەوە، ئەوانە ئەو بایەخەیان نەبوو. نەبوونیان بروایەکی وایان لای بەرزانی هێنابووە ئاراوە کە واشنتۆن هیچ کاتێك بەڕاستی بیری لەلابردنی سەدام حسێن نەکردبێتەوە جێی سەرسوڕمانەکە ئەو شێوەی سیاسەتەی واشنتۆن کەوتە بەر رەخنەی زۆری کۆمارییەکانەوە، بەتایبەتی کاربەدەستەکانی بەڕێوەبەرایەتی بووشەوە، کەپێشەکی خۆیان بەرامبەر ئەو ستراتیژە پڕ سەر ئێشەیە بەرپرسیارن. جا چونکە ئێستا شەرمەزاربوون کەوتبوونە ئەوەی لەناو کۆنگرێسدا، بۆ ئەو مەبەستە ١٠ ملیۆن دۆلار کۆبکەنەوە.)

بەڕێوەبەرایەتی ئەمەریکا بۆ ئەهێشتنی رەخنەکانی ساڵی هەڵبژاردن، لەمانگی ئەیلولدا بانگهێشتی بەرزانی و تاڵەبانی بۆ واشنتۆن کرد تا رێکیانبخاتەوەو لەمێزەکانی بەدریش وریایان بکاتەوە، کەلەکۆنە دیلەکانی جەنگ پێکهێنرابوو بنکەشیان لەو ئێراندابوو. لەم سەردانەیاندا، کەمەر دووبارەکردنەوەیەکی سەردانەکەی پێشووی ساڵی ١٩٩٢یانبوو زیاتریش واشنتۆنی دڵخۆشدەکرد، هیچ کام لەدوو سەرلەشکرەکە باوەڕی بەوەی تریان نەبوو، دیارە ئەوەش لەدوژمنایەتییە کۆنەکەیانەوە هاتبوو، هەردوولاشیان هیچ بڕوایەکیان بەبەڕێوەبەرایەتییەکەی کلنتۆن نەبوو کە هیچ شتێکی لەبارەی هەردوولاوە لاشاراوە نەبوو.

هەردوو سەرکردەکەو بەڕێوەبەرایەتی ئەمەریکاش مەترسییەکی هاوبەشیان لەجۆری تۆڵە سەندنەوە بەسوێنکەی سەدام هەبوو. سەرکردەکانی کورد راهاتبوون کەحساب بۆ تاڵەبارێتی زەمانەتی ئەمەریکا بکەن، بەڵام دەشیانزانی هەمووی هەر ڕواڵەتە، وەك بەرزانیش روونیکردبۆوە، خۆ لەسەدام نزیککردنەوە چەند شەرمیش بێت هەرلە ئارادایە. لاوازی سەرکردە کوردەکان، کەبەشی زۆری لەدوژمنایەتییە بەردەوامەکەی نێوان خۆیانەوەبوو، لەباکووری عێراقیشدا کاریگەرێتی بەغدا بەجۆرێکبوو کەناڕەزایی لێیان ئەمەریکا ناچاربێت بۆسەردانێکی دی واشنتۆن بانگهێشتیان بکات.

بەرزانی و تاڵەبانی چونکە بەنیاز نەبوون ناکۆکییەکانیان بەلاوەنێن، لەساڵی ١٩٩٧دا دەستیان بەشەڕ کردەوەو بەوەش خۆیان لەباوەشی وڵاتی دراوسێیان نا کە هیچیشیان چارەیانیان نەدەویست. تورکیا بۆ شەڕە درێژخایەنەکەی دژیە "پەکەکە" هانی دان و، وەك پیشەی خۆی سوپاکەی بۆ قوڵایی کوردستانی عێراق ناردەوە. وڵاتە یەکگرتووەکانیش کەلەوشتانەدا خۆی دەکاتە "کەڕەی شەربەت"، بەڕواڵەت بۆئەو خوتەیەکی لەوبارەیەوە

دەردەبڕی و بێزاری دەربڕینەکەی ئەورووپای خۆرئاواش تۆزێك لەوزیاتر بوو. هێزەکانی تورکیا ساڵی ١٩٨٨ لەشکرێکی قورسی دژ بەتاڵەبانی و "پەکەکە"ی دۆستیدا، بەجۆرێکی جیا لەپارەمەتییەکەی ١٩٩٦ی عێراق هاریکاری بەرزانی گەمارۆدراوی کرد. نزیکەی ١٠٠٠ کوردێك بەتۆپ و بۆردومانی تورکیا کوژران و زۆربەشیان سەر بەتاڵەبانی بوون و ١٠ - ١٢ کەس زیاتریشیان سەرکردەو باڵادەستبوون. راپۆرتەکان دەڵێن تاڵەبانی خۆی لەگێژاوی ئەو هاوپەیمانێتییەی "پەکەکە" دەربازکرد.

ئوچلان، لەعێراق و تورکیاشدا زیانێکی سەربازیانەی کوشندەی وای لێکەوت کەبەدرێژایی مێژووی شۆڕشی ئاپی ١٩٨٤ تووشی شکستی وا نەهاتبوو، بەڵام بەوەدا کە شۆڕشی چەکدارانەی "پەکەکە" خۆگرترین شۆڕشی سەردەمبوو و پێشی نابووە پانزەیەمین ساڵیەوە، دەیزانی تەنانەت کەمالیستە توندڕەوەکانیش وەك گەلێکی تری ناو تورکیا دان بەکێشەی کورددا دەنێن و بەگرفتێکی بێ چارەی دادەنێن. تورکیا کەلەبناغەوە بەدەست جووتە گرفتی ئیسلامی و کوردە ووشیارەکانەوە -کەهەندێ جار پێوەندی لەنێوانیشیاندا هەبوو- شەکەتببوو. واش ئەو زیانانەی کەلەپەکەکە کەوتن هێندە سەختبوون کەلەمارتی ١٩٩٨دا دوو سەرکردەی باڵادەستی ناو تورکیای چوونە پاڵ بەرزانی و دەنگی ناڕەزاییان لەئاست ئوچەلاندا لێبەرزبۆوە، بەوەی کەلەدوورەوە سەرکردایەتی دەکات.

مانگێك دواتر یەکێکیان، سەمەدین ساکیك- کەزیاتر بە "زەکییە کۆل" ناسرابوو، چونکە لەبەسەرهاتێکی تەقینەوەی گوللە تۆپێکدا پەنجەیەکی قرتابوو، کۆماندۆی تورکیا لەنزیك دهۆکەوە گرتیان، پێدەچوو بەبێ ئاگاداری حکومەتی ئەنقەرەو کاربەدەستانی بەرزانیش بووبێت و، هەرچۆنی کردبێتی- چەند رەخنەگرێك زۆر بەپەرۆشەوە- بۆچوونەکانی سوپای تورکیایان پەکلادەکردەوە بەوەی، کە ناکۆکی ناو پەکەکە بەهۆی قاچاخچێتی "موخەدەرات"و توندی پێوەندییان بەسوپای سوریاوە، پەرو لەزیادبوونە.

ژەنەراڵە تورکەکان کەلە ساڵی ١٩٩١ەوە زیاتر لەپەنجا کەڕەت چووبوونەناو عێراقەوە، وا لەخۆیان پشت ئەستوور بوون کەباری نائاسایی لەسەر ٧ پارێزگای تورکیا لابەرن، بەڵام هەر بۆ دەمکوتکردنی ئەو دەنگانەی کەداوای چارەسەرێکی سیاسیانەیان بۆ کێشە پڕ لەئازارو ئەشکەنجەکەی کورد دەکرد، بارە نائاساییەکەیان لەسەر ٦ پارێزگا هێشتبۆوە. ژەنەراڵەکان ئەو بەناو دانپیانانەی زەکییە کۆلیان بڵاودەکردەوە تا رەخنەگرە بێلایەنەکانی وەك "محەممەد عەلی بیراند"و "جەنگیز شاندەر" بێدەنگ بکەن. ئوچلان کەزیاتر باسی لەوەدەکرد بەنیازە داوای سەربەخۆییەتییەکەی بەرامبەر بە چەند مافێکی سیاسیانەو کلتوری- نیوەناچڵ پێناسەکراو- بۆ ئاگربەست بەلاوە نێت، ژەنەراڵەکانیش وەك لێیان چاوەڕواندەکرا هیچ گوێیان پێنەدەدا.

سەددام لە کوردستانی عێراقدا ئەوەندەی هەبوو کەتاڵەبانی وا لێبکات دەست لە خۆباییەتییەکەی خۆی هەڵبگرێت و ڕێگاکەی بەرزانی بگرێت، سەرەتای ١٩٩٨ نێردراوی خۆی بۆ بەغدا نارد تا لەبەغدا بەجۆرێکی وا ڕسوایان بکەن کە عەلی کیمیاوی پێشوازیان لێبکات، ئەوەش ووریاکردنەوەیەکی تری سەددام حسێنە بۆ کوردەکان کە باشتر وایە وازلەپشێوی نانەوە بێنن.

بەڵام تەنیا ئاژاوەی کورد لەئەورووپادا، کەلەنێوان جەژنەکانی لەدایکبوون و سەری ساڵی ١٩٩٨دا ڕوویدا، کاتێک ئەو ٢٠٠٠ کوردە هەژارەی بەسەر دوو پاپۆڕی ژەنگاوییەوە، کەقاچاخچی لەتورکیاوە بۆی بەکرێگرتبوون گەیشتنە ئیتالیا. چەند مانگێک بوو ئاوەناوە کۆچی کەم کەم بەرەو ئیتالیا هەبوو، کەوەک وێستگەیەکی سەر ڕێگایان لێکردبوو تا کە گەیشتن خزمانیان لەئەڵمانیاو زەوییە نەوییەکانەوە (هۆڵنداو بەلچیکاو لۆکسەمبورگ) بەکێشیان بکەن. بەڵام بەم ژمارە زۆرەو بەپاپۆڕی وا کەزیاد لەتوانای خۆیی لەسەر بارکرابێت، سەرنج و سۆزو قایلێتی کاربەدەستانی ئیتالیای ڕاکێشا. زۆربەی ئەمانە کوردی عێراق و هەندێکیشیان کوردی ئێرانبوون کەلە دەست ڕژێمەکەیان هەڵاتبوون و عێراقیش حەزی پێنەدەکردن، لەدواڕۆژی خۆیان و وڵاتە پەرتپەرتەکەی نێوان سەرکردە ناکۆکەکانی خۆیان، هیوا بڕاوبوون. کوردەکان بۆ پەیداکردنی بەڵگەنامەی تەولو و چاوپۆشیکردنی پۆلیس لەچوونەناو دەرچوونی تورکیایاندا، کەتانەمات پیستر دەبوو، ئەوەندەیان پارەدابوو بەتەواوەتی شەکەتببوون، ڕێندانەکەی دەوڵەتی تورکیاش بۆ ئاسانکردنی دەربازبوونی پەنابەرەکان، بە شێوەیەک تۆڵە سەندنەوەیەکی باشبوو لەکوردەکان، چونکە ئەم پەنابەرانە گەر بۆماوەیەکیش بێت هەندێ گرفتیان بۆ ئەنقەرە پەیداکردبوو، هانی لەنوێ دەنگ بەرزکردنەوەی چارەسەرێکی دادوەرانەی کێشەی کوردیدا، بەڵام بەگوشاری ئەڵمانیا ئیتالیاش زیاتر پێی لەسەر یاسا پەنابەرییەکانی خۆی داگرت.

# (١٢)[٦٩]

# سەدەی بیستو یەکەمو کێشە ئاڵۆزەکەی کورد

بەسەرکەوتنی سەدەی بیستو یەکەم، کورد نە ئەوەندەی هەبوو ئاهەنگی بۆ سازبکات نەشتێکی چەسپاوی واشیان دەستکەوتبوو کەچاوەڕوانی دواڕۆژێکی دڵخۆشکەرەی نزیکی لێوەبکرێت. بارودۆخێکی نالەبار بۆکوردی ئێرانو عێراقو سوریا لەئارادابوو، تەنیا لەتورکیادا نەبێت کەمێوەی هەموو کوردی تیادا دەژیو تاکە وڵاتە لەخانەخوێنکانی کورددا بەپواڵەت دیموکراتی بێت، حکومەتەکەی بەفڕاندنە سەرسوڕهێنەرەکەی عەبدوڵلا ئوچەلانی سەرۆکی PKK ی شوباتی ساڵی ١٩٩٩ بزووتنەوەکەیانی زیاتر خستەڕوو. ئەو زانیارییە کەمەی سەبارەت بەجۆری هەڵسوڕاندنی دادگاییکردنەکەیو ئەو هەلومەرجە سیاسییە تەمومژاوییانەی بەدوایدا هاتن، بەهیچ شێوەیەکو بەڕوونیو بەوردیش ئەوە پەنجەیان بۆئەو زۆروستەمە رانەکێشا کەلەوماوە دوورودرێژەدا دەرهەق بەکورد کرابوو.

لەئێراندا، هەرچەندە محەممەد خاتەمی لەهەڵبژاردنەکەی ساڵی ١٩٩٧ی سەرۆکایەتی حکومەتدا، لایەنگرەکانیشی لەهەڵبژاردنەکەی ئەنجومەنی یاسادانانی ساڵی ٢٠٠٠دا سەرکەوتنێکی گەورەیان بەدەستهێنا، بەڵام دەستڕۆیشتوانی پارێزگارخوازانی کۆماری ئیسلامی بەڵێنی چاکسازییەکان هەر بەکۆتکراوی هێشتەوە، گرنگ ئەوەیە نەشیان توانی زەمینە بۆ بەخشینی مافەکانی کورد خۆشبکەن، هەروەک تەنانەت نەشیانتوانی ئەوکارانەش بیەنەسەر کەلەقووڵایی ناخیاندا جێگیربوو[٧٠].

---

[٦٩] نووسەر لەحوزەیرانی ٢٠٠٠دا، ئەم بەشەی سەبارەت بەبەسەرهاتەکانی کوردی ئەم دواییە بۆ ئەم چاپە کوردییە نووسیوەو لەهیچ کام لەدوو چاپە ئینگلیزییەکاندا نییە. (وەرگێڕ)

[٧٠] لەناو ئێراندا کوردە نەتەوەییەکانو داواکارییان بۆ خودموختاری بەردەوام لەبیرکرابوون. زمانی کوردیش لەخوێندنی سەرەتاییو ناوەندیدا بەقەدەغەکراوی مابۆوە. بەڵام هەرچۆنێك بێت کۆماری ئیسلامی رێگەی داوە کتێبە بەبایەخەکان بەزمانی کوردی بنووسرێنو لەڕۆژنامەو رادیۆو تەلەفزیۆنیشدا کوردی بەکاربهێنرێت. لەساڵی ٢٠٠٠یشدا لە زانکۆی کوردستانی شاری سنەدا، کە زانکۆیەکی دەوڵەتییە، بەشی زمانو ئەدەبیاتی کوردی بکرێتەوە، کە ١٤٠٠ قوتابی تیایدا دەخوێنن. بۆ یەکەمجار لەمێژووی هاوچەرخی ئێرانی ژێر دەسەڵاتی

لەسووریادا دوای نەخۆشییەکی درێژخایەن و ٣٠ ساڵ دەسەڵاتی رەها، لە حوزەیرانی ٢٠٠٠دا حافز ئەسەد سەری نایەوەو رژێمەکەی بۆ کوڕە بێ ئەزموونەکەی بەجێهێشت، تا رووبەڕووی چەند شتێك ببێتەوە کەلەکێشەی کورد بەبایەختترن، بە تایبەتی کە سووریای کلیلی گوشاری سەر دەوڵەتی جووە. سەرۆکی کۆن، بەهۆی ئەو هەوڵ و تەقەلایانەی دەیدا تا کوڕەکەی جێگای بگرێتەوەو دوای چەند مانگێك پێشخولاردنەوە بەوەو بەو هەوڵە سەرنەکەوتوانەی لەدانوستانی گێڕانەوەی بەرزاییەکانی گۆلانەوە لەئیسرائیل چەشتی، کەئیسرائیل ناچاربوو لەو "ناوچە ئارامە"ی کەیەکلایەنە لەباشووری لوبناندا دروستیکردبوو، دیمەنی زەبوونی کشانەوە بێ سەروبەرەکەی خۆی ببینێت. هەرەسهێنانی بیانووەکانی ئیسرائیل کەمبوون و ئاشکرایە بەرامبەر سووربوونی چەکدارەکانی حیزبوڵا لەمانگی مایسی ٢٠٠٠دا دەرگای بۆ چاوپیاخشاندنەوەیەکی پچووك کردەوە، کەلەکشانەوە ڕسواکەی پێش چارەکە سەدەیەکی ئەمەریکای ڤێتنام دەچوو. دیارە دەشێ ئەنجامەت زلهێزێکی وەك ئیسرائیلی ناوچەکە، بەچەکدارانێکی وا ببەزێنرێت کە تەنیا چەکی سووکیان هەبێت (جا با لەدەرەوەش پشتگیری بکرێن) ئەمەش گۆڕانکارییە لەڕوودلوەکاندار، دەبێت کوردو خەڵکی تریش، لە هەر شوێنێك بن، لەکاتی ووردبوونەوەو چاوخشاندنەوە بەهۆی سەرنەکەوتنەکانی پێشوویاندا، پشتی پێببەستن[21].

---

ئایەتوڵادا هەڵبژاردن لەگوندو شارەوانییەکانی کوردستاندا هەروەك لەسەرتاسەری ئێراندا کرا (بەڵام ڕێی خۆپاڵاوتن بەکوردە نەتەوەییەکان نەدرا)، کاربەدەستە ئاینییەکانیش چوونەوەسەر پیشەکەی شاهەنشاو کوردە ناودارەکانیان وەك بەرپرسیاری خوارتر لە کوردستاندا دادەنا.

([21]) کوردی سووریا کەلەشەستەکانەوە لەژێر دەسەڵاتی بەعسدان، چارووبار سزا دراون و بۆ هەندێ مەبەستیش بەکارهێنراون و تەنانەت چەند جارێکیش خەڵاتکراون. هەندێ جار موڵکداریتی زەوی و زاریشیان لێ سەندراوەتەوەو چەند جارێکیش تەنانەت لەهاوڵاتیتی بێبەریکراون، بەتایبەتی لەناوچەی جزیرەی نزیك سنوورەکانی عێراق و تورکیای بەشەرت دەوڵەمەند. سەرەتا لەشەستەکاندا هاوڵاتییی لە ١٢٠٠٠٠ کورد سەندراوەتەوە (لەم رۆژانەدا ژمارەیان بەنزیکەی ٢٥٠٠٠٠ دادەنرێت، کە ژمارەی کورد لەسووریاد بەملیۆن و نیوێك خەملێنراوە)ئەم کارە فاشیستیانە زەقە بێبەریکردنە بە پلانێکی واکراوە کە کورد لەناوچەکەدا نەبێتە زۆرینە. وەلێ حوکمی حافز ئەسەدی کەمایەتی عەلەوییەکان، بۆ سەرکوتکردنە درندانەکەی "اخوان المسلمین"ە بەناوبانگەکانی سنی، کەسەرەتای هەشتاکان بەچەك هەڕەشەیان لەڕژێم دەکرد، داوای یارمەتی لەکورد کرد لەساڵی ١٩٩٠دا کورد بەدڵنانی سێ نوێنەریان لەپەرلەماندا خەڵاتکران. ئەسەد کوردی سووریاشی لەدژی تورکیا بەکاردەهێنا. ڕێگاشی بە PKK دا کە بەشەرلوەتی سووریا بەکاربهێنێت و دەشتی بقاعی لبنانیشی بەرەو پرووکردنەوەو وەك شوێنێکی ئارام بۆی دیاریکردن، ئەویش لەکاتێکدابوو کەهەموو پارتێکی سیاسی کوردی لە سووریادا بەڕەسمی قەدەغەکرابوو، بۆ ئەهێشتنی هەستی نەتەوەیی کورد لەسووریادا هانی کوردەکانی خۆی دەدا

لەعێراقدا ئەو سیاسەتەی بەڕێوەبەرایەتییەکەی کلنتۆن لەسەری دەڕوات، خۆی بییەوێت یان نا، هەمیشە بەباشە بۆ سەدام حسێن گەڕاوەتەوە، ڕێگاشی بۆ بەرزانی و تاڵەبانی خۆشکردووە کە لەسەر شتەکانی نێوانیان دژایەتی یەکتریکەن و پێوەندیشیان بە بەغداوە باشبێت، ئەوەش لەکاتێکدایە کە خۆیان لەژێر ئاسمانپارێزییەکەی ئەمەریکادا حەشاردراوە، هەردوولاش لەبەشە پەرتکراوەکەی خۆیاندا دڵنیا دەکات، بەرزانی و تاڵەبانی ملیان بۆئەو سیاسەتە داوە کەئەمەریکا لەساڵی ١٩٩٨دا ڕێگاو شوێنی بۆ دیاریکردبوو، ئەویش هەر بەوەندەی دەستبەرداری شەڕە خۆکوژییەکەیان بن، بەڵام لەسەر دابەشکردنی داهات (کە سەرچاوە سەرەکییەکەی ئابلوقە سەرنەکەوتووەکەی نەتەوە یەکگرتووەکانە) هەر ئەویش لەسەرەتاوە هاندەرێکی شەڕەکەی پێشوویان بوو، ڕێک نەکەوتوون. واش بەپێچەوانەی ئەو ناڕەوایی و بێتوانایییەی کە لەدابەشکردنی "نەوت لەپێناو خۆراک"دا هەیە کەبەهاوبەشی لەگەڵ حکومەتی بەغدای عێراقی دەست بەسەردا بەڕێوەدەچێت، نەتەوە یەکگرتووەکان لەکوردستاندا، بەبێ هیچ گێچەڵێک سەدان ملیۆن دۆلار خەرجدەکەن.

ئەو پارەیەی کەژیانی بۆ سەدان گوندو قوتابخانەو ئەرکە تەندروستییەکان دابینکردەوە، کەمەر هەمووی لەنوێوە دەستی پێکرایەوە، کاتێک کە ئابلوقەی نەتەوە یەکگرتووەکان، ڕێگا نەدانی هێنانی پارچەی سپێرو ماشێنی دیش بۆ ئەو چەند کارگە کوردیانەی هەن کەمێک کەمبکرێتەوە باشتریش دەبێت، تەنانەت بۆ ئەو ئامێرە نەوت پاڵێوە سەرەتاییانەش کەهەیانە. ئەوەتەی کوردی عێراق هەن یەکەمینجارە سەرپەرشتی نەوتی خۆیان بکەن. بەڵام ئەم بەڕواڵەت دەست بەسەرداگرتنەی "حکومەتە زۆر بەژێرە دروستبووەکەی" کورد، دوای ١٠ ساڵێک بەسەر دروستبوونە چاوەڕواننەکراوەکەیدا دواڕۆژە دیارەکەی خۆیی پێ ناشاردرێتەوە. عێراق و دراوسێکانیشی پێکەوە، بەهیچ جۆرێک سووربوونی خۆیان لەهەڵکەوتنی یەکەمین دەرفەت بۆ کۆتاییهێنانی ئەم ئەزموونەی کورد ناشارنەوە. کورد لەعێراقدا ئەوەندەی بەرەنگاری "هاتنە کایەی" ڕژێمێکی تری عەرەبی سنی وا دەکات کەپێ لەسەر یەکبوونی عێراق دابگرێت، ئەوەندە

---

کەبچنە ڕیزی PKKەو بچنە ڕیزی PKKەو کوردی سووریای هەردووک کەی کردە بارمتەی خۆی، کەئەوەش چارەنووسێك بوو لوبنانی و فەلەستینییەکانیش بەشی خۆیانیان تیادا هەبوو PKKەو ئەسایەتییە کوردەکانی سووریاش، لەوناکۆکییەی لەسەر سوود وەرگرتنی تورکیا بەتەنیا لە ئاوی فورات بۆ گوش[illegible]ستنە سەر ئەنقەرە بەکارهێنرابوون. ئەم پێوەندییە وەك زەمانەتێك بوو بەڵام کە PKK چیتر نەیدەتوانی خزمەتی [illegible]ەکانی ئەسەد بکات سووریا دەستبەرداری ئۆچلان بوو. دوای مردنی ئەسەدیش هێشتا زۆر زووە بۆئەوەی کە یەکسەر بڵێین داخۆ کورد لەژێر سایەی دەسەڵاتی بەشار ئەسەددا، یان دەسەڵاتێکی سنی وادا کە ئەگەر ڕۆژێکی وابێتە پێشەوە کاربگرنەدەست، باریان باشتردەبێت

بەرەنگاری سەدام حسێن و خێزانە دڵڕەق و دەست پیسەکەی نابێتەوە. داخۆ ئەگەر بارودۆخێکی وا بێتە پێشەوە، ئەوساش فڕۆکە جەنگییەکانی ئەمریکا پارێزگاری کوردی عێراق دەکەن؟

بەهەرحاڵ، چونکە سوپای تورکیا، کەنیمچە جێگرەوەی دیموکراسی بوو لە رابردوودا، ئەو دیموکراسییەی شوێن هیوایەکی گەورەی گۆڕانکاریی بوو، جا ڕوولە باشتربوونبێت یان خراپتر. وەک ساڵانی ئەوەت دەریانخست تورکیا بەدەست گەندەڵییەکی تازەو بەڕێوەبەرایەتییەکی بێتواناو پەرلەمانێکی نەچەسپاوەوە دەیناڵاند، لەسەرو هەمووشییەوە هەروەک کاردانەوەیەکی ئەو لایەنە خراپانە، شەپۆلێکی خەباتی ئیسلامیانەی تیادا هاتۆتەکایەوە، کەبۆدەست تێوەردان لەلایەن میری، بەرەو یەکرتنەوە لەکاری چەکداری دەچێت - با تاڕادەیەکیش شاراوە بێت-، ساڵی ۱۹۹۷ کەمالیزمە توندڕەوەکانی ناو هێزە سوپاییەکانی تورکیا، نەجمەدین ئەربەکانی سەرۆک وەزیرانی تورکیایان دوورخستەوەو ساڵێک دوای ئەوەش حیزبی ڕەفاهەکەیان داخست. زۆر لەم جۆرە کارانە کەلەڕووی یاساییەوە ناڕەوان، راستەوخۆ بەو لاوازییەوە بەسترابوون کە ئەو شەڕە بێهێزەی کورد لەساڵی ۱۹۸٤ەوە دەستپێیکرد بوو، هێنابوویە ئاراوە. لەسەرو هەمووشییەوە بەهۆی ئەو پێشێلکردنانەی ماڤ مرۆڤەوە بوو کەلەهەموو دونیادا دەنگی دابۆوەو کوشتنی نادیاری هەزاران کەس و پاکتاوکردنی نەژادی بەکۆمەڵ، کەتا ساڵی ۱۹۹٦ سوپای تورکیاو جەندرمەکانی و هەزاران جاشی کورد بەناوی پاسەوانی گوندەوە، دژ بە پارتیزانەکان کردیان و هێزی PKK یان لەگۆڕەپانی جەنگدا دەرپەڕاند.

کاتێک پارتیزانەکانی PKK لەناو تورکیادا رۆژبەڕۆژ زیاتر بەرەو تەریکی دەچوون ئیتر حکومەتی ڕێ ئەستوور کەوتە خولیای کوشتنی ئوچلان خۆی، سەرەتای ئەوەش بە تەقینەوەیەک دەستیپێکرد کەلەبەردەم خانووە "پارێزراوەکەی" شامیدا ڕوویدا، لە ئاشکرابوونی ڕسواییە بێتامەکەی "سوسورلوک"وە پەردە لەڕووی هەوڵەکانی تری تورکیا بۆلەناوبردنی ئۆچلان لادرا. لەناوەڕاستی مانگی ئەیلولی ۱۹۹۸دا ژەنەڕاڵ "ئەتیلا ئاتس"ی سەرکردەی هێزە زەمینییەکانی تورکیا، کاتێک مناوەراتی سەربازیانەی لەنزیک سنووری سووریاوە دەکرد، ووریاکردنەوەیەکی راگەیاند بەوەی کەخەریکە ئەنقەرە ئارامی لەدەستی دەستیکردنە هەمیشەییەکەی حافز ئەسەد نامێنێت و رەنگە "تۆڵەی خۆی لەسوریا بکاتەوە". ئیتر بەدوای ئەوەدا رۆژنامە نووسە نەتەوەپەرستە توندڕەوەکانی تورکیا نامەکەیان بۆ شام بەوە بەهێزتر دەکرد کە (ئەگەر ئیلکردن و بەدەستەوەدانی ئوچلان لەڕووی سیاسییەوە زەحمەت بێ) دەریبکە، یان ئەوەتا سەرکێشی بەداگیرکردنی وڵاتەکەتەوە بکە. دوای چەندین ساڵ رێگە بەچالاکی PKK و پەیماندان بەدەستڕۆیشتنێتی، لەپڕا ئەسەد ملی دلو ئوچلان بەبێدەنگ دوورخرایەوە.

زەبرەکەی ئۆجەلان درا سوکایەتی پێکردن بوو پسوایی گەورەتریشی لەدووهات. دوای سەرهەڵگرتنێکی ١٥٢ ڕۆژانەی سەیرو سەمەرە، کەتیایدا بۆ شوێنێکی تر دەگەڕا ئارامی تیا بگرێت، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ داماوتر دەبوو، ئۆجەلان چەند وڵاتێکی کرد، لە ڕوسیاوە (کەسەرۆک بۆریس یەڵسن گوێی بەداواکارییەکەی دۆمای ڕوسیا نەدا تا وەك پەنابەر وەری بگرێت) بۆ ئیتالیاو پاشان گەڕانەوە بۆ ڕوسیاو ئەمجا هەوڵێکی سەرنەکەوتووی نیشتنەوە لەهۆڵەنداو پاشتریش بۆ یۆنان و لەئەنجامدا بۆ نایرۆبی، کە لەوێوە لە ٤ی شوباتی ١٩٩٤دا لەلایەن دەستەیەك خەڵك فڕێنی خوێڕی تورکیاوە، بەیاریدەی ئەمریکا گیراو دەرمانخواردکراو دەمی بەستراو وەك قومات پەلبەستکراو فیلمیشی گیراو بەفڕۆکە بەرەو تورکیا کرایەوەو لەوێش لەزیندانێکی پێ پەنجەرەدا لە جزیرەی ئامێرلی نزیك ئەستەنبوڵ بەندکرا. ئەو فیلمەی کە ڕۆژانە بەردوا لە تەلەفزیۆنی تورکیاوە نیشاندەدرا ئاژاوەیەکی لەخۆبایی دایە ئاراوەو هەستێکی خۆ بەزلزانی نەتەوەییە تورکەکانیشی دەربڕی، لەئاستی ئەوەشدا کوردەکان لەخۆوە، لەناو تورکیاو ئەورووپای خۆرئاواو خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا نزیکەی ٢٠٠ شتیانکرد کەهەندێکیان مردنی لێکەوتەوە.

داخۆ ڕاستی بڕیارە کوتوپڕەکەی ئەسەد بەدەستبەردان لەو میوانە ماندووەی ماوەیەك لای مایەوە چی بووبێت، ئەو ڕاستییە هەر بەنادیاری دەمێنێتەوە. بە هەمەجۆر شێوە حساب بۆ چەندین فاکتەر کراو، ئەم فاکتەرانەش لەو هەڕەشە شاردراوەیەوە دەستپێدەکات کە "بەرەی دووەمی" هاوپەیمانێتییەکەی تورکیاو ئیسرائیل هێنایە کایەوە تا دەگاتە نوێبوونەوەی گوشاری ئەمریکاو سەردانە یەك لەدوا یەکەکانی حوسنی موبارەکی سەرۆکی میسر بۆ شام و بەردەوامی بایەخە ڕوو لەزیادییەکەی کەوای دادەنا مەترسی پەرەسەندنی موسڵمانە رادیکالییەکانی ناو تورکیا هەیە. لەلایەکی تریشەوە بەشار ئەسەد بەردەوام دەیویست پەروباڵی جەمیلی مامی، کەئۆجەلانی لەناوچەکەدا دەپاراست، بکات. لەشامیشدا نرخدان بە PKK ە ساردبیۆوە، چونکە لاوازبوونەکەی ڕۆڵی پەرە بەهێزەکەی دەست سوریای نەهێشتبوو. لەسەرو هەمووشییەوە گەورەترین هۆی سەرسووڕمان لەهەموو دونیادا ئەو ١٠ مانگ خۆلکاندنەی ئۆجەلان بوو بەئیتالیاوە.

ئەو شارەزاو پسپۆڕانەی بەدووی کارەکانی ئۆجەلانەوە دەچوون لە مێژبوو بۆیان دەرکەوتبوو کەئەو هەرگیز ناچێتە ژێر ئەو بارەی لەبڕیزی پێشەوەی شەڕدا سەرکردایەتی بکات، دەشیانزانی کە ساڵ بەساڵ داواکارییەکانی ڕۆدەچن، لەسەربەخۆیی و فیدراڵییەت و تەنانەت بەئۆتۆنۆمیشەوە ئەوەستا هاتە سەر تەنیا ماڵ کلتوری و بەکارهێنانی زمانی کوردی، بەکۆتاییهاتنی جەنگی ساردیش دەستبەرداری مارکسیزم بوو. هەرچەندە ئۆجەلان چەندین ساڵ

کەسایەتی کۆمەڵەکەیی پەرەپێدا، بەڵام ئەوەش پێش دەرکردنەکەی سووریای وانەمابوو. دیاریشبوو کەهیچ سوودێکی لەو بەئاسانیوبێ تەگەرەییەی دەنگ بە خۆرئاوا گەیشتنی نەکردو، هەموو ویستەکەشی بووە ڕەخنەگرتن لەتورکیاو موحاسەبەکردنی ئەوەی کەشەڕ لەدژی کورد دەکات. ئۆچەلان لەو دوومانگەی ڕۆمایدا بەڕادەیەکی کەم وەك شۆڕشگێڕێکی ناودار سەرنجی خەڵکی بەلای خۆیدا بەدەستهێنا. لەبری ئەوەی زیاتر بایەخ بەکێشەکەی بداتو ئەورووپای خۆرئاوا ڕووبەڕووی ئەو کەمتەرخەمییە بکاتەوە کەلەچارەسەرکردنی شەڕەکەی نێوان تورکیاو PKK دا نواندی هەر هەوڵی خۆنزیك خستنەوەی بوو لەتورکیاو تەنانەت وازی لەلایەنی کەمی داوا سیاسییەکانیشی هێنا. کارەکەی لەڕۆشنبیرییێتییەوە نەبوو کۆنە شۆڕشگێڕێتییەکەشی نەهێشت.

ڕاستییەکەی ئۆچەلان وا ڕەفتاریدەکرد کەپێدەچوو بزانێت کێشەی PKK لە شوێنێکدا دۆڕابێتو باشترین شتێکیش کەلەتوانایدابێت ڕزگارکردنی ژیانی خۆیەتی (هەرچەندە ئۆچەلان، بەتایبەتی لەدادگاییکردنەکەیدا نکوڵی لەوەکرد کەنیازی وابووبێت). ئەگەر بەرەودوا بگەڕێینەوە ئەوا دەردەکەوێت کە ئۆچەلان هەر لەئیتالیاوە شانۆکەی بۆ ئەو شایەتیدانە ئامادە دەکرد کەلەحوزەیرانی ١٩٩٩دا لەبەردەم ٢ دادوەری دادگای ئاسایشی وڵاتەکەدا لەسەر خۆی دای، هەروەك خەڵکیش بیری لێدەکردەوە قورسترین سزا درا کە کوشتنە (ئیستینافەی نیو ساڵ دواتریشی هەر هەمان بڕیاربوو).

بەهەرحاڵ خەڵکێکی زۆری تورکیاو کوردە دووربینەکانیش لەکارە ناڕەواو سەختەکانی PKK پەستبوون. دانپێدانانەکەی ئۆچەلان پێدەچوو بەهەرمەیەك بێت بۆی نازل بووبێت، دەست ئاشکراکردنە ڕسولکەی وای دەگەیاند کە هێزێکە لەناوچووەو نابێت لەقۆناغی ئایندەدا هیچ ڕۆڵێکی هەبێت، کەئەوەش چارێکی سیاسیانەی وایە بۆ جێبەجێکردن دەلوێت. ئەم لنگەرقووچبوونەوەیەی ئۆچەلان کوردێکی زۆری والێکرد کاتێك بیریان لەو نرخە بێئەندازەیە دەکردەوە کە سەرکێشییەکانی PKK بەسەر ژیانیا هێنابووی، پەست بن (ئەویش نەك بەکەلاخستنی ئۆچەلان لەشوێنە تایبەتییەکەی خۆی کەبنکەیەکی نەتەوایەتی کوردە، چونکە تەنانەت کورتبینترین کەسی کەمالیزمیش ناتوانێت نکوڵی لەوەبکات کە ئۆچەلانو بزووتنەوەکەی، کێشەی کورد، کەبۆ نیو سەدە بەڕەسمی لەبیرکرابوو، خستۆتەوە ناو ئیشە بەبایەخەکانی تورکیا). لەئەنجامدا گرتنەکەی ڕێگای بۆ دەنگی کەمکردنەوەی توندڕەوی و زیاتر میانڕەوی کورد کردەوە، کەبێ ئەوەی یەکبینە لەهەردوولاوە، واتە حکومەتو سەرکردایەتی PKK تۆمەتی ناپاکی توندوتیژێتی بخرێتەپاڵ، گوێی لێبگیرێت.

PKK بەدوای ئۆچەلان[٢٢] دوای حوکمدانەکەی گورج بەرنامەیەکی کردەی بۆ دواڕۆژی خۆی دانا. جا ئەگەر PKK زۆر بەوە پچووک بووبێتەوە، یان نەشمابێت ئەوا قسەی هەر لەسەر دەکرێت. ئاگر لەناو خۆڵەمێشەکەدا لێرەو لەوێ ماوە. ئەو ئەندامانەی PKK کەئەم بۆچوونەی حیزب لایاندابوو، بەتایبەتی لەتونجلی هەوڵی بەردەوامێتی شەڕیان ئەدا، ئەگەرچی ئیشەکەیان نەشارێشبوو. کاتێک ئۆچەلان دوورکەوتبۆوە لەئامرلی جێگیرببوو، هەندێک لە چالاکەکانی پارتەکە سەبارەت بە ڕەوایی وتەی سەرکردەیەک کەبەوجۆرە ملکەچی ئارەزووەکانی ئەنقەرەبێت کەوتنە پرسیار، کاتێکیش هەڕەشەی بەردەوامی شەڕیان ئەکرد بەبێ ئۆچەلان، دڕندەیی تورکیاش هانی ئەو جۆرە بەرگرییەی ئەدان. واش پارتەکە لە ٨ی ئابی ١٩٩٩دا ئەخەباتی چەکدارانەی بەشێوەیەکی ڕەسمی راگرت و بایەخی بەکاری سیاسیاندا، لەئەنجامی ئەوەشدا رانەی ئالەبارێتی ئەو باروودۆخە زەمینییەی لەئارادابوو، تەنانەت بۆ سەرکێشترین کەس لەوانەی کەخۆیان بەدڵبوو ئاشکراکرد. ئۆچەلان یەکلایەنە فرمانی ئاگربەستی راگەیاندو دەنگی لەهەموو ئەوانەش کرد کەهێشتا بەدل لەگەڵیابوون- سوپای تورکیا هەربە ٥٠٠ چەکدارێک بەرامبەر بە ١٠٠٠٠ی ١٠ ساڵ پێشتر دایەدەنان- تا شەڕ رابگرن و بەرەو بنکەکانی دەرەوەی تورکیایان بینەوە، کەپێدەچێت ناو عێراق و ئێرانی مەبەستبووبێت. لە هاوینی ١٩٩٩دا ١٦ کادیری سیاسی باڵای PKK کەلەئەورووپاو عێراق جێگیرببوون، بەدوای ئۆچەلان خۆیان دابەدەستەوەو یەکسەر گیران. لەکانونی دووەمی ٢٠٠٠دا، حسێن کفرک ئوغلو، ژەنەڕاڵی پایەبەرزی تورکیا، رایگەیاند کە شەڕ بەڕادەی سەدی ٩٠ کەم بۆتەوە. هەر بۆ دڵنیاکردنی کەمالیزمە توندڕەوەکان، کە بەلای ئەوانەوە نەکوردو نەکوردستان بوونیان هەبوو، پارتەکە تەنانەت وشەی "کوردستان"یشی لابرد.

واش ژەنەڕاڵی سوپاسالار بەتەواوەتی ڕوونیکردەوە کەبڕیارەکە بۆ لەناوبردنی دوا چەکدار دڕاوە نەک بۆ دانوستانکردن، بۆیەکەمجار نەبوو کە شەڕانگێزەکان رایبگەیەنن کەتورکیای کۆماری هەرلە دروستبوونییەوە رێگای بەئەفسەرانی سوپا داوە شۆڕشەکانی پێشوو ونێستاو ئایندەی کورد هەر هەمووی لەناوبەرن، ئەویش بۆ ئەوەی رۆڵی دامەزرێنەرانی بە- پوالەت-

---

(72) ئۆچەلان بەم کارەی زمانی لەئەندامانی PKK کرایەوە کەزۆر لەمێژبوو کلیلدرابوو، تا بتوانن خۆیان لەو ئاکۆکیانەی نێوانیان، لەسەربۆچوونی جۆراوجۆری رابەرەوویان لەبارەی کاری سیاسیانەوە دووربگرن، بەدرێت.

بڕوانە:

-Chris Kuschera: The Middle Enst, London, Mag 2000.
-Disarry Inside PKK. Alasat 30 January 2000.
-L Express, 10 February 2000, (Kurdistan: I autoite d Ocalan Conteste).

دیموکراسی وڵاتەکە بپارێزن. ئەو سیاسەتمەدارە بێ ووره‌و ماندوانەی ئەنقەرە کەبەهەموو توانایانەوە کاریان دەکرد، دەرکەوت هەرگیز ئەو دیدو پڕکێشییەیان نەبووە کەچارەسەرێکی سیاسیانە پێشبین بکەن، بۆیە زنجیرەی بەسەرهاتەکان کارەکەی خستەوە دەست توندڕەوەکان. پێش دەرکردنی ئۆچلان لە سوریا، بلند ئەجەڤید، کە هێندە خۆی بەو کارەوە نەبەستۆتەوە بەلام هەر کەمالیزمە، دانرا بەجێگری سەرۆك وەزیران، ئەویش بۆ خۆئامادەکردنی هەڵبژاردنێکی پێشوەختی پەرلەمانبوو.

دوای گرتنەکەی ئۆچلان، ئەم خەباتگێڕە سیاسییە چەپە نەتەوەییە تەمەن ٧٣ ساڵە، بۆ خۆبەدەم شەپۆلی لێشاوی نەتەوایەتی و سەرکەوتن لەهەڵبژاردنەکەی نیسانی ١٩٩٩ی دەستەڵاتی پاسادائاندا، خۆی لەگەڵ پارتی کاری راستڕەوی نەتەوەیی توندڕەودا جووتکرد، ئەوەش سوپا بەهێزەکەی تورکیای گەلێك شادمانکرد، چونکە گرتنەکەی ئۆچلان، لەهەڵبژاردنەکەدا دەنگی ئیسلامییەکانی کزکرد، کەتاکە گەورەترین دۆڕاوبوو. پێدەچوو بەشێکی زۆری حکومەتەکەی ئەجەڤیدی ساڵی ١٩٩٩ خۆی بۆ لەسێدارەدانی ئۆچلان ئامادە بکات، ئەویش هەر بۆئەوەی بەو تۆڵەی خوێن سەندنەوەیە، رەزامەندێتی ئەو ٥٥٠٠ خێزانە بەدەستبهێنن کەڕۆڵەکانیان لەخزمەتی سەربازیدا (لەپاڵ نزیکەی ٢٥٠٠٠ چەکدارو مەدەنی کوردی کوژراودا) کوژرابوون. هەربەلای خەڵکە دووربینەکەوە ئەو لەسێدارەدانە ئۆچلانی دەکردە شەهید، پارەتی لەناوبردنی باشترین هیوای چارەسەرە دیموکراسییە ئیفلیجەکەی تورکیاشی دەدا، دەشبووە هۆی شلەقاندنی دەزگا ئارەندییە توندەکانی تورکیا، (زیاتر لەوەی کەتەنیا زیان بە کورتە سەربەکێچڵەکان بگەیەنێت).

لەو هاوینەدا سروشت دەستی لەتیشەکە وەردا، مانگی ئاب بومە لەرزەیەکی گەورە تورکیای گرتەوەو بەهەزارانی کوشت و، بووشەهۆی ناڕەزایی دەربڕینی خەڵکەکە لەبێتوانایی و بەدەنگەوە نەچوونی پێویستی باڵادەستانی مەدەنی و سەربازی (واش لەوەزیری گەشت و گوزار، ئەرکان مەمو، بکات کەبڵێت:"سیستمی سیاسی و بەڕێوەبەرایەتی تورکیایە کە بەژێر ئەم وێرانەیەوە بووە"). یۆنانییەکان کە زۆر لەمێژە دوژمنی ئەنقەرەن، (وەك دەیان وڵاتانی دی) چەند تیپێکی فریاگوزاری ئارد، بووە هەنگاوێکی دڵپاکی وا، کە لەدوا ڕۆژانی هاویندا کاتێك بومەلەرزە لەیۆنانی دا، تورکەکان بەرامبەر بەوکارەی ئەوان تیپی فریاگوزار بۆ یۆنان بنێرنەوە. تورکی ئاسایی کە هەرچەند مانگێك لەوەوبەر تووڕەیی خۆیان بەرامبەر بەئیتالیا بەتایبەتی و، خۆرئاواییەکان بەگشتی دەربڕی، چونکە بە گەیشتنی ئۆچلان بۆ رۆما قایل نەبوون یەکسەر بیگرن و بیدەنەوە بەتورکیا، بۆیان دەرکەوت کەدژایەتی دونیا بەرامبەر تورکیا بێ هۆ نییە، بۆیە

بەرەبەرە ئەو گوشارەی کەپێشتر بۆ لەسێدارەدانی ئۆجەلان ڕوو لە زیادی بوو، خستیانەلاوە (سەرەتای ساڵی دووهەزار حکومەت فەرمانی لە سێدارەدانەکەی نارد بۆ دادگای ماف مرۆڤی ئەوروپا، کە ڕەنگە پیاداچوونەوەکەی ئەوێی ٢ ساڵێك بخایەنێت).

بۆ ئەگبەتی ئەو شتەی بۆ ئۆجەلان باش بوو بۆ کوردی تورکیا وەك پێویست باش نەبوو. بوەلەرزەکە بووە بیانوویەکی نایاب بۆ حکومەتەکەی ئەجەڤید کە پەیمانی لێبووردنی گشتی لەجەنگاوەرەکانی PKK و بەگەڕخستنی پارەی زۆر لەناوچە کوردییەکانی خۆرهەڵات و باشووری خۆرهەڵات، کەئەمیان دەگەڕایەوە بۆکاتی شۆڕشەکەی شێخ سەعیدو هەر لەوساشەوە لەبیربرابۆوە، لەبیرخۆی بەرێتەوە، چونکە هەرچییەك هەبوو لەخۆرئاوای تورکیادا بۆ لێقەوماوانی بومەلەرزەکە تەرخانکرا. حکومەت، دوای ئەوەی ڕادەیەك بۆ شەڕ دانرا، جوتیارە دوورخراوەکانیشی بۆسەر جێگای خۆیان نەبردەوە. (دوا ڕۆژانی مایسی ٢٠٠٠ سوپا سالار ڕایگەیاند کەژمارەی ئەو چالاکیانەی کەناوی "تیرۆر"یان لێنابوو لە ٣٣٠٠ی ساڵی ١٩٩٤ەوەو ١٤٣٦ای ساڵی ١٩٩٥ەوە، لەساڵی ١٩٩٩دا کەمبۆتەوە بۆ ٤٨٨و، لەیەکەمین پێنج مانگی هەزارەی نوێدا بۆتە ١٨). ئەندامە کوردەکانی پەرلەمان یەکبینە نابدڵی خۆیان بەرامبەر بەخۆگێلکردنی حکومەت نیشاندەدا چونکە پارەی بۆ ئاوەدانکردنەوەی دابین نەدەکرد. کاربەدەستە تورکەکانیش کەلەناوچە نائاساییەکاندا مابوونەوە، لەوکارەدا هیچ پەلەیەکیان نەبوو. جاچونکە یارمەتی زۆری حکومەت بەسەر ناوچەکەدا دانەبارێنرا پارە بەگەڕخستنەکەی خەڵکەکەش هێندەنەبوو، ئاوەدانکردنەوەی ٢٠٠٠ گوندی کاولکراو کەدەبوا سوپا بیکردایە، چاککردنی زەوی و زاری ناوچەکەو قەرەبووی مێگەلە مەڕو ماڵات و ئاژەڵی دی هیچی نەبرایەسەر. بەڵام داخۆ دانەوەی ئەو زیانانەی شەڕ نەك هەر پشتگوێخستنی ئاوەدانکردنەوەی ناوچەکە، تا دەیان ساڵی تریش لەبەرنامەی حکومەتدا دەبێت؟ داخۆ دەست بۆ هیچ درێژ نەکردن بەلای ئەو حکومەتەی کەمێشتا بەهیوایە ئەو چەندین ملیۆن کوردەی بەرەو خۆرئاوای وڵات هەڵاتبوون ئارەزووی مانەوە نەکەن، کەئەوی ڕاستیبێت هێشتا خەڵکی تریشیان بەدوو دەکەوێت، بەجێ نەبێت؟ بێگومان ئەم پشتگوێخستنانە یاریدەی ئەوان دەدات کەبۆچوونەکەی ئۆزال ببەنەسەر، کەئەویش تواندنەوەی کوردە بەرەی بەشی زۆریان لەوڵاتی باوو باپیریانەوە ڕاگوێزن.

ئەگەر شتێك هەبێت لەوەبچێت ئەخشەیەك بۆ هاندانی ئەنقەرە دانرابێت، کەلە پێناو چارەسەرکردنی کێشەی کورددا دەست بەچاکسازی دەزگاکانی بکات، ئەوا بڕیارەکەی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٩٩ی یەکێتی ئەوروپا، کە ئەگەر تورکیا وازلە سیاسەتە کۆنەکەی بهێنێت ئەوا سەرەڕای تۆمارە ناهەموارەکەی ماف مرۆڤی، جارێکی دی وەك ئەندامێکی پاڵێوراو

وەربگیرێتەوە. وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاش، کە دوای چاوپۆشین لەتۆمارە بەبەڵگە سەلمێنراوەکانی ڕادەی ستەمو فاشیستییەتە هێجگار ئاڵۆزەکەی ئەنقەرە، هیچ کات لە بایەخدان بەخواستەکانی تورکیا بێزار نابێت، لەم کارەی یەکێتی ئەورووپای پێخۆشبوو (بەڕێوەبەرایەتی کلنتۆن، لەساڵی ١٩٩٧دا بە توندی گوشاری خستبووە سەر یەکێتی ئەورووپا تا چاوێك بەڕەتکردنەوەی ئەندامێتی تورکیایدا بخشێنێتەوە. ئەو پاداشدانەوەیەی واشنتۆن بۆ ئەنقەرەی ئەندامی ناتۆ، لەبری ناردنی سەربازەکانی بوو بۆ بۆسنەو تەرخانکردنی بنکە ئاسمانییەکەی خۆرئاوای تورکیابوو لەشەڕی داهاتووی کۆسۆڤۆی بەهاری ١٩٩٩دا. -بێگومان- ڕێگاشی بەفڕۆکە جەنگییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان دا کەبنکەی ئەنجەرلیك بۆ پارێزگاریکردنی کوردی عێراق بەکاربهێنێت!!)[٧٣]

بڕیارەکەی یەکێتی ئەورووپا بەلای کوردەوە، بۆ ماوەیەکی دی چاوپۆشینی ئەو "بێباوەڕییە" بوو کە بەرامبەر بە تورکیا لەئارادابوو، وڵە لەئاکامی تاقیکردنەوەوە، وەك هیوایەکی ئاشکرابێت و جارێکی تریش(سەرەڕای ئەوماوە دوورو درێژەی کارەناڕەواکانی‌تیادا مەیسەر دابوون) بدرێتە تاوانبار . بەڵام لەخۆباییەتی تورکەکان بەوەدا کەنزۆریان لەیەکێتی ئەورووپا دەکرد چاو بەڕەتکردنەوەکانی پێشوویاندا بخشێننەوە، هەستێکی نەتەوەیی توند ڕەوی وای

---

(٧٣) هەڵوێستی بەڕێوەبەرایەتی ئەمەریکا بۆ بەرگریکردن لەتورکیا هێند نامەردانەبوو، کەنکۆڵی لەبوونی هیچ جۆرە ئەگونجارییەکی سیاسەتی ئەمەریکا دەکرد لەچوونە شەڕ لەگەڵ کۆسۆڤۆییەکاندا، کە دوچاری پاکتاوکردنی ڕەگەزیانە هاتبوون، کەچی هیچ ناڕەزاییەکی لەهەمان کاری تورکیادا کەلەگەڵ کورددا دەیکرد نیشان نەدەدا. لە٦ی نیسانی ١٩٩٩دا و لەگەرمەی بۆردومانکردنی سربیاو سوپای سربی ناو کۆسۆڤۆدا، وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا بەڕاشکاوی هەستی بە شەرمەزاری کرد کە "جێیمیس ڕۆبن"ی قسەکەری ڕەسمیانەیان بڵێت: "تورکیا وڵاتێکی دیموکراسییەو هەوڵی چارەسەرێکی ئاشتیانەی کێشەی کورد دەدات، تورکیا وەك ئەندامێکی ناتۆ بەهیچ جۆرێك ئەخراوەتە ناو هەوڵی بەبەرنامە بۆ پاکتاوکردنی مەدەنییە دەستەپاچەکان یان وێرانکردنی بەکۆمەڵی ماڵەکانیان و خەڵکەکەشیانی ڕاگوێزرابێت، بەراوردکردنەکە سەراپا ناڕەوایە". بەپێچەوانەوەی تۆمارگە کۆنەکانی ئەنقەرەدا دەردەکەوێت کە کوردو خەڵکی نا کوردیش هەڵیانە لە "گەڕانی تورکیا بۆ چارەسەرێکی ئاشتیانەی کێشەی کورد" دوودڵن. بەکارهێنانی "ئەخراوەتەناو" سەرنجی شارەزایانی زمان ڕادەکێشێت، چونکە هیچ پرسیارێکی تری وای بەدوادا نەهاتووە کە "هەوڵێکی بەبەرنامە"ی ساڵانی ڕابردوو هێندە سەرکەوتووبێت کەهیچ هەوڵێکی دی پێویست نەبێت. جا ئەگەر ئەمانە هەمووی گەمە بەزمان کردن بێت، ئەوا بەبیریانە کە سەرۆك کلنتۆن بۆ خۆی هەوڵی خۆبەدوورگرتنی لەپرسیارێکی پڕ لەڕسوایی، سەبارەت بەپەڵداریە نهێنییەکەی ساڵی ١٩٩٨ی لەگەڵ مۆنیکا لیونسکیدا بەوە دایەوە کە وەڵامەکەی پێشتری بۆ مانای وشەی IS ی ئینگلیزی بەو جۆرەبێت کەلەتەوراتدا هاتووە

لاپەیدا کردن کە وەک هەر لایەنێکی سەرەکی تری دامەزراندنی کۆمارەکەی بەدرێژایی ٨٠ ساڵ ئاتەمات پتەوتر دەبوو، بۆیان دابین نەکرێت . ئەودەمارگیرییە لەمناخ چەسپاوەی تورک، کەمەندێک جار وایان پێشبین دەکرد بیانییەکان بەچاوی نەرم پێیاندا دەڕوانن و دەست لەکاروبارییانەوە وەردەدەن، دەکەوتە ڕوو، جۆرە مەترسییەکی واشیان لای سەرۆک و کاربەدەستانی ئەورووپا دێنایە ئاراوە کەپێیان وابێت، بەرلە ڕوودانی گۆڕانکارییەکی وا لەتورکیادا، تا ئەودیارە پێویستانەی کەدەبێت لەیەکەمین ئەندامێکی ئادیان و فاشیدا هەبن دەربکەوێت و شایانی ئەندامێتی بێت، ماوەیەکی هێجگار زۆری بوێت. هەموو هەنگاوێکی بەرەوپێشەوە چوونی تورکیا دووهەنگاو گەڕانەوەی بەدوادا دێت .

لەداخی ئەو سەردانانەی چەند نێردراوێکی یەکێتی ئەورووپا بۆ لای چەند کوردێکی دیارو ناسراو، وەک ئەو کاربەدەستانەی لەڕێگەی هەڵبژاردنەوە گەیشتبوونە پلەو پایە کەیان، یان بەند کراوە سیاسییە بالادەستەکانی وەک لەیلا زانا، کار بەدەستەکانی تورکیا، هەردوا بەدوای بڕیارەکەی یەکێتی ئەورووپا؛ سەرۆکی شارەوانی دیار بەکرو دووشاری تری کوردیان لەکاتێکدا گرت کەقینەبەرایەتی کوردو ئەورووپاییەکان وەکو یەک بگەیەنێت. ئەم کارانە تەنانەت لای بەڕێوەبەرایەتییەکەی کلنتۆنیشەوە کاردانەوەیەکی گشتی هێنایە ئاراوە.

"هارۆلدکۆنجو کۆ"ی وەزیری مافی مرۆڤی بەڕێوەبەرایەتییەکەی،کە تورکەکان ڕەخنەی خۆ تێهەڵقورتاندن و دەست لەکار وەردانیان لێدەگرت دەڵێت کە ئەوخۆی "لەگرتنەکان ڕامابوو کاری زۆریشیان تێکرد ". "جۆهانس سۆبۆدا "ی سەرەبەپەرلەمانی ئەورووپاش، زیاتر ئامانجەکەدەپێکێت و دەڵێت:"ڕاستییەکەی تورکیا بەم نیشانەی خۆپالاوتنەکەی بەرەو ئەمان دەبات. زۆر کەس لەتورکیا هەن نایانەوێت تورکیا ببێتە ئەندام لەیەکێتی ئەورووپادا[74].

هەر لەوکاتانەشدا و لەناوچە کوردییەکاندا دەزگاکانی مافی مرۆڤ بەهێجگاری کڵۆم کران و ئەندامانی پارتی "هادیپ"یش لەسەر بیروڕا بەندکران. پەرلەمانتارەکانیش، کە کوتوپڕانە سەردانی بنکە پۆلیسییەکانیان کردبوو،کەرەسەی ئازارو ئەشکەنجەدانی ئەو بنکانەیان راگەیاندو ئاشکراکرد. بەشێکی ڕاپۆرتی کۆمیتەیەکی پەرلەمانتارەکان؛ بەبەڵگەی تەواوەوە بۆ پێشێلکردنە بەربلاوەکەی مافی مرۆڤ تەرخانکرابوو. سەری ساڵی نوێ، کە نەورۆزی پێدەوترێت، کۆماری تورکیا، بۆ ڕێگرتن لەکوردەکان تا بەجەژنی نەتەوەیی خۆیانی دانەنێن، لەساڵانی

---

(74) بەپێی نیویۆرک تایمس ٢٢ی شوباتی ٢٠٠٠ سەرۆکی شارەوانییەکان لەماوەی هەفتەیەکدا ئازاد کران بەڵام تۆمەتیان خرایەپاڵ و سەرلەنوێش لەشوێنەکانی خۆیاندا دامەزرێنرانەوە. کەچی لەسەر ڕەوشتە کۆنەکەی "کەمالیزم"، هەنگاوێک بۆ پێشەوە دووان بۆ دواوە، چەند سەرۆکە شارەوانییەکی کورد، بەچەند بیانوویەکی پڕوپووچەوە، بۆ بەشداریکردن لەسیمینارێکدا ڕێی سەفەرکردنی واشنتۆنیان پێنەدرا

ئەوەتدا کوردییە پشووی ڕەسمی، لەو مانگی ئازارەدا هەر قەدەغەکرا، ئەویش بەو بیانووەی کەپیتی W ی ووشەی NOWROZ لەزمانی تورکیدا نییەو هەر NEVROZ کە بەتورکی کراوی ناوی پشووکەیە ڕێگای پێدەدرێت، خۆپیشاندانێکی تووڕەو سەرسووڕهێنەر لەناوچە کوردییەکاندا (کەلە ئێرانیشدا ڕوویدەدات) کرا.

ئەگەر بۆ دەوڵەت بلوایە ئەوا پێشێلکردنەکانی دی هەرچۆنێك بوونایە دڵی پێدا دەنرا. دوای یەکلاکردنەوەو ئارامبوونەوەی PKK ساڵی ٢٠٠٠ لەپڕێکا حکومەت بەرامبەر بەو توندوتیژییەی لەکورد دەکراو لەباشووری خۆرهەڵاتی وڵاتەکەدا ببووە هۆی کوشتنی ٢٤٠٠ - ٣٥٠٠ کەسێکیان و، لەبەر کەم توێژینەوەو بەدوادا چوونیاز هێشتا بەرەسمی هۆی کوشتنەکانیان نەزانرابوو، "حیزبوڵا"ی (هیچ پێوەندییەکی ئاشک[illegible] [illegible]ێوان ئەم حیزبەو ئەوەکەی لوبنان، کەهەمان ناوی هەیە بەدی نەکراوە) بە[illegible]پرسیارکرد. هێزەکانی ئاسایش کەشوێنی باوەڕنین، دژی ئەو قسانەن کەلەو کوشتارە بیّ دادگاییانەدا هیچ ڕۆڵێکیان هەبووبێت. ڕاستییەکەشی کۆماری تورکیا کەوتبووە پاکسازیکردنی ئیسلامییە بالادەستە توندڕەوەکان، کەلەپێناو سوودی خۆیاندا ببوونە پەردە بۆ پۆشینی تیپە پیاوکوژەکانی دەوڵەت، زۆر بەهێزتربوون. سەرۆك سلێمان دیمیرێل کە بۆ زیاتر لە ٤٠ ساڵ قورسایی ئاشکرای بەسەر گەندەڵی دەزگاکانی وڵاتەوە دیاربوو، ڕێگای ئەوەی دابوو کە "ئەگەر بەرژەوەندی گەورەتر لەئارادابێت ئەوا پێویست ناکات دەوڵەت ڕێ و شوێنی ئاسایی بگرێت و، خۆ ئەگەر پێویست بێت و دەوڵەتیش پەسەندی بکات، ئەوا بۆی هەیە لەڕێگای ئاسایی دەرچێت".

ئەم شێوە کۆنەو قسە زلە پڕوپووچەی سیاسەتی کەمالیزمەکان، ئەوەندە لەگەڵ رەتکردنەوەکەی پەرلەماندا نەگونجا کە بۆ جۆرە گۆڕانکارییەکی دەستوور هیواکانی دیمیریل بهێنێتەدی، تا بەهۆیەوە ماوەیەکی یاسایی دی لەشوێنەکەیدا بمێنێتەوە. ژیانی خەڵکەکە ئەوەندە ناهەمواربوو کە پەرلەمان والێبکات لەمانگی ئایاردا دادوەرێکی کەمالیزمی دادگا "ئەحمەد نەجدەت سێزێر" ناو لە جێگای ئەو هەڵبژێرێت. ئەم سەرۆکی دادگا دەستوورییە کە کاتی خۆی بڕیاری قەدەغەکردنی حیزبی ڕەفاهی پەسەند کرد، ئەو توانا و زۆر زانییەی سیاسەتمەدارێکی شارەزای وەك دیمیرێل و ئۆزاڵی نییە تا زوو بە زوو کۆشکی سەرۆك کۆمار، کە بەڕواڵەت زیاتر شوێنی بۆنەو ئەوشتانەبوو، بیگۆڕێت بۆ جێگەی دەستەڵاتی ڕاستەقینە. سیزەر شارەزایی لەپەرلەماندا نییەو بێگومان شارەزایی سیاسیشی نییەو هیچ زەم[illegible]ینەکی بیانیش

ئازانێت[٧٥] بەڵام دەنگ دلێرو قسەلەڕوو بەجەرگە، ئەمەش زۆر بەدەگمەن لەژیانی گشتی تورکیادا بەرگوێندەکەوێت. سالی ١٩٩٩ کە وتی: "یەکێك لە گرفتەکانی ئەم وڵاتە ئەوەیە کەهیچ کەسێك ملکەچی یاسا نییە" وتیشی: "ئەگەر ئێمە دەستوورمان هەبێت ئەوا پێویستە بەپێی یاسا ڕێزی لێبگرین" و دەبێت تورکیا "دەستوورو یاساکانی بگۆڕێت تا شان بەشانی بنەما سەرەکییەکانی دونیا بوەستێتەوە" و سووربوو لەوەی "دەبێت کۆت لەسەر ئازادی بیروڕا هەڵبگیرێت و پێویستە یاسا ڕەواکەشمان پاك بکرێتەوە"، بەوقسانەی هەستی خەڵکێکی بێشوماری بەلای خۆیدا ڕاکێشا.

سیزیر لەو وتەیەیدا کە بەبۆنەی دەستەڵات وەرگرتنەکەیەوە دای، وتی: تورکیا دەبێت واز لەو شتانە بهێنێت کە "لەشێوەی حکومەتێکی پۆلیس ئاسا بچێت"، لەوەش توندتربوو. پێدەچێت کەمالیزمە توندڕەوەکان کە مەترسیان لەدیدە فرەلایەنییەکەی هەبوو، کە چەند ڕۆژێك دوای سوێندخواردنەکەی بەدیاربکەوێت، بەتایبەت خاڵەکانی ٨و٣١٢ی تایبەت بە سزادانی بیروڕا، لابیات. بەلای سەرجەم خەڵکی تورکیاو زۆر بە تایبەتیش بەلای کوردەوە، شێوەی دیموکراسی دەزگا خۆرئاوایییەکانیش تاکە ڕێگایە کە بۆ بوونە ئەندامی لەیەکێتی ئەوروپادا پێویستە بیگرێتەبەر، ئەویش نەك جێبەجێکردنی کەڕێگایەکی سەختی دووروودرێژی پڕ لە خەرکەبەرە. لەدیاربەکر کوردێك بەڕۆژنامە نووسێکی بیانی کەسەری لەوناوە دەدا، وتبوو: "ئێمە لەوەزیاتر ئاترسێنرێین، لەمە زیاتر چیم لێدەکەن؟" دەشێ وابێت، بەڵام ئەم قسە ئازایانە ئەوەندە بڕی نەکرد، کە داوایان لێکرد ناوی خۆی بڵێت"[٧٦]

---

[75] "مادلین ئۆلبرایت"ی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا، بەر لە هەڵبژاردنەکەی بەسەرۆك کۆمار، لەسەر خوانێکی ڕەسمی کەوتبووە تەنیشتییەوە ناچارمابوو جێگای خۆی بگۆڕێت، ئەوەش وایکرد کەداروەر بەتووڕەییەکەوە شوێنەکە بەجێبهێڵێت.

[76] "وول ستریت جورنال"ی ١٥ی ئازاری ٢٠٠٠.

## سەرچاوەکان

Adamson, *David. The Kurdish War. London*. 1964.

Alam, Asadollah. *The Shah and I: The Confidential Diary of Iran's Royal Court, 1969 - 1977*, New York, 1992.

Amnesty International, *Getting Away with Murder: Polotical Killings and 'Disappearances' in the 1990s*. London, 1990.

_____. Human Rights Abuses in Iraqi Kurdistan Since 1991.' London, 1995.

_____. Iraq: Human Rights Violations Sins the Uprising.' London, 1991

_____. Iraq: The Need for Futher United Nations Action to Protect Human Rights.' L ndon 1991.

_____. Turkey: Brutal and Systematie Abuse of Human Rights.' London 1989 Bell, Gertrude. *The Desert and The Sown*. London, 1907.

Black, Ian, and Benny Morris, *Israel's Secret War: The Untold Story of Israeli Intelligence*. London, 1991.

Bois, Thomas. *The Kurds*. Beirut, 1965.

Bulloch, John, and Harvvey Morris. *No Friends but the Mountains: The Tragic History of the Kurdis*. New York, 1992.

Chaliand, Gerard. *A ptople Without a Country*. London, 19890, and Brooklyn, 1993.

"Civil War in Iraq." Committee on Foreign Relations, United States Senate, Staff Report, 1991.

Cockburn, Andrew, and Leslie Cockburn. *Dangerous Liaison: The Inside Story of the U.S.-Israeli Covert Relationship*. New York 1992.

Dersimi, Nouri. *Le Dersim dans l'histoire du kurdistan*. Aleppo, 1952.

Driver, G. R. *kurds and kurdistan*. Mount Carmel, 1919.

Eagleton, William, Jr. *An Introduction to kurdish Rugs and other Weavings*. Buckhurst, Essex, Engeland, 1998.

_____. *The Kurdish Republic of 1946*. London, 1963.

Edmonds, C.J. *Kurds, Turks and Arabs: Politics, Travel and Research in Northeast Iraq, 1919-1952*. London, 1957.

Farouk-Sluglett, Marion, and Peter Sluglett. *Iraq Since1958: From Revolution to Dictatorship*. London, 1987 and 1990.

Fromkin, [illegible] *A Peace to End All Peace: The Fall of the Ottoman Empire [illegible] the Creation of the Modern Middle East*. New York, 1989.

Galbraith Peter W. 'The United States and the Kurds.' Remarks deliv[illegible] the H. John Heinz III School of Public Policy and Mar[illegible]gement, Pittsburgh, November 5, 1992.

Ghareeb, Edmund. *The Kurdish Question in Iraq*. Syracuse, 1981.

Ghassemlou, Abdul Rahman. *Kurdistan and the Kurds*. London, 1980
Gordon, Michael, and Bernard E. Trainor. *The Generals' War: The Inside Story of the Conflict in the Gulf*. Boston and New York, 1995.
Gunter, Michael *The Kurds in Turkey*. Boulder, Colorado, 1990.
___. *The Kurds of Iraq: Tragedy and Hope*. New York, 1992.
Hamilton, Archibald M. *Road Through Kurdistan*. London, 1937.
Hay, W. R. *Two Years in Kurdistan*. London, 1921.
Hourani, Albert. *A History of the Arab Peoples*. Cambridge, Massachusetts, 1992.
Howell, Wilson N. ' The Soviet Union and the kurds: A Study of a National Minority.' Unpublished Ph.D. thesis, University of Virginia, 1965.
Human Rights Watch. ' Bureaucracy of Repression: The Iraqi Government in Its Own Words.' New York, 1994.
_____ ' Landmines: A Deadly Legacy.' New York, 1993.
' Incontournable Turquie.' *Les Cahiers de l'Orient*. Paris, 1993.
Izady, Mehrdad R. *The Kurds: A Concise Handbook*. Washington and London, 1992.
Kaplan, Robert D. *The Romance of an American Elite*. New York, 1992.
al-Khalil, Samir. *Republic of Fear*. London and New York, 1990.
Kimche, David. *The last Option-After Nasser, Arafat and Saddam Hussein: The Quest for Peace in the Middle East*. London, 1991.
Kinnane, Derk. *The Kurds and Kurdistan*. London, 1964.
Kinross, Lord. *Ataturk: The Rebirth of a Nation*. London, 1964.
Kutschera, C. *Le Mouvement national kurde*. Paris, 1979.
Laurie, Thomas. *Dr. Grant and the Mountain Nestorians*. Boston, 1853.
Lowry, Heath W. *The Story Behind Ambassador Morgenthau's Story*. Istanbul, 1990.
Makiya, Kanan ( Samir al-Khalil). *Cruelty and Silence: War, Tyranny, Uprising and the Arab World*. New York, 1993.
Mauries, Rene. *Le Kurdistan ou la mort*. Paris, 1967.
McDowall, David. *The Kurds: A Nation Denied*. London, 1992.
____. *A Modern History of the Kurds*. London, 1996.
Middle East Watch. ' The Anfal Campaign in Iraqi Kurdistan: The Destruction of Koreme.' 1993.
____ ' Endless Torment: The 1991 Uprising in Iraq and Its Aftermatch.' 1992.

____. ' Genocide in Iraq: The Anfal Campaign Against the Kurds ' New York, 1993.
_____. ' Hidden Death: Land Mines and Civilian Casualties in Iraqi Kurdistan.' October 1992.
_____. ' Human Rights in Iraq.' 1990.
_____. ' Kurds Massacred: Turkish Forces Kill Scores of Peaceful Demonstrators.' 1992.
_____. 'Unquiet Graves: The Search for the Dissappeared in Iraqi Kurdistan.' 1992.
More, Christiane. *Les Kurds aujourd'hui: Mouvement nationale et partis politiques.* Paris, 1984.
Morgenthau, Henry. *Ambassador Morgenthau's Story.* Garden City, New York, 1918
National Security Archive. ' Iran 1977-1980.' Previously classified documents from Department of State and other goverment agencies.
Nikitine, Basile. *Les Kurdes: Etude sociologique et historique.* Paris, 1956.
Othman, Siyamand. 'Contribution historique a l'etude du Parti Demokrati Kurdistan-i- Iraq 1946-1970.' Ecole des Hautes Etudes en Sciences Sociales, Paris, 1985.
Pelletiere, Stephen C. *The Kurds: An Unstable Element in the Gulf.* Boulder and London, 1984.
Pichon, Jean. *Les Origines orientales de la guerre: 1921, le partage du Proche Orient.* Paris, 1938.
Raviv, Dan, and Yossi Melman. *Every Spy a Prince: The Complete History of Israel's Intelligence Community.* Boston, 1991.
Reza. *Les Chants brules.* Bern, 1995.
Roosevelt, Archie. *For Lust of knowing: Memoirs of an Intelligence officer.* Boston, 1988.
Roux, Georg. *Ancient Iraq.* London, 1964.
Safire, William. *Safire's Washington.* New York,1980.
Safrastian, Arshka. *Kurds and Kurdistan.* London, 1948.
Schmidt, Dana Adams. *Journey Among Brave Men.* Boston, 1964.
Sciolino, Elaine. *The Outlaw State: Saddam Hussein's Quest for Power and the Gulf Crisis.* New York, 1991.
Shawcross, William. *Shah's Last Ride: The Fate of an Ally.* New York and London, 1988.
Soane, Ely Bannister. *To Mesopotamia and Kurdistan in Disguise.* London, 1912. 2nd edition, 1926.

